AWER

ناوەندی ئاوێر بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
ژمارەی بڵاوکراوە: ٢٢٢

# خۆشناو و دۆ و دۆشاو

کۆکردنەوەو نووسینی: فەقێ شێخ وەسانی
بابەت: مێژوو و فۆلکلۆر
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: جمعە صدیق کاکە
دیزاینی بەرگ: ئاکار جەلیل کاکەوەیس
نرخ: ١١٠٠
ساڵی چاپ: ٢٠١٥
نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی ( ١٦١ ) ی ساڵی ( ٢٠١٥ ) ی دراوەتێ

ناوەندی ئاوێر
بۆچاپ و بڵاوکردنەوە
ناونیشان: هەولێر-پشت پارێزگا-بەرانبەر دەرگای قەڵات
ژمارەی مۆبایل: ٠٧٥٠٤٢٤٢١٠١ — ٠٧٥٠٤٢٠٩٤٩٥
فەیس بووک : www.facebook.com/Nawendi.Awer

# بەرکوت

حاجی قادری کۆیی دەڵێ: " میللەتی بێ کتێب و بێ نووسین *غەیری کوردان نییە لە ڕووی زەمین" بۆ ڕابردەی کورد ئەم شیعرە پڕ بە پێستی خۆیەتی. لە مێژوودا میللەتی کورد لە هەموو لایەکەوە چەوسێندراوەتەوە، لە مەفتەن و زێدی خۆی دوورخراوەتەوە، بە کەیف و ئارەزووی دووژمنان قەتڵوعام کراوە، سەرباری ئەوانەش پێیان گوتووە: دێو و درنج و دڕندە! گەلێك لەنێو ئەو هەموو بەرداشدا بهاڕدرێت، چۆن دەپڕژێتە سەر نووسین؟ چۆن پێی دەکرێت قەوماو و مێژووی خۆی بنووسێتەوە؟ ئەگەر دەرفەتی هەناسەهەڵکێشان و نان و ئاوێکی هەبووبێت سەت شوکرانەی لەسەر کردووە، ئیتر نووسین لە کوێ جێگەی دەبێتەوە؟ هەر بە هۆی ئەم بارە نالەبارە بە هەزاران گەوهەری گرانبەهامان لە دەست چووە، بە سەتان ڕووداوی مێژوویمان لێ ون بووە، چەندان بەیت و بالۆرە و شیعر و ڕووداوی فۆلکلۆریمان لە کیس چووە... ناوەناوە ئەگەر کەسانێکیش هەبووبن چەند سەرەقەڵەمێکیان تۆمار کردبێت، لەگەڵ بێنەوبەردە و ئاوارەییدا سووتاون یان لەژێر خۆڵدا فەوتاون.

کوردەواری گوتەنی "زەرەر لە نیوەی بگرێتەوە قازانجە". کاك فەقێ زیاتر لە بیست ساڵ دەبێت خەریکی کۆکردنەوە و نووسینەوەی مێژووی زارەکی خۆشناوەتییە. لەو گوند بۆ ئەم گوند گەڕاوە، پیرەژن و پیرەپیاوی دواندووە، هەر وشەیەك، ڕستەیەك، پەندێك، حەیرانێك، بەسەرهاتێك، شیعرێك، لاوکێك، چیرۆکێك، قسەیەکی نەستەق..تاد، بیستووە دەفتەرەکەی لە باخەڵ دەرهێناوە و تۆماری کردووە. لە پاڵ هەموو ئەوانەش مێژووی ڕۆژانی سەخت و دژواری خۆی نووسیوەتەوە.

ئەم کتێبە سوودێکی زۆری بۆ نەوەی نوێ هەیە، بە پووختی دەشێ ئاماژە بەم چەند خاڵەی خوارەوە بکەین:

خۆشناو و دز و دزشاو

١- یەکەم دەکرێ لە ڕێگەی ئەم چیرۆك و سەربردە و پەند و بەند و مەتەڵانە، بەسەر چەندان سەرەداوی مێژوو هەڵبێن و ڕابردووی باوك و باپیرانمان بدۆزینەوە. وەك من دیقەتم داوە بەشێکی زۆری مێژووی کورد پشتی بەم کەرستانە بەستووە کە کاك فەقێ بەکاری هێناون.

٢- کاك فەقێ لە ڕێگەی ئەم کتێبە خزمەتێکی زۆری زمانی کوردی کردووە، چەندان وشەی لەبیرکراوی زیندوو کردوونەتەوە. بەسەرهات و ڕووداو و حەیرانۆك و ... بەشێوەی گوتراو، تۆماری کردوون. شێوەزاری خۆشناوەتی بەسەر هەموو نووسینی ئەم کتێبەدا زاڵ کردووە.

٣- ئەگەر لە سۆنگەی فۆلکلۆرەوە تەماشای ئەم کتێبە بکەین سوودی تەواو نابێت. زۆر زیرەکانە هیی هەموو گوندەکانی خۆشناوەتی کۆکردووەتەوە. من کە سەروکارم لەگەڵ خوێندنەوە و نووسیندا هەیە، ئەم کتێبە لەمبارە بە یەکەم کتێب دادەنێم... ناکرێ هەوڵەکانی کاك محەمەد جەمالیش لەبەرچاو نەگیرێن.

٤- بەشێك لە ڕووداوەکان ژیاننامەی خۆیەتی، کە خوێنەر دەیانخوێنێتەوە نازانی بگری، یان پێبکەنی، ئەو بە ژیانێکی سەخت و ناهەموار تێپەڕیوە... لەم بەشەشدا دەیان پەند و ئامۆژگاری وەردەگیرێ. لە هەمووی خۆشتر کاك فەقێ زۆر سادە و خاکیانە ئیعتراف بە هەڵەکانی خۆی دەکات و بە ڕوون و ڕەوانی خۆی سەرکۆنە دەکات.

٥- مێژووی ئاغا و کێخوا و شێخ، دەگێڕێتەوە زۆرداری و خوراڤاتیان دەخاتە ڕوو، جاروبارێش شیکردنەوەیەکیان بۆ دەکات و لەژێر تیشکی عەقڵ تەتەڵەیان دەکات، ئەمەش بۆ توێژەران سوودێکی زۆری دەبێت، هەروەها بۆ هەموو ئەوانەی کە بیانەوێت لە شێوازی حوکمڕانی و دەستەڵاتی ڕابردوو تێ بگەن.

٦- کاك فەقێ لەنێو کتێبەکەیدا چەندان چیرۆکی واقیعی و خەیاڵی هێناون، خوێنەر بە خوێندنەوەیان چێژ وەردەگرێ و حەز دەکات بە دەنگ بۆ دەوروبەریان بخوێنێتەوە.

٧- زیرەکی و نەزانی ئەو خەڵکە دەخاتە ڕوو، هێندێك جار بە خوێندنەوەی چەند بەسەرهاتێك کە جاری وا هەبووە لەسەر کلکی گوێدرێژێك چەندان کەس کوژراون، بێز لەخۆت دەکەیەوە! لە هێندێك ڕووداو زیرەکی و زیتەڵی ئەو خەڵکەی بە شێوەیەك خستووەتە ڕوو، کە وا هەست دەکەیت ئێستە خەڵك بەرەو دواوە گەڕاونەوە!

بە کورتی و کرمانجی ئەم نووسراوە بۆ نەوەی نوێ بە گشتی و بۆ دەڤەری خۆشناوەتی بە تایبەتی لە مێوژەڕەشان بە سوودترە.

ئەم کتێبە بە شێوەیەکی کلاسیکی نووسراوە، وەك خۆی دەڵێ دز و دزشاو تێکەڵ بە یەك بووە، خوێنەر ئەگەر بە خوێندنەوەشی ماندوو بێت، با بۆڵەبۆڵ بەسەر کاك (فەقێ)وە نەکات، بابێت دز و دزشاو تێکەڵ بە یەك بکات، ئەوسا هەوڵ بدات لێکیان جیا بکاتەوە، ئەگەر شتێکی وای کرد، هەق بە دەستە، گەرنا کەس لە کەس!

ئەم کارەی جوانەی کاك فەقێ بۆ ئێمە و نەوەی داهاتوو، جێگەی رێز و پێزانینە. خۆزیا لە هەموو ناوچەکانی دیکەیش چەند کەسێك هەبووانە وەك کاك فەقێ ئەم مێژووەیان نووسیبایەوە... خۆزیا حکوومەتیش تۆزێك مەیل و سەلیقەی ئەم جۆرە کتێبانەی هەبووایە و هەر ناوچەیە و چەند کەسێکی ڕاسپاردبا، بۆ ئەوەی هەروا بە ئاسانی مێژووی زارەکی چەندانساڵی ڕابردوومان لە دەست نەچێت.

من لە پێداچوونەوە و خوێندنەوەی ئەم کتێبە چێژ و سوودێکی زۆرم وەرگرت، تەماخوازم ئێوەش لەم سوود و چێژە بێبەش نەبن.

حەیدەر عەبدوڵڵا

هەولێر

١٥/ ٦/ ٢٠١٤

# پێشەکی

گوندێك مەلایان نەبوو، بە کەڵەشێریان دەگوت مەلا... کەچی من پەنجا ساڵە فەقێمە و هێشتا هەر نەبوومە مەلا !

بەڵام ئەوجارە دەمەوێت ببمە مەلا، ئایا دەبمە مەلا، یان نا؟ ئەوەشیان دیار نییە. گرنگ ئەوەیە مرۆڤ بێ هیوا نەبێت. بە کەسێکی لای خۆمان دەڵێن: فلان پیربووی، وەختی مردنت نزیك بووە، لە وەڵامدا دەڵێت:"پیاوی باش، قسەی خوش نازانی، قسەی ناخۆش ما دەکەی؟ ئەمن هێشتان کام لۆ ماراتی (ماڵاتی) نەکێشایە مردنێ چ!". ئەو کاتەی منداڵان لە قوتابخانە بوون، من گاوان بووم - دواتر هۆی دابرانم لە قوتابخانە باس دەکەم- لە تەمەنی دەساڵی بوومە تاقانەی ماڵەوە، باوکیشم کوێر بوو. من دەبووایە کار بکەم بەو تەمەنە نانێك بۆ خانەوادەکەم پەیدا بکەم، کە ئێواران لە لای گاران دەهاتمەوە، دەچوومە لای منداڵاتی پۆلی یەك، ڕۆژانە چییان دەخوێند بە منیشیان دەگۆتەوە، بەو شێوەیە هەندێك پیت فێربووم، بۆیە نووسینەوەی یاداشت بۆ من و کەسانی وەك من زۆر قورسە، بێ کەموکورتی نابێت، چونکە ئاستی وشیاریمان لە ئێستا و ساڵاتی زوو وەك پێویست نەبووە، یان یا داشتەکانمان ڕۆژانە بە وردەکارییەوە بە شێوەی سەعات و ڕۆژ و مانگ نە نووسراون. لەبەر سەختیی ژیان و ڕووداوە جەرگبڕەکان بە بەردەوامی نەپرژاوینە سەر یاداشت نووسینەوە، کە بەدوای تەمەنی دوور و درێژدا شۆڕ دەبیەوە زۆر شت نایەتەوە خەیاڵت، بەتاییەتی کات و ڕۆژو مانگ و ساڵ ناوی دۆست و برادەران ... دیارە نووسینەوەیان باشترە لە نەنووسینەوەیان، ئەگەر هەموومان ئەوەی بە بیرمان دێتەوە بینووسینەوە ڕۆژێك دێت کەسانێکی شارەزا بە دواداچوون بکەن و گوڵبژێریان بکەن، کە بێ گومانم مێژوویەکی ڕێکوپێك دەدۆزرێتەوە بۆ گەلەکەمان، چونکە دەکرێت مێژوونووسان ئاگایان لە هەندێك وردەکاری ڕووداوەکان نەبێت، دەتوانن لە یاداشتەکان بە شێوەی کۆکردنەوەی زانیاری هەواڵگری، سوود وەرگرن. من هەندێك و فلان وفیسار هەندێك، ئیتر ئەو بابەتانە لێك نزیك دەبنەوە راستی ڕووداوەکان دەردەکەون. ئەگەر هەموومان هەوڵبدەین دەکاتە خەرمانێك، بە مەرجێك وەك خۆیان باس بکرێن، شەرت نییە ئێمە لە ڕێزمان و ڕستەسازی شارەزابین.دەکرێت خەڵکی شارەزا دەستیان تێ بگێڕێ و ترش وخوێیان بکات، نەوەکانمان وەك ئێمە بۆڵە بۆڵ لەپێش

خۆیان ناکەن... ویستوومە لەگەڵ یاداشتەکانی خۆم وا بکەم هەندێك ڕووداوی مێژوویی کە پرسیارم کردووە و بۆیان گێڕاومەتەوە و بەسەرهات و بەشێك لە فۆلکلۆری خۆشناوەتی ئەرشیف بکەم، دەکرێت خەڵکی تریش ئەوکارەی کردبێت، یان بەجۆرێکی تر شت نووسرا بێت، بۆنموونە: لەو ماوەیە نووسراوێکم خوێندەوە برادەرێکی بەردەڕەش دەستی خۆش بێت چیرۆکێکی فۆلکلۆری لەسەر مام ڕێوی و مریشك بلاو کردووەتەوە، بێگومانم ئەوچیرۆکە بە ئەسڵ هیی خەڵکی دۆڵی شلۆرتیە، وردە وردە بەخۆشناوەتیدا بلاو بووتەوە و دواتر کەوتووەتە ناو خزمانی سورچی و لە کۆتاییدا گەیشتووەتە لای بەردەڕەش. واتە مەرج نییە ئەو بابەتە فۆلکلۆریانەی کە من کۆم کردونەتەوە هەموویان موڵکی خۆشناوەتی بن، ئەو بە سەرهات و ڕووداوانە، موڵکی من نین، بەڵکوو موڵکی گەلن. من و ئێوەش میراتگری ئەو گەلەین بۆمان هەیە بەموڵکی خۆمانی بزانین و وابکەین لە فەوتان نەجاتیان بێت. بە مەرجێك وەك خۆیان دەستکاری نەکرێن. دەشبێت موڵکی گەلانیش بن بەهۆی داگیرکاری و بەهۆی سەربازانی کورد لە زەمانی عوسمانییەکان کە سەردانی زۆر وڵات و شوێنیان کردووە، یان بە هۆی بازرگانی و حەجکردن، ڕووداوەکانی ئێمە بۆ ئەوان چوبێت، وە بەپێچەوانەوەش. هەندێك لەدەقەکان وەك زاراوەی خۆشناوەتی نووسراون، واتە چۆن گوێم لێبووە وام نووسیون، بەئەمانەتەوە، وەك خۆی نووسیومن. ئێمە لەخۆشناوەتی وشەی (نەکەم)، بەکاردێنین لەجیاتی دەکەم، ماڵ دەکەینە (مار) واتە (ر) لە زۆرشوێن بەکاری دێنین لەجیاتی (ڵ)، ئەگەر لە وشەیەك تێنەگەیشتی، بەشێك لە (ر) ەکان بکە ( ڵ ) لەوانەیە تێی بگەیت، (هێ )ش زۆر بەکاردێنین وەك: (ئەوێ هێ)، (ئێراهێ)، (دارێ هێ)، (کانیێ هێ)، (ڕووبارێ هێ)، (چیاێ هێ) ،...هتد .لەوانەیە ئێمە: (خار)وخوارزایەتیمان لەگەڵ خزمانی هیندی هەبێت، بۆنا؟

بەداخەوە نەم توانیوە هەموو ئەوشتانە بنووسم ئەوەی زانیومە و ئەوەی دیومە و ئەوەی گوێم لێبووە، واتا: خۆم لەزۆر شت لاداوە، چونکە دەورووبەر ڕێت پێ نادات، ئەگەر ئێوە بیر لە بابەتێك دەکەنەوە، ئاماژەی پێ نەکرابێت، لە خۆشناوەتی خۆم لێ لاداوە، بەتایبەتی کوشتن و خنکاندنی خوشکان لەسەر دیاریکردنی هاوسەرێك بۆ ژیان، کە مافێکە لە هەموو یاسا ئاسمانی و زەمینییەکان ڕێگەی لێ نەگیراوە، بەڵکوو هاندەریشن، کەچی ئێمە لە کوردستان وخۆشناوەتی پێمان ڕەوانەدیون. لەخوا بەزیاد بێت ئێستا باشترە و بەرەوباشی دەچێت. هەربۆیە ئەوشتانەی دەورووبەرم لەو ڕۆژگارە ڕێم پێ نادات ئەوەی زانیومە و گوێم لێ بووە و ئەوەی دیومە بنووسمەوە

بڵاو ی بکەمەوە، نیازم هەیە بیان نووسمەوە بڵاویان نەکەمەوە، لەشوێنێکی باش بیانپارێزم بۆ ڕۆژگارێکی تر، سەردەمێکی تر، خۆشم لە هەندێك وردەکاری پێشمەرگایەتی و تیپی (٨٣) هەوریێ لاداوە، لەبەر ئەوەی کاك (ئەحمەد هەرتەلی ) بە وردی باسی ڕووداوەکانی کردوە ... ئەم ویست دووبارە باس بکرێتەوە، ئەو لە منیش وشیارتر و بەزەینترە، ئەمن بڕەك هێرم.دەست خۆشی لێ دەکەم، کاك ئەحمەد هەرتەلی بەراستی پیاوێکی نیشتمانی و پشودرێژ و پاك بووە، لە ژیانی پێشمەرگایەتی و کۆمەڵایەتی..تاد.

ئەوەی زۆر ئەزیەتم پێوە دیوە، دەبووایە خۆم لە رشتەی مرواری دووربگرم، یادی مامۆستا مەلا (سەجادی)بەخێر، ئەو لە دەرگای هەموو ناوچەیکی داوە، لەوانەیە ئەگەر مامۆستای بەرێز ئەوکارەی لەڕابردوو نەکردبا، ئێستاش من و زۆری وەك من ناوێراین دەست بۆ ئەو بابەتانە ببەن، هەزار ناو ناتۆرەیان لە دوا دروست دەکردین، کەوابوو هەموومان قەرزاری مامۆستا مەلا (سەجادی)ین، باوەڕیشم وایە هەندێك شتی مامۆستا سەجادی تێکەوتووە، بە ئەنقەست شتەکانم تیکەڵ و پێکەڵ کردووە، بە بۆچونی خۆم پێم وابووە واباشترە، بۆ ئەوەی خوێنەر ناوە ناوە خەندەیەك بیگرێت و دڵ خۆشبێت و لەخوێندنەوە بێزار نەبێت.

خاڵێکی گرنگ هەیە ئەمەوێت ڕەچاوی بکەن، پێم باش نەبووە فێڵ لەخۆم و ئێوەی ئازیزیش بکەم، کەسێك لە رووی رێزمان و وشە پاکی بکاتەوە و بە ناوی خۆم بڵاو بکرێتەوە، نەخێر ئەوە منم بەهەموو کەموکورتییێکەوە، لۆمەی ئێوەش لەسەر چاوان، من من و جەنابیشت تۆی، واتە جیاوازیمان هەیە لە هەموو ڕووێکەوە، ناکرێت من وەك جەنابت زیرەك بم!

دەربارەی ناونیشانیش هەموو ناوچەیەك بەشتێك بەناوبانگە، دەشتی هەولێر و حەیران و گەنم وجۆ.. گەرمیان و قەتار و ئەڵڵاوەیسی ... هەورامانیش بە هۆرەو گوێز و کلاش... زاخۆ و دەوروبەری رانك وچۆغەر، خۆشناوەتیش تری و دۆشاو وەك دۆشاو رۆن و بەفر و دۆشاو قسەیەکمان لەسەرە دەڵێن: خۆشناو چایەی بەدۆشاوی دەخۆنەوە ! کە باسی دۆشاو بکەی خۆشناوەتیت وەبیردێتەوە، کەباسی خۆشناوەتی بکەی دۆشاوت وەبیردێتەوە .. دۆ و دۆشاو تێکەڵەیەکی سەیری لێ دروست دەبێت، بابەتەکەی منیش هەمەچەشنە، وەك دۆ و دۆشاو خۆی لە یەك دەدات وخۆی لێك نادات، بۆیە ئەو ناوەم دەستنیشان کرد.

فەقێ ڕەسوول شێخ وەسانی

٢/٢/ ٢٠١٤ بالیسان

# بەشێك لە دۆڵی خۆشناوان (دۆڵی بالیسان)

دۆر یان دۆڵ بەو شوێنە دەوترێت کە دەکەوێتە نێوان دوو چیا، دۆڵی بالیسان دەکەوێتە نێوان شلرۆچکەی شکارتە و ناحیەی خەلیفان وە ناوی جیاجیای هەیە، وەك: دۆڵی ئالانەو هەروتیان، دۆڵی بالیسان،پشت گەریان، ئەو دۆڵە دۆڵێکی بە پیت و بەرەکەت بووە لە ڕوویی کشتوکاڵ دۆڵەکە پڕە لە کانی و ڕووبار بۆ کشتوکاڵ سوودی زۆری لێ وەرگیاوە، لە ڕوویی بەخێوکردنی ئاژەڵداری زۆر لەبار بووە، وەك هەبوونی پوشوپاوان و دارستان و شاخی زۆر و بەرز و نزم و ئەشکەوت و ڕازو ڕەوەز، کەوابوو لەبار بووە بۆ ژیانی مرۆڤ لە ڕابردوودا. دۆڵی بالیسان ناوچەیەکە لە خۆشناوەتی، هەرچەندە من شارەزاییم لە شارستانێتی کۆن نییە، دیارە هەندێك شت بەبیرکردنەوەو سەیرکردن، شتێکی کەمت بۆ دەردەکەوێ وەك هەبوونی ئاو و دارستان وشاخ و ئەشکەوت و بچووك، کەوابوو شاخ و دارستان وئاژەڵی کێوی وئەشکەوت و ئاو، وا دەردەخات لە کۆنەوە مرۆڤ لێرە ژیاوە. پێداویستیی ژیانی لەباربووە، پێداوستییە سەرەکیەکانی هەبووە، لە ڕوویێکی تر سەیر دەکەی دەیان شوێنی نیشتەجێبوونی کۆن دەبینی، وەك: گوندی شەڕکان و دەوروبەری، سەرەزێ و دەوروبەری گوندی بناویە، دۆڵی مەلەکان و قەڵاتی سەرکۆڕانە گادەڕێی مەلەکان . گوندی هەروتەکەون ناوەکەی بەخۆوەیە گوندێکی زۆر کۆنە. کانی کەرەك و قەڵاتی ناوگوندی خەتێ، گوندی بلاروکاوەو دەوروبەری، گوندی زێنە بەرەو ڕۆژهەڵات، بالیسان و دەوروبەری تاکو دەگاتە گوندی کانی بەردو گورگان، لەنێوان سێ گۆشەی گوندی بێراوە وگوندی کانی بەرد وگوندی شێخ وەسانان و شارستانییەتە گەورەکەی نێوانیان، قسەش لەسەر کورد و رەگەزی کورد، کورد لەڕابردوو چی بووە؟ چۆن ژیاوە؟ مرۆڤایەتی هەمووی یەك رەگەزە، دابەشبووە بەسەر زمانی جیاجیا و گەلی جیاجیا کورد و ئاری و بەشێك لە مێژووی ئێران. بەشی ئێمەشی تێدایە، واتە هەموومان شارستانێتی ئێرانین، شکەستی ئێران وئێرانییەکان، شکەستی ئێمەش بووە، سەرکەوتنیان سەرکەوتنی ئێمەبووە، نزیکیمان لە ئێران وەك نزیکی زمان و ئایینی زەردەشتی و جیران و عادات و تەقالید و لەگەڵ یەك گونجاوە، زۆرشتی تر لەهەزار و یەك شت

لێك نزیکین، ئەوان فارس و ئێمەی کورد  لە کوردایەتی… دەی ناوی خوای لێ بینە و لەگەڵ فارسان براینە و لەیەك تورەبووینە، ئەوان لەماڵی خۆیان و ئێمەش لەماڵی خۆمان، هەربراش دەبین. ناوی ڕابردوو کاشی و لۆلۆوگۆتی و  ئەوانی تر. بێگومانم تێەیەك بووینە لە ناو کورد، من پێم وایە ئەگەر هەڵەنەبم  کورد لە ڕابردوودا  دوو تێەبووینە (لێلێ و- لۆ لۆ) وەك  ئێستا سۆرانی و کرمانجی ناوچەی سۆران  لۆلۆ  بووین، ناوچەی باکوور  لێلێ بووینە، ئەو لێلێ و لۆلۆش  لە لاوك زۆر باس کراوە، لاوك: بەشێکە لەپێناساندنی مێژووی ڕابردوو. نزیکیشمان لە خزمانی فارس زیاتر  لە دەوروبەری کرماشان بەرەو ڕۆژهەلات هەستی زیاتر پێ دەکرێت، ئەوەی ئەو قسەی منیشی زۆر پێ ناخۆشە دەتوانی بڵێت فارسەکان بەشێك بووینە لە ئێمە وردە وردە لێمان وەدوورکەوتوون، لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و دەوروبەری لەخوار( ۱۹۰۰ ) شتێك نەبووە بەناوی قەومیەتی هیچ گەلێك، بەڵکوو ئیمپراتۆر هەبووینە بەناوی ئاشووری و بابل وکلدانی و ئیرانیەکان و ڕۆمانییەکان …تاد. دەوڵەت لەناو چارچێوەیکی دیاریکراو نەبووە، سنووری دیاریکراو نەبووە. سنوور  بە بەهێزی و لاوازی  دیاربووە، شتێکیش نەبووە بەناوی قەومی - بەڵکوو پاوانخوازی و ئایینی  دەوریان هەبووە، وەك ململانێی ئایینی جولەکە و لەگەڵ ئایینە کۆنەکانی وەك: زەردەشت و ئەوانی تر. دواتر  مەسیحیەکان لەگەڵ جولەکە، دواتر ئیسلام لەگەڵ هەموویان، دواتر ململانێی مەزهەبیشی هاتەسەر. لەپەندێکی کوردی لەبارەی زستان دەڵێت: جومعە باری، شەموشی هاتە ئاری. بۆوە هەزاری بەرهەزاری.  بەشی زۆری ململانێکان لە ڕابردوودا ئەو کیشانەبووینە، بەتایبەتی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ودەوروبەری.

بەدرێژایی مێژوو ئیمپراتۆریەتی فارس لەکوردستان دانەبڕاون، کوردیش لەو شارستانییە غەریب نەبووە، ئەوەی کوردی لەشارستانیەتی ئیران دابڕیوە سەفەوییەکان و توورکەکان بووینە، سەرانی تورکانیش خەڵکی تورکیانەبووینەو میوان بووینە، دەکرێت بڵێین قەرەج بووینە، پێم وایە مەزهەبیش  کاریگەر بووە کە بەتایبەتی دوای بێ هێزبوونی ئیمپراتۆری ئیسلامی پارچەپارچەبوونی و پیدابوونی مەزهەب لەناو ئایینی ئیسلام، تورکەکان سوودیان لێ بینیوە، فارسەکان زیرەکانە توانیان تۆڵەی خۆیان لەعەرەبەکان بکەنەوە،لە  تۆڵەی رووخاندنی ئیمپراتۆریەتی فارس  تاکوو ئەمڕۆش  عەرەبەکان  لەترسی ئێران و ئیرانییەکان تۆقیون .

زیرەکی فارسەکان لەوەیە ململانەی ئایینی ئیسلام ناکەن، راستەوخۆ ناراستەوخۆ لەرێگای مەزهەبەوە، عەرەبیان تۆقاندوە. لەتۆڵەی رووخانی ئیمپراتۆریەتی ئێران لەسەردەستی ئیمامی عومەر.

لە جیاتی عەرەب لە رابردوودا تورکەکان لەژێر پەردەی مەزهەب توانیان خۆیان بناسێنن نەجیهان، تاکو ئەمڕۆش . دەتوانین دوو نموونەی زۆر بچووك بێنینەوە هەر ئەمڕۆ ڕانکوچۆغەرێك ئەمریکە و شەدەیێکی ریشدار لەسەری ببەستە و برۆ شاری بەغدا گوێبیستی دەیان پەلاری عەرەبەکان دەبییەوە، بانگت دەکەن (وەرووەرو کەکە)، گومانیشم نییە کەس بوێرێت بەجلکی کوردی بچێتەناو ئەستەمبۆڵ و دەوروبەری و بەئازادی بجوڵێتەوە. بەڵام دەتوانی بەوجلکانەسەرتان سەری ئێران بگەرێی و لە هەرکاتێك پیاسەی ناو تاران دەکەی رێزی تایبەتیشت هەیەو کەسیش بەغەریبت نازانێت، خۆشت بەغەریب نازانی وادەزانی لەهەولێری، لەرابردوو ئەگەر لەبەرململانێی نێوان سەفەوی و تورکەکان نەبیوبێ، گەلانی ئێران کەمترین کوشتاریان لەکورد کردووە، لەچاو تورك و عەرەب ئێستاش توندڕەوی لەناو گەلانی ئێران بەرانبەر بەکورد زۆر کەمە، ئەمەش بە بەراورد بە عەرەب و تورك...

کە دەوروبەرمان دەوڵەتی قەومییان دروست کرد، ئێمەلەبەرچەندان هۆ پێمان دروست نەکرا، ئەوەیان مەسەلەیەکی ترە دەشکرێت کاریگەری ئەو بۆشاییە بێت کە لەنێوان ئەودوو ئیمپراتۆرە، واتا فارس و تورك ناوەناوە دروست دەبوو، کورد هەر تیەو ویستویە حوکمڕانی خۆی بکات کەسیش ملکەچی کەس نەبووە، هەموویان خۆیان بە(میرمحێ) زانیوە . لەهەمان کات کورد کەوتۆتە نێوان دوو ئیمپراتۆری گەورەی ئەوکات .

باناوی خوای لێ بێنین دەوڵەتی کوردی دروستی بکەین، کەواتە با زۆرخۆمان هیلاك نەکەین و سەریش لەمنداڵەکانی خۆمان تێك نەدەین، نان ئەوە نانە، ئەورۆ لەخوانە. زۆرجار گلەیی لەمیرنشینەکان دەکەین لەسەر شەڕی ناوخۆ، نموونەی : ماڵباتی بابانەکان و میری کۆرە و ...تاد. ئەوە دوێنێ بوو، ئەدی ئەمڕۆ چ؟ ئەمڕۆ هەردوو بنەماڵەن لێ ژینەوە، سنوورەکان و دەستەڵاتیان هەمان شێوەی جارانە زۆرتریان کەمتر، من و ئێوەش تاوانمان هەیە، کە ئەوەندە چەپڵەیان بۆ لێ دەدەین! کێ تاوانباری یەکەمە؟ ئەوەیان مەسەلەیێکی ترە.

*** *** ***

بابێمەوە سەر باسی دەڤەری خۆم، لە مێژوونووسان بەرگوێم کەوتووە کەشارستانیەتێکی کۆن هەبووە، بەناوی گورگان، دواتر ون بووە و تا ئێستا نەدۆزرایەتەوە، شوێنێکیش هەیە لەنێوان سنووری هەرسێ گوندی: کانیبەرد ، بیاوەو ، شێخ وەسانان، پێی دەڵێن: گورگان و سماقە و قەڵاتگا، پاشماوەی مرۆڤ وجێی ژیانی یەکجار زۆری لێ دیارە، بەدواداچونێکی وردی دەوێت لەلایان خەڵکی شارەزا لەوکارە. ئەکرێت هەمان شارستانیەت بێت، ئەشکرێت وانەبێت. لەسەرتای نۆسەدەکان بڕەپارەیەك دیترایەوە، کەپارەی ئاشوریەکان بووە ، لەلایەن جووتیاران زێریش دیترایتەوە، وەك مام حسێنی کانی بەرد. لەگوندی کانی بەرد بەردێکی جوان لەسەر(کانی بووکرا) بووە تاتەنوێژ لەنزیك ماڵی قاسم وەك بەردە تراشاوەکانی ئەهرامەکانی میسر دەچوو. لەباب و باپیران زاندراوە کەوا شێخێر ئاوێکی گەورەی لێزاوە پێیان وتوە:( زێیی شێخێری) کەدەکەوێتە نێوان گوندی بێراوە و شێخ وەسانان وشاخی کەرێتە و ڕۆژهەڵاتی شێخ وەسانان، ئەوشارستانیەتە ئەو شاخەیان بەکار هێناوە بۆ دوا بەرگری، شاخێکی زۆر سەختە و چەند کۆرە ڕێیەکی تێدایە پڕە لەپارچە کوپی گەورە، دەکرێت لەو کوپانە ئاویان دابین کردبێت بۆ ڕۆژی تەنگانە، واتا: بۆ ئاو هەڵگرتن سوودیان لەهەڵگرتنی بەفر وەرگرتبێت، ئەوێ شوێنێکی لەبار بووە بۆ بەرگری، دەشتی بالیسانی بەتەواوی لێوە دیارە. دوو ئەشکەوتی لێیە، ئەشکەوتێکی تریان لەناو ئەشکەوت بۆی دەچێت، ئەشکەوتێکی لە سنووریەدەر قایمەکە یەك کەس دەتوانێت خۆی لە هەزاران کەس بپارێزێت، کەس ناتوانێت هیچی لەگەڵ بکات، گوندی بێراوە، زۆر کۆنە دایکی گوندانە، شوێنی نیشتەجێی کۆنی پێوە دیارە وەلە هەردوو چیوە، پاشماوە هەیە، نێوان هەرمك وزێوە و بەساڵاچوان دەڵێن جگە لەبێتواتە هەرمك کۆنترین گوندە، گوندێکی جیاوازە لەگەڵ دەوروبەر، هەرچەندە هەموولای شاخی بەرز بەرزە، بەزستانان گەرمترین گوندە بەفری لێ ناکەوێت، وهەردووشیە پاشماوە دەبینرێت، بێتواتەش هەرباسی ناکرێت من لە بەساڵاچوان بیستومە کە بێتواتە ئەوەندە گەورەبووە، بووکی ساڵی لێ بزربووە! ئایا ئەو میللەتە کێ بوونە؟ ئەوە کاری من نییە، لەو ناوچەیە من زۆرجار لە خەڵکی بەساڵاچوو، دوو ناوم بەر گوێ کەوتووە کەپاشای ناوچەکە بوونە، ئەوانیش، یەکەمیان: ناوی (لەندەهۆ)، ئەوەی تریان ناوی ( دێگە)، وە نەزاندراوە کێ بوونە؟ ئەکرێت ئەو سەرکردانە ئاشووری بووبن، ئەوەی زاندراوە کۆشکی (دێگە) لەلایەن زەینەفۆن گیراوە، شێوەی گیرانیشی بەو شێوەی خوارەوە بووە، دێگە زانیویەتی کە کەهێزێکی زەینەفۆن بەرەو قەڵاتی دێگە بەڕێوەن، هێزێکی زۆر دەنێرێتە

پێشیان، دەوروبەری قەڵاتیش بەگاجووتان دەکێڵێت و ئاوی لێ دەنێت بۆ ئەوەی قوڕ دەوری خۆی بپینێ، لەپێشگرتنیان لەشکری زەینەفۆن پێشڕەوی دەکەن شەڕێکی زۆرسەخت ڕوودەدات لەنێوانیان وبەرگری یەکەم دەشکێنن، شەڕ دەکەوێتە دەوروبەری قەڵات ماوەیەکی زۆر شەڕو بەرگری دەکەن، دواتر زەینەفۆن دەکەوێتە داتووسان هێزێکی بچووک دەنێرن بوودانووستان، ئەوانیش دەرگایان بۆ دەکەنەوە کە دەگەنە دەرگا شەڕ دەکەن، هێزێکی ئامادەشیان دەگاتێ و دەتوانن دەست بەسەر قەڵات دابگرن. (دێگە ) ژێرزەمینێکی لەناو قەڵات هەبووە بە ژێرزەمینەکەدا چووتە خوارەوە و ژێرزەمینیان بەسەردا ڕووخاندوە، گوایە (دێگە) ئێستاش تەرمی لە ژێرزەمینەکەیە،پاشماوەی هێزەکە بەرەوساو و سێۆکان دەچێت، لەقۆڵی دۆڵی شاورە و وەرتێ و گەرەوان شەڕبووە هێزەکەی زەینەفۆن لە هەموو لایێکەوە بەرەو سێکووچکەی چیای بێترخێن ،کارۆخ، ئاراسن، پێشڕەوی دەکات خەڵکیش بۆ خۆپاراستن لە هەموولایەک بەرەو ئەو ناوچە شاخاوییە سەختە دەچن خەڵکی ناوچەکە زۆر پشت بە گوێزکردنی بەردی گەورە دەبەستن، هێزێکی زۆری زەینەفۆن دەکوژرێت دواتر هێزەکەی زەینەفۆن بەسەریان دا زاڵ دەبێت یەکێک لە قسەکانی زەینەفۆن دەڵێت: دەبێت ئەوەندەیان لێ بکوژم تا دونیا دونیایە ئێسك وپروسکی مرۆڤ لێ نەبڕێت. لە بەرانبەر ئەو کوشتارەی لێی کراوە من ئەوپرسیارەم لە ڕەوەندان کردووە، لە وەڵام: گوتویانە ناوەناوە کە لەسەرمان بەرچاوکەوتووە یان لە هەندێك شوێن هەست بە دەنگی ئێسکخواردن دەکرێت، کە مێگەلەکان دەبەینە ئەو شوێنە تامی خوێی لێ دەکەن هەست بەکرمەکرمی ئێسك دەکەین، لەلایەن ئاژەڵان قەڵاتی دێگە دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی بالیسان بە چەند سەد مەترێك لێك دوورن.

ئەو زانیاریانەم لە( خار فەقێ ئەحمەد شێخ وەسانی)یەوە وەرگرت کە بە شێوەی بەند باسی شەڕەکەی زەینەفۆنی دەکرد. باسی ئەوەشی بۆ کردم ئەو هێزە زۆر شاخەوانیش بووینە وەك خۆمان بەندەکانی شەڕی زەینەفۆنم لەگەڵ دەیان بابەتی فۆلکلۆری جۆراوجۆر و دەیان چیڕۆك و بەسەرهات و شتی مێژوویم لە سندووقێکم شاردنەوە، لە شوێنێك لەسەروی (کانیەریخ)، لە گوندی لەشێخوەسانان، تاکو پایزی (١٩٨٨) زریان شیخ وەسانی و بڵند شێخ وەسانی بەپاریزانی لە ناوچکە دەژیان، سەردانم کردن بە بڵند شێخ وەسانیم گوت: ئەوکەرستەیەمولکی گەلەو نوسخەیەکی لەبەریگرەوە و بیبە بۆ ئێران با نەفەوتێت، قەولی پێ دام دواتر کارەکەی نەکرد،

بەداخەوە هەموویان فەوتان، کە نزیکەی (١٠ ) ساڵ خەریکی کۆکردنەوەیان بووم دوای بەدواداچوونێکی زۆر، هەر ئەوەندەم لەبارەی ئەو دوو گەورەپیاوە زانیوە کەلەسەرەوە باسمان کردن.

ناوی دێگە لەکوردستان غەریب نییە، وەك گوندەکانی (دێگەرە)، واتە (دێگە) و (دێگەرە) نزیکن لەیەك. ئەوباسە بۆخەڵکی شارەزابە جێ دێڵین، نامەوێ بە وردی باسی خۆشناوەتی بکەم، چونکە زۆرکەسی زیرەك و شارەزا بە وردی باسیان کردووە، پێویست بەدوو بارەکردنەوە ناکات .

*** *** ***

خەڵکی کۆن لە خۆشناوەتی بە پێنج قۆناغ مردوویان ناشتووە، دیارە ئەمەش نیشانەی ئەوەیە خۆشناوەتی زۆر لەمێژە مرۆڤی تێدا ژیاوە، ئەکرێت لەبەر چەند هۆیەك بوو بێت، چونکە نەگەرمیانە نە زۆر کوێستانە، هەموو پێداویستیەکی ژیانی لێ بووە کە پێشتر ئاماژەم پێ کرد، زۆربەی ناوچەکانی کوردستان هاوشێوەی دۆڵی بالیسان زۆرتر یان کەمتر. قۆناغی یەکەم : مردووەکانیان لەئەشکەوت ناشتوە لە زۆربەی ئەشکەوتەکانی شێخ وەسانان و دەوروبەر ئێسك و پروسکی مرۆڤ دیتراوە، بەتایبەتی لەدوای ساڵی ١٩٩١ زۆربەی ئەشکەوتەکان هەڵدرانەوە، بەمەبەستی دۆزینەوەی زێڕ و کەلوپەلی تر. بەشێکی هۆیەکەی ئەوەبوو خەڵکی توشی نەبوونیەکی سەخت ببوون، لەدوای راپەڕینی گەلەکەمان دژ بەداگیرکەری بەعس کورد قسەیەکی هەیە، دەڵێت: " لە هەژاری بەدوای کەونە قەردان دادەچێت، لە دوژمنداری بەدوای کۆنەخزماندا دەگەڕێت" بۆ نموونە لە شێخ وەسانان، لە شاخی ( کەرێتە)، لەدامێنی ئەشکەوتە (زیر) ئەشکەوتێکی بچووکی لێیە کەسێکیان لەناو ناشت بوو، سێ کوپی بچووکیان لەگەڵ دانا بوو، کوپەکان زۆر سەرەتایی بوون، تەنها قوڕ بوون، بەکورە سوور نەکرابوونەوە.

لە زۆربەی ئەشکەوتان مردوو ناشتن هەبووە. قۆناغی دووەم : بەکۆمەڵ نێژراون، قوڕتێکی گەورەیان لێداوە هەر مردوویێکی لێیان مردووە فڕێیان داوەتە ناو ئەو قۆرتە. لەگوندی کانی بەرد شوێنێك بەدەرکەوت کە پڕبوو لە ئێسك و پروسکی مرۆڤ، لە زۆر شوێنی تریش دیتراوە، ئەکرێت ئەوگۆڕە بەکۆمەڵینە یان بەهۆی نەخۆشی کۆلێرە کەپێیان دەگوت تاعوون، یان بەهۆی شەڕ بووە کە بە کۆمەڵ نێژراون یان وایان پێ پەسند بووە مردووەکانیان بەو شێوەیە بنێژن . قۆناغی سێیەم: هەر بنەماڵەیەك ئەشکەوتێکی بەدەست لێداوە مردووەکانیان تێدا ناشتووە بەردێکی گەورەیان بەدەمی ئەشکەوتەکە ناوە لەترسی ئاژەڵی گۆشتخۆر ئەو گۆڕستانە لە باکووری گوندی خۆرانی لای خۆمان بەرچاو دەکەوێت. هەندێك کەلوپەلی سەرەتای مردووەکە لەگەڵی ناشتراوە،

وەك گوارەی مز و مۆری و شتی لەبەرد دروست کراو. ئێستاش بنەماڵەی بەرێز کاکی (هیوانێ )، مردووەکانیان لە ئەشکەوت دەنێژن بەشێوازێکی تر. دەبێت هەرکەسە و قەبری خۆی ئامادەکات، ئەو ئەشکەوتە هەیبەتێکی تایبەتی هەیە. قۆناغی چوارەم : لاشەی مرۆڤ لە شوێنێك داندراوە تاك و گۆشتەکەی خوراوەی دارزاوە، دواتر پەیکەرە ئێسکیان لە ناو کوپ داناوە و نیوەمەتر کوپەکەیان لەژێر خاك داناوە، کوپێکی بچووکیان لەگەڵ داناوە دواتر پارچەکوپێکی لاکێشەیان لەسەر داناوە، ئەوەیان کوپی خڕن . جۆرێکی تریان لاکێشەن مردوویان بەگۆشتەوە لەناو ناشت وە ئایە ئەو کوپە بچووکە ئاوبووە یان خواردن بووە ئەوە کاری من نییە! ئەو گۆڕستانانە یەك جار زۆرن لە هەموو گوندەکان بۆنموونە لەبالیسان زۆرن...

لەسەر دووڕیانی بالیسان ڕۆژێکیان من و ساڵح حەیدەری بەڕێوەبەری ناحیەی بالیسان و حەسەن مەلازادەی شارەوانی بالیسان، سەیرێکی ئەو گۆڕانەمان کرد، شتێکم بەرچاوکەوت لەژێر کەللەسەرێك لوولەیەکی مزبوو درێژییەکەی نزیکەی دە سانتی مەتر دەبوو زۆرجوان نەخش ونیگار کرابوو پارچە ئاسنێکی بەقەبارەی سوژن لەگەڵ دابوو سەرەکەی تیژبوو کە سەیرم کرد لێی ورد بوومەوە، بۆم دەرکەوت کەرستەی مژینی شوێن پێوەدانی مارو دووپشك بوو زۆر جوان نەخش و نیگار کرابوو، زۆرکەس ویستی لێم بکڕێت نەم فرۆشت دامەدەست برادەرێك بەناوی کاك مەجید برای شەهیدپۆلا بیبات بۆ مەتحەفی سلێمانی ئایا بردی یان نا؟ ئۆباڵ بە ملی ئەو!

لەکاتی دروستکردنی بینایەی قوتابخانەی ناوەندی بالیسان، دەیان گۆڕی لەناو کوپەنێژراو بە دەرکەوتن، لەدۆڵی مەلەکان گۆڕستانی ناو کوپە هەیە...

لە دەوروبەری کانی کەڵەك کەدەکەوێتە باشووری گوندی خەتێ گۆڕی کوپە یەکجار زۆرە، واتا: لە دەوروبەری زەوی حاجی سەعیدی (گوندی خەتێ)... مردووەکان کێنە سەر بە چ نەتەوەیەکن، لەسەر چ ئاینێکن، ئەوەشیان کاری من نییە لێی نازانم قۆناغی پێنجەم: وەك خۆمان ناشتاون. لە گوندی کانی بەرد لەشوێنێکی بەرز لەڕۆژ ئاوای ئەو گوندە شوێنێك هەیە بەناوی گۆڕێ سەنەمێ، ئێمە لە خۆشناوەتی بەشوێنێکی پان دەڵێین( گۆڕ) واتە: گۆڕ بەماتای شوێنێك دێت پانتایی بێت (سەنەم)، واتە: ( بت) ئەوە نیشانەیە لە زوو بتپەرستن هەبووە لەناوچەکە، دەیان ناوی ئایینی مەسیحی لەناوچەکەمان هەیە. لە بالیسان گردی (شلێمۆن) هەیە جۆگەی( دێرێ ) کە دوو ناوی مەسیحین، لە شێخ وەسانان ئێستاش زەوی هەیە بەناوی

زەوی قەشەی، لە گوندی باشوورە لە لەنێوان باشوورەی سەرێ خوارێ شارستانییەتێك هەیە شوێنێکی لێیە بە ناوی دێر پاش ماوەی ماوە خەڵکی ئەوێ پێی دەڵێن:( دێرۆك ) زۆر جار پاش ماوەی پەیکەریش لەلایەن جووتیاران دیتراوە، لەکاتی زەوی کێلان، گوندی هەرمك هەیە، ( مۆتە ) شاخێکە لە نزیك گوندی هەرمك، ( هەرمك و مۆتە ) واتە: ( هەرمۆتە ) کە ناوێکی مەسیحیە، مۆتە بەزمانی برا مەسیحیان واتە: قاشکەهەنار کە سەیری مۆتە دەکەی وەك قاشکەهەنار وایە.

*** *** ***

پەیکەرێکی حەزرەتی مەسیح دۆزرایەوە، لە نێوان گوندی کانی بەرد و گوندی گورگان پەیکەرەکە لە قەبارەی بستێك بوو، فرۆشتیان ئاو و ئاو چوو. جاران بەدۆڵی بالیسانیان گوتووە: دۆڵێ ( قەشان)، یان نێوان شکارتە و میرگەسەر بەدۆڵێ قەشان بەناوبانگ بووە واتە: قەشەی زۆری لێ بووینە وەدەتوانین پشت بەحەیرانێك ببەستین کە دەڵێت: (حەیران لە دۆرێ (دۆڵێ) قەشانێ قۆشمەی سواران گیشتە بالیسانێ، رەشە رەحانم چاندن لەتریانێ، سۆرەگور گەیشتنە هەیوانێ). جاران لە پێش خان هەیوانێکیان دروست دەکرد. گومانی تێدا نییە ئاشووریەکان زۆر لەو ناوچەیە حوکمڕانییان کردووە وە پێش عوسمانییەکان خۆشناوەتی وەك زۆربەی کوردستانی باشوور لە ژێرحوکومڕانی ئێرانیەکان بووە لە سەردەمی عوسمانییەکانیش خۆشناوەتی وەك زۆر شوێنی تری کوردستان ماوەیەك لەدەست فارسەکان بووە و ماوەیەك لەدەست تورکەکان بووە لەو بینەوبەردەش خۆشناوەتی باجی داوە وەك زۆر ناوچەی تر. هەر کاتێك شەڕ روویی دابێت لەنێوان ئەو هێزە زەبەلاحانە کوردستان و ناوچەکەی ئێمەش بووە ئاردی نێوان دوو بەرداشە هاڕدراوە زۆرجار ناوچەکەمان بۆ ماوەیەك سەربەتورکیا بووە بۆ ماوەیەك سەربە فارسەکان بووە، دواتر بەیەك جار کەوتەدەست توورکەکان کە کوردستانیان کردە دوو بەش سنووریان جێگیر کرد.

*** *** ***

دیارە بۆماوەی چەندان سەدە تورکەکان خۆشناوەتیان داگیر کردووە، وەك سێ بەشی کوردستان چەندان سەدەیەك حوکمڕانی کوردستانیان کردووە، خۆشناوەتیش وەك هەموو ناوچەکانی کوردستان بە درێژایی ئەو هەموو ساڵە لە ژێر باری باج و سەرانەی عوسمانییەکان ناڵاندوویەتی... دیارە ژیان و گوزەرانی جووتیاران لە سەردەمی میرنیشینەکان باشتر نەبووە، میرنیشینەکان لەبەر شەڕو ململانێی نێو خۆیان بەتایبەتی میری سۆران و بەبەکان کە رەت

رەحەتیان لەخۆشناوەتی بووە چاوپۆشی زۆریان کردوە لە دەرەبەگەکان بۆ ڕازی کردنی دەرەبەگەکان من پێم وایە پێویست ناکات بۆ میرنیشینەکان بگرین چونکە میرنیشینەکان شتێکیان نەکردووە بۆکورد وەبەرنامەیەکیشیان نەبووە میرایەتیشیان هەر ئەوە بووە دەرەبەگێکی دەست ڕۆیشتوو بوونە ودەستەڵاتیان بەسەر میرەبچووکەکان هەبووە، بەدەر لە بنەماڵەی بەدرخان شتێك نەبووە لەلایەن میرەکوردەکان بەناوی ڕێکخستنی کورد و بنیاتنانی دەولەتی کوردی، عەبدولرەحمان بەدرخان جێگای ئومێد بووە بۆ بنیاتنانی دەوڵەتی کوردی ..دەشزانین بە دەستی خۆفرۆشانی کورد تووشی چ کارەساتێك بوو، من وەك جووتیارێکی نەخوێندەوار، پێم وایە تاکو بەریتانییەکان نەهاتن باپیرانی ئێمە بیریان لەیەکێتی نەتەوەیی کورد نەکردیتەوە دواتر لەخەو ڕابوون یان دووژمنان ئەوەندە سەرسەخت بوونە، دەرفەتی هیچ شتێکیان نەداوە! ئەتوانین نموونەیەك بینینەوە، ماڵی ڕەشیدبەگی بێتواتە لە کاتی هاتنی بەریتانیا، لە ناوچەکەمان پێشوازییان دەکەن تاکو گوندی (سوێرە)، کە سنووری حوکمڕانیی خۆیان بووە، بەڵام لەبەرچاویان بە تۆپوو تەیارە و سەربازەکان دەکەونە کوشتن و سووتاندنی گوندەکان و خەڵك بەبارمتە گرتن، کە هەردوو عەشیرەت یەك عەشیرەت بوون ناوچەی بالیسانیش خزمەکانی خۆیان حوکمڕانییان دەکرد، کوشت وبڕین بە بەرچاوی خۆیان ئەنجام دراوە، بەشێك لەوان خزمی خۆیانبوون بێدەنگ دەبن کەوابوو مشتێك نموونەی خەروارێکە!

پێم وابێت ناوچەکانی تریش لە ئێمە باشتر نەبوونە، کەوابوو کورد کوردایەتی نەکردووە، پیاوی زۆر شارەزا و ئازاشمان هەبوونە، بەڵام لە خزمەتی مێژووی گەلانی دەوروبەرمان دابوونە. ئەو مەسەلەیە چییە؟ سەری لێ لێ دەرناکەم ئەکرێت سەرکردەکانمان وەك میرانی دووێنێ نەکەن مێژوویەك بۆخۆیان تۆمار بکەن بۆ ئەوەی نەوەکانمان نەفرەتیان لێ نەکەن.

پێویستە بەرژەوەندیی گەل و نیشتمانمان لە هەموو شت لا گەورەتربێت، لەجیاتی ڕق وکینە یەکترمان خۆش بوێت، ئەگەر ئێمە یەکترمان خۆشنەوێت لە دەوروبەرمان کەس حەز ناکات ئێمە هەبین.من نەنووسەرم، نەمێژوونووسم، بەڵام پێم سەیرە ئەوانەی خۆیان بە نووسەر و مێژووناس دەزانن، ناڵێم نازانن دیارە نایانەوێ ڕاستی دەرکەوێ، ئەکرێت ئەوەشیان لەدڵسۆزی بێت، بەڵام سەرلێ شێواندنی نەوەکانمانە... میرەکانمان زۆر دووژمنانە دژایەتی یەکتریان کردووە کە دووژمن پەلاماری یەکیانی دابێت ئەوان هاوکاری دووژمنیان کردووە، بۆ لەناوبردنی یەکتر.

جەنابی ئەحمەدی خانی، لەو کاتەوە هاوارەکات کەسی دڵسۆز نییە، لەناو کوردان وەك سەرکردەیێك دەرکەوێ و کوردایەتی بکات، وەنموونەی ساڵەکانی (١٩٨٨) بەسەتان میری کورد حەمبالەبەری دووژمن بوون بۆلەناوبردنی شۆڕشی کورد پیاوم دەوێت بڵێ وانییە، باوەڕ ناکەم میان (١٧٠٠) تاکو (١٨٥٠) ساڵ پێش ئێستا لە میانی ساڵەکانی(١٩٨٨) وشیارتر و شۆڕشگێڕتر بوون، ئەقڵ نای بڕێت .

دوونێ بوو میەکانمان زۆربەیان لە ئەنفال و جینۆساید کردنی گەلەکەیان پێشڕەو بوون، ژن و کچی کوردیان فرێدەدایە ناو ماشینەکانی دووژمن، ئەوە خەڵکی خۆشناوەتی و دەشتی کۆیە و کارەساتی مەرگە وەدەوروبەری و گەرمیانی پان وبەرین و قراغ و ناوچەی شوان و شێخ بزێنی و بادینان و دەیان شوێنی تر، کە بە چاوی خۆیان میە کوردەکانیان دەدیتن کە زۆر ئازابوونە لە گرتنی کچ و ژنە جووتیاران و دانەدەست سەربازانی داگیرکەر نیشانەی ئازایاتییان بە بەرزکی وە دەکرا، شانازییان بەو نیشانانەوە دەکرد، ئێستاش بەداخەوە بەشێکیان بەرپرسن لەو ناو حکومەتی هەرێم بە فرسەت وەرگرتن لەملمڵانێی پارتەسیاسیەکان لەسەر دەستەڵات وەرگرتن.دیارە بۆ ماوەیەکی زۆر شەڕ و شۆڕی بابانییەکان و میانی سۆران ناوچەکەی ئێمەشی گرتووەتەوە بەبەکان یان بابانیەکان لەلای ئێمە بە (بەببە) بەناوبانگن، زیاتر حەزیان لەشەڕی چیا بووە، لەشەڕی چیا سەرکەوتوو بووینە.

میانی سۆران حەزیان لەشەڕی دەشت بووە، سەیرە زۆرجار ڕابردو دووبارە دەبێتەوە، بە درێژایی شەڕی بابانیەکان و میانی سۆران بالیسان سنووریان بووە، پاشەکشە و چونەپێشیشی تێدابووە، بە درێژایی شەڕی پارتی و یەکێتی بالیسان سنوور بووە و شوێنی پێکدادان بووە، بەبەکان لەسەروی شێخ وەسانان قەڵاتیان هەبووە، کە دەکەوێتە دامێنی ڕێی (دەرەدار) سەد مەترێك لەسەرووی کانی (مام شێرەکە) یە دوای ڕووخانی میرنیشینی بابانییەکان، کەسێکی شێخ وەسانی بەناوی (ئەحمەد ) لەبنەماڵەی دەرمانیان بۆماوەی چەندان ساڵ ماڵی دەباتە ناو ئەو قەڵاتە، دواتر چۆڵی دەکات و وردە وردە دەڕوخێت، ئێستا پاشماوەکەی ماوە لەکاتی ئەحمەد نشتەجێیە لەقەڵاتێ بەبەکان، میرێکی خۆمان لەسەردانی مەلەکان دێتەوە و لادەداتە ماڵی ئەحمەد ئەوانەی لەگەڵ میر بووینە نزیکەی (١١ ) کەس بووینە ئەحمەد داوەتیان دەکات و دەڵێت شەویش دەبێت لەلای من بن، میریش دەڵێت ئەحمەد شەو نووینت هەنە؟ ئەحمەد دەڵێت: میان خەمت نەبیت، لەکاتی نووستن ئەحمەد( ١١) شەونووین دێنێت بەڵێف و دۆشەك و بالیف،

**هەمووشیان خوری بووینە و بەرگیشیان لە ڕەنگی سۆر و زەرد بووە . میر سەری لێ سور دەمینێت و دەڵێت ئەحمەد ئەمن میم ئەو شەونوینانەم نینە، لە کێت بوون؟ ئەحمەد دەڵێت: میان کەیفم بە هەبوونی خۆنایت، چونکە زۆر غەدرم لێکراوە و دەنگم نەکردووە . لەبەر دەوڵەمەندی ئەگەر هەژاریام ڕێم بەکەس نەدەدا غەدرم لێ بکات کەوابوو زۆر کەیفم بەهەبوونی خۆنایت! کەوابوو زۆرجار هەبوونی بەڵایە.**

**ئاغاکان بەهۆی هاوکاری عوسمانییەکان و هەلپەرینیان بە ئاوازی ئەوان زۆرگوێیان بەجووتیاران نەداوەو خوێنیان مژیون بۆخویان و عوسمانیەکان.**

*** *** ***

**مێژووی بنەماڵەی ئەمبێژیانی خۆشناوەتی ماڵیان ئاوابێت، بە ناوی (خۆشناو و خۆشناوەتی) نووسراوەتەوە، وەك نووسەری بەرێز کەمتر باسی خراپەی بنەماڵەکەیان دەکات چاو پۆشی لەزۆر شت کردوە، خۆی لێ لاداوە وردە هەڵەشی هەیە، لەچەند چیرۆکێك شتەکانی تێکەڵێو کردووە و کراوی(کڵاوی) عەلۆی لەسەری جەلۆی ناوەو کراوی جەلۆی لەسەری عەلۆناوە! ناکرێت بڵێین (مام کەماڵ ) هیچی نەکردوە بەڵێ دەستی خۆش بێت و سوودی خۆی هەردەبێت، من لاریم نییە لەو بنەماڵە گەورەیە بێشك پیاوی باش و بەرێزیان هەیە و هەبووە دەشبێت.. کاری باشیشیان لێوەشایەتەوە و کاری باشیشیان کردووە سوڵح و سوڵحکاری زۆریان کردووە، خانەدانیش بووینەو خۆشناوەتیشیان لە شەڕوشۆڕی نێوان عەشیەتان پاراستووە نموونەی میانی شەقڵاوە لەو سەردەمە تورکمانانی هەولێر شەڕ بەخۆشناوان دەفرۆشن میانی شەقڵاوە ئاگاداری تورکمانان دەکەنەوە کە واز لەو کردەوانە بێنن وازنەهێنن لە هەولێر ڕاتان دەماڵین لەو کاتییەوە خزمانی تورکمان واز لەشەڕفرۆشتن دێنن هەرچەندە تورکمانەکان دەستکەلای عوسمانییەکان بووینەخۆیان بەبەشێك لەعوسمانییەکان زانیوە هەرچەندە ڕێژەیان زۆر کەم بووە، دیارە پشتیان بەهێز بووە میانی شەقڵاوە گوێی بەعوسمانییەکان نادەن، من بەشێك لەو بنەماڵەیە دەناسم کە دەوری بەرچاویان لەخەباتی ڕەوای گەلەکەمان هەبووە، پیاوی تێکۆشەرو ئازابووینە نموونەی وەك ( ساڵح بەگ) مام کەماڵ بەگ و (زیرەك کەماڵ)ی ڕۆشنبیر و تێکۆشەر و خەمخۆری گەل و وڵات، شەهیدیشیان هەیە وەك شەهید ( زاهیر)ی کادیرو ڕۆشنبیرو تێکۆشەر.**

*** *** ***

پیە (هەولێر)، لەمێژە مشتومڕ هەیە لەسەر ناوی هەولێر لە چییەوە هاتووە، من ( پەندێکم ) بە دەست کەوت دەکرێت هەولێر لەوە هاتبێت دوای ناوە کۆنەکەی کە(ئەربەئیلۆ) بووە، پەندەکە دەڵێت:(پیاو ئەو پیاوەیە بچێتە هەوێ و بێتەوە) واتە پیاو ئەوپیاوەیە بچێتەشەڕی و شەڕی خۆش بکات و بەسەلامەتی بگەڕێتەوە، خۆی بەکوشت نەدات و بەووریایی دووژمنیش بکوژێت. واتە لە کۆن بە شەڕ وتراوە (هەو، یان هەوێ ) واتە:( هەوە)لێر) (هەوەلێرە) واتە (شەڕە لێرە )، وە هەولێریش شەڕوشۆڕی زۆر لێ کراوە ئەکرێت هەڵەش بم ئەشکرێت ڕاستیش بێت بەجێی دێڵین بۆ خەلکی شارەزا لە رووی زمانەوانی، ئەوە لەتواناى من دا نییە ...

*** *** ***

باسی تورکمان کرا، بەداخەوە لە ڕابردوودا کورد باوەڕی بەخۆی نەبووە و بەرانبەری دوژمنان خۆی بە کەم زانیوە ئەمەش یەکێکە لە هۆکارە خراپەکانی خەڵکی گەلەگەمان کە تائێستا خاوەنی کیانی خۆمان نین .. ئێستاش ئەو دیاردەمان زۆر و کەم بەرچاو دەکەوێت لە بەڕێو بردنی دەوڵەت داری دا، بۆ نموونە زۆربەی بنەماڵە دیارەکانی کوردستان لە ڕابردوو شەجەرەکیان دروست دەکرد خۆیان دەکردە ئامۆزای فلان قایدی سەربازی پێپەتییەکان، هەرچەندە لە رەنگ و روو لە کورد نەبێ لە هیچ نەتەوەیەك ناچن ..لەو سالآنە نەوەکانیان خریکن جارێکی تر خۆیان دەکەنەوە کوردی رەسەن، بەشێکی زۆری تورکمانەکانی هەولێر مام خۆشناوی خۆمانن، خۆیان کردوە بەتورکمان لەبەر بەرژەوەندی ڕابردوویان، ئێستاش خزمیان لە گوندی قەراسنج و گوندەکانی خۆشناوەتی ماون، بۆ نموونە ((........)) من کە لە بنەماڵەیەکی کۆنی کوردەوارینە بە ناوی (بنەماڵەی گاوان ) لەو سالآنە بە هۆی هاوکاری ((تورکەکان ))خۆیان کردە تورکمان و زۆر باشیش تورکمانی دەزانن، با چاوەڕێ بکەین تاکو کورد لەسەر پێی خۆی دەوەستێ ئەو کاتە تورکمانە خۆشناوەکانیش خۆیان دەکەنەوە خۆشناوی کورد ...نموونەی سالّح بەگی باشوورە کە پیاوێکی زۆر باش بووە، لە تەواوی تەمەنی خۆی،وە (حەمەد بەگ) ی وەرەو (کەماڵ بەگ)ی وەرێ و (کەیفی بەگ ) و زۆری تر ئازا و نیشتیمان پەروەر بووینە کە ناکرێ مێژووی گەلەکەمان لە بیریان بکات و لەبیریش ناکرێن بە درێژایی مێژووی قۆناغی دەرەبەگایەتی ئەو بنەماڵەیە ئەوانەی لە دەستەلآت بووینە بۆ مانەوەیان هەر لە بەرەی دووژمنان و داگیرکەران بووینە.

*** *** ***

بەرێز (مەلا خالید فریزی) ڕێزم بۆی هەیە زۆرشتی جوانی نووسیوە لەبارەی خۆشناوەتی، لە منیش شارەزاترە لە بنەماڵەی ئەمبێزبەگ، بەدرێژی باسی ئەو بنەماڵە دەکات خۆی بە دوور دەگرێت لە هەڵەکانیان، دیارە هیچ کارێك بێ هەڵەنابێت ناکرێت مێژووی یەکێتی وپارتی بنوسرێتەوە و هەرباسی قۆناغی بەرگری و ڕزگاری و سەرکەوتن و دروستکردنی حکومەت و پەرلەمان و ئاوەدانکردنەوەی کوردستان و دەیان شتی باش بکرێت کەکراوە، جێگای شانازیشە بۆ هەمووومان، بەڵێ ئەو شتانە پیرۆزن شایانی دەست خۆشین دەسکەوتی گەورەن پارتی و یەکێتی و ئەوانیتریش کاری باش کراوە و دەکرێت ئەگەر مێژوو هەرباسی ئەوشتانە بکات مێژوونییە وەك خۆشناوان گۆتیە ئەدی هەڵەکانیان، ئەدی غەدر و زۆرداری و خەڵك کوشتن ئەدی شەڕی براکوژی، ئەدی ئەدی .تاد. ئیسلامییەکانیش بەهەمان شێوە و ئەوانی تریش دەیان و دەیان هەڵەیان هەبووە.

*** *** ***

لە ڕابردوو لە کوردەواری نەریتێك هەبووە و ئێستاش لەلای زۆرکەس ماوە کەسێك پەنات بۆ بێنێت خۆی بارێتە بەختی تو، ڕاستە کە بەو شێوەیە هاتووە (خۆم هاویشتە بەختی تۆ یان تو . ئەمبێز خۆی هاویشتیتە بەختی میر شەرك، میشەرك میرێکی خۆشەوستی خۆشناوەتی دەبێت هەموو خۆشناوەتی ئێستاو تیەی هەروتیان و دۆڵێ ئاکۆیانیش ئەوکات خۆشناو بووینەو سەربەمیشەرك بووینە میشەرك سەر بەبنەماڵەی بابیانی میری کورەبووە هەر لە زەمانی میسلێمان و خانزادەخانەوە زۆریش جێگای ڕێزبووە، بنەماڵەی میانی سۆران زۆر پشتیان بەمیر شەرك بەستووە، ئەمبێز بەخۆی و کوڕەکانی وەك ئاوارە لە کوردستانی رۆژهەڵات دێنە لای میشەرك و خۆیان داوێنە بەختی میر شەرك، میشەرك کۆمەڵێك زەوییان بۆ دیاردەکات و ئاشی ئاوشیان دەداتە دەست، کوڕێکی میشەرك پێی ناخۆشە باوکی ئەوەندە ڕێزی ئەمبێز و منداڵەکانی دەگرێت، شەوان بە دزی دەچێت ئاو لەسەر ئاش دەبڕێت ئەمبێز دەچێتەلای میشەرك دەڵێت کەسێك فێربووە شەوان ئاو لەسەر ئاش دەبڕێت میشەرکیش تووڕە دەبێت و دەڵێت: بڕۆن ئیشکەبگرن کوڕی منیش بوو بیکوژن. ئەمبێز بەخۆی و کوڕەکانی ئیشکەدەگرێت، کەسێك دێت ئاودەبڕێت دەی کوژن کە سەیردەکەن کوڕی میشەرکە هەر هەمان شەو پەلاماری ماڵباتی میشەرك دەدەن، میشەرك بەرێزەوە ئەو بنەماڵە دەگرێتەخۆ و خانوویان بۆ دروست دەکات و موڵك و ماڵیان دەداتێ، ئاشی ئاویان دەداتێ وەك سەرچاوەیەکی بژێوی ئەگەر بەهەڵەش

ماڵی ئەمبێز کوڕی میشەڕك دەکوژن ئەبووایە داوای لێبووردن لە (میشەڕك) بکەن یان دەبووایە لە شەڕمان ناوچەکەیان بەجێ هێشتبا، ئەوە کەی ڕەوایە سەرباری ئەو هەموو چاکەی میشەڕك، ئەوان دوای کوشتنی کوڕەکەی بەو شەوە پەلاماری بنەماڵەی میر شەڕك بدەن میر شەڕك لەخەوی شیرن بکوژن بەبێ تاوان. ئەو بنەماڵەیە قەتلوعام بکەن، خەڵکی خۆشناوەتی زۆریان پێناخۆش بووە میشەڕك کوژراوە بەدەستی ئەمبێز لە خوار (گوندی هەرمك) سەروی (گوندی مێرگەسەر) گۆڕستانێکی لێیە بەناوی ( مەقبەرێ ڕەشکی)، مەقبەر واتە بچووك دەکەوێتە سەر ڕێگای هاتوچۆی خەڵکی گۆڕی ئەمبێزلە وێیە هەرکەسێکی خۆشناوەتی بەوێ داتێپەر بیان ڕستەیەك دەگوترا وەك:

فاتیحایەکی دەخوێنم

بەخێرا ئەوێ مەقبەرێ

ئەمبێزم لێ هاویشتەدەرێ

ئەوکاتەی ئەمبێزدەمرێت ئەمبێز دەبەنە گۆرستانی (رەشکی ) دەی نێژن، شەوان جووتیارەکان لە گۆڕیان دەردینا و فڕێیان دەدا و بیانی وایان بڵاو دەکردەوە کە گۆڕستان لاشەی فڕێداوەتە دەرێ، دواتر لەدووری گۆڕستان دەی نێژن ئێستاش شوێن گۆڕی ونە.

من پێم وایە ئەگەر کەسێك شتێك لە سەرەخۆشی بنووسێ دەبێـت دوای چـاکە و پیـاوەتی و باسی خراپەکانی خۆشی بکات. ئەوەك خەڵکی چەواشەبکات! ڕۆژێك دێت کەسێکی لێ پەیدا بێت و بڵێت قوربان بە یارمەتیت ئـەوەی نووسـیتە هـەمووی وانییـە! میشـەڕك چ تـاوانی بەرانبـەر بنەماڵەی ئەمبێز بەگ کردبوو؟ یان تاوانی خزم وکەسوکاری میشەڕك چـی بـوو؟ ئـەمبێز دوای ئەو ڕووداوە دەچێت دەستی بەبەکان رادەکێشێتە ناوچەکە و لەخۆشناوەتی خۆی دەیکاتە میر . وردە وردە هەموویان قەتل و عام کران بەدرێژای چەندان پشت گوند بەگوند ناوچە بە ناوچە بنەمالـەی میر شەڕك و لایەنگرانی میر شەڕك قەتلوعام بکرێن، بەبەرچـاوی هـەردوو میرنیشـینی سـۆران و بەبەکان. وەك کۆمەڵێك خەڵکی چاوچنۆك بوودەڵە لەکاتی شـەری پـارتی و یـەکێتی تـاوانی زۆر نابەجێیان دەکرد، چاوپۆشیشیان لێ دەکرا لە هەردوولا! مام رەسوول شـێخ وەسـانی چـی کردبـوو تەنها دوسـتێکی مـیری کۆسـە بـوو، قـەتلوعام کـران یـان ئـەو هـەموو زەوی و زارەی هـەموو خۆشناوەتیان لەکێ کڕیوە؟ ئەوان میوان بوون لەخۆشناوەتی ئەوەیە تا ماخۆ دزی گرت، دز ماخۆی گرت ! هەزار و هەزار شتی تر دیارە باڵادەسـتیی ئەمبێزییـەکان بەسـەر بنەماڵـەی میشـەرك و

خۆشناوەتی بەپاڵ پشتی هەردوو میرنیشینی بابان و میری سۆران بووە زۆریش زیرەك بوونە، بەتێپەربوونی ساڵ بۆ وەرگرتنەوەی خۆشناوەتی لە سنووری میری سۆران بەشێك دەبنە پاڵپشتی میری سۆران و دژایەتی بەبەکان دەکەن، بەشێکیشان دەبنە لایەنگری بەبەکان سوودیان لەو ناکۆکییە وەرگرتوە، وردەوردە بەشێکیان دەچنە ناو میرنیشینی سۆران، ئەو بەشەی لەناو میرنیشینی سۆران خزمایەتی هەروتی و خزمانی دۆڵی ئاکۆیان ملکەچی منداڵەکانی ئەمیێز نابن بەهۆی نزیکیان لە میانی سۆران وەك بنەماڵەی حویزاغەی هەروتی دیارە ئەو سنوورانە واتە ناوچەی خۆشناوەتی سەقامگیر نەبووە ناوەناو بەبەکان بەرەو رۆژئاوا هاتوون، یان میانی سۆران بەرەو رۆژهەڵات پێشرەویان کردووە، ئەوشەڕانەش بەدرێژایی حوکمڕانی هەردوولایان وێرانکردنی ناوچەکەبووە، دەرەبەگەکان سوودیان لەو ناکۆکییە وەرگرتووە و هەرکەسە و باج وسەرانەشی دایتە میرەکەی خۆی باج و سەرانەش جووتیاران باجیان داوە، دواتر بە نەمانی میرەکانی کورد لەسەر دەستی عوسمانییەکان ئاغەکانی کوردستان و خۆشناوەتی بازارێکی خۆشیان بۆ دروست دەبێت دووبارە، ناوچەی خۆشناوەتی وەك هەموو ناوچەکانی تری کوردستان لەسەر دەستی دەرەبەگەکان سووتەمەنی عوسمانییەکانیش بوونە، بۆ باجی جۆراوجۆر و ئامادەکردنی سەرباز و رەوانە کردنیان بۆ بەرەکانی شەڕی گەلان.. کەپێیان دەگوت:(سەفەر بەلینگ)، هەزاران کەس لە کوردستان و خۆشناوەتی لەو سەفەرە بێسەر و شوێن بوون و بە هەزاران بەدیلی کەوتنە دەست رووسەکان و کڕین و فرۆشتنیان پێ کراوەو کاری کشتوکاڵیان پێ دەکردن دەیانکردنە شوان و گاوان زۆریان کوردستان و کەس و کاریان نەدیتەوە وە بەشێکیان دوای دەساڵ هاتنەوە و نموونەی (مام وەیسەی شێخ وەسان)ی و زۆری تر بەسەدان سەرباز دیلەکان کڕین و فرۆشتنیان پێ کراوە بە تایبەتی رووسەکان باب وباپیران پێیان دەوتن ( حورس) بەشێك لەو سەربازانە لەلایەن خەڵکی ئازاد دەکران و ژنیان هێناو دواتر منداڵەکانیان بەجێهێشتن بە هۆی غوربەتی وڵات و کەسوکاریان.لە کۆکردنەوەی باج و سەرانە و هاوکاری تورکەکان دیارە ئەوکارەش بازارێکی خۆشی بۆ دەوڵەمەندکردنی دەرەبەگەکانی کوردستان و خۆشناوەتی دروست کردبوو وەك: زەمانی سەدام حسێن و(کمل حشرین ) سەیرە رۆژگارەکان زۆر لەیەك دەچن بەشێوەی جۆراوجۆر (کمل حشرین) ئەوە بوو لە زەمانی سەدام شەڕی ئێران و عێرق هەر مونەزەمەیەك دەبووایە رێژەیەك خەڵکی بە زۆر رەوانە بکەن بۆ پاڵپشتی هێزی سەربازی، پیان دەوتن (جێشی شەعبی) کەسێکیان دەگرت بەپارە بەریان دەداو کەسێکی تریان دەگرت لەجیاتی بەرێ دەکرا ئەو

## خۆشناو و دز و دزشاو

ڕووداوە لەمامێکی من ڕوویدا بەناوی (فەقێ خدر) لە شەقڵاوە دەژیا کە تەمەنی لە سەروی شەست ساڵان بوو کەسێکیان بەپارە بەرداو مامی منیان برد دواتر مامم لە کوێت کوژراو تەرمیشمان نەدیتەوە ئەگەر بڵێین مێژوو درۆمان بۆ هەڵ دەبەستێ ئەتوانین بڵێین دوونێ بوو لەساڵی ١٩٨٠ بۆ ١٩٨٨ زۆربەی دەرەبەگەکان ئەوانەی خۆیان بەمێردەزانی جگە لەچەندان ئاغایەکی مەردوو ئازاو نیشتیمان پەروەر، زۆربەیان دەوری خراپیان دەدی بۆڕاو کردنی گەلەکەمان کوشتن و تالان و جاسوسی و ئەوهەموو خەڵکە بەبەرچاوی بەرێزیان کوژراو زیندە بەچاڵ کرا بەسەدان کچ و ژن فەساد کراو منداڵ وژن و کیژوپەککەوتە بە زیندووی خرانە ژێر زەوی هەموو کوردستان وێران کرا بە هەزاران مزگەوت و تەکیە و خانەقاو بچووکی پیرۆز وێران کران بە سەدان هەزار دۆنم ڕەزو باغ بە هەموو جۆرەکانیەوە سوتاو وشککران ئەگەر پاساو دێننەوە ئێمە خراپ نەبووینە منیش دەڵێم هەمووتان خراپ نەبووینە بەڵام هەڵوێستان نەبوو بێدەنگیتان دەنواند بێدەنگی نیشانەی ڕەزامەندیە ئەگەر پاساوتان ئەوەیە توانامان نەبووە دەتوانین نموونەیکی زۆر بچووک بەڵام زۆرزۆر گەورە بینینەوە دوو مەلای زۆربێ دەستەڵات بێنینەوە سەرباری بێدەستەڵاتیش هەڵوێستیان هەبوو خاوەنی پیاو و چەك و تەقەمەنیش نەبوون ئەودوو مەلایەش (مەلاعەزیزو مەلاعوسمان)ی شەقڵاوەبوون کە لەسەر هەڵوێستیان نەفی کران، بەڵام ئەمڕۆ هەزارانی وەکی من کەدەگاتە ئەو دوو مامۆستایە بەڕێزەوە پێشوازیان لێ دەکەین. خۆشەویستی خەڵکی ناوچەکە و دەوروبەرن، هەر ئەمرێکی بکەن جێ بەجێ دەکرێت، هەرچەندە مامۆستا عەزیز حەز لەخواردنی خۆش دەکات ئێمەش لەخزمەتی داینە ئەگەر ڕوو لە ماڵمان بکات گەورەمان دەکات، هەموو خۆشناوەتی ئەو دوو مامۆستایە دەناسێت چونکە خۆشەویستن لەلای خەڵکی .

گەل شتی باش و خراپ لەبیر ناکات دەرەبەگە دەستەلاتدارەکان ئەوان داوەتیان دەکردن، باوەڕ بکەن بەوچاوانەم شتێکم دیت لە کوڕەبەگزادەیەك بەناوی نەبەم چ داوەتێکی بۆ پیاوانی ڕژێم ئامادەکردبوو لە مانگی ٩ ی ١٩٨٨ لە (فندق مەشکور)ی شەقڵاوە کە ڕووی دەوێت باسی بکەم ئەوەی ئەوداوەتەی کردوە دەزانێت چ داوەتێك بوو ئەکرێت خەڵکی نەزان پشت لە گەل و نیشتیمان بکات. دیارە مێر دەبێت مێربێت ناکرێت وەك کەسێکی ساویلکە ڕەفتار بکات، پشت لە گەل و وڵات بکات خۆی بچووك بکاتەوە ئەوەی لەسەر مێر دەکەوێت لەسەر کەسێکی نەزان و ساویلکە ناکەوێت دیارە خەڵکی ساویلکەش زۆرشتی نابەجێیان بەرانبەر ئەو گەلە کرد،

نموونەی، سەلاح شەلاتی شەقلاوەیی، سەری (بەرخۆکەی) بڕی لە گوندی سیساوە و بردیە دایرەی ئەمن، وتی: سەری پێشمەرگەم بڕیوە، فەرموون ئەوەتە! کەسمان گلەیی نەبوو لەو سەربڕینە، چونکە سەلاح ناسراو بوو سەلاح شەلاتی، گلەیی لەو کەسانە ناکرێت هەرکارێك بکەن تەواو .

دەبووایە جیاوازی هەبووایە لەنێوان میو ئەوانەی لە مەنزەمە هەڵدەپەڕین، ناکرێت میر خۆی بچووك کاتەوە وەك خەڵکی سادە و ساویلکە، پشت لە گەل و وڵات بکات، دەکرێت لە داهاتوودا پەند لە ڕابردوو وەرگرن، هەرچی بۆ دووژمن بیکەی بێسوودە و زەرەری هەیە، دەکرێت بنەماڵەی سەرکەپکان بەنموونە بینینەوە توانییان لەهەر زرووفێك خزمەتی گەلەکەیان بکەن، دووژمنیش ڕێزی دەگرتن ، دەرەبەگەکان بەهەمان شێوە بە کەسێکیان دەوت ناوت هاتووە بۆ (سەفەربەلینگ) ئەگەر ئەو کەسە پارچە زەوییێکی پێشکەش بە جەنابی ئاغا کردبا، ئاغا کەسێکی تری لە جیاتی ئەو دەنارد، بۆ ئەو سەفەرە دوور و درێژە و هاتنەوەشی دیارنەبوو، بە هەزاران گەنجی ئەو وڵاتە بوونە قوربانی و گۆڕیشیان ونە، نموونەیێك وەك سێ برا لە یەك ماڵ لە گوندی شیە بردنیان بۆ سەفەربەلینگێ

١- مستەفا عەبدوڵڵا

٢-عەزیز

٣- مەولوود

هاوکات ئەو ماڵباتە لەو سێ برایە پێك هاتبوون، تاوانیان ئەوە بووە لەلای ئاغە خۆشەویست نەبووینە.لەهەر گوندێکی ئەوکوردستانە بەدوو دابچی چەندین کەس ئێستاش بێسەر و شوێنە، بەدرێژایی پاوانخوازیی تورکان ناوگەلان پڕە لەگۆڕی لاوی کورد ئێستاش تورکە توند ڕەوەکان شانازی بەڕابردووی خۆیان دەکەن، کە بەخوێن و گۆشتی لاوانی کورد پێی گەیشتبوون ئێستاش کورد بەمرۆڤ ناناسن، بە کێوی ناومان دەبەن، سەیرە ئێستاش لەو گێلە کوردانە ماون بە قسەی تورك دڵخۆش دەبن، بەناوی ئایینی پیرۆز کە دەیانەوێت دووبارە بێنەوە و ببنەوە نەتەوەی سەردەست، وەك ڕابردوو بە هەمان ناوی ئایینی. دوێنێ بوو، قونانەی ژنانیان لە ئێمە وەردەگرت، ئەو کوردە گێلانە دەیانەوێت دووبارە تورك بگەڕێتەوە و قونانە بدەین، بۆنموونە لە بالیسان پیرەژنێك هەبووە بەناوی (هەمین) ناسراوە بە هەمینەبنە،(بنە) بەو گاجووتە دەوترێت کە زۆر بەهێز و بە توانایە دەتوانێت چەندان گاجووت ڕابگرێت بۆ سوڕانەوە (بنە) بۆ ئەو ژنانەش دێت کە پیاوەکانیان دەمرن بەخۆیان ئیدارەی ماڵ و منداڵیان دەدەن… هەمینەبنە واتە: ژنێکی

بەهێز و بەتوانا و لێزان، کوڕەکەی ناوی خدر بووە، مێردەکەی دەمرێ، بە هەژاری قوڕ بەسەری کوڕەکەی گەورە دەکات هەر ئەوەندە کوڕەشی هەبووە ئێوارەیەکیان ڕەمەزان دەبێت پیرەژن بەخەیاڵی دادێ کە سەبەتە هەنجیرێك بۆ ماڵی ئاغا ببات کە دەکاتە باپیری (........) بالیسان پیرەژن هەنجیرەکان دەداتە دەست ئاغەژن ئێوارە ئاغەژن سفرە دەڕازێنێتەوە چاوەڕێی ئاغە دەکات لە جەمەعاتی نوێژی ئێوارە بێتەوە، جەنابی دێتەوە دەست دەکات بە خواردن و چاوی بەو هەنجیرە ڕەشانە دەکەوێ، دەڵێ کێ ئەو هەنجیرانەی بۆ هێناوین ئاغەژن دەڵێ فلان پیرەژن. جەنابی ئاغا بیر لەو هەنجیرانە دەکاتەوە و لەگەڵ ڕۆژووشکاندن پیلان دادەڕێژێت بۆ داگیرکردنی ئەو زەویە دوای چەند ڕۆژێك ئاغە لە دوای پیرەژن دەنێرێت و پێی دەڵێ پیرەژن ناوی کوڕەکەت هاتووە دەبێت بچێتە (سەفەر بەلینگێ) پیرەژن دەست دەکات بە گریان زۆر لە بەر ئاغاو ئاغەژن دەپاڕێتەوە خودا و پێغەمبەر دێنێتە ڕەجایێ . ئاغەژن روڵە ئاغە دەکات دەڵێ: کوەکی هەبێ هیممەت بکە با ئەو کوڕە نەچێتە سەفەربەلینگێ، ئاغە دەزانێ پیلانەکەی سەریگرت بە پیرەژن دەڵێ: پیرەژن چارە هەیە کوڕەکەی خۆت بکڕەوە، پیرەژن دەڵێ بەقوربانت بم ئاغە پارەم لەکێ بوو؟ ئاغە دەڵێ: باشە پیرەژن لەبەر ئەوەی خواو پێغەمبەرت هێنایە ڕەجایێ بەو ڕەمەزانە ئەتوو ئەو زەویەی هەنجیرێ ڕەشی تێدانە بدە من و منیش لە ترسی خوداو پێغەمبەر کوڕەکەت لە توورکان دەکڕمەوە. پیرەژن دەستی ئاغە ماچ دەکات و دەڕوات زەوی و بنەهەنجیرەکان بوونە موڵکی ئاغاو بەو ڕەمەزانە خێرێکی گەورەشی کرد، لە ترسی خودا و پێغەمبەر، ئەو هەنجیرانە تا ساڵی ١٩٩٩ مابوون دواتر کەوتنە بەر جادە، من ئەو هەنجیرانەم خواردووە بەخێری پیرەژنێ.

*** *** ***

بەهۆی ئەوەی ئاغەکانی ئێمە لە بنچینەدا خۆشناون کەمترین زەوی و زاریان هەبووە. بەسوود وەرگرتن لە هەردوو میری سۆران و بابان خۆشناوەتی خەتی پێکدادان بووە لەنێوان هەردوو میر..بۆیە هەردوو لا چاوپۆشی زۆریان دەکرد لە ئاغاکانی خۆشناوەتی و ئاغاکانمان وەك پاشاکانی بەغدا کە سوودیان لە هاتوچوونی فارس و تورکەکان دەدی بۆ دەستەڵات و یەکتریان بە زۆر شێوە دەکوشت، ئاغاکانمان زۆر جار یارییان بە ئەقڵی میری سۆران و بەبەکان کردوە، ئێستاش ئەو جۆرە کەسانە هەنە و دەیانەوێت شەڕ هەبێت و خوێنی خەڵك بڕژێ و ئەوان پۆشتە و دەوڵەمەند بن . زۆرجار هەوادارانی پارتی و یەکێتی کۆمەڵێك شتی نابەجێیان بەرانبەر گەل کردووە چاوپۆشییان لێ کراوە بۆئەوەی دوو فیشەك بتەقێنێت ئەگەر لەلایەك لێ پچینەوەی

نەگمێ كرابا، دەچووە لایەكەی تر بەپلە وپارە و سەیارە و چەك خەلات دەكران، كەسیان ناوێران سەزایان بدەن، خۆشبەختانە بەرەوكەمی چوە، دواتر بەهۆی دەستەلاتی عوسمانییەكان بنەماڵەی تەمیێز دەستیان بەسەر هەمووخۆشناوەتیدا گرتووە چیرۆكی پیاوانی نموونەیەكە لە هەزاران رووداوی لەو بابەتانە و زۆریش خراپ تر ...

*** *** ***

لە گوندی توتمە گوندێكە دراوسێی بالیسانە، دوو برا دەبن بەناوی (یەحیا) و (حەمەد) برایەتیان زۆر خۆش دەبێت، خاوەنی موڵك و ماڵێكی زۆر دەبن، ئەو زەویەی خوار كانی گوندی زێنێ موڵكی ئەوان دەبێت، ئاغەكان چاو دەبڕنە موڵكیان پیلانێك دادەڕێژن بەو شێوەیەی خوارەوە: لەدوای (یەحیا ) و ( حەمەد ) دەنێرن بۆ بالیسان، لە بالیسان لێكیان جودا دەكەنەوە وە بە (یەحیا) دەڵێن: (حەمەد) بە خێزانت فێر بووە، (یەحیا) دەڵێ شتی وانییە! زۆر هەوڵ دەدات قەناعەت بەدەرەبەگەكان بەكات كە ئەوە بوختانە، بەڵام دەرەبەگەكان سور دەبن لەسەر قسەی خۆیان دەڵێن ئەوە سوكایەتیە لەناو عەشیەتمان دەبێت برات بكوژی دواتر دەستی (حەمەد) لە پشتەوە دەبەستن لەخوار (بچووكی بلاروكاوە) بە(یەحیا) دەڵێن دەبێ (حەمەد)ی بكوژی نەی كوژی هەردووكتان دەكوژین، زۆر هەوڵ دەدات برای خۆی نەكوژێت، دەرەبەگەكان ناچاری دەكەن بیكوژێت، براكەی دەكوژێت دواتر پێی دەڵێن: سەگباب، واتە: باوك سەگ برات لەسەر چ كوشت زەویەكانمان نەدەیێ، دەت كوژین (یەحیا)واز لەزەویەكان دێنێ، دەبنە موڵكی دەرەبەگەكان (یەحیا) دووای چەند ڕۆژێك بەرەو تێكچوون دەچێت، لەبەر خۆییەوە ڕستەیەك چەند بارە دەكاتەوە، دەڵێت:

هۆ هۆ خەنجەرێ،<br>
عەمرت نەمینێ<br>
دەگەر جەوهەرێ،<br>
كوت كوشت،<br>
بە قسێ ئاغان،<br>
برای جگەرێ؟

وردە وردە (یەحیا) لە خەمی براكەی شێت دەبێت و سەری خۆی هەڵدەگرێت و دەڕوات، ئێستاش هەر دەڕوات كەس (یەحیا)ی نەدیتەوە! موڵك وماڵی بووە هی دەرەبەگەكان و دوو ژنیش

تووشی بێوەژن کۆشی کران و منداڵەکانیان گەورەکردن بە هەژاری و بێکەسی، نەوەکانی (یەحیا و حەمەد) ئێستا دانیشتووی گوندی توتمەن.

*** *** ***

جاران چەند کەسێك ڕێك دەکەوتن ترێیان دەبردە دەشتی بیتوێن و زۆرجار بۆ دەشتی هەولێریش دەیان برد، بە گەنم دەیان گۆڕییەوە لە گوندی بێراوە، چەند کەسێك ڕێك دەکەون یەکێکیان ناوی (سمایلی عالیەکۆکی) بووە کە لەگەڵ ئەو چەند کەسە بووە کەسێکی بێکەس بووە، بەگی گوندی (......) بێراوە، ئەو هەواڵە دەزانێت دەچێتە لای بە (سمایلی عالیە کۆکی) دەڵێت: سمایلۆك زانیتم دەچیە کاروانی، کەرێش لۆ من ببە دووسێ تەنەکە گەنمانیش لۆ من بینە، سمایل دەڵێت: ئاغە ئەو جارەم پێ ناکرێت بەخۆم دوو کەرم وێنە شەرت بێ جارێکی تر بە سەرچاوان بۆت دەبەم. بەگی بێراوە دەڵێت: باشە سمایلۆك لەبیرت نەچێ، وەت لێهات قسەی من بەهەند هەرنەگری، سمایل دەچێتە کاروانی و دێتەوە دەگاتەوە ماڵەوە باری کەرێ دێخی و لەلای خێزانی دادەنیشێت منالەکانی لەپێش هەڵدەپەرن لە شایی (لەخۆشی) هاتنەوەی باوکیان غەریبیان کردوەو گەمە لەگەڵ منداڵەکانی دەکات (.......) بەگە بەوە دەزانێت سمایل گەیشتەوە ماڵەوە دەچێتەپێش ماڵیان دەڵێت: سمایلۆك هاتیەوە ئەویش دەڵێت بەڵێ، بەگ هاتمەوە لولەی چەکی تێ دەکات دەڵێت: یاخوا بەخێربێیتەوە راست دەی کوژێت !سمایل بە کوژراوی دەکەوێتە باوەشی خێزانی و منداڵەکانی دەست دەکەن بەگریان ئاغە بەخزمانی گوندی دەڵێت: (سمایلۆك)م تۆپاند بڕۆنە سەرقەبران، خۆشی دەچێتە سەر قەبران خێزانی سمایل و دایکی سمایل بۆ سمایل زۆر بەجۆش دەگرێین دەڵێن جەنابی فلان... بەگ دەی کوژێ و دێیە سەرقەبرانیش، بەگ پەلاماریان دەدات و زۆر لە ژنەکان دەدات دەڵێت: کو لۆ ئەو ناپیاوە دەگرییێن بەڵێ جەناب (..... بەگ گریانیشی قابیلی سمایل نەدیووە، تەنها لەسەر کەر نەبردنە کاروانی!

دەوەرە ئەوەمیر و ئاغەکانی ئێمە بووینە بەرانبەر فەقیر و خەڵکی بێکەس چەند ئازا بووینە، سمایلی بێکەس کۆشەك منداڵی بە هەتیوی مانەوە لەسەر کەر نەبردنە کاروانی، ئەگەر باوەڕیش ناکەن وەرن بپرسن نەوەکانیان لە ژیاندان، ئەو کەسەی بەناوی ئەوسمایلەکراوە برادەرمە و ناوی حاجی( سمایل) بیراوەییە، لە هەولێر لە قەڵاتی نوێدا دەنیشێت تەمەنی بەرەو هەشتاساڵی دەچێت یەکێك بوو لە پیاوماقوڵاتی گوندی بێراوەیە و زۆر خزمەتی هێزی پێشمەرگەی کردوە.

کوڕە ئاغاکانمان بەدزی و بە ئاشکرا دەستیان لەکچ و ژنە جوانەکانی جووتیاران نەپاراستوە ئەگەر لە بەرچەند هۆیەك نەبێت ڕووداوی واباس دەکەم کە ڕوویداوە مرۆڤ بێز لەخۆی و ڕابردوو دەکەت. لە هەمان کات کوڕە جووتیار بۆی نەبووە سەیری کچە ئاغا بکات، هەرچەندە ئەشق هیچ نرخێك بۆ جیاوازی چینایەتی دانانێت و مەترسیش ناناسێت بۆ نموونە: ( کوڕە لاوی گەنج و جوانی ( سۆفی علی بالیسانێ ) ئەشقی کچە ئاغایەك دەبێت و زۆری خۆش دەوێت ئاغاکان سەیر کەین و بەینە دەزانن . ڕۆژێکیان سۆفی علی لاو دەچێتە جوتی لە خوار( چاکی بادینارێ ) واتە: گۆڕستانی بادینارێ . ئاغاکان کەسێك دەنێرن بەناوی حەوێز کە لە خۆیان دەبێت و دەچێتە لای عەلی و دەی خافڵێنی و دوای چاك و چۆنی دەیداتە بەرخەنجەران و دەی کوژێت، زگی هەڵدەدڕێت و ساواری نیوەڕۆی کە خواردبووی بە گۆڕێ وەر دەبێت عەلی جوانەمەرگ دێنەوە و نێو هاوڕێنە کانی (باراوێ )، دەی شۆن و دەی نێژن ـ عەلی ئامۆزایێکی هەبووە بەناوی ڕەسوول مەشوور بووە بە ڕەسوور بارزانی، ئەوناز ناوەی بۆ ئەوە دەگەڕایەوە، کە لە سەربازی فیرار دەکات و لەترسی ئاغان زیاتر لە هەشت ساڵ ناوێرێت بێتەوە بالیسان، خۆی داوێتە بەختی بارزان و بارزانییەکانیش دەی پارێزن خۆی لە بارزان حەشارداوە، ئەوەك ئاغاکان بیدەنەوە دەست حکوومەت ئەو هەواڵە دەزانێت کەوا ئاغاکان ئامۆزایەکی ئەویان کوشتووە بەپارتیزانی دێتەوە و چاودێری ئەو ئاغایە دەکات، ئەو ئاغایە دەیەوێت بچێت شەکر لەحکووت وەرگرێت لە زینی خۆشناوان کەمینێك دادەنێت و ئاغا لە تۆڵەی ئامۆزای دەکوژێت و خۆی بزردەکاتەوە یەکێك لە ئاغاکانی گوندی بالیسان بڕیارێکی دابوو هەر جووتیارێك بە سواری گوێدرێژ بە پێش دیوەخان بڕوات دەبووایە مریشکێك جەزابدات ڕۆژگار هات و چو جنابی ئاغا پیر بوو کەوتە نەخۆشخانەی هەولێر و مرد بەلەدیەی هەولێر لە گۆڕستانی سەید ئەحمەدی ناشت، لە قەراخی گۆڕستان خەڵکی دەوروبەری هەولێر بۆ ساغکردنەوەی بەرهەمەکانیان داتنە هەولێر و کەدەگەڕانە گوێدرێژەکانیان دەبردە بن کێلی ئەو گۆڕە و سواریان دەبوون، ئەوە کاری خوایە، خودایە بمانپارێزی لە غەریزەی زۆرداری .

ئاغاکان لە هەمان کات خۆیان لە بنەماڵە گەورەکان پاراستووە، نموونەیەکی زۆر بچووك باس بکەین، کە خۆیان لەبنەماڵەگەورەکان پاراستووە لە گوندی (خەتێ) کەسێك بەناوی قادر لە بنەماڵەی مەلایان خاوەن ئێسترێکی باش دەبێت، بەگی گوندی خەتێ دەچێتەلای و دەڵێت ئێسترم وێدە لۆ گێرەی، قادریش دەڵێت: بە چاوان دوای چەند ڕۆژ قادر کارێکی بە ئێستر دەبێت دەچێت

ئێستر دێنێتەوە و لەپێش ماڕێ دەی بەستیتەوە، جەنابی ئاغە ئەو هەواڵە دەزانێت بەپەلە دەڕوات بۆ ماڵی قادر بۆ ئەوەی لە قادر بدات دەگاتە قادر، گۆپار(گۆپاڵ) لە قادر سەروابن دەکات، قادر پەلاماری ئاغە دەدات و بەئەرزی دادەدات و زۆریشی لێ دەکات دواتر خەڵکی دەگەنێ و ئاغەی نەجات دەدەن، کێشەکەش کۆتایی هات.

بەڵێ، ئەوە سمایلۆکی بێکەسی بێراوە و ئەوە قادری بە کەسوکاری گوندی خەتێ، هەر ڕووداوێکی باسم کردووە نەوەکانیان ماون. ئاغەکانی دەوروبەرمان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ئەوپەڕی ڕێزی عەشیەتی خۆیان گرتووە، هەرچەندە من باوەڕم بەهۆز و هۆزایەتی نییە وەك منداڵانی عەباساغای سەرکەپکان ئێستاش میری هەموو حەوزی بیتوێن و دەوروبەرن، چونکە بە درێژایی میرایەتیان پاڵ پشتی فەقیر و هەژاران بوونە و لەکوردایەتیش دانەبڕاون. هیوادارم بەردەوام بن بۆ ئەوەی هەر بەمیرایەتی بمێنێنەوە، بەڵام بەمیرایەتییێکی سەردەمانە، دەکرێت ئەوانیش وردەهەڵەیان کردبێت، تەماشای میرانی سوورچی دەکەی ئەوانیش ئەوپەڕی دڵسۆز بوونە بۆ عەشیەتی خۆیان، دەتوانم نموونەیەك بێنمەوە کە لەنزیکەوە ئاگام لێیە.

بەشێك لە بریندارنی هەردوو گوندی بالیسان و شێخ وەسانان کەوتنە سلێمانی بە هیممەتی دکتۆر و بەردەست و خەڵکی ئازاو بەغیەتی شاری هەڵەت و قوربانی، بەراستی ئەوناوە لەخۆوە نەهاتووە خەڵکی سلێمانی ئەوناوەتان پیرۆزبێت بەهیمەتی خەڵکی سلێمانی تواندرا بزریان کەن لە دەستی ڕژێم، بۆ هێنانەوەیان خەمێکی گەورە بوو خزمەکانی من چوونە لای ئاغەیەکی خۆمان کە موستەشار بوو، فەوجی هەبوو داوایان لێ کرد چەند پسولەیەکی ڕێپێدراومان بداتێ بۆ هێنانەوەی بریندارەکان، لە وەڵامدا وتبووی باشە بەکابرای هەواڵگری بەعس بڵێم بزانم ئەو ڕێ دەدات؟ خزمەکانم وتبوویان: میران بەردەکی لەسەردابنێیت باشترە خزمەکانم دەڕۆن، دواتر خزمەکانی من دەچنە لای ئاغەی سوورچیان بەڕێز محەمەدی قادری لەگوندی باتاس، بەهەمان شێوە داوای پسوولەی لێ دەکەن، کاك محەمەدی قادری دەڵێت: "پسوولۆك و لۆ چنە هێزەکە لە دووکانن هێزەکامە ببەن ئەوەی دەنگی کرد تەداکێی وەکەن" ئەوە دەقی ڕستەی محەمەدی قادری سورچیە، واتە بڕۆن هێزێکی من ببەنە سلێمانی بریندارەکان بیننەوە ئەوەی دەنگیشی کرد لە بازگەکان بیان کوژن داکیان واو والێ بکەن بەڵێ ئەوە ئاغاکانی ئێمەنە و ئەوەش ئاغەی سوورچیان خزمەکانم دەچن چەند سەیارەی پڕ لەچەکدار دەبەنە سلێمانی و بریندارەکانیان هێنانەوە، بەڵام دووڕێنێ کێخوا حەسەن هەموو ئاغەکانی خۆمانی لەمردن ڕزگاردەکات ناهێلێت

دەخانوودا بسووتێن کە مەحەموود کاوانی دەوریان دەگرێت لەگەڵ (مەلاماتۆڕ) و هێزی پێشمەرگە، لەخانووویەك دا لەبالیسان. ئایا(مام کەماڵ بەگ)ی نووسەری خۆشناو خۆشناوەتی ئاگای لەو بەسەرهاتانە نەبووە، یان خۆی لێ لاداوە بەسەرهاتێکی تر لەسەردەمی (حەمەد بەگ) ی لبی (میوامنی خدر بەگی میوسی )، لە شێخ وەسانان کێخوا برایم هەبووە لەبنەماڵەی ( سۆی خدری) دۆستی (حەمەد بەگی) میوسیان بوو، لەو کات نێوان میوانی میووسی و نێوان میر مەحمەریان تێك دەچێت.دەبێتە شەڕە تفەنگ لەسەروی (کانیێ نیوکۆمێ لەو بەرولەوبەرمیرمەحمەریەکان پێشڕەوی دەکەن میوسیەکان پاشەکشە دەکەن و دەچنەوە قەلاّت و دەوروبەری، میرمحمەریەکان گردی سەرمێرگیان لێ دەگرن (حەمەد بەگ) ترسی لێ پەیدا دەبێت، ئەسەر دەستی خزمەکانیان هەموویان بکوژرێن کەسێك بەجلکی..... ڕەوانەی شێخ وەسانان دەکات و پێی دەڵێت برۆ هاوار بۆ کێخوا (عالی) ببەن ئەنگاتێ میر مەحمەری هەمانن دەکوژن ( ئێمە بە عەلی دەڵێین: عالی.) کێخو عەلی دەنگ لەشێخ وەسانان دەدات زیاتر لەسی کەس بەدوای دەکەون لەلای کانی گۆرەشێر دەکەنە تەقە لەسەر میرمەحمەریان و میرمحمەری دەشکێنن و پاشەکشە دەکەن، لەو شەڕە کوڕێکی کێخو عالی دەکوژرێت دواتر خزمەکانیان لە هەردوو لا دێن نیمچە سوڵحێك دەکەن، دوای ماوەیەکی تر شەڕ دروست دەبێتەوە بەهەمان جاری پێشوو، کوڕێکی کێخوعالی لەتۆڵەی برایەکی ئەوکەسە دەکوژێت کە دەستی هەبووە لە کوشتنی برای ناوی ...... بووە و خەلکی هیان بووە، پیاوی میانی مەحمەری بووە دووبارە خزمانی هەردوو لا دێن سوڵح دەکەن، پەیوەندی ماڵی سۆیخدری شێخوسانان بۆماوەیەکی زۆر لە گەڵ بنەماڵەی میوسی خۆش دەبێت، دوای ئەو هاوکارییەی بۆیان کردبوون لەدوای مردنی کێخوا عالی بنەماڵەی سۆیخدری برایەکی لەشوێنی دادەنێن بەناوی کێخوابرایم ڕۆژێکیان کێخوا برایم بەسەردان دێتەماڵی خدر بەگ کێخوا برایم کەسێکی لەگەڵ بووە بەناوی ڕەسوول لەبنەماڵەی ئەحمەرێ کەبەژنان تێکەڵی ماڵی سۆیخدری بوون قسە بەقسە دێنە سەر ئەوەی فلان زۆر بەهێزە و فیسار زۆر بەهێزە کێخوا برایم دەڵێت: ڕەسووڵی منیش زۆر بەهێزە...... بەگ خزمێکی خۆیان بووە دەڵێت: من لە ڕەسوولی بەهێزترم ڕێك دەکەون عاردانە بکەن کێ کێ لە ئەرزی دەدات خەنجەران لە بەرپشتێ دەردێنن تێکومرانە دەکەن واتە زۆرانبازی هەردووکیان زۆر بەهێز دەبن دواتر ڕەسوول ..... بەگ لە ئەرزی دەداو چۆکی لە سەر سنگی دەدات .....بەگ زۆر شەرم لەخۆ دەکاتەوە و کە ناکرێت کرمانجێك کوڕە ئاغەیەك لە ئەرز بدات پەلاماری خەنجەرێ دەدات

رەسوول دەداتەبەر خەنجەران برینداری دەکات لەشەرمان . کێخوا برایم خەنجەرێ دەردینی و پەلاماری.... بەگ بدات دیارە ئاغاکان کێخوابرایم دەگرن تاکو .....بەگ ڕادەکات کێخوا برایم رەسوول دەباتەوە و بەدەرمانی کوردەواری چاکی دەکەنەوە نێوان بنەماڵەی کێخوا خدری و میوسیان بۆ دوواجار تێك چوو دوای چەند ساڵ..... بەگ دەنێرن ببیتە ئاغای شێخ وەسانان بنەماڵەی سۆیخدری بەدووای دەکەون بەتفەنگان کەسێك دەی شارێتەوە لێی ناگەرێت بکوژرێت بەناوی :(حاجی مەلا) کە دەکاتە بنەماڵەی لەیلیێ لەبن گیای دەشێرێتەوە، بەشەو دەربازی دەکات لەو ڕووداوە بەولاوە دۆستایەتی ماڵی سۆیخدری لەگەڵ میوانی شەقڵاوە خۆشتر بوو، بە تایبەتی لە سەردەمی کێخواخدر تاکو زەمانی عوسمان بەگ و سەرەتای شۆڕش دۆستایەتی بەردەوام بووە، لەنێوان بنەماڵەی سۆیخدری و تیرەی میرمەحمەری لە شەقڵاوە واتە: بنەماڵەی سۆیخدری وازیان لە ئاغاکانی بالیسان هێنا بەهەردوو تیرە، دەکرێت شتێك بلێین بەدرێژایی بنەماڵەی مندالآتی ئەمبێز و دانیشتوانی شێخ وەسانان کێشەو ململانێ و دۆستایەتی و دووژمنایەتی هەبووە زۆرو کەم سەردەم بۆ سەردەم مندالآتی ئەمبێز نە لەگەڵ شێخ وەسانیان هەڵیان نەکردوەنەبێ ئەوانیش ئیدارەیان کردوە و میوایەتیان پێنەکراوە بەهۆی شێخ وەسانیان نەبێت دووژمنایەتی و دۆستایەتی بەردەوام بووە، بەتەنیا شێخ وەسانی لەمەیدان مانەوە.

من زۆرشتم لەبارەی گوندی خۆرانیان و سکتانیان زانیوە ئەودوو گوندەش وەك شێخ وەسانان ملکەچ نەبووینە و توشی دەیان کێشەبووینە لەگەڵ مندالآتی ئەمبێز لەهەردوو لا خەڵك کوژراوە و دۆست و دوژمنیش بووینە لەو ڕۆژگارە، هیوادارم لەخزمانی سکتان و گوندی خۆران ئەوانیش باسی گوندەکەی خۆیان بکەن، لەهەمووڕووێکەوە چونکە ئەو دوو گوندەش ململانەیان کردووە لەگەڵ زۆرداران.

*** *** ***

بەسەرهاتێکی تر کە دەکرێت بکرێتە فیلم لەلایەن هونەرمەندان، لە دەست بەسەرداگرتنی زەوی جووتیاران لە گوندی هەرمك، کابرایەك هەبووە بەناوی ( سلێمان دۆت مەلا) خاوەنی زەویوزارێکی زۆر بووە، کە لەباب و باپیری بۆی دەمینێتەوە، بەناوی (پرکانیان) ئێستا مەشهوورە بە ( زێخان )، یەکێك لە ئاغاکانی مەلۆکی، چاو دەبڕێتە مولکی (سلێمان دۆت مەلا )، ئەیەوێت بەپیلانێك تاوانباری بکات و کەسێك دەست نیشان دەکات لە گوندی هەرمك دەڵێت: ئەگەر سلێمان چووە ماڵێك ژنەکە بە تەنها لە وێ بوو وەرە پێم بڵێ، ڕۆژێك مام سلێمان بۆ

**نەگبەتی گاجووتەکانی بە پێش خۆداوە بە نیازی جووتکردن لە مێرگەسەر، دیارە مێرگەسەر ئەوکات چۆڵ بووە، هێشتان لە گوندی دەرنەچووە قەننە دادەگرێت لە توتن و ئەستێ و بەرد دەردێنێت، قاوە ئاگر ناگرێت بۆ ئاگر وەرگرتن دەچێتە ماڵی، عەولاقوت ماڵیان لەسەر رێگابووە، خێزانی مام عەولاقوت ناوی( سارا) بووە، خەریکی نانکردن بووە سلێمان دەڵێت سارا پشکۆیەکم وێدە لۆ سەرقەنێ ساراش دەڵێت: سلێمان وەرە پشکۆیەکی لە بن سێرێ دەرینە مام سلێمان پشکۆ دەبات و(سارا)ش نانێکی گەرمی وێدەدات سلێمان دەڕوات دەچێتە مێرگەسەر بۆ جوتکردن، کابرای جاسووسی بێناموس، ئاگاداری ئاغەکان دەکاتەوە کە ئەمڕۆ سلێمان چووە ماڵی عەولاقوت و سارا بەتەنیا لەماڵە، سولێمان جۆت دەکات تاکو ئێوارە، ئێوارە دەگەڕێتەوە گوندی هەرمك لەپڕ چەند پیاوێکی ئاغا پەیدادەبن،مام سلێمان وعەولا قوت و سارا، دەبەنە گوندی مەلۆك بڵاو دەکەنەوە کە ئەمڕۆ بەیانی سلێمان چوویتە لای سارا و زینایان کردووە لە ژوورێك بەندیان دەکەن، تا بەیانی. ئەوکات لە خۆشناوەتی کوشتن لەسەر ئەوکارانە نەبووە نەریتێکی تر هە بوو، سەری سارا دەتراشن و سەرو برۆو سمێلی سلێمان یش دەتراشن پشتاو پشت هەریەکەو سواری کەرێکیان دەکەن هەریەکەو بادیە ماستێکیان بەسەر سەری دادەکەن لە گوندی (مەلۆك بۆ گوندی، هەرمك، بۆ زێوە و هەرتەل و بێتواتە و دواوە و نواوە و وەرەو و مەلۆك) بۆ کەرامەت شکاندنیان، لەو هەموو گوندەش مناڵان هان دەدەن بەردیان تێ بگرن و چەپرەیان بۆ لێ بدەن دواتر جەنابی ئاغە سلێمان جەزا دەدات بە سەد لیرە بە زۆر سارای بە (عەولا) کە ناسراو بووە بە (عەولاقووت) واتە (عەولای کورتە بالا) تەڵاق دەدەن و بەزۆر لە سلێمانی مارە دەکەن هەرچەند سلێمان دەڵێت سارا وەك خوشکم وایە و سارادەڵێت سلێمان وەك برام وایە کەس گوێیان لێ نا گرێت مام سلێمان دەست دەکات بەموڵك فرۆشتن بۆ پەیداکردنی ئەو سەد لیرەیە دواتر ماڵی دەباتە (گوندی شیوە) دیارە زەویە بەراوەکانی (پرکانیانیش) کە ئێستا پێی دەڵێن (زێخان) ئەوێش موڵکی سلێمان بووە دەبێتە موڵکی ئاغەی لەسەرەوە ئاماژەم پێ کرد سلێمانیش لە گوندی شیوە دەبێتە سەپانی خەڵکی لە ماڵ وێرانی و هەژاری، هەر هەمان ئاغا بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی دەستەڵاتی پێوستی بە شێخێك هەبووە کە ناسراوەبە شێخ( ..)ی زێخان بە ئەصل خەڵکی سورچیایەتیە لە گوندی (بێراوە) دەبێتە مەلا و مەلا ماوەیەك ماڵی لە ناو گوندی بێراوە دەبێت دواتر دەڵێتە خەڵکی گوندی خانوویەکم لەدووری گوندی بۆ دروست بکەن خەڵکی بێراوە لە خوار گوندی بێراوە خانووی بۆ دروست دەکەن لەسەر ئەرزێکی مزگەوت**

ماوەی سێ ساڵ دوای ئەو ڕووداوە ئاغەکانی مەلۆك زەویەکانی پرکانیانی پێشکەش دەکەن ناوبراو بەهانە بەخزمانی بێراوە، دەگرێت و دەڵێت شەرعەن دروست نییە من لەسەر موڵکی مزگەوت بم، خزمانی بێراوە ئەو ئەوبەهانە شی دەبڕن دوانزە پارچە ئەرز پێشکەش بە مزگەوت دەکەن لەجیاتی ئەو شوێنەی خانوووی لێ کراوە بەوەش ڕازی نابێت و لەسەر قسەی ئاغا ماڵی لە بێراوە بار دەکات بۆ پرکانیان ئێستا ناسراوە بە زێخان، سلێمان کەخاوەنی ئەو هەموو زەویانە بووە لەو ڕووداوەی بۆی دروست دەکەن بۆتە سەپان لەلای خەڵکی گوندی شیە.لە دوای پانزە ساڵ کە جەنابی ئاغە دەمرێت ڕۆژکیان بەخەیاڵی دادێت بچێتەلای شێخ....دەچێتە لای شێخ و دەڵێت یاشێخ تۆ شێخێکی گەورەی و لەخوا ترسی ئەو موڵکەی تۆ لەسەری موڵکی منە، وەختی خۆی بە بووختانێك لێم زەوت کراوە جەنابیشت ئاگاداری ئەوە بووختانەی بووی ئەگەر نیوەم بدەیەوە لە نیوەی تر گەردەنت ئازاد دەکەم شێخ تووڕە دەبێت و بەدەرویشان دەڵێت: لێی بدەن و دەری کەن بەڵێ مام سلێمان لێدانێکی باشی پێ دەبڕێت لەسەردەستی دەرویشان.

سەیرکە جەنابی شێخ لەگوندی بێراوە هەمجەت بەپارچە عەردێکی دێم دەگرێت دەڵێت شەرعەن دروست نییە لەسەری دابنیشم نوێژم بەبەرناکەوێت لەهەمان کات دەچێت تەکییە و مزگەوت لەسەر موڵکی مام سلێمان دەکات کە چەندان دۆغی بەراوە چەندان کانی و کانیاوی تێدایە، ئەوەی باوەڕ ناکات بەو بەسەرهاتە تاکو بەشێك لە بەساڵاچوان ماون وەرن پرسیار بکەن لەو ڕووداوە، لە گوندی بێراوە و گوندی شیە و گوندی هەرمك، بەڵێ بەو شێوەیە منداڵەکانی ئەمبێز دەستیان بەسەر خۆشناوەتی داگرتوە ، هەر لەو زمانە ڕۆژکیان ئەو شێخ، دەچێتە گوندی شیە لای باوکی حاجی مەولوود دوای چاك و چۆنی دەڵێت من ئەو گۆپارەم بۆت هێناوە بەخانووی وەبکە ( رسقت ) بەخۆ بەسەردا دەبارێت و لە کولانکەی خانی دێتەخوارێ، لە بەرانبەر ئەو گۆپارە ئەتۆش زەویەکانی خۆران بدەمن، باوکی حاجی مەولوود پیاوێکی غەریب بووە، باوەڕی کردوە ب ەشێخ مامەڵەکە سەر دەگرێت، شێخ دەڕوات باوکی حاجی مەولوود گۆپار بەنزیك کولانکەی خان و وەدەکات بەنیازی هاتنەخوارەوەی رسق لەکولانکێ دواتر حاجی مەولوود دێتەوە ماڵەوە حاجی مەولوود پیاوێکی زۆر وشیار و زیرەك و قسەزان بووە لەو سەردەم باوەڕی بەشێخان نەبووە چاوی بە گۆپار دەکەوێت پرسیار دەکات لە باوکی مەسەلەکەی بۆ دەگێرێتەوە، حاجی مەولوود گۆپار دەست دەداتێ و بەرەو زێخان دەکەویتە ڕێ دەچێتە لای جەنابی شێخ دەڵێت یاشێخ مادام گۆپارەکەی تۆ سەرچاوەی ڕسقە قوربان بە تەکیەی وەکەی باشترە، نەکو لەماڵی

**ئیمە. نزیکی زەویەکانیش بکەوی ئای لەحاڵت ئاغەکان کوشتنی هەر کەسێك کە مەترسی هەبوویێ یەکێك لە قسەکانی ئاغەکان دەڵێن :**

**(کرمانج تێری خوارد یان کەسێك دەکوژێت یان ژنێك هەڵدەگرێ، واتە: مەهێڵن جووتیار تێربخوات :**

**خودا بەردی گەورە و گچکەی دروست کردوە، یان**

**کارێتە لە کفری هەر ناکەوێ، یان گیا لەسەر پنجی خۆی شین دەبێتەوە**

**واتە ئاغە هەرئاغەیە و کرمانجیش هەر دەبێت خزمەتکار بێت و جووتیاریش وەك داری کفر وایە و پیاوی لێ هەڵناکەوێت جووتیار مرۆڤێکی بێ کەڵکە، جووتیار هەر جووتیارە و ئاغاش ئاغەیە.**

**نموقسانە بۆ قەدەم شکاندنی جووتیاران بووە، باوەڕیان بەخۆنەبێت وە منداڵانی ئەمبێژ ئەوانەی میر بووینە غەدرێکی زۆریان لە خزمەکانی خۆشیان کردوە ئەوانەی لە دەستەڵات بووینە خزمە بێ دەستەڵاتەکانیان چەوساندیتەوە و موڵکیان لێ داگیرکردوون یان میراتیان پێ نەداون، یان یەکتریان کوشتووە لەسەر میرات و لەسەر میرایەتی وە لەپێناوی بەرژەوەندی خۆیان خزمەکانی خۆشیان بەکوشت داوە،کەدەیان نموونەی بەرچاو لەڕابردوو هەیە نموونەی: وەك کوشتنی (علی بەگ) کە پیاوێکی باش بووە و مەترسیان هەبووە ببێتە میر شەڕیان پێ فرۆشتوە، لەسەر میرات کوشتویانە کە پیاوێکی باش بووە .**

*** *** ***

**(برایم بەگ و......بەگ) برابوون لەسەر میرایەتی برایەتی نێوانیان تێك دەچێت برایم بەگ ماوەیەك ماڵی خۆی دەباتە گوندی شێخ وەسانان وەك میوان بۆ ئاغایەتی نا (برایم بەگ) ماوەیەك لەترسی(.بەگ برای لەوێ دەمینێتەوە (..بەگ هەوڵەدەن بیکوژن بە دزی ..کێخوافەقێ ئاگاداری خزمەکانی برایم بەگ دەکاتەوە تاکو برایم میوانی من بی، لە شێخ وەسانانە و کەسیش بۆی نییە بیکوژێت بۆیان نەکراوە لە شێخ وەسانان بیکوژن (...بەگ وابەباش دەزانن بەفێڵ بیکوژن، چەند کەسێك دەنێریتە لای (برایم بەگ ) داوای لێ دەکات بێتەوە بۆ جاری دووەم خەڵکی دەنێرێت کە ئێمە براینە و لێك تورە بووینە و پێك دێینەوە، هەربرای یەکین! برایم بەگ باوەڕیان پێ ناکات، وابەباش دەزانن بە خزمێکی خۆیان لە گوندی بێراوە، برایم داوەت بکەن، پیلانەکە سەر دەگرێت، برایم سەردانی گوندی بێراوە دەکات بووکێکی ئەو ماڵە ئامۆزای**

**برایم دەبێت که نانیان بۆ دەبات دووسێجار ئیشارەت دەداتە برایم نان نەخوات و ڕابکات برایم تێ ناگات دەست بۆنان دەبات پەلاماری دەدەن، بەخەنجەران و دەی کوژن هۆی کوشتنی برایم بەگ ئەوەبووە که مەترسی هەبووە برایم بەگ ببێتە میر و شوێنی پێ لەق بکات هەر هەمان شەو مەیتی برایم بەگ بە دزی دەبەنە شێخ وەسانان، دەی هاوێنە کانی سنجەرێ، بۆ ئەوەی بە خەڵکی بڵێن شێخ وەسانیان برایم بەگیان کوشتووە! ئێستا گۆڕی برایم بەگ لە گۆڕستانێکی شێخ وەسانانە بەناوی گۆڕستانی(ماندیان) لە شوێنەواری گۆڕەکەی یەك کێلی ماوە . دەکەوێتە نزیك گۆڕی کێخوافەقێ نموونەیەکی تر:**

**(خدربەگ بابی رەشید بەگی بالیسانێ) داوا لە کێخوا فەقێ دەکات سەردانێکی دەشتی هەریر بکەن کێخوافەقێ دەبێتەمامی بابیم بەرێ دەکەون کێخوا فەقێ چەند خزمێکی خۆی دەبات دەگەنە گوندی (کۆیکان) لە شوێنێك دەگەنە کۆمەڵێك خزمی خدربەگ، شوێنەکە مەشوورە بە(مەندێ کۆیکان )، (عوبێد بەگ) و چەند خزمێکی خۆیان لە وڵاغ فڕێ دەدەن بۆ ئەوەی (خدربەگ) بکوژن، کێخوا فەقێ خدربەگ داوێتە پشت خۆی و چەك سوار دەکات خزمەکانی کێخوا فەقێ ئەولاوئەولا دەبن، دەڵێت تا من نەکوژن خدربەگ ناکوژرێت، زۆرداوای لێ دەکەن دەڵێن: وازبینە بابیکوژین ئێمە باشتریش دەبین بۆتۆ و خزمەکانت لە خدر بەگ، کێخوافەقێ وازی لێبینە بابیکوژین ، کێخوا فەقێ دەڵێت من ناتان کوژم بەڵام تامن نەکوژن ناهێلم خدربەگ بکوژرێت دەتوانن جارێکی تر بیکوژن خزمی خۆتانە ئەوجارەیان من لەگەڵی هاتیمە وازی لێ بینن واز لە خدربەگ دینن و عوبێد بەگ دەڵێت: خزمینە واز بینن ناکرێت کێخوا فەقێ بکوژین، کێخوا فەقێ بکوژین میرایەتی لە بالیسانی لۆمەنابی کێخوا فەقێ خاوەن کەسوکارە بالیسان بە مە ناخورێت، خدربەگ نەجاتی دەبێت هەردووکیان دەگەڕێنەوە بالیسان،خدربەگ تا لەژیان دا بووە ڕێزی زۆری بۆ کێخوا فەقێی شێخ وەسانان هەبووە وە ڕەشیدبەگی کوڕیشی زۆربە نەرمونیانی بەرانبەر شێخ وەسانان نەرمونیان بووە، بەتایبەتی بەرانبەر بنەماڵەکەی ئێمە وە لەسەرەتای شەستەکان کە هێزی پێشمەرگە دەورەی قەڵاتی میر مەحمەریان دەگرن لەبالیسان، کێخواحەسەنی کوڕی کێخوافەقێ دەیان لە ئاغەکانی میروسی و میرمەحمەری لە مردن نەجات دەدا لەکاتێکدا لەلایەن هێزی پێشمەرگە دەوریان گیرا بوو رزگاری کردن بەهیمەتی خۆی وخزمانی نەی هێشت ئاغاکانی میروسی و میر مەحمەری دەخانوودا بسووتێن، دواتر کە چونە سیساوە و پشتیان بەهێز بوو،بە پاڵپشتی ڕژێمی ئەوکات کێخوا**

حەسەن بۆخزمێکی داوای فەردە ئاردێك دەکات نای دەنێ، دەهەری گرەوە کێخواحەسەن ئەوە تەمیعاتی ئاغەکانی ئێمەیە! کێخواحەسەن بەخۆی وخزمان بەرەو لای میانی شەقڵاوەی باداوە کەمێ مەحمەرین، عوسمان بەگ زۆر بەرێزەوە کێخواحەسەن و خزمەکانی وەرگرتەوە هەمووشتێکی بۆدابین کردن لەشەقڵاوە و لە گوندی دەربەندیخان و بەزەوی و زارەوەش، ئەو پەیوەندیەی نێوان ئێمەو میانی میروسی لە فەردە ئارد بەرەو کزی چوو، خەریکە نەمێنێت و نەماوە وەباوەڕیش ناکەم دروست بێتەوە، ئەو نموونانە بۆیە دێنمەوە بۆ ئەوەی بزانین ئەوان بەزەییان بەبراو ئامۆزاکانی خۆشیان دا نەهاتیتەوە ئەی بەرانبەر جووتیاران چۆن بووینە؟

لەزەمانی (.... بەگ )تیەی مەحمەریان لە بالیسان سێ برا دەچنە ڕاوە(سیخوڕێ) دوو یان بەنیاز بووینە براکەیان بکوژن کە تاوانی ئەوەبووە داکیان جیاوازبووە لە وانیش گەورەتربووە، مەترسیان هەبوو ببێتە میر لە کاتی لەکونە سیخوور دێتەدەرێ، لەژوورەوە گوێی لە قسان دەبێت خۆی خەریك دەکات لە دەرگای کونەکە چاودێری براکانی دەکات لە فرسەتێك دێتەدەرێ و پەلاماری چەك دەدات هەردووکیان دەکوژێت!

*** *** ***

## چیرۆکێکی سەرنجڕاکێش

( یەك تیبینی هەیە بۆ ئەوەی خوێنەر تێی بگات ئەو چیرۆکەی باسی دەکەم زۆر کۆنە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ( ١٨٢٣) بەسەرەوە، دیارە لەو تاریخە نەخۆشی تاعوون زۆربەی بنەماڵەکانی وێران کردبوو ئەو کات دوو بنەماڵەی شێخ وەسانان کە بنەماڵەی سۆیخدر و مستی حەوێزی گەشەیان نەکردبوو، بۆیە ئاغاکان توانیبوویان، ئەو کارەساتە بخولقێنن دوو بنەماڵەی تر هەبووینە دواتر بە تاعوون دوو کەسیان لێ دەرچوون ئەو دوو بنەماڵە بەرەو نەمان چوون (مام ڕەسوول) کە ناسراوە بە(ڕەسوی کۆران) تاوانی ئەوە بووە دۆستی میری کۆسە بووە میری کۆسەی بالیسان سەر بەئیماراتی بەبە بووە خزم و کەسی میری کۆسە پیوەندی بە میری سۆرانەوە دەکەن دەڵێن ئێمە میری کۆسە دەکوژین و تۆش پشتیوانین بکە، میری سۆرانیش ڕەزامەند دەبێت خزمەکانی میری کۆسە بە ناوی داوەت لەسەر نان خواردن پەلاماریان دەدەن میری کۆسە و کوڕەکانی دەکوژن کە خزمی خۆیان بووینە وە بەرنامەش بۆ مام ڕەسوری کۆرانی شێخ وەسانی دادەڕێژن، کە دۆستی نزیکی میری کۆسە بووە. مام ڕەسوول خۆی وخێزانی و دوو کوڕی خێزاندار

و لەگەڵ حەوت منداڵی لە تەمەن جۆرا و جۆر لە گوندی شێخ وەسانان وەك خەڵکی تر خەریکی کارو کاسبی خۆیان دەبن مام رەسوول پیاوێکی بە هەیبەت و ئازاو چاو نەترس بووە خاوەنی گاجووت و رەز و مەڕو ماڵێت بووە، کۆنە ڕەزی مام رەسوول دەکەوێتە ژێر شاخی، کە ناسراوە بە ( کێلی کیناوێ) لە گەری شێخ وەسانان، وەچەند زەویەك ئێستاش هەریەناوی رەسوی کۆران مەشوورە بنەماڵەی ئەمبێژبەگ پیلان بۆ مام رەسوول دادەنێن، دەرەبەگەکان زۆر بێزاری دەکەن لە وەرگرتنی باج و سەرانە مام رەسوول ئازا و خاوەن چەند چەکێکی ئەو کات بووە، لە چەکە سەرەتاییەکان نایەوێت ملکەچی بنەماڵەی ئەمبێژ بێت منداڵانی ئەمبێژ زۆر هەوڵ دەدەن بەدزی بیانکوژن هەوڵەکانیان سەر ناگرێت چەند جارێك ئاغەو پیاوەکان پارێزی بۆ دەبەن بەشێمان دەبنەوە، دەڵێن : ئەگەر تەقەمان لێ کرد پێی نەکەوت خۆ رەسوول هەموومان دەکوژێت لە بەدبەختی مام رەسوول نەخۆشی (خروکە) لە ماڵی ئەوان دەست پێ دەکات سەرەتا چەندکوڕێکی لەماڵەوە دەکەون، درەبەگەکان بەوە دەزانن پیلان دادەنێنەوە بۆ لەناو بردنیان ئەو ڕۆژەی دەست بەکار دەبن مام رەسوول لە بەرانبەر گوندی کانی بەرد خەریکی جووت کردنە، چەند پیاوێکی ئاغا پارێزی بۆدەبەن بەدزییەوە بۆی دەچن لەو کاتەی مام رەسوول لە چەکەکەی دوور دەکەوێتەوە پەلاماری دەدەن دەی گرن، دەیبەنەوە گوندی شێخ وەسانان، لەلای کانی سنجەرێ دارێکی توی لێ بووە ئێستەش ئەوداره توە ماوە، بەڵام دارتوەکە بەرەو پیری چووە دەکرێت ئەودار تووە دەیان چیرۆك و بەسەرهاتی لە لابێت کە ئێمە نای زانین ئەوکات مام رەسوول لە دارەکە دەبەستنەوە و دەچنە ماڵی مام رەسوول هەردوو کوڕە گەورەکەی کە لەماڵەوە نەخۆش بووینەو چاویان دنیا نەدیوە ئەوانیش دێنن بۆلای مام رەسوول و لە هەمان دار دە یان بەستنەوە دەرەبەگەکان بڕیار دەدەن لە کوشتنی ئەو بنەماڵەیە دەبێت هەموو بنەماڵەکانی شێخ وەسانان بەشداری بکەن، هەموویان بەشدار دەبن، بەشداریشیان ئەوکات بنەماڵەکان ڕێژەیان کەم بووینە نموونەی باپیرە گەورەی ئێمە ئەوکات کەناوی مستێ حەوێزی بووە، تاکە نەفەر بووە منداڵەکانیشی ورد بووینە مام رەسوول و هەردوو کوڕەکەی دەکوژن دووکوڕە گەورەکەی مام رەسوول ناویان (حەسەن وحسێن) بووە، دوای کوشتنیان وا بە باش دەزانن کۆتایی بەو بنەماڵەیە بێنن بۆ ئەوەی مناڵەکانیان گەورەنەبن و نەوەك تۆڵەی خۆیان بکەنەوە، بۆیە دەچنە سەر ماڵیان لە رێش دەست دەکەن بە کوشتنیان یەکێك لە بووکەکانی ڕادەکات ئەیەوێ منداڵێکیش لەگەڵ خۆی رزگار کات منداڵەکەی داوێتە سەر پشتی خۆی کەسێك بە خەنجەرێکی دەبان پەلاماری

نعلات و خەنجەرێك لە پشتی منداڵەکە دەدات و منداڵەکەو دایکی دەکوژێ ژنەکەش زگی هەبووەو واتە بەخەنجەرێك سێ کەس دەکوژێت بووکەکەی تری ڕادەکات منداڵێکی بچووکی پێیە بۆ بەرەو ماڵێك دەچێت کەسێك بە دوایەتی بیکوژێ لەپەنایەك منداڵەکە دادەنێت بەرەو لایەکی تر ڕادەکات، دواتر ژنەکە دەکوژن ژنێکی گوندی چاوی لەو ڕووداوە دەبێت، بەدزی منداڵەکە دەشارێتەوە منداڵەکە کچ دەبێت دوو منداڵی تر لە ماڵەوە نابن لە دووری ماڵەوە لەگەڵ منداڵانی گوندی خەریکی( کەلانە) کە(لەسەرمازوان و لەسەر چەقەلان-باوی ). یەکێك لەو منداڵانە کەبۆی دەچن بی کوژن دەڵێت مامە مەمکوژە تا کورتەك لەبەردەکەم بۆ ئەوەی پیس نەبێت پیاوکوژەکە ڕاناوەستێت دەی کوژێت، مناڵەکەی تریش دەکوژن، ( دەبێت ئەو منداڵە چەند ئەو کورتەکەی لاخۆشەویست بووە، دەست هەڵناگرن تاکو کۆتایی بەوماڵباتەدێنن، تەنها یەك کچ نەبێت کە تەمەنی شەش مانگانە دەبێت ئەو ژنەی ئەو منداڵەی رزگارکرد ناوی فاتم بوو لە بنەماڵەی عیسایان بووە، ماڵە خاڵی لە بالیسان دەبن کەدەکاتە بنەماڵەی سۆی عەودان کە ئەسۆفی عەود هاتوە ئەو بنەماڵەیە ئێستا بەشێکیان لە گوندی بێراوە دادەنیشتن وەك حەسەن و پیرە برایەکیان ناوی مەلا ئیسماعیلە، مامێکیان بەناوی (گزال) لە شەقڵاوە دادەنیشێت، فاتم ئەو بەدزی لەگەڵ مێردی منداڵەکە دەبەنە بالیسان ئەو منداڵە گەورە دەبێت و شو دەکات وەیان نەوەی تر دێنێتەوە ژیان و ژیان لێرە دەست پێ دەکاتەوە بەشێکی زۆری بنەماڵەی عەودان لە وەرەسەی ئەو کچەیەوەن.

*** *** ***

بۆ مێژوو بنەماڵەی عەودان بەئەسڵ خەرکی بالیسانن بۆ ئەوەی باشتر ئەو بنەماڵەیە بناسن ناسراون بە ماڵی ( عودی حەسەنەکۆری )، گۆڕی ئەو غەدرلێکراوانە لە بچووکی شێخ برایمە لە سەرووی گۆڕستانەکە بە ڕێزنێژراون خەڵکی شێخ وەسانان بەمەبەستی دەیان نەخۆشی سەردانیان دەکردن من بە چاوی خۆم دیت کوڕێك هەبوو بەناوی (سۆفی عەولا) لە بنەماڵەی سۆفیان کە دواتر بەچەکی کیمیا شەهید بوو، ماوەی چەندان مانگ نەخۆش بوو بە دکتۆران چارەنەکراو ناردیانەوە ماڵەوە بۆ مردن بە پشتی کەر بردیانە سەر ئەو گۆڕانە دواتر بە پێی خۆی هاتەوە، خەڵکی شێخ وەسانان زۆریان ئەو سەردانەی سۆفی عەولایان دی، جار ئەو جار بوو چاك بووەوە سۆفی عەولا چۆن چاك بووەوە؟ ..ئەوە منیش نازانم...

لەو کوشت وکوشتارە دوو بنەماڵە دەستی بەر چاویان هەبووە، لە هاوکاریکردنی ئاغەکان لەو ڕووداوە وەك بنەماڵەی(حاجیە شۆر) ئێستا پیان دەڵێن بنەماڵەی باپیری حەمبەری، بنەماڵەیەکی تر پێیان دەڵێن ماڵی حەسەنەقیتی،ئێستا ماڵی سۆفی مستەفایان پێ دەڵێن کە دووبنەماڵەی دەست ڕۆیشتووبوونە لە شێخ وەسانان.

دوای ساڵێك نەخۆشی کۆلێرە ڕوو لەناوچەکە دەکات و ئەو دوو بنەماڵەیە دووکەسیان لە ژیان دەمینێن و ئەوانی تر دەمرن ئەکرێ تۆڵە کردنەوەیەکی خودایی بووبێت باپیرە گەورەی ئێمە کە مەشوورە (بەمستی حەویزی) مستی حەوێزی دەکاتە بابی کێخوافەقێ، دواتر مناڵەکانی زاوەزێیان زۆر دەبێت، مستی حەوێزی لە کاتی ئەو ڕووداوە مناڵەکانی ورد دەبن لەو کوشتوکوشتارە بەشدارە لە ترسی دەرەبەگەکان نەوێراون، بەشدار نەبێت لە ترسی خودا تەنها باروتی تەقاندووە ئەو کات پێیان گوتووە (تێز) دواتر زاندراوە مستی حەوێزی لە کوشت و کوشتارە تەنها باروتی تەقاندووە، بۆیە ئەو بەندەیان لەسەرداناوە:

بڕێنە مستی حەوێزی،
سەنگەران لێوەگوێزی،
لە تفەنگێ نەبری تێزی،

(ئەو بەندە بەیتی شەڕی پشیلەش دووبارە بوویتەوە)، من پێم وایە خودای گەورە لەو هەڵوێستەی مستی حەوێزی کوڕ و نەوەکانی پاراستوون گەشەیەکی یەکجار گەورەیان کردوە، ئەو گەشەکردنە ئێستاش بەردەوامە خەریکە بێتام دەبیت، تاکو ئەو ساڵانەی دوایش خەڵکی دەچوونە سەر گۆڕیان وا باوبوو نابووا ئەو دوو بنەماڵەیە بچنەسەر گۆڕیان، بۆ چابوونەوەی نەخۆشی کە باپیرانیان دەستیان هەبووە لە هاوکاریکردنی دەرەبەگەکان، من لەسەر گۆڕی ئەو غەدرلێکراوانە دانیشتوم فاتیحەم بۆ خوێندوون، ئەوە چەند نموونەیەك باس بکەم لەسەر زەوی داگیر کردن و کوشتن دەست درێژی بۆ سەرناموسی خەڵکی لەو ڕووەش دەیان چیرۆك و بەسەرهات هەیە نامەوێ باس لەو چیرۆکانە بکەم لەبەر خانەوادەکان. ئەگەر باسیان بکەم ئاگر لە ویژدانی ئەو کەسانە بەردەبێت کە خاوەن ویژدانن، فەسادکردنی چەندان کچی هەتیو، ئەو زاڵمانەی ئەو کارانەیان کردوە بەشێکیان لەژیان ماون، ئاغاکان زۆر جار کوژراون لێرەو لەوێ بە شێوەیەکی نادیار لەلایەن جووتیاران، کە نامەوێت ناویان بێنم، زۆرجار سێ تیرەکەی مندالاتی

**ئەمبێز به دزی یەکتریان تیرۆر کردوە هەر تیرەیە و لە ناوخۆشیان لەسەر دەستەڵات یەك تریان کوشتووه، زۆرجار لە لایەن کەسێك مێژوو ژێراو ژور دەکرێت**

**نموونەی میری کۆسە هەرچەندە منداڵەکانی ئەمبێز لە بالیسان بووینە دەوردەوری میری کۆسە بووه، کە خزمی خۆیان بووه سەر بە ئیماراتی بابان بووه شەڕی میرانی سۆران ناوی میەکە نەزاندراوە، کەپێش میری کۆرەبووە بالیسان لەگەڵ میری کۆسە بووە و شەڕەکە زۆر خوێناوی بووە، دواتر هێزی بەبەکان گەیشتە شەڕەکە و لەشکری میرانی سۆران پاشەکشە دەکات تاکو نێوان گوندی خەتێو گوندی ئەشکەوتە لەدوای چەند ساڵێك کێشە لەنێوان کوڕانی ئەمبێز و میری کۆسە دروست دەبێت کەخزمی خۆشیان بووە، ڕۆژێکیان بە مەبەستی ئاشتبوونەوە منداڵەکانی ئەمبێز میری کۆسە داوەت دەکەن و لەسەر نانخواردن بە خەنجەران دەیان کوژن ماڵ ومنداڵیشیان دەکوژن دەستیان لە ژنانیش نەپاراستووە، تەنها منداڵێکیان لە ترسان دەچێتە لای ژنێك دەڵێت بشێرەوە با نەمکوژن ئەو جگانەت دەدەمێ، ((جگ) لە چۆکی ئاژەڵ دایەو جاران منداڵان یاریان پێ دەکردن ئەو منداڵە تەنها (جگی) شك بردوون کە بیبەخشێت لەپێناوی مانەوەی خۆی پەندێکی کوردی هەیە دەڵێت:**

**ئەگەر جگم نەبن،**

**کو بچمە جگ جگانێ؟**

**بەڵێ ئەو ژنە بەرێزە منداڵەکە نەجات دەدات منداڵەکە گەورە دەبێت و چەندان نەوەی لێ وەپاش دەکەون، یەکیان لەو نەوانە ناوی مامۆستا مەلا یاسینە لە بالیسان دادەنیشێت سەردانم کردوو ئەومەسەلەیەی پشت ڕاست کردەوە و وتی ڕووداوەکە ڕاستە، بەڵام لەمێژە وازی لێ بینە، سەردانی چەند بەساڵاچوێکیشم کرد لەبالیسان حەزیان نەکرد ناویان بێنم هەمان شتیان پشت ڕاست کردەوە، بەڵێ پشتر وتم: پێویست ناکات بۆ میرنیشینەکان بگرین ئەو ڕووداوانەی باسم کردن ئەو کوشت وکوشتارە لەژێرحوکمرانی ئەودوومیرحوکمڕانی بابانیەکان ومیرانی سۆران ڕوی داوە چارپۆشیشیان کردووە لەبەر مانەوەی میرایەتیان ئەو کات خۆشناوەتی بەتایبەتی دۆڵی بالیسان دابەش کرابوو لەنێوان هەردوو میرنیشین.**

*** *** ***

**من وەك پیاوێکی گێلۆکە و نەزان و نەخێندەوار، پێم وایە مێژوونووسان لەڕابردووی گەلی کورد شتێك شك نابەن میەکان نەبێت بۆیە لە دڵسۆزی بۆ گەل و نیشتمان ئەیانەوێت واپیشان**

بدەن پاڵەوانی سەردەمی خۆیان بووینە، هەرچەندە وانییە! دەوەرن مێژوونووسان رەحمەت لە بابوو باپیریش و پاسارێك بیبینەوە میری كۆرە لەسەرچی دووتیەی گەورەی كوردی جینۆساید كردن ئێستاش لەسەر ئەورووداوە مەیلی نەتەوەكەی خۆیان كزو لاوازە و بەشێكیان مەیلی عەرەب وجلوبەرگی عەرەبیان هەیە ئەوانیش برایانی ئێزیدی و برایانی شەبەك بوون تەنانەت بەمردوویش سوكایەتی بە میری ئێزیدیان دەكات، لەگەڵی علی بەگ هەلی دەواسێت تاكو تەرمی لەپاڵ یەك هەڵدەوەشێت، كورد قسەی خۆی هەیە لەسەركەسێك كە مرد من تەواوی ناكەم. لە هەمان كات توركەكان شتێك نەماوە بە برا ئێزیدییەكان نەكەن لە بەرچاوی میرانی بەرێزی كورد ئەگەر ئیسلام نەبوون خۆمرۆڤ بوون، یان كورد بوون یان جیهان بوون. عوسمانییەكان چەندان باجی جۆراوجۆریان خستبووە سەرخەڵكی كوردستان و ناوچەكەشمان وەك بردنی خەڵكی بۆ سەربازی كەپێی دەوترا سەفەر( بەلینگ )، كە بە هەزاران گۆڕەكەشیان ونە لەوڵاتان...باجەكان: گەنمانە و جۆیانە رەزانە و مێوژانە ونۆكانە و ماشانەو نیسكانە و مەڕانەو گۆلكانە و بزنانە و جیسكانە و توتنانە و رۆنانە و سەوزانە و... سەوزانە واتە: هەرشتێكی سەوزكرابا، باجیان لە بەرانبەر وەردەگرت، زۆری تریش دوا باجی عوسمانییەكان.

*** *** ***

گەنجەكان ئاگادارین، پێم خۆشە دەستەڵاتداران لێتان بترسێن و ئومێدیشیان بە ئێوە هەبێت، واتە هەردووك لە لایەكەوە ترس و لە لایكەوە پشتیوان واتە لەلایەك با حكوومەت لێتان بترسێ، لەلایەكی تر حكوومەت بزانێت لەكاتی تەنگانە گەڵ پشتیوانی حكوومەتە بەدەستێك هەڕەشە لە حكوومەتی هەرێمی كوردستان بكەن بەدەستەكەی ترتان ئالای كوردستان بەرزبكەنەوە، بۆ ئەوەی جاریكی تر قونانە نەدەینە داگیركەران، دووژمن بێتەوە دەبێت قونانە بدەین، قونانە، واتە هەركەسێك، قونی خێزانی، گەورەبا دەبووایە باج بدات! ئەوەی نویّ ئاگادارین ئەگەر یەكرێزی خۆمان نەپارێزین ولات و نیشتمانی خۆمان خۆشنەوێت دوژمنان قونانەمان لیّ دەستینن. واز لەو توندرەویەی حیزبایەتی بێنن لە شەڕی نێوان پارتی و یەكێتی خەڵكی بە ئارەزوی خۆی هەموو پیوەندییە كۆمەڵایەتیەكانیان لێك هەڵوەشاندەوە تێكیان شكاند، كە كاریگەری خۆی دەبێت بۆ چەند ساڵی تر من بۆ مێژوو لەناو ئەو شەرە ژیاوم كە لە زۆر وەخت ئەمریان پیّ نەكراوەو كاری زۆر خراپیان ئەنجام داوە، پاساو بۆ شەڕی پارتی و یەكێتی نایێنمەوە كارێكی خراپ بوو بەڵكوو گەلیش دەوری خراپی هەبوو لەوشەرە، هەڵوێستی نەبوو، ئەوەی شێخ ئەمری پیّ دەكرد، وەك

دعوێش بەرئەمربوو، وەزیاتریشی ئەنجامی دەدا، ئەتوانم نموونەیەك بێنمەوە: لە كەپكی حەمەد ئاغا شەڕەكەگەرم بوو، لەنێوانیان چەند كوڕەجووتیارێك و چەند پێشمەرگەیەكی یەكێتی كوژران دواتر بەشێكی زۆر پێشمەرگەكانی پارتی بە دیل گیران ئەگەر كاك ( ئاریزعەبدوڵلا ) نەگەیشتبا شوێنەكە بەنیاز بوون هەموویان لەشاخی فڕێ بدەن سەیركە بەرپرس دەڵێت مەیان كوژن لەشاخیان فرێمەدەن كورەجووتیار راناوەستێت دەڵێت وادەكەم كاكی من ئەوەبراتە پشتوپەناتە بۆلەشاخی فرێدەدەی گومانم نیە لەناو پارتیش ئەوە ڕوویداوە، یەكجار زۆربووینە ئەتوانین نموونەیەك لەناوپارتیش بینینەوە: كورێك بەدیلی بەناوی عەبدوڵلا مستەفا كەوتە دەست كۆمەڵێك بارزانی ئەوان نەیان كوشت، بەرەودواوەی شەرگەیان بردبوو، چەند كەسێك هەوڵیان دابوو بیكوژن، بەرپرسێك نەی هێشتبوو بیكوژن.

كاك مەسعوود بارزانی قسەیەكی جوانی كرد وتی خەڵكی شەڕی نێوان پارتی و یەكێتی دروست كرد، منیش دەڵێم جەنابی راست دەكات ئەگەر گەل وەك كۆیلە سەیری خۆی نەكات و رچاوی بەرژەوەندی گشتی بكات و گەل و نیشتمانی خۆش بوێت و یەك رێزی گەلی لەلا لە هەموو شتێك گەورەتربێت، هەڵوێستی دەبێت، من ڕۆژێك لە ڕۆژان نەمدیوەو نەمزانیوە كەس بە زۆر رەوانەی شەرگەی نێوان پارتی و یەكێتی كرابێت بەڵكوو زۆرشتیان دەكرد بۆ ئەوەی بەرپرسەكەیان بیان بینن، بیانكەنە بەرپرس و مەسولایاتی وەرگرن خۆیانی پێ فشكەنەوە و ژیانی خۆیان پێ خۆشكەن.

*** *** ***

بابێینەوە سەر مەسەلەی خۆمان جووتیاران سەرباری باجی عوسمانییەكان دەبووایە چەند باجی تریش بدەنە ئاغا و كێخوای ئاغاكان كەسێكیان دەكردە كێخوا كە بەر ئەمریان باوە لەو گوندەش كەسوكاری زۆربایە ئاغاكان وەك عوسمانییەكان باجیان وەردەگرت، وەك بزنانە و ڕونانە و مەڕانە و زۆرشتی تر، بەس قونانێی تێدانەبوو، شتێكی تری تێدابوو، وەك: سۆرانە و جوتانە.

دەبووایە ئەو جووتیارانەی گاوجووتیان هەبوو، بە هاران وپایزان لەكێڵگەی ئاغا جووتیان كردبا، تاكوكاری ئاغا تەواو دەبوو وە كەسێ ژنی بۆ كوڕەكەی هێنابا، یان كچی بە مێرد دابا دەبووایە سۆرانە بدات.

جووتیاران كێشەیەكی تریشیان هەبوو ئەویش رازی كردنی كێخواو كۆمەڵێك باج و تەنانەت خزمانی كێخواش بۆ ئەوەی ڕۆژێك لە ڕۆژان دوو قسەی خێری بۆ بكات لەلای جەنابی ئاغا

وەدارانەش هەبوو، بۆ سوتاندن لە دیواخانیّ جووتیاران دەبووایە ناوەناوە سەردانی شێخیش بکەن چونکە شێخ لەلایەن ئاغە گوێی لیّ دەگیراو دەیتوانی دوو قسەی خێر بۆ جووتیار بکات، سەرباری ئەوەش جووتیاران وایان دەزانی شێخ دەتوانێت زۆر کاری مەحالّ بکات وەك شەفاعەتی رۆژی قیامەت زانینی شتی غەیب، دوورخستنەوەی (لەمەچێتر) واتە ئەجندە(جنۆکە)، ئەجندە بە کوردی ناوی مەلەچێتە وەچارەسەری هەموونەخۆشێك دیارە نووشتەش سەرقەڵەمانێی دەویست دیاریەکانی شێخ، بەران مەڕ، شەکر و چا، نێری و بزن گیسك و رون، داری سوتاندن، قەندەشەکر، کەرەباب، (کەلەشێر). جووتیاران کێشەیکی تریان هەبوو ئەویش ئیدارەدانی مامۆستا دیارە مامۆستاش کۆمەڵێك ئەرکی لەسەر جووتیاران هەبوو وەك مووچەیکی ساڵانە زەکات و سەرفترەش بۆ مامۆستابوو، داری سوتاندن دەبووایە دابین بکرێت، بۆ خۆی و بۆ مزگەوت، چونکە بەشێکی زۆرلەمزگەوتەکان فەقێیان هەبوون، برایانی فەقێش پوخت و خاوێن بوون کۆمەڵێك ئەرکیان لەسەرجووتیار بوو وەك نانی رۆژانە و داری سوتاندن زەکاتی بزن ومەروجیسك کاکی فەقیّ وەریان دەگرت وە چاوچاوانیّ لەگەڵ کچە جووتیارانیش باسی نەکەین باشە بافەقیّ تورەنەبن دیارە فەقێکان ئەو زەکاتەی دەیاندرایێ، وەك بزن ومەڕ و جیسك زۆرجار بەخاوەنیان دەفرۆشتەوە، بەو پارەیە کتێب و جلك و کەرستەی جگەرەیان دابین دەکرد. پێوستی فەقێیانیش هەر ئەوەندەبوو، کەخوێندنیشی تەواو دەبوو، جووتیاران کچێکیان لیّ مارەدەکرد و ناومالّ وخانووشیان بۆ دروست دەکرد، مەلاژنی بەرێزیش بە یەك شەودەبووە گەورەی ژنان، لە گوندی بەرێزەوە ناویان دینا، وەك داك مەلاژن لە سەرەخۆشی زۆرشتی پیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان مەلاژنی بەرێز دەبووایە لەپێش ژنان بروا ئەوەیە لە پڕ دەبێتە کورێك، دەوەرە جووتیاری قورپەسەری نەزان تووشی چ کارەساتێك بووە، لە رابردوو .... ئەکرێت شتێك باس بکەین جگە لە خزمانی دۆڵی ئاکۆیان و خزمانی هەروتی کە رۆژێك لە رۆژان ملکەچی منداڵەکانی ئەمبێز نەبووینە، لە هەمان کات سیّ گوند لە خوشناوەتی بەردەوام لە ململانەیەکی سەخت دابووینە، لەگەڵ منداڵەکانی ئەمبێز، بۆیە منداڵەکانی ئەمبێز دەڵێن:

خۆرانی و سکتانی،<br>
تاك تاکەی شێخ وەسانی،<br>
بە نەعلەت بن لەگەڵ شەیتانی!

بەڵێ ئەو سێ گوندە بە نەعلەت کراون لەلایەن بنەماڵەی ئەمبێز، ئێمە شەیتانین، کە ملکەچیان نەبووین ئەگەر یەکێك ملکەچیان نەبێت پێویستە بێتە ڕیزی شەیتان، بەڵام ڕاستیەك هەیە ئەو سێ گوندە، ناوە ناوە پەلاماریان داون و خەڵکەکەیان لەگوند دەرکردوون بە گوێرەی زەمان و زرووف لە هەر دوولا خەڵك کوژراوە، باسی خۆیان ناکەن لە ڕابردوو دەیان بنەماڵەیان وێران کردووە لەپێناوی دەسەڵات.

*** *** ***

لە کۆتایی ١٩٥٠ یەکێك لەئاغاکانمان تۆبەی نسووح دەکات دەسەڵات دەداتە کوڕەکەی بێژکیان ڕونیان نامێنێت خزمەت کارێکیان هەبووە بەناوی (خدر بلە) بەخدر بلە دەڵێن: بڕۆ شێخ وەسانان لای حاجی حەسەن ڕونی بینە، کە ئەوکات ئەو ماڵباتە دوو برابوون زۆر بێکەس بوون خوا پێداویش بوون، جاران تەنیا ڕونی خۆماری هەبووە، خدر بلە دەچێتە ماڵی حاجی حەسەن دوای سەلام و کەلام دەڵێت جەنابی میر منی ناردووە بۆ ڕونی، حاجی حەسەن بە خێزانی خۆی دەڵێت: (سۆریێ) ڕونی بدەنە خدربلەی، خێزانی حاجی حەسەن ناوی سۆریێ بوو، دەڵێت ڕون نەمایە، هەندەك دەبنی دەسمەنجەرێمایە، حاجی حەسەن دەڵێت لۆی بینن ڕونەکە دێنن حەسەن دەڵێت خدر ئەوەندەی ببە سبەینێ دەچمە ئاراسنی، واتە کوێستانێ ڕونی دینمەوە و بەخۆش لۆ مارێ (ماڵێ) میری دینم خدر ڕونەکە وەردەگرێت و دەسمەنجەر بە ڕونەوە فڕێ دەدات دەگەڕێتەوە بالیسان و بەمیر دەڵێت ڕونیان نەدامێ میر دەڵێت بڕۆ بۆمی بینە خدر دەچێتەوە شێخ وەسانان، حاجی حەسەن بەپێش خۆی دەدات و بەرەو بالیسان دەکەونە ڕێ دەگەنە ماڵی میر میری گەورە لەسەر دووگردێیە خەریکی تەسبێحەلایە، میری گچکە دەکەوێتە لێدانی حاجی حەسەن هەرچەند حاجی حەسەن دەڵێت: میان بەس گوێم لێ بگرە مەسەلەکەت بۆباس بکەم، میر گوێی لێناگرێ و هەر لێی دەدات، بەگۆپار(گۆپاڵ)ی، میری گەورە لەناو تەسبێحەلا دەڵێت سوبحانەلا سوبحانەلا کوڕی بابی خۆیتی نایی دۆڕینی، قسەکەی میری گەورە، ئایە پێی ناخۆش بووە و کوڕەکەی لەخەڵکی ئەدا وتویەتی منیش جاران ئاوهام لەخەڵکی دەدا، یان پێی خۆش بووە ئەوەیان ڕون نیە! مەبەستی چبووە لە وڕستەیە چونکە گێڕانەوەی ڕووداوەکان دەبێت وەك خۆی بێت ئەوەی من گوێم لەبەساڵاچوان بووە، بەڕاستی تۆبەی نسووحی کردبوو و گۆڕانێکی گەورە بەسەر ئەوپیاوەدا هاتبوو، بووبووە پیاوێکی باش لەژێر کاریگەری شێخ مستەفای هەولێرێ لەلای ئێمە

به شێخی کەزی سۆرناسراوە .هەر هەمان ڕۆژ دووای ئەو هەموو لێدانە دەی نێرنە سەری ئاراسن بۆ هێنانەوەی ڕوون . ئەوەی شارەزابێت دەزانێ چونە سەر چیای ئاراسن بەقسەخۆشە .

دیارە ئەوبنەماڵەیە ئەوکات زۆر بێکەس بوون، خوا پێداویش بوون، تەنیا دوو برابوون، تۆ سەیرکە بەرانبەر خەڵکی بێکەس چەند ئازابوونە، لە بەرانبەر بنەماڵەی گەورە زۆریان خۆ پاراستوە، باپیرم کەناوی حەمەدەمینی کۆشکێیە ئەو ڕووداوە دەزانێت، دەچێتە بالیسان زۆر لۆمەی کابرای تۆبەکار دەکات و وەپێشی دەڵێت ڕازی نابم جارێکی تر لە کەسی شێخ وەسانی بدەن، بەتوڕەبوون هەڵدەستێت دەڕوات خواحافیزیش ناکات پەیوەندیەکە بۆ ماوەی چەند مانگ دەبڕێت ڕۆژکیان کابرای تۆبەکار سەردانی عەولای گابرە دەکات و دوای سەلام و کەلام دەڵێت: عەولا پێم باشە لە دووای حەمەدەمینی کۆشکێ بنێری بێتە ئێرە وابنێرە بانەزانێت من لێرەم مام عەولا بەدووای دادەنێریت، حەمەدەمینی کۆشکێ دێتە ماڵی مام عەولای گابرەی کەسەر بەژورێ دادەگرێت دەبینێت کابرای تۆبەکار لەوێ یە و شەرم دەکات بگەڕێتەوە و پێك دێنەوە زۆر گلەیش لەیەك دەکەن کەچەندان پشتە برای پشتێ یەکتربوونە کابرای تۆبەکار دەڵێت من ئاگاداری ئەو ڕووداوە نەبووم ئینشا الله دووبارە نابێتەوە لەو سەردانەی کابرای تۆبەکار شتێکی خۆش هەیە، ئەمەوێت باسی بکەم عەولای گابرەی پیاوێکی دەوڵەمەندە و لەخواترس بوو پێش ئەوەی ئاغای تۆبەکار بچێتە سەردانی پێڵاوی کەڵکی دەپێکردنێ نامینێ جارانیش پێڵاو لەشاری کۆیە دروست دەکران مام عەولا ناردبووی لەشاری کۆیە پێڵاوی بۆ بێت، ئاغای تۆبەکار کە دەچێتە سەردانی عەولای گابرەی و ئەیەوێت دڵی حەمەدەمینی کۆشکێش چاك بکاتەوە، کە لە ماڵی مام عەولا نزیك دەبێتەوە مام عەولا پێڵاوی نییە و بەپیر ئاغەوە دەچێت ئاغە تۆبەی کردوە و دەبینێت مام عەولا بەپێخواسی بەپیریەوە دەچێت خۆی لە ماینێ فرێدەدات دەڵێت کورە مام عەولا (استغفرالله) چەند جار ئەو ڕستەیە دوو بارەدەکاتەوە، وادە زانێت مام عەولا لەبەر ئاغایەتی بەپێخواسی پێشوازی دەکات دواتر مام عەولا مەسەلەی پێڵاوی تێدەگەینێت، زۆرم زەمی ئاغان کردوە باباسی جووتیارانیش بکەین .

جووتیارانیش لە ئاغا باشتر نەبووینە لەنێوخۆیان بە دەگمەن یەك ڕیز بوون، شەڕ و شۆڕ بەردەوام بووە، یەکتریان کوشتووە،لەسەر ژن هەڵگرتن و لەسەر ژن ڕاکێشان و لەسەر سنووری زەوی و پاوان و لەسەر یەك گندۆرە و لەسەر یەك کد و کە شانزەکەس کوژراون لەسەر زەڕکردنی ئاژەڵان و بەشەوان ئاگر دەماڵ بەردان و بە شەوان خراپکردنی کەرستەی جۆتی یەکتر و بەدزی

بڕینی کلك و گوێی بزن و کەر و چێڵ و شەڕە گوند و سوتاندنی خەرمان و سوتاندنی (دێ)چرو نەپایزان و یەکتر کوشتن دەخەوێدا و ملبڕینی منالێن دەلاتکێداو بڕینی داری مێو و جۆرەکانی تر و زۆر زۆری تریش وەك باپیرم دەڵێت (کورتی و کەژێ لێك دەهەژێ) واتە ئاغە و جووتیار یەك یەك بووینە لە کرداری ڕەفتار هەرکەسەو بە منێخۆ، زۆربەی تاوانەکانی ئاغاکان دژ بەجووتیاران، بەجووتیارانیان تاوانەکە ئەنجام داوە .

یەکێك لە گوندەکانی خۆمان دوو بنەماڵە دەبنە دووژمن ملی منالی شەش مانگانیان دەجۆلانێدا بڕیوە، لەو کاتەی دایکی خەریکی بژارکردنی توتن بووە،گوایە تۆڵەکردنەوەی دووژمنایەتی بووە، دەوەرەکوردە منالی شەش مانگە و دووژمنایەتی، یان دووکەس بوویتە شەڕیان کەسێکی لابەلاچووە (دێ)ی چڕۆی سوتاندوون، یان کلکوگوێی کەروبزنانی بڕیوە، بۆ ئەوەی ئەوشەڕە گەورە بێت و یەکتر بکوژن یان بەهەڵەلەیەك تێگەیشتن لەسەرشتێکی زۆربچووك ئەگەرباسی بکەم زۆر پێ دەکەنن چەندان کەس کوژراوە، کە ئێستا ئەوێرم باسی ئەو ڕووداوە بکەم یان لەسەرخواردنی پەرەپوشێك کە ئاژەڵ خواردویتی چەند کەس کوژراون، دیارە ئەوانەی باسم کردن لە کرداری ڕەفتاری جووتیاران هەر یەکەو چیرۆکێکی لە پشتە، یەك دوو نموونە باس دەکەین:

ڕۆژێك دێت کەسێکی تریش باسی شەڕی براکوژی ئێمە دەکات من و ئێوەش گلەیی لەو لبردوو دەکەین، دواتریش هەمان گلەیی لە ئێمە دەکرێت، قوربەسەر ئەوکەسەی شتی شاز و بەرچاوی کردبێت بۆ خۆدەرخستن و پۆز لێدان و پلەو پایە وپێکەوەنانی سەروەت و سامان بیری لەدوواڕۆژ و نەتەوەکەی نەکردبێتەوە ئەوەی داهاتو گۆڕەکەشی هەلدەتەکێنن وەك کابرای فەرەنسا کە (دکتۆر کەمال مەزهەر) باسی دەکات، گوندێك لەدەوروبەرمان هەیە بەناوی گوندی کانی نێریان خەڵکی ئەو گوندە وەك هەر گوندێك زەویەکانیشیان جیرانی یەکتر دەبن دوو کەس سنووری زەویەکانیان بستێك بووە، ئێمە پێی دەڵێین (تخوب )، هەردوو لایان کدوو (کولەکە)دەچێنن تخووب نیو مەترنابێت سروشتی کدوو وایە چەندان مەتر دەڕوات کدوەکان تێکەڵ دەبن کەسێکیان دەچێت کدوێك لێ دەکاتەوە و جیرانەکەی چاوی لێ دەبێت وادەزانێت کدوی ئەو لێ دەکاتەوە شەڕ لە نێوانیان دروست دەبێت دواتر خەڵکی دێن لێکیان دوور دەخەنەوە، ڕۆژی جومعە لەناو مزگەوت ئەو کێشەیە سەرهەڵدەداتەوە، بەشەڕ دێن، وابەباش دەزانن دەرگای مزگەوت داخەن، بەخەنجەران دەکەونە ناو یەك شوانێك تۆزێك دوادەکەوێت، دەبینیت شەڕە،

خەنجەرە لەناو مزگەوتیٚ دەرگاش کلیل دراوە، دەچێتە سەربانی مزگەوتیٚ و دەڵێت .سەرەکی لەناو سەران نەبێت لۆ برین باشە ... دەکولانکیٚ مزگەوتیٚ خۆی داوێتە ناو مزگەوتیٚ بۆ شەرەخەنجەر، لەو شەڕە شانزە کەس دەکوژرێن جگە لەبرینداران دوواتر ئەو گوندە چۆل کراو تاکو ئەوساڵانە هەربەچۆلی مایەوە لە سەر یەك کدوو... وەلەسەریەك گندۆرە ( کاڵەك) چەندان کەس کوژراوە لەسەر پارەی مەلای خەڵك کوژراوە، لەسەرخوراندنی پەرێز لەلایەن ئاژەڵان خەڵك کوژراوە، لەسەر شەڕە سەگ خەڵك کوژراوە.

لەساڵی (١٩٩٢) لەسەرپەڕ پوشێك دوو گەنج کوژران، لەسەر جولەی بەشێك لەجەستەی کەسێك بە هەڵە تێگەیشتن چەندان کەس کوژراوە، ئەوانەی باسم کردن هەر یەکە و چیرۆکیکی خوێناویە، ئەگەر تەمەن مۆڵەتی دا، دەیاننووسم و لە شوینێکی باش دایان دەنێم کە ئەمڕۆ دەوروبەرم هەزمی ناکات بڵاو بکرێنەوە.

*** *** ***

با بەسەرهاتێکی ئامۆزایەکی خۆم باس بکەم، کە ئامۆزایەکەشم دەڵێت سەرەك لەناو سەران نەبێت لۆ سەربڕین باشە پێشتر باسم کرد کەچەندان بریندازی کیمیاوی دەکەونە شاری سلێمانی یەکێکیان لەوان ئامۆزایەکی من بوو، بەناوی:(خدر ئیلیاس حەمەدەمین) کە بەهیممەتی خزمانی شاری سلێمانی نەجاتی دەبێت، بەخۆی و خێزانی دەڵێت: من دەچمەوە هەولێر بۆلای خزمانم، خزمانی سلێمانیش دەڵێن کاکە مەچوو بچی ڕژێم ئەنفالت دەکات، ئامۆزاکەم دەڵێت، سەرێك لەناو سەران نەبیت لۆ بڕینیٚ باشە، بەڵیٚ ئامۆزاکەم دەچێتە هەولێر و دەچێتەوە ناو بریندارانی کیمیاوی، دواتر لەگەڵ خەڵکی گوندی ئەنفالکرا و سەری چوونە سەران خێزانی نەجاتی بوو.. ئەو قسەیە زۆرجار بۆتە بەڵایەکی گەورە ! لەو ساڵانە لە گوندی توتمە منداڵێك کەوتە ناو بیرێك خنکا، بیرەکە یەك بەرمیل نەوت دزەی کردبووە ناو بیرەکە تاکو من هەواڵەکەم زانی دوو کەسیتریش تێیداخنکابوون باش بوومن چوم، ئەگەر وازم لێهێنابان بیرەکە بردەبوو لەمردوو لەسەر هێنانە دەری منداڵێك، کە بەداخەوە چوارکەسی تر تیداچوون.

لەناو مرۆڤایەتی و ئێمە ئەمڕۆ کەسانێك هەیە نەفرەت لە درووستکەری چەك دەکات، پێویستە نەفرەت لەو کەسەش بکەین کە داهێنەری خەنجەر بوون، بۆ کوشتنی مرۆڤ چەك و خەنجەر پێویستە، بەڵام پێویستە بزانی چۆن بەکاری دێنی و لەکیٚ بەکاری دێنی، ناکرێت چەك لەدەستی هەمووکەس بێت پێویستە خەڵکی کوردستان بەپەلە چەکدار بکرێت هەموو

ـەرمـاتەکانی دووای ١٩٩١ ئەوەیە چەك لەدەست هەموو کەسە بەتایبەتی کوشتنی ژنان وەمن ـیە وایە ئێمە گەلێکی ترسنۆکین لەژن کوشتن زۆر ئازاین ئەوەش نیشانەی ترسنۆکیە و گێلیە ـە خواناترسێین ڕۆژو نوێژیش وەك نەریت دەکەین دوور لە خواپەرستی ئەوەندەی لەلۆمە دەترسێین ـخوا ناترسێین .. باوەڕ بکەن لەو سالآنە زۆرکەسم دیت کە بکوژی ژنە گوایە ئەوکارەی لەسەر شەرف ئەنجام داوە لەرابردو جاش و جاسووس بووە ئێستاش ئەو کارەی پێشەرم نییە، بەلآم ئەگەر حوشکی قسە لەگەڵ گەنجێك بکات شێت دەبیت و گوایە شەرەفی رووشاوە ئای لەو شەرەفە.من .. حـموی چەك پێویستە لەدەست پەرلەمان بێت نەوەك لەدەستی حیزب و لایەنگرانی .. خۆشناوەتی ـەترسی باج و سەرانەی عوسمانیەکان وردە وردە وازیان لەخزمەت کردنی ڕەزەکان و ئاژەڵ داریش هێنا و زۆربەی ڕەزەکان کۆرکرانەوە وە ئاژەڵدارش بەرەو نەمان چوە لەترسی مەڕانەو بزنانەو جیـکانە رۆنانە نەیان ویستوە بە خێوی بکەن و عوسمانییەکان بێنە سەرحازری لە کاتی هاتنی بەریتانیا و شکان و بەزینی عوسمانیەکان، لە کاتی هەلآتنیان بەشێکی زۆریان بە کوردستان ڕادەکەن تۆلەی شکان و بەزینیان لە خەڵکی کوردستان دەر دەکەن هەر شتێك بەلایەنەوە پەسەند بووایە دەیان برد ئەوەی تر دەیان شکاند وایان لێ دەکرد کەلکی خاوەنی نەبێ وەك دڕندەیەکی بریندار هەمووشتێکیان تێك شکاندوە خەڵکی کوردستانیش دەستیان لێ نەپاراستون چەك و تەقەمەنییەکی زۆر یان لێ ستاندوون زۆریان لێ کوشتن بلآو بوونەوەی چەك و تەقەمەنی بەشێکی زۆری جووتیاران بوونە خاوەنی چەك وە سەرەتا یەك بوون بۆ ترسانی دەرەبەگەکان لە جووتیاران بۆیە بەشێکی زۆر لە دەرەبەگەکان پێیان باش نەبوو عوسمانیەکان بڕوخێن بۆیە دەرەبەگەکان لە کا تی هاتنی بەریتانیا دەبنە دووبەش بەشێکیان باوەڕیان وایە عوسمانییەکان جارێکی تر ناگەڕێنەوە پێویستە خۆیان لەگەڵ بەریتانیا بگونجێنن وەك میوانی شەقلآوە و میرانی ڕەشید بەگی بێتواتە خۆ لە شەڕی بەریتانیا دەپارێزن، وە بەشێکیان بڕیاری شەڕ دەدەن بۆ نموونە وەك خزمانی سوورچی هەروتی دۆڵێ ئاکۆیان و هەرچەندە سەرەتا کۆدەنگییەك هەبووە،لە پێشگرتن لەبەریتانییەکان هەندێك لە ئاغەکانی خۆشناو سوورچی و ئاکویان و محەمەد ئاغای وە توورکەکانیش قەولی برێك سەرباز و تەقەمەنیان پێ دەدەن دواتر تورکەکان بێ تومێد بوون بریتانیەکان کە دەگەنە شاری کۆیە لەگەڵ پیاو ماقولآتی کۆیە ڕێك دەکەون بەتایبەتی لەگەڵ دوو بنەماڵە گەورەکەی شاری کۆیە، دەبێ شتێك باس بکەین ئەویش بەشێکی زۆری خۆشناوەتی عەشیەتی بلباس وئاکۆیاتی و دەشتی بیتوێن پەیوەندیەکی خۆشیان هەبووە

لەگەڵ پیاو ماقولانی کۆیە شاری کۆیە بەریتانیەکان ئەو پەیوەندیەیان زانیوە، بۆیە کەدەیانەوێت بەرەو رواندز بچن پیاو ماقولانی کۆیە لەگەڵ خۆیان دێنن پیاو ماقولانی کۆیەش بەریتانیایان پیٚ باشتر بووە لە عوسمانیەکان، بۆیە لەگەڵیان دێن، بەرەو بیتوێن خزمانی کۆیە ئاگاداری ئاغاکانی خۆشناوەتی دەکەنەوە کە ریٚ لە بەریتانیا نەگرن، چونکە ئاغاکانی خۆشناوەتی و حەوێزائاغە و عەشیرەتی هەروتی و خزمانی سوورچی و دۆڵیٚ ئاکۆیان بڕیاریان دا بوو، شەڕی بەریتانیا بکەن کە گوایە، ئەوانە کافرن دیارە کاریگەری خزمانی کۆیە توانییان ڕەشید بەگی بێتواتە و میرانی شەقڵاوەش ڕازی بکەن کەشەڕی بەریتانیا نەکەن، لەلایەکی تر( شێخ کاکەمینی سەران) هێزێکی باش ئامادە دەکات لە خزمانی دۆڵی ئاکۆیان و مەلەکان و بەرەو خۆشناوەتی دێت، بەشێك لەخەڵکی شێخ وەسانان و گوندی بێراوە و گوندەکانی دەوروبەر لەسەر قسەی شێخ کاکەمین لەدامێنی چیای شیشار پێش لە بەریتانیا دەگرن لەلایەکی تر پیاو ماقولانی کۆیە قەناعەت بەرەشید بەگی بێتواتە دینن کە ریٚ لەبەریتانیا نەگرن بۆیە پێشوازی لە بەریتانیا دەکەن ئەیانەوێت بەرەو بالیسان بێن بەشێك لە هێزەکەی (شێخ کاکەمینی سەران)هێزەکەی بەریتانیا لێیان نزیك دەبێتەوە کەسێك لە وان بە ناوی حسێن ناسراو بە حوسێنەکۆری شیخ وەسانان، تەقە لە بەریتانیەکان دەکات بەریتانییەکان دەیان بیننەوە و هاوانێکیان تیٚ دەگرن بەسوتفە هاوانەکە بەناویان دەکەوێت ژمارەیەکی زۆر دەکوژرێن، وەك ئاغیلە بێراوەی و فەقیٚ عەزیز لەماڵی حەویزانی شێخ وەسانان و حسێن شێخ وەسانی و کەسێکی گوندی شیە و جگە لەچەندان بریندار دوای ئەو ڕووداوە، ئەو هێزە ڕادەکات لایەکی تر محەمەد ئاغی بیشوکە پەشیمان دەبێتەوە لەو قەولەی بە تورکانی دا و ئەوەی بڵێت کورد شێرە من دەڵێم وانییە، وەك پێوست ئازانییە لەچاو گەلانی دەوروبەرمان وەك پێویست خۆبەخش نییە بۆ بەرگری لەپاراستنی وڵاتی خۆی چونکە ئەگەر پیاو غیەتداربێت، خیانەت لەگەل و نیشتیمانی خۆی ناکات، ڕاستە من و تۆ خەلقی خوداین لەهەمان کات من وتۆ لەو خاکە خولقاوین قەرزاری خوداین لەهەمان کات قەرزاری ئەو خاك وئاو هەوایەین هەر کەسێك وڵاتی خۆی خۆش نەوێت بێگومان بە خودای گەورەش خۆشی ناوێت، ئەوکەسە بیٚ ئیمانە چونکە خودا منی بە کوردی خەلق کردوە و ئەو نیشتیمانەی پیٚ بەخشیوم کەس بۆی نییە لێم زەوت بکات، بە هەر ناوێك بێت، بە یەك هاوان لەشکرێك ڕابکات لەناو ئەوهەموو شاخ و تەنگەبەرانە عەرەبەکان لەو دەشتانی خوارەوەی کاکی بەکاکی زۆرجار شکەستیان بە بەریتانیا هێناوە بەهەزارانیان لیٚ

کوشتوون من دەڵێم عەرەب لەئێمە ئازاترن  ئێمەش بەهاوانێك  لەشکرێك ڕادەکات!  ئەتوانین بەسی دوورێنیی خەڵکی ئێران بکەین  دوای رووخانی ڕژێمی شای ئێران و نەمانی ئەرتەشی ئیران سەدام ئەوفرسەتە حیزەی لەدەست نەداو جولەی بەسەربازەکان کرد  هێرشەکەی سەدام حسێن بۆ قوڵای خاکی ئێران بەپاڵ پشتی زۆربەی جیهان لە پڕ خەڵکی ئێران بەجلوبەرگی خۆی بەبێ مووچە بەسەدان هەزار  خۆبەخشانە بۆ ماوەی هەشت ساڵ شەڕی نابەرانبەریان کرد، لە هەر پەلامارێکی ئێرانییەکان بۆ سەر سەربازانی عیراق  هێزێکی چەندان هەزار کەسی خۆ بەخش دابەش دەبوون، بۆ پاککردنەوەی ڕێگا بۆ لەشکری  خۆیان،  وەك هێزێك بەبێ چەکی دەچوو بەسەر ئەلغامەکان دەکەوت  بۆ ئەوەی ئەلغامەکان بتەقنەوە ڕێگا بۆ لەشکر بکەنەوە  هێزێکی تر بۆ شکاندنی بەربەستی تێلەدڕکاوی و کارەبای  هێزێکی تر  خۆبەخش بۆ خەندەکی گەورەی پڕئاو کارەبا .

بەو شێوەیە بەرگری ڕژێمی عیراقیان تێك دەشکاند و لەشکر بەسەر تەرمە خۆبەخشەکان پێش ڕەوی دەکرد سەربازەکانی عێراقیان ڕاو دەناو نیشتیمانی خۆیان ڕزگار کرد،  بە ملیۆنان کەس شەهید و بریندار و پەك کەوتە و بێسەر و شوێن بوون،  ئێستاش ئەو شاخانەی سەر سنوور پڕن  لە تەرمی  پاسدارە خۆبەخشەکان من وەك  داگیرکەری کوردستان سەیری ئیران دەکەم،  بەڵام ئەوەی باسیشم کرد ڕاستیە و ڕاستیش ڕاستییە،  با دوژمنیشت بێت ڕەش ڕەشە و سپی سپیە، ئەگەر  زلهێزەکانی  فریای  سەدام حسێن نەکەوتبان  ئێران  عێراقی  عەجەمی داگیر دەکردەوە و بەغداشی دەگرت،  بەڵێ ئەوە ئازایەتی و شەڕەف و کەرامەت بوو،  خەڵکی ئێران نواندیان من سەر دادەنوێنم بۆ خەڵکی ئێران شەهیدانی خەڵکی ئێران، بەداخەوە لە ڕابردوو و ڕۆژە سەختەکان گەلەکەمان دەبووە سێ بەش  بەشێك دەبووە عەباڵەبەری دووژمنت ، بەشێك ڕای دەکرد  بەشێکی کەم مەردانە بەرگری دەکرد و  دەبووە سوتەمەنی هەمووی خۆزیا وەك گەلانی ئێران وڵاتی خۆمان خۆش دەویا، یان خۆزیا وەك  مێش هەنگوین وڵاتی خۆمان دەپاراست،  چ پیاوێك هەیە بێ خۆداپۆشین دەست ببات بۆ ماڵی مێش هەنگوین،  هەرچەندە لەچاو ئێمە بچووك و بێ تواناییان دیارە، مەردو غیرەتدارن  بژی مێش هەنگوین بمری ترسنۆك !

بەریتانیا بەرەو بالیسان پێشڕەوی دەکات و هۆزەکانی دەوروبەرمان  یەکریزیان نەبووە، یەکرێزییەکە تەنیا بە قسە بووە، ( ڕەشید بەگی بێتواتە) لەگەڵیان دێت تاکوو لە سنووری گوندەکانی خۆی ڕەتیان دەکات، ئەو بەرگریەی لە سەرەوە باسم کرد، بووە هەنجەت بۆ بەریتانیا و

**کەوتە بۆردومانکردنی بالیسان و دەوروبەری بە تەیارە و ناپاڵم و تۆپ و سوتاندنی تەواوی دۆڵی بالیسان.**

**لە گوندی بالیسان ژنێك شەهید دەکەن بەناوی(فاتم) خێزانی (ڕەسوول قادری حەبیبێ) (فاتم) کوڕێکی بەناوی (قادر) بەو بۆردومانە سەری دەپەڕێ، فاتم دایکی قادر دووگیان بووە، لەگەڵ بۆردوومانەکە زگ و مناڵەکەی لەلاشەی فاتم جیادەبنەوە، دواتر مناڵەکە دەمرێت، فاتم دەبێتە خزمی خزمانی گوندی کانی بەردی سەرێ، ژنێکی تریش شەهید دەبێت بە ناوی فاتم کە دەکاتە دایکی حسێن حەمەد شینکۆی، لە شێخ وەسانان بەچەکی سپی (مەلا قادر) شەهید دەکەن، خێزانی مامۆستا بەرەگەز یەهودی دەبێت، دەڵێ مەلا مەترسە من بە زمانی خۆمان قسەیان لە گەڵ دەکەم دواتر ئەوانەی دێنە سەر مەلا سەربازەکان هێندی دەبن، مەلا دەکوژن مەلاژن چی پێ ناکرێ، مەلا قادر دەکاتە کوڕی هەمزە لە بنەماڵەی سۆغدری، دوای سوتاندن و وێران کردن گوندەکان بارەگایان لە لای گرد(کەروێشك)دادەنێن، گرد کەروێشك دەکەوێتەنێوان (گوندی چیوە و بالیسان)، ژن و منداڵ و پەککەوتەیەکی زۆر بەبارمتە لەلای خۆیان بەند دەکەن، دوای چەند ڕۆژێك پەیوەندی بە ئاغاو ڕیشسپیانی ناوچەکە دەکەن و لەگەڵیان دادەنیشن سەرکردەی هێزەکە بە خەڵکی ناوچەکە دەڵێ: ئێمە نەهاتوین بۆ مانەوەمان، هاتوین دوو خەزێنەی زێڕ لە ناوچەکەتانە دەی دۆزینەوە و دەڕۆین.**

**دیارە ئەو مەسەلەیە وەك تاکتیك بەکار دەهێنن بارمتەکانیش بەردەدەن، بۆ بەیانیەکەی ئەو هێزە دەڕوات بەرەو ناوچەی هەروتیایەتی و خزمانی هەروتی شەڕێکی زۆر گەورە لەگەڵ بەریتانیا دەکەن، ئەوان لەو پەیمانەی بەخزمانی سورچیانیاندا بوو بەڵێنی خۆیان نەشکا ند، ئەو دارەی خزمانی هەروتی حەوێزئاغە سەربازەکانی لێ کوشتوون، دارەکە ماوەتاکە بنەدارە لە ناوچەکە، زۆر گەورەیە. ئەودارە خۆی راگرتووە، بۆئەوە چیرۆکی خۆی بۆ چەندان نەوە بگێڕێتەوە، بڵێت: من شاهیدم ئەلێرە چەندان پیاوی مەردوئازا خوێنی داگیرکەریان رشت بۆ ئەوەی من پێی بەهێزم، بەڵێ ئەودارە زۆر بەهێزە لەناو هەموو داران دیارە، بەهەمان شێوە سوڵحیش لەگەڵ خزمانی هەروتی دەکەن ژن وماڵ و منداڵەکانیان بەردەدەن لەهەمان روژگاردا لەشکرێکی عوسمانییەکان بەرەو ناوچی سۆفیایەتی دەیەوێت بەرەو توورکیا بچێت خزمانی سۆفی ڕێیان لێ دەگرن تورکەکان ڕێگۆری دەکەن لەورێگریە لەشکری سۆفیان ژمارەیان (١٠٢) دەبێت دوواتر لەشکری رووسەکان دێتە ناوچەی سۆفیایەتی و ئەوهەواڵە دەزانێت کە سۆفیەکان بەو ژمارەیە**

ـــ نه تورکان گرتووه، داوای ئەو ڕێژەیە دەکات خزمانی سۆفیش وادەزانن لەلایەن روسیا حەڵت دەکرێن هەر (١٠٢ ) کەسەکە ئامادە دەبن روسەکان هەموویان چەك دەکەن و ئێستاش ـ گەڵدانیت ئەو(١٠٢) کەسە بێ سەروشوێنن.

هەبوونی ئەو دوو خەزێنەیە لە ناو چەکەدا بڵاو دەبێتەوە خەڵکێکی زۆر لە ناوچەکە ـ گەڕێن بۆ دۆزینەوەی، دیارە کەس نەی دۆزیەوە و تەنها خەڵك سەرقاڵ کردن بووە، خەڵکی خۆشناوەتی دەست دەکەنەوە بە خانووو دروست کردنەوە، دیارە دەبێت پێش هەموو کەس قەڵاتی ـەکان دروست بکرێتەوە. ماڵی( .......) لە بالیسان دەست دەکەن بەقەڵات دروستکردن بە ـ ـایی دووسەد مەتر جووتیاران ڕێز دەکەن بۆ گواستنەوەی خشت و قەڵات دروست دەکەن، ـو خورەبان(خۆڵەبان)ی قەڵات جووتیاران بانگهێشت دەکەن یەکێك لە گاجووتە پیرەکان بۆ جووتیاران دەکوژنەوە، جووتیاران زۆر بە لەزەت دەیخۆن دوای ناغواردن یەکێك لە پیاوەکانی ـغا بە جووتیاران دەڵێ: دەی خزمینە هەرکەسە و لیرە یەك بدات بۆ کڕینەوەی گاجووتێك ـکرێ ماڵی ئاغە گاجووتیان نەبێ بەو فرتوفێڵە دەیان لیرە قازانج دەکەن، وردە وردە خەڵکی خانووو دروست دەکەنەوە، دوای شکەستی عوسمانییەکان ئەو سەربازانەی لەژێیاندا مابوون ـەردەوردە هاتنەوە نموونەی شێخ وەسانان:(حەمەد مستەفای بابی باپیری عەلی هەمینێ) ونبوو ـەهاتەوە. دووەم:(مەحموودی سەلەقی)ش ونبوو، (محەمەد عەزیز باپیری وەستاسمایلی بنەماڵەی ـەرمانیان) هاتەوە، (مام تەها لەبنەماڵەی سۆیخدری ) هاتەوە، (مام وەیسی )ش هاتەوە، کە ناکرێت بەوردی باسیان بکەم، هەریەکێك لەوانەی هاتینەوە بەسەرهاتەکانیان ڕۆمانێکی گەورەیە، کە دەکەونە دەست ڕووسەکان دەیان بەنە ڕوسیا و کاریان پێدەکەن، بەبرسیەتی و نەمرەو نەژین بەزستانان سەرمایەکی زۆریان بووەو چەندان کەسیان لەسەرمان ڕەق بوونەوە دوای ڕووخانی عوسمانییەکان بەشێکی زۆریان وەك کۆیلە دەفرۆشنەخەڵکی و کاروکاسبیان پێدەکەن دواتر وردە وردە خەڵکی ئازادیان دەکەن بەشێکیان ژنیان هێناوە و منداڵیان پەیدابووە بەشێکیان نەبەرمنداڵەکانیان لەوێ ماون و ئێستاش بێخەبەرن وەبەشێکیان بەهۆی غوربەتی وڵات و کەسوکاریان بەماندوبوونێکی زۆر گەڕانەوەو بەشێکیان لە ڕێگا کوژران لەلایەن خەڵکی چەتە و بەشێکیان لەڕێگادا توشی نەخۆشی ببوون و مردوون بوونە خۆراکی ئاژەڵان، نموونەی (مام وەیسی) خزمی من ئێستاش منداڵەکانی لەوێن بێخەبەرن لە یەکێك لەشەڕەکان لە زەمانی میری سۆران لەگەڵ ڕوسەکان مستەفای حەوێزی بریندار بووە، کە دەکاتەبرای:( مام وەیسی) وە (

حەمەدەسۆر)یش بریندار بووە، لەبنەماڵەی عیسایان لەزەمانی زوو تاکو ئێستاش هەر شەڕێك کرابێت شیخ وەسانی بەشی خۆیان لە کوشتن تێدایە.

*** *** ***

لە گوندی بالیسان چیرۆکێکی غەریب هەیە کابرایەك هەبووە لەساڵی (١٩٤٠) بەناوی (ناوخۆش) ئەوماڵباتە لەسێ کەس پێك هاتوون واتە ناوخۆش ناوی خێزانی نەزاندراوە، کوڕێکی هەبووە بەناوی (سمایل ) لە خزمایەتی خزمی ماڵی (شینکۆیان) بووینە ماڵی ( شینکۆیان) بنەماڵەیەکی باش بووینە، بە ئەصل برادۆستینە گوندی (جورجان) ناو خۆش پیاوێکی هەژار و دەست کورت دەبێت کە خێزانی دەمرێت دەستی کوڕە تاقانەکەی دەگرێت دەیباتە چیاو ماڵێك دادەنێت لە ئەشکەوتێك کەئێستا مەشوورە بە ئەشکەوتی( ناو خۆش) نزیکەی زیاتر لە پێنج کیلۆ مەتر لە ئاوەدانی دوورە، لە ترسی پلینگ و هەرس دەرگای ئەشکەوت چەپەر دەکات دواتر بەشی زۆری بەبەرد دەگرێت بۆ ماوەی سێ ساڵ بەخۆی و کوڕە تاقانەکەی لە مرۆڤایەتی دادەبڕێت خواردنیان بەرو بوومی کێوی و گرتنی بزنەکێوی و کەروێشك و کوڕبەش و ئەوانی تربووە داوی هەبووە بۆ گرتنی کەو بەوشێوە ژیاوە دوای سێ ساڵ پایزێکیان (سمایل)ی کوڕی نەخۆش دەکەوێت سمایل لە پشتی خۆی دەکات و دەی هێنێتەوە بالیسان بۆ ماڵی شینکۆ دوای سێ ڕۆژ (سمایل)ی تاقانە دەمرێت شینکۆ تازی بۆ دادەنێت دوای سێ ڕۆژی تازیە ناو خۆش بە دزی ڕوو لەچیا دەکات لەکراو قاسم و بنکر ڕەشە دۆر، دەگەڕێت هەرهاوار دەکات هۆۆۆۆۆ سمایلۆك هۆۆۆۆۆ سمایلۆك، بۆ ماوەی یەك هەفتە لە چیادەگەڕێت بەشەو ڕۆژ لە دوای (سمایل)ی کوڕی دواتر خەڵکی بالیسان لەچیا هەستی پێدەکەن چەندان کەس دەچن زۆر دەگەڕێن دەی بیننەوە ڕەق و لاواز بووە دەنگی نوساوە ئەوەندەی بانگی کوڕەکەی بکات بە پشتی ولاغ دەیهێننەوە، دوای چەند ڕۆژێك ناوخۆشیش دەمرێت ئەوی لەدووای ئەوماڵباتە بەجێماوە، ناوی ئەشکەوتەکەیە، بەناوی ئەشکەوتی( ناوخۆش ) لە سەروی ( بێشێخێ)، ئەوچیایە لەمێژە ناوی چیای(ڕەش) بووە دواتر بووە ( بەنێ ئەوبەری ) دواتر بووە (چیای هەوری) . ئەتوانین بەهەڵبەستێکی کۆن بیسەلمێنین کە ناوی چیای ڕەشە، جووتیاران دەڵێن :

تا بەفر بمێنێت لەچیای ڕەش،
هەندی نێو چاوانی گای قەرەبەش،
تێری ناخوا گای ڕەش.

## خۆشناو و دزۆ و دزشاو

بەهاتنی بەریتانیا ژیان ئاسایی دەبێتەوە بەقسەی جووتیاران کەمن گوێم لێ بووە، جیاوازییەکی زۆر هەبووە لە نێوان تورك و بەریتانیەکان وەك جووتیارانی خۆمان دەڵێن جووتیاران ئاهێکیان بەبەر داهاتیتەوە دوای ڕۆیشتنی تورکەکان و هاتنی بەریتانیا وردە وردە ڕەزەکان خزمەت دەکرێنەوە و ئاژەڵداری دەبووژێتەوەو کشتوکاڵ بە ڕێژەیەکی باش روو لە بووژانەوە دەکات تاکو نزیکی ساڵی شەستەکان جووتیاران بەخۆشی و هێمنی دەژین لە سێبەری حوکمڕانی بەریتانیا یەك باجیان هەبووە ئەویش سەربازی بووە وەکڕینەوەش هەبووە ئەگەر هەڵەنەبم دەوڵەتی تاقانە بووینە چاوپۆشییان لێ کراوە. ئەوەی سەیرە عوسمانیەکان خۆیان بە میراتگری ئیسلام داناوە و لەبن پەردەی ئیسلام ئەو هەموو زوڵمەیان دەکرد! ئەوەی سەیرە لە حوکمڕانی بەریتانیا چەتەو چەتەکاری سەری هەڵداوە هەموو ناوچەیەك چەتەی خۆی هەبووە، پێیان دەوتن:{ئەشقیا} دیارە ئەشقیاکان دووبەش بووینە ئەشقیاکان داواکراو بوون لەیاسا، لەو دووبەشە بەشێکیان دزیش بوون، بەشێکیان خۆیان لەدزی پاراستوە، هەمووشیان یەکتریان دەناسی دەستی یەکتریان ڕادەکێشا بۆ ناوچەکەیان، واتە کەمتر کەسی ناوچەکە دزی لە ناوچەکەی خۆی دەکرد، بەڵکوو بەکەسێکی تری خەڵکی ناوچەیەکی تر دزیەکەی دەکرد و بەشی خۆی هەبوو، هەرکەسێك ماینی هەبا یان ئەسپی هەبا تائێستریش دەبووایە سندمی هەبا، سندم وەك کەلەمچە وایە یان وەك ئەو زنجیر بەندە وایە کە ئەوروپییەکان بۆ کۆیلەکانیان بەکاردەهێنا، بۆ ئەوەی کۆیلەکان ڕانەکەن لەکوردستانیش دەبووایە خاوەن ولاخ سندمی هەبووایە لەترسی ئەشقیاکان ئەشقیاکان زۆر جار بەچەك سندمەکانیان دەشکاند، بەشێك لەناوی ئەشقیاکان :

١/ ڕەحمان شێخ وەسانی

٢ / عەولاسۆر شێخوەسانی

٣باوەکربالیسانی

٤/خدر شێخ وەسانی

٥ /علی بەگ وەرەیی

٦/ قەرۆ و حسۆ برابوون، خەڵکی گوندی ئەسپینداوە بوون.

٧ / مستەخێل خۆرانی

٨ / مەجید خۆرانی

٩/ ئەحمەد سوورچی
١١ / کاکل وەرەیی

وەزۆری تریش،دەرەبەگەکان ئەو هەڵەشیان لەدەست خۆیان نەدا و ئیدارەی ئەشقیاکانیان دەدا دەبووایە هەر دەربەگە و چەند چەتەیەکی هەبووایە یەکەم بۆ ترساندنی جووتیاران. دووەم بۆ خۆپاراستن لەچەتەکان. سێیەم: بۆ خۆپاراستن لە دەرەبەگەکان. چونکە دەرەبەگەکان لەناو خۆیان لە ململانەیەکی توندداببوون لەسەر دەستەڵات، ئەشقیا جێی مەترسی بوون، دەرەبەگەکان لێیان تۆقی بوون، ناهەقیش نەبوون هەموو شتێکیان لێدەوەشایەوە و هەمووشتێکیان پێ دەکرا ئەوان لەلایەن دەستەڵات داواکراو بوون، بێ ئومێد ببوون لەژیانی ئاسایی، ئازاو چاونەترس بوون، چەتەکان شوێنێکی تریشان هەبوو، بۆ کاتی نەخۆشی و برینداری و لەکاتی سەختی زستان ئەو شوێنەش دیوەخانی ماڵی{عەلیەڕەش}ی بناری قەندیل بووە، دیارە عەلیەڕەش بەخۆی ڕۆمانێکی سەیرو سەمەرەیە کاری زۆر سەیر وسەمەرەی کردووە، قسەی زۆر خۆشی هەنە، ئەکرێت نموونەیك بینینەوە، عەلیەڕەش سەردانی شاری بەغدا دەکات لەبەغدا یەك لە پۆلیسەکان ڕێزی ناگرێت، کە دەگەڕێتەوە لە دەربەندی سەرووی ڕانیە پۆلیسێك دەبینیت بۆی دادەبەزی و لێدانێکی باشی لێ دەدات، دەڵێن: قوربان بۆ لێی دەدەی؟ دەڵێت: پۆلیس هەر پۆلیسە!

ئاماژە بەڕاستییەك بکەم ئەو ئەشقیانەی بە شۆڕشی کورد ڕاگەیشتن نەمردبوون، زۆبەی هەرەزۆریان بوونە بەرپرسی دڵسۆز و وازیان لەڕێگری هێنا و تۆبەیان کردوو و دەوری بەرچاویان هەبوو لە خەباتی رزگاری نەتەوەکەمان.

*** *** ***

ئەمەویت بەسەرهاتێکی گوندی (بێراوە) بگێڕمەوە:

جاران لە کوردەواری بەتایبەتی نێوان کوردستانی ڕۆژهەڵات و باشوور برایانی فەقێ بۆ خوێندن ئەودیو ئەودیویان کردووە، یەکێك لەفەقێیەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات کە نەزاندراوە خەڵکی کوێیە، گوند بەگوند دێتە خۆشناوەتی و لە گوندی بێراوە دەست دەکات بەخوێندن، گەنجێکی جوان و پۆشتەبووە، ناوی( فەقێ عەولا) بووە، دوای چەند مانگێك خەڵکی هەست دەکات کچە ئاغایەکی خۆش ویستوە، ئاغایەك. بەناوی میر (وەتمان) لە فرسەتێك فەقێیەکە

ـەكوژێت، خەڵكی گوندی بێراوە كفنی دەكەن و لە گۆڕستانی( باسكی تاشان) دەی شارنەوە، دوای سومیت كەس وكاری گوند بەگوند بەدوای دادەگەڕێن بۆیان دەردەكەوێت كە لەگوندی بێراوە تێـ.ەوە لەكوردستانی ڕۆژهەڵات دوو كێلی مەرمەڕی بۆ دێنن بۆی لەقەبری دەگرن و دەڕێن ـڕی ساڵێك كەسێكی لەخزمەكانی فەقێی كوژراو خۆی بەهەژارو نەدار پیشانی خەڵكی بێراوە ـدەت. داوا لەخەڵكی دەكات كە كەسێك هەژارم كەسێكی هەژارم كەسێك بم كاتە جووتیار، شوان، گاوان، ـەرگلرێك بێت چەندی بمداتێ بە زیادی بێت، ئەوهەواڵە لەناو گوندی بێراوە، بڵاو دەبێتەوە. میر ـەتمان دەڵێت بۆمنی بێنن دەی كەمەغولام ناوبراو بۆ ماوەی دەمانگ خزمەتی میر وەتمان ـەكات. ڕۆژكیان ماڵی میر وەتمان چۆڵ دەبێت تەنیا میر وەتمان لەماڵەوە دەبێت میروەتمان ـوەستوە و تفەنگە ڕەشكەی لەدووری خۆی داناوە، ئەو تفەنگەی فەقێی پێ كوشتوە، كابرا دەست ـەداتە چەكەكە و لەگەڵ پێداوستی ئەو چەكە، چونكە ئەوچەكە گولەی لەلولە تێدەخراوبارووتی ـە دولوە لە كونێك تێدەكرا، لەگەڵ فتیلەیەك بۆ ئاگرتێبەردانی، ئامادەی دەكات و ئاگری لە فتـیلە بەردەدات و لەنزیكەوە بەرانبەر سەری میروەتمان دای دەنێت و بەهێواشی ڕادەكات دواتر چەكەكە دەتەقێت میروەتمان دەكوژێت، كەس نەی زانی ئەوكەسە بۆكوێ چوو، كوشتنی میروەتمان تۆڵەكردنەوەی فەقێ عەولا بوو.

من سەردانی گۆڕی ئەو فەقێ عەولایەم كردووە و كێلەمەرمەڕەكانیشم دیوون، ئێستا كێلە مەرمەڕەكان لەلای مامۆستا مەلا كەماڵ بێراوەی پارێزراون، لەبەدبەختی فەقێ عەولا چەند كەسێكی نەشارەزا لەو ڕووداوە لەدوای ڕاپەڕین لە گۆڕەكەیان دابووەوە و وایان زانیبوو گۆڕێكی ئەمەریە و زێڕی تێدایە! ئەوەیە (لە بێخەبەران كەشكەك سەلاوات!) هەرچەندە نازانم چیرۆكی ئەو ڕستەیە چییە (ئاش لەخەیاڵێكی و ئاشەوان لەخەیاڵێكی!)، پێم وایە ئەودوو ڕستەیە هەریەكە و چیرۆكێكی لەپشتە، من نازانم.

*** *** ***

یەكێك لە بەسەر هاتەكانی (حاجی ڕەحمان شێخ وەسانی) كە لە گوندی شیرە ڕوی داوە، ئەو كە لەسەرەوە ناوم هێنا یەكێك بووە لە ئازاترین ئەشقیاكان، گوندی شیرە، كەسێك بەناوی ( حاجی عەمەر) لەگەڵ مەفرەزەی پۆلیس ڕێك دەكەوێت كە(ڕەحمان شێخ وەسان)ی دەعوەت بكات ئەوانیش بێن دەستگیری بكەن، (ڕەحمان شێخ وەسان)ی دەعوەت دەكات لەكاتی نان خواردن

پۆلیسەکان لە(ڕەحمان) بە ژووریّ دەکەون،(ڕەحمان) مەجالی شەڕ کردنی نامینیّ، خانووەکەی مام عەمەر سیّقات دەبیّت، هەبوونی خانووی سیّقات نیشانەی دەوڵەمەندیشی بووە. ئەمەویت لەناو ئەوبەسەرهاتە شتیّکی جیاواز باس بکەم، مام عەمەر دەوڵەمەند دەبیّت کە لەکوردستان رادیۆ پیدادەبیّت مام عەمەر رادیۆیّك دەکڕیّت کە دەست بەخانوو دروستکردن دەکات خەڵکی شیە و گوندەکانی دەوروبەریش ڕۆژانە هاتوون گوێیان لە رادیۆ گرتووە، بەمام عەمەریان گوتوە ئەتو بەس رادیۆن لۆ لیّ بدە و نانن بدیّ ئیشت بۆ دەکەین، ئەویش کریّکاری زۆر بووە و بەهۆی رادیۆکەی خانووی سیّقاتی دروست کردووە!..بابیّینەوە سەر (ڕەحمان شیّخ وەسانی)، پۆلیسەکان دەست و قاچی ڕەحمان دەبەستن دەیبەنە سەر خانووی سیّ قات، لەپێش خانووش حەرەسیات دەگرن، بەباوەڕی ئەوان کەس ناتوانیّ بەدەست وقاچی بەستراو خۆی رزگار کات لەسەر خانووی سیّ قات، مام ڕەحمان دەبەنە سەربانی سیّقاتی ئەونانەی بۆ مام ڕەحمان ئامادەکراوە پۆلیس دەیخۆن!

*** *** ***

باجاریّ واز لە مام ڕەحمان بینین،پشویەك بدەین، بچینە خزمەت باب و باپیران وکەمێك چێژوەرگرین لە حەیران و حەیرانۆکەکانی ناوچەکەمان دواتر دێینەوە سەر مام ڕەحمان شیّخ وەسانی، بۆ زانیاریتان ئەوانەی خوارەوە حەیران نین پیّیان دەوترێت حەیرانۆك، حیرانۆك زیاتر لەلایەن خوشکان دەوتراوە.

لەساڵی (١٩٥٠) بەخوارەوە حەیرانۆك لەلایەن خوشکان وتراوە و لەخۆشناوەتی شەرمیش نەبوو دەردی دڵی خۆیان باس دەکەن. سەیرە ئێمە ناوەناوە بۆ دواوە دەگەڕێینەوە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆ بەشێك لە کچە گۆرانیبێژەکان باسی بەژنوباڵای کچان دەکان ناوێرێت باسی بەژن و باڵای کوڕان بکەن، زەینێخۆ بدەنە ئەو کچە چۆن باسی کوڕەکات دەڵیّ :

حەیران دەرێم لە سیلەی ڕەزی،
ڕانك وچۆغەرت قەلیێ مەرەزی،
کوڕەتیم ئەگەر نەم خوازی،
ڕەبی لەخوینیّ خۆ گەوزی.

حەیران دەرێم لە گەرەکیّ ژۆری،
بەفریّ گرتینە کارەك و گۆری،

بمسکم پڕن لەمەرجان ومۆری،
مێرد لەمن حەرام بن،
تە دوای کوڕی خدرە کۆری.

حەیران دەرێم لە دۆرە وشکێ،
گمردمن مامزێ ددان کوێریشکێ،
ئەمن بەتو دەرێم برا،
ئەتو بەمەن بڕێ خوشکێ،
خمرکی مە گەلەك پیسن،
تا پێن نەبەن شکێ!

حەیران لەکلکەوباری،
کموەك دەخوینێ کەوبارٍ دەناری،
کوڕەتیم خۆشی لەمن چوینە،
یاخوا بەخێر بێن تاری.
وشەی تاری واتە: واتە غەم و کارەسات .

کورە حیان دەرێم لاوی سیسەما: واتە کورە لاوی سیسە . سیسە بەرەنگی سۆرو قژی زێڕین دێت.

قەنەکێت لۆتێ دکەم لەتوتنێ بیشەما : بێشەمە جۆرێکی توتنی بۆندارە.
رەبی کۆرەبن بەتکارێ گوندێما،
ئاورێخۆ وەدەوە جەرگم لۆت نەما.
حەیران کەرەبابەك پاشیوان دەخوێنی،
نزانم نە لەگەرەکێ ژۆری یان لەژێری،
عەمری بابی ماخۆی نەمینی،
لەسێبارێ شەوێ ئەمن و نازدارێ لەخەوێ شیرنم رادەپەرینی.
یارەبی هەر هەندەی بمێنی،

لەکەرەکە شین نێت،
وردە وردە کلکێ لەبن ڕاوەشینی.

حەیران دەرێم لەڕازێ سەری،
دەستەکم گۆزەیە ئەویدیم لەنگەری،
ئەودەستەم ببڕن،
بەدەستی دی دێمەبەری.

حەیران لەمن هێوارێ ورە : هێوارە ورە، واتە ئێواریەکی درەنگە
بەژنێ یارێم دار قەنەفرە،
کوڕەلاو لۆمەم دەکەن،
بەمن لەهەموو عالەمێ جوانترە!

حەیران بەیانە بەیانی سەختە،
لەمیرو حاکمان وەرگەڕا تەختە،
لەکابرای بێمار لەژنێ بێبەختە،

حەیران دەرێم لاوی بەمن لاوی،
چەمێ شەقلاوێم بەوردە بناوی،
کیژێ خۆ ئەمن ئەتوم نەدیتبوو،
ئاشقت بووم وەلا لەناوی،

حەیران دەرێم لە خەل و مێخەلان
کۆتر تێکەر بووینە لە گەر هەرامە قەلان
ئەگەر کوڕە لاوی من ناس ناکەن،
ئەوە وردە وردە دەڕوات لە دوو مێگەلان.

حەیران عەمری بابی من نەمینێ،
گەنمی بچینێت زیوانی بێنێ،
برنجی بچێنی داڕوجانی بێنێ،
ئە منی دایە پیرە کی
تەسبەینێ پشتێ خۆم پێ ئەخورێنی،
ئەی دامە کوڕەکی چاردە ساری
تەسبەینێ بم گەوزێنێ.

حەیران دەرێم لەسەر باریێ خەتێ
چلوی ئەڕەشن، برۆ ئەکەن خزمەتێ!
حەیف وەختابن کوڕەتیم
ئەمن بوویە دیداری ئاخیرەتێ : دیداری ئاخیرەتێ، واتە: دوادیتن پێش مردن

حەیران کەرەبابەك دەخوینی،
کەرەبابی گوندە سۆری یاگوندەشینی،
نزانم لەچ گەڕەکێ ئەخوینی،
شەوێ لەسێ باریێ شەوێ ئەخوینی،
ئەمن و گەردەن زەردێ لەخەوێ ڕادەپەڕینی،
ڕەبی یەکت لەماریێ ماخۆی نەمینی،
برنجی بچینی داڕووجانی بینی،
گەنمی بچینی شێلمەی بینی،
جۆی بچینی قونجرکەی بینی،
بێستانی بچینی گاشەبەردان بینی،
یاخوا ماخۆی هەر هەند بمینی،
لەکەرەکە شین بنێ لەزینی خۆشناوان،

ورده ورده کلکیّ دەبندا ڕاوەشینی.

حەیرانۆك هەمەجۆرە هەندێك جار ژنان ئەوەندە بەخەم نەبوونە لەسەر پیاویان، ئەو ژنانەی پیاوەکەیان لەگەڵ خراپ بووە بەو شێوەی خوارەوە حەیرانیان گوتووە :

حەیران دەرێم حەیران عەنتیکە،
دیاریّ حەیرانێم هەتیکەتیکە،
تاکو خۆشبێت ئەو تریکە،
ئەوەنا ئێکیّ دیکە.

ژنان لەمێژە قسەیەکی جوانیان هەیە ئەویش دەڵێن:
بامێردت بەدریّ خۆبیّ
شەونوێنت چارۆگیّ خۆبیّ.
، شەونوێن واتە: دۆشەك وبالیف یان سەرین و بالیف.

واتە ئەگەر مێردت بەدڵی خۆ بوو کێشە نییە ئەو کوڕە چەند هەژارە، دەکرێت لەجیاتی لێف و بەتانی ئیدارە دەکەن وچارۆگ بەخۆدادەن سەرماشیان نابێت، چۆن سەرمایان دەبێت،لە کۆن قسەیەکی ژنان هەبوو، ئەگەر کەسێکیان بەدڵ با، دەیانوت (وەرە بم خوازە مارەبێت لەسەر گرێی چارۆگیّ بۆدادەنێم)، واتە: من زۆر بەکارەم دەوڵەمەندت دەکەم،لە گوندی بێراوە کوڕێك دەزگیرانێکی جوانی هەبووە، ڕۆژکیان دەزگیرانەکەی لەگەڵ باوکی دەچنەچیا، بەمەبەستی مازی چنین کچەکە دەچێتەسەر یەکێك لەدارەکان لە کاتی مازی چنین لقیك لەبن پێدا دەشکێت بەردەبێتەوە،توشی ئازارێکی زۆر دەبێت، باوکی کچە کچەکەی بەپشتی گوێدرێژ دەباتەوە گوندی کورە گەنجەکە ئەوهەواڵە دەزانێت و سەردانی دەسگیرانی دەکات و بەدەسگیرانی دەڵێت: خەم مەخۆ شەرت بێت تۆڵەت بکەمەوە دوای نانی ئێوارە دەست دەکات بەبیور سوێن تاکو موان دەکات بەیانی بەرەو چیادەچیت بەپرسیار دارەکە دەبینیتەوە، دەست دەکات بەبرینی دارەکە ورد وردی دەکات و ئاگریك دەکاتەوە، دارەکە دەسوتێنێت و دەگەڕێتەوە!

ئەو ڕووداوە لەمێژە، ئەوەی سەیرە ڕووداوەکان دووبارە دەبنەوە، ساڵی ڕابردوو حاجی عومەر بێراوەیی کەپیاوێکی دەست ڕەنگین و بەڕێزە خانوویکی خۆشی دروست کرد، بەمەبەستی هێنانی ژنی دووەمی، ناو حەوشەی ماڵیشی کاشی کردبوو ژنی دوەمی هێناو ڕۆژکیان خێزانی

**ـــــرکاشی بەردەبێتەوە، حاجی عومەر کەوتە بەر کاشیەکان و هەمووی شکاندن و فرێی دان ..**

*** *** ***

**ئەگوندەکەمان ژنێکی زۆر بەرێز هەبوو، زۆریش ژنێکی کراوە و حەزی لە سوحبەت بوو، ـێـەکەی برایەکی مردبوو، براژنەکەی خۆی مارەکردەوە، ئەو ژنە کەئەو هەواڵـەی زانـی زۆر پـێ تێـک چوو، پیاوەکەی ماوەیەك سەردانی ماڵەکۆنەکەی نەکرد، ڕۆژکیان هاتەوەو بـووە بەشـەڕ دەرو حەیان دەورەیان لێدان، منیش ئامادەبووم لەوێ ژنە کۆنەکە پڕ بەدەنگی خۆی هاواری دەکرد ئەی گوت:**

**خزمینە عەیب بی و نەبێ، پشێ خۆم دەوێت، پێم بووێت باشە پێم نەوێت ئەمن پشێ خۆم ـعـەو کونە دیواری دەنێم، ئەموێت شەرمێش لەکەس ناکەم ئەوئیشە بەڕەزامەندی خواو ـێغەمبەرانە، دەك ئافەرین بۆ ڕاست گۆییە و ڕاشکاویەت پلکە .... نە.**

**ژن بوونەوەرێکی سەیرە ئەگەر بە تیلەی چاو تەماشای مێژوو بکەی بە دەیان هەزار پیاو ـەـلو چوینە تەنها هۆیەکەی خۆنواندن وخۆ بەئازاپیشاندان بووە، لە بەرچاوی ژن بەهەزاران پیاو ـتەلەوە بووە هۆیەکەی ژن بووە، ئەگەر بە وردی سەیری ئاژەڵ و باڵدارانیش دەکەی هەمان غەریزەیان هەیە، بەتایبەتی لە کاتی جوت بوون، بزنەکێوی نێریەکانیان لەو وەرزە ترسیان لەبیر ئەچێت هەست بەترس ناکەن، دەبێتە شەڕە قوچێك لە دووری چەندان کیلۆ مەتر هەستی پێ ئەکرێت، بۆیە ڕاوچییەکان وەختەکەیان دەزانن ئەوکات دەچونە ڕاوێ یان کەو، لەکاتی ماکە و خۆی دەشارێتەوە بۆ ئەوەی کڕ بکەوێت، لەسەر هێلکان نێرەکە و نەشەرم ونەترس لای نامینێت هەرهاوار دەکات، زۆریش تورە دەبێت شەڕیەدارو بەرد دەفرۆشێ.**

**شتێکی شاز لە بزنەکێویەکاندا هەیە، شوان پایزان نێری لە بزنان جیا دەکاتەوە، بۆ ئەوەی زاووزێ لە زستان لەدایك نەبێت، بەخاتری ئەوەی لەسەرمان و لەبرسان نەمرن، بزنە کێویەکان بەخۆیان ئەو کارە ئەنجام دەدەن لەڕەگەزی مێ جیادەبنەوە لە ڕەگەزی نێر بەراوردی وەخت دەکەن، کە وەچەکانیان ئەوکاتە لەدایك ببێت کە سەرما نەماوە و گیاوگۆڵیش زۆر بووە، چیرۆکێك هەیە لەشێخە بەرێزەکانی باقلانێ:**

**گوایە یەکێك لەشێخەکان ناوە ناوە بزنەکێویەکانی خوێداوە، یەکێك لەبزنەکان سەقەت بووە، واتە کەمئەندام بووە، شێخ ویستویە خوێیان بۆببات و کەم ئەندامەکەش بێنێتەوە و بیکوژێتەوە، ئەو نیازەی هەبووە کەدەچێت خوێیان بدات، هەموویان دێنە سەر خوێ بەردەکە**

کەمئەندامەکە نایەت! شێخ بانگی دەکات بزنە سەقەتەکە نایەت، شێخ دەڵێت: وەرە خوێی خۆت بخۆ، من پەشیمان بوومەوە نات کوژمەوە یەك سەر بزنەکەدێت، دەست دەکات بەخوێ خواردن!

لەخۆشناوەتی بزنەکێوی تاکو ساڵەکانی (١٩٤٠) هەبوون، رێژەی بزنە کێوی یەکجار زۆر بووە، وردەوردە بەرەو کەمی چوون، بەنەمانی بزنەکێویش، لەناوچەکەمان رێژەیەکی زۆر هەلۆ و دارەش و سیسارکەکەچەر هەبوون، ئەوانیش ماڵئاواییان کرد.

مرۆڤ لەمێژە دەزانیت ئەگەر رەگەزی نێر رەگەزی مێی لەدیارییت، نەلەمردن دەترسێت، نەماندووش دەبێت، بۆیە بەشك لە دەوڵەتان رەگەزی مێ دەخزێننە ناو سەربازی، بۆ زیاتر هاندانی سەربازەکانیان.

کوردیش زۆرلەمێژە هەستی بەوەکردوە،لەکاتی هەرەوەزی بۆ زەوقی گەنجان بۆ ڕاپەڕاندنی ئیش و کارپێویستی بەکچە، بەهەبوونی کچ گەنجان سەر خۆش دەبن و هەست بە ماندوو بوون ناکەن، ئیشوکاری هەرەوەزی زوو رادەپەڕی بۆنموونە: کاتی گەنم دروین دەبووایە کچێك یان چەند کچێك گیشەکەربان، گۆرانییەکانی بۆ گەنم دروین دەگۆتران لەناو ئەو گۆرانیانە زۆرجار گۆرانیبێژ بە ئەنقەست ناوی کچە گیشەکرەکانیان دینا، بۆ شێت کردنی گەنجان:

ئهۆی گەنمن گەنمی ڕەشگورە،
گیشەکەر عەیشە گورە،
ماری منی خەراکردیە،
چەندە جوان و بگۆڕە،
یان هەندێ جار جوێندان بەگیشەکەر

هەدرونە درونە درونە
ههۆی دەسکێ داسێم بە ڕونە
خزمینە گازێ لێدەن
گیشە کەرفێرە .....نە

یش لەکاتی ساوار کوتان گەنم تەڕکردن و گواستنەوەی دەبووایە کچ بێ، گەنجان شێت و هار دەبوون گۆرانیەکەش لەگەڵ جوولانەوەیان ئەگونجا وەك :

گەنمی پارە ئۆلاو،
نۆ ئەموسارە ئۆلاو،
کلبان هارە ئۆلاو.

چومەماریێ حەمەی حەیدەر ئۆلاو،
دووقرژاران سەر هینادەر ئۆلاو،
هلوار نەم خۆن یاپیغەمبەر ئۆلاو،
دانیشتوە لەبن تویێ ئۆلاو،
تارۆی دەخوا بە چەقۆیێ ئۆلاو،
بە من نەبوو حەزم چوویێ، ئۆلاو.

لەکاتی ئەو گۆرانیانە گەنجە کان سەرخۆش دەبوون ناحەقیش نەبوون، کچان ئێوارە خۆیان دەرازاندەوە قۆڵیان لێ هەڵ دەکرد قۆڵی پر لە بازن خۆیان بۆن خۆش دەکرد، بە گیابەند لەناو باغەرنان و بۆنی قەنەفر و مێخەك و هیتر ..بسکیان لول دەدان و لەسەر سەریان گرێ دەدان بۆ دەرکەوتنی گەردەنی زەردیان بەناز و فیزەوە بەردەستی کوڕانیان دەکرد، ناوە ناوە تیلە چاوێکیان دەدایە کوڕان و زەردەخەنەیەکیان بۆدەکردن، پیاو ئەوپیاوەیە خۆی ڕاگرێت، زۆرجار لەکاتی ئەو زەردەخەنە کوڕان بەرنامەکەیان لێ تێك دەچوو، کوتکەکان بەریەك دەکەوتن، شریقەی کوتك بەریەك کەوتن، ڕۆژەڕێیەك دەڕۆیشت، یان لەسوڕان پێیان لەپێی یەکتردەنا، یان لە دێ کاتی چرو برین بۆ تاژەڵان دەبووایە کچان ئامێزە چرویان کردبا، لەتوتن پێوەکردن کچان توتنیان دەبریەوە، دەیان هێنا بەر دەستی گەنجان یان لەکاتی توتن چاندن کچان توتنیان دەچاند و کوڕان خاکاریان دەکرد خاکاو: بەو ئاوە دەوترێت کە بۆیەکەم جار بۆیەکان ئاویان تێ دەکرێت سەیری گەنجان بکە لەکاتی زەماوەند چۆن خۆیان هیلاك دەکەن، لە شایی تەنها بۆ خۆنواندن،یەکێك لە بەندەکانی خۆنواندن لەبەرانبەر کچان دەڵێت:

بیور سوابێ،

**دار گەندەربێ،**
**یار لە دیاربێ.**

**واتە تازە بیور سواکرابێ یان تیژ کرابێتەوە، کوڕ دار قەد بکات و دارەکەش گەندەربێت واتە نیمچەرزی بی یاریشی لەدیار وەستابێ کوڕ کێشەی نابێ، لە خۆنواندن، گەلی کورد لەڕابردو وەك ئێستا دڵپیس نەبووە، بەتایبەتی لەکاری جوتیاری کارێك نەبووە ژن یان کیژ بەشداری تێدا نەکات، کارەکانیش زۆریان هەرەوەزی بووینە، تێکەڵیەوی هەبووە، مامۆستایانی ئایینی ئاگادار بووینە و مامۆستای زۆرگەورە و زیرەکیش بووینە و لاریشیان نەبووە، چونکە ئەو تێکەڵیەیە نەریتێکی کۆن بووەو نەریتێکی خۆمان بووە زەرووریەتی ژیانیش بووە لەلای هەمووکەس ئاسایی بووە وەجل وبەرگی خوشکان هەمووی ئالاو والابووە بەتایبەتی سوورو سپی زۆ ر بەکارهاتوو.**

**بەداخەوە کۆمەڵێك بەناوی ئیسلام پەیدابووینە باوەڕیان بەخۆیان وگەلەکەیان نییە وا دەزانن دینی خوداو پێغەمبەر تاپۆیە لەسەر عەرەب !**

**(ئیسلام) لەچاوی عەرەب و جل وبەرگی دەبینن، بەشێك لەخوشکانیان کردۆتە (قەلەڕەش) بەعەبایی ( خەلیجی)، کەکراس و کەوێی خۆمان زۆر جوانتر و پۆشتەترە، ئەو بەناو ئیسلامییانە لەبیریان چووە خودا خودای هەمووکائیناتێکی ئەرز و ئاسمانە و پێغەمبەریش سەلامی خودای لێ بێت موڵکی هەموو مرۆڤایەتییە، ئەشکرێت دڵی خۆمان بدەینەوە، دەی قەیناکە نانی ئەوانیش لەو بەزمەدایە ئەگەر مەلای گەورەی کۆیە لەژیان مابا پێی دەوتن ڕدێن پانینە وامەکەن ئاگاتان لەدین و گەلەکەی خۆتان بێت، بەڕم بۆتۆ مەلای گەورە بەخەون وەرە پێیان بڵێ وامەکەن مەلاینە.**

**هەردوێنێ بوو لەژێرسایەی عەرەبی قورئان لەسەر ڕان بەهەزاران موسڵمانی کورد بەهەردوو ڕەگەزەوە زیندەبەچاڵ کران، بەهەزاران منداڵ بەمەمەی دەمیان بەزیندووی ژێرخاك کران بەهەزاران مزگەوت و تەکیە و خانەقا وێران کران، کەپڕبوون لەوتە بەنرخەکانی خودا و پێغەمبەری خۆشەوست و پیاوە باشەکان کەخۆشەوستی خودا و پێغەمبەر بوون، ئەوەی ئیسلام لەچاوی عەرەب ببینێت گێرانەوەی عەرەبە بۆدووبارە ئەنفال و کیمیاباران وێران کردنەوەی کوردستان و وێران کردنەوەی ئاینی ئیسلام لە کوردستان، من وەك کەسێکی کوردی موسوڵمان پێم وایە شەق شەق کردنی ئاینی ئیسلام تاوانیکی گەورەیە، نەلەبەرژەوەندی ئاینی ئیسلام و نەلەبەرژەوەندی مرۆڤایەتی دایە هەرکەسێك ئەوکارەبکات بزانێت ونەزانێت گوناهبارە بەرانبەر ئاینی ئیسلام، چونکە تۆزێکی تێ دەگەم ئەگەرمەلاش نەبم ناوم فەقێیە، کەوا بوو فەقێش**

ـــکی لێدەزانی، رێزم هەیە بۆ مامۆستایانی ئاینی ئەوانەی لەدین و گەلەکەی خۆیان
ـنصرۆن ئاین بۆ بەرژەوەندی مەنسەب و پارەپەیداکردن بەکار ناهێنن.
بە کوردی ئاین لەسەر سەری ولەسەر چاوان، عەرەبیش وەك من مرۆڤە لەمن گەورەترنییە
ـ گەورەی منیش نییە لەقەساغانە مەرِ بەپێی خۆی و بزن بەپێی، خۆی هەڵدەواسرێ.مەبەستم
ـمۆستایانی ئایینی نییە بەگشتی بەرێزن مامۆستایانی ئایینی بەتایبەتی ئەوانەی
ـسۆزبوونە بۆگەلەکەیان ودڵسۆز دەبن لەداهاتوو مەبەستی من ئەوەنیە مامۆستا ببێتە
ـرتێکی سیاسی، نەخێر دەکرێت بێلایەن بێت و ئەوکاتە دەتوانێت بێ دەنگ نەبێت و گوێشیان
ـێ رادەگیرێت و زۆرکاری چاکیش بکات ببێتە پیاوی دنیا و قیامەت. بەداخەوە ئەمرۆ
ـەکوردستان بەشێك لە مامۆستایانی ئایینی لەناریش دەدەن لەبزماریش دەدەن،
ـسەرمینبەرەکان زۆر توندن،قسەی خێر بۆ گەل و نیشتیمان ناکەن بۆ ئەوەی خەلکی پێیان بلێت
مەلای باشن کە سەردانی بەرپرسان دەکەن خۆیان دەکەنە خاکوخۆر(خۆڵ) بۆگەل و ولات ئەو
ـەنەرو بزماردانە بۆکەسایەتی مامۆستا پەسند نیە وادەزانن خەڵك نایان ناسێ، بەلێ باش
ـەیلتناسێ مامۆستای باش زۆرن نموونەی مەلا سەیدی شارۆچکەی سەروچاوە، بۆخۆی رِق
ـەخەلکی دەبێتەوە، نەك بۆ دووژمن، خزمەتی دین و نەتەوەکەی دەکات کەدەبنەپیاوی دنیاو
قیامەت هەر ئەومامۆستایانە دەبنە سەردێری مێژووی گەلەکەمان، ئەوەی خزمەتی گەل و
ـیشتیمانی نەکات کەمرد وەك ئەوە وایە لەدایك نەبوویێت بە بێدەنگی لەدایك بووە و بەبێدەنگی
ـمردەنێتەوە! ئەوانە لەرِیزی مردووانن بزان یان نەزانن!
گەورەترین تاوانیش بەرابەر ئاین ئەوەیە خۆت لەناو خەلکی بەپیاوێکی دینداری عەیارە
ـیست و چار پیشان بدەی مامۆستایان ئەو مەسەلەیە لەمن باشتر دەزانن، مەلا ئەحمەدی گوندی
توتمە بەناوبانگ بووە، عالمێکی گەورەش بووە، وەکەسایتیەکی گەورەی ناوچەکەش بووە، پیاوێکی
وشیارو دلسۆز بووە، بۆگەل و نیشتمانی خۆی وەقسەی خۆشی هەبووینە، یەکێك لە
قسەخۆشەکانی: دوو خزمی گوندی بێرۆ کە هەردووکیان برابوون، کێشەیەکیان دەبێت، دەلێن: بە
شەرح دەکەین لەلای مامۆستا مەلا ئەحمەد، بەیانی هەریەکە و بەجیا سەردانی مەلادەکەن،
یەکیان گۆسکە رِونێك بۆ مامۆستا دەبات، ئەوەی تریان رِێژەیەکی زۆر هێلکە دەبات، کە
هەردووکیان ئامادە دەبن مامۆستا گوێیان لێ دەگری، دواتر پێیان دەلێت: ئەگەر بەهێلکان

بکەم قوربان تۆ دزراوی، ئەگەر بەرونیش بکەم تۆ دزراوی، هەستن برۆن برایەتی یەکتر بکەن باشترە.

لەشرع و شەرعکاری مەلاجیاوازە لەگەڵ مامۆستا، مەلا ئەوانەی پێیان دەڵێن مەلا تەنها کاری مەلایەتی دەکات، ئەوانەی پێیان دەڵێن مامۆستا مەلا ئەوانە خاوەن مەدرەسە بوینەو دەرسیان بەفەقێیان وتووە .

*** *** ***

**چیرۆکیکی خۆش کەکچ فێڵ لە گەنجان دەکات**

**سەیرکە کچێك چۆن یاری بە ئەقلی کوڕان دەکات**

کابرایەك ژنی مردبوو تەنها کچێکی جوانی هەبوو، کابراپایزێ گەنمێکی زۆری چاندبوو، وەختی گەنم دروون هات، رۆژێکیان بە کچەکەی گۆت بابچینە گەنم درووینێ ئەورۆژە گەنمیان درووی تاکو ئێوارە ئێوارە کابرا زۆر هیلاك ببوو وتی کیژم بەخوای ئەوگەنمە لە تاقەتی من دانیە بەیەك مانگ بەمن تەواو نابی، بچمەوە گوندی بە سەپانی دەیدەمە کەسەکی، کچەکە دەڵێ: بابە بە گوێم دەکەی لە بەیانی بۆ نیوەڕۆ هەموو گەنمی بدروم،کابرا دەڵێت: بزانم کو دەی درووی ئەمن رازیمە کچە کە دەڵێت: بابە بەیانی بڕۆ شاری دە سێوان بینە خەمت نەبی گەنم درواییە کابرادەڵێت: کیژم شێت بووی، سێوکو گەنمی دەدرون، کچە دەڵێت: بابە ئەتو لۆم بینە، ئەمن کچی بابی خۆنیمە ئەگەر بە سێوان گەنم نەدوری لێم تورەبە ، بەیانی زو کابرا دەچیتە شاری و (١٠) سێوان دەکرێ و دەگەڕێتەوە دەڵێ هاکیژم ئەوە دە سێو بزانم چاکەی،ئاخر بەسێوان گەنم کو دەدروێت، کچەکە دەڵێت بابە ئەوە ئیشی تو نیە ئیشی منە، کچە دەناو گوندی دەگەڕێت بە شێوەیەکی نەهێنی قسەلەگەڵ دە گەنجی گوندی دەکات هەریەکەو بەجیا، دەگاتە هەرکوڕێکی دەڵێ بەیانی وەرە یارمەتیمان بدەلەگەنم درووینێ ئەو سێوەش سبەینێ دەباغەرێنێ وەك نیشانە، کچ دەگەڕێتەوە ماڵەوە کابرا دەڵێت کچم چت کرد، دەڵێ بابە گەنم دروا، بەیانی زوو کچەکە لەخەو هەڵدەستێ و مەشك دەژێنێت و یەك تەشتە ناسکەنان دەکات و نان و چا دەداتە باوکی وبەخۆ دەکەون و بەرێ دەکەون بۆ ناو گەنمەکەیان وردە وردە گەنج بەدەر دەکەون، هەر گەنجێك کەدەگاتەلایان کچەکە دەڵێت، بەقوربانی کوڕە لاوی سێو لە باغەرێ بم،گەنجەکان دەست دەکەن بەگەنم دروین، ناوەناوە کچە دەڵێت قوربانی کوڕەلاوی سێو لەباغەرێ بم گەنجەکان شێت و هار دەبن گازەیەك لەولای گازەیەك لەولای، راست وچەپ پەلاماری ئەو گەنمە دەدەن تۆز بەری ئاسمانێ

ـەگری پێش ئەوەی مەلا بانگی نیوەڕانێ بدات، تەقەی لێوە دینن هەمووی دەدرون. دەچنە سەر ـتی دەست و چاویان بشۆن لە سەر کانیێ گەنجێك لەوان سێوی لێ بەردەبیتەوە ناو کانیێ ـنجەکان تەماشای یەك تر دەکەن هەموویان پێدەکەنن، کوڕەی سێوی لێ بەردەبێتەوە پێیان ـێت: بە چی پێ دەکەنن هەموویان دەڵێن کوڕە مار وێران ئەمەشی هەمور وەکی توی گاینە ـەر کچە ئەمەی تراندین و ئەمەش هەمووان سێون درایتێ وەکی تور !

ئەوەی من بەچاوی خۆم دی، ئەوماوەدرێژەی لەگوندی ژیاوم، هەرماڵێك کچی هەبانە ـەکانیان زووتر رادەپەری لەهەرکارێکی جووتیاری، ئەوەی لەگوندیش ژیابێت نکۆڵی لەو ـستییە ناکات، گەنجەکان زۆرجار بەئەنقەست لەکاتی کارکردنی ماڵی خاوەن کچ خۆی پیشان ـەلن بەدەوروبەری ئەوماڵە داتن و دەچون بۆ ئەوەی پێی بڵێن وەرە هاوکاریمان بکە.

*** *** ***

ـەگوندی شیوە، دوو برا هەبوون، یەکیان بەناوی(تەها) و ئەویتر بە ناوی(حەمەد)، حەمەد حەز لەکچێك دەکات تەهاش لەبنەماڵەکەیان دەترسێ ئاژاوە دروست بێت، رۆژێکیان دانیشتوون تەها داوا لە حەمەدی برای دەکات واز لەو کچە بێنێت کێشە لە نێوانیان پەیدادەبێت وازبێنەو واز نایێنم، لەو کات کەرەکەیان لەقاتی ژێرەوە دەزەڕی تەها پەلاماری قیسپێك دەدات و هەموو گیانی کەرێ دەشکێنی و دەڵێت هەی داکێ ماخۆی پێشیت بگێم ئەتووش وەکی حەمەدی برا حەزلێ کردنێ ئەکەی !

لەو دەورو بەری خۆمان کابرایەك هەبوو بەناوی وەستا ....... دوو قەیرە کچی هەبوون ـەنگیان تێدا نەمابوو لە ماندبوونیان خۆشی هیچ زەوی نەبوو وە کاری ئاسنگری دەکرد وەك پیوردروست کردن و لە و بابەتانە لە سەرتای بەهار ئەو کچانە دەبوونە دەست کەلا هەر ئیشێکی هەرەوەزی هەبووایە، لە گوندی خەڵکی گوندی دەچون داوایان لێ دەکردن وەك بژارکردن، پیاز چاندن، کارتە و جۆتەی توتن تا دوای باوکی کچەکان دەیزانی بەشێکی بردنی کچەکانی بۆ بە زەوقخستنی کاری هەرەوەزیەکەیە، گومانی پەیدا کردبوو کە خەڵکی گوندی نیازیان خراپە بەرانبەر بەکچەکانی، بۆیە بڕیارێکی داو هەرکەسێك داوای کچەکەم بکات بۆ هەرکارێك پیویستە سەرەتا (یەکم) بداتێ و ئەوکات رازیم کچەکانم ببات.. ئەوبانگەوازی بلاو

**کردەوە وای لێ هات کەس نەی دەوێرا داوای کچەکانی بکات بۆ کاری هەرەوەزی.... کچەکان لەکۆر کار و کاسبی بوونەوە... من ئەو پیاوەم دیوە**

**لەپیناسەیکی باپیران دەڵێت:**

**سێ گەواد هەنە لەدنێ... دنێ: دونیایێ**

**ئەوەی باوەڕ دەکات بەژنێ**

**ئەوەی لەهەورازان دەکێشێ قەنێ**

**ئەوەی مارێ دەباتە کن خزمێ ژنێ**

**کورد دەڵێت سێکەس لەژیاندا پەسند نین**

**دەوڵەمەندی دز**

**پیری ئاشقە قوز**

**فقیری بەبوخز**

**کورد دەڵێ ئەو ژنەی یەك جار هەڵە دەکات بە هەڵە ئاژمار ناکرێ، دیارە ئەو قسەیە بە جۆرێکی تر وتراوە لە بەر ڕێزی ژنان من باسی ناکەم مەبەستی کورد لەوەیە ئەکرێت هەموو کەس هەڵەبکات .**

*** *** ***

**لە گوندی بێراوە، کابرایەکی باش هەبووە بەناوی حاجی حەمەد کۆران ، خێزانی ناوی پلکە حبیب بووە، ڕۆژکیان پلکە حەبیب لەماڵ نابێت مام حاجی چەند سەرەبزنێك دەفرۆشی، ئێوارە پلکەحبیب کە دێتەوە ماڵەوە مام حاجی پارەی بزنانی وێ دەداتەوە دەڵێت هەندەك بزنم فرۆشتن پلکەحبیب دەڵێت کو فرۆشتنت؟ مام حاجی دەڵێت فرۆشتنم پلکەحبیب دەڵێت: بزنێ قۆچ ئەنگوستیلەت فرۆشت دەڵێت بەرێ. بزنێ بەلەکاریشت فرۆشت؟ دەڵێت: بەرێ. حەبیب دەڵێت برۆ ئەوبزنانە نەینیەوە، تەڵاقت دەدەم! نەیەوە ئەومارەی، حاجی دەڵێت کو تەڵاقم دەدەی! پلکە حەبیب دەڵێت ڕاوەمەستە نەینیەوە تەڵاقت دەدەم. مام حاجی بەپەلە دەچێتە لای کابراو دەڵێت قوربان بزنێ بەلەکارو بزنێ قۆچ ئەنگوستیلەم وێنەدەیەوە ژنم سوێندی لی خواردیە تەڵاقم بدات**

**ئەو ژن و مێردە نێوانیان زۆر خۆش بووە، شتی سەیریان لێ دەگێڕنەوە، برادەریش بووینە، مام حاجی حەمەد پیاوێکی زۆر بەهێز بووە ، زۆرجار خێزانی خۆی بەدەستێك بەرز کردوە، واتە**

حیزتی لەسەردەستی خۆی ڕاگرتوە، مام حاجی حەمەد کۆران حەزی لەگاڵتەو گەپیش بووە، شەوێکیان نیوەی شەوێ بەخەیاڵی دادێت لەگوندی بێراوە بچیتە گوندی شیە بۆلای برادەرێکی خۆی کەوەك ئەو بەهێز بووە، دەچێتە لای و ناوبراو لەلای خێزانی نوستوە و هەڵی دەستێنێت و دەڵێت هاتیمە شەڕە دەستێك بکەین ئەویش دەڵێت مارت خرانەبی ڕۆژبرابوون، دەڵێت واز لەو قسانە بینە هەستە، دەست دەکەن بە دەست شکاندنەوە دواتر بۆیەك هەڵدەستن دەبێتە شەڕەمل و مرخ مرخانێ وردە وردە خەڵکی بەونیوەشەوە بەخەبەردێن لێیان کۆدەبنەوە بەژن ومناڵەوە، ماوەیەکی زۆر خەریکی یەکتر دەبن کەسیان ناتوانێت بەسەر کەسدا زاڵ بێت، کەسێك دێتن دەڵێت خزمینە ئەوەچیە چ ڕووی دایە؟ یەکیان وەڵام دەداتەوە دەڵێت: مابرێم چیە بەونیوەشەوە پیرەکەرەکی بیراوێ هاتیە ئیتقێ نێرەکەری شیرێی گرتیە، کابرا باوەڕ دەکات و دەڵێت مارو خەرانەبی بەهەمان و دوو کەر پێ لەکۆر یەك نابنەوە !

***   ***   ***

لەساڵانی زوو لە گوندی خەتێ کەسێك پەیدا دەبێت دەڵێت خزمینە ئەگەر بەخێوم کەن تا بوارێ واتە تابەهارێ ئەوگردەی پێش گوندی لادەبەم، دیارە گوندی خەتێ گوندێکی خۆش و پڕلەکانی و کانیاوە، دەوڵەمەندە بەهەموو میوەیەك، ئەوەندەی من گەڕاوم لە گوندەکانی کوردستان نموونەی گوندانە لەپاك وخاوێنی ژنەکانیان زۆرپاك وخاوێنن، زۆرحەز لەخاوێنی دەکەن. زەوی و زار و دەغل و جۆشیان باشە دیارە ئەو گردە گوندی خەتێی تۆزێك قەبز کردوە، خزمانی خەتێش کابرا خزمەت دەکەن، تا بەهارێ بەهار دادێت گرد هەر لەشوێنی خۆیەتی پێی دەڵێن: کا کابرا گردت لانەبرد، کابرا دەچێتە سەر گردی دەڵێت:

گردە هۆگردە،

مادام ئەتو نەڕۆی،

ئەمن لەڕکی تو دەڕۆم !

بەڵێ کابراخۆی بەخێوکرد، بەخزمانی خەتێ و بەهارێش لەرقی گردی ڕۆیی، کابرا ناوناو چوو، گردیش هەر لەشوێنی خۆیەتی.دیارە گوندی خەتێ لەمێژووی گەلەکەمان خاوەنی چەندان شەهید و پەك کەوتەیە، دەیان پیاوی ڕۆژگاری خۆی بووە لە ڕابردوو زۆر خزمەتی هێزی پێشمەرگەیان کردووە .

وتەیەك هەیە گوایە خوشكان خۆش باوەڕن، لەگوندی خەتێی خۆمان كابرایەك هەبوو بەناوی مام (ئاوڕەحمان) دەبێتە خزمی بنەماڵەی مەلایان گەنج دەبێت و دەچێتە كاروانی لە ماڵێك میوان دەبێت، لەگەڵ ژنەتیم ڕێك دەكەوێت و باسی هەبوونی خۆی دەكات دەڵێت حەوت ئاشی ئاوم هەنە پێنج جوت وپێنج جووتیارم هەنە:

نانیشم كونیش كونیشە

مافوریشم بەرمە ر یشە

ژنە لەودوو ڕستەیە نەگەیشتوە، واتە: نانم لەماڵەوە هەرزنە و كون كونە دۆشەك و ما فوریشم نیە ،لەسەر بەرمە برنج دەخەوم، دیارە ژنە زۆر ساویلكەبووە و ڕەگەلی دەكەوێت بۆ گوندی خەتێ، تەماشا دەكات كابرا نانی نیە، بخۆن ژنە بە ئاوڕەحمان دەڵێت: باشەئەتو وتت ئەوشتانەم هەیە،واش نەبوو .مام ڕەحمان دەڵێت تۆ بۆئەوە باشی باشەمن كەدەم وت ئەوشتانەم هەیە بۆ بیوت لەوەنەكردەوە كەمن هێندە دەوڵەمەندم بۆ بەو كوچەكەرە چەند شەو و ڕۆژە دەڕێێ دامە هاتیمە ترێ فرۆشتنێ، ئەگەر حەوت ئاشم هەنە لەچ سەگبابی دێمە دەشتی هەولێرێ، بۆ گۆڕینەوەی ترێ بەگەنم، گەنمیش سەری هارو ماری تێدایە، دوای ماوەیەك ژنە دەڕوات و بزر دەبێت .

*** *** ***

ماكەرە دزم: لەوگوندانەی خۆمان ماڵە دزمێك لەشوێنێكی لابەلا ماڵی دادەنێت، كەسێكیش لەهەمان گوند تازە رادیۆی كڕیوە، بۆ یكەم جاریشە رادیۆ هاتوتە ئەوگوندە، كابرای خاوەن رادیۆ بۆ خۆدەرخستن رادیۆی هێناوەتە پێش ماڵی خۆیان ودەبوایەئەوجۆرە رادیۆیانە چەند وەیارێ ببەیتە ئەولاو ئەولا، ئەو كات گۆرانی بێژەكان رەسوول گەردی و حەسەن جزراوی و عەلی مەردان و مریەم خان و ..تاد. لەوكاتیش هەندێك منداڵی تازە پێگەیشت و ئەیانەوێت ماكەرێ دزمی بدزن بۆكاری حەرامزادەی دزم چاوی لیان دەبێت و بۆلایان دەچێت سەیر دەكات بەبەردان لەماكەرێ دەدەن بۆئەوەی ماكەر بگرن، دواتر بەردێك لەسەری ماكەرێ دەدەن، ماكەر دەمرێت منداڵەكان رادەكەن، دزم بەدووایان دەكەوێت، منداڵەكان لەترسان ئاگایان لەخۆ نییە، دە وەیاری خاوەن رادیو دەئالێن و رادیۆ بەردەبێتەوەو دەشكێت ولەكاردەكەوێت، كابرای خاوەن رادیو پەلاماری دزم دەدات هەزار جوێن بە پولەكی...دەڵێت تۆڵەی رادیۆم دەوێت كابرای دزمیش دەڵێت: ئەمنیش تۆڵەی ماكەرێم دەوێت، دوواتر ریشسپی و پیاو ماقوول كۆدەبنەوە و كێشەكە

حیکۆتایی دێت: کابرای دۆم واز لە تۆڵەی کەرێ بینیت و کابرای گوندیش وازلەتۆڵەی رادێۆ بێت. چونکە منداڵەکان لەخۆیان بوون، خزمانیش هاوکاری کابرای خاوەن رادیۆ بکەن .

*** *** ***

**( چیرۆك)**

کابرایەك به گومان دەبێت لە خێزانی خۆی، رۆژێك لە دووای نیوەڕۆ بە خێزانی دەڵێ دوو تەوێ دەچمە چیای لۆ ڕاوێ نان و پێخۆرم بۆدانێ، ژنە ئەو سەفەرەی مێردی زۆر لا خۆش دەبێت، و تەوەی دۆستەکەی میوانداری بکات، مێردەکەی زوو بەڕێ دەکات مێردی ژنە لە پەنایەك چاودێری ژنەکەی دەکات، کە ژنەکەی دەچێتە کانی بۆ ئاو هێنان پیاوەکە دەچێتەوە ماڵەوەو خۆی لە پەنایەك مات دەکات، دوای هاتنەوەی ژنە لەکانی ئامادەباشی دەکات بۆ دۆستەکەی کەرمێلێك سەر دەبڕێت و هەندێك هێلکە لەناو گیزە دەکولێنێت و ئەستورکە هەنجیر لە پەرۆکێك نەنێت و لە بن قونی خۆی دادەنێ بۆ ئەوەی خاو بێتەوە بۆ دۆستەکەی، ژنە دەچێت ئاو بێنێت ئەکاتی، مێردی ژنە لەماڵەوە دەر دەچێت، مێردی ژنە لەبەرانبەر ماڵی خۆی ڕادەوەستێت تاکو پێش نوێژی شێوان خۆی ئامادە دەکات ئەگەر ژنە لێی پرسی بۆ لە ڕاوێ هاتییەوە تاوەکو وەڵامی بەلتەوە واتە لە لایەك باسی سەفەرەکەی خۆی بکات و لە لایەکی تر فرتو فێڵی ژنەکەی ئاشکرا بکات بە وردی بخوێنەوە چەند جوان فرتوفێڵی خێزانی ئاشکرا دەکات، دەچێتەوە ماڵەوەو دوای سلاو، ژنە دەڵێ مێردە ، ئەتو بەتەمابووی دروشەوان لەچیایی بمێنییەوە، خێربوو هاتییەوە، کابرا دەڵێ:

ژنێ بەسەری من وتوو،
لە سەرانم لێ بووە تەمو توو،
دنکە تەزرە دەبارین،
وەکی هێلکەی ناو گیزێ توو،
ئەگەر سەر بەرگم گەرم نەبا،
وەك خروەی بن قونێ توو،
لاقم لێ قوچ دەبوونەوە،
وەکی کەرەبابی ناو مەنجەرێ توو!

ژنە دەڵێت  مێردە من کردم تۆنەی کەی لەسەر دەستی خوداو پێغەمبەر تۆبە دەکەم.پیاوەکە چاوپۆشی لەو هەڵەیە دەکات و دەکەوێتەسەر خواردنی کەرەبابی بۆ دۆستی ژنە ئامادەکرابوو، ( محەمەد جەمال تۆتمەیی)  ئەوچیرۆکەم بۆ باس کردم، لە کتێبەکەی (فۆلکلۆری خۆشناوەتی) بلاو ی کردیتەوە، لەوانەیە زۆر شتمان یەك شت بێت، چونکە ئەوەی من و ئەوەی ئەو  مولکی ناوچەکەمانن جیرانین.

( محەمەد جمال تۆتمەیی ) ڕێزم بۆی هەیە زۆر شتی لەمردن نەجات دا، زۆریش هیلاك بووە بە ئەدەبیاتی ناوچەکە، چونکە ئەو جیلەی داهاتووی ئێمە زۆربێ خەبەرن لەڕابردووی ژیانی گەلەکەمان، ئەگەر هاوتەمەنەکانی ئێمە هیمەتێك نەکەن زۆر شت ماڵئاوای دەکات بەیەکجاری،لەناو کوردەواری زۆر جار چەند وشەیەك  دەوترێ، زۆر ڕون نییە بەلام چیرۆکێکی لە پشتە وەك:

کوڕ  کوڕبی ماڵی بۆچیە،

کوڕ کوڕ نەبی ماڵی بۆچیە!

واتە  کوڕکوڕبێت ماڵ بە ئازایەتی و ئارەقەی نێوچاوان پەیدا دەکات  ئەگەر ماڵیشی نەبی واتە لەباوکی هیچی بۆ بەجێنەمابێت بەپێچەوانەوە ئەگەر کوڕ پیاو نەبوو دەوڵەمەندیش بێت لەباوکی بۆی بەجێمابێت لەدەست دەدات مایەپووچ دەبێت.

گوێم لە چەند ڕستەیێك دە بوو  لە و باوکانەی کە کوڕەکەیان لە گوێیان دا نەبوون، یان کورەکەیان کاروکاسبی ناکرد و  هاوکاری باوکی نابوو .. دەوترا  ... گوتیانە کەرێ مژگینیمان کەوت، کوڕێکت بوو  بوویە  باوك .. کەر وەلام  دەداتەوە  دەڵێت  بە من چی کوڕم بووە ((باری کەرێ هەر لە کەرێیە)) ..واتە باوك ئەوکاتە بەکوڕەکەی دڵخۆشە، کە کوڕەکەی لەگوێی دابێت و هاوکاریی بکات، بەپێچەوانەوە  کوڕ هەبێت و نەبێت بەوی چ!

هاوینان بکورێ مێشکۆکە

زستانان دەکورێ مەنجەرۆکە

واتەهاوینان گوێ مەدەنە گەرما کاروکاسبی بکەن بۆ ئەوەی زستانان تێرو تەسەل بن، ئەو پەندە پەیوەندیدارە بەجووتیاران چونکەکاری جووتیاری سێ وەرزیە. ئەوەی دەست دەشکێنێ پێی نالێین وەستا.

ئەوەی دەست هەل دەبەستێتەوە و چاکی دەکات پێی دەڵێن: وەستا. ئەو قسەیە مولکی من نییە مولکی کوردە، واتە ئەوەی شەڕو ئاژاوە دەنێتەوە پێی ناڵێن پیاو ئەوەی کێشەکە چارە دەکات پیاوی باشە و جێگای ڕێزە لەلای خەلکی ئەوە وەستایە.

منیش قسەم هەیە ئەوەی ڕێز لەماڵ و منداڵی خۆی نەنێ و تێرو پۆشتەیان نەکات شایانی ئەوە نیە ببیتە هاوڕێت، شایانی ڕێزیش نیە، چونکە ئەگەر بەزەیی بە منالەکانی خۆی دانێت پێشك بەزەیی بەجەنابت دانایەتەوە، وریابە لەوکەسانە

ڕەز و ئەز

پەز و ئەز

ئەوە قسەی خانزادی سۆرانە واتەژن گەورەیە سەروەرە ژیان بەبێ ژن وجودی نییە، بۆی ئەو پیاوانەی (وەك من ئۆمەرن) ڕێز لەژن دەنێن، خانزادی سۆران قسەیەکی تری هەیە دەڵێت:

فەقیرلۆ فەقیرە،

با هەر برنج بەشیر بخوات

ئایە خانزادەخان مەبەستی چی بووە لەو ڕستەیە، من نازانم وە من لەباوکم گوێم لێ بووە، ئەکرێت بەو نیازە ئەو ڕستەیەی گوتبێت ناوچەی دەشتی هەریر برنجی زۆری لێکراوە و خەلکیش ئاژەڵداربووە، واتە برنج و شیر هەبووە، لەکاتی حوکمڕانی خانزاد دەستی باڵای هەبووە لە جۆگە دروستکردن و مزگەوت بنیات نان مەدرەسە و هاوکاری مەلاو فەقێیان، نیشانەیەکی هەبووە مزگەوتەکانی خانزاد دەرگەیان ڕوو لەڕۆژ هەلات بووە،بەداخەو مام کەماڵ بەگ کردینی بەمولکی بنەماڵەی ئەمبێزخان نموونەی مزگەوتی شێخ وەسانان یەکێکە لەمزگەوتەکانی خانزادەخان کە من ئەوقسەیەم لەمەلاخدر گوێ لێ بووە، کەکۆنترین بنەماڵەن، دەی گوت مزگەوتی مە، زۆرجار دروست کرایتەوە، هەمووجارێك لەبەرخاتری گۆڕی خانزاد، بەهەمان شێوە دروست کرایتەوە، ئەوپرسیارەم لە مام فەقێ ئەحمەد کرد، کە کەسێکی زۆر وریا بوو ڕووداوو بەسەرهاتی زۆر لەوەی کۆنتری لەلا هەبوو، ئەویش هەمان قسەی مەلاخدری دەکرد ئەوپرسیارەم لەمام حاجی وەستاسمایلی بنەماڵەی ئەسمەرێ کرد، کەپیاوێکی نیشتیمانپەروەر و زیرەك و ئاقلّ و وریابوو، دەریای ڕووداوەکانی ڕابردوو بوو ئەویش بەهەمان شێوە دەی وت نیشانەی مزگەوتەکانی ڕوو لە ڕۆژهەلات بەهاوکاری خانزادەخان کراون، ئاساییە مام کەماڵ بکەوێتە ناو هەڵە منیش لەوانەیە چەندان شتم نوسیبێت بەهەڵە، هۆیەکەی لە خەلکی بەساڵاچوو وەرگیراوە

نوسراوێك نەبووە، پشتی پێ ببەستی زۆرجار چیرۆكێك بەسەرهاتێك بەچەندان شێوەهەیە، كەم و زیاد كراوە، دەبێت خوێنەری بەرێز ئەوە بزانێت زۆر لۆمەولۆمەكاری نەكات ئەگەر زۆرنەڕازیە ئەوەقەڵەم و كاغەز، باجوانتر و باشتر بنووسێ و راستربنووسێ، كێ پێی ناخۆشە ئاوی سارد بابخواتەوە، سەری خۆی لەچیای قافێ بدات وەكی خزمانی جاف دەڵێن:

دەوڵەمەند لە جۆخینێ،

هەژار لە دۆخینێ.

واتە دەوڵەمەند لەبەر دەوڵەمەندی خۆی و خێزانی لەبیر دەكات دیارە كابرای هەژار ئەو كێشانەی نییە وەكی كەرەبابی وەخت وناوەخت نازانێت، ناوەناوە پەلاماری پیەژنێ دەدات مەنجەرە ساوارەكی دەخوات.

*** *** ***

وەك دەگێرنەوە:

ژنەدەوڵەمەندێك هەموو بەیانیان دەبینێت ژنەهەژارێك خۆی داوێتە ئاوێ غوسل لە خۆ دەردەكات، ڕۆژێك نییە و دووان نیە ژنە دەوڵەمەندەكە حەسوودی پێ دەبات ڕۆژكیان ئەو مەسەلەیە لەلای مێردی باس دەكات دەڵێت: ئەمن هەموو بەیانیان دەبینم ئەو ژنەهەژارە خۆ داوێتە ئاوێ، پیاوە دەوڵەمەندەكە مەترسی لە ژنەكەی خۆی دەكات، بەدزی دەچێتە لای پیاوە هەژارەكە، دەڵێت برادەر ئەمن تۆ دەبینم بەبێ كار دانیشتووی بۆ كارێك ناكەی هەژار دەڵێت: بەدەستی بەتار كار ناكرێت دەوڵەمەندەكە دەڵێت هائەوەپارە برۆ تیجارەت بكە،پیاوە هەژاركە دەڕوات بۆ تیجارەت، ژنە دەوڵەمەندەكە تەماشا دەكات ژنەهەژاریش وەك ئەو دێت نوێژی خۆی دەكاو دەڕوات بەكز و داماوی، .

مازی كەرێ كون دەپاشۆڵێ

ئەو پەندە ڕووبەڕووی ئەو پیاوانە دەبێتەوە كە زۆر كاسبن و هیلاكن لەهەمان كاتدا لەماڵەوە ژنەكانیان ماڵیان بە هەدەر دەدەن پیاوەكە خڕی دەكاتەوە، ژنەوێرانی دەكات،كورد دەڵێت:

ئومورگێڕت بمرێت،یان كاسبكار

وەڵام :

كاسب كارم بمرێت باشترە لە ئومور گێڕ

بەداخەوە حکوومەتمان کاسبن ئومیرگێڕمان کەمە،
قسە جێ نەگرێ نەی کەی،
گوو نەگات نەی کەی.

ئەوە قسەی باوکمە، باوکم دەی وت بۆ هەرشوێنێك چووی با دوونانت پێ بن، باوکم باوەڕی زۆر بەبەخت هەبوو، زۆرجار دەیوت ئەگەر شێربێ کە نێو چاوانت نەبوو،لەڕیویش کەمتری باوکم هەموو، ئامۆژگاریەکانی بەچەند وشەیەك بەمن دەوت کوڕم یەك شتم بۆ بکە لەژیان:(لە هەموو شتێك بەراورد لەنێوان خۆت و خەڵکی بکە) واتە: کەچاوت لەدزی بوو، بیربکەوە، ئەگەر یەکێك دزیت لێ بکات چەند پێ تێك دەچی، کە ویستت دەست بۆ کچی کەسێك ببەی بیر لە خوشکی خۆت بکەوە، ئەگەر کەسێك دەستی بۆ ببا چەند پێت ناخۆشە، تا دووای بەڵێ بابە بەراورد زۆر گرینگە لەنێوان خۆت و خەڵکی، ئەگەر لۆمەی ڕابردوو بکەی پێویستە شارەزاییەکی باشت هەبێت لەڕابردوو بۆ ئەوەی ئەوکات بەئێستا بەراورد نەکەی، چونکە دوێنێ و ئەمڕۆ جیاوازن).

*** *** ***

ئاغایەك هەبوو بۆکاروباری ماڵەوە کەسێك دەکاتە خولام ڕۆژێکیان بە خولام دەڵێت:
گەواد وەرە ئەوئیشە بکە خولام توڕەدەبێت لە ئاغا مۆر دەبێتەوە ئاغا هەست دەکات، بانگی خولام دەکات دەڵێت: وەرە پێشم گوێی خولام دەگرێت، ئاغە دەڵێت کوڕە ئەتو گەوادی ئەمن گەوادم، ئەتوگەوادی، ئەمن گەوادم، ئەمن گەوادم ئەتو گەوادی... گوێی بەرنادا، تاکو پەنجاجار خۆی و نۆکەرەکەی گەواد کرد،دیارە دەرەبەگەکان زیرەك بووینە ئەوکات خەڵکیان( غسل دەماغ ) کردووە، وردە وردە نۆکەر وای لێ هات ئاغا بەنۆکەرەکەی نە وتبا گەواد نۆکەرەکە دڵخۆش نابوو.

*** *** *** *** ***

**چیرۆك**

ئاغایەك ڕۆژێکیان لەدیار،خولام دەبێت خەریکی ئێستر داکردنە چەندتان لە ئێستر دەدات ئێستر ناچێتە ژووریّ ئاغا، دەڵێتە غولامی کوڕم بە زمانی خۆت بە ئێستر بڵێ: بڕۆ ژووریّ شەرم مەکە، ئێستر بەقسەی خۆش ناچی، چونکە ئەوهە فێربووە، ئەوجارەیان خولام دەڵێت: بڕۆ ژۆریّ هەی ژنی ماخۆت بگێم، ئێستر بەنەرمونیانی دەچێتە ژووریّ ئاغا دەڵێت: ئەدی بابم ئەوەزمانی تووە هێستر تێ دەگا، وات فێرت کردوە.

زۆرم زەمی جەنابی ئاغاکان کردووە، با زەمی بەشێك جووتیارانیش بکەین، هەندێك لە

جووتیارانیش وەك مشك چاوەڕێی ئەوە بووینە شێربیان پارێزێ کە کوڕە جووتیارێك کچێکی هەڵدەگرت، خۆی دەخالەتی ئاغایەك دەکرد ئاغاش دەی پاراست لەوپاراستنەش ئاغا زۆرکاری نابەجێی بەوکەسە دەکرد، مەجبوور دەبوو کارەخراپەکان بۆ ئاغا بکات لە بەرانبەر پاراستنی، وەك مۆسادی ئیسرائیل سەرباری کوڕە ئاغاو چاوچاوانێ لەگەڵ ژنە هەرگیراوەکە، یان کوڕەجووتیارێك کەسێکی دەکوشت، دەچوە لای ئاغایەك خۆبەخشانە دەبوە نۆکەری لەپێناوی مانەوەی لەژیان، ئاغاش ئەو فرسەتەی لەدەست نادا، هەزار و یەك کاری نابەجێی پێ دەکرد،کورد بۆ ئەو جۆرە دەسکەوتانە قسەی خۆی هەیە دەڵێت:

نەئەونان و ڕونە،

نەئەو زەبرەقونە!

واتە چاوت لەدەسکەوتێك نەبێت باجەکەی گەورەتر بێت لەدەست کەوتەکەی.

*** *** ***

**چیرۆك**

کوڕەمێرێك ئاشقی کچەدزێك دەبێت، دیارە ئاشقایەتی جیاوازی چینایەتی ناکات، کوڕەمیر کچەدزم داخوازی دەکات و دەی گوازێتەوە. کچەدزم دەبێتە ئاغەژن و چەندان کێرکەری بۆ تەرخان دەکەن . ڕۆژکیان کوڕەمیر بە دزی تەماشای خانمێ دەکات کە نانی بۆ دێنن، بەشێك لەنانی دەشارێتەو دواتر لە دەلاقە دای دەنێت، کە دەوروبەری چۆل دەبێت دەچێت لە دەلاقە دەپارێتەوە خێری پێ بکەن بەدەستەکی نانەکە دەداتە دەستەکەی تری! ڕێزی زۆرم بۆ خزمانی دزم هەیە ئەویە کورد دەڵێت خوی شیری تاپیری .

دەڵێن ژنێکی لای خۆمان زۆر مێردی کردبوون، لەوکاتە خەریکی هەویر شێلان دەبێت لێی دەپرسن ئەرێ پلکێ چەند مێردت کردینە؟ دەرێ ڕۆڵە بالۆت بژمێرم:

دزی و حیزی شورەییە،

هەزاری بکە و

حەراری بکە،

نۆو نۆ و نۆیدی،

خدرە پوزەو دەیدی،

کۆرەکەی هەمبان لەپشت.

## خۆشناو و دز و دزشاو

یەکیان لە شێخێری کوشت( شێخێر دۆلێکە لە نێوان شێخ وەسانان و گوندی بێراوە )
دەستیشم بە هەویرن
هەر ئەوەندەشم لەبیرن!
واتە نزیکەی
چل مێردی کردوە، هەموویان بە حەراری بوون، دەستیشی بە هەویر بووینە دیارە هەر ئەوەندەی لە بیر بووینە،

کورد دەڵێت حیزو دز چاك دەبن، ژنی بەزمان زمانیشی بیڕی چاك نابێت، ئایا کورد لە یۆنانیەکان وشەی خۆت چاك بکە فێر بووە یان یۆنانیەکان لەئێمە فێربووینە؟

**چیرۆکیك لەسەر ئەمە**

فەلسەفەی کوردە بە شێوەی چیرۆك پێمان دەڵێت خۆت چاك بکە، هەبوونەبوو جووتیارێك هەبوو بەیانیان دەچووە جوتی تاکو دەگەیشتە سەر زەویەکەی حەیرانی دەگۆتن کە جوتیشی دادەبەست دەستی دەکرد بەجوت کردن کە ماندوش دەبوو دادەنیشت و دەستی دەکردەوە بە حەیران کابرایەکی ڕەوەند بە لایەوە سەیر دەبێت ئەو جووتیارە ئەوەندە دڵخۆشە، دەچێتە لای و دوای چاك و چۆنی دەڵێ مام جووتیار پێم خۆشە بزانم ئەو دڵخۆشیەی تۆ چیە؟

مام جووتیار دەڵێ وەلا دڵخۆشی من دەگەڕێتەوە بۆ خێزانم، زۆر خزمەتم دەکات ئێواران کە دەچمەوە بەرەو پیرم دێت و گاجووتان و تورەکەم لێ وەردەگرێ و دواتر دادەنیشم ( لاقانم) بە ئاوی گەرم دەشوات و خواردنی چاك و بەتامم بۆ ئامادە دەکات و شەوێ تا بەیانی دەستێکی دەکاتە ( بالیف) و بەوەی تر دەمشێلێ و دەم خورێنێ. دوای بەزم و ڕەزمی کاری شەرعی وەك مندالان لایەلایەم بۆ دەکات، تاکو خەوم لێ دەکەوێ بەیانیان بە ئاوی گەرم جوان دەم شوات و ڕدێنم دەتراشی و بەر سمێر و مەرسمێرانم دەکات و مالۆ دڵ خۆش نەبم برالە! ئەگەر دڵخۆش نەبم لۆ کوشتنێ باشم.

کابرا دەڵێت مام جووتیار وەرە با مامەڵەیەك بکەین، من سێ ژنم هەنە سێ ژنەکانی خۆمت دەدەمێ بە ژنەکەی تو، مام جووتیار سەرەتا ڕازی نابێت، کابرا زۆر داوای لێ دەکات دەپاڕێتەو دواتر مام جووتیار تەماع بەری چاوی دەگرێ و ڕازی دەبێت، ژنەکان بۆ یەکتر تەڵاق دەدەن.

مام جووتیار دەڵێ: کاکە من مامەڵەکەم کردووە پەشیمان نیم، یەك داوام هەیە ژنەکانی تۆ سەخڵەتیان چییە؟ کابرا دەڵێت: وەڵڵاهی پێت دەڵێم: یەکیان دزە، یەکیان حیزە، یەکیان بە

زمانە، مام جووتیار دەڵێ: دز و حیزەکەم دەوێ، بە زمانەکەت بۆخۆت نامەوێ، دوای ماوەیەك مامەڵەکە جێبەجێ دەکەن، مام جووتیار لەگەڵ هەردوو ژنە حیزو دزەکەی دادەنیشێت دەڵێتە ژنە حیزەکەی، خانمی خۆشەویستم ئەو ژوورە بۆتۆ دوو دەرگای تێدانە کەمن هاتمەوە ماڵەوە ئەگەر کەسێکت لەلابوو بە بێ دەنگی با لە دەرگەکەی تر بچێتە دەرێ، بامن نەی بینم هەر ئەوەندە، خانمە دزەکەم ئەوە هەموو کلیلی ژوورەکان دەدەمەدەست تۆ لە لای مـن گـەردەنت ئازابێـت مـاڵ ماڵی خۆتە، من خاوەن ماڵ نیم.

مام جووتیار چووە سەر کاری خـۆی و دوای ڕۆیشـتنی جووتیـار ژنـەکان پێکـەوە دانیشـتن بڕیاریان دا کە هەردووکیان واز لە دزی و حیزی بێنن خزمەتی ئەو پیـاوە مـەردە بکـەن، مـام جووتیار ئەوەندە خزمەت دەکرا ئەوجارەیان لە کاتی جـۆت کـردنیش حـەیرانی دەگـوتن، کـابرای ڕەوەند ڕێی کەوتەوە لای جووتیار سەیر دەکات مام جووتیار دوو ئەوەندەی جاران دڵخۆشـە، دوای سەلام و کەلام دەڵێ مام جووتیار وەزعت چۆنەلە گەل ژنان؟ مام جووتیار بە دوو وشـە وەڵامـی دەداتەوە دەڵێ:

یەك و دووە،

ئۆعە وەرەوە لەوی سەری،

هەزار سەلاوات لەپێغەمبەری.

مام جووتیار دەڵێت ئەتو وەزعت چۆنە لەگـەڵ کەونـە ژنەکـەم . کـابرا دەڵـێ وەڵلاهـی مـام جووتیار کەونە ژنەکەی تو حیزیش بووە دزیش بووە، بە زمانیش بووە، بەوردی گوێ لەجووتیار بگرن چ بەکابرا دەڵێت مام جووتیار دەڵێت:

کابرا جەنابت

هەر سێ سفەتت تێدانە:جنابت حیزی، دزی، بەزمانیشی !

هەزار ژن بگۆڕی هەموویان حیزو دزو بەزمان دەردەچن!

وا باشە خۆت چاك بکەی،

ئۆعە وەرەوە سەرخەتێ،

خودا بدات فرسەتێ!

کەجەنابت خۆت چاك کرد ژنەکان بە خۆ چاك دەبن،

ئۆحە وەرەوە بە خورامی ملانت بم

شموێ تا سبەینێ خزمەت کارت بم

بەڵێ ئەو چیرۆکە، فەلسەفەیە، هەرکەسێك بیەوێت ئامۆژگاری خەڵکە بکات هانیان بدات بۆ کاری باش و پەسند پێویستە سەرەتا کەموکورتیەکانی خۆی ببڕێت، کوڕ و کچ بەوردی چاودێری جوکیان دەکەن، ئەوباوکە کردار و رفتاری چۆن بێت بەشێکی لێ وەردەگرن بۆ وەڵام دانەوەی ئەو چیرۆکەی باسمان کرد کە ژنی بەزمان چابوونی نییە هەمووشتێك لە عەزیا دەترسێ عەزیاش لە ژنی بەزمان دەترسێ بۆیە کابرا ژنی بەزمانی نەویست.

*** *** ***

چیرۆکیکی تر لەم بارەیەوە:

با باسی ژنی بەزمان بکەین بە یارمەتی خوشکان تورە مەبن، هەبوو نەبوو کابرایەك هەبوو، ژنێکی زۆر بە زمانی هەبوو ئەوژنە بە زمانە ناوی ( سار) بوو لەگەڵ خزمان و جیران وگوندی هەموو رۆژێ لە شەڕو جوێن دان دابوو کابرا زۆر ئامۆژگاری دەکرد سوودی نەبوو، لێدانی تاقی کردەوە ئەویش سوودی نەبوو، رۆژێك بە خەیاڵی داهات هەڵی داتە ناو بیرێکی زۆر قوڵ لە کۆڵ خۆی و خەڵکی بکاتەوە، ژنەکەی بەفێڵ بردە سەر بیرێ و فرەیدا ناو بیرەکە، دوای پێنج رۆژ وتی بچم (سارێ ) دەربینم گوناحە گوریسێکی هەردایە ناو بیرێ و گوریسەکە زۆر قورس بوو وردە وردە هەڵی کێشا تەماشای کرد عەزیایەك خۆی لە گوریسی ئالاندوە زۆر ترسا ویستی فرێی داتەوە ناوبیرێ،عەزیا وتی کابرا خواو پێغەمبەرم هێنایە رەجایێ نەجاتم دە لە دەستی(سارێ) ،چی بتەوێ بۆت دەکەم لەو دنیایە کابرا وتی شەرت بی سارێ وازت لێدینم مادام عەزیا لە دەست زمانی تۆ دادە دادیتی کابرا عەزیای هێنا دەرێ و عەزیا وتی کابرا خەمێ لە سەر( سارێ ) هەر مەگرە بە یانی زوو دەچم خۆم لە کچی پاشا دە ئالینم دەڵێم هەرچی بۆ لام بێت بە کچی پاشا وەدەدەم ئەوکات تۆ وەرە بلێ ئەگەر ئەو کچە دەدەنە من من رزگاری دەکەم، بۆ بەیانی عەزیا خۆی لە کچی پاشا ئالاند هەموو شار تێ گەیی کەس نەوێرا کچە نەجات بدات، کابرا چووە لای پاشا گوتی: ئەگەر ئەو کچە بدەنە من نەجاتی دەدەم پاشا کچەکەی پێشکەش کرد بە مەرجێکی نەجاتی بدات، کابرا بۆ لای عەزیا چووسەری بردبۆ لای عەزیا و وتی عەزیا ئەو کچە بەردە، سارهات، عەزیا لە ترسی سارێ کچەکەی بەرداو خۆی لەهەموو قەڵاتێ پاشای فرێدا و پارچە پارچە بوو!

*** *** ***

## خۆشناو و دز و دزشاو

**چیرۆك**

ژنیش بابی خۆیان زۆرزانن، دەگێڕنەوە کابرایەك دوو ژنی هەبوو یەکیان بەناوی( مەلەك ) بوو ئەوەی تر بەناوی( پەری) مەلەك ژنی گەورەی بوو، بەپیاوەکەی دەڵێت ئەریّ پیاوەکە پرسیارێك دەکەم ڕاستیم پیّ بڵیّ، منت خۆشتر دەویّ یان پەری؟ پیاوەکە دەڵێت وەك یەك خۆشم دەوێن. مەلەك دەڵێت: ئەگەر هەردووکمان بە ڕوو باری داچوین لەمن و پەری کیّ دەگریەوە، کابرا دەڵێت مەلەك ئەتو مەلە دەزانی پەری دەگرمەوە، مەلەك دەڵێت بەقوربانی دەلینگانم بی ئەوە پێم ئاشکراکردی پەریت لەمن خۆشتر دەوێت، باب و باپیران پێمان دەڵێن ئاگادارین دڵتەنگ و دڵخۆش مەبن نەبەفەقیری نە بە دەوڵەمەندی دەوڵەمەندی خۆشی تێدایە ودەیان کێشەی هەیە، هەژاریش خۆشی و ناخۆشی تێدایە، فەقیری بەڵایەکی گەورەیە دیارە حەسانەوەشی زۆرە واتە فەقیر زۆر هیلاك نییە، نموونە زۆریەی دەوڵەمەندەکان ناوێرن، شتی خۆش بخۆن، دکتۆر لێیانی قەدەغەکردوە، فەقیر ئەوکیشەی نییە، باش دەخوات زۆریەی دەوڵەمەندەکان کێشەیماڵەوەیان هەیە و منداڵەکانیان باش دەرناچن، لەگوێی باوکیان نین فەقیرئەوکێشەی نییە دەوڵەمەند زۆریە ترس و وەسوەسەو درانگ خەوی لێدەکەوێت بەزەبری مەشروب و مخەدەرات دەنوێت ، فەقیر ئەوکێشەی نیە لەلایەن خزمان لۆمەیەکی زۆر لەسەردەوڵەمەندە، کەس لۆمەی هەژارناکات، دەوڵەمەند کێشەی زەکات و حەج و هەتیوو فەقیری هەیە فەقیر ئەوکێشەی نیە، دەوڵەمەند داوەتی بەرپرسان و دیاری و شیرینی و خۆنواندن و زۆر شتی تر دەبێت بیکات بۆدرێژەدان بەهەبوونی خۆی . فەقیر ئەوکێشەی نیە

ئەوەیە فەقیر لەدۆخین، دەوڵەمەند لەجۆخینیّ

فەقیر لە زستانان لە بەر پشکۆیان دادەنیشێت و نەبەفری وێدەکەوی و نەباران چایی دەدیمێدایە و وردە وردە قەنیّ دەکێشیّ و دەڵێت

دانیشتیمە لەبەر پشکۆیان

هەرامەم بەهەرامەی ساحێب دۆیان

واتە کابرای دەوڵەمەندی خاوەن مەڕو ماڵیّت و زستانان ناتوانێت لەبەر سۆبا دانیشێت خۆی گەرم بکاتەوە بەردەوام بەفرو باران لێی دەدات زۆر هیلاکە کەبە هار داد یّ و باران بەرەو کەمی دەچێت ئاژەڵدار تۆزێك بیخەم دەبێت ودەڵێت :

دەخۆم نان و پەنیر و شیری

خۆشناو و دۆ و دزشاو

**هەرامەم بە هەرامەی فەقیری**

*** *** ***

**ڕووداو**

**لەزستانان شەوێك هەیە لەخۆشناوەتی پێی دەڵێن شەوی گای سۆر**

**لە سەروچاوەی گوندی مەلاکان بەرەو لای ئاراسن گوند بووە، لە زەمانی زوو چەند ماڵێك دەبن یەکێك لەپیاوە بە ساڵاچوەکان ئێوارەیەو سامارێشە، واتە ئاسمان هەوری لەبەر نیە زەینێخۆ دەداتێ پشیلەکەیان فەرخەکانی لەناو خانوو دەباتە ئەشکەوت بیر لەو پشیلەدەکاتەوە، پێی سەیرە! ئاشکرێت پشیلە بەبێ ئەوە بکات. سێ کوڕی هەبووینە، بانگی کوڕەکانی دەکات لەگەڵیان دادەنیشێت، دەڵێت: کوڕم من پێش ئێستا پشیلەم بەو شێوە دیوە، بڕۆن گاجوتی سۆر بکوژنەوە، ئەوشەو بەفریکی زۆردەبارێت هەرچەندە کوڕکان ئەقڵیان قسەی باوکیان نابڕێت، دیارە قسەی باوکیان ناشکێنن، ئاگاداری خزمانیش دەکاتەوە وریابن بەفر لە ڕێیە خزمان باوەڕی پێ ناکەن، گاجووت دەکوژنەوە و ڕێژەیکی باش دەکوڵێنن، شەو دادێ و خەڵکی گوند دەخەوێت کابرا ناهێڵێت کوڕەکانی بنون، لەنیوەی شەو بەفر دەست دەکات بەبارین، کابرای بەساڵاچوو دەڵێت: کوڕەکانم بەنۆبەت یەکتان بەفرمارن دووتان دانیشن، ئەوەی لەسەریان دێتەخوارێ باگۆشت بخوات، منیش لەدیار و دادەنیشم.**

**ئاگاداری خزمانیش دەکات کەهەستن بەفردەباری کەس خۆی لەخەو ناکات، ئیتر ئەوسێ کوڕە بەنۆبە ئابەیانی ناخەون ئەوەی لەسەریانیش دادەبەزی باوکی ئاوگۆشتی بۆتێ دەکرد دەی خوارد بەیانی سەیری جیرانەکان دەکەن هەموویان خانوویان بەسەرداروخاوە لەژێربەفر مردوون وخنکاون! شەوی گای سۆر مەشوورە لەخۆشناوەتی.**

**من لەپیاوە بەساڵاچوەکان شتێکم زانیوە کەباس لەشتێکی غەریب دەکات ئەویش بەبەستەڵەك بوونی گۆی زەویە، قسەکە بەوشێوەیە دیارە، سیمرخ، یان لەژیاندا نەماوە یاننەبووە و ئەفسانەیە .یان دەشکرێت هەببووبێت. پیشتریش چەندان نموونەن هەیە لەچیرۆکەکان باپیران لەجیاتی گیانلەبەر گفتوگۆیان کردووە، ئەکرێت سیمرخ گیانلەبەریکی لەشێوەی دایناسۆرەکان بیێت بەهەرحار لە سیمرخ دەپرسن جنابی سیمرخ لەتەمەنی دوورودرێژت لەو دنیایە چشتیکی غەریبت دیوە؟ سمرخ دەڵێت شتی غەریبم زۆردیوە یکیك لەوانە: من لەکونەکەی خۆم لەناو ئەوکونە سێ لانەم هەبوون، یەکیان زستانی ئەوەی تریان پایز و بەهاری بوو، ئەوەی تریان**

هاوینەبوو. بە چلەی هاوین بەفربارین دەستی پێ کرد بەفرەکە زۆردرێژەی کێشا، لەکونی سێیەم وەخت بوو لەبرسان و لەسەرمان بمرم ناچار بووم لەبرسان فەرخەی خۆم خواردن. من پێم وایە ئەو چیرۆکە زۆر کۆنەو دەگەرێتەوە بۆ بەستەڵەک بوونی گۆی زەوی، دەشکرێت وانەبێت پیاو ئەوپیاوەیە لەقسەی خۆی نەیتەخوارێ من دەڵێم وایە ...

ئێمە هەمووممان خۆ بەپیاو دەزانین ئایا کێ پیاوە، دیارە پیاوی پیاو بە کۆمەڵێك کردار پیاوی ناو پیاوانە، وەك خۆپاراستن لە حیزی و دزی کە دووکۆڵەگەی گەورەن لە ژیانی هەرکەسێك بەهەردوو رەگەزەوە، خاڵیکی تریان خەڵکی لەدەست و زمانت نەترسێ، هەر کارێکی باش لەدەستت هات لەخزمەت کردنی خەڵکی درێخی نەکەی، رێزی هەمووکەس بەهەردوو رەگەز لە منداڵ تاکو شێت،لەهەر نەتەوەیەك، لەهەر ئایینێك،قسەی شیرین و دەم بەخەندە و خەڵك خۆش ویستن، رێزگرتن لەکەم ئەندام و هەژار ودەست کورت، خۆدوورگرتن لەپۆز لێدان و خۆنواندن، راستگۆیی و بە هەڵوێستی، رەش رەشە و سپی سپیە، باگوێ لەو چیرۆکە بگرین:

یەکێك لە میرە کانی خۆمان لەناوچەی (( ئامەد )) وارێك دەکەوێ منداڵی پەیدانابن، دووسێ ژن دینی هەر سوودی نابێت واز دینی و شوکرێ خوادەکات، برازایەکی دەبێت، بەناوی شاباز چاوی دەبڕێتە میرایەتی مامی، دیوەخان دادەنێت و دەڵێت ئەمن میرم، مام بە دوای دا دەنێری لەگەڵی دادەنیشی و پێی دەڵێ کورم ئەمن پیربوویمە و کوڕیشم نینە واز لە میرایەتی بینە، کە مردم بەخۆت دەبیە میر. برازا بەوە ڕازی نابی بە تورەیی دەڕوات وردە وردە کێشەکە گەورە دەبێت، شەڕ دروست دەبێت برازا توانای شەڕی لەشکری مامی نابێت دەڕوات بۆ ناوچەی، مەرگەوەڕ، دەچیتە لای میری ئەو ناوچەیە دوای سڵاو چاکوچۆنی دەڵێت: میران دوو سێ پرسیارم هەیە ڕێم پێ دەدەی بیان کەم، میری مەرگەوەڕ دەڵێت فەرموو لە خزمەت دام، شاباز دەڵێ میران چ جۆرەپیاوەکت هەنە، میر دەڵێت: پیاوم هەنە سەد پیاو بە ولاغەوە لەپایزێ تا بەهارێ بەخێو بکەن، پیاوەکان گۆشت وبراو بخۆن ولاغەکانیش کاو و جۆ بخۆن، شاباز دەڵێت میران ئەوانە پیاو نین خواپێ داون دەی بەخشن بەخشندەن، بەخشەندەیان پێ دەڵێن ئەو جۆرە پیاوانە پێویستە هەبن، شاباز دەڵێت میران چ جۆرە پیاوی ترت هەنە، میر دەڵێت جۆرە پیاوی ترم هەنە هەریەك لەوان بە سەد کەس هەیە لە شەڕ، شاباز دەڵێت میران ئەوانەش پیاو نینە پێیان دەڵێن شێتەپیاو، پێویستە هەبن ڕیزیان بگیرێت لەهەندێك شت چاوپۆشیان لێ بکرێت چونکە ئەوانە سەرەڕۆن.

شاباز دەڵێت: میان چ جۆرەپیاوی ترت هەنە میر دەڵێت جۆرەکی ترم هەنە کە کەسێك لێی قەوماو توشی کێشەیەکی گەورەبوو سەرو ماری خۆیان لە پێناو دادەنێن تاکو کابرا رزگار ئەکەن، شاباز دەڵێت بەڵێ میان ئەوانە پێیان دەوترێ پیاو، شاباز بەسەرها تی خۆی و مامی بۆ مەس دەکات میری مەر گەوەڕ دەڵێت شاباز تا بەهارێ خۆ ( بێدەنگ کەو دانیشە ) واتە تاکو مەهارێ لەوێدەبیت بەهارێ میر دەڵێت با برۆین بۆ ئامەد پێشی بگەنە لای میری ئامەد میری مەرگەوەڕ دەڵێت: شاباز ئەتو لەو ناوەی بە من بەتەنیا دەچمە لای مامت، بە تەنیا دەچێتە لای میری ئامەد دوای خۆ پێناساندن و دووای چاك و چۆنی دەڵێت،

میری میان هاتیمە میوایەتیم بدەیێ

میر دەڵێت ئەوە میوایەتم پیشکەش کردی

میری مەرگەوەڕ دەڵێت

میری گەورە میوایەتی بێ دیوەخان نابی

میری شەمزینان دیوەخانی پێشکەش دەکات

میری تەرگەوەڕ دەڵێت

میری گەورە دیوەخان بێ مەسرەف نابێت

میر دەڵێت ئەوە نیوەی سەروەتی خۆم پێشکەش کردی.

میری مەرگەوەڕ هەڵدەستێ دەستی میری ئامەد ماچ دەکات و دەڕوات برازای میر دێنێتەوە دیواخانێ دەستی مامی پێ ماچ دەکات شابازی کردە میر و بەبێ شەڕ و کوشتار شاباز دەبێتە میری ئامەد ...

*** *** ***

ژنێك ئامۆژگاری پیاوان دەکات کە خۆ بپارێزن لەمومارەسەی جنسی نادروست و رێ پێ نەدراو لەیاسای ئاسمان و زەمینی سەرباری دەیان کێشەی خێزانی و دەروونی خۆتان خۆش بووێ وخیانەت مەکەن لە خێزانتان بەوشێوەی خوارەوە:

**چیرۆك**

هەبوو نەبوو پاشایەك هەبوو رۆژەك لەرۆژان بە خەیاڵی داهات، کە بڕیارێك بدات هەموو ژنەجوانەکانی مەملەکەتی ناونووس بکرێن و بە نۆبە هەریەك لەو ژنەجوانانە شەوێك لەگەڵ پاشا بنوێ بۆ بەیانی ئەو مەڕسومە دەرکراو کەوتە بواری جێبەجێکردن سرە گەیشتە سەر ژنێکی زیرەك

**و بەتوانا، بانگی پیاوەکەی خۆی کردو وتی: پیاوەکە برۆ حەوت هێلکەم بۆ پەیدابکە کابرا هێلکەی پەیداکردن ژنە هێلکەکانی کوراندن، دواتر هێلکەکانی ڕەنگ کردن، هەریەکە و بەڕەنگێك کەوتە ڕێ بۆ ماڵی پاشا، داوای مۆڵەتی کرد لەپاشا چون بەپاشایان وت ژنێك دەیەوێت پاشا ببینێت و دیاری بۆ هێناوی، پاشا وتی ڕێگەی پێ بدەن، ژنە چوە لای پاشا و دوای چاك و چۆنی وتی پاشای گەورەم، ئێمە لەماڵەوە هەژارین ئەو دیاریەی بۆم هێناوی حەوت هێلکەنە هەریەکە و لە ڕەنگێکی حەز دەکەم لەبەر دڵی من بیانشکێنی و هەریەکە و تامێکیان بکەی پاشا لەبەر خاتری خانم هەر حەوت هێلکە دەشکێنێت تۆزیکی لێ دەخوات، ژنەکە وتی گەورەم هەستت بە جیاوازی تامی هێلکەکان کرد، پاشا دەڵێت نەخێر هێلکە هەرهێلکەیە، تامیش یان وەك یەك بوو! ژنە دەڵێت پاشای گەورەم باوەڕ بکە ئێمەی ژنانیش هەموومان وەك هێلکەین لە هەر ڕەنگێك دابین لەهەر بەژنێك دابین .....هەرامە هەر هەرامەیە، هەمووی یەك تامە پاشا ئەقڵی قسەکەی دەگرێ و ژنەکە خەڵات دەکات و بڕیار دەدات مەڕسومەکە چیتر جێبەجێ نەکرێ، واز لە ژنان دێنێ.**

**لەناو ئەوچیرۆکە نەهێنیەك هەیە، لەمێژە کورد هەستی بەوە کردوە تەنیا حەوت ڕەنگ هەیە، کورد لەمێژە دەڵێت شێر هەستا لەلانێ چ نێر چ مێ ئەگەر کەسێك لەڕەسەن بوو باب وباپیری پیاو بوون، خۆشی بەپیاو بزانێت ڕێزی لێ گیا، پێویستە ئەوکەسە شەرم بیگرێت و ئارەقە بکات لەشەرمان ولە ترسان لەبەر ئەو بەرپرسیاریەتیەکی گەورەی دەکەوێتەسەر شانی ئەوکەسەی کەڕێزیان لێنا ئەگەر ئەوکەسە ناڕەسەن بوو، وادەزانێت خەڵکی لەترسان ڕێزی دەگرن، کورد دەڵێت:کابرای دز وادەزانێت هەموو خەڵکی دزە، حیز وادەزانێت خەڵکی هەموو حیزە. یان دەڵێن:**

**گوێزان لە هەمبانێخۆ دەژمێری. دەفەرموو گوێ لەو چیرۆکەبگرە:**

**دوو خوشك هەبوون ڕۆژێکیان بەشەر هاتن بچووکەکە بەگەورەکەی وت قاحپێ لە ئاخوڕیان .......ی، دوای ماوەیەك پێك هاتنەوە ڕۆژێك لێی پرسی ئەرێ خوشکێ کەلێك تورەبووین لۆ بەمنت گۆ قەحپێ لەئاخوڕیان..... ی ، گوتی خوشکێ بەخوای منیان لەوێ ......بوو وام زانی ئەتوشیان لەوێ ........یە)**

*** *** ***

**چیرۆکێکی تر**

**-کرێت ئەو ئامۆژگاریانە بە ئاوی زێر بنوسرێنەوە**

پیاوێك کوڕەکەی خۆی ئامۆژگار دەکات دەڵێ کوڕە جوانەکەم کەمن مردم،

بازنت هەر کچ بێت،

نانت هەر گەنم بێت،

وڵاغت هەرجوان بێت.

باوك دەمرێ کوڕە هەموو ڕۆژێك ژن دێنێت و جوان و دەکڕێ و نانیشی هەر گەنم دەبێت وردە وردە کوڕ بەرەو هەژاری دەچێت، ڕۆژکیان برادەرێکی باوکی دێتە لای کوڕە وەسیەتی باوکی خۆی باس دەکات، کابرا دەڵێ: کوڕم جەنابت بەهەڵە لە وەسیەتی باوکت تێگەیشتی باوکت دەڵێ:

کەم کەم بڕۆ لای خێزانت کەچووی وادەزانی هەرکچە،

وڵاغەی خۆت جوان خزمەت کە کەسواری بووی وادەزانی هەر جوانووە!

نان مەخۆ تاکو برسی نەبی، ئەوکات هەرچی بخۆی وەك خواردنێکی خۆشە.

باب و باپیران شتێك نەماوە بۆمان باس نەکەن، هەرشتە و بە شێوازێك ویستویانە شارەزامان کەن، وەك پێمان دەڵێن ئاگاداری خۆتان بن زۆر مەخۆن خواردنی زۆر خراپە، لەهەمان کات زوو زوو خۆتان بشۆن بۆ تەندروستیتان باشە بە وردی دووبارە بیخوێنەوە:

خواردن کەندو گوو

شوتن ڕەنگ و ڕوو

واتە بەخواردن وەك کەندوو قەڵەوت دەکات، هەمووی نەخۆشییە بەپێچەوانەوە، خۆشوشتن ڕەنگ و ڕووتان خۆش دەبێت، لە نەخۆشی پارێزراو دەبن، لەسەر تەندروستی باسی پیوازمان بۆدەکەن، کە هەموومان دەزانین پیواز بۆ هەمووکەس پێویستە بیخوا، ئەگەر کێشەی گەدەی نەبێت، پیواز دەڵێت:

سبەینان بەخۆت بم خۆ

نیوەڕۆ بمدە دۆستت،

شەوان بمدە دووژمنت!

واتە شەوان بدە دووژمن بۆ ئەوەی خەوی لێ بکەوێت، چونکە پیواز خەو هێنەرە، خەوێکی قووڵ، بنیشت کە لەداری دارەبەن دەردەهێنرێت دەڵێت:

مەمکە تفیَ زاری،
دەبەم ژەهریی ماری!

مەبەستی ئەوەیە بنیشتەتار قووت بدرێت باشە، بۆ ئەوەی ( لیکی دەم ) سوودەکانی نەکوژێت ئەگەر قوت بدرێت سوودی زۆر دەبێت بۆ مرۆڤ، (داری سماق) لەهەندێك شوێن پێی دەڵێن داری ترش، ناوە ئەسڵەکەی داری سماقە دەڵێت:

تا پۆترانم نەشکینی،
قەت خێرێم لێنا بینی!

هەموومان دەزانین ترش دەورێکی باش دەبینێت لەتەندروستیمان، لەکاتی ڕنینی واباشە پۆترەکانی بشکێنی ئەگەر هەردنکەکانی ڕاماری ساڵی دووەم سماق کەم دەدات، زۆرجار بەدنك ڕنین سماق کەرك دەبێت واتە سماق نادات واباشە وشیەکەی بشکێنی، چاندنی سماق سەیرە، تاکو نیوە سوتای نەکەی شین نابێت جووتیاران سماقیان بەشوێنێك وەردەکرد دەبووایە ئەوشوێنە پوشی هەبووایە ئاگریان تێبەر دەدا و ئەوکات دەیان کێلا بەهاریَ شین دەبوو وە ئەگەر سماق کەرك بوو، لەکاتی ڕشانەوەی سماق لەشوێنێکی تر چەند پۆترەسماق بینە وەك دارخورما لەسەر سماقە کەرکەکەی خۆت ڕای وەشینە سماقەکە واز لەکەرك بوون دێنێت، باپیران دەڵێن: ترش خویدانی مرۆڤە، واتە کەم خویَ بخۆ ..زۆر ترش بخۆ

باپیران دەڵێن: حەیوان خویَ وخواردن و خوێدانە،
لۆمەش سماق دەرمانی دەردانە

واتە لەمێژە کورد مەترسی خوێی زانیوە دەڵێتك زۆربەکاری مەینە، خویَ بۆ ئاژەڵ باشە لەهەمان کات سماق بەکار بێنە دەرمانی هەموو دەردانە، مەبەستی بەکارهێنانی شتی ترشە بۆ مرۆڤ باشە.

باپیران لەجیاتی گیاش قسەمان بۆ دەکەن وەك
لەناو عاردان تاریشکم،
لە دەرمانان سەر پشکم

واتە تاریشك پێمان دەڵێت ئاگادارین من لە هەمووگیا و گوڵێکی تر دەرمان ترم .

پونگیش دێتەقسە بۆمان و دەڵێت:
پونگیَ دەوجۆگەو ئاوانم،

دەرمانی هەموو دەردانم.

گیایەکی تر خۆمان پێدەناسینێ و دەڵێت:

ئەدەشتان ناوم مێکوکە،

دێمم کەو بمخۆ هەندوکە،

دەبمە دەرمانی زاواو بووکە.

واتە مێکوك پێمان دەڵێت بەدێم کردن بمخۆن سوودم بۆ ژن و پیاو هەیە.

زۆرجار باپیران لەجیاتی داریش زانیارمان دەدەنێ وەك داری مێو دەڵێت:

بمبڕو بم کێڕەو بن پێەڕەمکە،

پشتێخۆ لێ وەکە و ئاوێ لە بیرکە.

واتە ئەوسێ شتەم لەگەڵ بکە من پیویستیم بەئاو نییە، لەشوێنێکی تر دەڵێت:

بە دووژمن بم بڕن،

بەدۆستان بم ڕ نن.

واتە مێو چەندی زۆرتر بیبڕی باشترە واتە بەزەیت بەمێو بڕین دانیێت باشە، لەکاتی لێ کردنەوە چمندی بە نەرمونیانی بەرەکەی لێ بکەیەوە، مێو پێی باشە، داری هەنجیر دەڵێت واباشە تاکو (۳۰) کەد چارپۆشیم لێ بکەی باشە، داری هەنار دەڵێت بۆمن سێ کەد زۆرە کەم نییە واتە

هەنجیر سی کەد،

هەنار سێ کەد.

زۆرجار باپیران لەجیاتی ئاژەڵیش قسەمان بۆ دەکەن وەك بزن و مەڕ دەڵێن: پا یزان شەوینم کە، بۆ پاشەکەوتکردنی چەوری بۆ وەرزی زستان بۆئەوەی خۆڕاگر بم وەك:

پا یزان شەوینم کە،

زستانان دووینم کە.

وشەی( دوونە دووین ) لەو کاتە بەکاردێت کە زستان زۆر سەخت دەبێت ناتوانی ئاژەڵ دەرکەی بەوکاتە دەڵێن دووینە یان کەتیتە دوونە مەڕو کەریش قسەی خۆیان هەیە مەڕ دەڵێت:

بەهاران زوو دەرمکە

واتەمن زۆر ڕقم لەگەرمایەو حەزم لەسەرمایە، بەهاران لەهۆرێم دەرکە، باسەرمام بێت باشترە.

کەر دەڵێت :

هاوینانیش جلم کە.

کەر دەڵێت من قەت گەرم نابمەوە، زۆر ڕقم لەسەرمایە و زۆر حەزم لە گەرما یە، بەهاوینانیش جلم کەن، یان لەشوێنێکی تر دەڵێت:

کەر لەچلەی هاوین سێ ڕۆژ سەرمای نیە،هەروەها چێڵ یان چێر یان مانگا دەڵێت:

ئەگەر کابانم کابان بێ،

چ ڕۆژان مار بێشیر نابێ!

واتە ئەگەر کابانی ماڵ واتە گەورەی ماڵ، چێڵ خزمەت کاتن هەرچوار وەرز ماڵ بێ شیروماست نابێت،یان گاجووت دەڵێت :

دنیایێم پێ بکێلی کاکە،

کزنان لەبیرنەکەی چاکە!

کزن لەخزمایەتی دەچیتەوە، سەر نیسک جووتیاران دەیان چاند بەتایبەتی دەدرایە گاجووتان، بۆیان لەبەر ئاوێ دەکردن لە زستانان و لەکاتی جووتکردنیش دەیان دانێ،

ژنیک لەمریشک دەپرسی بۆ هێلکان ناکەی؟

مریشک وەڵامی دەداتەوە دەڵێت:

کابانێ گچکە،

ور ورەم دەپشتێدایە،

هێلکەم دەدمکێدایە.

واتە هەمووکات من ور ورەم هەنە بەڵام ئەگەرکابان تێرم بکات ئەوە هێلکەکردنم ئامادەیەلەخزمەت دامە بەبرسیەتی ناتوانم ور ورە بکەمە هێلکە.

*** *** ***

لەگوندی زێنەی خۆمان چیرۆکێك هەیە باس لە چێل دەکات کەسێکی شێت لە دۆڵی جافەتی لە گوندی دۆرمازەڵە هەبوو ڕێزم بۆی هەیە، یەکێك لەقسەکانی ئەوە بوو دەی وت: بابۆت بلێم منیش بابۆتان بلێم، گوندی زێنە دەکەوێتە باشووری گوندی توتمە سەربەناحیەی بالیسان ئەوگوندە تاکو ساڵی ۱۹۸٦ ئاوەد ان بوو لە (۹۱ ) چۆل کرا گوندێکی پڕلە ئاوو کانیاو ڕووبارو پڕلەمیوەو پڕلە گیاو گۆل بوو کە سێك دەچێتە ئەوگوندە بەمەبەستی چێر

ـریێ دەگاتەپیاوێك بەناوی حاجی محەمەدی مەشوورە بە حاجی محەمەدی گەورە، دوای چاك وچۆنی ـمرامی چێرکڕ دەڵێت نیازم کڕینی چێرێکە لۆ دۆی،مام حاجی دەڵێت من هەمە و دەی فرۆشم ـێك دەکەون مام حاجی بەخێزانی دەڵێت وەرە لۆی بدۆشە، خانم دەسمەنجەرەکی گەورە دینی و لەبەر چێریێ دادەنیشیێ و دەسمەنجەر پردەکات لە شیری، کابرای مشتەری کە چاوی بەو هەموو شیرە ـکەوێت خەنی دەبێت پارەی خۆی دەدا و چێر دەداتەپێشخۆی و بەرەو ماردەچێت بەیانی ـگوندەکەی خۆی چێر دەباتەگاڕانیێ و ئێوارە چێردێتەوە و کابان دەچێتەبەر چێریێ بۆ چێردۆشین سەیردەکات ئەوەندەی دەی دۆشی چەن پیاڵە شیرێکە بەپیاوەکەی دەڵێت چێریێ چ ـێ تێدانەبوو بەیانی کابرا چێریێ دباتەوە زینیێ و بەحاجی محەمەد دەڵێت برا نابوا فێرم لیێ ـکەی ئەمەدۆست و ناسیاوی یەك بووین مام حاجیش دەڵێت برا من فێرم لیێ نەکردی چێرم دایتە ـو خۆ زێنەم نەدایتە تو، واتە شیر لە خواردنی باش دایە .

هەموومان دەزانین مانەوەو گەشەکردنی مروڤایەتی لە ژیان چەند هۆکارێکن لەوان ـەرژەوەندی و خۆشەویستی هۆکاری سەرەکین هەندێك جار لەنێوان ژن و مێرد کە زۆر لێك ـرێکن کە بەرژەوەندیان لە نێوان نامینیێ ساردایەتی دەکەوێتە نێوانیان،

بۆ نموونە:

کابرایەك خۆی وخێزانی و دووکوڕی دەبن خاوەنی بزن و مەڕیش دەبن یەکێك لە کوڕەکانی شوان دەبێت،کابرا بە خەیاڵی دادێت خێزانی خۆی تاقی بکاتەوە ئایە پەیوەندی نێوان خۆی و خێزانی خۆشەویستییە یان بەرژەوەندییە؟ ڕۆژێکیان بانگی خێزانی دەکات دەڵیێ وەرە ئەوەی لەمن قەومایە لە برایمی مەلای زێند ینان نەقەومایە، ژنە دەڵێت، ئەی ڕۆ مێردە چ قەومایە کابرا دەڵێت چت لێوە شێرم ژنیێ لە پیاوەتی کەتیمە و هەرامەم نەمایە، ژنە دەڵێت گوێش مەدیێ ئەوە کاری خوایە لەخوای بەزیاد بێت مندارۆکەن هەنە و وەکی جارانیش گەنج نینە، هەرامەت نەمایە نەمایە! دوای ماوەیەك ژنەتیم دەکەوێتە پەلار لێدان و هەنجەت وخۆتوڕەکردن و بۆرەبۆر ڕۆژێکیان بە مێردەکەی دەڵێت مێردە کو درت دیێ ئەو کوڕە ناسکۆکە بەو زستانە سەختە بنێریە کن بزنان لە سبەینیێ زووترنیە دەبێت بە خۆ بچیە کن بزنان، مێردی دەکاتەشوان، بەیانی زوو کابرا دەچیتە لای بزنان و دەبێتە شوان، دوای ماوەیەك شەوێکیان کابرا خۆی لە ژنیێ نزیك دەکاتەوە و بە دزی بە ژنەکەی دەڵێت ژنەکە وەرەپێشەوە خوا ڕەحمی کرد ـە چابوومەوە ئەوشەوە چەندان قاپە ساوار دەخۆن، ژنە دەڵێت سبەینیێ مەچوە کن بزنان سبەینیێ

بزنەکی دەکەینە خێرێ، مەولوودی پێغەمبەری، بۆ بەیانی ژنە بانگی کوڕەکەی دەکات، دەڵێت کوڕم هەستە شەرمە باو بەو تەمەنە بچیتە کن بزنان ئەنگۆی جوان وجاحێل لە مارێ دانیشتینە، کوڕ دەکاتەوە شوان و بزنێکیش دەکەنە خێری مەولوودی پێغەمبەری، مێردیش لەماڵەوە خزمەت دەکات.

*** *** ***

**چیرۆك**

ئەوچیرۆکە باس لە هەبوونی خەم دەکات واتا کەس بێخەم نییە کەسیش لەدەردی کەس ئاگادارنیە کورد دەڵێت مەگەر خودا بێخەم بێت ژیان هەمووی ململانێیە پڕەلەشتی خۆش وناخۆش پڕە لەپێکەنین و لە فرمێسك پڕەلە دڵخۆشی وخەم وەك تاریکی و روناکی، شیرینی و تاری هەوراز و نشێو سەرماو گەرما گەنجی و پیری ژیان و مردن تادووای ، کابرایەك سەردانی میرێك دەکات سەیردەکات میر لەدیواخانێ دانیشت وەو خاوەنی چەندان خولامە یەکیان تایبەتە بەچاو قاوە یەکیان کاری ئەوەیە قەنە بۆ میرئامادەبکات یەکیان کاری ئەوەیە ئەسپ بۆمیر خزمەتکاو لەکاتی پیویست بۆی زینکاو چاوەڕێی میر دەکات تاکوسواری ببێت، چەندان جووتیارو چەندان کێرکەری هەنە،چەندان پیاوی بەتفەنگ و خەنجەر چاوەڕێی فەرمانی میین، ئاغەژن لەجوانی چاوی لەبەرهەرنایێ و یەکبار زێرو زەمبەری پێوەیە مەروماراتی میر نەسەری دیارەونەبن، کابرا بەمێردەرێت، خۆزگەم بەتۆ میر چەند بێخەمی،میرکە گوێی لەمیوان دەبێت خۆزگە بەمێردەبات،دەڵێتەمیوان برۆ باپیاسەیك بکەین دەرۆن لەشوێنێك دادەنیشن، میر دەڵێت کابرا گویم لێبوو خۆزگەت بەمن دەخوارد ، نەهێنییەك هەیە پێت دەڵێم: هەرکاتێك نەهێنیەکەت درکاند سەرت دەبڕم، کابرا دەڵێت: میان بەو شەرتە رازیم سەرم ببڕە،میر دەڵێت کابرا من و خێزانم شەرتمان کردبوو کە هەریەکمان مردین، ئەگەر من مردم ئەو مێردنەکاتەوە، ئەگەر ئەو مرد من ژن نەهێنمەوە، بەسوتفە سەفەرێکم کەوتە پێش، دوای چەند ڕۆژ ئاگاداریان کردمەوە کەوا خێزانم مردووە، منیش بەپەلە بۆئەوەی شەرتەکەی خۆم جێبەجێ بکەم..... هەرامەی خۆم لێ کردەوە بەو مەبەستەی نەوەك رۆژێك لەڕۆژان ئارەزوی ژن هێنان بکەم.

بەپەلە گەڕامەوە، کەگەرامەوە خێزانم لەمردن نەجاتی بووبوو، ساڵ هات و ساڵ رۆیی ژنەکەم کەوتە بۆڵەبۆڵو وتی من رازی نابم بەجێت دێڵم، منیش دوای بیرکردنەویەکی زۆر، داوام لێ کرد باکەس ئەو رووداوە نەزانێت وەرە مێرد بەو خولامەم بکە، ئەوخورامەی قەنەم بۆ ئامادە دەکات

ـە ڕۆژ خورامی منە، بەشەو مێردی خێزانمە لەبەرچاوی من بەربوویتە خێزانم حەسوودی بەچیمن ـمەی ماڵت ویران بی ئەوخەمەی من هەمە کێ هەیتی، کەوابوو پێوست ناکات ئێمە حسوودی ـەکەس ببەین لەوانەیە ئەوکەسەی ئێمە حسوودی پێدەبەین ئەویش حەسوودی بەئێمە ببات یان ـەرکەسە زۆر لەئێمە بەدبەختر دەری ناخات .

*** *** ***

**بەسەرهاتێک:**

ـە ساڵانی زوو یەکێک لەگوندەکانی خۆمان ژنێک پەیدا دەبێت زۆریش بەرچاو دەبێت، ـەسێک لەخۆی مارە دەکات دوای پێنج ساڵ عەتارێک دێتە ئەوگوندە لەپێش مزگەوت ـەلاکانی پەخش دەکات لەپڕ چاوی بە کەونەخێزانی خۆی دەکەوێت سەیردەکات دەچێتە ماڵێک ـۆ نیوەڕۆ مام حەتار دەچیتە ئەو ماڵە و و دوای سەلام و کەلام دەڵێتە خاوەن ماڵ ، قوربان من شتێکم هەیە و ئەمەوێت لەگەڵت باس بکەم ئەوشتەش لەترسی خوا و پێغەمبەرە، کابراش ـەڵێت: فەرموو مام عەتار، مام عەتار دەڵێت: قوربان عەیب نەبێت ئەو خێزانی تووە، کەونە ژنی منە و ئێستاش لەمارە و تەلاقی من دایە! کابرا دەڵێت: باشە کوێزام جەنابت ڕاست دەکەی عەتار دەڵێت قوربان من نیشانەم هەیە کابرادەڵێت نیشانەت چیە؟ عەتار دەڵێت قوربان ـەکاتی گەمەرگاڵتە تاکو من حینگێکم لەوی دەدا ئەو حەوت حینگی لە بنەوە لەمن دەدان، کابرا وتی تەواو ڕاست دەکەی گومانم نەما خۆیەتی، کابرای عەتار دەڵێت لە بەر خاتری خودا بۆت تەلاق دەدەم، بۆی تەلاق دەدا ، ئەو بەسەرهاتە زۆر دوورنیە.

*** *** ***

دیارە لەناو هەرهۆزێک شتی سەیر رووی داوە هەر خۆشناوشتی سەیر ناکەن، یەکێک لە عەشیرەتەکانی جیرانمان چەند کەسێک ڕێک دەکەون سەردانی شاری کۆیە بکەن، بەمەبەستی مشتومارکردنی خەنجەرەکانیان، چونکە خەنجەر دەبووایە چەند ساڵێک جارێک مشت ومار، کرابایەوە بۆ ئەوەی نەبێتە خۆراکی ژەنگ.

ئەوچەند کەسە ڕێک دەکەون سەردانی کۆیە دەکەن، خەنجەرەکانیان مشتوماردەکەن، دەگەڕێنەوە ناوچەکەی خۆیان شوانێکی مێردمنداڵە لەسەر ڕێگا دەبینن کە کوڕی کەسێک بووە بەناوی (مام ناسر) ڕێک دەکەون خەنجەرەکانیان لەو کوڕە تاقی بکەنەوە راست وچەپ بەخەنجەران دەکەونە سەر ئەو منداڵە، پارچەپارچەی دەکەن ئێوارە شوان نایەتەوە شەو تا بەیانی کەسوکاری

بەدوای دەگەڕێن بەیانی کوڕە بەمردووی دەبیننەوە پارچەپارچەکراوە بە خەنجەران، دوای ماوەیەك ئەو ڕووداوە لەناو خۆیان دزە دەکات، مام ناسر ناوی خوای لیٚ دێنێت دەست دەکات بەکوشتن، بە هۆی ئەو ڕووداوە چل کەس دەکوژرێت ئەو ڕووداوە ڕاستییە و لەعەشیرەتەکانی دەوروبەرمانە ناوی ناهێنم ، هەموومان کدووی یەك برکێینە گەورەتر یان بچووکتر.

*** *** ***

**بەسەرهات :**

حاجی خدر شێخ وەسانی هەبوو، پیاوێکی چاو نەترس بووە و کۆنە ئاشقیاش بووە، لەگوندەکەمان توشی دووژمنداری بوو چەند کەسێکی کوشتبوو، لەسەر ئەو دووژمنداریە ناوچەکەی بەجێهیشت بوو، ببوە پیاوی ماڵی میرانی شەقلاوە لەگوندی قادیانە، زەوی و زارێکی زۆریان دابووە خدر، دیارە میرانی شەقلاوەش بۆ مەبەستی خۆیان ڕێزیان لەخدر نابوو کە لێرە باسی ناکەین ئەگەر تەمەن مۆڵەتی دا ئەوە باسی دەکەم. جوتیارانی ناوچەکەش ڕێزیان لەخدر دەنا و خۆشیان لەخدر دەپاراست، کەسێکی گوندەکەمان بەناوی مام عەولا ناسراو بەعەولاشین، دەچێتە گوندی قادیانە دەبێتەگاوان، حاجی خدر شەوێك بەدووای دادەنێرێت دەڵێت عەولاشین پێویستە بەزمێك دروست بکەین بۆ ئەوەی بتوانی گاوانەتی بکەی چونکە دەوروبەری گوندی هەمووی کرداره، خەڵکی لێرە زۆر لەمن دەترسێن بەیانی ئێوارە من بەچەکەوە دێمە ناوگوندی دەڵێم چێرم نەهاتوە، ئەتوش بڵێ جا من چی بکەم بە کورتی بەشەردێین تۆ پەلامارم دە و من لەبەرت ڕادەکەم بۆئەوەی خەڵکی قادیانە بڵێن ئەو پیاوە زۆر ئازایە و خدریش لەبەری هەرات، منیش شەوێ مەلاو چەند ردێن سپێك دینمە ماڵتان و داوای لێبووردنت لیٚ دەکەم ئەتۆش بڵێ ئەگەر لەبەر خاتری مامۆستا و ردێن سپیان نەبی کەلە گەڵت هاتینە پێك ناداتمەوە هەر دەم کوشتی چ بکەم دەستەڵاتی ئەوانەم نییەبۆ بەیانی ئێوارە ئەو شانۆیە دروست دەکەن و هەموخەڵکی گوندی ئەوشەڕە دەبینێت و حاجی خدر لەبەرگاوانی ڕادەکات، حاجی خدر شەو کۆمەڵێك ریش سپی و مەلای گوندی دەباتە ماڵی مام عەولا داوای لێبووردن دەکات مام عەولاش دەڵێت خدر خوات بەقوربانی مەلا و ردێن سپیان کات ئەگەر ناداتنە رەجایێ هەر دەم کوشتی لەو شەرە بەولاوە، خەڵکی گوندی قادیانە خۆیان لەمام عەولاشین دەپاراست بەکەسێکی زۆر ئازایان ناسیوە، هەرچەندە وانەبووە .

*** *** ***

خۆشناو و دزو دزشاو

**بەسەرهات :**

لەوبەشە خۆشناوەتی خۆمان نەریتێك هەیە زۆری گوندەكان هەموو بەهاران خەڵكی بەهەموو تەمەنەكان لە هەردوو رەگەزی نێرو مێ دەچنە كوێستانان پێی دەڵێن (عامیە) نەورۆژە دیاری كراوەو بە هەموو پێداوستیەوە بەرەو ناوچەی ساو سێوزكان دەچن بەمەبەستی كۆكردنەوەی گیاوگۆڵ وەك رێواس و كەنگر و كوارگ و هەندرێشە سۆریازە. قافڵە دروست دەبوو كەر و ماین و ئیستر و ئەسپ و هەندێك بەسواری و هەندێك بەپیادە ڕویان لەساوسێوزكان دەكرد لەرێگا تەقەكردن و گوتنی حەیران و بەستە و قسەی خۆش و قاقای كچ و كوڕ ململانێی وەپێش یەكتر كردنەوە دەكەوتنە رێ تاكو دەگەیشتنە شوێنی مەبەست، دووای پشودان دەست دەكرا بەڕەشبەڵەك، گۆرانی گوتن و خۆنواندن لەنێوان كچ وكوران تاكو درەنگی شەوان، بەیانی بەو چیایە بڵاو دەبوون، یەكێك لە گوندەكانمان مەلای گوندی دەزانێت كە خەڵكی بەنیازی چونە عامیەن، مامۆستا وتاری تەرخان دەكات كە وا ڕشبەرەكی لە ئاینی ئیسلام رێپێنەدراوە زۆر بەتوندی باس لەرەشبەرەكی دەكات، بۆ بەیانی خەڵكی ئەوگوندە دەچنە عامیە لەوێ بریار دەدەن لەسەر قسەی مەلا رەش بەرەكی نەكەن ، بیردەكەنەوە ئەی باشە چی بكەین، یەكیان دەڵێ با گەمەی كەری سۆر بكەین، دەڵێن گەمەی كەری سۆر چیە؟ دەڵێت گەمەی كەری سۆر ئەوەیە ژنەكان نیومەتر لەیەك دوور یەك لەدوای یەك هەموویان سەریان لەلایك بێت و خۆیان كوڕ بكەنەوە ئێمەی پیاویش یەك یەكە لەلای سمتیان خۆمان فرێبدەینە لای سەریان هەموویان بریار دەدەن ئەوگەمەیە بكەن بۆماوەی چەند ڕۆژ لەكاتی پشوودان ئەوگەمەیە دەكەن دوواتر دەگەرێنەوە گوندەكەی خۆیان مەلای گوندی دەپرسێت خۆ رەش بەرەكی و نەكرد بەقسەی منتان كرد؟ دەڵێن: بەڵێ مامۆستا رەشبەرەكین نەكرد، گەمەی كەری سورن كرد! مەلا دەڵێت دەك داوەشێن گەمەی كەری سۆر زۆر خراپترە لەرەشبەرەكی ئەوجارەی رەشبەرەكی بكەن باشترە لە گەمەی كەری سور . مامۆستا شارەزای گەمەی كەری سۆر بووە دەی زانی ئەوكەسەی باز بەسەر پشتی ژنەكە یان كچكە هەڵبدات هەرامەومەرامەی بە سمت و بەپشتی ئەو ژنە یان ئەو كچە دەكەوێت لە رەشبەرەكیە زۆر خراپترە بۆیە فتوای رەشبەرەكی دەدات لەبەرانبەر گەمەی كەری سۆر.

*** *** ***

**ڕووداو :**

**لە یەکێك لەگوندەکانی خۆمان کەسێك برادەریکی ناوچەیکی تر داوەت دەکات جیسکێکی بۆ سەردەبڕێت، ئێوارە بەخۆشی دەی خۆن شەوهەموویان لەیەك ژور دەنون دوای جیگاراخستن و فانۆس کوژاندنەوە هەر زوو خاوەن ماڵ خۆی بەرە و خێزانی خۆی دەخزینی ،خێزانیشی بەچرپە دەڵێت پیاوەکە شەرمە ئەمە میوانن هەیەو هیشتان خەوی لێ نەکەوتوە! کابرادەڵێت: قونگەورە وەرەپێش میوانی سەگباب هێوارە هەندی گۆشت و برینج قوزل قورت کردووە، ئاگای لەچییە؟ میوان راست دەبیتەوە و دەڵێت وەڵلاهی ژنت لە خۆ پیاوترە هەی ناپیاو ما ئەمن گەوادی تۆمە بەو شەوە دەڕوات و ماڵی کابرا بەجێ دێلێت، ژنەکە دەڵێتەمێردی، توخواپیاوەکە ئەوە ئیش بوو کردت، پیاوەکە دەڵێت، کچێ:**

**سۆرەی دەسەر کردم،**
**میوانی لەبیر بردم،**
**حەیاشی لەکن بردم،**
**ئێکم نەکردبا دەمردم،**
**لۆ قەبرستانیان دەبردم.**

*** *** ***

**چیرۆك...**

**هەبوو نەبوو کابرایەك هەبوو بەناوی حەمەدی عەباسی دوو ژنی هەبوون ڕۆژێك کابرا بە خەیاڵی دادێت خێزانەکانی خۆی تاقی بکاتەوە، سواری کەرێ دەبێت دەچێتە چیای بە مەبەستی (چرۆ) هێنان، بە هەر شێوەیەك بیت مارمیلکەك دەگرێت و دەی کوژێت خوێنەکەی بەسەر شلواری خۆ دادەکات هەندێك لە شلواری خۆی بە داس دەبڕی دەچێتەوە ماڵەوە هەردوو خێزانی کە چاویان بەمێردی دەکەوی دەست دەکەن بە گریان و دەڵێن مێردە ئەوە چی ڕوی داوە کابرا دەڵێت چتان لێ بشارمەوە ئەورۆ لەوەختی چرو برین داسەکم لە هەرامی خۆدا و لێم کردەوە دوای چەند ڕۆژێك بۆرە بۆر دەکەوێتە ناو ئەو ماڵە یەکیان دەڵێت کراسم دڕایە ئەوی تریان دەڵێت چاوم کز بووینە پێویستیم بە دکتۆرە هەیە، بم بەیە شاری کابرا دەڵێت: ناوەڵا ڕاوەستن با بەخۆم بچمەشاری عیلاجەکی لەخۆ بکەم دواتر بەچاوان عیلاجەکی لە چاوانی تۆ دەکەم و کراسیش لۆت و دەکڕم کابرا دەڕوات و سەر دانێکی شار دەکات ونان و کەبابێك دەخوات، جاران وابوو**

## خۆشناو و دز و دزشاو

خەرکی گوندان چوبا شاری نان و کەبابێکی نەخواردبا وامەشووربوو نەچویتە شاری دەبووایە نان و کەبابی بخواردبا! دەگەڕێتەوە ژنەکان دەڵێن: مێردە چت کرد؟ کابرا دەڵێت وەڵڵا چابووم شەوێ کاری خۆی لەگەڵ هەردوو ژن دەکات، بەیانی بە ژنەکان دەڵێت: ئەت و دەبەمەشاری لۆچارەسەری چاوان و لۆ توش کراسی دینم ئەو ژنەی چاوی دێشان وتی پیاوەکە باوڕیکە ئەوەتی دوونێ چاوم باشترن، ئەوەی تریان دەڵێت: کوڕە مێردە گوێش مەدێ کراسم دڕایە دڕایە، یەك دوو پنیان لێدەدەم ! کابرادەست لۆ هەرامەکەی دەبات و دەڵێت:

هەی هەرامەی عەباسی

وەکی ناسکە ڕێواسی

سەرپانی کلك ماسی

دەرمانی چاو کراسی

*** *** ***

**چیرۆك ....**

شوانێك بزنەکانی دینیتە سەر ڕووباری تەماشا دەکات ژنێك لەوبەری ڕووباری لە سەر پشتێ نووستوە هەرامە و مەرامەی بەدەرەوە وەن شوانەکە نیازی خراپ دەبێت، چاو دەگێڕێ، کەس دیار نییە، دەپەڕێتەوە، تومەز ژنەکە بەئەنقەست خۆی وا پیشان داوە کە خەوی لێکەوتووە، کوڕە کاری خۆی دەکات و دەپەڕێتەوە ئەوبەر لە دیار ژنەکە دادەنیشێت، دوای ماوەیەك ژنەکە لە خەو هەڵدەستێ وخۆ لێك دەکێشیتەوە تەماشای دەوروبەری خۆی دەکات دواتر تەماشای کوڕە دەکات و دەڵێت:

هۆهۆ کوڕەی ئەوبەر،

ئەت و نەهاتیە ئەم بەر،

کوڕە دەڵێت:

نەبەپێغەمبەر،

ژنەکە دەڵێت:

هەرامەم قوپایە!

کوڕە دەڵێت:

دیارە مەڕ پێی لێنا یە.

ژنەکە دەڵێت: کوڕە.
مەڕ پێی لێنەنای
خوناو لێی دایە،
کوڕ دەڵێت:
ئەتولە ڕۆخ رووباری نووستوی
کەزو کوز لێی دایە،
ژنە دەڵێت:
نانا کزوکوز لێی نەدایە،
کوڕ گەلەك شەیتانن،
شەواویان لێنایە!

شەواو بەوئاوەدەوترێت جوتیاران بەهاوینان لە باغچەی دەنێن و لێی بڵاو دەکەن زەویەکە زۆر باش ئاوهەڵدەگرێت،

زۆرجار پیاوان بەبەلۆرەیان بەگۆرانی شەڕیان بەژنان فرۆشتوە، بەلۆرە بەخۆی واتە جوێندان بەیەکتر یان وەسفکردنی بەحەرام زادەیی لەنێوان کوڕ و کچ بەشێکی شەڕەجوێن بووە، لە نێوان هەردوو رەگەز کەسیش توڕەنەبووە، ژنانیش دەستەوەستان نەوەستاون وەك پیاوان وەڵامیان داونەتەوە، وەڵامدانەوەی ژنان یان کچان شەرم نەبووەو ئاسایی بووە، بۆ نموونە، پاوێك لەبەرانبەر ژنێك خۆی هەڵ دەکێشێت و دەڵێت:

مارمان لەبنەی هەریر بوو،
جەم جەمەم نان و شیر بوو،
ئەوەم قۆپەنێ ........ بوو !

ژنە دەستەوەستان ناوەستێ و مەردانە وەڵامی پیاوەکە دەداتەوە دەڵێت:

مارمان لەبنەی رواندز بوو،
جەم جەمەم گۆشت مامز بوو،
ئەوەم قۆپەنێ ....بوو ..

هەربۆی ژنی کورد خۆبەکەمتر نابینێ لەبەرانبەر پیاو.

*** *** ***

## خۆشناو و دز و دۆشاو

**چیرۆك....**

ژنو پیاوێك هەبوون نێوانیان زۆر خۆش بوو پیاوەکە ناوی لاوکە بوو، رۆژێك لە رۆژان ژنەکە جوکی مرد ژنەچووە ماڵەبابی و بۆ ماوەی دەرۆژ لە ماڵەبابی بوو، دواتر هاتەوە ماڵی خۆیان شەوێ دەروجیران هاتن و سەرەخۆشیان لێ کرد، کە میوان رۆیشتن منداڵ نووستن کابرا وردە وردە خۆی لەخێزانێ خۆی نزیك دەکردەوە و داوای ساوار خواردنی دەکرد، ژنەکە وتی پیاوەکە ناوی خوای بێنەو ئەمن تازە بابم مردیە واو وا، کابراگوێی بەوقسانە نەدا دەستی کرد بەساوار خواردن، ژنەکە لە دڵی خۆی وتی شەرتبێت پیاوەکە لێت دەریکەم تۆڵەی خۆم دەکەمەوە زوو درەنگ، ساڵ چو ساڵ هات ، کابرا باوکی مرد تازی رێکخراو سێ رۆژ پێچوون، ژنە خۆی خزاندە لای پیاوەکەی، کابراوتی خانم نیازت چییە، خانم وتی:

تۆرە بە تۆرە قازانجی زۆرە

کورە پێی ناوێ ئەوبۆرە بۆرە

هەستەوناوی خوای لێ بینە لاوکە

ئەوەش خیرە و لۆمردیان چاکە

دیارەهەمووشمان دەزانین ژیان لەبەر مردنی فلان وفلان راناوەستی ژیان درێژەی هەیە .خانم راست دەکات.

*** *** ***

**چیرۆك.....**

یەکێك لەکێشەگەورەکانی ئێمەی مرۆڤ درۆکردنە لەگەڵ خۆمان واتە لە دەروونەوە جۆرێکین لەرواڵەت جۆرێکی ترین، وەك هەین خۆمان پیشانی دەوروبەر نادەین، فیڵ لەخۆمان و دەوروبەر دەکەین. دوو خوشك مێردیان کردووە و ماڵی هەردووکیشیان لە یەك گوند دەبێت، رۆژکیان باوکیان دەمرێت تازی دادەنین جاران واباو بوو بۆ یەك مانگ نابووا جلك بشورین و خەنەش بەکاربێت، دوای بیست رۆژ یەکێك لەخوشکەکان خەنە لەسەرو دەستی خۆی دەنێت خوشکەکەی تر لۆمەی دەکات، دەڵێت خوشکێ کوت دەست گرتن خەنەی لەسەر ودەستان بنێی، ئەمە تازە باو مردیە خوشکەکەی تر وەڵامی بەو شێوەیە دەداتەوە دەڵێت:

ئەتو لەخۆت حەرام کردیە ناو لینگانێ؟

تا ئەمن لەخۆ حەرام کەم خەنەبەندانێ!

**چیرۆکیکی تر:**

ئەو چیرۆکە پەلاماری ئەو کەسانە دەدات کە زووخۆیان لەبیر دەکەن، دووێنیّ چۆن ژیاون یان کوڕ و کچی کێن و باب و داکیان چۆن ژیاون. هەبوو نەبوو دایك وکچیك هەبوون، هەژار و دەست کورت بوون، ڕۆژانە دەچونە کەنگران و بەشێکیان دەفرۆشت و بەشێکیان دەخوارد ژنەکە کچەکەی بەمێرد دا مێردی کچە وردە وردە دەوڵەمەند بوو، کچە خۆی لەبیر کرد کەکچی کەنگر فرۆشێك بووە، بەهارێکیان دایکی کچە سەردانی کچەکەی کرد و تورەکە کەنگرەکی بۆبرد دوای چاك و چۆنی دەڵێت: کیژم تورەکە کەنگرەکم لۆ هێناوی لەمێژە کەنگرت نەخواردینە، کچەکە دەڵێت: دایە

هۆ هۆ دالۆنە
داری کەنگر چەندلۆنە
دایك دەڵێت کیژێمن
ئەزانی داری کەنگر چەند لۆنە
کە خۆت هەڵ دەدایەسەرپیشکۆنە
دەت کردن ترێ هەندۆنە
داری کەنگرهەندە لۆنە

**چیرۆك:**

هەبوونەبوو کابرایەك هەبوو حاکم ئەمری کردبوو لەدادگا ئامادە بێت لەکاتی ڕۆیشتنی خێزانی دەڵێت پیاوەکە کەهاتیەوە کراسم بۆ بکڕە،لەبیر نەکەی. حاکم بڕیار دەدات لەسێدارەی بدەن،لەو کات و ساتە کابرا ئارەزووی هەڵدەستیّ کابرا پیّ دەکەنێت،حاکم دەڵێت کابرا بەچی پێدەکەنی؟ کابرا دەڵێت حاکم چۆن پێنەکەنم،

ئەقلی خێزانی من و
ئەقلی جەنابت و
ئەقلی هەرامەی من
وەك یەکن !

حاکم دەڵێت: چۆن باسی بکە کابرا دەڵێت کە جەنابت لەدوات ناردم من دەمزانی جەنابت حاکمێکی داد پەروەر نیت، لە سێدارەم دەدەی لەو کاتە خێزانم داوای کراسی لیّ دەکردم،جەنابت

**حیێ لێکۆڵینەوە، لە سێدارەم دەدەی،لە دوای ئەو هەواڵە ناخۆشەش (هەرامەم) هەستاوە و نەرمزوو دەکات، لەبەر ئەمە حاکم ئازادی دەکات و دەڕوات .**

**کورد لەمێژە دەڵێت نەوەکانم دووشت مەکەن خۆتان لەو دووشتە بپارێزن، وەك حیزی و دزی هەمیەتی مرۆڤ ناهێڵێت مرۆڤ سوك دەکات هەزار و یەك کێشەی بەدواوەیە،لەرووی کۆمەڵایەتییەوە لەرووی جەستەییەوە، لەروی دەروونییەوە.**

*** *** ***

**هەبوونەبوو کوڕ و دایکێك هەبوون، ڕۆژێك لە ڕۆژان کوڕەکە هێلکەیەکی دزی و بردیەوە ماڵەوە، داکی دڵخۆش بوو، پێکەوە خواردیان، کوڕە وردەوردە بووە دزێکی نەقۆرا، دوادزی کردنی دزینی گایەك بوو، لێی ئاشکرابوو، حاکم بڕیاری لە سێدارەدانی بۆدا وتیان کوڕە دووا داخوازیت بڵێ، وتی: دەمەوێ دایکم بێتەلام دایکیان بۆ هێنا وتی دایەلێم نزیك ببەوە وتی دایە دەمەوێ دووا ماچت کەم، ماچیش لەسەری زمانت بکەم؟ دایکیش زمانی بۆ دەرهێنا کوڕە بەددان پەلاماری زمانی دایکی دا و زمانی لێ کردەوە،حاکم پێی وت ئەو کارەت بۆ چ کرد ؟ وتی حاکمم خۆش بێت سەرەتای دزیم یەك هێلکەبوو، کە بردمەوە، دایکم لەگەڵی خواردم ئەگەر لەسەر هێلکەکە لێی دابام و ئامۆژگاری کردبام هێلکەشم بۆ خاوەنی بردباوە ئەوە ئەمڕۆ وابەرەزیلی خۆم نادی لەبەردەستی جەنابت حاکم ئازادی دەکات .**

**ئەو چیرۆکەپیمان دەڵێت ئامۆژگاری دایك و باوەك زۆر گرینگە بۆ مناڵ . کورد دەڵێت: (دز ڕۆژێك سینگ دەخوات، ڕۆژێك سینگ دەکوتێ) منیش دووقسە دەکەم پێم وایە پێویستە دایك و باوك چەند شتێك بکەن، بۆ ئەوەی مناڵەکانیان جوان پەروەردەبکەن پێویستە ژن و مێرد زۆر ڕێز لە یەك بنێن، لە بەرانبەر مناڵەکان کەسایەتی خۆیان بپارێزن، پارە لەمناڵەکانیان نەشێرنەوە، پارەلەلای مناڵەکانیان بکەنە شتێکی ئاسایی، لەسەر زەڕکردن لێیان نەدەن، لەلای خەڵکی زەمی مناڵەکانیان نەکەن خۆشەوستی و توندی پێکەوە بێت لاسەنگ نەبێت زۆربەناز پەروەردە نەکرێن زۆریش دڵشکاو نەکرێن .**

*** *** ***

**بابگەڕێینەوە سەر مەسەلەی پۆلیسان لەدوای دامەزراندنی حکوومەتی عیراق بەزۆر بەسەرکورد دا چەسپاندیان وردە وردە بەریتانیەکان زۆر هەوڵ دەدەن بەپۆلیس پیادەی حکومرانی بچەسپێنن، لە کوردستان و لەخۆشناوەتش وەك هەرناوچەیك، هاتنی پۆلیس وئیدارە دانیان**

دەكەوتە سەر ئاغە و كێخوا ئەوانیش دەیان خستە سەر جووتیاران بۆ چاوپۆشی لە هەندێك شت بەرتیل و پیدانی خواردنی فروجەو فروجاو ئەوكات باو بووە، فروج (بارەكە ) مریشكێك هێشتان هێلكەی نەكردبێ پێناچێت. ئاغاش دەوری هەبوو لە گرتن و نەگرتنی كەسێك پۆلیسان رەچاوی ئاغە و كێخوایان دەكرد دیارە بەریتانیەكا نیش ئیدارەی دەربەگەكانیان دەدا وردە وردە حكومەتی عێراق بنكەی پۆلیسی گەیاندە گوندە دوورەكان، لە هەر ناوچەیك لە گوندێك مەركەزی پۆلیسیان دامەزراند بەپێ ی ئەوكات گۆڕانێكی گەورەبوو بە هەرحاڵ حوكمڕانیی بەریتانیا و عێراقی ئەوكات زۆر باشتر بووە لە عوسمانییەكان. سەردەمێك لەخۆشناوەتی واتوند كرابوو لەلایەن پۆلیسان كەسێك كوژرابا تەرمی كەسی كوژراو دەبووایە بچیتە شاری كۆیە، بەپشتی ولاغ بۆ پشكنین بكوژ ژیانی نەدەما، دەبووایە خۆی رادەستی پۆلیس بكردبایە، سەیرە لە (٢٠١٣ ) بكوژ زۆرجار ناچێتە بەردەستی پۆلیس و شارەو شاریش دەكات كەسیش نالێت لەپشتی چاوت دوو برۆیە، لەناوچەی ئێمە عەلی قەمچی رەش بەناوبانگە، بووە خەڵكی تاوانبار لێی تۆقی بوون دەور دەوری علی قەمچی رەش بووە ئاغاش لێی ترساون وەلەلای من نەناسراوە و نەزاندراوە خەڵكی كوێ بووە و پلەی چی بووە، زۆر حەزی كردوە یاسا سەروەر بێت كەس سەرپێچی نەكات بەرانبەر یاسا ئەو سەردەمانە دیاردەیەكی تر هەبوو، ئەویش دەروێشایەتی بوو، دەروێشایەتی ئەوكات لە كوردستان باوبوو دوواتر دێنەوە سەر دەروێشایەتی لە گوندی شێخ وەسانان گۆڕستانێكی لێیە بەناوی (شێخ باوەدین) لە سەر گۆڕەكەی بەردێكی لێیە، بە شێوەی ڕۆژ دروست كراوە و بابە دینیش لە ئاینی زەر دەشتی زۆر بە كار هاتوە، وە نموونەیكی تر، ئێستاش ئێمەی كورد (الله) بە(الله) ناناسین، بەڵكوو دەڵێین : خوا یان خودا، یان خودان وەك زۆرلەگەلان وەك فارس وهیند و ئەفغان ...تاد وە بە (نەبی) دەڵێن پێغەمبەر، یان پیام بەرەوە من بە دەیان جار گوێم لە پیەژنان بووە، گەورەترین توكیان دەكرد ئەویش بەو شیوی بوو، خوایەئاگرو دەمارێدا نەمینێ،ئاگر پیرۆز و گەورە بووە،ئێواران ئەوشێوەی دەمایەوە كابانی ماڵێ یەك دوو پۆلی ئاگری لەناو مەنجەر دادەناو بەو نیازەی دەبووە پاریزەری(لەمەچێتر) لەخۆشناوەتی بە جنۆكە دەڵێن لەمەچێتر، بۆ ڕێگرتن لە خواردنیان، ئەكرێت بۆ مەبەستی تێك نەچوونیش واكرابێت بۆ ئەوەی لەمەچێتر دەستی بۆ نەبەن، وە من دەیان جار بەخۆم گوێم لە ژن و پیاوان بووە، سووندیان بە ئاگردان و تەندور خواردوە، وەك:بەو تەندورەی، بەو ئاگردانەی. ئاگر ڕێزی هەبووە و شایانی سوێند و باوەڕكردن بووە، لەلای خەڵكی ئێستاش لە ناوچەی ئێمە سوند بە ڕۆژ

ـحورێت وەك: بەورۆژەی ڕاست ئەکەم، یان بەوتریسکەی، واتە ترسکەڕۆژ لەکاتی هەڵهاتنی یان ـوبوونی وە ئامۆژگاریەك ئێستاش بەر گوێ دەکەوێت، لەلای بەساڵاچوان دەڵێن:

ئێواران زوو دەرکێ پێوەدەن، سبەینان زوو دەرگای بکەنەوە.

یان ئێوارەی شەڕان، سبەینەی خێران

یان شەڕی سبەینان باشترە لە خێری ئێواران

یان سبەینەی ساڵحان، دەرگای مرادان

واتە ڕۆژ زۆر پیرۆزتر بووە لە تاریکی، تاکو ئێستاش کاریگەری ئاینی زەردەشتی ماوە ـناوچەکەمان.

*** *** ***

دیارە خۆشناوەتی وەك هەرناوچەیەکی تری کوردستان بەقۆناغی ئاینی مەسیحیش ـێپەڕیشتوە، ئەکرێت بەهۆی حکومڕانی یۆنانیەکان، یان کاریگەری ئەرمەنییەکان، یان ئاشووریەکان بووبووێت،لەناوچەکمان دەیان شوێن ئێستاش ناوەکانیان ماوە کە ناوی مەسیحین وەك:(زەوی قەشەی، جۆگەی دێرێ لە بالیسانێ، هەرمك، مۆتە...) زۆر ناوی تریش، سەرباری ئەوشتانەی باسم کرد کێشەیەکی گەورە هەبووە بۆ گەشەنەکردنی خەڵکی کوردستان، ئەویش نەخۆشی بوو، وەك( سۆریکە، ملەخرە، مردنی ژنان بە منداڵ بوون و نە خۆشی سیل، کۆلێرە گەورەترین درندە بووە لە کوردستان و دونیاش،کە کورد پیان وتوە( تاعوون) لە لە (١٨٢٣ ) زۆر بەخراپ ئەو دڕندەیە رووی لە کوردستان و ناوچەکەی ئێمەش کردوە و بەملیۆنان خەڵکی کوشتووە گرانی و قات و قریشی لەگەڵ بووە لەناوچەکەمان لەبرسان کەر و پشیلە و خوراوە، وایان لێ هاتوە پەلاماری منالێن دراوە بیخۆن لەبرسان، من لە خار فەقێ ئەحمەد گوێم لێ بووە، ئەوەیش باوکی بۆی گێراوەتەوە، ژنێکی غەریبە لەبرسان لەشێخ وەسانان پەلاماری منالێك دەدات بیخوا لێ دەستێنەوە دوای ژنەکە بەردەبیتەوە و دەمرێت، چەندان بنەماڵەی گەورە کەسێکیان ماوە، نموونەی بنەماڵەی حەسەنەقیتی شێخ وەسانان و ماڵی حاجی ەشۆری شێخ وەسانان.

باسی ئەوەی دەکرێ جەرگ و هەناوی کەری تۆپیویان خواردوە، لەکوردستانی رۆژهەڵات خەڵکێکی زۆر روو لە خۆشناوەتی و شوێنەکانی تر دەکەن، ئێستاش لەزۆربەی گوندان قەبرە غەریبە ماون، نموونەی گوندی کانی بەرد، قۆڵی قەبرەکانیان چەند بستێك بووە خەڵکی لەبرسان

نەیان توانیوە قەبرەکان قولّ بکەن یەکێك لەکێشە گەورەکانی دانیشتوانی کوردستان نەبوونی خوێ بووە ئەگەر خویان هەبووایە دەیانتوانی بەگیاوگۆڵی کوردستان درێژە بە ژیان بدەن، زۆربەی خەڵکی بەهارێ مردوون بەخواردنی گیاو نەبوونی خوێ،گرانەتا و دەیان نەخۆشی تری جۆراو جۆر سەرباری ئێمەی گەلی کوردستان بۆ دەیان سەدە بووبووینە ئاردی نێوان دوو بەرداشی خوێنرێژی بێبەزەیی و درندە ئەوانیش تورك و فارس بوون، شەڕەکە بەئێمە دەکراو وڵاتی ئێمە وێران دەکرا باجەکەش بەر ئێمە دەکەوت کوردستان بۆماوەی چەندان سەدە شوێنی پێکدادانی ئەو دوو هێزە زەبەلاحەبووە، تا دوا شەڕی (چالد ێران)لەپارێزگای ( وان ) نزیك لە سنووری ئەرمەنستان.

*** *** ***

نمونەیکی نەخۆشی سۆرکە یان سۆریکە بینینەوە چ کارەساتێکی دروست کردووە، لە ساڵی (١٩٧٢ ) مانگی پێنج نەخۆشی( سۆریکە لە ناوچەکەمان بلاّو بووەوە وەك خۆشناو دەڵێن قران لۆ منداڵان هات واتە کۆتایی بەمنالێن هات، تەنها لەشێخ وەسانان ( ٤٥) منداڵ مردن لەتەمەنی چەند مانگی تاکو تەمەنی دەساڵی وای لێهات تازی و سەرەخۆشی نەما لەسەر قەبران، دوای ئەوەی منداڵەکەیان دەشاردەوە بەخاوەن مردوویان دەوت خودا حەوێزەت بداتەوە. خەڵکی براوەی دەکرد هەر کەسەو دەچوەسەرکارەکەی خۆی لەگوندەکانی دەورو بەریشمان زیاتر یان کەمتر بەهەمان شێوە بوو، ئێستاش ئەگەر سەیری گۆڕستانە کۆنەکان بکەن بەشی زۆری مردووەکان منالّ بووینەمن بەخۆم کۆخە رەشەم گرتوە، بەلاّیکی گەورەیە خەو خواردنت نامینێ، لەبابوو باپیرانمان ماڵێك نەبووە چەندان منداڵی لێ نەمرێت، بەونەخۆشیانەی باسم کردووە منیش دووبرام مردووە بەسۆرکە، بەنەمانی عوسمانیەکان خەڵکی دەست دەکەنەوە بە پەیداکردنەوەی مەڕوماڵێت و دانانەوەی رەزی ترێ وردەوردە خەڵکی کوردستان ئەبووژێنەوە ئەوکات خۆشناوەتی لە روی ئیداریەوە سەر بە کۆیە بووە" زۆربەی پێداویستیەکانیان لەو شارە دابین دەکرد وە، وشیاری خەڵکی کۆیە کاریگەری لەسەر خۆشناوەتی هەبووە.

*** *** ***

خۆشناوەتی قەرداری کۆییانن، تاکو ئێستاش زۆرجوان لەگەڵ خۆشناوان گونجاون، لەخۆشناوەتی هەر بەروبومێکیان هەبا وەك خوری قەزوان و مازی و توتن و مێوژو سماق و چەقەڵەوجەفت و دەیانبردە ئەو شارە ئەوانیش دەیان فرۆشتە شارەکانی تر. پێداوستیەکانیان لەوشارە دەکڕی، وەك: کورتانی جۆراو جۆر بۆکەر و ئێستر و بارگیر مەبەستم جۆراو جۆر

نەگەورەی و بچووکیە قایشی پار و سەرپار و کۆپەران و بن مل و نار و بزمار و رێشمەو شوژن و داس و داسوکە و قەیناغ و بیور و کارتیخ و درێشە و گاز و سمتراش و کەرپەتێن. بۆدەرهێنانی دولنی مرۆڤ حەوجۆش و مەنجەری سفری کێشت لێنان و مەنجەری ساواری و دەسمەنجەر و لەگەن و تەشت و سیکوسکەو ئاون و خم و خام و لەجۆری ئەمبێز بەناو بانگ بووە. پیلاوی جۆراو جۆر. نەکاتێك تای سەیارەیان کردۆتە ژێر پێلاو کە بەر گوێزنگیان کەوتوە زۆر ئازارە هەبووە، برینداری کردوە کە شەکر و چاش پەیدا بووە کرپویان پێیان وتوە شەکری سۆر رەنگی خۆلەمێشی بووە، خشلی بووکان وەك کل و کلدان و نەینۆك واتە ئاوێنە و تاس و خەزێم و دووگمەو دۆراب و بمشکیان زێر بووە و بەشکیان زیو بووە خەنەو دەرزیلەی پێچەی ژنان و قولابە و گوستیلە و چەرخ و بەردەچەرخ و دوای پیدابوونی نەوت دیارە بەگوێرەی داهاتی ئەو کەسە کراوە، ئەگەر دەوڵەمەند بایە زێر بووە هەژار بووایە زیویان دەکڕی، وەقوماشیش بۆ ژنانی هەر لەکۆیە کراوەوە. دیارە خزمانی کۆیەش بەشێك خۆیان داهێنەر بووینە و بەشێك تاجیرەکان لەموسلێ و لەویش لە حلەبێ هاتووون، واتە دەست بەدەست تیجارەت کراوە.

شاری کۆیە شارێکە هیچ کاتێك بێ پیاوی سەردەم نەبووە، واتە بە درێژای دروست بوونی شاری کۆیە پیاوی خۆی هەبووینە و دەبن دیارە شاری کۆیە زۆر کۆنە، بەناوبانگ ترینیان (حەماغەی کۆیەبووە) لەسەردەمی خۆی هاوکاری خەڵکی برسی کردوە بۆ ئەوەی لە برسان نەمرن بە هەزاران کەسی نەجات داوەدەیان شاعیر و نووسەرو تێکۆشەری هەبووە کە دەوری پێشڕەویان دیوە لەخەباتی رەوای گەلەکەمان لە ئەدەبیاتی گەلەکەمان وەك:(حاجی قادرو دڵدار و دڵزار و مەلای گەورەی گەوران و بەئەسل مام خۆشناو، زۆری تر کەناسراون )

ئینجا بابێینەوە سەر باسی رەحمان شێخ وەسانی، گوتمان لە گوندی شێە گیا، کاتێك ئەوانەی هاتوون بۆ گرتنی دەست دەکەن بە ناخواردن، رەحمان کەلەمچە لەدەستی خۆی دەکاتەوە و لە سەر هەر سێ قات خۆی فرێدەداتە خوارەوە، دیارە چەندان پەراسوی دەشکێ و تەقرێکی زۆریشی بە پشتی دەکەوێ، لەوێ خۆی دەکاتەوە بەو هەموو برینە خۆی دەگەیێنێتەوە چیای شێخ وەسانان، ناوێرێت بچیتەوە ناو گوندی لەچیای شێخ وەسانان ( زنج) زۆرە (بەدار و کەدە مێو دروست دەکرێت، وەکو خێمە وایە رەزەوانان دروستی دەکەن بەمەبەستی خۆپاراستن لەباران)، دواتر شوانێك دەبینێت بانگی دەکات مام شوان ناوی مام خەلیفەی سۆفی برایم بووە بەدەنگییەوە

دەچێت کە دەبینی رەحمان وەزعی خراپە رەحمان بەسەرهاتەکەی بۆ باس دەکات، مام شوان جیسکێك سەردەبڕێ و پیستەکەی بەگەرمی لەپشتی رەحمان شێخ وەسانی دەنێت.... مام شوان خوێشی پێ بووە، جەرگی جیسکی بۆ دەبرژێنیت وتێری دەکات... مام شوان ئاگاداری باب و دایکی دەکەنەوە باب و دایکی دەچنە لای سەردانی دەکەن، لەچیا خزمەت دەکرێت تاکو چاك دەبێتەوە.

حاجی رەحمان شەوێك دەچێتەماڵی مام (حاجی عەمر لە گوندی شیێ) دوای سەلام دەڵێت:( عەمەر) من خراپەی تۆم هەبووە؟ بۆچی وات لەگەڵ کردم؟ مام عەمەر دەڵێت هەڵەیەکی گەورەم کردووە بەس مەم کوژە، چی دەتەوێت لەخزمەت دام! رەحمان شێخ وەسانی دەڵێت نات کوژم بەڵام تاکوو من لە ژیاندامابم، هەر رۆژی وتم شتێکم دەوێ، دەبێت جەنابت بلێی لە خزمەتت دام بەو مەرجە رازی یان بتکوژم؟ مام عەمەر دەڵێت رازیم. چەندان ساڵ رەحمان شێخ وەسانی ئیدارەی خۆی و منداڵەکانی پەیدا دەکات. ئەوەیە ئەگەر خودا رزقی نارد بەکار و کاسبی نییە.دیارە مام عەمەر غەدرێکی گەورەی لە رەحمان شێخ وەسانی کردووە.

مام رەحمان شێخ وەسانی جارێکی تر لەسەر رێگایەك دادەنیشێ بۆ رێگری، لە کوردەواری قسەیەك هەیە دەڵێت: رۆژێك دێت توشی( گون رەشی) خۆت دێیت، رەحمان شێخ وەسانی توشی هەمان رووداو بووە، واتە توشی گونرەشی خۆی بووە، ئەو چیرۆکە بەم شیوەی خوارەوەبووە: کەسیك هەبووە زۆر شەڕاوی و عەجوول بووە، غەدری لە زۆر خەڵك کردووە، زۆریش ئازابووە، کەس پێی نەوێراوە، باوکی ئەو کەسە نارازی بووە لە هەڵسوکەوتی کوڕکەی، زۆر ئامۆژگاری کردووە بەگوێی باوکی نەکردووە، باوکی لێی بێزار بووە پێی وتوە کوڕم، رۆژێك دێت توشی گونرەشی خۆت دێی. رۆژگار دێودەروات رۆژێك توشی عەرەبێك دەبێت دەیەوێ روتی بکات، کابرای عەرەب بەنەرمی و پارانەوە خۆی لێ نزیك دەکاتەوە و پەلاماری دەدات لەبنەخۆی دەدا و دەکەوێتە لێدانی، لەپڕ چاوی بە گونی کابرای عەرەب دەکەوێت، گونی رەش دەکرێن، بە کابرای عەرەب دەڵێت: بەس مەمکوژە، شەرت بێ تۆبە لەڕێ گری ئەتو ئەو گون رەشەی کە باوکم باسی دەکرد، کابرای عەرەب ئازادی دەکات بەو مەرجەی واز لە رێگری بێنێ، هەر لەسەر ئەم کارە رەحمان شێخ وەسانی کەدانیشتووە لەسەر رێگایەك بەونیازەی کەسێك ببینێ و روتی بکات، تەماشا دەکات پیرەمێردێك سواری کەرێ بووە و برنۆیێکی لەپێش خۆداناوە و وردە وردە بەرە و لای مام رەحمان دێت، رەحمان دەڵێت: خودا رزقی نارد، پیرە مێرد لەمام رەحمان نزیك دەبێتەوە، مام رەحمان

بەکەمی لەپیرەمێرد دەگات لە دڵی خۆی دەڵێت: بەس پێی بڵێم چەك بە چەك دەبێ، رەحمان دەڵێت کابرا چەك بە(ئەگەر نا کوژرای) پیرەمێرد دەڵێت: وەی بە سەرچاو، چەك بۆ تۆ باشە، لەپڕ خۆفرەدان و سوارکردن و تەقکردنی لە رەحمان شێخ وەسانی یەك دەبێت، دەبێتە شەڕەتەقە لەنێوانیان پیرەمێردەکە دەست پێ دەکات. پیرەمێرد زۆرئازا و لێزان دەبێت رەحمان ناوێرێت سەری خۆی دەربێنێت لەبەر پیرەمێرد، شەڕەکەدرێژە دەکێشێت رەحمان گولەیەك لەقاچی پیرەمێرد دەدا و پیرەمێرد تاکو برینەکەی دەبەستێتەوە رەحمان ڕادەکات، ناوچەکە بەجێ دێڵێت دەڕوا. لەدووری ئەو شوێنە هۆبە رەشمارێکی دەکەوێتە بەرچاوی بۆ نانخواردن لادەدات دوای ماوەیەك نانی بۆ دینن، خەریکی نانخواردن دەبێت، پیرەمێرد لەبەر دەرکی رەشماڕێ پەیدا دەبێت، دەڵێتە منداڵەکانی وەرن بهێنەخوارێ لە کەرێ ئەوانیش دەچن دەڵێن چی بووە؟ نەخۆشی دەڵێت: نەوەڵڵا منداڵێك لەولای ئێرە هاتەسەر ڕێم گۆتی: چەك بە! گولەیەکیشی لێدام، تا کو برینەکەم بەستەوە ترسنۆکە هەرات، نەشمزانی کێوەچوو! ئەگەرنا بابم واو والێ دەکرد. مام رەحمان گوێی لەو قسانەیە،لەماڵی ئەوانیشە پیرەمێرد دێتە ژوورێ و رەحمان لەبەری هەڵدەستێ و چیرۆکەکە بۆ رەحمان دەگێڕێتەوە، رەحمان دەڵێت: پیاوێکی کم و ترسنۆك بووە! رەحمان خواخوایەتی چیرۆکەکە تەواو بێ بۆ ئەوەی زوو بڕوا دواتر رەحمان دەڕوا.

رەحمان شێخ وەسانی زۆرئازا بوو، ئەوپیاوە لەسەرەتای شۆڕش بووە، بە بەرپرس و وازی لەکاری ڕێگری هێنا و تۆبەی کرد، گۆڕانێکی گەورەی بەسەرداهات، لەدز و جەردەیی بووە پیاوێکی نیشتمانپەروەر و چاکەخواز، لەخزمەتی گوندەکەی و ناوچەکەی دابوو بووە سەرکەوتووترین بەرپرسی شۆڕشی ئەیلوول تاکو هەرەس هێنانی شۆڕش وەیەکێك بووە لەلای سەرۆك بارزانی خۆشەویست بووە، پلە بەپلە بووە سەرلق کەپلەیەکی باشی ئەوکاتی سەربازی بوو.

باسی بڵاو بوونەوەی چەکم کرد، کە بە شکانی لەشکری عوسمانیان و هەڵوەشانەوەیان ناوچەکە پڕ بوو لەچەك و تەقەمەنی. دیارە پێش هەڵوەشانەوە ناوچەکەمان بە ڕێژەیەکی یەکجار زۆر، بزنەکێوی و کەم بووینە و تاك تاکەش پرینگ مابوون، وردە وردە بە هۆی ئەو چەکو تەقەمەنییە لەناوچوون وهەموویان کوشتن.

زۆجار شەڕ و کوشتن روی داوە لەنێوان پۆلیس و ئەشقیاکان، یەکێك لەپۆلیسە بەناو بانگەکان ناوی عەلی ناسراو بە عەلی قەمچی رەش بووە، چەتەکان لە عەلی دەترسان عەلی دەیویست بە هەر نرخێك بێت یاسا لە کوردستان بەرقەرار بکات، پۆلیسەکان بە سواری وڵاغ بە

**گوندەکان دەگەران کارەکانیان گرتنی ئەوکەسانەبوو، کە ناوی سەربازییان دەهات و نەدەچوونە سەربازی، یان ئەو کەسانەی تاوانیان دەکرد، یان بەدواداچوون دەکرا لەکوشتنی کەسێك... ئەو کات کوشتن یەکجار زۆر بووە، بە تایبەتی کوشتنی ژنان لەسەر نامووس و خۆشەویستیی، ئەوەی من زانیومە، لە پیاوە بەساڵاچووەکان لە ساڵەکانی بیست بەخوارەوە کوشتنی کچ و ژن لەکوردستان دەستی پێ کردووە، لە کۆن لەجیاتی کوشتن نەریتێکی تر هەبووە سەری ژنە و پیاوەکەیان دەتراشی و ماستیان بەسەری دادەکردن و بەناو گوندیان دەگێران و دواتر لێکیان مارە دەکردن. ئەوە جەزای ئەوکەسانە بووە کە کارێکی خراپیان کردبا، من زۆرم گوێ لەو بەوسەرهاتانە بووە، دوای هاتنی بەریتانیا کوشتنی ژنان دەستی پێ کردوە وەبەتایبەتی لەدوای نۆسەتەکان، کوشتن بووە بەنەریت، ئێستاش ئەونەریتە بەردەوامە، لەساڵەکانی زوو کورد ئەوەندە توند نەبووە، لەگەڵ خوشکان دوواتر بەرە بەرە توند بوو، خۆشەویستی تاوان بوو، بە هەزاران کچی ناسك و نازدارمان لە سەر خۆشەویستی کوژران. بەهەزاران بەزەبری خەنجەر مارە دەکران، بە هەزران کیژۆڵەی ناسکۆکە لەسەر پشتی لانکێ مارە دەکران. بەدەیان سوڵح بەو پەپولانە دەکرا، بە هەزاران ئاشق لەخوێنیان گەوزاندن، بە هەزاران ئاشق ئیشقیان بردە ژێرگڵ. بەداخەوە ئەو خەڵکەش نوێژی دەکرد و ڕۆژیشیان دەگرت! هەمووشمان دەزانین لەوەتەی مرۆڤایەتی هەیە خۆشەویستی پێوستیەکی زەروریە و هەبووە و هەیە و دەشبێت.**

**چەند نموونە دێنمەوە ئەو کات کچ چەند ترساوە لە دەوروبەری خۆی چۆن خەمەکانی بە حەیران دەربڕیوە بۆ زانین، ئەوحیانانە پێیان دەڵێن:(حیانۆك)جیایە، لەگەڵ حیان، کچ دەڵێ:**

**حەیران لەبەردی بەرەشماری**
**ماین شەمووسە ڕاناگری باری**
**لەترسێ بەتکاران نەبی**
**کوڕە لاو خۆم دێمە بەرباری**
**کچە ئاشقێکی تر دەڵێ:**
**حەیران سێبەرێ دنیایێ لەمن حەرام بن لەپاش سێبەرێ بیێ**
**مەیتێ حەوت براو ئامۆزایانم بارێنە کانیێ**
**بەرکی کوڕەتیم بێتە مارەبابێ من بە هەنجەتێ تازیێ**

سەیرکە ئەو کوڕەی ئەو کچەی خۆش ویستوە، نەوێراوە بەهیچ شێوەیەك نزیکی ماڵی بابی ئەو کچە بێت کچەکە لە ئازاری ئەشقی پێی باشە حەوت براو ئامۆزای بمرن بۆ ئەوەی کوڕەلاوی خۆی ببینێ بە هەنجەتێ تازیی، یان کوڕێك لە هەڵبەستێك دەڵێت:

بەقوربانت بم گەزە
سینگت بێستان و ڕەزە
حەزم لێ کردی لە چاوی
لەسێبەندەی کراوی
نەوێرم بێنم ناوی
لەبەر گەوادە باوی
تەنانەت کوڕ ناوێرێت ناویشی بێنێت!
حەیران دەرێم وەنیەو وەمەکە
قورئانەکی بینە بەر دەرکێ مارە بابێ من وەکە
هەرچی بووختانان بەمن و تویکا
یارەبی خوایە چاوانی کۆرەکە

حەیران کاکی بەکاکی
پێشولە وردن کاول بێ خاکی
دوعا لۆ وی بن سەلام لۆ داکی

حەیران لە کانیلێ مێردان
وەزگم هەرێنن چەقولەو کێردان
ئەتو مەینە چ ژنان
ئەمنیش ناکەم چ مێردان

*** *** ***

**خۆشناو و خۆشناوەتی بەدرێژایی هەبوونیان لەگەڵ دەروجیرانان باش بووینە، بە دەگمەن شەڕە عەشیرەت رووی نەداوە وەچەندان عەشیرەتمان لەدەورو بەر هەیە، وەك خزمانی ئاکۆ و خزمانی سوورچی و برباس و هەندێك لەخزمانی بۆری ئەگەر شەڕیش روویدا بێت شەڕەکان رێژەیی بووینە، دواتر سولّح کراوە، دابڕانی بە یەك جاری نەبووە ...**

**با بەسەرهاتێکی بۆریانیش باس بکەین، دیارە خزمانی بۆریش وەك هەرتیرەیەك پیاوی رۆژگاری خۆیان هەبووینە، زۆریش بووینە، نموونەی شەهید شینەی بۆری و حاجی ئەحمەد و سەعیدئاغای بۆری و زۆری تر... حاجی ئەحمەد پیاوێکی خانەدان و دەوڵەمەند و بەخشندە بووە، مامۆستای چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتییەکان بووە. لەساڵی (١٩٧٧) بووەپێشمەرگە و لەرووی ماددی ومەعنەوی کاریگەری هەبووە، لەرۆژە سەختەکانی ئەوسەردەم و لەساڵی ١٩٨٧ لە گوندی کۆدرە سەرباز و رەوەجاشێك پەلاماری ئەوماڵباتە دەدەن، شەڕێکی دەستەویەخە گەورە دروست دەبێت، شەهید ڕەسوول کە کوڕی مام حاجی بوو، شەهیدی دەکەن و ئەوانی تر نەجاتیان بووە، هەر لەو هەڵەتە شوانێکی گوندی نێوەش شەهید دەکەن، کوڕی حاجی حەمە یان حەمەد ناوم نەزانیوە، مام جەلال حاجی ئەحمەد سەعیدی زۆرخۆشویستووە و رێزی تایبەتی هەبووە. لەساڵی( ١٩٧٩) توشی نەخۆشی سەرەتان دەبێت، مام جەلال پێی باشە تەسلیم بیتەوە، بەرژێم بەمەبەستی چارەسەری، دواتر شەهید بوو. ئێستاش کوڕێکی مەرد و پیاوی هەیە بەناوی عومەربۆری. بابێینەوە سەرمەسەلەی بۆریان، لە دوای کیمیابارانکردنی شێخ وەسانان و بالیسان کەدواتر دەی خوێننەوە ئەوکات دەزانن چ کارەساتێك بووە، خزمانی بۆری و خۆشناو لە سەروچاوە بە شەڕ هاتبوون، هەردوولاشیان جاش بوون، رۆژانە شەڕەتەقە بوو کوشتیاریش هەبوو، نازانم شەڕەکەیان لەسەرچی بوو، دیارە ماڵی ئەنوەربەگ رۆژانە بالیسان و دەوروبەریان تۆپباران دەکرد.**

**بۆ مێژوو لە ساڵی(١٩٨٢) ماڵی ئەنوەربەگ دووژمنایەتییەکی لەسنوور بەدەری لەگەڵ هێزی پێشمەرگە و سنوورەکەیان دروست کرد لە کاتی رووداوی شەڕی بۆری و خۆشناوان رۆژانە دەیان گوللەتۆپ بەر ناوچەکەمان دەکەوتن، لەوکاتە نامەیەکی ماڵی ئەنوەربەگ بە دەستی من گەیشت، دیارە نامە بۆ هەموو گوندەکانی ناوچەکە چووبوو، ناوەرۆکی نامەکە بەو شێوەی خوارەوەبوو:**

**"بۆ خزمانی گوندی شێخ وەسانان، دوای دوعا و سەلام، ئێمە وەك عەشیرەتی خۆشناوان خەریکی سولّحی خزمانی بۆرین، داواکارین هاوکاریمان بکەن" کە نامەکەم خوێندەوە،پارچە**

پەرچەم کرد و کۆمەڵێك جوێنیشم بە هەردوولا دا، دیارە هۆیەکەی ئەوەبوو تێمە بەدەیان کەسن شەهید و زیندەبەچارکران، بەمنداڵ و ژن و پیرو پەککەوتە و، ئێوەی هەردوو لا جاشی ئەو پیاوە خوێنرێژە بوون ڕۆژانەش دەیان تۆپ داروبەردی ناوچەکەی دەسوتاند، ئایادەکرێت من خەمی جلشانم بێت، بۆ ئەوەی یەکتر نەکوژن، هاوکاری بنێرم، شەڕی گەورە کە ڕووی دابێت یەك جاربووە، ئەوەشیان تاوانەکە تاوانی مام خۆشناوان نەبووە، بەڵکوو خزمانی هەرکی تاوانبار بوونە هاتووچۆی خزمانی هەرکی بەشێکیان بەناو خۆشناوان هاتووچۆی کوێستانیان کردووە. تەسەردەمێك پێ دەچێت ئەگەر هەڵەنەبم لە کۆتایی نۆسەتەکان بووە کەهاتوچۆ دەکەن تاژەڵەکانیان بەناو دەغرودان دەبەن، پێیان دەڵێن: کاکە بۆ وا دەکەن لە وەڵامدا دەڵێن: دەغری خۆ، لەسەر ڕێیا پەزیمە لابەن. وردە وردە وەزعەکە گەورە دەبێت و شەڕ دروست دەبێت لەگوندی مەلەکان کەسێك دەکوژن و بەشێکی گوندی مەلەکان تاران دەکەن، خدر بەگی بالیسان داوا لە عمر سیّ تیەی خۆشناوان دەکات هاوکاری بکرێن، خەڵك کۆدەبێتەوە و شەڕەکە لە سۆرەپەلو زینەتیر دەست پێ دەکات، بەشێك لە چیای سەفینیش دەگرێتەوە، تاکوو زرگە و گوێژان ژمارەیکی زۆر لەهەردوو لا دەکوژرێن. دواتر هەرکیەکان وازیان لەسنووری خۆشناوەتی هێنا، کەسێك لەخزمانی هەرکی ناوی قەتۆ بووە لەسەر چیایی سەفین لەکاتی شەڕەتفەنگ دەچێتە سەر بەردێك و دەڵێت:

هۆی قەتۆ قەتۆمە

ساحێیێ تفەنگێ خۆمە

کەس بە مرۆ نزانم

ئەز میری خۆشناوانم

کەسێك تفەنگێکی بۆ داوێ و بەر سەری دەکەوێت و دەکوژرێت، قەتۆ پیاوێکی زۆر ئازابووە، لەو ساڵانەی دوایی شەڕێکی خوێناوی لەلایەن خزمانی هەرکی لەگەڵ خزمانی خەیلانی ئەگەر هەڵەنەبم، پێم وایە لەساڵی حەفتا و دوو بوو، لەناو کوژراوان کەسێك کوژرا بەناوی حەسەن خەتیبی، پیاوێکی بەرێز و میوان دۆست بوو، لەدەشتی هەریر و دەوروبەری بەپیاو ناسرا بوو، ئەگەر خزمانی سوورچی هاوکاری خزمانی تیەی خەیلانیان نەکردبا، هەرکیان بیزە لەتیان دەکردن، دواتر شەڕەکە کۆتایی هات، شێوەی کۆتایی شەڕەکە نازانم، ڕێزم هەیە بۆعەشیرەتی هەرکی...

جارێکیان فێر لەخوشناوان دەکەن، لەگوندی مەلەکان چەند ماڵە هەر کییێك ویستویانە بەرەو گەرمێن بێنەوە، لەگەڵ خۆشیان ترێی خوشناوان بدزن، زۆر بیر دەکەنەوە چۆن بیدزن؟ یەکیان دەڵێت: دێتمەوە برۆنە ناو گوندی مەلەکان بلێنە خزمانی گوندی پیرەمێردێکن، مردیە ناوی رەشۆیە، دارە مەیتن وێ دەن، مەیتەکە پێ ببەینەوە گەرمێنێ، دەچنە مەلەکان و دارەمەیت دێنن، بەشەو دەچنەناو رەزان پری دەکەن لەترێ و پوشی لەسەردادەنێن و دواتر جاجمیکی گەورەی بەسەردادەدەن و بەیانی دەکەونە رێ دەگەنە هەرگوندێك تا لەو گوندە تێ دەپەڕن بەترێ هەردەڵێن:

هۆ برا برا هۆ رەشۆ برا

هۆ برا برا شیرنۆ برا

هۆ برا برا چاو رەشۆ برا

هۆ برابراپاییزت دی برا

هۆ برابرا زستانت نەدی برا

هۆ برا برا لە کوێستانێ مردی برا

هۆ برابرا ئەتبەینەوە گەرمێنێ برا.

بۆ ئەوەی خەڵك وابزان برایان ناوی رەشۆیە، رەشۆش پیاوێکی شیرن بووە، بەڵام ئەوان بە ترێیان وتوە رەشۆ، کەترێ رەشەو شیرینە و پاییزییەو زستان ترێنامینێ بەڵێ بەوفێرە ترێیکی زۆریان دزیوە و کەسیش نەی زانیوە، دوای چەند ساڵێك زاندراوە، کە خزمانی هەرکی فێریان لێکردووین.

*** *** ***

خۆشناوەتی بەتایبەتی پیوەندی لەگەڵ خزمانی سوورچی زۆر خۆش بووە و تاکو ئێستاش کیشەمان لەنێوان نیە و ئەگەر هەشبوویێ کێشەکان بچووك بووینە و شەڕی دوو عەشیەت نەبووە بەڵکوو چەند گوندێك بووە وەك باشوورەو دەوروبەری، ئەوانی تریش هەروا لەگەڵ سورچیانیش یەك جار ئێمە پەیمانشکێن بووینە ئەویش لەپێشوازی بەریتانیەکان قوتە فێرەکن لەگەڵ خزمانی سوورچی کردووە نەهاوکارین کردن شەڕیشمان لەسەر نەکردن، شەڕیشمان نەکردوون. دیارە خزمانی هەروتی خاوەنی پەیمانی خۆیان بوون، لە هاوکاریکردنی خزمانی سوورچی دەوری بەرچاویشیان هەبوو لەگوندی باتاسێی لە کوشتنی بەریتانیەکان،خزمانی باویان

ـ خرواتان به وەرەسە لە شێخ وەسانی و سکتانیان و و خۆرانیان نزیکن، کەم بەمردنی خۆیان ئەمرن.

لە خۆشناوەتی لەسەر دەستی شێخەکانی دەورو بەرمان لەساڵەکانی سییەکان بۆ ساڵەکانی پەنجاکان، خۆشناوەتی و هەموو گوند ببوونە چەندان بەش لە نێوان ئەو بنەماڵە بەرێزانەی دواتر ناویان دێنم بەناوی قادری و نەقشبەندی بەتبەختی کورد لەوەیە ئەوەندەی شێخەکانی قادری و نەقشبەندی دەرویش و لایەنگریان هەبوون سنووریان بەرفراوان بوو . شێخ مەحموودی نەمر نەئەو هێزەی هەبووە و نەسنووریشی ئەوەندە لەبەر دەست دابوو، نە ئەوەندە لایەنگری هەبووە، خەڵکێکی زۆر لەلای ئێمە سەریە بیارەوەبوون، بەڵام نەزاندراوە کەسێك لەلای ئێمە سەر بە شێخ مەحموودی نەمر ببێت، لەوبارەیەوە زۆرم پرسیارکردووە لە ساڵانی زوو لەسەر شێخ مەحموودی نەمر، بەساڵاچووەکان لەناوچەکەمان یەك شتیان باس دەکرد، ئەویشیان دەمزانی درۆیەکی گەورەیە بەشێخ دەکەن، گوایە کە ئینگلیزەکان تۆپیان تەقاندووە، ڕووبەڕوووی شێخ، شێخ بەدەست تۆپەکەی گردیتەوەو لەناوبەریتانیەکان تەقاندوویتەوە! لەخۆشناوەتی تەنها بەوقسەیە لایەنگری شێخ بووینە، گومانم نییە دەورووبەریشمان لە ئێمە بێ خەبەرتر بووینە. گەلان لەو ڕۆژگارە خەریکی دەوڵەت دروستکردن و خۆڕێك خستن بووینە، باب و باپیرانی ئێمەش خەریکی دەروێشایەتی بووینە، خۆ لەو ساڵانەی دوایش خەریك بوو دەرویشایەتی سەرهەڵبداتەوە و ئەوجارەیان بەناوی تر بەناوی ئیسلام بەدەستی دووژمنان، ویستیان ئەوجارەش ڕێگرین لە دروستکردنی دەوڵەتی کوردی، من وەك نازیەکان بیر ناکەمەوە، بەڵام دەورووبەرمان واتە نازیانە بیر دەکەنەوە، بۆ توانەوەی ئێمە بەناوی جیاجیا من پێم وایە نەمارکسیەکان نەئیسلامیەکان، لەخەڵکی کورد تێ ناگەن ناشیانەوێ تێبگەن! بۆیەش دوای هەڵچوونێك گەلی کورد پشتیان تێ دەکات لە ڕابردووی ئێمە کەسمان چەوسانەوەی ئایینیمان لەسەر نەبووە، ئەوەندەی چەوسانەوەی نەتەوەیمان لەسەر بووە، هەردوو فیکرەش نەیان توانیوە کوردایەتی و مارکسیەت و یان ئایین تێك هەڵکێشکەن، وەك عەرەب و یان وەك فارس و مەزهەب، کە بۆ مێژووی یەکێتی نیشتمانی کوردستان باجێکی زۆری دا و بەهەزاران پێشمەرگەن شەهید و بریندار پەککەوتە بوو، تاکو ئەوپیلانە دووبارە نەبێتەوە و دەوڵەتی کوردی لەبار نەبەن.

خۆشبەختانە گرووپە ئیسلامییەکان بەخۆیان دا چوینەوەو وایان دەزانی لە دەوڵەتی کوردی نوێژو ڕۆژی بەرناکەوێت، قوریان دەوڵەتی کوردی بنیات بنێ و خوداپەرستی خۆشت بکە و ڕەخنە

و گلە و گازاندەی خۆشت بکە، ئەگەر تواناتان هەیە دەنگی خەڵکی کوردستان بێنە حوکمڕانیی هەمووشمان بکەن لەخزمەت داین، بەئاشتی و بە برایەتی ئیسلامیش لەسەرسەر و لە سەرچاوان. دەی بادەوری بەرچاوتان هەبێت لەبنیاتنانی دەوڵەتی کوردی، ئەوەی پێی ناخۆش بێت، ماڵی وێران بێت، بەڵام بەو شێوەیە، چونکە بێگانە هەربێگانەیە، لەبن هەرپەردەیەك بێت، جەنابی شێخ ناوەناوە سەری لە دەروێشەکانی دەدا و لەهەوڵی ئەوەی زۆرترین خەڵك بکاتە دەروێش، بۆ ئەوەی باشتر و ئاسانتر تێی بگەین، ململانەیەکی زۆر توند لەنێوان دەروێش و شێخان هەبووە، وەك ئەمڕۆی نێوان پارتی و یەکێتی و ئەوانی تر..بۆ نموونە لە گوندی شێخ وەسانان دوو برای ( رەسوولی عەلیمێ و عەزیزی عەلیمێ ) ڕۆژێکیان لەپێش مزگەوتێ خەڵکێکی زۆر دانیشتون دەبێتە کێشە لە نێوانیان لەسەر کەرامەتی شێخیان، قادری و نەقشبەندی هەرکەسەو دەڵێ شێخی من کەرامەتی لە شێخی تۆ زۆرترە، پەلاماری یەك تری دەدەن بەخەنجەران خێرومەند دەکەونە نێوانیان ئەگەرنا برای دایك وبابی یەکتریان پارچەپارچە دەکرد بەخەنجەران، لەسەر شێخەکانیان وەکو ئەمڕۆی هەوادارانی پارتی و یەکێتی و ئەوانی تر، سیاسەتمەداریان لێ بووینە شێخی جاران کە جیاوازی لەنێوان ئەو دوو سیستەمە ئاسمان و ڕێسمانە.

خوایە بەتەمای تۆ، بەزەیت بەو میللەتە هەژار و نەزانەدا بێتەوە، چیتر برای دایك وبابی خۆی نەکوژێت لە سەر کەرامەتی جەنابی شێخە و دەروێشایەتی، بە وەرەسە بۆمان مایتەوە تاکو ئەمڕۆش، بە هاتنی جەنابی شێخ کاروکاسبی رادەوەستا مزگەوت پڕ دەبوو لە خەڵك بەزمو رەزم دەستی پێ دەکرد و دەروێشان پەلاماری تاق و دیواریان دەدا و ناوە ناوە یەکیان گەرم دەبوو، هەر دەپەڕی و کەفی دەکرد، شێخ دەچووە لای و دەستی بە سەریدا دینا و دەی وت: ساکین ساکین، دەرویش هیمن دەبووەوە دەروشێکی تر! گەرم دەبوو عەرەبێکی موصلاوی هەبوو بەناوی ئیبراهیم حەمەدۆن بوو، زۆر دۆستی باوکم بوو، پیاوێکی زیرەك و ماقوول بوو، تەمەنێك پێکەوە قاچاغی توتنیان کردبوو، تاجیرێکی گەورەی توتن کڕین بوو، لە خۆشناوەتی ودەوروبەرمان. برادەری زۆرکەس بووە متمانەیێکی زۆری هەبووە لەناوچەکە، دەروێشەکانی بە شێت و گێلی زانیبوون، زۆریش برادەری حاجی تەها بووە لەگەڵ ئەو سوحبەتیان هەبووە. حاجی تەها پیاوێکی باش وموسڵمان بووە، خەڵکی شێخ وەسانان بوو، ناسراوەبەحاجی تەهاڕەش، ڕۆژێکیان شێخ محیەدینی کۆیە دێتە شێخ وەسانان، دەروێش دەورەی لێ دەدەن، لەسەربانی مزگەوتێ زکر دەکەن هەڵدەپەڕن، هاواردەکەن، پڕ بەدەنگ یاشێخ محیەدین حاجی تەها گەرم دەبێت و پەلاماری ئەولاو

ـەلا دەدات، ئیبراهیم حەمەدۆن دەڵێت: حاجی تەها درۆ دەکات هەندێك جونی دەدەمێ، ئەگەر ـڵامی جونەکانی منی دایەوە واتە درۆ دەکات ئەگەر وەڵامی نەدامەوە دیارە ڕاست دەکات، دەست ـکات بەجویندان حاجی تەها واز لە زکر دێنێت و دەیان جوێن بە ئیبراهیم حەمەدۆن دەدات، ـیبراهیم حەمەدۆن دەڵێت: نەم گوت درۆ دەکات!

شێخەکانی ئەوکات وەك پارتەسیاسیەکانی ئێستاوابوون، یان پارتەکان وەك شێخی جاران ـتە بەداخەوە زۆرینەی خەڵکیش دەروێشی جارانن، جگە لەبنەماڵەی شێخ مستەفای هەولێری و شێخ محیەدینی کۆیە و شێخانی باقلانێ، هەورەمانیش دەروێشی خۆیان هەبووە لەناوچەکە، لە هەمان کات ئێمە شێخی خۆشمان هەبوون، ئەو بنەماڵانەی خوارەوە بوون، شێخی زێخان،لە نزیك گوندی مێرگەسەرە، بنەماڵەی شێخانی بالیسانێ و، بنەماڵەی کاکی سیساوە بەرچاوترن ـەشیخەکانی تر، لەخزمەتی خەڵکی دابووینەو دەوری بەرچاویان هەبووە، لە چارەسەری کێشەکۆمەڵاتەکان، بە دەگمەن نانی خەڵکیان نەخواردوە، هۆیەکەی چییە؟ نازانم لەهەمان کات خۆیان خانەدان بووینە، ماڵی کاکی هیوانێ و، ماڵی شێخی بلە و شێخی سەران و ... واتە: خۆشناوەتی دابەش بکە بەسەر ئەو هەموو شاخ و داخ و شێخە و مشایخەبیر کردنەوەی هەریەکیشیان جیاواز بووە، بۆیە ئەو میللەتە گێژ و وێژ بووە و مێشکی راوەستاوە! ململانێی جوتیارن لەنێو خۆیان و ئاغا لەگەل جووتیاران و جووتیار لەگەڵ ئاغایان و ململانێی ئاغا ئەگەڵ ئاغا و شێخ لەگەڵ مەلایان ومەلا لەگەڵ ئاغا و شێخ و کۆمەونیست لەگەڵ ئەوان و کوردایەتی لەگەڵ زۆربەیان و هەرایك بووە( هەرامە ) خاوەنی خۆ ناناسیوە!

بۆ مێژوو یەك شێخ کەیفی بەشێخەکەی تر نەهاتووە، ململانەیەکی توند هەبووە لەنێوانیان بەتایبەتی لەسەر بۆچوون و بیرکردنەوەیان، وەك قادری و نەقشبەندی سەرباری بزوتنەوەی حەقەش کە لەناو ململانێکە دابوە و بەهەموو شیان ململانێی حەقەکانیان کردووە سەرباری ململانێی ناوخۆیان شێخ مەحموود شۆڕش دەست پێ دەکات، بارزانییەکان ملانێی داگیرکەردەکەن، ئەوە کێشەی شێخ و دەرویشان نەبووە، هەر بیریشیان لەشۆڕش نەکردیتەوە.

بەداخەوە شێخەکان ئێستاش بەناوی جیاجیا و دەروێشەکانیش بەناوی جیا جیا، هەمان تاس و حەمامە لەبن پەردەی تر بەناوی تر لەپاڵ ئەو بەزمە شتێکی شاراوە هەبوو، ئەویش مامۆستایانی ئایینی ئەو کارایان لاپەسند نەبوو، بەڵام لە بەرجەنابی ئاغاو شێخ و دەروێش مەلا دەبووایە بێدەنگ بێ وخۆی بگونجێنێ، لەترسی نان بڕان ئاغەکان ئەوبەزمەیان پێ باش

بوو، جووتیار بەو هێزیە بچێت بیر لە خۆی و دەورو بەر نەکاتەوە لەهەمان کات ڕێژەیەکی باش لە مامۆستایانی ئایینی ئەوکات بێدەنگ نەبووینە لە بەرانبەر ئەو زاهیرە ناپەسندە کە شێخەکان دەی کەن نموونەی مەلای گەورەی کۆیە زۆر بەتوندی دژی شێخ و دەروێش راوەستاوە و پێی وگوتوون ئەوەی ئێوە دەیکەن ئایین نییە، بەڵکوو تەڵەکەبازییە.

ئەگەر لافاوێکی شێتانەی گەورە رووبەرووت بووەوە هەرچەندە بەهێز بیت و مەلەبزانی ئەگەر نەشت خنکێنی لەگەڵ خۆت دەبات و سەروسیمات دەشێوێنێت. مەلای گەورە هەرچەندی هاوار دەکات جووتیاران بە شێوەیەکی تر لەمەلای گەورە دەگەن، ناوی کافر دەدەنە پاڵ مەلای گەورە، کورد لەمێژە دەڵێت: کەسێك بەتەنێ هەرچەند سوارێکی باش ولێزان بێت، بەتەنیا تۆز ناکات، نگبەتی کورد لێرەیە تائێستاش ناوە ناوە خۆی لەبیر دەکات و دۆست ودووژمن لە یەك جیا ناکاتەوە، یان لەسەر هەڵوستێکی برایەکی خۆی دار و بەرد دەسوتێنێت، ئەگەر خۆشی تێدا بسوتێ لاری نییە.

***    ***        ***

ئاغایەکی خۆشناوان لەگەڵ پیاوێکی خۆی سەردانی ئاغایەکی دەوروبەرمان دەکات، ئەوەی من زانیومە گوایە سەردانی ماڵباتی عەباساغا دەکەن لە دیوەخانی دانیشتوون ئایە عەباساغا بووە؟ یان ئەو ڕووداوە لەباب و باپیرانی عەباساغابووە؟ پێشتربووە؟ یان نازانم پیاوی ئاغای قەنەبزئاغای ئامادە دەکات؟ دواتر دەچێت پۆلیە ئاگرێك لەسەردەستی دادەنێت بزقەنەی ئاغەی دەبات و بە نەرمونیانی بەبێ ئەوەی گوێ بەسوتانی دەستی بدات لەسەرقەنەی دادەنێت، ئاغا بە ئاغای خوشناوان دەڵێت: دیتت چ پیاوم هەیە، پیاوی ئاغای خۆشناوان کە گوێی لەپیاهەڵدانی پیاوی ئاغا دەبێت وئاغا خۆی هەڵدەکێشێت بەخولامی، خەنجەرێ لەبەر پشتێ دەردینێت و تا هێزی تێدایە خەنجەر لە ڕانی خۆی دەدات دەڵێتەئاغای ئاکۆیان قوربان وەرە کەرێی لێ وەبەستەوە، ئاغای خۆشناوانیش خەلاتی دەکات!

بەتبەختی کورد لێرەیە، زۆرجار ڕك و دەمان گری و ئاقڵ بۆ ماوەیەك لەدەست دەدەین من خۆشم زۆر جار وام بەسەرهاتووە، مەلای گەورەی گەوران بخوێنەوە، مەلای گەورە کارێکیان پێ دەکات بابە دەواری شڕی نەکرد بێت، دیارە ئەمڕۆ هونەر نییە من شتێك لەسەر ئاغاو شێخ باس دەکەم بۆ مەلای گەور هونەر بووە، لەو کات و سات بەرەنگاری شێخان دەبێتەوە:

به ڕیشی پان و سەری پڕله ئەسپێ
بناغەی ئیشی کوردان چۆن دەچەسپێ
تا شێخ له کوردستان بمێنێ
ئومێدی زیندەگانیت پێ نەمێنێ
هەمووی بێ ئیشوکار وتەوەزەل
ورگ پان وملی ئەستوورو سەرك زل

دیاره جەنابی حاجی قادری کۆیەش قسەی خۆی هەبووه لەسەر شێخان :
شکلی تەکیه و خانەقای شێخەکان
واقیعەن رەنگینه ئەمما بۆ ریان
لەو هەموو شێخ و مریدانەی ریا
فەردەکی ناچێته مزگەوتی خودا
مەسجید و میحراب و مینبەر بێکەسه
هەرمەپرسه حالی چۆنه مەدرەسه
شێخانه ئەگەر ئەوقست نایێتەگوێ
سەیری وا چۆله کەری تیدابکێ

دیاره جگەر خوینیش قسەی خۆی هەیه، دەڵێت دەردی کورد که نەبۆوته هیچ لەناوگەلان، یەکێك له هۆکارەکان ئاغا و شێخن، جەنابی فتوای کوشتنیان دەدا:

مەلاقانیعیش قسەی خۆی هەیه لەوبارەیەوە:

زۆری تریش بەداخەوە گەلی کورد لەرابردوو بەشێکی زۆری به هەڵه له دین تێگەیوەن، بەشێکیش بەهەڵەش له کوردایەتی گەیشتوون، ئێستاش سەرۆکی پارته سیاسیەکانمان لێ بووینه شێخی جاران و دەروێشەکان ئەوەندەی خەمی شێخیانه خەمی رێکخستنەوەی ناو ماڵی کورد و چوار پارچەی کوردستانیان نییه و لەسیستەمی سیاسی تێ ناگەن و یان نایانەوێت تێبگەن و پیادەی بکەن، خەمیشی بۆ ناخۆن ناشیانەوێت بزانن بەتایبەتی که شێخ بووته سەرچاوەی بژێوی ژیانیان بەمنیشەوە. شێخ سەلامەت بێت، یارەبی کوردستان وێران دەبوو، گرنگ شێخ سەلامەته، دەرویشایەتی وەرەسەیه بۆمان بەجێماوه، ئەگەر باوەڕیش و بەقسەی من

نییه تۆزێك بەوردی سەیرکەن ئێستاش جەنابی شێخ چۆن بیر دەکاتەوە و دادەنیشێت، دەروێشەکان وادادەنیشن شێوەی جلوبەرگی شێخ چۆنە؟ ئەوانیش بەشێوەی سەرکردەکەیان دەی پۆشن سەرۆکیان چۆن هەڵسوکەوت دەکات؟ ئەوانیش لاسایی دەکەنەوە.

منیش یەك قسەم هەیە بۆسەرکردەکانی خۆمان بەشێك لە دەرویشانە کلك بادانیان بۆ نانە هەرهەمان دەروێشن کە کلکیان بۆ سەدام بادەدا بۆنانێك سەرکردەکان ئاگا و لەو جۆرە دەروێشانە بێت، چونکە مێژوو کەمتر بەرپرسیەتی دەخاتە سەر دەروێشان، زیاتر پەلاماری سەرکردەکان دەدات، من ئێستا بیر لەوە دەکەمەوە چەپەکانی خۆمان دەیان ویست لەو دەروێشانە سیستەمی کۆمەنزمی لەکوردستان پیادە بکەن، کە بەداخەوە قوربانیشیان زۆر بۆ دا کە جیاوازی لە هەموو روویەکەوە لەناو مرۆڤایەتی بن بڕکەن، عەدالەتی کۆمەڵایەتی پیادەکەن، وەکی خۆشناوان گۆتیە چەپەکان (دۆشاو بەگون لەجێیکی بێ ئاو) شۆڕشی پرۆلیتاری بەدەروێشانی کوردستان بکەن و لەشکری سور دروست بکەن ئەوان نازانن کوردایەتی بکەن برای دایك و بابی بەقسەی شێخی دەکوژێت بەتەمای بیکەیە هێزیکی وشیاری بزۆتاری مرۆڤایەتی پێ رزگارکەی زۆرینەیان کەرولاڵن، زۆربەیان جیاوازی لەنێوان دۆست و دووژمن ناکەن لەڕابردوو کێنانی دەدانێ بۆ ئەو هەڵدەپەرین وەك ......، وەدەمەوێت یەك نموونەی بچووك بخەمەبەرچاوی جەنابتان کە ئەوکات بەشێك خەڵکی خۆشناوەتی و کوردستان چۆن بیریان لەجەنابی شێخ کردیتەوە، سەدان نموونەی سەیرم لایە یەکیان باس دەکەین بۆ ئەوەی کوڕەشێخەکان زۆر توڕەنەبن، سەیرکەن بیر بکەنەوە، پورە عەیش هەبوو خێزانی ( مام رەشاد ) بوو خزمی من بوو پور عەیش تاساڵی ١٩٩٨لەژیان دامابوو جەنابی شێخ محیەدینی کۆیە سەردانی دەروێشەکانی دەکات لە شێخوەسانان یەکێك لەدەروێشەدڵسۆزەکانی ناوی رەشاد فەقێ مستەفا بوو میوانی دەبێت، جەنابی شێخ دەیەوێت دەست بە ئاو بگەیەنێت بە رەشاد دەڵێت رەشادیش بەخێزانی دەڵێت: کچێ عەیشی هەندێك ئاوێ دە(حەوجۆشی ) کە بۆشێخی دەست بەئاو ئەگەینێت حەوجۆش وەك مەسینەی ئێستا وابووە، پوورعەیش کە گوێی لەوقسەیە دەبێت شێت دەبێت و لەخۆی دەدات دەڵێت( وەی وەی خوایە تۆبە باوی مەجۆی (جێنك جو) کافربووی وەبرێ تۆبە شێخ کو گوی ئەکەن، خوایە تۆبە کوڕە رەشاد وەبرێ تۆبە، کافر بووی جێنك جوو ) (جێنك) بەبسك دەگوترێت پیاوانی ئایینی جولەکە جێنوکیان هەبوون و رەشاد دەڵێت: کچێ عەیشێ بیا ئەوانیش وەکی مەنە گوی ئەکەن دەوەرن گەنجینە سەیرکەن بیرکردنەوەی گەلەکەتان چۆن بووە پورعەیش وای زانیوە شێخ وەك (مەلەکن

گوو ناکەن، یان دەرویشەکان زۆرجار دەکەوتنە مەحت و سەنای شێخانیان بەسەڵەوات لێدان دوایان لە شێخ دەکرد ڕۆژی قیامەت شەفاعتیان بۆ بکات فەرموون بیخوینەوە

قوربانت بم شێخی تازە
لەجەرگت دام تیرو گازە
لە ڕۆژی قیامەت بنکە ئازا
حەبیبی عالەم محەمەد سەلەوات

ئەوەی من زانیومە پێغەمبەرەکانیش جگە لە (محەمەد) سلاوی خوای لێ بێت، تواناى شەفاعەتیان نییە، مەگەرخودا مۆڵەتیان پێ بدات ........

بەقوربانت بم شێخی نوێ
بەژنت رەیحانە دەم جۆێ
بە هەشتێ لەتو دەوێ
سەیدی عالەم محەمەد سەلەوات ...
هەم سەیدە و هەم پێغەمبەرە
بابە هەم شەهیدە و هەم سەروەرە
ئەو زاتەو پێغەمبەرو سەردەفتەرە
دەخالەت حەبیبی ڕۆژی مەحشەرە ...

قوربانت بم ئەی بەقوربانە
خالق بەخۆی پشتیوانە
وا بکە لێت ببم میوانە
لەقاپی یزدان زۆر ئاسانە
ئەتو شەمع و ئەمن پەروانە
بقوربانت بم میرات گری شێخ عوسمانە ..... واتە جنابی شێخ عوسمانی بیارە ..

بەقوربانت بم ئەی محەمەدە
هەر بەخۆی لەدووی ئەحمەدە

ئۆمەتی تۆم جوابم وەدە
دەخالەت لەقاپی یزدان فەرەن زەدە ...

بەقوربانت بم ئەتۆی جەبیل
دانای هەر تۆی فکر و خەبیر
ساحیب روحم و ساحیب سەبیل
سەیدی عالەم محەمەد سەڵەوات...

ئەودانانەت بەقوربان بم
بەسەر سەرم فەخری عالەم
تاجی سەرم تا دەمرم
هەریەکەسەرم بقوربانت بم
سەیدی عالەم محەمەد سەڵەوات

بقوربانت بم برینت کردم دوورخانە
بابە میراتگرم شێخ عوسمانە
وەلا بابە تاجی سەری هەموومانە
پێغەمبەری ئەوەل و ئاخیرانە .
دەخالەت یا رەسوولەڵلا...

میرات گرم شێخ عوسمانە
بەخۆی لێ بووم بەمیوانە
نیو چاوان ناسکە نانە
ئەتو شێخ و من دێوانە
حەبیبی عالەم محەمەد سەڵەوات

وەك ئەوە وایە بەهەشت لەدەست شێخی بەرێز بێت، ئەتوانین بەسەرهاتێکی ترلە گوندێکی حواڵمان بینینەوە،کە چەند هەژاربووینە لەبیرکردنەوە، ڕۆژێك لە ڕۆژان دوو کەس دێنە سەرشاخی و دەشتیّ بالیسانیّ و دەشتیّ بیتوێنیّ دەبینن یەکیان دەڵێت کوڕە (حەمەد وەرە وەرە تیهیّ دنیا چەند گەورەیە مار خەرا) ئێمە کە زەمی شێخ و ئاغا بکەین دەبێت ئەوەشمان لەبەرچاوبێت بیرکردنەوەی جووتیارانیش چۆن بووە:

کوڕتێو کەژیّ

لێك دەهەژیّ.

*** *** ***

ئەتوانین ئەو ڕستەیە بەبەسەرهاتێك باس بکەین باپیرم دوو کچی هەبوون یەکیان ناوی ئایش بووە، پور ئایش دەستێکی سەقەت بوو بەمنداڵی سوتا بوو باپیرم دەی داتە کەسێك بەناوی قادر کە چاوێکی کوێر بووە، کەسێك لێی دەپرسێ ئەو کچەت چۆن دایە قادرە کۆری، باپیرم بەو ڕستەیە وەڵامی دەداتەوە،کورتیّ و کەژیّ لیك دەهەژیّ، واتە ئەگەر قادر بەکچەکەمی گوت، ئایشە گۆج، کچەکەی من بەقادر دەڵێت قادرەکۆر، کەوا بوو شێخ و ئاغا چۆن بووینە لەهەمان کات جووتیارانیش لەو پەری ناوشیاری دابووینە ئاغاو شێخ بە جووتیارانیان غەدر لەجووتیاران کردوە بلسم کرد، با واز لەشێخانیش بینین ..هەندێك بەسەرهات باس بکەین باپیرم پیاوێکی زۆر باش بووە، بەتایبەتی لەگەڵ فەقیرو هەژاران و خەڵکی بێکەس خزمەتکاری هەموو گوندی بووە، دیارە خەرکی گوندیش کاردانەوەیان هەبووە، زۆر ڕێزیان گرتووە، لە گوندی خزمی کەس نەبووە، بەڵکوو خزمی هەموو گوندی بووە.

*** *** ***

**باسیك لەسەر باپیرم:**

باپیرم ناوی حەمەدمین عەلی مستەفا بووە، ناسراوبووە بە حەمەدەمینی کۆشکیّ، کۆشکی هەبووە کۆشك بەخانێکی خۆش گوتراوە

باپیرم چوار ژنی هیناوە، ژنی یەکەمی دوای ماوەیەکی لێی جوانەمەرگ دەبێت، باپیرم لەگەڵ خەڵکی دەچێتە سەرقەبران دووای ماوەیك تەرمی خێزانی دینە سەر قەبران، سەروە تەرمی خێزانی دەکات و بەردەوام بۆی دەگرێت قەبر ئامادە دەبێت، تەرمەکە دەشارنەوە کە دوو کێل دەقەبری دەگرن، باپیرم پەلاماری یەکێك لە کێلەکان دەدات هەرچەندی ریش سپی و مەلا داوای لیّ دەکەن

## خۆشناو و دز و دزشاو

ناوی خوا بینەو دەست لەکێلێ بەردە بەقسەی کەس ناکات، خەزووری باپیرم دەڵێت: من دەزانم حەمەدەمین بۆ وادەکات، دەچێتە سەر سەری و دەڵێت حەمەدەمین هەستە کچەکەی تریشت دەدەمێ، باپیرم زۆر بە گورجی دەست لەکێل بەردەدا و بەرەو گوندی دەچنەوە، شینی باپیرم بۆ حەسەن و حوسێن نەبووە بۆ هەریسە بووە ! مامێکم هەبوو کەپێشتر باسم کرد بەناوی فەقێ خدر پیاوێکی زیرەك و زۆر ئاقڵێ بوو قسەی زۆرجوانی هەبوون، یەکێك لەقسەکانی دەی وت ئەگەر کەسێك چووە سەر شاخی وتی من خۆ لەو شاخەی داوێم، ئەرکی سەرشانتە پێی بڵێی کاکی من ئەگەر زگت بەخۆش ناسوتێ، زگت بەمنداڵەکانی خۆت بسوتێ، هێتیمیان مەکە کەس منداڵانت بەخێو ناکات، دوای ئەو ئامۆژگارییە ئەگەر سوور بوو لەسەر خۆفڕەدان، نەکەی لە دیاری ڕاوەستی تاکو خۆی فڕێ دەدات پاڕانێکی پیوەبنێ بۆ ئەوەی پارچە پارچە بێت .

*** *** ***

دیارە مام خۆشناو بە خزمانی دەشتێ دەڕێن دەشتەکی، پەیوەندیەکی دۆستایەتی گەورە هەبووە لەنێوانیان خۆشناو خەڵکی کۆیە و کەندێناوە و دەشتی هەولێر وقەراج و دەوروبەری موصل بۆ ساغ کردنەوە هەنار و ترێ و پیواز و لەتکە هەنجیر و کارتەو چەقەلە و جۆرەکانی هەرمێ ودۆشاو مێوژو سماق و جەفت و گروان و بە تایبەتی توتن و کارتە و لەتکە سۆرکەو لەبەرانبەری گۆڕینەوە بە گەنم یان بە پارە واتە: لەنێوان هەردوو زێدا خۆشناو تێیدا دەگەران بۆساغ کردنەوەی بەرو بوومەکانیان، دیارە لەو سەفەرە دوورو درێژو بەردەوامە پێویستی بە قسەی خۆش و کات بە سەربردن هە بووە، مام خۆشناو دەیان بە سەر هات و ڕووداوی دروست کراو ئامادەی دەکرد بەو مەبەستەی کەدەچوە هەر گوندێك شەوان خزمانی ئەو گوندە دەورەیان لەمام خۆشناو دەداو شەڕیان بە مام خۆشناو دەفرۆشت دەیان بەسەر هاتی سەیروسەمەرەیان دەگێرایەوە، کە بە زەرەری مام خۆشناو تەواو دەبوو، زۆرجار ئاغای گوندی پرسیاری دەکرد ئەگەر خۆشناوێك لە گوندی میوان بایە، بانگ هیشتی دیواخانی دەکرد، بۆ شەڕە بەسەرهات، دیارە مام خۆشناویش لە ئامادەباشی دادەبوو بۆ وەڵام دانەوەیان، گێرانەوەی ئەو بەسەرهاتانە لەخۆشەویستی بۆ زاخاوی مێشك و دەرکردنی ماندووبن بووە، بەشی زۆری ئەو بەسەرهاتانە دروستکراو بووینە، وەك دروستکردنی چیرۆك و فیلیمی ئەمڕۆ دەکرێ بەشێکیان ڕاستیش بن. دیارە من لەخەڵکی خۆشناوەتی زۆر لەوچیرۆکانە گوێم لێ بووە، کە بەزەرەری خزمانی دەشتێ تەواو دەبێت، کە ژمارەیان تەواو نابێت، وەپیوەندیم بەزۆر کەسی خزمانی دەشتێ کرد کە

ئەوانیش هاوکاریم بکەن بۆ ئەوەی چیرۆکەکان وەك یەك بن غەدر لە خزمانی دەشتیَ نەکەم. زۆرکەم هاوکاریم کرا ناچار بووم بۆ دڵخۆشی خزمانی دەشتیَ هانام بۆ مامۆستا سوجادی برد کە لەسەر خۆشناوەتی کۆی کردینەوە، بۆ ئەوەی خزمانی دەشتیَ نەڵێن خۆشناو غەدری لی کردووین وە دەشزانم خزمانی دەشتێش زۆر شتیان لەلایە کە بەزەرەری خۆشناوان تەواو دەبێت منیش دەڵێم: دەستی کەس نەگیراوە، ئەوە عاردوو ئەوەگەز، دەشتەکینە چی لەسەرخۆشناوان دەزانن بینووسن، هەندێك شتی خۆشتان بنووسن، ئەوەی من نەم زانیوە پیاو ئەوپیاوەیە ئەدەبیاتی گەلەکەمان لە مردن نەجات بدات بۆ نەوەکانمان بۆئەوەی نەوەکانمان بزانن پێش ئێمە چۆن ژیاوین لەهەموو رووێکەوە ئەوەندەی زانیومە وام کردوە غەدر لەخزمانی دەشتیَ نەکەم، بەداخەوە ئەوچیرۆکانەی دژ بەمام خۆشناوانم زۆر پیَ پەیدانەبوون، داوای لێبووردن دەکەم لەخزمانی دەشتیَ، چەند نموونە دێنینەوە، یەکەم بەسەرهات لە خۆشناوان دەست پیَ دەکەین بۆ ئەوەی خاریَ دەشتێن تورە نەبن:

کابرای دەشتیَ دەڵیَ، ژنەخۆشناوێك دووکونده دۆشاو بار دەکات بەرەو دەشتی هەولێر دەچێت لە ئاقاری پیاوێکی لیَ پەیدادەبێت بە ژنە دەڵیَ خوشکە ئەوە چیە ڕێتە؟ دەڵیَ دۆشاوە دەی فرۆشم کابرا دەڵیَ: باشە تامی دەکەم، باش بوو دەی کرِم، ژنەش دەمی یەکێك لە کوندەی بۆ دەکاتەوە، کابرا ئەویان تام دەکات زارکی کونده دەداتە دەست ژنە،ئەوەی تر دەکاتەوە و تامی دەکات و دەیداتەوە دەستی ژنە، کابرا کە دەزانیَ هەردوو دەستی ژنەتیم گیراینە، ئەو فرسەتە لەدەست ناداو پەلاماری ژنە دەداو کاری خۆی دەکات، ژنە دەمی کونده بەردەدات دۆشاوی دەرژیَ بەری نادات ئەوە کابراکاری خۆی دەکات، ژنە دەڵیَ: خوایە چی بکەم (هەی لەقونیَ هەی لەدۆشاوی!

*** *** ***

## لەگوندێکی دەشتی هەولێر

کابرایەك لە ژنەکەی خۆی تورە دەبێت تەلاقی دەدات دواتر زۆر پەشیمان دەبێتەوە، دەچێتە لای مەلا، مەلا دەڵیَ چاك نابێتەوە بە مارەجاش نەبێت مارەبە(جاش) (کەسێك ژنەکەی تەلاق دەدات دەبێت کەسێکی تر مارەی بکات و شەوێك کاری خۆی لەگەڵ بکات و دواتر بۆ خاوەنی ئەسڵی خۆی تەلاقی بدات) لەو کات و ساتە خۆشناوێك دەچێتە ئەو گونده و دەڵیَ هۆی وەرنەترێی کابرای ژن تەلاق دەر وا بەباش دەزانێت ژنەکەی لە مام خۆشناو مارە بکات، بیر لەوە

**دەکاتەوە مام خۆشناو باشترە لە کەسێکی خۆگوندی، یەك جارەو خۆشناوملی خـۆی دەشـکێنێت و دەڕوات و نابینێتەوە، دەچێتە لای مام خۆشناو پێی دەڵێ مام خۆشناو واز لە ترێ فرۆشـتن بێنـەو لەگەڵ من وەرە یەك بارە گەنمت دەدەمێ من حاروحیسابێکی وام بەسەر هـاتووە، ئەگـەر رازیبـی چاکەیەکی گەورەم لەگەڵ دەکەی، تریش دەکەینەخێر. مام خۆشناو دەڵێ باشـە رازیـم، خێرەکـی گەورەیە خۆشناو دەڵێتە خەرکی گوندی ئەوتریە بووەخێر بەبێ گەنم لەسەرخەرکی گوندی دابەش دەکات و خۆشناو لەگەڵ کابرای دەشتێ دەڕوات و یەك بارەگەنم بۆ خۆشناو ئامادە دەکـات ئێـوارە کابرای دەشتەکی مەلاو شاهید پەیدا دەکات و ژنەتیم لە مام خۆ شناو مارە دەکەن و ماڵەکەی بۆ خۆشناو بەجێ دێڵێت، مام خۆشناو کاری خۆی دەکات و بـەیانی مـەلای گونـدی دێتـە لای مـام خۆشناو بۆ ئەوەی ژنەکەی پێ تەڵاق بدات، بە خۆشناو دەڵێ: (هۆ خۆشناوی قون بەدۆشاو) دنیـا چ باسە؟ خۆشناو دەڵێ بەخوای مامۆستا زۆریـش مانـدو بـووم، کـوەکی هـەبوو – حـەوت نـانم بەساواری خواردن! کابرای مێردی ژنە کە گوێی لەوقسەی مام خۆشـناو بـوو، دەڵێـت خۆشـناوی سەگباب جارەکی دی لەو گوندت بیینمەوە بابت دەگێم بەسەیان.**

***** *** *****

**لەگوندەکی دەشتێ**

**شەوێ دەورە لەمام خۆشناو دەدەن یەکێك دەڵێت: مام خۆشناو دەزانی ئەمە منارەی چۆلین هەیە، ئەنگۆی خۆشناویش دۆرەتێ و هەیە،(دۆرەتێ دەکەوێتە رۆژهەڵاتی گوندی شێخ مەموودیان لەدەشتی هەریر) مام خۆشناو دەڵێت: خۆ هێرنیم ئەزانم ئەمەش سەردۆرن هەیە، ئەنگۆش سۆریەش و هەیە، (سۆریەش گوندێکە لەدەشتی هەولێر).**

***** *** *****

**کابرایەکی خۆشناو دەچێتە گوندێك ماڵە خانەخۆی لەگوندێکی تر داوەت کراون بۆ سەر زەماوەند خانەخۆش دەڵێت: مام خۆشناو با پێکەوە بچینە بووکێ، کەدەچن شایی گەرمە و رەش بەرەکییە کابرای خۆشناو نیو دیناری پێ دەبێت سەری گەرم دەبێت، دەچێتە شایی کابرای زوڕناژەن زوڕنای تێ دەکات، داوای شاباشی لێ دەکات خۆشناو یەك روعبەی پێ دەدات زوڕنا ژەن ناو نیشانی لێ وەردەگرێت و دەڵێت شاباش شاباش لە میری خۆشناوانەوە ئەوەی ناحەزی خۆشناوە لەسێبەرێ دمی بەم، لەقۆرتێ گونێی بەم، لەگەرو گوانی ماموژنێی بەم، خۆشناو بەو**

شلپاشەی سەرخۆش دەبێت و دەڵێت وەرە سەگباب دووبارەی کەوە ئەو روعبەش بگرە، کاکی خۆمیش دووبارەی دەکاتەوە .

*** *** ***

کابرایەکی دەشتیَ ئەیەویَ سەردانی برادەرەکی خۆشناو بکات لە رێگا دەگاتە ژنە خۆشناوێك دەچێتەوە خۆشناوان پێکەوە دەکەونەریَ قسە بە قسە کابرای دەشتیَ دەڵێت ئەریَ خوشکیَ ئەنگۆی خۆشناو ئەو زەویە باشەو هەنە لۆ لۆخۆ گندۆران ناکەن؟ ژنەخۆشناو دەڵێت: براڵە خەرکی مە هەن بیَ حەشر و نەشرن بشکەین چلۆ ماخۆی نامینێت لیَی ئەکەنەوە،کابرای دەشتیَ دەڵێت:

دەوەڵڵاهی، وەبیلاهی وەتیلاهی، هەرسێکیان ناوی خوایە ئەمن گندۆران بکەم ئەوەی لیَ بکاتەوە راست دەی گێم، پیەژنە خۆشناو کە گوێی لەو قسەیە دەبێت، ئەو فرسەتە لەدەست نادات، دەڵێت: راوەستە لە جێخۆ نەرۆی ئەوەعارد ئیتوە.. کردیتە گندۆرە.. ئەمنیش لیَم کردنەوە. بزانم چت لەدەست دێت؟ کابرای دەشتیَ پەلاماری پیەژن دەدات، کاری خۆی دەکات ماوەیەك دەرۆن ژنەخۆشناو قسەکەی پێشتر دووبارەدەکاتەوە کابراش کاری خۆی دوبارە دەکاتەوە ماوەیەك دەرۆن ژنە قسەکەی سیَ بارە دەکاتەوە کابراش کاری خۆی سیبارە دەکاتەوە ماوەیەك دەرۆن ژنەخۆشناو ئەیەویَ قسەکەی چواربارە بکاتەوە کابرای دەشتیَ بەو سیَ جارە زۆر هیلاك دەبیَ و دەڵیَ، تواوی نەکەی خوشکێمن، ئەمن لێرە نەعاردم هەنە و نەگندۆرانیش دەکەم ئەوەی گندۆرانیش بکات بابەکەی دەگێم، دەفەرموو دەشتەکینە باری پیەژنەکە خۆشناویش نابەن .

*** *** ***

کۆلکە مەلایێکی خۆشناوان دەچیتە گوندێك، وەختی نوێژێیە، لەو گوندەی کەس بانگ نادات و مام خۆشناو بانگ دەدا و کۆمەڵێك حاجی وئیختیار کە گوێیان لە بانگی دەبی دێنە مزگەوتیَ نوێژیَ بە جەماعەت دەکەن کە تەواو دەبن مام خۆشناو دەڵێت: ئەریَ خزمینە لۆ کەس بانگی نەدا دەڵێن: وەڵڵا مامۆستا ماوەی دوو ساڵە بیَ مەلاین، مام خۆشناو دەڵێت دەباشە ئەمن بچمەوە خۆشناوان مەلایێك و لۆ پەیدا دەکەم تاکو دێمەوە کێو لە هەمان گەورەترە لەگوندی بابانگی بدات، ئیمامەتیش بکات لۆ جەماعەتیَ، مام خۆشناو دەڕوات ردێن سپی کۆ دەبنەوە بریار دەدەن پلکە فاتم لەهەمان گەورەترە، داوای لیَ دەکەن بانگ بدات و پێش نوێژان بکات پور فاتم رازی دەبێت لە سەر فتوای مام خۆشناوی، دوای ساڵێك خۆشناو مەلایێکیان لۆ دێنی دەڵێت:

ئەو ماوەی نوێژ دەکردن بە جەماعەت هەموویان دەڵێن ئەرێوەڵڵا خوا خێرێ پلکە فاتمێ بنووسی، بانگیشی دەدا و جەماعەتیشی لۆ دەکردین، مام خۆشناو دەڵێ ئەنگۆ باسی چ دەکەن پورفاتمێ چ، دەڵێن وەڵڵا پورفاتم جەماعەتی لۆ دەکردین ئەدی ئەتو وەنەگۆ کێو لەهەمان گەورەترە بابانگیش بدات و پێشنوێژیش بکات مام خۆشناو دەڵێت: وای ئیشو کردیە نوێژی پیاوان کو لەدو ژنان وەبەردەکەوێت، یەکێك لەوان دەڵێت: وەڵڵا مام خۆشناو راست دەکات کە پور فاتمێ خۆ دادیناوە لۆ سوژدێ ئەمن ........م. رەق دەبوو، یەك نوێژم وەبەر نەکەتیە!

*** *** ***

خۆشناوێك بارە هەنارەك دەباتە دەشتێ هەولێرێ لە گوندێك دەچێتە ماڵێك بارەهەنارەکە دێخی و کەرەکەش لە دووری خۆی دەبەستیتەوە، کابرای خاوەن ماڵ لەماڵ نابێت تەنها ژنە لەماڵ دەبێت، دوای ماوەیەك ژنەتیم دەچێت دوو هەنار بەدزی مام خۆشناو دەبات بۆ منداڵەکەی مام خۆشناو چاوی لێ دەبێت، دوای کەمێك مام خۆشناو بۆلای کەرەکەی دەچێ کەرەکە دەست دەکات بە لوشەلوش دیارە مەبەستی کەر ئەوەیە کە خاوەنی دەبینی دەست دەکات بە لوشەلوش بەمەبەستی خواردنە مام خۆشناو دەنگی بەرزدەکاتەوە و بە کەرەکەی دەڵێت خۆ دنیا خەرانەبوو، دوو هەناری برد ن بردن، شەرمە هەرباس مەکە. ژنەتیم گوێی لەو گفت و گۆی خۆشناودبێت لەگەڵ کەرێ سەری سوڕما کەر چۆن قسە دەکات، ژنەتیم دوو هەنارەکان دەباتەوە ئەوجارەیان خۆشناو بەقەستی بۆ لای کەرەکە دەچی، کەرەکە دەست دەکاتەوە بە لوشەلوش خۆشناو، دەڵێت دەبەسە بردنی قسەت کرد هێنایەوە لۆ قسان ئەکەی، وازبینە ژنە ئەوەندەی ترسەی سوور دەمینێ کەمێردەکەی دێتەوە دووای بە خێرهاتنی مام خۆشناو ژنەتیم دەڵێتە مێردەکەی وەرە ئیشم پێتە، ژن بەسەرهاتەکە بۆ مێردی دەگێرێتەوە، کابراش سەری سوڕ دەمینێ، دەچێتە لای مام خۆشناو ئەو مەسەلەیە باس دەکات، خۆشناو دەڵێت ئەوەی خێزانت باس دەکات راستە کەرەکەی من کەر نییە کابانی مارێیە، ئەمن پیاوێکی فەقیم کەرم پێناکرێ کە ئیشەیکم بە کەرێ هەبوو دووعایێك دەکەم خێزانم دەبێتە کەر، تاکو کارەکەی خۆم تەواو دەکەم، دواتر دەیکەمەوە ژن،کابرای دەشتێ دەڵێت مام خۆشناو بەخوای ئەمنیش فەقیم ئەمنیش فێرکە خێرت دەگاتێ، مام خۆشناو دەڵێت: باشە ئەمەکی ئەومارەم لەسەرە بە سەرچاو، دە چاوی خێزانت ببستەوە بەخۆش چاوان بگرە، وا دەکەن خۆشناو لەدواوە خەریکی ژنە دەبێت دووای ماوەکی کابرا دەڵێت: ها خۆشناو تەواو نەبووی، خۆشناو تەواو دەبێت، خۆی قەیم دەکاتەوە و دەڵێت

سەرت خەرانەبی ئەدی وەم نەگۆ قسان نەکەی، زۆر نەمابوو تەواوبی، ژنەتیم دێتەقسەو دەڵێت نەرتوەڵلا لێ نەگەڕای سمم خڕبووبوون، گوێم قیت ببوون، قونم خڕبووبوون مارت خەرابی پیاو نەحەمووشتی هەر بەئەجەلەنە.

*** *** ***

کابرایەکی دەشتێ سەردانی خۆشناوەتی دەکات دەگاتە بنە هەنجیرێك زۆری هەنجیر پێوەنە حەزی دەچیتە هەنجیران دەچیتە سەر بنەهەنجیرەکە، دەست دەکات بە هەنجیر خواردن، پیرەژنە خۆشناو سەیر دەکات، کابرایەك هەنجیران دەخوات، دەچێتە لای و دەڵێت کابرا وەرەخوارێ لە سەر هەنجیرێ، شەرم ناکەی حەیات بە خۆنییە هەنجیران بە دزی ئەخۆی، کابرای دەشتێ دەڵێت: پیرەژن وسبە جونان نەدەی بێمەخوارێ دەت ......م پیرەژنە خۆشناو دەڵێت: تەماشاکە تەماشاکە شەرمێش ناکا هەنجیرانیش ئەخوا و درۆیانیش ئەکا کابرا دێتە خوارێ و پە لاماری پیرەژن دەدات و لەبن هەنجیرێ کاری خۆی دەکات دوای پیرەژن دەکەوێتە گەوزان، کابرای دەشتێ دەڵێت خوایە چیم کرد نە خۆ، زیناشم کرد قەتلیشم کرد ، پیرەژنە خۆشناو کە گوێی لەو قسەیە دەبێت دەڵێت: نەتاکورم لۆێم وەکرد تا دەهێسکانم بگەڕێ پیرەژن دەڵێت: کورم ئەتو ناوت چییە؟ کابرای دەشتێ دەڵێت: ناوم تارە، پیرەژنە خۆشناو دەڵێت:

نا ئەتو تارنیت شەکەری

پیرەژنت دەبەر مری

ئەولادی پێغەمبەری

پیرەژنێ رەحەت کەری.

*** *** ***

چەند مام خۆشناوێك دەچنە دەشتێ هەولێرێ یەکێکیان دەڵێت: دەچمە ناو ئەو گوندەی هەندێك هێلکان دەکڕم دەگاتە ناو گوندی و ژنێك دەبینێت دەڵێت خوشکێ ئەنگۆ هێلکەی فرۆشتنێ و نینە ژنە دەڵێ چەندان دەکری بە دەرهەمەکی، ئەو کات درهەم زۆر بوو خۆشناو دەڵێت نۆ هێلکە ژنە دەڵێت: ناوەڵلا شەش هێلکە. خۆشناو دەڵێت: خوشکم نە شەشی تو، نە نۆی من، حەفت هێلکە بە درهەمەکی. ژنە ڕازی دەبێت دەچێت هێلکان بێنێت، ژنە دەستێکی لەگەڵ سەری دەباتە ناو کۆریتی بۆ هێلکەدەرهێنان، خۆشناو ئەو فرسە تەعیزە لە دەست نادات،

پەلاماری ژنەکە دەدات کاری خۆی دەکات، دواتر هێلکان دەکڕێت و دەڕوات.مێردی ژنە دێتەوە ژنە دەڵێت مێردە ئەوڕۆم خۆشناوەك تراند حەوت هێلکەم بەدەرهەمەکی دانێ، کابرا دەڵێت کچێ ئەتو دەڵێی چی خۆشناوی ئەتو .......یە ژنە دەڵێ: وەلا ئەگەر سەرم لە ناو کۆریتی نابوو، خۆشناو گوی دەخواردپێی دەکرا ئەمن ......... یێ) کابرا دەڵێت کوسەگ بابی خۆشناو ئەوەشی کردوە !

*** *** ***

کابرایەکی دەشتێ لەسەر جۆخینی خەریکی کاو و دان لێك دەرکردنە، بۆ لای سۆرەی گەنمی دەچێت پێ لەبێژنگ دەنێت بێژنگ کێل دەبێتەوە و وەسپیلکی لاقی دەکەوێت، زۆری دێشێت کابرا تووڕە دەبێت پەلاماری بێژنگ دەدات بە هەموو هێزی خۆی بە ئەرزی دادەدات بێژنگ هەل دەقۆزێتەوە بەنێوچاوانی کابرا دەکەوێت کابرا سەری گێژ دەبێت لەدوورەوە پەلاماری بێژنگێ دەدات و خۆی بە سەردا دەدات، ئەوجارە سێ پەراسوی دەشکێن، وەزعی زۆر خراپ دەبێت، مام خۆشناوێك بەوێ دا تێدەپەڕی بانگی دەگات دەڵێت: هۆمام خۆشناو وەرە بێژنگێ کوشتم، مام خۆشناو دەچێتەلای دەڵێت چت لێ قەومایە برا، کابرای دەشتێ دەڵێت: مام خۆشناو پێشی هەموو شتی وەرە ئەوبێژنگەی پارچەپارچەکە بەخەنجەران ئەوجا قسەت لۆدەکەم. خۆشناو وا دەزانێت کابرا شێت بووە، دەڵێت بیسمیلا کابرا ناوێ خوای بینە، کابرای دەشتێ دەڵێت: کوڕە خۆشناو شێت نیم بێژنگی ئەو هەو ئەو هەی لێ کردیمە، مام خۆشناو کابرای سواری کەرێ دەکاو دەی گەینیتەوە ماڕێ.

*** *** ***

مام خۆشناوێك بۆ گەنم کڕین دەچێتە گوندێك لە دەشتێ، جۆخینێك لەتەنشت گوندیە ئەچێتە سەرجۆخینێ لەگەڵ کابرا ڕێك دەکەوێت گەنم دەپیون و دەگوشان دەکەن، کابرای خۆشناو دەگەڕێت شوژنی دیار نییە دەڵێت: وەڵڵاهی وێ ئەچی شوژنم لێ کەتییی روو لە کابرای دەشتێ دەکات و دەڵێت: خزم شوژنت وێ نییە کابرای دەشتێ دەڵێت بڕۆ لەکن ژنێمن بینە، وەی بڕێ بتداتێ، کابرای خۆشناو شەیتان دەبێت دەڵێتە ژنەتیمێ مێردت وەگۆ بتداتێ، ژنەش تووڕە دەبێت دەرێت کوڕە ئەتو ناکەی پیاو بێ مێردم کوواڕێ بدەمێ خۆشناو دەڵێت دەبانگی کە ژنە دەڵێت هۆ

فلان کو بیدەمێ کابرا دەرێت بیدێ بیدێ، قەیناکە ژنە دەچێتە ژووری و خۆشناو کاری خۆی ئەکات دواتر دەلێت: دەشوژنێشم وێدە شوژن دەبا و کاری خۆی رێك دەخات و دەروات نیوەرۆ کابرای دەشتێ دێتەوە مالێ بۆ نانخواردن لەسەر نانی ژنەدەرێتە پیاوەکەی ئەری پیاوەکە ئەتو ئەورۆ شێت بووی لێت تێك چوبوو کابرادەرێ لۆ وارێی ژنەدەلێت وەت نەگۆ بدە خۆشناوی خۆشناوم تێبەربووخەریك بوو بم خوا، کابرا دەلێت: یانی چی خۆشناوت تێبەربووژنە دەلێت کورە خۆ ئەتوهێرنیت، خۆشناوم سوار بوو، کابرادەلێت: لۆ سوارت بوو، ژنەدەلێت: ماری تو خراپی وەت نەگۆ بیدێ، کابرادەلێت ئەمن وەگۆ شوژنێی بدێ خۆ وەم نەگۆ دەسەرەخۆی بمردە،کابرای دەشتێ دەست دەکاتەتفەنگێ و سواری ماینێ دەبێت دەرێت راوەستە داکێت دەگێم خۆشناو، زۆر دەگەرێت خۆشناو نابینێتەوە، تومەزانە خۆشناو کەتنی خۆی کرد بوو، لاوونیو خۆی ئەکەندێك مات کردبوو، تاکوشەوێ شەو بۆی دەردەچی .

*** *** ***

کابرایەکی دەشتێ سەردانی برادەرێکی خۆشناو دەکات مام خۆشناو لەگەلێ مالەوە دەکەونە ئەگبیر، چ خواردنێك بدە نە کابرای دەشتێ لەسەر ئەوە رێك دەکەون، شیری بدەنێ، ئێوارە قاپەشیرێك لەبەردەمی دادەنێن،خۆشناو دەلێت: کاکە هەرچەندی فکرن لێ کردەوە چت بدەینێ شیر لە هەموویان باشتر بوو، بابی هەموانە دەبخۆ. کابرای دەشتێ دەخوات دووای ماوەکی خۆشناو دەچێتە دەشتێ و شەو دەگاتە بەردەرکێ مالی برادەرەکەی لە درگا دەدات کابرای دەشتێ دەلێت: کێی جنابت؟ دەلێ منم برادەری خۆشناوت. دەلێت بەو نیوەشەوە چت دەوێ؟ دەلێت هاتیمە لاینگۆ ئەمەوێ مندالان ببینم. کابرای دەشتێ شیری لەبیر ناچێت کیری لە کونی دەرگا دەردێنی و دەلێت پێوست ناکات بیان بینی ئەوەی ببینە بابی هەموانە.

ئەوچیرۆك و بەسەرهاتانەی نێوان خۆشناو و خزمانی دەشتی هەولێر ئەوەندە زۆرن، لەژمارە نایەن، لە گێرانەوەی ئەو بەسەر هاتانە تەواو نابن، وە ئەخزمانی دەشتێ تورە دەبوون، ئەمام خۆشناویش لە هەمان کات دۆستایەتی و خزمایەتی و خارو خوارزایەتی هەبووە هەردولایان تەواو کەری یەکتربوون، بۆ بەردەوامبوون لە ژیاندا بەشێکی زۆر لە خەلکی خۆشناوەتی کاتی دروێنە دەچونە لای خزمانی دەشتێ بۆ سەپانی بەدەیان ژن وژنخوازی هەبووە لە نێوانیان، ئێمە خاروخوارزاین، یەکێك لە گورانییەکانی خۆشناوان کە دەچوونە دەشتێ هەولێرێ، ئەگەر هەناریان پێبان لەرێگا دەستیان بەگۆرانی گوتن دەکرد، وەك:

هۆی هەنار و هۆی هەنار
وڕێیتم چوار باری هەنار
بەو دەشتەی دا چومەخوار
هۆی هەنارو هۆی هەنار
........................
ئۆی لەبەر هەناری شوشێ
ئۆی هەنار پڕ بەکۆشێ
هەتا هەنار نەفرۆشێ
بارناکەم لەکەردۆشێ
ئۆی هەنارو ئۆی هەنار
........................
هۆی هەناری سۆری قورمزی
ئۆی هەتا هەنار نەرزی
تاماچ نەکەم جوانێ چل کەزی
بارناکەم لەکەر دزی
هۆی هەنارو هۆی هەنار
........................
هۆی هەنار وهۆی هەنار
هۆی هەناری خۆشناوان
چەند جوانە لەبەر چاوان
کلی نابرێت لەچاوان

هۆی هەنار و هۆی هەنار
........................
هۆی هەنار و هۆی هەنار
ئۆی هەنار لەکەرێ شینە
چەند گەرمایە بەوهاوینە
یار لێم دەکات باوەشینە
هۆی هەنار و هۆی هەنار

کورە یارم ناوی هەمینە
بسکی لەسەر سینگینە
چەن جوان وگران و سەنگینە
هۆی هەنار وهۆی هەنار

وەی هەنار وەی هەنار
وەی هەناری نازەنینێ
رێم کەتە لای دیوینێ
وەختە لۆت بمرم
گیشەکەرێ سەرجۆخینێ
وەی هەنار و وەی هەنار
........................

وەلە و هات و چۆیە لەنێوان خۆشناوان و خزمانی دەشتێ زۆر بابەتی فۆلکلۆری بەرەو دەشتێ هەولێرێ چووە بەپێچەوانەوەش نمونەی دووناشقی غەدر لێ کراوی دەشتی هەولێر بەناوی (کەریم و ئەستی) کە بەدەستی کەسێك کوژراون بەناوی( برایماغا ) ئەوبەسەرهاتە زۆر بەربڵاوە لە خۆشناوەتی لەکاتی دروینە دەگوترێت ئەشکرێت کەم و زیادی تێکەوتبێت لەو هات و چونە

## خۆشناو و دز و دۆشاو

س بەو شێوەیە گوێم لێ بووە لە مام حاجی مستەفای شرێمکی کە ئێستا تەمەنی نزیکەی ـحت ساڵە:

کە سەرێ من دێشی	بابچینە حسارۆکان
هۆبرا سەرێ من دێشی	لۆ ڕۆژێ لێقەومانێ
عرەێ لەدرێم هەوایە	پۆلیسن دێنە ئاری
هەرچی ئەستی برێ	قەومایە براقەومایە
کە ریم دەرێ وایە	لەبرایم خان قەومایە
هەت وەختی جۆخینان	لانک لەزێرو زیوی
کەریمی ( ئەستی) هینا	کورتێدبەجێما یە
ـعالەمێ مەشوورە	باب دەرێ مەگری
کریم و ئەستی	داك خراپوو هەرگیایە
ئشقی ئێکد ینە	ئەوقەومەی حسارۆکان
کلێ سەید عوبێدی	قەومی سەگ ساری
هۆبرا لەبن کەنداری	قاقەزەکیان نوسی
ئەستی چاوان لێمەشۆ	بەمەلا و موختاری
ئەتو مجبووبێکی جوانی	لۆم وە برێنەبرایمی علۆی
ئەستی لەحەوشێدا بوو	بێتن بەخۆی و خزمەکانی
کەریم لەپشت دیواری	برایم هەستا لەخەوێ
ئەستی دەرێت هۆ کەریم	گۆتی چقەومایە
دەبا بڕۆین لێرانە	گۆتیان ئەستی هەرگیایە
هەموعالەمێ پێزانی	برایم درێ خۆ ئەمن چخەمم نینە
کەریمی ئەستی برد	ئەو تفەنگەم لۆ بینە
هۆبرا بردیە ئاقاری	کەریم و ئەستێ ئەمن کوشتیمە
لەوێندەرێ بەر ڕێبوون	گوتیە کورۆ و کارێ سیاوی
گەیشتنە بەر هەولێرێ	ڕەختەیان لەخۆ بەستن
ئەستێ گۆتەکەریمی	ڕەختەی جام بێزاری

هەروایە کاکە وایە ئەشتاقت لەپێشنینە
شەڕە لە گۆڕێ پاشایە کەریم دەڵێت ئەستی
ئەستی دەڵێت کریم هەندەی دیش بن
مەولوود حفای بکوژە هیشتان لۆ من چنینە
فتنی دەچاواندا دایە غیرتم بەرنەدایە
ئەستی دەڕێت کریمە فیشەك دەتفەنگێ پسا
دەستێخۆ هەربینە خوا نگبەتی هینا یە
غیرەتێخۆ بنوینە تورمبیلەك ژێرهەرات
ئەوا بەدروایی مەوەنە وای زانی عاوینە
جۆت جۆتیان هەروەرینە نەی زانی برایماغەیەو
دەی هەمان بکوژە کافرێکی بێ دینە
هێك بابوو برایمن نینە هەری کێشا دەبانچە و
ساڵح و سلیم عەلۆ دوو یخسیری کوشتینە

بەڵێ کەریم و ئەستی بەدەستی برایما غە دەکوژرین ئەشقیان ژێرخاك دەکرێت.

لە حوکمڕانی مەلەکیەت سەربازی ئیجباری بووە، لەخۆشناوەتی قسەیەك هەبوو دەیان وت پیاو تاکو نەبێتە سەرباز نابیتە پیاو هۆیەکەی زەبتی سەربازی بووە، منیش لەگەڵ ئەوقسەیەم، پێم وایە حکومەتی هەرێم پێویستە بەرنامەی هەبێت ئەگەر بۆسێ مانگیش بێت گەنجەکان بکاتە سەرباز، چونکە رێزم هەیە بۆ گەنجان بەشێکی زۆری گەنجانی ئەمڕۆ شلوشەوی بەبوغز و بەنازو و بەشێکیان خۆیان ناناسن، کەوا بوو رێز بۆماڵەوەیان وەك دایك وباب و براگەورە دانانێن، رێز لەیاسا ناگرن وەك پێوست، رێز لە مامۆستا و دکتۆر و ..تاد کەوابوو منیش لەگەڵ قسەکەی باب و باپیرانم هەرکەسی نەچێتە سەربازی بەتەواوی نابیتە پیاوێکی گورجوگۆڵ و زۆرشتی تر. ئەگەر بۆسێ مانگی هاوینیش بێت پێویستە حکومەتی هەرێم گەنجان بکات ەسەرباز هەرکەسێك سێ مانگ سەربازی نەکات لەزانکۆ وەرنەگیرێت. لە سەردەمی کۆماری مهاباد خەڵکی خۆشناوەتی بەشە داری خۆیان بردووە بۆ ئاگری مهاباد زۆر و کەم لەوانە مستەفا خۆشناو رەحمان شێخ وەسانی و مەلا سەلام بێتواتەی زۆری تریش... لەدوای

ـۆوخانی کومار پارتی هیوا له هەموو و کوردستان له خۆشناوەتیش گه شه دەکات، یەکێك ـە کادیرەکانیان بەناوی محەمەد سۆفی ئەحمەد بووە، دواتر له چیای هەیبەت سولتان شەهید کرا بەدەستی حەرەس قومیەکان، تەرمی پیرۆزی شوێن بزرکرا.

*** *** ***

پیش سالی چلەکان لەزۆربەی گوندەکان خزمانی( جوولەکه ژیاون) بۆ نموونه لەبالیسان چەندماڵێکی لێ بوو، وەك ( فرایم) خێزانی ناوی (رەندە )بووە، کچێکی ناوی( مەخمەر) بووە، یەکێکی تریان ناوی (ئیلیه)بووە، خێزانی ناوی (مریەم) بووە، کوڕەکانی ناوی ( داود) هۆشێ ) پیە) کچی ناوی (ئەستێرە )بووە، کەسکی تریان ناوی شەموولە بووە، کوری ناوی( قێچێ ) کچی ناوی( کحێ ) بووە، کەحێ موسلمان دەبێت، مەغدیدی کوڕی کێخوا حەسەنی شێخوەسانان ناوی دەگۆرێت ناویان لێنابوو ئامینە، دواتر تەلاقی دا لەترسی ئەوەی خەلکی بەمنالەکانی بلێن بن جوو، پێش گەڕانەوەیان دووکەس له بالیسان بەناوی عەولای بەکری و خدرێله ئاگر لەماڵی فرایم بەردەدەن کچەکەی فرایم که زۆرجوان بووە و لەتەمەنی جوانی بووە، لەو ئاگر بەردانه مالیان دەسوتێت و مەخمەریش بەسەختی دەسوتێت و دواتردەمرێت... هۆی ئاگردەماڵ بەردانیان ئەوەبووە: داوای رانکوچۆغەری بەلاشیان له(فرایم) کردبوو، ئەویش وتبووی بەلاشتان بۆ دروست ناکەم، لەکاتی ناشتنی تەرمی( مەخمەر ) دایکی مەخمەر بەکچەکەی هەلدەلێت و دەی لاوێنیتەوە دەلێت:

هۆ هۆ هۆ زۆزۆ مەخمەرێ
ئەتبەنه گۆردیوانێ برندونەوێ
پێی وەکرایه ئاوێ دێمکەی ساردوشەوێ
ئەگەر لێت نەگەران خۆ فجورکه کنشتێ
ئەگەرهەرلێت نەگەران خۆفجورکه بەهەشتێ

---

بچووکی خزمانی جوو بەرانبەر گۆردیوانییه گۆردیوان دەکەوێته نێوان بالیسان و کانی بەرد فجور لاسایی کردنەوەی کەوە که لەسەرشاخ خۆی فرێدەدات دەلێت فجوق واتەوەك کەو پەلاماری بەهەشت بدە.

ئەکرێت لێرە شتێك باس بکەم خدرلە پیاوی یەکێك لەئاغاکانی خۆمان دەبێت هەموو کەسیش زانویەتی خدرلە ئاگری دەومالە بەرداوە، کەسیش نەی وت خدر لەپشتی چاوت دوو برۆ هەیە! زۆرجار ئاغاکانمان ئازایانە بەشانازییەوە جووی یەکتریان کوشتوە تەقەی سەریشیان هاتووە، لەهەمان سالّ دەنگۆیەك پیەدا دەبێت کە جووەکان دەبەنەوە ئیسرائیل، لە گوندی بێراوە کەسێك بەناوی حوسێنی حەمەدی مام عەمەری خەون دەبینێت، لە خەونی هەرچوار خەلیفە ئیسلام دەبینێت بەجلوبەرگی سەربازی دەڵێن برۆ ( ئێلیە ) جوی بالیسان بکوژە پیغەمبەر زۆر بەئازارە لەدەستی ئێلیەجوو، حسێن دەڵێت ئێلیە بەمن ناکوژرێت ئەگەر بە عەولاسۆری شێخوەسانان نەبێت، هەرچوار خەلیفە دەڵێن: عەولاسۆر دەناسین برۆ پێی بڵێ بچێت ئێلەجوو بکوژێت، حوسێنی حەمەدی بەیانی زوو دەچێتە شێخ وەسانان خەونەکە بۆ عەولاسۆر باس دەکات عەولاسۆر دەست دەکاتە چەکی و بەرەو بالیسان دەچێت، عەولاسۆر دێتە سەروی مالآن ئێلیەش خریکی گەڕانەوەون، بە مالآن دەگەڕێت بۆ دروا مالێ ئاوایی یەکجاری عەولاسۆری شێخ وەسانان پارێزی بۆدەبا و ئێلیە بەسەختی برندار دەکات گولەیەکی لە ڕانی دەدات ئێلیە بە پشتی ئێستر بەرە و هەولێری دەبەن لەوێش چارەسەری دەکەن و دواتر بەرەو ئیسرائیل چوون، دواتر باسی هەندێك بەسەرهاتی عەولاسۆردەکەین .

لەگوندی زێوەی خۆمان کەسێکی لێ بووە بەناوی (سەید محەمەد زێوەیی) پیاوێکی سەیرو سەمەرەبووە نامەوێ وەسفی بکەم زۆرحەزی لەچەك هەلگرتن بووە ڕۆژکیان لەگۆڕێ( سایێ) کە دەکەوێتە نێوان چیای کەپرە و ئاراسن، دەگاتە دوو برا و خوشکێکی جوو، کە بەنیاز بووینە بگەڕێنەوە ئیسرائیل دەست بۆ چەکی دەبات و هەردوو برایکە دەکوژێت، داوا لە خوشکیان دەکات موسلّمان بێت، مارەی بکات، خوشکەکە لەتاوی کوشتنی براکانی پەلاماری دەدات چەکی لە سەید محەمەد بستینێت و سەید بکوژێت، سەید گولەکیش لەسەری خوشکەکەیان دەدات، ئێستاش تەرمی پیرۆزی ئەو غەدر لێکراوانە لەگۆڕێ سایێ بەخاك سپاردراون، دوای ماوەیك ملا ئیبراهیمی گوندی بێراوە کە مەلایکی زیرەك و پیاوێکی باش بووە، ئەو کارەساتە دەزانێت... ڕۆژکیان مەلائیبراهیم دەچێتە گوندی شیەی سەروو سەردانی ملامەحموود شیەیی دەکات و لەوێش دەڵێت مەلا مەحموود بابچینە گوندی زێوە سەردانی سەید عەبدولڕەحمان بکەین سەید عبدولرەحمان پیاوێکی باش بووە بەرەو زیوە دەڕۆن، مالّی سەید محەمەد لەسەر ڕێیان دەبێت لە مێرگەپانێ مەلا ئیبراهیم کوشتنی سێ جووەکە دەزانێت کە سەید محەمەد کوشتوونی، پێی

بلش بووه سەردانی بکات و ئامۆژگاری بکات کە جوو کوشتن لەئایینی ئیسلام دروست نییە، ئەگەر میوان بن و بەرئەمرت بن، مەلا ئیبراهیم دەڵێت مەلا مەحموود با سەردانی سەید محەمەد بکەین هەندێك ئامۆژگاری بکەین، ئەو کارەیان واجبە بەرەو ماڵیان دەچن سەیر دەکەن سەید محەمەد داس دەسوێ دوای سەلام و کەلام مەلائیبراهیم کوشتنی جووەکان باس دەکات، دەڵێت: سەید ئەتو نابووا ئەوجووانەت کوشتبان، شەرعی ئیسلام رێ نادات، سەید محەمەد راناوەستێت تاکو مەلا ئیبراهیم قسەکانی تەواو بکات، بەداس پەلاماری مەلا ئیبراهیم دەدات و دەڵێت مەلا وسبە نۆ جووم کوشتینە ئەتووش دەکوژم دەبنە دە! مەلا ئیبراهیم هەڵدەستێت و دەڕۆن بەرەو زێوە سەید بەجێ دێڵێت، سەید نیازی بووە

مەلا ئیبراهیمیش بکوژێت، کە جووکوشتنی بە تاوان زانیوە، کەوابوو بەشێك لەمەلا یانی زیرەك و بەتوانا جووکوشتنیان بەتاوان زانیوە، سەردەمێك لەنێوان دوو بنەماڵەی ئەمبێژریان لەبالیسان جووکوژراون، ئاغەکانی رۆژئاوا جووەکانی رۆژهەڵاتی بالیسانیان کوشتن، وە بەپێچەوانەشەوە ململانێی یەکتریان کردووە، لەوناوە جووەکان بووینە قوربانی هەندێك شت، رووی داوە لەرابردوو، ناکرێت ئێمە ئێستا شینی بۆ بگێڕین، چونکە ئەو کوشت وکوشتارە لە ساڵی چلەکان بوو، ئێمە لە نۆهەدوچوار یەکترمان دەکوشت لەسەر حزبایەتی، کەوابوو ناکرێت لۆمەی رابردوو بکەین وازبینین باشترە دەکرێت پەند وەرگرین لەداهاتوو یەکتر نەکوژین و رێز لە و کەسانە بنێین کەباوەڕیان بە ئایینێکی ترە، ئەوەیان گرینگە نەوەك فرمێسك ڕشتن بۆ دوێنێ، وەك برایانی مەسیحی و ئێزیدی و سامی و لەبن هەرناوێك بێت پێوستی بەرێزە وەك مرۆڤ .. شەرمە توانای کەسێکت هەبێت شەڕی پێ بفرۆشێت، یان بیەوێت لەژێر سێبەری تۆ بحەسێتەوە، چاوی لەوە بێت تۆ بیپارێزێ زۆرشەرمە ئازاری دەی پیویستە ئەوەندە رێزی بگرێت شەرم لەخۆی بکاتەوە، هەر ئەوەندم لەدەست دێت داوای لێبووردن لەخزمانی جووبکەین بیرکردنەوەی ئەوکات وەك ئێستا نەبووە، ئەگەر بەو پاساوە رازی بن لێمان ببوورن سوپاسیان دەکەین.

لە ساڵی پەنجاکان مووچەخۆر نەبووە، لەخۆشناوەتی تووتن چاندن هەبووە، بازاڕی زۆر خۆش بووە، تاجیرەکانی موصل زۆربەی توتنی ناوچەکەیان دەکڕی لەو زەمانە عارەب و وشتر سەیر نەبووە. لەخۆشناوەتی و دەوروبەر وەئەشقیاکان لەسەر کاری خۆیان بەردەوام بووینە ناوەناوە عەرەبەکانیان روت دەکردەوە. عەرەبەکان دەبووایە پارەی ئەو کەسانە بدەن کە توتن بە وڵاغ دەگوازنەوە وەچەندان کەسی باوەڕ پێکراوی چەکدار بە کرێ بگرن یان هەر ئەوکەسەی توتنی

دەگواستەوە ئەگەرچەکی پێبا ئەوە پارەی چەکیشی وەر دەگرت. من گوێم لێ بووە زۆرجار تاجیەکان لەترسی ئەشقیا پارەیان لە ناو کورتان و هەتا لەکۆمی کەریشیان شاردیتەوە.
کێشەیەکی تر هەبوو قەدەغەکردنی توتن بەقاچاغ، زۆرجار شەڕ دروست دەبوو لەنێوان قاچاغچییانی توتن و پۆلیس، زۆر جاریش لەنێو خۆیان رێك دەکەوتن، پۆلیسەکان بە برێك بەرتیل رازی دەبوون، زۆرجاریش پۆلیس لە بن باڵی یاسا غەدرێکی زۆریان لەجووتیاران کردووە، گەلێك جار جووتیاران پۆلیسەکانیان کوشتووە، ئەتوانین نموونێك بێنینەوە:
کەسێك هەبووە بەناوی( خالید بەگ ) لە گوندی بالیسان پۆلیسێك زۆر غەدر لەخەڵکی ناوچەکمان و لەمام خالید دەکات و بێزاری دەکات، رۆژێکیان مام خالید لە کاروانی دێتەوە و دەڕوا بەرەو سەرزینی خۆشناوان لەدوورەوە ئەوپۆلیسە غەدارە دەبینێت، چەکی لەشانی دێنێتەخوارێ و سواری دەکات وردە وردە دەگاتە پۆلیس و چاکوچۆنی لێ دەکات و دەڵێت کاکی پۆلیس ئەگەر کەسێك غەدری لەکەسێك کرد،چی بکات باشە؟ پۆلیسەکە دەڵێت ئەگەرتوانای هەبێت واباشە تۆڵەی خۆی بکاتەوە ئەگەرنەشی توانی ئەوە بەردەوام غەدری لێ دەکرێتەوە! مام خالید لوولەی چەکی تێ دەکات و تەقەی لێدێنی و پۆلیس لە ولاغ بەردەبێتەوەو دەمرێت مام خالید کەرەکەی بەجێ دێلێت و بەرەو بالیسان رادەکات و بەخەڵکی ناوچەکەش دەڵێت: ئەوپۆلیسە زاڵمە تۆپاند، دواتر بەرەو کوردستانی رۆژهەلات دەچێت، خەڵکی ناوچەکە زۆر دڵخۆش دەبن بەزانینی کوشتنی ئەوپۆلیسە بەدەستی مام خالید، کەرەکەی مام خالید سەرگەردان دەبێت، لەخۆشناوەتی وردەوردە خەڵکی دەزانن ئەو کەرە کەری مام خالیدە، چەند کەسێك بڕیارێك دەدەن دەڵێن: هەرکەسی کەرێ مام خالیدی لەناو بەروبوومەکەی دەر بکات هەرامەی کەرێ مام خالیدی تێ، کەرێ مام خالیدی لەخۆشناوەتی دەناسرێت بۆ ماوەی سێ ساڵ وەك بەرانی سوڵتان عەولای بەغدایێ کەس ئەو کەرە دەرناکات لەناو بەروبوومی، ئەوەی من زانیومە کەرێ مام خالید چووتە سەرجۆخینێ و دەستی بەگەنم خواردن کردووە، خاوەن گەنمەکە دەری نەکردوە، با پشویەك بدەین بێینەوە سەر حەیران و حەیرانۆك و چیرۆك...

حەیران کیژۆرێ لەدەو رووباری
ناوقەد باریکێ ناو قەد شمشاری
بەچاوێمن لەهەمان جوانتری
لۆخۆم لێ هەرگرتی لەناو هەزاری

خۆشناو و دۆ و دۆشاو

حەیران دەڕێم لەچیایان لەچیاکەی دێمێ
لە نەوریانم وەرە و لەبرندانت دێمێ
ڕەبی گوارەت پیرۆزبن لەگەڵ خەزێمێ
لەبەر لۆمەێ خەرکی نەوێرم دوو قسانت بڕێمێ

---

حەیران دەشتێ بالیسانێ لەمن گەلەکەشینە
کێلێ کوێستانێ لەمن کەوی کەوی نە
حەزلێ کردنێ خەرکی بە سارو مانگە
ئێمن و کوڕەتیمی لە مردن و ژینە

---

حەیران دەڕێم لە چیوە و چیوان
کەرەبابەك دەخوێنی هەموو پاشیوان
خەبەرەکی بدەنە کوڕە لاوی من
داخوازیم دێن نوێژێ شیوان

---

حەیران پیر بوویمەو درم گندۆرە
سەربسکم چوینە ماینە وردە خەزەرە
دایکێ حەفت لانکی ساوام تازەم گۆنەرە
واتە هەرچەندە پیریم پێوە دیارەو بسکم هەروەێنە و خاوەن مندالم، بەلام لەدلدا وەك کچێکی چاردە ساڵ وام

---

حەیران لە گۆڕێ گۆڕێ پایە
باران دەبارێ خونا و لەگیایە
ئەگەر لاوی من ناس ناکەن
ئەوەهات دەپێش میگەن دایە

---

حەیران دەڕێم ناوەلا لە بالیسانێ
ڕەشە ریحانم چاندن لە تریانێ
سۆرە گور گەیشتنە هەیوانێ
چ بکەم حەیف و مخابنێ دنیاێ

کوڕە لاوی من حەپس کرایە لەدیوانێ

حەیران دەرێم لە دزۆرێ قەشانێ
قۆشمەێ سوارن گەیە بالیسانێ
سۆرە گورم چاندن لەتریانێ
رەشە ریحان گەیشتنە هیوانێ
رەبی ئەوکەسە کۆرەبێت زمانی لێدای
کەکەتیە بەندو حەپسخانێ

حیان دەرێم لەدزۆرێ خۆشناوان
یاخوا تازی نەبرێ لە مارەباوان
ئەمنی دای پیرە مێردەکی
کۆرەیە لە هەردوو چاوان

حەیران دەرێم لە زێوە و هەرتەلان
خۆزگەم بەوێ ڕۆژێ بێری بووم لە بەر مێگەلان
رەبی مەلا کۆرەبن مارەیان کردم لە کەچەران

حەیران لە شیرە و شیان
وەرن بم کوژن بەشیان
حەوت سارە پاوانێ کوڕەلاریمە
ئەورۆ داخواز یم هاتینە لە کوڕەمیان..

کوڕە حەیران مردم رابردم
فرمێشکێ چاوان ڕەگ و ڕوو بردم
ئەوە ماوەی دوانزە سالە لە
کن گولەی هەر بەتاخ و دەردم

حەیران چویە شارەکەی کاولە موسرێ
کراسەکت لە من تاوبوولەچیتی مەخمەرێ
کوڕ دەلێت سەبرەکم لێ بگرە تادەچمە شارەکەی پیرە موسرێ

تفەنگیٚ سەر ملانت لۆ دەدەم بە گوارە و خەنجەریٚ بەر پشتیٚت لۆ دەدەم بە قەنەفریٚ،
کچ دەڵیٚت: کورەتیم ئەگەرتفەنگیٚ سەر ملان لۆمن دەدەی بە گوارە و خەنجەریٚ دەدەی بە قنەفریٚ
رەبی بیٚتە سۆتکە و بە سەر مەیتی من وەرکریٚ

---

وەپیٚشینان ئاماژەیان بە شتیٚکی جوان کردووە پیٚمان دەڵیٚن وریابن هەموو کوڕ پیاو نینە وە هەموو کچ (ژن نینە) ژنیٚك بەو شیٚوەی خوارەوە گلەی لە کچان دەکات دەڵیٚت

حەیران دەرێم تیتیٚ بەتیتیٚ
کچیٚ گوندیٚمە کەرەك کەوریٚتیٚ
هەر کوڕەتیمەکیان دی
وا ئەزانن پیاوە حەزیان دەچیتیٚ

کوڕێك گلەیی لە خۆی دەکات کەوا کەسیٚکی نەزان بووە لە ڕابردوو دەڵیٚت:

حەیران دەرێم لەچۆم و مەمان
چاردە دۆستم هەبوون بەهەمان
لەسەر بیٚ ئەقڵیٚ خۆم
لە هەمان هیٚکم لۆ نەمان ... هیٚکم: هیچیانم

---

حەیران ڕۆژیٚ بوارانم لیٚ ڕابردن
شەویٚ پایزان لیٚ هەربردن
بەخۆم کوڕەتیم حەیرانی
تیٚر قسەن پیٚکەوە نەکردن.

واتە بەو ڕۆژە دریٚژانەی بەهاریٚ و بەشەوە دریٚژانەی پایزیٚ من کوڕەلاو لەیەکتر تیٚر نەبووین، لەگفتوگۆ شەوانی پایزیٚ زۆر کورت بووینە و ڕۆژیٚ بەهاریش کورت بووینە، بریا دریٚژتربان بۆ ئەوەی تیٚربیا ین لە گفتوگۆ، دیارە لە کاروباری جووتیاری هەموو کاریٚك

**گۆرانی خۆی هەبووە، تاکوو مردنی ئازیزانیش کە خوشکان دەستارپیان لێ دەکرد گۆرانی خۆی هەبوو**

**وەك :**

**گوندەر گوندەر بایی بینە**
**لەتارانێ رەنگینە**
**سەرمەمکان بهەژینە**
**دەرکو بانان برشینە**
**جەرگێ لاوان دەرپینە**
**پردێ سەر رێێ ئۆ کێ لەسەرە**
**دوینێ ئێوارێ حەمەد لەسەرە**
**سێر قەیتان و شەدەلەسەرە**
**ئەمنیان بەمێردا و ئەو بێخەبەرە**
**لەپشت مارێمە رمبەدێ**
**لەبەر مارێمە رمبەدێ**
**نێکێ ئاغەی کەمەر لێدێ**
**سینگێ ئاغەژنێ شەڕ لێدێ**
**مەگرە مەرجانە مەگرە مەرجانە**
**پوش و پەراش و داروجانە**
**یاخوا پیرۆزبێ لەو دووانە**
**زاوا کەچەرە و بووك بێدرانە**
**مەڕ لە هەوێزێ هاتە پەرێزێ**
**شەدەت بۆدەکرم شەدەی تەورێزێ**
**ئەمنت لەبیر کرد هینات زیزێ**
**هەرینوی لەبن سێبەرێ (گوێزێ).**

**لەو دوابەندە،کچ توك لە کوڕە دەکات کە ئەوی لەبیر کردەوەو مەیلی کچێکی تری کردوە و کردیتیە کابانێ مارێ**

دەڵێت: یاخوا هەر بنوی لەبن سێبەریٚ گوێزیٚ، کورد لەمێژە دەڵێت: لەبن سێبەریٚ گوێزیٚ مەنون خراپە بەشێوەیەکی جوان باسی دار گوێز دەکات. دەڵێت: کەسێك لە بن داری گوێز نووستبوو مارێك ویستی بچێت بەکابرای نووست و وەبدات، دار گوێز وتی: مارە پێی وەمەدە من پێم وەداوە. تووکی ئەوکچە کە دەڵێت: یاخوا بنوی لەبن سێبەریٚ گوێزیٚ، واتە گوێز وەك مار پێت وەبدات سەیرە، کورد هەزاران ساڵە دەزانێت داری گوێز لە لە گەڵاکانی ژەهر بلاو دەکاتەوە، بەدەورو بەری کەزەرەری بۆ مرۆڤی هەیە.

*** *** ***

دوو ڕووداوی عەولاسۆر باس بکەین: عەولاسۆر شێخ وەسانی کەسێکی بەبەژن وبالاو دەموچاوێکی شێرانەو چاوشین و رەنگ و روویێکی سۆر و جوان و پۆشتە لەتەواوی ژیانی خۆیدا، دیارە عەولاسۆر ئاشقیابوو، وەك ئاشقیاکان، دە بووایە خۆی بژینی وەك چەك وتەقەمەنی و ئیدارەی ماڵ و منداڵیش، دواتر لەکێشەیەکی کۆمەڵایەتی لە گوندەکەمان کەسێك دەکوژێت، دەچیتە ئامۆکان لای خزمەکانی ئێمە و لەویٚ ئیدارەی دەدەن پێی دەڵێن: دووشتت لەسەر ئێمە، یەکەم: لەحکوومەت دەت پارێزین . دووەم: لەسەرمان و باوباران دەتپارێزین، ئەوەی تر لەسەر خۆت واتە هەمووپێداوستییەکان دەبێت خۆت خۆت بژینی وەناویشی لیٚ دەگۆرن مام عەولاسۆر، دەبێتە، عەزیز خۆشناو، لەوەڵام دەڵێت باشە دیارە وەك بەشێك لەوان خۆی دەژینی بەتایبەتی کە خزمانی هەرکی دەچونە کوێستان و دەگەرانەوە ئەوکەسانە دەبووایە ژیانی خۆیان دابین کردبا، لەوانەی وەك مام عەولا بوون سەرەتا وادەزانن عەزیز خۆشناو زۆردەست و پیٚ سپییە دواتر بۆیان دەردەکەوێت لەوانیش شارەزاترە و لەوانیش ئازاترە شەوێك لەگەڵ خۆی دەبەن لەدوور مێگەلێکی خزمانی هەرکی، دەڵێن عەزیز خۆشناو تۆ لێرە چاوەڕێمان کە و ئێمەدەچین مەڕان دەدزین، ئەویش دەڵێت باشە بەرەو مێگەلەکە دەچن شوان هەستیان پیٚ دەکات و دەڵێت دزینە بگەڕێنەوە ئۆبالٍ بەملی خۆتان دەتان کوژم. دزەکان دەگەرێنەوە لای عەزیز خۆشناو دەڵێن: عەزیز بابڕۆین، عەزیزخۆشناو دەڵێت بۆ بڕۆین دەڵێن ئەوکابرایە بەخەبەرە و چەکیشی پێیە، عەزیز خۆشناو دەڵێت: ئێوە لێرە بووەستن من دەچم مەڕان دینم و دێمەوە، عەزیز خۆشناو دەچێت لەنزیك مێگەلە مەڕ خۆی رووت دەکات و بەروتی بەرەو لای مێگەلان دەچێت و سەگەکان لەروتی مام عەزیز خۆشناو ڕادەکەن خۆی دەگەینیتە ناو مەڕان و دوو مەڕ دێنێت ودووبارە دەچێت دووی تردێنێت سێبارە دەچێت دووی تردێنێت برادەرەکانی سەریان سوردەمینێت لەوکارە، بەولاوە

دەیکەنە میری خۆیان ئیتر دەسکەوتەکانیان ڕۆژ لە ڕۆژ باشتر دەبێت وەزعەکە بەرەو باشی دەروات...

*** *** ***

ڕۆژێکیان ماڵی شێخ ئەحمەد سوورچی ، شێخاغەی ئامۆکان داوەت دەکەن بەبۆنەی زەماوەندێك شێخاغەش کۆمەڵێك کەس و عەزیز خۆشناو لەگەڵ خۆی دەبات دەگەنەماڵی شێخ و دەچنە دیواخانێ دوای بەخێرهاتن و چاکوچۆنی شێخ رەقیبیش لەوێ دانیشتوە شێخ رەقیب تایبەتمەندی خۆی هەبووە، دەیان چیرۆك و بەسەرهاتی سەیر وسەمەرەی لێ دەگێرنەوە، من بەهۆی دووری و نەشارەزایم دەستیان بۆ نابەم تەنها دوو بەسەرهاتی باس دەکەم هیوادارم کەسێکی شارەزا قوڵی لێ هەرماری و دەستێك دەمێژووی بنەماڵەی شێخ ئەحمەد و ئەدەبیاتی سورچیایەتی بگێرێت بێگومانم شتی زۆردەگمەن لەوێ بوون رزگاری دەبێت، کە دەبێتە خەرمانێك بۆ دوارۆژی گەلەکەمان، دەتوانم یەك بەسەرهات بگێرمەوە، شێخ رەقیب لەسەر قەڵاتێ بەدوورین تەماشای دەوروبەر دەکات کەسێك دەبینێت لەدووکەرێ دەڕوات، ماوەیەك تەماشای کابرا دەکات کابرالەپڕئاوڕ دەداتەوە، شێخ پێدەکەنی، دەڵێن یاشێخ بەچ پێدەکەنی دەڵێت: وەرن بەدوورین سەیرکەن، ئەوکەسەی لەدوو ئەوکەرە دەڕوات دەستنوێژی شکا، بڕۆن بۆمنی بێنن دەچن کابرادێنن کەزیاتر لەدوو کیلۆمەتر دووربووە، کابرا دەگاتە لای شێخ و سڵاوی تایبەت بەشێخ دەکات و دەڵێت یاشێخ فەرموو ئەمرکە، شێخ دەڵێت: پرسیارێکت لێ دەکەم راست وەڵام بدەوە، کابرادەڵێت: بەچاوان وە کەسیش ناوێرێت درۆ بکات لەگەڵ شێخ، شێخ دەڵێت: کە گەیشتییە فلان جێگا دەست نوێژت نەشکا، کابرادەڵێت: بەڵێ وابوو، بەڵام جەنابت کوتزانی؟ شێخ دەڵێت ئاوڕێکی ئەوەند لە پڕت داوە، کابرا دەڵێت بەخوای وەبوو، وتم نەوەك کەسێکم لە دووبێت و گوێی لێ بێت. شێخ رەقیب بارە گەنمێکی دەداتێ پاداشی راست گۆیەکەی و کابرادەڕوات .

**بەسەرهاتی دووەم :**

دیارە ڕۆژانە خەڵکی گوندی هێلکە بۆماڵی شێخ دەبەن، شێخ ماوەی دورۆژ هێلکەی بۆ نایەت لەلایەن خەڵکی زۆرپێی سەیردەبێت، بەدوای چەند کەسێك دادەنێریت بزانیت مەسەلە چییە، یەکیان دەڵێت یاشێخ خۆشناوەك خەرکی لای مەلەکانە فێربووە، گوێز و مێوژان دینیت بە هێلکەدەگۆڕیتەوە و دواتر بەرەوموسڵیان دەبات بەنیازی فرۆشتن، شێخ دەڵێت: کە خۆشناو هات

ئاگادارم بکەنەوە، خۆشناودەچێت و ئاگاداری شێخیش دەکەنەوە، شێخ لەلایەك دەڵێت: بڕۆن خۆشناوم بۆبێنن، چەند کەسێك دەنێرێت ژمارەیەکی زۆر بەرد بینن، خۆشناو دەبەنە لای شێخ شێخ خۆشناو بەخێردینیت دەڵێت خۆشناو گوێزەکانت لەوناوە ڕووبکە خۆشناویش گوێزەکانی ڕوو دەکات دەڵێت بڕۆن خەڵکی ئاگاداربکەنەوە، خەڵك دێتە لای جەنابی شێخ بەردەکانیش دەگەنە لای شێخ، بەخەڵکی دەڵێت: دەست بکەن بەگوێزخواردن وردە وردە گوێزەکانی خۆشناو هەموویان دەخورێن، جەنابی شێخ دەڵێت: خۆشناو پاشماوەی گوێزەکان و بەردەکان لەگونییە بکە لەکەرەکەت باریان بکە، خۆشناویش ئەوکارە دەکات، شێخ دەڵێت: خۆشناو بەپارە گێزەکانی تۆ بایی چەندبوون؟ خۆشناویش دەڵێت یاشێخ بایی ئەوەندە بوون، شێخ دووئەوندە پارەی دەداتێ و دەڵێت خۆشناو جارێکی تر لێرەت نەبینمەوە بێیەوە هەردوو چاوت دەردێنم!

بابینەوە لای عەزیزخۆشناو جەنابی شێخ لە دیواخانی قسە بەقسە دێنە سەر ڕاوەبەرازێ، شێخ ڕەقیب دەڵێت: دوونێ چوینە ڕاوەبەرازێ و زۆرن دێتن و پێن نەکوژران، عەزیز خۆشناو شارەزای شێخ ڕەقیب نییە دەڵێت پەکو بەراز وایان لێهات، نەکوژرێن! شێخ ڕەقیب بەغەرەزەوە سەیرێکی دەکات . شێخاغەبە نەهێنی بە عەزیز خۆشناو دەڵێت: قسەیەکی خراپت کرد، کەس بۆی نییە قسە لە قسەی شێخ ڕەقیب بکات، شێخ ڕەقیب ناوەناوە تیلەچاوێك دەداتە عەزیز خۆشناو، دواتر شێخاغە داوا لەشێخان دەکات مۆڵەتی بدەن بچێتە ماڵە ناسراوێکی شێخ مۆڵەتی دەدەن شێخاغە و خزمەکا نی لەگەڵ عەزیزخۆشناو لە دیواخان هەڵدەستن دەچنە ماڵەناسیاوێك شێخ ڕەقیب بەیانی کەسێك ڕادەسپێرێت بڕۆن ئەو خۆشناوەم بۆبینن، کابرا دەچێت شێخاغە دەبینێتەوە و دەڵێت شێخ ڕەقیب خۆشناوی دەوێت شیخاغە زۆر دەترسێ، شێخ ڕەقیب عەزیز خۆشناو بکوژێت شیخاغە بەوکەسە دەڵێت: بە جەنابی شێخ بڵێ من کارێکی زەروریم بەعەزیزخۆشناوە، ئەوجارەیان شێخ ڕەقیب بەخۆی دەچێت، بەشیخاغە دەڵێت: مەترسێ نای کوژم عەزیز خۆشناو دەبات و ئەسپێکی بۆ ئامادە دەکەن لەگوندی بەدوور دەکەون، شێخ ڕەقیب دەڵێت: عەزیز خۆشناو ئەگەر بەرازت نەکوشتن بەخۆت کوژرای، عەزیز لەگەڵ شێخ دەڕوات و لەگەڵ چەن کەسی تر تاکوو دەگەنە بەرازان، بەراز ڕادەپەڕن عەزیزخۆشناو بەئەسپەکەی لابەلا دەچێتەوە پێش بەرازان و لەبەریان دادەنیشێت سێ بەراز دەکوژێت، دواتر دوو بەرازی تریش دەکوژێت، واتە بوونە پێنج بەراز شێخ ڕەقیبیش دەگاتەلای و دەڵێت یاشێخ فەرموو

**تەماشایان کە شێخ دەست خۆشی لێ دەکات و دەگەڕێنەوە کە دەچنەوە شێخ رەقیب خەلاتی دەکات بە بەرانێك و چۆخەرێك. شێخ ئەحمەدیش بە سەبیلەی خۆی خەلاتی دەکات.**

**دیارە (رانکوچۆغەری بەرشێخی و لەناوخزمانی سوورچی لە هەموو شتێك بەبەهاترە، شێخ ئەحمەدیش سەبیلەی توتن کێشانی پێشکەش دەکات، کە گەورەترین خەلاتی شێخ ئەحمەد بووە، زۆر پیرۆز بووە لەلای عەشیرەتی سورچیان. لەکاتی شایی شێخ ئەحمەد پێی دەڵێت: عەزیز بۆ ناچیەداوەتێ واتە بۆ شایی ناکەی، دەڵێت یاشێخ شایی ئێ مرۆیان نییە! شێخ ئەحمەد دەڵێت بەراستی وایە ئەتۆ مرۆێکی گەورەی، دواتر شێخ رەقیب بە شێخاغەی تامۆکان دەڵێت ئەگەر ئیدارەی ئەو پیاوەت بەباشی پێ نادرێت بیدە من.**

**شێخاغە دەڵێت یاشێخ ئەو داوایەم لێ مەکە، شێخاغە و عەزیز خۆشناو دەگەڕێنەوە، لەناو خەڵکی دەنگ دەداتەوە، کە عەزیز خۆشناو لەلایەن شێخان خەلات کراو بە بەرانك و چۆغەری شێخ رەقیبی و سەبیلەی شیخ ئەحمەدی، ئەو خەلات کردنە لە سورچیایەتی لای خۆمان دەنگ دەداتەوە، رۆژانە دیوانەکانی سورچیاتی دەگەڕان تاکو عەزیز خۆشناو ببینەوە سەبیلەی شێخی ماچ بکەن. عەزیز خۆشناو لەناو سورچیایەتی خەڵك خۆی لێ دەپاراست لەبەر هیبەتی ماڵی شێخ و رێزێکی تایبەتی هەبووە.**

**بەسەرهاتی ئەوپیاوەزۆرن، رۆمانێکی گەورەیە ئەوپیاوە لەسەرەتای شۆڕش دێتەوە و لە عەزیز خۆشناو دەبێتەوە عەولاسۆری شێخ وەسانانی جاران، لە سەرەتای شۆڕش دەبێتە پێشمەرگە و دەستی بالای هەبوو لە سەرەتای شۆڕشی گەلەکەمان، لەسالی (١٩٧٤) بووە جێگری سەرلەق، لەبەرگری شۆڕشی گەلەگەمان جێ پەنجەی دیارە لەهەرشەڕێك بەشداری کردبێت دەوری بەرچاوی هەبووە وەلەپێشتریش دەرەبەگەکانمان رێزی تایبەتیان بۆ داناوە و لێشی ترساون. لە دوای هەرەسی شۆڕشەکەمان وەك زۆربەی خەڵکی بەرەو قولایی دەوڵەتی ئێران دەڕوات لە قەزای (نیشاپوور سەربە پارێزگای خوراسان نیشتەجێ دەبێت بەخۆی و منداڵەکانی وە لەو سەفەرەی رانکوچۆغەری شێخ رەقیبی لێ ون دەبێت و زۆریش خەمی بۆ خواردووە، ئەو پیاوە لە هەموو ژیانی بەپیاوەتی ژیاوە، پیاویش پیاویان خۆشدەوێت، پیاویش پیاوان دەناسن سەیری ئەو بەسەرهاتەی عەولاسۆر بکەن، دەنگوباسێك پەیدا دەبێت ئێران برە مووچەیێك دەداتە ئاوارەکان، منداڵەکانی عەولاسۆر زۆرهەوڵ دەدەن، قایمقامی ئەو شارە کەمتەرخەم دەبێت، رۆژکیان عەولاسۆر دەڵێت ئێستا دەچمەلای قایمقام مووچە بۆخۆم دەبڕمەوە دەکەوێتە رێ و دەگاتە قایمقام، بەهەموو هێزی خۆی**

گۆپاڵێك لە مێزی قایمقام دەدات و دواتر گۆپاڵی لەملی قایمقام دەکات، دەڵێت ناپیاو بۆ کاری مووچەم بۆ جێبەجێ ناکەی کۆمەڵێك پۆلیس لێی نزیك دەبنەوە، قایمقام دەڵێتە پۆلیسان وازی لێ بێنن عەولاسۆر بە کوردی قایمقام بە فارسی تێك ناگەن، کوڕی عەولاسۆر پەیدا دەبێت قایمقام بەکوڕەکەی دەڵێت پێی بڵێ بەس دانیشێ چی دەوێت بۆی دەکەم، کوڕەکەی مام عەولاش داوای لێبوردنی دەکات و دەبێتە تەرجومان و داوای لێبووردن لەقایمقام دەکات، قایمقام دەڵێت: داوای لێبووردنی ناوێت ئەوپیاوە پیاوە، پیاویش لەهەرشوێنێك بێت پیاوەتی خۆی دەردەخات ئەو پیاوە نەزانێت من پیاوی دەوڵەتم دەوڵەتیشم زۆربەهێزە، دەشزانێت ئەو بێ دەستەڵاتە و لەوڵاتی غەریبیە نەترسا و داوای مافی خۆی دەکات، ئافەرین پیاو چی دەوێت بۆی دەکەم؟ ئەو پارەیەم لێ وەرگرن، مووچەشی بۆدەبڕمەوە بەچاوان مام عەولاش پارەکە وەردەگرێت و دەڵێتە کوڕەکەی بڕۆ جیسکێك بکڕە و قایمقام میوانە، قایمقامیش داوەتەکەی ڕەتناکاتەوە و میوانی مام عەولا دەبێت. دەوەرە سەیری ئەقڵی فارس بکە، لە بەڕێوبردنی دەوڵەت غەریبەیەك پەلاماری حکومەت بدات و خەڵاتیشی بکات، خوانەخواستە مام عەولاسۆر وای لەقایمقامێکی ئێمە کردبا دەبووایە چەند ساڵ بەبێ لێ پرسینەوە خراپایە زیندان.

لەساڵی (١٩٩١) وەك زۆربە خەڵکی هاتەوە کوردستان و لەشاری هەریردا نیشتەجێ بوو، ئەو شێرە پیاوە زۆر بەدڵشکاوی ( ٢٨ / ٥/ ٢٠٠٤ )ماڵئاوایی لێ کردین، ئێستا گۆڕی لە گۆڕستانی ماڵە شێخانی سیساوەیە.

*** *** ***

**چیرۆك ....**

کورد دەڵێت: جووت ژنە پەسند نییە، دەگێڕنەوە پیاوێك هەبووە هەموو بەیانیان کە دەچێتە مزگەوت دەبینێت کەسێك پێش ئەو لە وێیە ڕۆژێکیان لێی دەپرسێت ئەرێ کابرا پێم ناڵێی هەموو ڕۆژێ پێشی من لێرەی مەسەلە چییە؟ کابرا وەڵامی دەداتەوە و دەڵێت برادەر من دوو ژنم هەنە، زوو هەڵم دەستێنن بە هەردووکیان ڕێکم دەخەن و بەڕێم دەکەن کابرا لەدڵی خۆیدا دەڵێت: واباشە منیش دوو ژن بینم، دوو ژن دێنێ، دوای ماوەیەك ئاژاوە دەکەوێتە ناو ماڵیان، کابرا لەترسی ژنان لەئێوارە وە دێتە مزگەوتێ تا بەیانی، کابرای تر دەڵێت: وەزعت چۆنە وەڵامی دە داتەوە دەڵێت ڕەبی ماڵت خراپێ وەکی ماڵی منیشت خەرا کرد.

*** *** ***

**چیرۆك....**

هەبوو نەبوو کەسێك هەبوو، هەر میوانێك چووبایەماڵیان لێدانێکی باشی لێ دەدا، ڕۆژێکیان کابرایەك ویستی بچێتە ئەو ماڵە وتیان مەچوو، چونکە خاوەن ماڵ لێت دەدات! وتی: مادام وای لێهات من دەچم، بزانم مەسەلە چییە؟ چووەماڵیان دووای سەلام و چاك وچۆنی وتی ماڵێ میوان رادەگرن؟ خاوەن ماڵ وتی: میوان لەسەرسەرو لەسەر چاوان، فەرموو دانیشە خاوەن ماڵ بانگی کوڕەکەی کرد و وتی: کوڕم وەرە بەرخێك بۆ میوان سەر ببڕە میوان دەنگ ناکات. نان ئامادە دەبێت و دەیخۆن دواتر چایەش دەخۆنەوە کابرا دەڵێت: من بەخواتان دەسپێرم، خاوەن ماڵ دەڵێت: وەی سەرچاوی من بچی، خوات لەگەڵ بێت، خاوەن ماڵ تاکو بەردەرگا لەگەڵی دەچێت، کابرا دەڕوات، دوای چەند هەنگاوێك دەگەڕێتەوە دەڵێت: برادەر من پێش بێمەماڵتان وتیان مەچوو لێت دەدات، بۆچی لەمنت نەدا؟ خاوەن ماڵ دەڵێت من لەپیاوان نادەم، لە ناپیاوان دەدەم کەمیوان دێت من بەکوڕەکەم دەڵێم، شتێك بکوژەوە بۆ میوان ئەگەر میوان پیاو بێت، خۆی بێدەنگ دەکات! ئەگەر وتی نابێت بی کوژنەوە ئەزانم ئەو کەسەپیاو نییە کە ڕۆیی لێدانێکی باشی لێدەدەم، ئەگەر وەك تۆش پیاو بوو، زۆری بەخێر دینم .

*** *** ***

**چیرۆك....**

کورد دەڵێت: "قسەی خۆش کوێستانی دڵانە." کابرایەکی حەیرانبێژ ئەیەوێت سەردانی برادەرێکی حەیرانبێژ بکات، دەگاتە گوندێك ئێوارەی بەسەردادێت، لادەداتە گوندەکە و پرسیار دەکات کێ میوان رادەگرێت؟ پێی دەڵێن برۆ دیواخانێ ئاغەی، دەچێتەدیواخان و دوای سەلام وکەلام دەڵێت: میوانم. پێی دەڵێن فەرموو، دوای نانخواردن ئاغە دێتە دیواخان و زۆری بەخێر دێنێت وردە وردە خەڵکی گوندی دێنە دیەواخانێ ئاغە لەکابرای میوان دەپرسیت قوربان جەنابت چ کارەی؟ میوان دەڵێت: قوربان من حەیرانبێژم بەنیازم سەردانی فلان حیرانبێژ بکەم، برادەرمە لەفلان شوێن. ئاغە دەڵێت کەوابوو ناوی خوای لێ بینە، کابرای حەیرانبێژ دەست پێ دەکات دوسێ بەندە حەیرانی خۆش دەڵێت. ئاغە بەخولامان دەڵێت: بەیانی کە میوان ویستی بڕوات ئەسپی پێبازی بۆ زین کەن، لەمنەوە پێشکەشی بیت کابرای حیرانبێژ کە گوێی لەو بەڵێنە بوو دەستی پێ کردەوە دوای ماوەیەك ئاغە وتی خولامینە بەیانی کەسواری ئەسپی بوون برنۆێکیشی پێشکەش کەن، کابرای حەیرانبێژ خۆی شێت کرد لەحەیران گۆتن تا درەنگی شەوێ و

ئاغە هەستاو وردەوردە خەڵکی دیواخانیان چۆڵ کرد، کابرای حیوانبێژ ئەو شەوە لەخۆشیان خەوی لێ نەکەوت، تابەیانی لەشایێ ئەسپ و برنۆێ بەیانی نان خوراو چەندی چاوەرێی کرد کەس لێی بەپرسی بە خولامێکی ئاغەی گوت بەئاغات بڵێ من نیازی رۆیشتنم هەیە، ئاغا هات و وتی چییە؟ بەنیازی رۆیشتنی کابراوتی بەڵێ ئاغە وتی دەباشە سەفەرت خێر بێت، کابراوتی جەنابی ئاغا ئەو شتانەی پێشکەشت کردبووم ، ئاغا وتی کوڕم ئەوە دوێنێ شەو بوو، ئەتو بەحەیرانان دڵی ئێمەت خۆش کرد، منیش بە قەولان دڵی تۆم خۆش کرد، کەوابوو زێر بەزێر دەرچوو، خوات لەگەڵبێت سەفەرت خێربێت.

*** *** ***

**چیرۆک.....**

باب و باپیران پێمان دەڵێن: پیاو ناتوانێت هیچ کارێکی دیار و جوان بکات ئەگەر ژنێکی باشی لەپشت نەبێت و ماڵێکی ئارامی نەبێت، دووکەس دەچنەبازاڕی، لەناو بازار سەیردەکەن نە جارێك بەردەوام بە تەپشوو دار لەسەر قاچی خۆی دەتاشێ، بەبێ ئەوەی تەپشوو لە قاچی خۆی بدات، یەکیان لەو دووکەسە دەڵێت: بەڕاستی هونەرە پیاو ئەوەندە شارەزابێت دار لەسەر قاچی خۆی بتراشێ، تەپشووش لە قاچی خۆی نەدات، ئەوەیتر دەڵێت: براله هونەری خۆی نییە ژنی ژنێکی باشە و پەیوەندی نێوانیان باشە، ئەوەیتر دەڵێت: هیچ پەیوەندی بە ژنی وەنییە ئەوەیتر دەڵێت: باشە دووبەیانی دێینەوە ئێرە، ئەگەر تەپشووی لەقاچی خۆی نەدابوو، دیارە من لە دنیا تێناگەم و هیچ نازانم! کابرای ئەو قسەیەی کرد ئێوارە تاقیبی ماڵی نەجاری کرد، ماڵەکەی دیتەوە، بەیانی نەجار هاتە سەرکار،کابرا خۆی لە خێزانی نەجار نزیك کردەوە و کۆمەڵێك بوختانی بە نەجار کرد. ئێوارە نەجاڕ چووەوە ماڵێ و لەگەڵ خێزانی بووە شەڕ بەیانی هاتە دووکانێ و دەست بەکار بوو، وەك رۆژان دووەم تەپشووی لە قاچی خۆی داو لاێکی لێ کردەوە نەجار پشبێندی لەخۆ کردەوە و لە لاقی خۆی پێچا ئەو دووکەسە پەیدابوون چوونە لای نەجار تەماشایان کرد، نەجار دار لەسەر کۆلکەدارێك دەتراشی قاچی خۆشی بەستیتەوە، کەوابوو هەموو هونەرێکی پیاوان بەپاڵپشتی ژنان دەکرێت، بۆ نموونە: ئەو نووسینەی من بەشێکی بەرچاوی هونەری خێزانەکەمە، بە تایبەتی بەشە فۆلکلۆریەکەی . زۆرجار لە کوردەواری ڕستەیەك، یان چەند رستەیەك هەیە، چیرۆکێکی لە پشتە وەك:

**شۆڕێ وای زانی لەکن هۆپێیە**

**هۆپیێش وای زانی لەکن شۆپییە**
**نازانن لەبن چرپ وچۆپییە!**

**دەگێڕنەوە کابرایەك دووژنی هەبووینە، بەناوی شۆپیێ و هۆپیێ لەگوندێك، گوندەکە دوو بەش بووە ئەوبەر و ئەوبەر رووبارێکی گەورە بەناو گوندی دادەڕوا، ماڵێ شۆپیێ لەوبەری بوو، ماڵێ هۆپیێ لەو بەرەبوو. کابرا ئێوارە لەلای شۆپیێ بووە ویستویە بچیتە لای هۆپیێ ئەیەوی لە رووباری بپەڕێتەوە رووبار دەی بات شۆپیێ وا دەزتانێت لەکن هۆپییە، هۆپیێش وادەزانێ لەکن شۆپییە، نازانن کابرا بە رووباری داچوە و تەقەتەقی سەریەتی!**

*** *** ***

**هەرکەسێك لەکارو پیشەکەی کەمتەر خەم بێت و گوێ بەکارەکەی نەدات پێی دەڵێن : (گێرێ ئۆمەرەکۆریە.)**

**چیرۆك لەو بارەیەوە :**

**ئۆمەرەکۆرەك هەبوو، لەسەر جۆخینێ خەریکی گێرە کردنە بووە، کوڕ و بووك و کچی لەگەڵ دەبن، دووبووك لەنزیك ئەوان( دەگۆڕینەوە) جاران وا بوو لە ژن بەژنی لەنێوان دووگوند کە خزمایەتی دەکرا، بووکەکان لەشوێنێکی دیاریکراو دەگۆڕدرانەوە، شایی دەستی پێ دەکرد، دوایی هەر کەسە و بووکی خۆی دەبرد، ئەو ڕۆژەی مام ئۆمەر گێرە دەکات لەنزیك ئەوان، بووك دەگۆردرێنەوە، شایی دەست پێ دەکات کوڕی مام ئۆمەر گێرە بەجێ دێلێت و دەچێتە شایی لە دوای ئەو بوو کە کەش دەڕواتە شایی دواتر کچەکەش سەری گەرم دەبێت و دەڕوات مام ئۆمەر چەندی دەکات گێرەی بە تەنێ پێناکرێت و دەڵێت هەی دایك و واو وا لێ بکەم گێرە بەجێ دێلێت و رادەکات دەچێتەسەرچۆپی و دەڵێت، دەی بابم هەریەشان!**

**هەریەشان هەریەشان**
**گێرە دەکرێت ناکرێت**
**بەگونی عەلی بەردەشان**

**ماوەیەك شایی گەرم دەبێت و دواتر بووکەکان دەگۆڕنەوە ئەوان دەڕۆن ئۆمەر و کوڕ و بووك وکچی دەگەڕێنەوە لای گێرە ولاغەکان لەشاخی کەوتون چەندیان مردوون .. ئەوەش گێرێ ئۆمەرەکۆری لەو بەندە ئاماژەیەك بە عەلی بەردەشانی دەکات لە وانەیە عەلی لەو زەماوەندە بەشداری کردێت،یان ئەو بەسەرهاتە لەزەمانی عەلی بەردەشان رووی دابێت.**

## خۆشناو و دز و دزشاو

لە زەمانی زوو کێشەو ململانێکی خوێناوی زۆر گەورە لەناو عەشیرەتەکانی کوردستان هەبووە، بە تایبەتی ئەو چوار عەشیرەتی ناویان دێنین خزمانی سوورچی و سۆفی و بارزانی و هەرکی دیارە خەیلانیش تیەیەکن لە سوورچیان بە مام ساریشەوە، دیارە لەو شەڕ و کوشتارەش ماڵتارانکردنی یەکتر هونەر بووە، ئەگەر گوێ لە هەندێك لاوکی کۆن دەگری بە شانازییەوە باسی تاڵان دەکرێت ئەو کەسەی تالآنی زۆر هێناوە ڕێزی تایبەتی هەبووە، بەپیاوی جوامێر ناوی دەر کردووە. لەلایان هۆزەکەی شەڕ لەسەر سنوور و پووش و پاوان و ژن هەڵگرتن و دزی و ڕێگری و ئەو بابەتانە کراوە. ئەم جۆرە شەڕانە پێم وایەلە ساڵەکانی (١٩٧١ کۆتایی پێ هات دواشەڕ خەیلانی و هەرکی بوون، عەشیرەتەکانی ئێمە بەیەك تر کوشتن خەریك بوون فارس وعەرەب و توورکیش خەریکی دەوڵەت بنیاتنان بوون

*** *** ***

مام کازم خەرکی گوندی یلکانی سۆفیایەتی دەبێت لە پەلامارێك بۆسەر عەشیرەتی بارزان دەچێتە ماڵێك سێ چێڕ لە خانووی کەسێك دێنێتە دەرێ و دەی با، کابرا داوای لێ دەکات منداڵم وردن، بە تەمەن داچوومە، مام کازم گوێی پێ نادات کابرای بارزانی دەڵێت دەت دەمەخوای خواکەیفی خۆیتی، ساڵ هات وساڵ دەڕوات مام کازم وابەباش دەزانیت بچێتە حەجێ دەڕوات و لە دەوری کەعبە ڕاوەستاوە داوای لێ خۆشبوون دەکات، کابرای بارزانیش چوێتە حەجێ و سەیر دەکات کابرای سۆفی لەتەنیشتی ڕاوەستایە و دووعایان دەکات ناوەناوە دەڵێت: خوایە لەترسی تۆ خۆم لەزۆرشت پاراستووە، کابرای بارزانی دەڵێت نانا خوایە ڕاست ناکات سێ چێری لەمن دزین هەریدە نیوەندی جەهەنەمێ، کابرای سۆفیش کابرای بارزانی دەناسێتەوە و دەڵێت: خوایە ئەوە دزی نەبوو تارانێ عەشیرەتێ بارزانیان بوو، دیارە لە کوردستان هەموومان برکی یەك کدووین، گەورەتر یان بچووك تر، زۆرجار باسی گەڕیدان دەکرێت کە شتی خراپیان لەسەر کورد نووسیوە بە باش باسیان ناکەن، دیارە هۆیەکەی دڵسۆزییە، بەڵام زۆربەی گەڕیدەکان، ڕاستیان نووسیوە ئێمە ئەگەر ڕابردووی خۆمان بشێوێنین بۆ داهاتوو سوودی نابێت، ئەکرێت لێرە دەست پێ بکەین هەرشتێکی باب و باپیران هەڵەیان تێدا کردوە با ئێمە دووبارەی نەکەینەوە تاکو ئەو نووسینەی من خەڵك لەشارە گەورەکان کە زیاتر لەپەنجاساڵە لە شاردا دەنیشێت وەك عەشیرەت بیردەکاتەوە، خۆی بە کادیری پێشکەوتووی حیزب دەزانیت ئەگەر کەسێکی عەشیرەتێ غەدریش بکات کاکم بەرگری لێ دەکات و نای داتەدەست یاسا، گوایە خۆشناوە یان...!

بووك گواستنەوە لەخۆشناوەتی وەك هەرناوچەیەكی تر تایبەتمەندی خۆی هەبووە، باوكی دوو كوڕ ڕێك دەكەوتن كە ژن بەژنی بۆ كوڕەكانیان بكەن، ئایە پرسەخەسوویێك بە كوڕەكان دەكرا یان نا؟ زۆرجار كچەكان ئامادە نابوون باوكیان دەكردە وەكیل مارە دەكران و چایەك دەخورایەوە، شتێك دەدرایە مامۆستا لەسەر خشڵ ڕێك دەكەوتن، زێر یان زیو لە خۆشناوەتی تاس و خەزێمی لەگەڵ بوو دەچوونە جلكان دەبووایە ڕێژەیەكی باش (هەینۆك)ئاوێنە و دۆخین و دەسرۆك خەنە كرابان، دەسرۆكەكان ڕەنگیان سۆربوو، لەگەڵ جلكی بووكێ جلكی بووكێ چارۆگ دەبووایە ڕەنگی سپی گوڵداریا، جلك دەكران و پێی دەگوترا (خشڵ). ڕۆژێك دیاری دەكرا بۆ گواستنەوەی، ڕۆژێك پێش هەر لایەك بەربووكی دەنارد بۆ ماڵی بووكی، خۆی بەربووك دەبووایە سەرەژنێكی لێوەشایەوە بێت، بەربووك چەند ئیشێكی هەبوو: ئامادەكردنی بووك و ئامۆژگاریكردنی... ئەو ڕۆژەی دەگواسترانەوە، شوێنێك دیاری دەكرا لەشكری هەردوولا بە ولاغان سوارسوارانەیان دەكرد، تا دەگەیشتنە شوێنی دیاریكراو بەپەلە. هونەر ئەوە بوو كێ زووتر بووكی خۆی بباتە و مۆڕە لە یەكترکردن هەبوو، زۆرجار شەڕەخەنجەر ڕووی داوە، بووك دەگەیشتەوە بەر دەركی ماڵێ زاوای شەكرۆكە و گەنم و لەو دووایانە وردە پارەش بەسەر سەری بووكێ دەكرا، بووك دەگەیشتەوە پێش ماڵێ زاوا، دووسێ داری لەسەری بووكێ دەدا، وەك نواندنی هەیبەتی پیاو بووك دەچووە ژووری، دیارە تاكو ژووری ئاڵاێكی سووری بەسەردا دەدرا، چەند بالیفێكیان لەسەر یەك دادەنا و بووك لەسەردا دەنیشت. بۆنان خواردن گەنمەكوتا كفتە ئامادە دەكرا و خەڵكی گوندیش نانی خۆیان دینا و شایی دەكرا، شایی ژنان بە جیا و شایی پیاوان بەجیا، دیارە ناوچەبە ناوچە دەگۆڕا لای ئێمەوابوو زاوا نابووا لای بووك بێت تا ئێوارە.ئەوشەوە تابەیانی خەمی خەڵكی بوو ئایە زاوا بەزاوا دەبێت یان ئایە ئەو بووكە كچ بوویا بەپێچەوانەوە، مەسەلەی كچێنی خەڵك زۆر بەدوادادەچوو. گۆرانیەكان دووبەش بوون گۆرانی لەگەڵ بووكێ جیابوو، گۆرانی شاییش جیابوو، گۆرانی لەگەڵ بووكێ ئەمە بوو:

بووكانێ بووكانە هەوارە بووكێ،
بووكیمە بووك نینە دەلالێ بووكێ
گەردەن سوسنێ ساوا هەوارە بووكێ
پیرۆز بێت لێت زاوا دەلالێ بووكێ

بەرپێی بووکیم تاتە هەوارەبووکێ
زاوا وێ هەراتە دەلالێ بووکێ
هیننای شەش خەراتە هەوارە بووکێ
بووکمان هێناوهاتینەو ە دەلالێ بووکێ
لەجۆگەی پەڕینەوە هەوارەبووکی
ئەسپێ بووکییم هارە دەلالێ بووکێ
زاواش بیخەبەرە هەوارەبووکێ

ئەوەشیان گۆرانی شایی بە ناوی منجۆلی :

منجۆلیەو منجۆلییە
هاوار منجۆلییە
منجۆلیم هینەومینا وەی وەی منجۆلییە
تاچووم منجۆلێم هینا
منجۆلیێ دوو کوڕ هینا
منجۆلیم هەندە وەمەدە
کەمەری سفرییەندە
لۆت مردم پارم وێدە
منجۆلیم کیژێ شێخی
سەرمەمکان وەدەردێخی
پیاوی جاحێر پێدێخی هەی هەی منجۆلێ

---

گۆرانێکی تری ئای وەبانان:

وەبانان وەبانان هەگرە وەبانان
لەسەر لێرە لێران وەی وەی وەبانان
چاوێ خۆم دەگێران هەی هەی وەبانان

لەبندارکنێران : (کنێر دووجۆرە گیامان هەیە بەناوی کنێر داریشمان هەیەبەناوی کنێر )

لۆکچەمیران :

خۆشناو و دز و دزشاو

لیَری بەرشەنۆکا : (شەنۆکە شوێنێکە )

هەوکیَ بەکرمۆکە : ( هەوك .گەردەن ، گەردەن زەرد کرمۆك جۆرێکی خشل بوو بۆ خۆرازاندنەوە )

زەندیَ بەبازنۆکە : ( قۆلی بەبازن )

ئێخۆم بای ئەوشۆکە :

لەسەری هەوریَ بام : ( هەوریَ چیایی هەورێی لا خۆمان )

سەرگوفکیَ چەوریَ بام : (گوفك گولی چەوریَ چەورگیایکەلەکویستانان شین دەبێت)

روولە بیاویَ بام : (بێراوە گوندیکە لای خۆمان)

جیرانی مەمکان بام :

لەرێزی دووگمان بام وەی وەی بەبانان : دوگمە خشلێکە ژنان بەکاریان دینا بۆخۆنواندن)

دیارە بەلۆرەش بەشێکی تایبەتە لە فۆلکلۆری گەلەکەمان لە نێوان ژن وپیاو یان کچ وکوڕ ئەو بەشە زۆر بەرفراوانە هەندێکیان لە جوێندان لەسنوور دەردەچن هەندێکیان باشن زۆر جوێنی تێدانییە، هەوڵدەین زیاتر ئەوانەبنووسین کە کەمتر جوێنی تێدایە بەلۆرەش دوو جۆری هەیە یەکەمیان سێرستە و ئەوەی تریان چەندان رستەیە فەرموون:

کوڕ:

بەلۆرەم هەندومەندە
گوێم لیَ بگرە لەوبەندە
وام لیَ نەکردی لەوکەندە

کچ:

بەلۆرە و بەلۆرانم
ئەمن میری کیژانم
کوڕان بە پیاو نزانم

کوڕ:

بەلۆرەم لەسەری کانی
خۆم هەردا سەرمەمکانی
تێرماچم کرد نەی زانی

کچ:

بەلۆریَ دار ئەسحابیَ
داکیَ کوڕانیان گابیَ
مەیلم لەگەریان نابیَ

کوڕ:

بەلۆرەم کیژێ خاری
لۆم وەرە بن کەنداری
ماچت بکەم بەحەراری

کوڕ:

بەلۆرەم لەبەر مەڕی
کراسی بەرم دڕی
ئێکی هەندەم تێ بڕی

کچ:

بەلۆرەم لەبناری
داکیان گای لەکەنداری
لەتۆرێ کیژە خار ی

کچ:

بەلۆرەم رەشکێ رەشکێ
ئێ برایمت دەخوشکێ
بیژینی وەکی مەشکێ

کوڕ:

بەلۆرەم لە شێخێرە
خۆماچم کردی لێرە
مەمکانم پێ بسپێرە

کوڕ:

بەلۆرەم لەناو رەزی
کلو کلدانم لێ دزی
سەری مەمکانم گەزی

کچ:

بەلۆرەم لەمەندێری
خۆی پێ وەکی شێری
لەلای من وەکی چێری

کچ:

بەلۆرەم هەر لەشەڕە
ئەوکورە گەلەك کەرە
دایکی وەکی ماکەرە

کوڕ:

بەلۆرەم بەهارشینە
ماچم کرد ئەو سەرشینە
تامی وەکی هەنگوینە

کوڕ:

بەلۆرەم لەچیا وچیایە
ئاگای لە خۆ نەمایە
لەهۆرێم سێ جارگایە

کچ:

بەلۆرەم کەتیێ کەتیێ
کوری داك رەدووکەتیێ
خەیارە و لۆخۆ کەتیێ

کچ:

بەلۆرەم کانی کەوێ
سێ خوشکی رەدووکەوێ
سەرشۆڕیت وەبەر کەوی

خۆشناو و دز و دزشاو

کور:

بەلۆرەم لەسەرچیایە

بابیشی رازی بایە

ئەوکچەم هینابایە

کچ:

بەلۆرەم لەبن کوری

داکیان بەکیان دری

سەیە و بەکیژان رەوی

کچ:

بەلۆرەم بەندەوارن

کورێمە تۆری وتارن

زۆر بێ قەول وقرارن

کور:

بەلۆرەم ئەستی ئەستی

مەمکۆرەم گرتنە دەستی

چەند جارم لۆ خۆ گەستی

کور:

بەلۆرەم سەرەواری

هۆکیژێ .... کەفتیاری

چەندم ..... لەهەواری

کچ:

بەلۆرەم شاخەو لووسە

ئەوکورە بێ ناموسە

دایک و بابی دەیووسە

چێر ئەگەر بەدۆبا لەدەرکێ ماخۆی دەبوو

واتە شتی باش کەس ئامادەنییە بیفرۆشێ

مەم شۆ بەگواوێ

چاکەی دووایشم ناوێ

واتە: سەرەتا مەم شکێنە قسەی ناخۆشم پێ مەڵێ، دوایی بە قسەی خۆش دڵم خۆش مەکە، واتە: زۆرجار قسە ئەگەر ئامۆژگاریش بێت ئامۆژگاریەکە لە دڵسۆزی نییە بۆ شکاندنە ئامۆژگاریش کات و وەختی خۆی دەوێت، پیاوی خۆشی دەوێت ناکرێت بەخۆت کەموکورتیت هەبن، ببیە مام مۆتکی خەلکی، واباشە کەمتر ڕەخنە لەخەلکی بگریت ڕەخنە زۆرجار خاوەن ڕەخنە دەسوتێنێت، واباشە واز لەئامۆژگاری و ڕەخنە گرتن بینن، مەگەر کەسێك هاتەلات و وتی: ئامۆژگاریم بکە یان کەموکورتییەکانم لەکوێن ئەوکات ئەوەی بەباشی دەزانی بۆی باس بکە لەخۆتەوە مەبە مامۆستای کەس.

*** *** ***

خۆشناو و دز و دزشاو

**رووداو :**

پیاو قەت نائومێد نەبێت لەژیان، لەگوندی (نواوە)ی خۆمان مام حاجیەك هەبوو، ڕۆژێكیان پێنش مزگەوت دەبێت تۆزێك نەخۆش دەبێت، یەكێك لێی دەپرسێت ئەرێ مام حاجی نەخۆش دیری، مام حاجی دەڵێت: بەڵێ وایە كابرا دەڵێت بەخوای وەختی مردنت داهاتیە، مام حاجی بە دەنگێكی گڕ، دە لێت خواعەفوت كات، قسەی باش نازانی قسەی بێ مانا(ما) دەكەی؟ ئەمن هێشتان كام نەكێشایە لۆماراتی مردنی چی ؟ كەنگێ وەختی مردنییە؟ خزمانی نواوە و هەندێ گوندی دەوروبەری پیتی (ما) لەجیاتی بۆ یان لۆ بەكار دینن .

*** *** ***

**چیرۆك :**

هەبوو نەبوو پێنج كەڵەباب و كۆمەڵێك مریشك هەبوون، ڕێوییێكیان پێ فێر بووبوو، هەر ڕۆژە و یەكێكی دەخوارد، ڕۆژێكیان كۆبوونەوە وتیان ئێمە لێرە نەرۆین ئەو ڕێویە هەموومان دەخوات كەوتنە ڕێ و زۆر ڕۆیشتن دواتر گەیشتنە كیسەڵێك، وتیان كیسەڵ ئەتو پیاوێكی بەتەمەن و شارەزای ئەو ناوە ڕێوی لێیە، كیسەڵ وتی تا ئەمڕۆ نەم دیوە داهاتووش ڕۆن نییە و نەزانم، بڕیاریان دا ئەوشوێنە بكەنە مەملەكەتی خۆیان كەڵەبابەكان دەستیان كرد بە قوقاندن، باڵدارەكانی دەوروبەر مشاوەش بوون و ترسان و لەدەوری یەك كۆبوونەوە، گەورەكەیان وتی: خزمینە جۆرێك لەباڵدار هاتینە مەملەكەتی ئێمە، پێویستە ئێمە چەند ریش سپیك بنێرینە لایان بیان ناسین و بزانین نیازیان چییە؟ بەرنامەیان چییە؟ چەند كەسێك دەستنیشان كران، بەرێكەوتن لێیان نزیك بوونەوە دیتیان چەند كەسێك لەوان چوینە سەربەردێكی گەورە و هەرخریكی قوقاندنن سلاویان لێكردن دوای چاك و چۆنی بەخێرهاتنیان وتیان زحمەت نەبێت پێمان خۆشە لەگەڵ گەورەتان قسەبكەین یكێك لەوان وتی من گەورەم فەرموون چتان دەوێت یكێكی تر وتی ئەوگەورەی ئێمەنیە من گەورەم فەرموون یكێكی تر وتی ئەوان گەورەنین من گەورەم فەرموون، یكێك لەریشسپیەكانی باڵداران وتی خزمینە بابگەڕینەوە، لەرێگا وتی خزمینە ئەو باڵدارانە مەترسی نین بۆ ئێمە كە لە ناوەخۆیان ڕێك نین، هەموویان خۆ بە كێخوا دەزانن وازیان لێ بێنن ئەوانە دەبنە خۆراكی دەوروبەر، ئێمەش وەك عەشیەتی كەڵەشێر ئەو كێشەمان هەیە، لەخوارەوە بۆ سەرێ زۆر حەز لەكێخوایەتی دەكەین، ئەویش هۆیەك بووە،

لەهۆکارەکانی ئێمە کە خۆراکی دەوروبەر بووینە زۆربەمان نەزانین کەسمان خۆ بەنەزان نازانێت لە هەر کاروبارێك خۆمان بەشایستە دەزانین ئەو جوامێرییەمان زۆر کەمە، من بڵێم برای بەڕێز ئەوکارە کاری من نییە و لێی نازانم، فلان کەس پیاوێکی شایستەیەلەشوێنی منی دابنێن بۆ خزمەتی گشتی ئەو لەمن لەوکارە شارەزاترە ئەگەر ئەو رووحیەتمان لەناو دروست بوو، ئەوە هەموومان شتێن و نەجاتیشمان دەبێت لەدەست داگیرکەرانی عەرەب و فارس و توورك، لە هەمووی خراپتر گوێ لەیەکتر نەگرتن و جیابوونەوەیە لەیەکتر، لە ماوەی ئەو نیو سەدەیە کە گەورەترین هەڵەی ئێمە بووە کەچەندان کارەساتی بەدووای خۆ داهێنایە و ئێستاش باجەکەی دەدەین، جاران زۆربەی کوڕو کچ بێخەبەر بوون لەیەکتر باوکی کوڕ داخوازی کچێکی دەکرد لەباوکی کچە و بۆ کوڕەکەی، زۆرجار بابی کوڕەو بابی کچە دەبوونە وەکیل مارەشیان دەکردن، زۆرجار ئەو ڕێژەی ژنیان بۆ کوڕ گواستۆتەوە کوڕە شوان بووە و یان لەکارێکی تر بووە، ئەتوانین نموونەی کەسێك بێنینەوە کە ژنی بۆ دێنن، دیارە ئەو نموونەیە زۆر و کەم ڕەنگدانەوەی ئەو کات بووە.

*** *** ***

**ڕووداو :**

یەکێك لەگوندەکانمان کەسێك کە ناسراوە لەلای من ئاگای لەمارەکردن نەبووە، تەنها باوکی بووەتە وەکیل، چاویشی بەبووکێ نەکەوت بوو، ڕۆژکیان باوکی پێی ئەڵێت .... بەیانی ژنت بۆ دێنین، بەیانی ...... . لە شەرمان لەماڵێ دەڕوات ئێوارە کە چوێتەوە لە پەنایەك نان دەخوات و دواتر پێی دەڵێن بڕۆ فلان ژووری بووکت لەوێیە .. ... بۆ هەمان ژوور دەچێت ژوورێکی تاریك و دووکەڵێکی زۆریشی لێیە، دەکەوێتە سەر دەستان بە دوای بووکێدا دەگەڕێت، دواتر هەناسەی رادەگریت بزانێ دەنگی هەناسەی بووکێ لەکێ دێت هەست بە هەناسەی بووکێ دەکات و بۆ لای دەچێت لەپڕ سەری بەر ئەستووندەیەك دەکەوێت هێڕوگێژی دەکات، ماوەیەك لەشوێنی خۆی دادەنیشێت، تاکوو ئازاری سەری کەم دەبێت، ئەوجارەیان بەدەستان بووکێ دەبینێتەوە و بەبێ ئەوەی یەك قسەی لەگەڵ بکات پەلاماری بووکێ دەدات بەیانی زوو دەچێتە کانی گوندی خۆی بسمیل بکات، سەیر دەکات بابیشی لەناو ئاوەیە و خۆی بسمیل دەکات لە شەرمان دوور دەکەوێتەوە، تاکوو باوکی دەڕوات ئەوجارەیان دەچێت خۆی بسمیل بکات، ئەوجارەیان دەبینیت خەوزووریشی خەریکی خۆ بسمیل کردنە، ئەوجارەشیان بە بێدەنگی کانی بەجێ دێڵێت تاکوو

حەزووریشی دەڕوات دێتەوە کانی، دەبینێت برای خێزانی خۆی بسمیل دەکات! سێبارە کانی بەجێ دێلێ ت ئەوجارەیان خۆی فجووری ئاویٚ دەکات ئاویش زۆر ساردە جلکان دەبەر دەکاتەوە و بەرەو ماڵەوە دەڕوات، لە ڕێگا هەر بیر لە بووکێ دەکاتەوە، دەبێت جوان بێ یان ناشیرن، دەبێ بەژن درێژ بێت یان کورتەباڵا بێت، زۆر شتی تر کە دەگاتەوە ماڵەوە بووک د ەبینێت بووک زۆرجوانە و ج خەوشی نینە سوپاسی خودا دەکات.

*** *** ***

لەگوندی شێخ وەسانان کەسێك بەناوی عەبدوڵلا حەزی کردوە لە گوندەکانی دەوروبەرمان ژنێك بخوازی ژنەکە بەرچاو بووە،خۆی تۆزێك نەتەچاو بووە، برادەرێکی بە ناوی ڕەسوول دەنێرێتە ئەو گوندە کە خۆی لە ماڵەجیرانێك پیشانی کچەکە بدات کچەکە چاوی بە پیاوەکە دەکەوێت، پیاوەکەی زۆر پێ جوان بووە، دەڵێت من ڕازیم ئەگەر بێیە داخوازیم، ڕەسوول دێتەوە و دەڵێت عەبدوڵلا کچەکە رازی بوو عەبدوڵلا دەچێتەلای بابی کچە و داوای دەکات، باوکی کچەش دەڵێت برۆ مەلا و خزمان بێنەو مەلادێت و کچە کە باوکی دەکاتەوەکیل وا دەزانێت پیاوەبەرچاوەکەیە جلك دەکرین و دەی گوازنەوە زاواشەو بۆلای بووکێ دەچێتن کاری شەرحی خۆیان دەکەن بەیانی ڕۆژدادێت بووك زاوا لەخەوهەلدەستێنێت بەو نیازەی بچێتەکانیێ خۆی بسمیل بکات کەزاواهەلدەستێ بووك سەیری دەکات زاوا ئەوکەسەنیە کەپێشتر چاوی پێکەوت وە ئتازە کار لەکار ترازاوە بێدەنگ دەبێت دواتر دەزانێت ئەو کارە بەبەرنامە ڕێکخراوە ئەوەی خۆی پیشانی بووکێ دابوو ناوی ڕەسوول بووە و ڕەسوول رەنگ سپیی و چاوشین بووە و گەنجێکی زۆرجوان بووە دیارە زاوا ناوی عەبدوڵلا بووەو پیاوێکی ئەسمەر و نەتەچاو بووە .

بەڵێ ئەوە ژن هێنانی ساڵەکانی سییەکان و پێشتربووە، زۆربەیان کەمتریان زیاتر ڕووداوەکان لەیەك نزیك بووینە، زۆرم لەو بەسەرهاتانم زانیوە، زۆرجار زاوا تا بەیانی ڕەنگ و ڕووی بووکی نەدیوە، یان بووك تا بەیانی ڕەنگ و ڕووی زاوای نەدیوە، قسەیەك هەیە دەڵێن: کێ کفتەخواردینە با ئەو بچیتە کن بووکێ! ئەو ڕووداوە نزیکە لەو دوو بەسەرهاتەی لە سەرەوە باسم کرد.

*** *** ***

**ڕووداوی کفتان :**

کوڕێك شوان دەبێت ئەورۆژەی ژنی بۆ دێنن کابرا لەلای میگەلەکەی دەبێت، واتە ئەو ڕۆژەش هەرشوان بووە، تاکو ئێوارە، ئێوارە دێتەوە نانی بۆ دێنن قاپێك ماست و نان، شوان دەڵێت:

ئەوەچییە چ ولۆ بووکێ لێنابوو، دەڵێن: کفتەن لێنابوون و تەواو بوون و هەمووخوران، کوڕەکە دەڵێت: مادام وای لێهات کێ کفتەخواردینە با ئەویش بچیتەکن بووکێ! ئەمن ناچمە کن بووکێ. دایکی قەولی پێ دەدا کە بەیانی کفتانی لۆ لێبنێ، پێم باش نییە ناویان بێنم، بەشێك لە پیاوەبەساڵاچوەکان لەناوچەکەمان ماون کە تابەیانی بووکیان نەدیوە.

مرۆڤی ژیر ئەو کەسەیە لە هەرکارێك بیر لە داهات بکاتەوە وەك ئەوکچە.

*** *** ***

**ڕووداو ...**

ڕۆژێك لە ڕۆژان لە گوندێك مام سەید بەناو گوندی دەگەڕان بۆ سوننەت کردنی کوڕان، کاکە دەبووە ڕەت ڕەتانە لەناو گوندی کوڕەك لەوێ ڕای دەکرد، یەکیان دەگرت دەبووە هاتوهاوار لەناو گوندی یەکێك دەی وت: وەی بابەڕۆ ئەوی تر دەی وت وەی ئۆدە مردم، ئەوەی سوننەتیش کرابوو، لەلایەن گەورەکان پێیان دەوترا هەرامەت کارتەی هینایتەوە کوڕەکان تۆقیبوون، سەیریان کرد کچێکیش دەگریێ، وتیان: کچەجوان تۆ بۆ ئەگرییێ خۆ ئەت و کوڕ نیت؟ وتی:

راستە ئەمن کوڕنیمە ئەزانم لۆمنی تیژئەکەن، ئەوە پێشبینییە دەك ئافەرین کیژۆڵە بۆ خۆت و بۆپێشبینیت، خۆزیا هەموومان ئەوەندە بیرتیژ دەبووین و ڕابردوومان دەدیت وە لە سوننەتکردنی کوڕان زۆر دوا دەخرا بە هۆی نەهاتنی مام سەیدان کەتایبەت بوو بە کوڕان، زۆرجار کوڕەکان تەمەنیان دەگەیشتە پێنج ساڵ و حەوت ساڵ بەسەروتریش لە و تەمەنە دەبووە گرێیکی دەروونی کچەکانیش بە گەورەی سوننەت دەکران بە شێوەیەکی زۆر نا تەندرووست، هەرچەند زوو بۆ کوڕان بکرێت، بۆ کوڕان باشترە دیارە بە گوێرەی زانیاری سەردەم بۆ کچان نەکرێت باشترە .

*** *** ***

کابرایەك پێوستی بە کەرێك هەبوو چووە لای کەسێك گوتی: بیانی کەرەێم وێ بدە، کارم پێیە. خاوەن کەر دەڵێ: بەیانی ناتوانم وێت بدەم، کابرا دەڵێ: ئەی دوو بیانی وتی دوو بیانیش کارم پێیە ناتوانم، کابرا دەڵێ: ئەی سێ بیانی وێم نادەی؟ کابرای خاوەن کەر دەڵێ: کاکە وەرە ئێستا بیبەو لەکۆرم ببەوە، ئێمە لەجیاتی بەیانی و دوو بەیانی دەڵێین، سبەینێ، دووزبەی، سێزبەی، چارزبەی، پێنجزبەی، شەشزبەی، هەیینی .

*** *** ***

**ڕووداو :**

کابرایەکی ڕەوەند شەوی بەسەردا دێت لادەداتە ماڵە ڕەوەندێك وەرز هاوینە و شەو جێگای ڕێبوار لەنزیك رەشماری رادێخن و کابرای ڕێبوار دەچێتە سەر شەونوین پار دەداتەوە لە ماندیەتیان خەوی لێ ناکەوی لەپڕ هەست بەجوڵەیەك دەکات سەیر دەکات شوان لە نزیکی ئەو بەرەو ڕەشمار دەچێت گۆپارێك لە ڕەشمار دەدات، ژنێك لەبن ڕەشمار سمتی دینیتەدەرێ و کابراش کاری حرامزادەیی دەکات و دەڕوات، دوای ماوەیەکی تر دووبارە شوان دێتەوە بەهەمان تاس وحەمام کلرەکەی دووبارە دەکاتەوە و دەڕوات، کابرای ڕێبوار زۆر چاوەڕێ دەکات، شوان نایێتەوە ڕێبوار بە نەرمونیانی دەچێت، دارێك لە ڕەشمار دەدات و ژنەکەش سمتی بۆ لەرەشماریێ دەردێنی و کاری خۆی دەکات، بەیانی هەموویان لەکاتی نانخواردن کۆدەبنەوە، ژنەکە هەستێك دەکات گومانێکی لە ڕێبوار پەیدا دەبێت دەڵێتە شوانی ئەرێ ئەو شەو مەڕەمە چەند جار ڕەوینەوە، شوان دەڵێت: دووجار ڕەوینەوە، ژنەدەڵێت بەمن سێ جار ڕەوینەوە، شوان دەڵێت: کچێ باوەڕبکە دووجار ڕەوینەوە، ژنەدەڵێت: نا سێ جار ڕەووینەوە، کابرای ڕێبوار دەڵێت: وەڵڵاهی ئەمنیش جارەکم دی مەڕ ڕەوینەوە، ژن ەتێگەیی کابرای ڕێبوار دزی کردووە !

*** *** ***

کابرایەکی دەوڵەمەند سێ ژنی هینا بوون ساڵ هات وساڵچوو کابراپیربوو بوو نەخۆشیش بوو، زۆریش بێ توانا بووبوو لەهەموو ڕوویێکەوە، ڕۆژکیان هەرسێك ژنی بەشەڕ دێن، کابراش لە دیاریان وەستاوە و دەڵێت:

شەڕە لەگولەکی
لەسەر جۆتەگونەکی
گونیش وەگونان ناچی
رەبی بەقوڕێ داچی
مارێ نگۆش خەرابی
داخوازی نگۆشم
پێ جێبەجێ نابی

*** *** ***

له گوندی زێوەی خۆمان بەهارە و کەسێك دەچێتە قەرەمەگێوژان بۆ پەرژینی، قەرەمان دەکات و بار لەکەرێ دەنێت و لەپڕ کیژۆکاری سێ گوندان دێنە نزیك جەنابی، بۆ کەنگران کابرا نارِوات و لەدیاریان دادەنیشێت، تاکوو کیژۆکار کەنگران دەکەن و دەڕۆن کابراش دەڕوات دەچێتەوە گوندی لەلای خەلکی دەڵێت: ئەوڕۆ لەچیا کەیف وسەیرانم کرد، بارم لەکەرێنا و کیژۆکارێ سێ گوندان پەیدا بوون، ئەمنیش لەدیاریان دانیشتم، تاکوو رۆیشتن کابرایەکی بەتەمەن لێی دەپرسی دەڵێت: هێکت ماچت کردن؟ دەڵێت: نەوەڵلا مەمکێ چ کچانت گرتن؟ دەڵێت: نەوەڵلا. هەتا کیژۆکار رۆیشتن کەر هەر دەبن باری دابوو. دەڵێت: بەلێ. مام ئیختیار دەڵێت: دەباوەڕ بکە ئەتو لەکەرێ کەرتری !

*** *** ***

**چیرۆك:**

له گوندێك ئاغه دەمرێت و مەلای گوندی به مەبەستی دڵدانەوەی ئاغەژن رۆژانە سەردانی دەکات وردە وردە لە ئاغەژن نزیك دەبێتەوە و بە ئاغەژن فێر دەبێت،کوڕیکی ئاغەژن هەست بەو پەیوەندیە دەکات، ناوە ناوە لەلای داکی زەمی مەلا دەکات، بۆ ئەوەی دایکی تێ بگات، ئاغەژنیش دەڵێت: کوڕم لێی گەڕێ به تەمای خوای کە کوڕە دەڵێت ئەو مەلایە هەردەکوژم، ئاغەژن دەڵێت: کوڕم وازی لێ بێنە مەی کوژە بەتەمای خوای، کە شەوێکیان مەلا بەسەربانی دەکەوێت بۆ بانگدان کوڕە لەپشتەوە پەلاماری دەدا و لەمزگەوت فڕێی دەدات مەلا سەروگوێلاکی دەشکێت و گوند بەجێ دێڵێت: کوڕە دەچێتەوە ماڵەوە و دەڵێت: دایە دایکی مەلام . له سەر خانووی مزگەوتێم فڕێدا ئاغەژن دەڵێت: کوڕم بە گوێت نەکردم وتم بیدە خوای، کوڕە تورە دەبێت و دەڵێت دایە ئەگەر بە تەمای خوای لێگەڕابام هە تا ئەمرد هەر ئەتوی ...........)

*** *** ***

له گوندەکەمان کەسێك هەبووە بەناوی (سۆفی ئەحمەد ) پیاوێکی زیرەك و خواناس بووە، بەردەوام شەوان نان و مێوژی خواردووە بە مەبەستی تەندروستی، واتە هەموو فەسڵەکانی ساڵ شەوان برێك مێوژ و نانی رەقی خواردووە، زۆر قسەی نەستەق و خۆشی هەبووینە یەکێك لە قسە بەناو بانگەکانی:

(کاکی من ناکرێت هەرچی تری ئەمن برێم بەگونم،ئەگەر وابێت یەك مووم بەگونانەوە نامینێت) یان (زمانی خەلکی کونە مشك نیە تۆپە قوڕێکی لێدەی) واتە: پیاو ناکرێت هیچ

کارێك نەکات لەترسی قسەی خەڵکی، واتە ناکرێت من گوێ لە قسەی هەمووکەس بگرم و وەڵامیان بدەمەوە هەندێك جار خۆت لەگێلی بدە ڕەخنە مەگرە، ڕەخنە زۆر جار ئاگرە و دەت سوتێنێت چونکە سەخڵەتی زۆکەس وایە ئەگەر ئامۆژگاریت کرد لێت دەبێتە دووژمن، زۆر کەس مێشکی سەخڵەتی بەردی هەیە چاکەی بۆ باس بکە ئەو بە خراپەی دەزانێت، خۆت لە هەمووکەس مەکە (مام مۆتك) خەڵکی بۆ خۆدەژی هەموو کەسیش هەڵ ناکەوێت چەمی ئەسپیندار، پێکەوە دەچێنریت دوای چەندساڵ هەندێکیان باش گەشە دەکەن، هەند ێکیان نەخۆشن و گەشە ناکەن هەندێکیان وردە وردە وشك دەبن، مرۆڤیش وایە ناکرێت هەموو کەس پیلو بێت و پیاویش نابێت.

*** *** ***

هە بوو نەبوو کوڕە دزمێك ئاشقی کچە جووتیارێك بووبوو، زۆر چوبوو بۆ داخوازی کابرا ئامادەنەبوو کچی خۆی بەکوڕە دزمێك بدات کوڕە دزم ڕۆژ نەبوو مەلاو شێخ نەباتە لای باوکی کچە، باوکی کچە ڕۆژێکیان بە کوڕە دزمەکەی گوت کاکی من ئەگەر توانیت یەك درهەم لە فلان حاجی بستێنی، من کچەکەمت پێشکەش دەکەم، کوڕە دزم وتی ئەوە زۆر ئاسانە ڕۆیشت و چوە لای مام حاجی، مام حاجی مەشوور بوو بە ڕەزیلی چوە لای و گوتی مام حاجی هاتیمە یەك درهەمم بدێ، حاجی وتی: خوا بتداتێ کوڕم، بۆ ماوەی یەك هەفتە کوڕە دزم سەردانی مام حاجی کرد و داوای درهەمێکی لێ دەکرد مام حاجی هەر بە یەك وشە وەڵامی دەدایەوە دەی وت خوا بت داتێ، ڕۆژێکیان کوڕە دزم وتی حاجی پاشی دەساڵی تر قەولم پێ بدە دێمەوە درهەمێکم بدەیێ، حاجی لە دڵی خۆی وتی: باشە ئەو سەگبابە لەکۆڵەخۆ بکەمەوە وتی: باشە دوای دەساڵی تر وەرەوە دەت دەمێ، کوڕە دزم ڕۆژی دوەم لەگەڵ مەلابانگدان بەردێکی لەدەرگای ماڵی مام حاجی داو حاجی بەرەو دەرگاهات وتی: بەو بەیانیە چ سەگبابێك بوو، بەردی لەدەرگادا کوڕە دزم وتی: مام حاجی تورەمەبە من بووم وتم:

با مام حاجی لەبیر نەکات لە دەساڵان ئەوە ڕۆژێك کوڕە دزم چەند ڕۆژێك ئەوکارەی دوو بارەکردەوە ڕۆژێکیان حاجی وتی وەرە دزمی سەگباب تۆ لەمن بێ چاو ڕووتری ئەوە درهەمەکەت نەت بینمەوە، لەو ناوە کاکی دزم درهەمەکەی بۆمام جووتیار بردوو کچەکەی لێ خواست.

بەڵێ ئەگەر مرۆڤ بێنی هەبێ ڕۆژێك دێت بە ئامانج دەگات وشەی بێن لە ناوچەی سورچیایەتی بە کار دێت لەجیاتی (سەبری عەرەبی) ساڵی ( ١٩٩٠ ) لە کەونە گوندی باتاس

خۆم لە ڕژێم حەشاردا بوو لەماڵە ئامۆزایەکم بەناوی مەلا جمیل. ڕۆژکیان ژنەکان کۆببوونەوە بۆ گفتوگۆی خۆیان یەکیان وتی، ئەنگۆ بە من نابێن ئەو مرۆیەی کو هەندە بێن دیٚمنیش لەدڵی خۆم گوتم بەخوای خوشکە لەخۆشی نییە، هەندە بەبێنم پێ لەخۆشی ناترێ. ڕێزم بۆ دزۆمان هەیە، چونکە ئێمە زۆر قەرداری دزۆمانین، دزۆم بە درێژایی قۆناغی دەرەبەگایەتی داهێنەری کەرستەی جووتیاری بوون، هێنانی کەرستەی جووتیاری لە گەلان بۆ ئێمە و لە ئێمە بۆ ئەوان... مامەڵەشیان ئاسان بوو. نان و ڕوونێکی تێدابا، دەربازیان ناکرد. یەك مەرجیان هەبوو لە مامەڵە ئەوان لە گۆڕینەوە پارەیان لەسەر هیچ شتێك نادا، دەبووایە شتێك وەرگرن ئەگەر کەمیش بووایە، کێشەیان نەبوو پێیان دەوت: ( نان و ڕوون ). کێشەیەکی تریشیان هەبوو، لەگەڵ یەك ناگونجان ئەگەر چوار ماڵبات، لەنزیك یەك نیشتەجێبان، ناوەناوە دەبووە شەڕیان ئەکرێت، هەر ئەو کێشەیەش بێت خاوەنی وڵاتی خۆیان نینە و لەناو گەلان وردە وردە دەتوێنەوە بەشکی زۆر لە جووتیاران وایان دەزانی تیژکردنی کەرستەی جووتیاری وەرەسەیە بۆیە واباو بوو ئەگەر قونجرکێك لە ژنە دزۆمێك بدەی، ئەوە هەمرو کەرستەیەکی جووتیاریت بەدەستی تیژدەبێت، کابرای قونجرکەی لە ژنەدزۆمێ دەدا دەی وت: (لەنییەتی سان و ترنجی). ژنە دزۆمەکانیش ترسابوون، کە پیاوێك لێیان نزیك دەبووەوە ئەوان دوور دەکەوتنەوە، دیارە پیاوانیش بەنهێنی ئەوکارەیان دەکرد، بەژنانیان دەوت: ژنەدزۆم خەریك بکەن لەپڕ قونجرکەیان لێ دەدا. ئێمە لە خۆشناوەتی دەڵێین: (لێی ڕەبادا، یان لێ ڕەبادان ) کە ژنەدزۆمی قوربەسەر لێی ڕەبا دەدرا لەتاو ئازاری دەی قیژاندو و چەند جوینێکی تەڕی بەو کەسە دەدا، وەك:دە دەوی بابت ڕم، زۆری تریش، خزمانی دزۆم شارەزابوون، لە زوڕناو دەهۆڵ و بلوێر و تەپڵ بەشداردەبوون، لە خۆشی و بۆنەکانی جووتیاران، ئەو کەرستانەی دروستیان دەکرد وەك تەشی و تیۆك وناوبرێشك و گاسن ومەساسە و فیشەقان و داس و داسوکە چەقو لە جۆری سی کارد، هێرەنگ و بێژنگ سەرەد شەنەو شەکرشکێن و تیژکردنەوە و سەقاکردنەوەی بیور و داسو داسوکە و ئەوانی تر.. هێنانی کەر و فرۆشتن و گۆڕینەوە، کەوابوو ئێمە زۆر قەرداری خزمانی دزۆمین لەو وڵاتە پێویستە ئەرك و مافیان پارێزراو بێت وەك ئێمە.

زۆرجار ئێمە کە تووشی کێشەیەکی دەورو بەردەبین خەڵکی خێرخواز و پیاوی باش دێنە ناو کێشەکە ئەگەر بەگوێیان بکەین قازانج دەکەین زوو کێشەکە کۆتایی دێت، ئەگەر بەقسەی کەسمان نەکرد دواتر دەبێت دەستی گاوان ماچ بکەین، گاوان لەلای من جێگای ڕێزە.

*** *** ***

**گوندێکی لای خۆمان دوو بەش دەبێت، واتە ئەم بەر و ئەوبەر، نێوانیان ڕووبارێك دەبێت، دوو بنەماڵەی گەورە لەو گوندە دەبن، کێشە لەنێوانیان دروست دەبێت، خێرومەند و پیاوی باش دەکەونە نێوانیان، بە قسەی کەس ناکەن، وردە وردە دەست دەکەن بە کوشتنی یەکتر لە دووروبەر دەیان مەلا و ڕیشسپی دێنە ناو کێشەکە ڕێز لە قسەی کەس ناگرن بەردەوام دەبن لە کوشتنی یەکتر وردە وردە خەڵکی وازیان لێ دینن، دوای چەند ساڵێك دێنە ئەو باوەڕەی سوڵح بکەن، دیارە دڵی زۆر خەڵکیان شکاند بوو،چاو و ڕوویان نەما بوو بەکەس بڵێن وەرە سوڵحمان بۆ بکەن. ڕۆژکیان گاوانی گوندی لەچیا خەریکی نان و چاخواردنە بە خەیاڵی دادێ دەڵێت ئێوارە بچمەوە داوا لە خزمانی گوندی دەکەم سوڵح بکەن، ئێوارە زوو دەچێتە لای مام کێخوای، دەڵێت: مام کێخوا هاتیمە سوڵح لەگەڵ خزمانی ئەوبەر بکەین مام کێخوا دەڵێت هەستە بابڕۆین گاوان ومام کێخوا بەرەو ئەوبەر دەچن خزمانی ئەوبەر کەچاویان وە مام کێخواو گاوان دەکەوێت ئەوانیش بەرەو مام کێخوادێن لەسەر پردێ دەگەنە یەك و یەکتر ماچ دەکەن، زۆریش بۆ یەکتر دەگرین. بەڵێ کورد دەڵێت: مامەڵەی یەکەم جار باشترە .**

*** *** ***

**بەسەرهات**

**لە زەمانی عوسمانییەکان کەسێك ژن دێنی و دوای مانگێك دەیکەنە سەرباز، کابرا بۆ ماوەی چوارساڵ پەیدا دەبێتەوە دێتەوە، ماڵەوەیان خەنی دەبن دوای سەلام وکەلام، دەبینێت سێ منداڵ لە ماڵەوەن دەڵێتە خێزانی ئەو منداڵانە منداڵی کێنە؟ ژنەکە دەڵێت مێردە منداری خۆینن. دەڵێت: ژنێ ئەمە مندار لەکێ بوون؟ ژنە دەڵێت: مێردە کە چوویە عەسکەریێ منداریکم دەزگی دا بوو، پاشی سارەکی ئەتووم هاتیە خەونێ و منداڕەکم وەزگی کەوت، بەسەری هەردوو منداران باسی ئەوی گچکۆکەش مەکە،کابرا دەڵێت دەباشە ژنێ ئەوە باسم نەکرد. کابرا بووە بابی سێ کوڕان خوای پێ بێرن دەگەر حازریان .**

**کورد لەمێژە دەڵێت بەکاسبیێ نییە کەخوا دای دای. یان کورد دەڵێت: ئەگەر خوای دا لەخەتەکی دەدا. کابرایەکی جووتیار دەچێتە جۆتی گاجووتان دادەبەستی و دەست بەجووتکردن دەکات، لە یەکەم خەتە جووت کوپە زێڕێکی گەورە دەبینیتەوە، کابرا واز لە جووتیارێ دینێت و دەوڵەمەند دەبێت، جووتیارێك بەکرێ دەگرێت لێی دەپرسن بەچی دەوڵەمەند بووی؟ دەڵێت**

**ئەگەر خوابدات لەخەتێك دەدات .**
**بەڵێ کابرای سەرباز خودا سێ مندارۆکەی پێدان شوکری خوای دەوێت.**

*** *** ***

**لەگوندی مەلەکان کەسێك هەبوو بە ناوی (مام ئۆمەر) خزمانی مەلەکان دەبووایە پێداوستی پێنج مانگ ئامادە بکەن بۆ زستان، زستانی مەلەکان زۆر سەختە م(ام ئۆمەر) بەخۆی و کەرەکەی دێتە لای خۆمان و بارێك پێداوستی لە کەرێ دەنێت بەرەو دەرەشێ دەچێت لە ناوەراستی دەرەشێ کەرەکەی دەوەستێ، کەرەکەی ناڕوات ناوی خوای لێ دێنیت باری کەرەکەی بەسەر دەرەشێ دێخی و دەگەڕێتەوە، قاچی کەرەکەی دەبەستێ و کەرەکەش لەسەرشانی خۆی دادەنێت تاکو لەشاخی بەسەر دەخات لەسەرەوە بارەکە لەکەرێ دەنێتەوە و دەڕوات. ئەوەی دەرەشێی دیتبێت ئەوە دەزانێت کەر وەسەرخستن بەکۆڵ شتێکی مەحاڵە ئەوەی نەیدیوە ئەگەرڕۆی بچێت هیچیشی پێ نەبێت، دەبێت چەندان پشی بدات بە سعاتێکیش سەر ناکەوێت، ئەگەر لە خوارەوەش تەماشا بکات ئەقڵی نابڕێت ڕێگا لەو شوێنە هەبێت .**

*** *** ***

**لەنێوان گوندی بێراوە و گوندی کانی بەرد گوڕستانێکی گەورە هەیە بە ناوی (بچووکە)....لەوێ دوو برادەر دەبن یەکیان خەرکی دەوروبەری خۆمان دەبێت ناوی گوندەکە نادەم ئەوەی تر خەرکی ڕۆژئاوای سەفینە شێتی خۆشناوان دەبێت، هەردووکیان دەچنە دەشتی هەولێرێ بۆ ساغکردنەوەی ترێ، لە ڕێگا دەبنە ڕەفیق پێکەوەدەبن تاکوو ناوچەی کەندێناوەی ترێ بەگەنم دەگۆڕنەوەو دەگەڕێنەوە قسە بەقسە ڕێك دەکەون ژن بەژنی بکەن بۆ کوڕەکانیان دوای مارەکردن نێوان بالیسان و گوندی بێراوە دیاری دەکەن بۆ گوڕینەوەی بووکەکان، ڕۆژێك دیاری دەکەن، هەر یەکە و بەرێ دەکەوێ بۆ شوێنی دیاری کراو، دیارە هەرلایەك چەندان کەسی لەگەڵ خۆی هێناوە، دوای چاك و چۆنی لەیەك کردن وپشودانێکی کەم، دەست بەشایی دەکەن، پێش ئەوەی چەك زۆربێت، زۆربەی خەڵکی دەبووایە خەنجەری هەبێت و شانازیش بووە، پێیان وتوە (برای بەرپشتێ)، یان کورد دەڵێت: خەنجەر باشترە لەبرای. لەو زەمان باوبووە وەك دوای ڕاپەرین بیکەیسی و زنجیر لەخۆ ئالآندن و حەفتاوپێنجی هەڵگرتن و خۆبادان باوبوو... ئەو دوو ماڵباتە لەسەر سەرچۆپی کێشەیان لەنێوان دروست دەبێت، ڕاست و چەپ بە خەنجەران دەکەونە ناو یەك، کۆتایی بە یەك دێنن تەنها پیاوێك دەردەچێ ئەویش هەردوو بووکەکان دەکوژێت!**

ئەو بچووکە ماوە ئەوەی باوەڕناکات بابێت سەیری بکات پێکەوە سەردانی دەکەین، ئەو چیۆکە غەریب نییە، ئەمڕۆش لە سەر سەرچۆپی دەیان شەڕ ڕوودەدات و خەڵك دەکوژێت، بەتایبەتی لەسەر ڕەنگی زەرد وسەوز من لەدووای ڕاپەڕین چوونە بووکانم تەرك کردووە، لەبەر ململانێی ڕەنگ، ئەمڕۆش لە حزبایەتی هەر وایە، برای دایك وبابی یەکتر دەکوژن، لەسەر حیزبەکەی یان لەسەر ڕەنگ، با لۆمەی دوێنێ نەکەین بڵێین نەزان بووینە یەکتریان بە خەنجەران کوشتووە لەسەر سەرچۆپی!

*** *** ***

حاجی باپیر شێخ وەسانی گەنج دەبێت و کچی مام (.........) بۆ دەخوازن کەناوی هەمین بووە، دوای شەش مانگ وردە کێشەیەکیان لەنێوان دروست دەبێت، هەمین دەچێتەوە ماڵە بابی کەچی مام (.....) بووە مام (....) زۆر توڕە دەبێت و بۆ ماوەی شەش ساڵ کچەکەی نانێرێتەوە بۆ ساڵی حەوت وەختی مازیان دەبێت، حاجی باپیر دەچێتە مازیان و هەمینیش دەچێتە مازیان بە سوودفە لە بن دارێك ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە، سەیری یەکتر دەکەن دەست دەکەن بە گریان دواتر تامێز لە یەکتر دەدەن و ماوەیەکی باش گلەیی و گازاندە لەیەك دەکەن، دواتر ناوی خوای لێ دینن، دەست دەکەن بە ساوارخواردن تاکوو لە یەك تێردەبن، دواتر هەر یەکە و بەدوای مازیان دەکەوێت، دوای چەند مانگ هەمین خەبەر دەنێرێت بۆ حاجی باپیر دەڵێت: زگم هەیە و چارەکی بکات، حاجی باپیر چەند کەس دەنێرێتە لای مام (....... )، مام ........ڕازی نابێت هەمین بچێتەوە لای مێردی دواتر هەمین بەدایکی دەڵێت دایە من زگم لەحاجی باپیر هەیە، دایکی دەڵێت: کچێ سەرشینێ زگی چ؟ دەڵێت دایە لە مازیان ئێکدین دی و پێك هاتینەوە، دایکی هەمینێ شەوێکیان لەگەڵ مێردی دادەنیشێت و دەڵێت: کار لەکار ترازاوە حاڵ و حیساب وایە، مام بڕیار دەدات هەمین بچێتەوە.

حاجی باپیر پیاوێکی قسەخۆش و بەدین و سادە بوو، زۆر حەزی لەگاڵتە بوو، گەنجان توڕەیان دەکرد بۆ ئەوەی جوێن بدات گەنجەکان قسەیان هەبوو، حاجی باپیر زۆر پێ توڕە دەبوو، کە ئەو قسەیان پێ دەوت، حاجی باپیر کەسی نەدەهێشت دایکی کابرای وادەشێلا باس ناکرێت، حاجی قادری کوڕیشی هەروا بوو، حەزی لە دەستەگەمەبوو.

لەساڵی ۱۹۹۳ من و برادەرێك بەناوی ڕشید میوانی حاجی قادر بووین، یەك ددانی لەپێشەوە مابوو تەنیا ددانێك نەبێت، هەرچەندە ساغ بوو، بەلام بەتەنیا ناشیرین بوو، بڕیارمان دا

**ددانەکەی دەر بێنین ڕەشید حاجی قادری لەئەرز داو منیش ددانەکەم دەرهێنا و هەردوو کمان هەڵاتین تاهیلاك بوو جوێنی بەداکی هەردووکمان دا.**

**لە شێخ وەسانان پیاوێکمان هەبوو ناوی سۆفی مستەفا بوو، پیاوێکی زۆر زیرەك بوو، قسەی زۆرخۆش بوون، پیاوێکی خواناس بوو دەنگی زۆر خۆش بوو، قەسیدەی خۆشی لەبەر بوون، ڕدێنێکی گەورە و جوانی هەبوو. پۆشتە و پاك وخاوێن بوو، دووسێ دەسماڵی سپی دەپۆشی. بەردەوام سەرکردەکانمان دەیان نارده هەولێر و دهۆك و سلێمانی شارەکانی تر بەمەبەستی نامەبردن ... پیاوانی ڕژێم گومانیان لێ نە دەکرد، جارجار تورە دەبوو، لە منداڵەکانی قاپو قاچاغی ماڵەوەی دەشکاند، یان مەنجەڵی چێشتی فرێ دەدا، یان ئیستیکانی دەشکاندن، واتە: ڕقی خۆی بەو شتانە دەر دەکرد. قسەی زۆر سەیری لابوون، دەی وت:"کەی هونەرییە گان کردن بە هەرامەی خەرکی!" واتەپیاو دەبێت بەخۆ شێربێت وەك ڕێوی چاوەڕێی شێر نەکات کە شتێکی بۆ بەجێ بێڵێت لەنێچیرەکەی، یان پیاو نابێت خۆی هەڵکێشێت بڵێت من کوڕی فلانم، یان خزمی فلانم، یان حیمایەی فلانم، ئەوەیە گان کردن بە هەرامەی خەرکی! ئەوکەسە پیاوە بەخۆی پیاوێکی دیار و چاکخواز بێت، بە دەستی خۆی نانێکی باش بۆ خۆی و منداڵەکانی پەیدا بکات، خزمەتێك بە بەرژەوندی گشتی بکات... مام سۆفی مستەفا ڕۆژکیان دەچێتە لای خزمانی مام سار لە بن تاتی کەدەکاتە خوار کەپکی حەمەد ئاغا، دەچێتە ماڵی مام ڕەسوولێ مام سار، کۆمەڵێك پێشمەرگەی حزبی شیوعی میوانی مام ڕەسوول دەبن، مام سۆفی دوای سەلام و چاك وچۆنی قسە بەقسە برادەرانی شیوعی مام سۆفی بە هەڵەدەبەن و خۆیان دەکەنە پێشمەرگەی یەکێتی و زەمی شوعیان دەکەن، مام سۆفی دەکەوێتە زەمی شیوعیەکان کەوانە و وانە، دواتر خۆیان کەشف دەکەن... مام سۆفی زۆر دەترسێت و دیارە مام ڕەسوولێ مام سار نەجاتی دەدات. مام ڕەسوول مام سار کەسایەتیەکی بەرز بوو لەناوتیرەی مام ساران، پیاوێکی دڵسۆز و نیشتیمان پەروەربوو، بەهەموو تەمەنی خۆی ڕۆژێك لە ڕۆژان بەرانبەر خەباتی ڕەوای گەلەکەمان کەمتەرخەم نەبووە، هەر بۆیە ڕژێمی رووخاو لەساڵی ١٩٨٨ ئەنفالی کرد. بامنیش دوو قسە بکەم کێنە ئەو مرۆڤانەی لە لای خەڵکی خۆشەویستن؟ دوای مردنیشیان ناو ناوبانگیان دەمینێت و مێژوو بەئاوی زێڕ لەبارەیان دەنوسێت، ئەو مرۆڤانە خاوەن چەند خەسڵەتێکن ڕاستگۆی و داوێنپاکی و بە وەفابوون، بەهەڵوێست و دڵسۆزن بۆ گەل و نیشتمان . دەستپاکی واتا: دوورخستنەوە لە مشەخۆری، هاندانی خەڵکی بۆ کاری باش و چاوت لەهەتیوو فەقیر و پەککەوتە**

ـ کەمنەندامان بێت. زمانت لەگەڵ خەڵکی شیرین بێت مەردانە نانێکی حەڵاڵ پەیدا بکەی بۆ منالەکانت، چاوت لە دەستی خەڵکی نەبێت، هاوکاری بە هەر شێوەیەك بێت بۆ ئەوکەسانەی توشی کێشەیەك دەبن، خۆ دوورخستنەوە لە درۆ و بووختان و دووزمانی و کاری جاسووسایەتی. مەگەر لەخزمەتی گشتی دابێت، خۆ هەڵنەکێشان بەپلە و پایە و خزم و خزمایەتی، غەدر ـەکردن لە خەڵکی بێدەستەڵات، هەمووکەس پێوستی بە ڕێزە هەرچۆنێك بێت، ڕێز لە خێزانت و منالەکانت بنێ و ئەوەندەی دەتوانی ماڵێکی بێدەنگیان بۆ بنیات بنێ، فێر بکرێن ڕێز لەیەکتر بنێ، نەبنە بار بەسەر خەڵکی، ڕێزگرتن لە هەر نەتەوەیەك و دینێك و مەزهەبێك، ڕێزگرتن لە هەر یاسایەك، کە لە خزمەتی گشتی دایە، خۆزیا من و ئێوەش خاوەنی ئەو سیفەتانە دەبووین، پێمان دەکرا خۆشەویستی خەڵکی بین، بۆئەوەی بەخۆمان بڵێین مرۆڤ .

*** *** ***

لەو گوندانەی خۆمان ژن و مێردێك بەشەڕدین ژنە ناوی هەمین دەبێت ماوەیەکی زۆر ناچێتەوە لای مێردی ڕۆژێکیان ردێن سپی یەك ئەو ژنە دەبینێت و دەڵێت کێژێ من بەگوێی مامی خۆت بکە نانی مێردی لەهەموو نانێکی بێمنەتتره، ژنە دەڵێت ناچمەوە کاسێ لۆ برای خۆ بکەم باشترە، دوای ماوەیەکی کەم کابرای ردێنسپی دەچێتە ناو باغچان دەبینی پیاوێك خەریکی ژنێکە لەبن بنە هەنجیرێك نیزکتر دەبیتەوە، دەبینی هەمینە و مێردی خۆی خەریکە. دەڵێت: هەمین هەمین وای کاسبیت لۆ برایان کرد.

*** *** ***

ڕووداو

یەکێك لە بنەماڵەی شێخە بەرێزەکانی بالیسان ڕۆژێکیان ژنەدۆمێك دێتەماڵیان بۆ فرۆشتنی تەشی و تیزۆك، لە کاتی ڕۆیشتن پەلاماری مریشکێك دەدات و ڕادەکات، خێزانی شێخی چاوی لە ژنەدۆم دەبێت و دەڵێت: جەنابی شێخ ژنەدۆمێ مریشك برد، شێخ دەکەوێتە دوو ژنەدۆمێ، لەدووری سەدمەتر لە ژنەدۆمێ نزیك دەبێتەوە، ژنەدۆم زۆرزان دەبێت کە دەزانێت لە دەست شێخ نەجاتی نابێت کراس لەسەر هەرامە و مەرامەی لادەبات شێخ کە بەو شێوەیە ژنەدۆم دەبینێت ڕوو وەردەگێرێ و دەڵێت: دەك ڕووت ڕەش بێت ژنەتیم . جەنابی شێخ دەگەڕێتەوە ژنەدۆمیش مریشك دەبات و دەڕوا .

*** *** ***

باسی بنەماڵەی شێخانی بالیسان کرا کەسمان لاریمان نییە لەو ماڵباتە کە پیاوی زاناو نیشتیمان پەروەریان هەبووە و پێم وایە دەشبێت وەك من لەتەمەنی خۆم دووکەسی بەرێزم دیون لەنزیکەوە ئاگام لێیان بووە، وەك شێخ مەلانجمەدین شەهیدی سەرکردە وشێخ سلێمان، شیخ مەلانجمەدین عیب و عاری گوندێك وناوچەیەکی بزرکردبوو، یەکێك بوو لە کەسە دەگمەنەکان، لەخزمەتی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بوو... ئەو بنەماڵە زۆر زاناو پیاوی نیشتیمانییان هەبووینە، نموونەی: مەلامحەمەد کە سەردەمێك کەوتە بەغدا، شەهید شێخ سلێمانیش کە کادیر و رۆشنبیر و شۆڕشگێڕبووە، مامۆستای من بووە، بە مامۆستای خۆی دەزانم، شێخێکی بەڕێزیان لەنامیلکەیەك دا باسی ماڵباتی خۆی دەکات کارێکی باشی کردووە، بەڵام لە وتەیەکی باسی بالیسان دەکات کە بالیسان شێوایە کەوتۆتە دەستی خەڵکی بیگانە! من دەڵێم قوربان ئەوانەی کاربەدەستن لە بالیسان بالیسانیان، گوند بوو بە شار بەهیمەتی هەموولایەکی...هەرئەوانەش بوون لە رابردوو بەرگرییان لە بالیسان و دەوروبەردەکرد و بە رووباریش خوێنیان رژاوە لەپێناوی کوردستان و ناوچەکە و بالیسان هەموشیان خەڵکی ناوچەکەن، بێگانە نەتەوەیەکی ترە من و فلان نین، ئەوانە بێگانەبوون بالیسانیان وێران کردبوو... رێزت هەیە یاشێخ من تەڵەبەی شێخ سولەیمانم، لەبەر گۆڕی شێخ سلێمان ئەدەب دەنوێنم لە بەرابەر جەنابت.. هەر ئەوەندە دەڵێم هەندێك کەس ناکرێت هەڵە بکات چونکە بە زۆر لەسەری دەوەستێت، باپیران دەڵێن: قسە هاتە روو نامینێن چ گلەیی هەر زوو، واتە: هەندێك جار قافیەی قسەدێت پیاو واباشە قسەکە بکات وەك مامۆستا .

*** *** ***

رۆژێك ژنێك مێردی دەمرێت و دوای شوشتن دەی بەنە سەر قەبران، ژنەش لەگەڵ مەیتی دەچێتە سەر قەبران، مەلای گوندیش دەست دەکات بە قورئان خویندن، لەسەر مەیتی کابرا ژنەکە کڕ نابێت، لەناو گریانیش هەر دەڵێت ئەی رۆ چ بکەم چ بکەم؟ مامۆستا لەبەر گریان و چی بکەم، چەند جار توشی هەڵەدەبێت لەقورئان خوێندن، مەلا لە دڵی خۆی دەڵێت: دەبێ ئەو ژنە مەبەستێکی نەبێت لەو چ بکەم چ بکەم؟ واباشە پێی بڵێم غەمێ هەرمەگرە، من بکە، ئەو جارەیان ژنەکە دەڵێت:

ئەی رۆ، چ بکەم، چ بکەم؟ مەلا لەسەر نزمی قورئان خویندن دەڵێت:

خەمێ مەخۆ

**من بکە من بکە**

**ژنەوەلامی مەلا دەداتەوە و دەڵێت:**

**کەنگێ کەنگێ**

**مەلا دەڵێت:**

**سارنو سارنو**

**ژنەکە دەڵێت**

**تاهو تاهو!**

**واتە مەلا سارێك زۆرە من چاوەڕێی مێرد کردن بکەم!**

*** *** ***

**جارێکی تر ژنێك مێردی دەمرێت و ژنێکی بەرچاویش دەبێت، کابرادەشۆن و کفنی دەکەن، بەرە ولای گۆڕستانی دەبەن، دوور لە قەبری دادەنێن مەلای گوندی دەچێتەلای کابرای مردوو، بە مەبەستی قورئان خوێندن، خێزانی کابرای مردووش دەچێت لە لای تەرمی مێردی دادەنیشێت و بۆ کابرادەگریێ، مامۆستا دەیەوێت لەو فرسەتە دوو قسە لەگەڵ ژنەتێم بکات مەلا دەڵێت: خوشکێ چناکرێ، هەموومان دەمرین، ئەوڕۆنا بەیانی، کەسیش دوای مردیان مارێنخۆ خەرانەکردیە، ئەگەر ویستت مێردی بکەیەوە، پێم خۆشە قەولم پێ بدەی مێردی بەمن بکەیەوە، ژنە دەڵێت بریا زووترت پێ گۆتبام، ئەبوومە مەلاژنیش، چ بکەم کەسێکی تر، پێش جەنابت تەکلیفی لێ کردم ئەمنیش قەولم پێ داوە! مەلادەڵێت: خوشکێ لەوەی زووتر هێشتان مەیت نەشاردرایتەوە؟ ژنە دەڵێت: لەکاتی مەیت شوتن ئەوکەسەی مەیتی دەشوت داوای منی کرد و منیش قەولم پێ داوە!**

**چیای کۆڕەك چیایەکی بەرزە و لە ڕووی زانستی سەربازی دۆست و دووژمن گرنگی ئەو چیایەیان زانیوە، بۆیە بە درێژایی ڕژێمە یەك لەدوای یەکەکانی داگیرکەری کوردستان گرنگی زۆریان بەچیای کۆڕەك داوە، لە ساڵی ١٩٧٤ پێشتریش هێزی پێشمەرگە زۆرجار ویستویانە ئەو چیایە رزگار بکەن، نەتواندراوە چەندان شەهیدی لێ دراوە، نموونەی شەهیدی سەرکردە شەهید حەمەزیاد بووە، پێم وایە جارێکیان زۆربەیان رزگار کرد، تەنیا یەك ڕەبایە مابوو، لە دوای ساڵەکانی ١٩٨٠، ڕژێمی سەدام بەنیاز بوو مەرسەد فەلەکی لێ دروست بکات، دواتر تەیارەی نیهانی لە دۆڵی خوشناوەتی زۆر بەنزمی بۆی هاتن و وێرانیان کرد، بە وردی زانیاریم نییە لەسەر**

تەواوی شەڕەکانی چیای کۆڕەك، ئەکرێت کەسێکی شارەزاتر لەمن باسی بکات یەکێك لەو گۆرانیانەی باسی شەڕی کۆڕەك دەکات کە لە دۆڵی مەلەکان دەوترا بەو شێوەی خوارەوە بوو :

ئاشی مەلا عوسمانی
مەقەڕی مەلەکیانی
سەرپەلەکیان کاکی تو
یەکیان رەسوری سیمانی
شەری کورەکیان کرد
لۆ ئاقیبەو بەتانی
شێرەك دەناو شەڕیدا
قادرە کۆری مەلەکی
لەخۆی هەڵدا فەردە قۆندەرەکی
شاردیەوە لەبنەی کورەکی
لێی دزی کابرایەکی
حەوت ڕۆژانی لێ ڕۆنی
هاتەوە بەلینگەکی

*** *** ***

لەگوندی بێراوەی خۆمان کەسێك هەبووە لەساڵەکانی هاتنی ئینگلیز بۆ کوردستان بەناوی ( داود ) کەسێکی باش نەبووە، کەدوو بنەماڵە نێوانیان باش نەبووبێت جەنابی بە دزی کەرستەی جووتکردنی شکاندوون، یان کلکی کەرانی بڕیوە، یان گوێی بزنانی بڕیوە یان دێ چروی سوتاندوون، بەمەبەستی ئاژاوە دروست کردن... یەکێك لەئاژاوەکانی ئەو پیاوە حەوت کەس بەخەنجەر یەکتریان کوشتوە لەبەر دەرگایی مزگەوتی بێراوە، ناوی ئەوانەی کوژراون و ناویان زاندراوە لە پیلانەکەی داود:

عەزیز بەگ
عەبدوڵڵا
ئەحمەد برپاس
مام حسێن

عەبدوڵڵا ،لە زەمانی مەلیك لەسەر ئەوكوشتارە دەست گیر كرا و لە سێدارە درا.

ئەوپیاوە زۆر خراپ بووە خێزانی ناوی (خەجیج) دەبێت هەست بە ئاژاوەی مێردی دەكات، زۆر پێی نارازی دەبێت، زۆر ئامۆژگاری دەكات داود بەقسەی ناكات ڕۆژێكیان لەسەر ئەو كارە خراپانە بەشەڕ دێن داود بەنیاز بووە خەجیجی خێزانی لە سەریان فرەی بداتەخوارێ بەمەبەستی ئەوەی كارەخراپەكانی ون بن، خەجیج ناكاتە نامەردی پەلاماری گونی داود دەدات و بەری نادات، هەرپایان دەدات تاكو داود لەهۆش خۆی دەچێت، داود بەو گون ڕاكێشانە دەمرێت لە سەرمەرگە داوای گەردەن ئازای لەخەڵكی دەكات دیارە كەس گەردەنی ئازاد ناكات، هەرپێی پوور خەجیج لە كوشتنی داود، لەمێژە كورد دەڵێت شێر لەلانە هەستا چنێر چمێ...

*** *** ***

ڕۆژێكیان لە گوندی شارسینەی جیانمان كەسێك بۆ ناو نووسكردنی ناوی منداڵەكانی بە جیایی بێجان سەردەكەوێت و دەچێتە ڕواندز بۆ لای (كاتب نفوس) جەنابی كاتب نفوس ناوی منداڵەكانی لێ دەپرسی ناوی یەكیانی لەبیر دەچێت، هەرچەندی هەوڵ دەدات نایەتەوە بیری، لەوێ دەگەڕێتەوە بۆ گوندی شارسینە كەنێوان ڕواندز و ئەو گوندە دەیان كیلۆمەتر دەبێت، دەگاتەوە پێش مارێ خۆی خێزانی لەدەرێ دەبێت دەڵێت: ئەرێ ژنێ حەمەدی كوڕ ناوی چییە؟ خێزانی دەڵێت: ناوی حەمەدە، ئەدی ئەتو نازانی ناوی حەمەدە. كابرا دەست دەكات بەپێكەنین، خێزانی دەڵێت: بەچی پێدەكەنی؟ دەڵێت هیچ بەخۆم پێ دەكەنم خۆی ناشكێنێتەوە لەلای خێزانی، بەیانی دووبارە دەچێتەوە ڕواندز.

زۆرم باسی خەڵك كرد، بای باسی خۆشم بكەم چونكە خۆشم تۆزێك (هێرم) هێرپەكەشم بەرمەیە، مێشكم زۆر جار پێش ڕووداو ئاگادارم دەكاتەوە، زۆرجاریش ناوی منداڵەكانی خۆم لەبیر دەچێت، سێ ساڵ پێش خۆم دەبینم بەپێچەوانەش، سەیری كابرادەكەم نای بینم، چەند نموونەیەك بینمەوە: لە ساڵی ١٩٨٨ من و زریان شێخ وەسانی و سابیرتوتمەیی لە ناو شێخ وەسانان لەخانیەك دانیشت بووین نیو سعات پێش ئەوەی تەیارە لێمان بدات، من پێم وتن كاكە مێشكم دەڵێت كارەساتێكی گەورە ڕوودەدات بابڕۆین لێرە ئەو بەڕێزانە بەشێت دەمن گەیشتن، منیش خۆم نەتاسم دەمزانی ڕوو دەدات دڵیشم نەهات ئەوان بەجێ بێڵم زۆرم هەوڵدا ئەوخانووە بەجێ بێڵین بە قسەیان نەكردم، نانییان بۆ هێنایین، من لەدەرەوە وەستابووم، وتیان وەرەنان بخۆ وتم برادەرینە ئەگەر بەگوێم دەكەن نان ناخۆن، شتێكی گەورە ڕوودەدات. بە گوێیان نەكردم، دووای چەند

**چرکەیەك، دوو تەیارە لەپڕ پەلاماریان داین (١٦) قومبەلەی (٢٥٠ ) کیلۆی بەدەوروبەرمان کەوت، بەسوودفە شەهید نەبووین، چەندان کەس شەهید وبریندار بوون.**

**لەساڵی ١٩٨٦ ویستمان پەلاماری گرجان و دەوروبەری بدەین لە حەوزی بیتوێن، چوینە گوندی چیوە، لەناو گوندی بووین، باران دەباری پێشمەرگەش خۆیان لەبن هەیوانان نابوو، چەند کەرێك لەبن هۆرێك بەسترابوونەوە بەرانبەر بە ئێمە ئازووقە و تەقەمەنیان لێ بارکرابوو، لەناو مێشکم بروسکەیەك هات و وتی فەقێ ئەوخانووە بەسەر ئەوکەرانە دادەکەوێت، منیش هاوڕێ تەلعەت خدرم لە نزیك بوو، وتم هاوڕێ تەلعەت ئەو خانووە بەسەر ئەو کەرانە دادەکەوێت، وتی: قسەی بەلاش! خانی کو دەکەویت؟ دووای پێنج دەقە خانووەکە کەوت و دوو کەرمان فەوتان و یەکیان بەنیوە رووح دەرچوو.**

**لەساڵی(١٩٩٠) من و کۆمەڵێك ماروێران لە گوندی مەلەکان ماڵێکمان دانابوو، محەمەد گۆڕەشێری زۆر هاوکاری کردم، ڕۆژێك لێیان پرسیم ئەو وەزعە ناخۆشەی کوردستان چی بەسەردێت؟ وتم مژگینییێکی گەورەو دەدەمێ بەمەرج، وتیان مەرجت چییە؟ وتم کانیێ نیریم بدەنێ، شوێنێکی زۆرخۆشە قسەتان بۆدەکەم، بە کۆی دەنگ گوتیان پێشکەش بە تۆ بێت. وتم: بەرێزینە مێشکی من دەڵێت: ڕژێم دەڕووخێت بەو زووانە، مەلەکان ئاوەدان دەبێتەوە جادەی بۆ دێت کارەبای بۆدێت، خەڵکی بۆ خۆشی ڕوو لە مەلەکان دەکەن، منیش منداڵەکانم دینمە ئەو شوێنەکە ناوی کانی نێریە، شاهیدم زۆرن واش دەرچوو!**

**لەساڵی ١٩٨٢ مام سەید بالیسانی لەماڵی کاك یاسین بالیسانی بوو، خەڵکێکی زۆریش لەوێ بوو، وەك گاڵتەکردن بەشۆڕش وتی فەقێ،وتم بەڵێ مام سەید. وتی باوۆ ئەگەر حوکمی زاتیت وەرگرت هەندەکی بدەباوی. وتم مام سەید، خزمینە گوێ بگرن، دەزانم مام سەید بۆ قەدەم شکاندنی من ئەوقسەیە دەکات، شۆڕش سەردەگرێت، من دەمینم بالیسان دەبێتە ناحیە، من دەبمە بەرپرسێك لەو ناحیەیە، زەوی و زار دابەش دەکەین، زەویەکانی مام سەیدیش دابەشدەکرێت، من ئێستا ئەوکات دەبینم، هەموویان فشەیان بەقسەکەی من هات و زۆریش پێکەنین، ئەمنیش پێکەنیم، بەلام دەمزانی و بەرچاوم ڕوون بوو. لەخوا بە زیاد بێت بالیسان بووە شار بەهیمەتی دڵسۆزان، منیش تەمەنێکە بەرپرسم زەویەکانیشمان دابەش کردن!**

**لەساڵی ١٩٩٢ هەڵبژاردن کرا سندووقێك لە گوندی توتمە بوو، منیش سەردانی ئەو سندووقەم کرد لەسەر داوای برادەرانی ڕێکخستن بە مەبەستی هاندانی جەماوەر وابکەین دەنگ**

ی یەکێتی بدات، لەکاتی دەنگ دان مێشکم بروسکەیەکی بۆ کردم وتی فەقێ هەوڵ بدەن یەکێتی دەرنەچی باشە، یەکێتی نیوەی دەنگ بێنێت تووشی شەڕێکی گەورە دەبین، یەکێتیش زۆر زۆر دەکات، لەو شەڕەمن ساردبوومەوە و لەهاندانی برادەران و دوورەپەرێز راوەستام، لەپڕ پارتی چەندان کۆستەری خەڵك لەلای خەلیفان و دیانان بۆ ناردین بەمەبەستی(تەزویر)، من پێم خۆش بوو. شەهید مەلاخالید و یاسین بالیسانی هاتنە لام وتیان: بۆ وا دوورەپەرێزی، پارتی نابینیت چ دەکات؟ وتم: مەلاخالید و یاسین بەقسەی من دەکەن با ئێمەش بچین تەزویر بۆ پارتی بکەین، با پارتی لەو هەڵبژاردنە دەربچێت ئێمە دەربچین زەرەر دەکەین، بەنیوەش دەربچین هەر زەرەر دەکەین، منیان بەشێت ئەژمار کرد، منیش هەوڵم نەدا یەکێتی دەربچێت ئەوەبوو فیفتی بەفیفتی دەرچوون، ئەوەی پێشبینیم دەکرد وەك خۆی دەرچوو دەیان کارەساتی بەدواوە هات .

لەو ساڵانەی ڕابردوو لە سەردەمێك مام جەلال بووە سەرۆکی هەرێمی کوردستان و کاك کۆسرەت سەرۆکی حکومەت بوو، لەوکات مێشکم بروسکەیەکی بۆ کردم وتی: فەقێ وەزعی کوردستان بەوە ڕادەوەستی کاك مسعود بارزانی بکرێتە مەلیکی کوردستان، چەند جار ئەو قسەیەم لەلای حاکم ساڵح حەیدەری وبرادەران دووبارە و دەبارە کردەوە، باش بوو دووای چەند ساڵ کاك مسعود بارزانی بووە مەلیکی کوردستان وەزعەکەش بەرەو ئاوەدانی وهێمنی و خۆشگوزەرانی چوو. کورد قازانجی کرد بەزەرەری یەکێتی تەواو بوو.

جارێکیان من و حەکیم تاهیر ئاکۆیی و جەلال سۆرکانی و شەهید رەسووڵ ناسراوبە رەسورەکۆر و چەندبرادەرێکی تر کاك کۆسرەت بەدووای دا ناردبووین، ئێمەش چوین ودانیشتین، کاك کۆسرەت هەندێك قسەی بۆ کردین... وتی: برادەران بەکورتی پیلانێك هەیە پێمان وایە ڕژێمی عێراق بەنیازە پەلامارمان بدات، واتە پەلاماری هەولێر بدات، خۆتان و هێزەکانتان ئامادەبکەن بۆ کاتی پێوست، دوای گفتوگۆیەکی باش من پرسیارێکم لە کاك کۆسرەت کرد وتم: کاك کۆسرەت ئەگەر ڕژێم پەلاماری داین پارتی لەو شەڕە دەکەویتە چ بەریەك؟ وتی دەکەوێتەبەرەی دووژمن. دژ بەئێمە، ئێمەش گەڕاینەوە و خۆمان ئامادەکرد دوای ماوەیەك کاك کۆسرەت بەدوای داناردینەوە و وتی ئێمە لەگەڵ پارتی ڕێك کەوتووین، لەبەر بەرژەوەندی کورد چەند شەرتێکی پارتیمان قبووڵ کردووە، وەك هەڵوەشاندنەوەی فەوجەتایبەتەکان، چەند بڕیارێکی دان و وتی جێ بەجێی بکەن، لە بەر بەرژەوەندی گەلەکەماندایە، یەکسەر مێشکم بروسکەیەکی بۆناردم وتی: یەکێتی وادەکات و وادەکات، پارتیش وادەکات و وادەکات، منیش رووخسەتم لەکاك کۆسرەت

وەرگرت و ئەو بروسکەیەم بۆ باس کرد، کاک کۆسرەت خۆی لێ تورە کردم، دوواتریش قسەی من دەرچوو، چۆنم شی کردەوە وادەرچوو ڕۆژکیان لەلای سالّح حەیدەری دانشتبووم، مەلایەکی غەریبە هاتە ژووریّ، مەلا چ مەلا، مەلایەکی جوان بالاّ، مام ناوەند لە سنووربەدەر پۆشتە، وپاکوخاوێن بۆنەکی لەخۆدا بوو ژوورەکە پڕبوو لە بۆن، بۆنەکە بۆنێ بەهەشتێی لێ دات، ڕێزمان لە مەلا ناو دانیشتین مێشکم بروسکێکی بۆناردم وتی فەقێ ئاگاداربە ئەومەلایە پیاوێکی باش نییە، زۆریش خراپە، دیارە مەلا تازەبووبووە مەلای گوندی خۆرانێ خۆمان، دواتر مەلای بەڕێز هەستا و بەڕێمان کرد، وتم: حاکم سالّح بەیارمەتیت من باسی ئەو مەلایە دەکەم ئەو مەلایە وایەوایە وایە، دوای دە ڕۆژ قسەکانی من دەرکەوتن لەسەر مەلا مەلا بزربوو، ڕۆیی تێستاش هەر دەڕوات، پارەی گوندی خۆرانیشی دزی!

ڕۆژێکیان لە لای هەوارگەی هەوریّ لە بالیسان دەبانچەم لەبیر کرد، بۆ بەیانی بەبیم هاتەوە، کەدەبانچەم لەوشوێنە لەبیر چووە، بە پەلەچووم دەبانچە لەشوێنی خۆی نەمابوو. گەڕامەوە مالّەوە بروسکەیك لەمیشکم وتی: فەقێ خەمی لێمەخۆ کەسێك دێت پێت دەلّێت: دەبانچەت لێ بزرنەبووە؟ دەبانچەکە زۆر جوان و خاوێن بوو (٢٠ ) وەرەقەی دەکرد، لە مالّەوە زۆر غەمبار بوون، پێم وتن خەم مەخۆن ئەو کەسەی دەبانچەی بردووە، بە خۆی بەدووام دا دەگەڕێت، دوای پێنج ڕۆژ چوومەوە هەمان شوێن، کە چووم دوو خزمی مام سار لەوێ بوون و وتیان چت لێ بزرنەبووە؟ وتم با دەبانچەم لێ بزربووە، مالّیان ئاوا وەرم گرتەوە.

ئەو پێشبینیانە باس بکەم تەواو نابن، کەچی زۆرسەیرە زۆرجاریش سەیری کەسێك دەکەم ناي بینم، یان ناوی مندالّەکانی خۆم لەبیر دەکەم یان ئەوشتانەی وێمە دای بنێم لەبیر دەکەم قسەیەکە لەسەرە دەلّێن: لەدوای فەقێ بە قەت پاکەت و چەرخ مەکرە، چەندان جار دەمانچەم لەشوێنان لەبیرکردووە، کارمەند هەبووە دەسالّ لەگەلّمە ناوی لەبیرم نامێنی، زۆرجار چاخواردنەوەم لەبیر دەچێت، یان نوێژکردن لەبیردەکەم، کێشەی گەورەم ناو لەبیرچوونە، کە بەکەسێك دەلّێم: قوربان ناوت چییە؟ پێم دەلّێن: گەورەبووی و لە خۆبایی بووی؟ ئەگەر وانییە چۆن نامناسی، دەلّێم وەللاهی بیلاهی تیلاهی لە خۆبایی نەبووم، هێرم زۆرسەیرە کەس باوەڕم پێ ناکات.

*** *** ***

**با چەند ڕووداوێك لەسەر خۆم باس بکەم بۆ ئەوەی بیسەلمێنم کە هێرم :**

لە زستانی ساڵی ١٩٩٥ بیرم لەوە کردەوە چەند کوڵەمێشێك لەدار بەڕوو دروست بکەم بۆ ئەوەی لە بەهارێ بتوانم چەند شرغە مێشی (کورە هەنگی) شاخەکانی دەوروبەری گوندی ئاگرمەوە، دەست بەکاربووم، بنەداری بەڕووی گەورە زیاتر لە مەترێك پەیدام دەکردن لە پاوانی دۆست و برادەران، دەم هێنانەوە ماڵەوە و دەم قەراشتن، دواتر بەتەپشوو ناوەکەم دەردینان و لێکم دەدانەوە، زۆرم ئامادەکردن و زۆریش ماندوبووم پێیانەوە، سەرکەدەکانیش دەبوونە سووتەمەنی بۆ زستان هەر یەکێك لەوان نزیکەی چل کیلۆ دەبوو، بەهار داهات و وەختی کورە دەرکردن هات، ئێمە پێی دەڵێین: وەختی شرغە هات. چوومە ماڵی مامم، کەرێکی گەورەیان هەبوو، کورتانم کرد و ئەو کوڵانەی کە دروستم کردبوون، لەدارێکیانم لەپێشەخۆم دانا و بەرە و چیا چووم، نزیکەی چوار کیلۆمەتر دوور بوو، پێی دەڵێن: شێخێر. گەیشتمە لای مێشەکەو کەرم بەستەوە و گوریسم لە کوڵەدارەکە کرد و بەخۆم چوومە ناو لاتە شاخەکە و بەگوریس کوڵەکەم بەرز کردەوەو تە شاخم بەسەرخست دوای ماوەیەك مێشەکە کورێکی دەرکرد لەتەڕاشێکی دا، واتە لەدەوەنێك... منیش گرتمەوە و دووبارە کوڵەکەم بە گوریس ڕەوانەی خوارەوە کرد و خۆشم چوومە خوارێ کوڵەکم هەردایە سەر شانم و کەوتمەرێ ناوەناوە پشوم دەداو تاگەیشتمەماڵەوە چل کیلۆ هەڵگرە و بە مەسافەی چوار کیلۆ مەتر بەو گەرمایە، بە ماندووبوونێکی زۆر گەیشتمەوە ماڵەوە ئارەقەی تەپلی سەرم گەیشتبووە پێیەکانم! مێشەکەم لە شوێنێك داناو، چومەوە ماڵێ، دانیشتم ئاوێکیان دامێ وتیان فەقێ وتم بەڵێ وتیان کانی کەر، گوتم کەرم لەبیر چوە ! کەر چ کەر هەندی دووکەران بوو! دواتر منداڵەکانم چوون کەرەکەیان هێنایەوە، بەڵێ مێشکی من دوو بەشە بەشێکیان ناوە ناوە شت دەبینیت پێش ئەوەی ئەوشتە ڕووبدات، بەشی دووەم بەردەمی خۆشی نابینیت هۆیەکەی چییە من نازانم سەری لێ دەرناکەم وە لیرەوەش داوام لەو کەسانەیە هەر شتێکیان لەسەرمن زانیوە لەهەر بابەتێك چاك و خراپ ئازادن لەنووسینەوە و بڵاو ی بکەنەوە، من دەزانم کەس بێ کەموکورتی نییە.

هەر دووای کەر لەبیرکردن ڕۆژی دووەم چومەوە هەمان شوێن دانیشت بووم و چاوەڕێم دەکرد مێش شرغە بدات لە نێوان کاتژمێر دەو نیوی دوای نیوەڕۆ شرغە بەدەرکەوت، وردە وردە لە نزیك منی دا منیش بەبێ خۆ داپۆشین بۆی چووم، دارەکە تۆزێك ئەستوور بوو، منیش بۆ ئەوەی دارەکە دابێتەوە وردە وردە بەداس دارەکەم بڕی نیازم ئەوەبوو نیوەی دارەکە ببڕم ئەوکات دایبنێمەوە

لەپڕ تەواوی مێشەکە بەسەر سەرم داکەوت، لێم وەرداران دەستم بەڕاکردن کرد، خۆم بەدارو بەرد دا دەدا، بۆ ماوەی دە دەقە پێیان وەدام‌پێیوەدانیان لە هەزاران زیاتر بوو، کە لە کۆڵم بوونەوە کەتمە دەرهێنانی جزو وردە وردە هەستم کرد زەختم دادەبەزی، بەپەلە چوومە شوێنێك وتم ئەگەر بشمرم با لەشاخی نەکەوم، بیریشم لەوە کردەوە شوێنێك هەڵبژێرم ئەگەر مردم زوو کەسوکار بم بیننەوە، چوومە شوێنێك و لاقم بەرە و سەرەوە و سەرم لەخوارەوە، زۆری پێنەچوو ئاگام لە خۆ نەما کاتێك بەخەبەر هاتم، بەرەو عەسر چووبوو نسێی شاخان پەیدابیوون، زۆر بێ تاقەت بووم، سەیری مێشەکەم کرد لەهەمان شوێن مایە ئەوجارەیان خۆم داپۆشی و گرتمەوە و هێنامەوە ماڵەوە

**ڕووداوی کەرکڕین وفرۆشتن :**

دەتوانم بڵێم کەر و مەسولیایەتی بە کەیفی خۆتان ناوێکی لێنێن هەر شتێك لەو بابەتە نزیکە لە من بابۆتان باس بکەم، ناشمەوێ لەو مەسەلەیە بە درێژی باسی دەوروبەر ڕووداوەکان بکەم، لە بەهاری ساڵی ۱۹۹۲ ماڵم لە ئۆردوگای باسرمەبوو، بەباشم زانی ماڵم ببەمەوە گوندی شێخ وەسانان ماڵم بارکرد ماڵ چ ماڵ بەتوێتەك چوینەوە و ناو تویتە بەشی ماڵێکی تریشی دەکرد، نەبوونی بوو ماڵ لە ۱۹۸۷ ڕژێم زۆربەی خەڵکی گوندەکەمی شەهید کرد. جاشە بە غیەتەکانیش تالانیان کردین لە ۱۹۸۸ دووبارە لەلایەن جاش تالان کرایەوە، لەساڵی ۱۹۹۱ تالان کرایەوە، لەلایەن خەڵکی ڕاکردوو ئەو تالانکردنەم زۆر پێناخۆش بوو، دەوەرە ماڵ لەخۆ نەبێت و چەند جاریش تالان بکرێت، کە چومەوە شێخ وەسانان وەزعەکەم زۆر خراپ بوو. دەبووایە نانێك بۆ منداڵەکانم پەیدا بکەم وام بەباش زانی کەرێك بکڕم ئەوکات لە شارۆچکەی حاجی ئاوا دار پارەی دەکرد، چونکە سوتەمەنی نەبوو، پارەشم نەبوو، کەسێکم جیان بوو، بەناوی (جەلال کوڕی مام حاجی ڕەحمان) ڕۆژێکیان جەربە کەرێك هاتە گوندی لەڕەگەزی نێرومێ کەرەکان لە ڕەگەزی نێر گران تربوون، ماکەرەکان بە سێ سەد دینار بوون، داوام لەمام جەلال کرد پارەم بەقەرد بداتێ ماڵی ئاوابێت ماکەرێکی بۆ کڕیم، دەبووایە کورتان و قایش و سەرپار و تەنگە و گوریسێك و کندرێك و بیور و داسێ کیش بکڕم ئەوکەرستانە تەواو کەری کەرەکەبوون بەبیرم نەمایە ئەوانەشم کڕین بەقەرز بۆ ئەوەی ئەو قەرزانە پڕ بکەمەوە، ڕۆژانە چوار بارەدارم دینا، بە قسەخۆشە چوار بارەدار هێنان بۆ دارهێنان زۆر دوورناچووم هەر لەپاوانی کەسوکارم دێنان، ڕۆژکیان پەلێکم بەچاوی کەوت بۆماوەی شەش ڕۆژان بەچاوی بەئێش دارم دینان، لەکاتی داربڕین چاوی بەئێشم دەقوچاند، ماوەی دوومانگ ئەوە کارم بوو، وردە وردە قەرزم

دامەوە، پێداوستیە سەرەتایەکانی ماڵەوەم دابین دەکرد، زۆر بێ ئومێدیم پێوەدیار بوو، ناوە ناوە دڵی خۆشم دەدایەوە، دەم وت ڕۆژێك دێت حیزبەکەم لێم بپرسێت بڵێت فەقێ واز لەکەرێ بینە، وەرە کارێکت لە حکومەتی کوردستان دەدەینێ، ڕۆژێکیان ئاگادار کرامەوە سەردانی شارۆچکەی هەریر بکەم بچمە لای (کاك عەولابۆر و شەهید کارزان شەقلاوەیی) کە چووم دوای سەلام و کەلام وتیان فەقێ وتم بەڵێ، وتیان جەنابت بوویە ئەفسەری هەواڵگری لە فەوجی یەك لیوای سی و دوو مووچەت نۆسەد دینارە نەسریەت سێ هەزار دینارە، یارەبی هەمووکەس دڵخۆش بێت وەك ئەوکات من دڵخۆش بووم، دەست بەکاربووم وتم تازە کەرم بۆچییە کەرەکەم فرۆشت بەقوەیەکی باش دەست بەکار بووم، وردە وردە بووژامەوە لەپارەی ئەوکەرەش کەفرۆشتم بەشێکم دایە هاورێ کاوە کانی بەردی ئەویش لەمن خراپتری بەسەرهاتبوو، دواتر ئەویش وەك ئەفسەر شوێنیان بۆ دیاری کرد دواتر فەوجەکان تێك چوون.

من کەتمەوە ماڵەوە دووبارە هەژاری پەلاماری دام، بەپەلە کەرێکم کڕیەوە دووبارە دەستم بەکارەکەی خۆکردەوە واتە دارهێنان و فرۆشتن زۆری پێنەچو کردمیانە ئامرسریە لەیەکەم تەشکیلەی فەوجی سەربازی کەبەشێوەیەکی سەربازانە نیازیان هەبوو تەشکیلی بکەن لە دەربەندی شەقلاوە، دووبارە کەرەکەم فرۆشتەوە بۆ ماوەی دوو هەفتە هێشتان من نەچووبوومە فەوج شەڕ دەستی پێ کرد و فەوج تێکچوو شەڕەکە تەواو بوو، من چومەوە ماڵەوە سێ بارە کەرێکم کڕیەوە دەستم بەکارەکەی خۆکردەوە کە دارهێنان بوو بە ماوەیەکی کەم ئاگاداریان کردمەوە، کە جەنابم ئەو جارەیان بوویمە ئامر فەوجی تایبەت لەسنووری بالیسان مووچەم ئەوندەو نەسریەم بیست و پێنج هەزار دیناری سویسری بوو، بۆ ماوەیەك کەرەکەم نەفرۆشت ! دواتر هەر فرۆشتم دوای چەند مانگ فەوجەکان هەڵوەشانەوە، دیسان کەوتمەوە ماڵەوە ئەوجارەشیان کەرێکم کڕیی دووای بیرکردنەوەیەکی زۆر بڕیارمدا ئەو جارەیان بکرێمە سکرتێری یەکێتیش کەرەکەم نافرۆشم ! دەستم بەدارهێنان کردەوە ساڵ گەیشتە ۱۹۹۹ بالیسان کرا بەناحیە لەلایەن بەڕێز کاك کۆسرەت وەك وەفایەك بۆ خەڵکی غەدرلێکراوی ناوچەکە لەلایەن داگیرکەر و وەفایەك بۆ شەهیدان و خەڵکی شۆڕشگێڕ من کرامە ئەفسەری ئاسایش دواتر بوومە لێپرسراوی ئاسایش.

ماڵم هەر لە شێخ وەسانان بوو هات وچۆم دەکرد، کەرەکەشم بێ ئیش ڕاگرت بوو، چەندی مشتەری هاتن وتیان تۆ مودیری ئاسایش و چت داوە لەکەرێ؟ وتم من خۆم باشتر دەناسم کەرێ

بفرۆشم له موديرياتى نامينيّم"! وەزعى كوردستانيش ئالۆز دەبيّت دواتر سىّ خانوومان بۆ كران يەكيان بۆ موديّر ناحيه و ئەوەى تر بۆ پۆليس و يەكيان بۆمن، كه مالّم هيّنا ناو خان و له باليسان كەرەكەشم لەگەلّ خۆ هيّنا زۆرسەرکۆنەكرام، لەلايەن خەلّكى و دۆست و برادەر لەسەرهيّنانى كەرەكە بۆباليسان گويّم به كەسنەدا كەرەكەم لەپشت مالّى خۆم دەبەستەوە. خزمەتم دەكرد گلەييم زۆر لىّ دەكرا، دەمزانى كەرىّ بفرۆشم من ليّپسراوى ئاسايش نابم! دواتر دامه خزميّك بەناوى مام سابير به مەرج كەرى منه و لەلاى تووه، كاروكاسبى پىّ دەكەى، بەلاّم مولّكى منه و ئەمانەته لاى جەنابت خۆش بەختانه تاكوو ئەو نووسينه كه دەكاته مانگى ٨/ ١٠/٢٠١٢ كەرەكەم ماوه و خەلّكى زستانان بەرەلاّى دەكەن بەهاران دەى گرنەوه كارى خۆيانى پىّ دەكەن، خۆشيەكه لەوەيه سەنەوى ئەو كەره هەر بەناوى منه و هەر مولّكى منه، من پيّم وايه ئەوكەره بفەوتىّ منيش بەرپرس نابم. وەزعى كوردستانيش ئالۆز دەبيّت ! بۆمن نا بۆ وەزعى كوردستان پيّويسته ئەوكەره خزمەت بكريّت بەهەمووومان وەزۆر جار بەوبرادەرانەى بەرپرس دەليّم كەلەنزيكەوه چيرۆكى من و كەر دەزانن دەلّيّم بەنيازم كەرەكەم بفرۆشم دەلّيّن مەى فرۆشه! چيت دەوىّ لەخزمەتت داين بەلّىّ كەرى من مەترسيه لەسەر خۆم وەدەوروبەر پيّويسته نەى فرۆشم.

وه مەسەلەيەكى تريشم لەسەره بەناوى( بلور) گوايه خيّزانم پيّم دەلّيّت: برۆ بلوريّك بكره بۆمنالّەكەمان، من دەرۆم و دواى شەش مانگ ديّمەوه مالّەوه، شەش مانگەكه راسته چووه ببمه پيّشمەرگه بلوريشم هەر نەينا.

*** *** ***

زۆرجار دەتوانيت بەقسەى خۆش و باش مافى خۆت بستيّنى بەبىّ ئەوەى رووداوى نەخۆش دروست بيّت و سەرخۆت وەدەوروبەر بيّشيّنى مام حاجى كەريمى گوندى بيّراوه بەقەرز هەنديّك توتن دەداته كەسيّك له دەشتى هەوليّر دوواى چەند مانگيّك زستان دەبيّت دوو بارەتوتن دەباتەوه دەشتى هەوليّر بەنيازى فرۆشتن دوواى فرۆشتنى توتن سەردانى كابراى قەرداريش دەكات دوواى سەلام و كەلام دەلّيّت قوربان هاتووم پارەكەم بدەيەوه، كابراى دەشتىّ دەلّيّت: باوەربكه مام كەريم هەتا گەنمى نەدروم نەى فرۆشم پارەم نييه بيدەمەجەنابت، مام كەريم دەلّيّت: دەزۆر باشه هەنديّك ئاوم بۆپەيدابكەن، كابرادەلّيّت: ئاوت بۆ چييه؟ مام كەريم دەلّيّت: ئاوم بۆ قورگرتنەوەيه دوو ئاخوران دروست بكەم، لۆكەران دوو كەرۆكەم ويّنه ئەمنيش لەلاى جەنابت دەبم تاكو گەنم دەدرويّن، ورده ورده هاوكاريت دەكەم لەئيش و كارەكانت دا، كابراى دەشتىّ دەلّيّت: ئەتو

ـﺮستە مام کەریم دەڵێت: خۆبەقەستیش وەناریم، وردە وردەش ئیشت دەگەر ئەکەم، گەلەکیش تـﺴەی خۆش دەکەین تاوەختی جۆخینان، کابرای دەشتیٚ بیردەکاتەوە پارەکەی بۆ پەیدا بکات باشترە حـﻮێ چەندان مانگ کەسێك و دووکەران ئیدارە بدات، دەچێت پارە پەیدا دەکات و دەڵێت مام حۆشناو ئەوەپارەکەت و خوات لەگەڵ بێت ئەتوش مندارۆکەت هەنە ناکرێت تاوەختی جۆخینان ـکنەمن بی شانی یەکتر ماچ دەکەن و ماڵئاوای دەکات .

*** *** ***

ئە ناوچەکەمان کابرایەکمان هە بوو با ناوی نەدەین! ژنی بۆ دێنن رۆژێکیان خێزانی ـﺒﺘﻪوە ماڵ بابی بەپیٚ بووکی بەخۆی شەوێك لەویٚ دەبێت و دەگەڕێتەوە دوای هەفتەیەك دەچێت ـﻮك بینیتەوە لەرێگا لەشوێنێکی چۆل بەخێزانی دەڵێت ماچێکم بدیٚ خانمیش بسکی بۆ لەسەر ـﻤﻪتی لادەبات بۆئەوەی ماچی بکات پیاوەکە دەڵێت ئەتو ژنێکی وای و وای کە ماچیٚ بدەیە ـﻦ ماچ دەدەیە هەموو خەڵکی یەکسەر ژنەکە تەڵاق دەدات ژنەی بەستەزمان دەڵێت: ئەی رۆ! ـﻌﻰ ئەتوو مێردی من نی؟ کابرا بەجێی دێڵێت و دەڕوات گویٚ بەو قسانە نادات، من ئەوپیاوەم ـﻳﺘﺒﻮو تۆزێك شێتۆکە بوو.

*** *** ***

**چیرۆك ......کە ئامۆژگاری ژنان دەکات:**

هەمووممان دەزانین پیاوان چەند هیلاك دەبن تاکو شتێك پەیدا دەکەن و دەی هێننەوە ماڵەوە هەندێك لە ژنان ئەو ماندوو بوونە هەست پیٚ ناکەن، ژن و پیاوێك هەبوون پیاوەکە بارە ترێی لە خۆشناوەتی دەبردە دەشتی هەولێریٚ بەگەنم دەی گۆڕیەوە کە داتەوە ماڵەوە بارە گەنمی دەخست داوای لە ژنەکەی دەکرد لەگەڵی باتەژوورەوە ژنە دەیوت جاریٚ وازبینە مریشك و کێشکە بەردەبوونە گەنم خواردن چەند جارێك ئەوە دووبارە بووەوە پیاوەکە وتی فێڵێك لەخێزانم نەکەم قەدری ئەو گەنمە نازانێت چووە ناو رەزی ترێی داگرت و وتی خانم وەرە لەگەڵم بچینە کاروانی، چوونە کاروانی کە هاتنەوە پیاوەکە بارەگەنمەکەی خست وتی خانم بابچین بسێینەوە ئەوکات گەنم دەبەینە ژووریٚ، ژنە وتی نانا پیاوەکە بەخوای دانانیشین تاکو گەنم نەبەینە ژووریٚ زۆر پێوەماندووبووىمە کابراوتی: ئەدی خانم هەموو جاریٚ ئەمنیش ماندوو نابووم، ژنەوتی بەخوای نەم دەزانی هەندە ماندوو دەبووی.

باپیران لەمێژە هەستیان بەوەکردوە هەڵسوکەوتی هەندێك کەس لە هەردوو ڕەگەز نێر و مێ وەڕەسەیە و چابوونی نییە، بۆنموونە دەڵێت: ئەگەر گوجیلە سەگت ڕاگرت هەوڵ بدە دایکی دێرە تۆڕی نەبی، واتە دایکی باش بێت و لە ڕەسەن بێت.

یان دەڵێت گوجیلەی دێرە تۆڕیێ گورگ خنکێن نییە.

کورد دەڵێت: داکێ ببینە و دۆتێ بخوازە .

واتە کاریگەری لەسەر کوڕیش هەیە ئەگەر دایکی پەسند نەبێت گومانت هەبێت لەپیاوەتی ئەوکەسە پیاوێکی ئازاو غیرەت دارنابێت واتە دایك ئاوێنەی منداڵەکانیەتی دایك زۆر گەورەیە دایك واتە هەموو زەوی، هەندێك جار لەو بارەیەوە ئامۆژگاری بەشێوەی چیرۆك کراوە.

دەڵێ کابرایەکی تاجیر هەبوو دەچێتە وڵاتی ئێران بۆ هێنانی قوماش وخوێ لە ڕێگە دا چاوی بە هێسترەکی زۆر جوان دەکەوێ، لە جوانی وێنەی نییە، خاوەنی دەبینێتەوە مامەڵە دەست پێ دەکات و تاجیر هێسترەکە دەکڕێت دوای کڕینی بە کابرا دەڵێت: پیاوی باش پێم خۆشە سەخڵەتی ئەو ئێسترە چنە پێم بڵێیت؟ کابرا دەڵێت: عەیب لە چاوی من هەبن، لەو ئێسترە نینە، تەنها دایکی کە دەگەیشتە ناو ڕووباری بەبارەوە دەنووست. کابرای تاجیر دەڵێت: ئەوە ئێستر و دایکی ماین چ پەیوەندیان پێکەوە نییە! من ڕازیم، تاجیر دەڕوات، لە گەڕانەوە یەك بارە خوێ لە هێسترەکە دەنێت دەکەونە ڕێ، لە ڕێگا دەگەنە ڕووبارێك ئێستر لە ناوەندی ڕووباری درێژدەبێ بۆ نووستن، ئەوانی لەگەڵی بوون پەلاماری ئێسترەکە دەدەن بەنیازی هەستانەوەی. کابرای تاجیر دەڵێت: خزمینە وازبێنن گوێم لێ بگرن بە شاهید بن من خێزانی خۆم تەڵاقدا! خەڵکی سەریان سوڕ دەمێنێ ئێستر کەتیتە ئاوێ ئەو ژنێ تەڵاق دەدات هاوڕێکانی واز لە ئێستر دێنن دێنە لای کابرای تاجیر دەڵێن: مەسەلەچییە؟ تاجیر دەڵێت: خزمینە کە هێسترم لە کابرای کڕی کابرا وتی: عەیبەکەی ئەوەیە دایکی کە دەگەیشتە ناو ڕووباری دەنووست وتیان وابوو تاجیر وتی مادام هێستر لە خەسڵەت بچێتەوە سەر دایکی، دایکی خێزانی من ڕەدوو کەوتووە هیچ چارەنییە خێزانی منیش ڕەدوو دەکەوێ، هاوڕێکانی دەڵێن ناوی خوابێنە کاری وا چۆن دەبێت تاجیر دەڵێت باشە ئەمن و ئەنگۆ ودوایی ئەبینن، کە نزیك دەبنەوە لەماڵەوە لە ڕێگا دەگەنە شوانێك یەکێك لە شوانێك دەپرسێت دەنگوباس چییە؟ شوان دەڵێت: وەڵڵا خێزانی تاجیر ڕەدوکەوتووە .

*** *** ***

## خۆشناو و دز و دزشاو

ئەتوانین ڕووداوێکی تریش باس بکەین، کە وەرەسە کاریگەری هەیە، لەسەر پیاوەتی و سپیاوەتی:

کە سێکی گوندی توتمە بەناوی (عەسکەر) لەخۆشناوەتی بەناوبانگە لە بەسەرهات و قسەی خۆش و گۆرانیبێژ و دەروێش و زۆر و زۆریتریش ... ئەو پیاوە بەرێزە لە بەهاری ساڵی (١٩٦٩ ، ئەگەر هەڵەنەبم بەفرۆکەی دوژمن لەناو ڕەزان شەهید بوو ئەوپیاوە دەنگی زۆر خۆش بوو وشارەزاش بوو لەبەندو گێرانی شای و زەماوەند، ڕۆژکیان لەگەڵ چەندان برادەری تر دەچنە کلروانی ڕوو لە دەشتێ هەولێر دەکەن دەچنە گوندێك لەو گوندە زەماوەند دەبێت، ئەوانیش باری خۆیان دێخن، خەڵکی گوندی لەبەر شایی و ڕەشبەڵەك کەس بەخێرهاتن و میوانداریان ناکات، عەسکەر دەڵێت: برادەرینە ئەمن بەزمەکی دروست دەکەم، تا دوو ژنی جوانی ئەو گوندە نەیەن، شانم بگرن و قەولی ئەوەش بدەن کەرەبابەکم بۆ بکوژنەوە، لە شوێنی خۆم هەڵناستم ئێوە قسە مەکەن و مێنە ناو ئەوبەزمە، عەسکەر دەست بەگۆرانی دەکات وردە وردە خەڵکی لێ کۆ دەبێتەوە هەموو خەڵکی واز لە شایی دێنن و دەورە لە عەسکەر دەدەن و بەبێ دەنگی لەدیاری دەوەستن تاکو عەسکەر ماندوو دەبێت، ئەو دەڵێت وەرن لەگەڵ من ئەوی تریان دەڕێت وەرن لەگەڵ من عەسکەر دەڵێت: میوانی کەستان نابم، دوو مەرجم هەیە، جێ بەجێی دەکەن باشە، ئەگەرنا نان و چای خۆمان وییە و لێرە دەی خۆین خەڵکێکی زۆر دەڵێن دەی مەرجەکانت چنە؟ عەسکەر دەڵێت: یەکەم دەبێت دووژنی جوان بێن یەکەو پیلم بگرن، تاکو هەڵدەستم دوو ئەو کەسەی دەم باتەوە کەرەبابێکم بۆ بکوژێتەوە ئەوکاتە من دێمە ماڵتان، بەڵێ هەردوو مەرج جێبەجێ دەکەن .

*** *** ***

لە دەوروبەری خۆمان کەسێکمان دەچێتە چیایەکی دوور لە ئاوەدانی و برنۆیەکی پێیە لەسەر چیا نەخۆش دەکەوێت لەبن بەردێکی گەورە دادەنیشێت وبرنۆ بەبەردی هەڵدەنێت دەست دەکات بەناڵەناڵ لەبەرخۆی، کەسێك گوێی لەو ناڵەناڵە دەبێت بەپیریەوە دەچێت لێی نزیك دەبێتەوە، کابرای نەخۆش دەست دەداتە چەکەکەی و دەڵێت کابرا لێم نزیك نەبیەوە دەتکوژم کابرادەڵێت من هاتوم یارمەتی تۆ بدەم کابرای نەخۆش دەڵێت: ناوت چییە و خەڵکی کوێی و خزمی کێی؟ کابرادەڵێت ناوم فلانە خەرکی فلان گوندیمە، لە فلان بنەمارەم. کابرای نەخۆش دەڵێت: تازە هەر نزیکم ببی دەتکوژم لەو ناوەڕانەوەستێ کابرا دەڕوات، کابرای نەخۆش وردە وردە دەڕوات و

دەگاتە گاوانی گوندی سواری کەرێ گاوانی دەبێت، دەچێتەوە ماڵەوە دوای دەساڵ توشی هەمان پیاو دەبێت، دەڵێت: فلان توخوا پرسیارێکم هەیە ئەوەچوو و ڕابرد ئەوجارەی لەچیا گەیشتیە من کەنەخۆش بووم، نیازت چی بوو؟ مەترسێ و قسەم بۆبکە! کابرا دەڵێت: ئەوەی ڕاستیبێت نیازم هەبوو بتکوژم و چەکەکە ببەم ئەوەنیازی من بوو، ئەتو کوتزانی من نیازم خراپ بوو؟ کابرای نەخۆش دەڵێت: قوربان کە وتم خزمت کێنە لەوە زانیم پیاو خراپی، چونکە وەرەسەتان پیاوی باشنین، پیاوەتی و خراپە بە وەرەسەیە .

زۆرجار بنەماڵەکە باشە، بەڵام کەسێك لەو بنەماڵە ژنێك لەبنەماڵەیەکی خراپ دێنێت کوڕەکانی دەچنەوە سەر خاریان لە هەڵسوکەوت، کەواتە با ئاگاداربین کە ژن بۆ خۆمان یان بۆ منداڵەکانمان دێنین، پێویستە شارەزایمان هەبێت لەسەر دایکی کچە.

*** *** ***

باوکم چیرۆکێکی بۆگێرامەوە ڕووداوێکی ڕاستیە، بەو شێوەی خوارەوە( ئایە کەسێکی بە دەستەلات لەهەموو ڕوویەکەوە) کەسێکی هەژار و بێکەسە، هەڵەیەکی لەگەڵ کرد، هونەر لەوەیە بیکوژێ یان ئازادی کەی؟

یەکێك لەپیاوە باشەکانی دەوروبەرمان بەناوبانگە لەپیاوەتی و مەردایەتی مەشوورە کوڕەکانیشی مەردوخانەدانن، ناوی ناهێنین لە بەرچەند هۆیەك، ڕۆژێکیان دەچێتەوە ماڵەوە دەبینێت خانمی خێزانی لە باوەشی خولامی دایە، زۆر بە نەرم و نیانی هەردووکیان بەند دەکات، داوەتی هەموو پیاو ماقولانی دەوروبەری دەکات چەندان سەرەمەڕیان بۆ سەر دەبڕیت، دوای نانخواردن دەڵێت: خزمینە بابچین نیشان دابنێینەوە، بزانین کێ تفەنگ چییەکی باشە! نیشانەیەکی دوور دادەنێنەوە، دەڵێت: ئێوەدەست پێ بکەن بە نۆرە هەریەکە و تفەنگی خۆی داوێت، کەس نیشان ناشکێنێت جەنابی سێرەی لێدەگرێت و نیشان دەشکێنێت، دواتر دەڵێت باسوارسوارانێ بکەین لە سوارسوارانەش لەپێش هەموویان دەبێت، دواتر دەڵێت بابچینەوە دیواخانێ دەچنەوە دیواخان لەوێش پرسیارێك دەکات دەڵێت خزمینە لەمن و لە ئێوە کێمان لە هەمووماندەوڵەمەندترە بەیەك دەنگ دەڵێن: جەنابت لە هەمووماندەوڵەمەندتری، دەڵێت لەمن و ئێوە کێمان لەهەمووماندجوانترە دیارە ئەو پیاوە پیاوێکی زۆر جوانیش بووە، هەموویان بە یەك دەنگ دەڵێن: بەڕاستی جەنابت لە هەمووماندجوانتری، دەڵێت گوێ بگرن کە من زۆر دەوڵەمەند و تفەنگ چییەکی زۆرباشم سوارێکی زۆرباشم لە جوانیش لەهەمووتان جوانترم،

ـمیشت وپەناش پێم وایە لەئێوە بەپشت وپەناترم، وابزانم خانەدانیشم ... ئایە ئەو قسانەی کردم ڕستن یان نا؟ هەموویان بەیەکدەنگ دەڵێن: ئەوەی جەنابت دەڵێی لە بەرچاوانە قسەی لەسەرنیەو ڕستن، دەڵێت کەوابوو خزمینە وەختی ئەوەهات کارەساتێکم لێ قەومایە بۆتان باس دەکەم بزانم ڕیارتان چییە؟ هەموویان دەڵێن: فەرموو باسی بکە.دەڵێت: خزمینە دووێنێ لە سەفەربووم هاتمەوە ماڵێ سەیرم کرد خولامێکم لەگەڵ خێزانم لە باوەشی یەکتردانە، چیان لێ بکەین باشە ڕیار بدەن، لەدیوەخانێ دەبێتە هەرا هەندێك دەڵێن: دەیان سوتێنین هەندێکیان دەڵێن: بەزیندوی ـەقەبریان دەنێین، هەندێکیان دەڵێن: پارچەپارچەیان دەکەین، ئەومشتومڕە زۆر دەخایەنێ ئەو ـمرێزە باش گوێیان لێ دەگرێت، دواتر ڕوو لەوپیاوە دەکەن دەڵێن: بڕیاری بەرێزت چییە؟ جێ ـەجێی بکەین؟ دەڵێت: بڕیاری من جیاوازە لەگەڵ بڕیاری جەنابوو، هەموویان دەڵێن دەفەرموو-جەنابی دەڵێت: بەرێزینە بڕۆن مەلابێنن من تەلاقی دەدەم بۆ خولامم هەموویان دەڵێن: نابێت وناکرێت کاری واچۆن دەبێت، ئەو پیاوە بەرێزە لەسەربڕیاری خۆی سوور دەبێت، بانگی مەلادەکەن ژنە و خولام دێنەدیواخانێ ژنەکەی بۆ خولام تەلاق دەدات و مەلا ژنە لە خولام مارەدەکات، ئەو پیاوە بەرێزە دەڵێت: خولام من دوو شەرتم هەیە لەگەڵ خۆت و خێزانت، ئەو شەرتانەم جێبەجێنەکەی دەتان کوژم لەهەرشوێنێك بن، یەکەم خولام دەبێت بوماوەی حەوت ساڵ گاوانی ئەوگوندەبێت، خێزانیشت بۆماوەی حەوت ساڵ نانی گاوانی لەو گوندە وەرگرێت بڕیارەکە دراو خولام ڕازی بوو بە هەردوو شەرتەکە. کابرای خولام ماڵێکی داناو بەیانی زوو گاڕانێ گوندی کۆکردەوەو بەرەو چیای برد، خانمیش دەستیدایە تەشتێ نانی و ماڵ بەماڵ کەوتەکۆکردنەوەی نانی گاوانی، خانم ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو کزی چووە، دواتر نەخۆش دەکەوێت و دواتر دەمرێت ئەخەفەتان و لەشەرمان کابرای گاوان کە خێزانی دەمرێت ئەویش شەوێك سەری خۆی هەڵ دەگرێت ودەڕوات، ئێوەی بەرێز بۆچونتان لەو بەسەرهاتە چییە؟ من ئەزانم ئەوپیاوە دەی توانی سەدجار ئەوخولامە بکوژێت وە نەشی کوشت!

*** *** ***

ژن و مێردێك هەبوون پیاوەکە دڵپیسی لە خێزانی خۆ دەکرد، وای بە باشزانی ماڵیان لەو گوندە بار بکەن لە کاتی ماڵ بارکردن ژنەزۆر ژنێکی ئاقل بوو پەلاماری بەردی ئاگردانی دان، بەردی ئاگردان سێبەردن ژنان مەنجەلی چێشت لێنانی لەسەردادەنێن ئەوبەردانە زۆر ڕەشدەبن، پیاوەکە وتی ژنێ ئەوبەردەڕەشانە لۆدینی ئەوجێگەیەی دەچینێ قاتی سێبەردی لێنە، ژنە وتی

مێردە ئەوشوێنەی ئەچینێ قاتی سێ پیاوی لێنە، کابرا تێگەی و لە ماڵ بارکردن پەشیمان بووەوە .

ئێمەی پیاو خۆمان پێ گەورەتر و زاناترە لە ژنان، زۆرجار ژنان ویستویانە بە ئێمەی پیاو بسەلمێنن کە ئەوانیش کەمتر نین لە ئێمە بەڵکوو زۆرجار ژنێك هەڵدەکەوێت لەسەد پیاو پیاوترە، نموونەی:( پوور حەلیمێ ) دۆریاڵەیان کە دەکرێت هونەرمەندان ژیان ورووداوی پوور حلیم بکەنە فیلم و نیشانی پیاوانی بدەن، ئەو چەند ژنێکی بەجەرگ بووە، بۆیە چیرۆکەکەی نانووسم بە تەواوی لەبیرم نەماوە، هەرچەندە من لەنزیکەوە بەخزمەت پوور حەلیم گەیشتووم چەندان جەم نانیشم لە ماڵیان خواردوە، گوێزیشم لەگەڵ کۆکردینەوە، مەگەر مام جەلال وەسفی پوور حەلیم بکات ...

*** *** ***

لە گوندەکەمان ژنێك هەبوو ناوی ڕابی بوو، ڕابی مێرد بە ڕەحمان شیخ وەسانی دەکات، ڕەحمان شێخ وەسانی کە ئازاترین کەس بووە لەو سەردەمە، بۆ ماوەی چەند ساڵێك ڕابی دەبێتە دایکی چوار منداڵ دوو کوڕ و دووکچ، ڕەحمان ژنێکی تر بە سەر ڕابی دینێ‌پوور ڕابی کەبووك دەگاتە جێ، دەچێت بەخێرهاتن لە بووکێ دەکات، بەو شێوەی خوارەوە دەڵێت:

بەخێربێی خوشکێ بە خوشکایەتی
هەرامە و مەرامەت لێ بوون قاتی
بە سەر پشێ من هاتی؟

ڕۆژێکیان ڕابی لە بووکێ دەدات کە حاجی ڕەحمان دێتەوە ماڵ بووك لە لای ڕەحمان شکایەت دەکات، دەڵێ: ڕابی زۆری لێدام ڕەحمان دەست دەکاتە دارێك و بچی لە ڕابی بدات، دەچێتە ژوورەوە و دەرگا دادەخات بۆ ئەوەی کەس نەیگرێ، لەکاتی لێدانی لە ڕابی، ڕابی دەزانێت ڕەحمان نیازی خراپە، دەڵێت: ڕەحمان کە سێدارم لێ دە، دەنگ ناکەم دارێکیان: بە ژن ومێردایەتی. دووەم: بە خزمایەتی. سێیەم: بەگوندایەتی. چوارەم: لێیدەی، لێت دەدەمەوە. دیارە ڕەحمان زۆر لەخۆڕازی بووە، گوێ بەو قسەی ڕابی نادات. چوارەمین دار لە ڕابی دەدات ڕابی وەك شێر بەرەنگاری ڕەحمان دەبێتەوە، ڕەحمان بەرز دەکاتەوە و پشتاو پشت بەئەرزی دادەدات و دەکەوێتە لێدانی... زۆر لە ڕەحمان دەدات سەرەتا ڕەحمان شەرم دەکات، هاوار بکات دواتر کار لەشەرم نامێنێ پڕ بە دەنگی هاوار دەکات هۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆ ی خزمینە، بم گەنێ، ڕابیێ کوشتم

هۆۆۆۆۆۆۆۆۆی خزمینه بمگەنێ رابێ کوشتم، خزم دێن و دەرگا کلیل دراوە تاکوو دەچن بیوور دێنن دەرگا دەشکێنن، رابی ڕەحمان بێخێر دەکات. ڕەحمان نەجات دەدەن پوور ڕابی بەخۆی و چوار منداڵەکەی دەچنە ئالانە. لای خزمەکانی خۆی منداڵەکان گەورە دەکات، تاکوو مرد مەیلی ڕەحمان شێخ وەسانی نەکردەوە و وەك مەردان بە ڕەنجی شانی خۆی دەژیا، ئەوەی باسم کرد چیرۆك ییە، ڕاستی من دەیان جار بەخزمەتی پوورە ڕابی گەیشتووم.

***   ***      ***

**نموونەیەکی تر**

پیاوێك زۆر فشە فش دەکات لە سەر ژنەکەی، ژنەکە دەڵێ ئەوەندە بە خۆت مەنازە کەیفم نێ بی بە نیو مەکر دەت کەمە شێت و دەشت بەستمەوە بەو گوریسەی لە سەر ڕێزێ خۆ دانیشە، کابرا دەڵێ: ژن بە خۆچنە و مەکریان چنە؟ ڕۆژێکیان پیاوەکە دەچێتە جۆتی ژنە بەبرایەکی خۆی چەند کیلۆ ماسییەك پەیدا دەکات بۆ ڕۆژی دووەم کابرا بەڕێ دەکەوێ، بۆ جوتی. ژنە بە لایەکی تر خۆی دەگەینێتە ناو ئەو زەویەی مێردەکەی جوتی لێ دەکات ماسییەکان دەبات لە سەرووی کێڵگە قۆرتێك هەڵدەقەنێت و ماسیان دەناو دەنێت و ئەیان شارێتەوە خۆی ون دەکات، جووتیار دەست دەکات بەجووتکردن لە پڕ کۆمەڵێ ماسی دەبینێتەوە خڕیان دەکاتەوە لەناو تورەکەیان دەنێ، ئێوارە دەچێتەوە دەڵێ: ژنەتیم ئەمڕۆ بەو شێوەیە ماسیم دێتنەوە ژنە دەڵێ: زۆرباشە بەیانی مەچۆە جۆتی دەیان خۆین، هەندێك خزمانیش داوەت کە مام جووتیار بەیانی بۆ نیوەڕۆ چەند خزمێکی خۆی داوەت دەکات. دەڵێ: ماسی باشن هەنە ژنەش نیسك لێ دەنێ میوانەکان دێن و ژنە زۆر بەخێریان دێنێت، نان دادەنێت چەندان قاپ نیسك دادەنێت پێیان دەڵێ: فەرموون، پیاوەکە سەری سوڕدەمێنێ و دەڵێ: خانم لۆ ماسیان نایینی؟ ژنە دەڵێ: ئەی ڕۆ ماسیی چی؟ پیاوەکە دەڵێ: ئەدی ئەمن دونێ ماسیم نەینان؟ ژنە دەڵێ: کا ماسیت لە کێ هێناون؟ کابرا دەڵێت: ئەدی ماسیم دەبن عاردی دا نەدیتنەوە لەجۆتی! لەکاتی جووتکردن ژنە ڕوو لە میوانان دەکات دەڵێ: خزمینە ئەنگۆ زانیە ماسی دەبن عاردی دابن ! میوانەکان بە یەك دەنگ دەڵێن: نەوەڵلا ماسی کو دەبن عاردی دادەبن؟ ژنە دەڵێ: بەخوای براینە هەبێ و نەبێ ئەو مێردی من تێك چووە؟ کابرا کە گوێی لەو قسەی خێزانی بوو شێت و هار دە بێت، پەلاماری ژنەی داو دە کەوێتە لێدانی. میوانەکان گرتیان. ژنە بە گریانەوە وتی: خزمینە ئەمن دەرۆم نایێمەوە، ئەو مارەی ئەوپیاوەی من تێك چووە، شێت بووە دەترسم دەستان بووەشێنی،

**میوانەکان ژنەکەشیان گرت بۆ ئەوەی نەڕوات ژنە وتی: بە شەرتەکی ناڕۆم ئەگەر بێ بەستنەوە تاسبەینێ دەی بەینە ماریٚ شێخی، میوانەکان بە گوریس کابرا دەبەستنەوە ژنە دەڵێ: خزمینە ئەمڕۆ درەنگە بەیانی زوو دەی بەینە مارێ شێخی، شێت بووە بەشکو خوا ڕەحمی پێ بکات چاك بێتەوە میوانەکان دەڕۆن ژنە دەچێتە بەردەمی پیاوەکەی کابرا ئاگری لێ دەباری دەڵێ: ژنەتیم بم کەوە بەس بزانم ئەوە چبوو کردت! ژنە دەڵێ: باشە دەچێت بادیە ئاوەکی بۆ دینی، بە دەمی وە دەکات ئاو بخۆوە قسەت بۆدەکەم. کابرا ئاو دەخواتەوە و تۆزێك سارد دەبێتەوە، ژنە دەڵێ مێردە وەبیرت دێ؟ وتت ژن چنە و مەکریان چنە؟ وتم کوڕە وەمەرێ کەیفم لێ بێت بەنیو مەکر شێتت دەکەم، دەشت بەستمەوە، بشزانە ئەوەی کردوومە نیو مەکر بووە .**

**یائیلاهی ئەگەر مەکری تەواوت لێ بکەم، دەبێ چ کارەساتێك ڕوو بدات؟ ناوی خۆشت لەبیر دەچێت! پیاوەکە دەڵێت: ژنێ بمکەوە ئەمن کردم ئەتو نەیکەی، تۆبە هەزارجار تۆبە. ژن هەموو شتن پیاو چنینە!**

*** *** ***

**ژنێك مێردی یەکەمی لێ دەمرێت مێردی دووەم دەکات، زۆر بێزار دەبێت لەدەستی مێردی دووەم، دەڵێت:**

**بە گوللەم لێدابا نای هێشێ**

**لای چەپیشی لێهەڵکێشێ**

**چ بکەم لۆ مێردی پێشێ**

**واتە چ بەگوللەم لێ دابا و یان دڵم دەرهێنابا دەنگی نەدەکرد مێردی یەکەمم!**

*** *** ***

**دایك ئاشێ کورتەکێ:**

**دایك ئایشێ کورتەکێ، کورتەك لە سەروی گوندی مەلەکانە شوێنێکی خۆشە و زۆر فێنکە، گۆڕی دایك ئایشێی لێیە ئەو ژنە لەلای خەڵکی ژنێکی زۆر پیرۆزە، دایك ئایش خۆی و سێ برابوونە یەکیان ناوی مستەفا بووە یەکێکی تر یان ناوی مام گچکەلە بووە، ئەوەی تریان ناوی بۆکر بووە، پایزێکیان بۆکر لە( سایێ ) لە ئەشکەوتێ دەبێت ئەو ئەشکەوتە ئێستاش بەناوی ئەشکەوتێ شێخ بۆکر مەشوورە، سەری زستانێ دەبێت دایك ئایش نەیەوێت سەری لێ بدات کە دەگاتە لای بۆکر زۆر سەرمایەتی. دەڵێت: بۆکر لۆ ئاگرت هەرنەکردوە، بۆکر دەڵێت: دار**

ـەڕوون ئاگرم پێ هەر نەکر، دایك ئایش لەڕقی بۆکر پەلاماری جلیتە بەفران دەدات و یەك ئومەر دینیت ئاگریان تێبەر دەدات دوای گەرم بوونەوەی بۆکر بەئاگری جلیتان دەڵێت: بۆکر چواڵن بقوچینە، بۆکر چاوان دەقوچێنێت، شانی بۆکر دەگرێت و بەئاسماندا فرێی دەدات و دەڵێت: ئۆ بەکەڵکی کوێستان نایێت، گوایە بۆکر لە گوندی شێخ مەموودیان بەر ئەرز دەکەوێت، لەوێ وخۆی دەژی... ناوبراو ئێستاش گۆڕی لە شێخ مەموودیانە، گۆڕی پیرەمامی گچکەلە لە (گورگان یە نزیك گوندی کانی بەرد، گۆڕی شێخ مستەفا لە کۆخانییە، کە دەکاتە نێوان گوندی ـعرلش و گوندی چیوە، باپیران بە لەهەڵبەستێك شوێنیان دەست نیشان دەکەن:

هاوارم هینا لۆنگۆ
چمپێ ناکرێ بەبێ نگۆ
شێخ ئایشێ لە کوێستانێ
شێخ مستەفای کۆخانێ
مام گچکەلەی گورگانێ
شێخ بۆکری گەرمیانێ

ئەو ماڵباتە لە خۆشناوەتی زۆر جێگای ڕێزن، بەردەوام ئێستاش خەڵکی سەردانیان دەکەن، ـە تایبەتی کۆچەرەکان کە دەچنە کوێستانێ شەوێك میوانی دایك ئایشێ دەبن، چەندان سەرەبزن ـەر دەبڕن لە کورتەکێ گوایە ئەگەر خێرنەکەن بۆ دایك ئایشێ کوێستانیان لێ ناکەوێ توشی ـەلادەبن، تاکوو ئێستاش خەڵکی سەردانی گۆڕەکانیان دەکات، بە تایبەتی شێخ مستەفای کۆخانێ، ئەوەی من زانیومە: شێخ مستەفای کۆخانێ گۆڕی لە نزیك رووباری خوار گوندی دەراش ـەمینت، دەچێتە خەونی کەسێکی گوندی کانی بەرد، دەڵێت: خەریکە رووبار مەیتەکەم ببات، ـەرە گۆڕم لە فلان شوێنە و بمبە سەر فلان گرد.

*** *** ***

**بەسەرهات .....**

یەکێك لە چیرۆکە کۆنەکانی ناوچەکەمان، وایە وانییە من وام بستووە لەخار فەقێ ـەحەمەد شێخ وەسانی گوایە کەسێکی خەرکی گوندی هەرتەل لە کوێستانی لە شاخی (کەپرە ) رووبەرووی هەرسێك دەبێتەوە، هەرسەکە کۆمەڵێك جولەی سەیرو سەمەرە دەکات کەواپیشان دەدات بڵێتە کابرای هەرتەلی وەرە لێم قەومایەوە و فریام کەوە، کابراش بەدوای دەکەوێت دوای

ماوەیەك دەبینیت پرنگێك خریكی خواردنی كودەرە هەرسانە، كابرا پرینگەكە دەكوژێت و هەرسەكە دیسان بە ئاماژە دەڵێت دوامكەوە... كابراش دوای دەكەوێت هەرسەكە دەچیتە لای دارێك و مێشە هەنگێكی پیشان دەدات، بۆ پایزێ هەرسەكە پێستەپەنیرێك لە كونە پەنیرێك دەردێنێت بۆی دەباتە هەرتەلێ. بۆساری دووەم دیسان پێستەپەنیرێكی بۆ دەبات. كابرای هەرتەلی لە ماڵ نابێت، برایەكی هەرسەكە دەبینێت لەدەوروبەری ماڵی برای دەی كوژێت، دوای كوشتنی دەبینێت هەرس پێستەپەنیرێكی پێیە دوای ماوەیەكی كەم برای دێتەوە و باسی هەرسی بۆ دەكەن. دەڵێت: برا كارێكی خراپت كردووە ئەو هەرسە برادەری من بوو، ساڵی ڕابردووش پێستە پەنیرێكی بۆ هێنام مەسەلەكەشیان بۆ دەگێڕێتەوە. وەیە وانییە من نازانم!

كونەپەنیر: شوێنێكی فێنكە كۆچەران هارینان لە كوێستان پەنیری لێ دادەنێن تا پایزان. زۆرجار هەرس دزی لە كونە پەنیران دەكات ،خزمانی مام سار بەشێكیان لەگەڵ ئێمە دەژێن هەموویان ناسراون و زۆریان خزمەتی هێزی پێشمەرگیان كردوە، بەتایبەتی مام رەسوول مام سار لەكۆتای هەشتاو هەشت ئەنفال كرا، ئێستاش كوڕێكی مەرد و خانەدانی هەیە بەناوی حەسەن ناسراو بە ( شێتەكە) خزمانی مام سار زۆر قسەخۆشن سادەن وە لەكۆن هەندێكیان دزی زۆر نەقۆرابوونە دوو مام سار لەدیار جوتارێكی خۆشناو دادەنیشن بیرەكەنەوە چۆن گاجووتێك لەخۆشناو بدزن، بەرنامەیەك دادەنێن یەكیان بەدزی خۆی لە مام خۆشناو نزیك بكاتەوە وە ئەوەی تریان دەست بكات بەگریان، كە خۆشناو بەپیر كابرای دەگرێت بچێت ئەوەی تر گاجووت بدزێت، دەست بەكار دەبن یەكیان بە نەهێنی خۆی لەخۆشناو نزیك دەكاتەوە، ئەوەی تر هەتا هێزی دەبەردایە دەست دەكات بەگریان، خوشناو جووت رادەگرێت، چاوان دەگێری لەدوور كابرادەبینی، دەگرێت خۆشناو دەكەوێتە ڕێ و بۆلای كابرای... ئەوەی تریان كە دەزانێت خۆشناو رۆیی خۆی دەكاتە كابرای دەگرێ ئەوێشیان خۆی دەگەیێنێتە گاجووتان یەكیان دەباو دەڕوات خۆشناو دەگاتە لای كابرای مام سار دەڵێت: برا ئەوەچت بەسەر هاتییە؟ كابرای مام سار دەڵێت: لۆتو دەگرێیم. خۆشناو دەڵێت: لۆ لۆمن ئەگرێیی كابرای مام سار دەڵێت: كو لۆت نەگرێیم ئەتوو لەفەقیریان جۆتی بەلینگەگایكی دەكەی! خۆشناو دەڵێت: لینگە گای چ؟ ئێمن دوونە! برا چیدی مەگرێ. كابرای مام سار دەڵێت: دەبەرێ خۆ بدێ، نابینی گایەكە خۆشناو تەماشا دەكات یەك لینگەگایە بە گورجی دەگەڕێتەوە كابرای مام ساریش خۆی ون دەكات و دەڕوات گاجووتیان برد، كابرای خۆشناو بەدوایی گاجووت دەگەڕێت، لە ڕێگا كەسێك دەبینیت، دەڵێت:

ـ کمست نەدی گایەکی وێبێ؟ کابرا دەڵێت: بەرێوەڵڵا دیتم گایەکی بەرەکی وێ بوو، مام خۆشناو دەڵێت: بەخوای هەو نییە، گای من رەش بوو، تومەزانە کابرای مام سار دەرپێی خۆی سپێ کردبوو، گاجوتی پێ کردبووە گای بازی، کورد لەمێژەدەڵێت:

هەرشتێك پیاوی خۆی دەوێت، پیاویش هونەری دەوێت، واتە: هێز و ئەقڵ تەواو کەری یەکترن.

*** *** ***

مام سار جارێکی تر کەرێکی سپی دەدزن دەیهێننەوە مارێ و هەموو مەنجەرێ شێر کوراندن حڕ دەکەنەوە، جوان جوان رەنگی کەرێ دەگۆڕن لەسپی دەی کەنە رەنگی رەش، کەرەکەش لە نزیك سەرێ دەبەستنەوە، خاوەن کەر دەچێتە لایان دەڵێت: چ کەر و نەدیتینە کابرای مام سار دەڵێت: سخێو دەوەرە دانیشە، ئاوەکی بخۆوە، کابرا دادەنیشێت دووای کەمێك کەردەزەرێ کابرا دەنگی کەرێ خۆ دەناسیتەوە، دەڵێت: دەنگی کەریمیش ئەو هەیە، بەس رەنگیان جوودایە، دواتر کابرای خاوەن کەر دەڕوات .

*** *** ***

مام سار دەچنە کویستانێ چەند کەسێك پێکەوە دەبن سەیر دەکەن تۆزێك لە سنووری دەست کردی دووژمنان بە دەردەکەوێت لەناو خۆیان بەرنامەیەك دادەنێن دەڵێن: واباشە یەکمان خۆمان بکەینە نەخۆش و لەسەر ڕێیان دابنیشین بزانین ئەو ڕەوەندانە چەك و خەنجەریان پێیە یان نا یەکیان دەنێرنە سەر ڕێی و خۆشیان تۆزێك دوورتر لە خوارەوە خۆیان حەشار دەدەن. کابرای نەخۆش دەست دەکات بەهات و هاوار کاروانچییەکان بۆلای دەچن، دەڵێن: برا خێرتە؟ دەڵێت: زگم دێشی، خێرتان دەگاتێ ببەنەوە ماڵەوە، ئەوانیش سواری کەرێکی دەکەن، سەیریان دەکات کەسیان چەك وخەنجەریان پێ نییە، دەست دەکات بە هاوار هاوار دەڵێت:

دەوەرنێ برا وەرنێ
دوو نەفەر و سێکەرن
بارێ وان قایشێ زەرن
ئەبێ تفەنگ و خەنجەرن
وەی بابەچەند نەخۆشم وەرنێ

کاروانچییەکان وادەزانن هاوار هاواریەتی لەبەر ئازاری خۆی تێ ناگەن مەبەستی ئەو وەرن وەرن رووتیان کەین و تفەنگ و خەنجەریان پێ نینە و باریشیان هەمووی قایشە و لە ڕەنگی زەردە

**ئەوانی تر کە گوێیان لەو ڕوونکردنەوە دەبێت، دێن و کاروانەکە ڕووت دەکەن**

**دەی دەی ڕەشە**
**ڕەشمارێمە ڕەشە**
**وەی وەی ڕەشە**
**ڕەشمارێمە دەخرێدا**
**ڕەشمارێمە ڕەشە**
**بابێ کورتێم دەناو جێدا**
**هەریاندا لە مامەشە**
**وەی وەی ڕەشە**
**کورتێ لەبەرنەخشە**
**ڕەشمارێمە ڕەشە**
**وەی پڕ بەباوەشە**
**وەی وەی ڕەشە**
**وەی وەی ڕەشە**
**ڕەشمارێمە ڕەشە**
**ڕەشمارێمە ڕەشە**
**بنەگە لەگەرمێنێ**
**کورتێ لەسەر زینی**
**نازدار لەکوێستانێ**
**خوایە لە منت نەستینی**
**وەی وەی ڕەشە**
**دەی دەی ڕەشە**
**ڕەشمارێمەڕەشە**
**ڕەشمارێمە ڕەشە**
**مەڕلە هەوێزیە**
**کورتێم دەناو جێدا**
**دۆست پڕبەئامێزیە**
**مردم پارم وێدە**
**وەی وەی ڕەشە**
**وەی وەی ڕەشە**
**ڕەشمارێمەڕەشە**

*** *** ***

**لەو سالآنە حەسەن مام سار سەیارەیەک دەکرێت و دەچێتە سلێمانی، لەشوێنێک سەرێچی دەکات کۆمەڵێک مروور دەورەی لێ دەدەن یکێك لەمرورەکان کچ دەبێت سەنەوی سەیارەی لێ وەردەگرێت حەسەن نازانێت مرورەکە کچە لەسەیارە دێتەخوارێ و بۆلای کچەکە دەچێت دەست بۆ هەرامەی کچەکەدەبات و دەڵێت بەقوربانی ئەو گونیلەت بم سەنەویم وێ بدەوە !! کە مرورەکان ئەوقسەیە دەبیستن و مام حەسەن دەبینن دەست بۆ هەرامەی کچەکە دەبات پێ دەکەنن و مام حەسەن و کچە مروورەکە بەجێ دێرن، کچەکەش سەنەوی دەداتەوە مام حەسەن، مامە حەسەن بەبێ دەنگی سواری سەیارە دەبێت دواتر دەزانیت مرورەکە کچ بووە !**

**ڕووداو هەر لەسەر خزمانی مام سار...**

نە سەرەتاوە ڕێزم بۆ مامۆستایانی ئایینی هەیە لە هۆبەماڵێکی مام ساران ڕەوە گورگێك شەولتە پەلاماری مەڕەکانیان دەدات هەرچەندە چەندان سەیان هەبوون ئێوارەکیان مەلایەك بۆ ـکات سەردانیان دەکات، مامۆستا زۆر بەخێردێنن ئێوارە مەسەلەی گورگان بۆمامۆستاباس ـکەن، مامۆستاش دەست دەکات بەزاریەستنیان، بۆ بەیانی سەیردەکەن یەك مەڕ نەخوراوە ـکیان دەڵێت هەموو کسۆکان خوا بە قوربانی مامۆستای کا، مامۆستا لە سەد کسۆکی باشترە ـی بگرین !

*** *** ***

ئەگوندێك کابرایەك پیدابوو ناوبانگی دەرکرد لە خانەدانی خەڵکی سەردانیان دەکردن خەتمدانی ئەو ماڵە لەدەوروبەر دەنگی دایەوە، ڕۆژێکیان پیاوەکە لەلای خێزانی خۆی خۆی هەڵکێشاو وتی بەهۆی چاکە و پیاوەتی منە ناوبانگمان بڵاو بووەتەوە، ژنەکە وتی: پیاوەکە ڕاستە تۆ پیاوێکی باشی، بەخشەندەی، بەڵام نیوەی پیاوەتی تۆ بەشی منە، نیوەی تۆیش، بەشی منی تێدایە، پیاوەکە شێت و هاربوو، وتی: ژن بەخۆ چنە و بەشیان چییە، ژنە وتی: پیاوەکە واسەڵێ پشێمان دەبیەوە، پیاوەکە وتی: پیاوەتی پیاوەتی خۆمەو تەواو، ژنە وتی ئەگەر وام کرد بە ئەو ڕۆژ کەس رووی لەو ماڵە نەکرد تورە نابی‌پیاوەکە وتی تورە نابم ئەوە ئەتوو ئەوە مەیدان، ژنە بۆ بەیانی نیوەڕۆ چەند میوانێکیان هات ئەویش نیسکی بۆ لێنان کە نیسکەکەی لە قاپان کرد هەر قاپە و قشپلێکی هەردایە ناو بردی و لەپێش میوانانی دانا، میوانەکان کە سەیری نیسك دەکەن قشپلی لەناوە، دەڵێن: برسی نین و نان ناخۆن، دواتر دەڕۆن. ئەو مەسەلەیە لەناو خەڵکی بڵاو دەکەنەوە وردە وردە کەس بۆ نان خواردن ناچێتە ئەو ماڵە، کابرا هەست بە کەمی میوان دەکات ڕۆژکیان ئەومەسەلە لەگەڵ خێزانی خۆی باس دەکات، ژنە دەڵێت پیاوەکە من نازانم! پیاوەکە دەڵێت: نەخێر شتێك ڕوی داوە، من نازانم، ژنە دەڵێت: من دەزانم ئەویش قسە قەللەوەکانی تۆ بوو وتت هۆی خانەدانی منم. نەخێر پیاوەکە من بووم، حار و حیساب وایە پیاوەکە دەڵێت: ژنەکە وەك خۆی لێ بکەوە، خانەدان تۆ بووی من نیم، بەڵێ قسەیەك هەیە، نازانم مولکی کێیە؟ دەڵێت: " هەموو پیاوێکی باش و دیار ژنێکی باشی لەپشتەوەیە". کەوا بوو با ڕێز لە ژن بگرین، ژن ئاوێنەیە مەتەرێزە وسەنگەرە بۆ پیاو، پیاو بێ ژن نەبوونی باشترە لە هەبوون، ژن زۆر گەورەیە.

*** *** ***

## خۆشناو و دز و دزشاو

زمان بەرای سەرە، کابرایەك لەسەر جۆخینێ دەبێت خەریکی لەیەك دەرکردنی کاو و دانە ماندوو دەبێت دەچێتە بن کەپرێ دادەنیشێ، کەپرێ سەپانان بەناوبانگە کوندە دەکاتەوە و ئاوێکی ساردی تالخۆش دەخواتەوە، خەریکی چا خواردنەوە دەبێت، کەسێك بەوێدا تێ دەپەرێت، سواری کەرێ بووە، کابرای سواری کەرێ دەگاتە نزیك جۆخینێ، دەڵێتە کابرای سەر جۆخینێ:

جۆخین بەرەکەت

کابرا دەڵێت

خێروبەرەکەت

برا فەرموو وەرە چای بخۆوە، کابرای سواری کەرێ دەڵێت: کەرێ لەکێ ببستمەوە؟ کابرا دەڵێت: وەرە لەسەری زمانی من ببەستەوە. کەوابوو زۆر جار ئێمە بەزمانی خۆمان کێشە بۆ خۆمان دروست دەکەین:

زار دەرێتە زمانی

تا ئەتووم جیانی

خۆشیم نایتە گیانی

------------

کورد بۆهەر شتێك قسەی خۆی هەیە، وەك:

ئینسان دەکات تەگبیران

خودا دەکات تەقد یرا

واتەمرۆڤ زۆرجار بەرنامەیەك بۆخۆی دادەنێت دەکەوێتە سەر جێبەجێکردنی بەرنامەکەی وادەرناچێت، بەخراپ بەسەری دادەشکێتەوە فەرموون ئەو بەسەرهاتە بخوێننەوە، لەناوچەکەمان ڕووی دایە:

***  ***  ***

لەو گوندانەی خۆمان پایزێکی درەنگ لە ساڵانی زوو ژنەرەوەندێك لە گوندی (..........)ە، شەوی بەسەر دادێت وابەباش دەزانێت بچیتە ماڵی مەلای گوندی بە بۆچونی خۆی ماڵی مەلا لە هەموو شوێنێك ئەمین ترو باشترە، بۆ ئەو وەك ژنێك نازانێت لەماڵی مامۆستا خراپی بەسەردێت، ئەورۆژە ئێوارەی پێنجشەم دەبێت، دەچێتە لای ماڵی مامۆستا دەڵێتە مەلاژنێ میوانم ناگەمەوە ماڕێ، مەلاژن زۆری بەخێر دێنێت مامۆستا کە نوێژی مەغریب دەکات بۆ نانخواردن

رمێکی گوندی داوەتی مەلا دەکات و دەچن ناندەخۆن بۆ نوێژی عیشاش دەچنەوە مزگەوت، دوای ـێ نە خۆشناوەتی واباو بوو شەوانی هەینی بۆ ماوەیکی زۆر خەریکی زکرو تەهلیل دەبوون، ـتر مامۆستا دەچێتەوە ماڵەوە نازانێت میوانیان هەنە، شەوی جومعەیە و وەختی کاری ـەرعیە مەلا زۆر بەئەسپایی لە ترسی منداڵان بۆ لای مەلاژن دەچێت و کاری خۆی دەکات، ـیتی زوو دەچێتە مزگەوت خۆی داوێتە کانیّ و نوێژ دەکات و دەگەڕێتەوە و دەڵێت: مەلاژن ڕەق ـیە لەسەرمان، لۆ ئاگرت هەرنەکردییە، مەلاژن دەڵێت لۆمەلا سەرماتە مەلا دەڵێت کچیّ ـووم غوسڵم لەخۆ دەرکرد مەلاژن دەڵێت مەلا غوسڵی چ؟ مەلا دەڵێت: مەلاژن خوانەخواستە ـۆ نەیوت نەچووە ناکا هێشتان نوێژت نەکردبیّ؟ مەلاژن بیردەکاتەوە و دەڵێت: بە قورئان مەلا ـغەڵەت چووە؟ دەڵێت مەلا وابزانم ئەتوو ئەو شەو بەغەڵەت چووی؟ ئەمە ئەوشەو پیرەژنە ـومندکن لەکن بوو مەلادەڵێت: مەلاژن وەختی سوحبەتی نییە، مەلاژن دەڵێت: بە خودای ـست دەکەم، مەلا دەڵێت: بەو خودایە مەلاژن بۆنی ژاژی دات، وەمگۆ لە وانەیە مەلاژنیّ هێواریّ ـۆی خواردبێت، ئەدی کانی میوان مەلاژن دەڵێت: لەدوو تووچووە نوێژیّ و نەهاتەوە، مەلا ـوردەپەڕێتەدەریّ و بەدووی دەکەوێت، لە دووری گوندی دەی بینیت تومەزانە ژنەتیم لەشەرمان ـییە، مەلا تەشگەران هەردەکات و دەست دەکات بە غاردان تا دەگاتە پیرەژنیّ و دەڵێت: پیرەژن عەفووم کە گەردەنێم ئازاکە، شتەك بوو ڕوویدا نەمزانی بوو، توو میوانی، وام زانی بوو مەلاژنی! ـە لەشەرمان وەڵامی مامۆستا ناداتەوەو دەڕوات، مامۆستا یەك حەفتە هەر دەڵێت: خوایە خۆت عللی نەمزانی عەفووم کە تۆبە!

*** *** ***

ئەو دنیایە شتی زۆری لیّ روودایە یەکێك لە بەسەرهاتەکانی گوندی ..... دوو شوان لەلای میگەلان دەبن، پایزە و لەهەوێزیان راگرتوون هەردووکیان خاوەنخێزان دەبن، ژنەکانیش لەدووری شوانان لەلایەك نووستون یەکیان دەچێت کاری شەرعی بکات و دەگەڕێتەوە ئەوەی دووەمیش بە ێدەنگی بۆ لای خێزانی دەچێت، خێزانی دەڵێت: ئەدی ئەتو تازەنەهاتی دەڵێت: نەوەڵڵا ئەمن ئەبووم شوانەکە دەزانێت برادەرەکەی کاری وای کردووە، دەڵێت هۆ حەمەد ئەتوکیهەیت ......حەمەد وەڵام دەداتەوە دەڵێت: ئەمن نزانم ئەمن یەك...... ئەتوش یەکی ...... وەرەوە .

بۆ بەستەزمانی بەهار بەهاران
لۆمەش بەهار پایزانە

واتە بەهار بۆ ئاژەڵ بەهارێکی خۆشە گیاوگۆڵ زۆرە، پایزان بەهاری مرۆڤە زۆربەی مێوەکان لەپایزان پێدەگەن، پایزان ئاوخواردنەوەش خۆشترە لەوەرزەکانی تر، سمۆرە دەڵێت: مرۆڤ پایزان زۆر حەز لە ئاو دەکات، من لە ڕقی مرۆڤ پایزان ئاو ناخۆم هۆیەکەی چییە، من نازانم! ئەوەندە دەزانم سمۆرە پایزان ئاو ناخواتەوە، ئاوی لەخۆ حەرام کردووە، گوایە لە ڕقی مرۆڤە

مانگی ڕەشان مانگێ ڕووان

بەتار دەکات کەندوان

بەشەڕدێنێ بووک و خەسوان

واتە سەرەتای مانگی ڕەشەمێ بە هۆی زستانانە دەموچاو ناسک دەبن لە ڕەشەمێ تیشکی خۆر گەرم دەبێت، دەموچاو دەسوتێنێت، لە ڕەشەمێ ڕۆژ درێژ دەبن جوڵە زیاتر دەکرێت، خواردن زۆرتر دەخورێت، لێرە بووکو خەسو لەسەرزۆرخواردن بەشەردێن.

*** *** ***

هەموو بەهاران تەیرێکی کۆچەر بە کوردستان دا بڵاو دەبێتەوە، دەنگی زۆر خۆش و غەریبە گوایە ئەو تەیرە لەئەسڵ بووک بووە بووکی خەسوێکی سعر باز بووە ، ڕۆژکیان ئەو بووکە خەریکی شیر کوڵاندن بووە کەشیر هەڵ دەستێ لەوکاتە خەسو شیرەکەدەبینێت شیرەکە زۆردەبێت دواتر شیرەکە دەنیشێتەوە خەسو بەبووکێ دەڵێت شیرەکەت خواردوە بووک زۆر هەوڵ دەدات قەناعەت بە خەسوبێنێت بێ سوود دەبێت خەسو سحرێکی لێدەکات و دەبێتە ئەو تەیرە تاکو ئێستاش ئەو تەیرە بەردەوام دەڵێت،( نەم خواردوە نەم ڕێشتوە نەم کیشتووە) (پەکو) ئەو بەستەزمانە بەشەویش بێدەنگ نابێ هەر دەڵێت:

نەم خواردوە

نەم ڕێشتوە

نەم کێشت وە( پەکوو ) ئەو کاتانەش دێت کە بەهار لەوپەڕی جوانی دایە، قەبارەی ئەوەندەی کۆترێك دەبێت، دیتنی تۆزێك زەحمەتە، زۆر خۆپارێزە، ڕەنگی لە کۆترە باریکە دەچێت، تۆزێك گەورەترە ئەو تەیرە تەنها وشەی پەکوو دەڵێت: ئەوەی تر کورد بۆی دەناوە .

بووکێك لەبەر خۆی دەڵێت :

بریا خەسوو نەبانە

دەرگا بێ کلیل بانە

بووکە سەربەخۆ بانە

مێرد بەدرێ خۆبانە

واتە کچ لەژیاندا سێ شتی زۆرلا گرینگە :

یەکەم مێردێکی بەدڵی خۆی

دووەم ماڵێکی سەربەخۆ

سێیەم پیاوەکەی ژێر ئەمری بێت

واتە ئۆمەر بێت، ئەوسێ شتە زۆر گرینگن بۆ کچان لەکاتی شوکردن، لە سەرەتای کارەکە کە خەسوو دەچێتە دیتنی کچەکە و دەی بینێت کە گەڕایەوە ماڵەوە بە کوڕەکەی دەڵێت: کوڕم تابزنی کچێکی جوانە، چاوی رەشن ئەرنی ژێر پیارەنە، برۆی گەشن، بەژن باریکە شتی وا نەبووەو نیە هەر نەخۆی کەی نەتەماشای کەی، کەکارەکە سەر دەگرێت و دەی گوازنەوە زۆری پێناچێت پێك دادان دروست دەبێت دایك تەماشا دەکات کوڕکەی ئەوەندەی مەیلی خێزانی دەکات مەیلی دایکی نەمایە کچێك لەولا هاتوە و جگەرگۆشەکەی لێزەوت کردووە دایك چاوی دەچنە تۆقی سەری و دەرگای کێشە دەبیتەوە و ئەو کوڕەی ئاقڵ بێت دەبێت، دوو هەمیان بدەفی یەکیان لەلای خانمی خێزانی، ئەوەی تر لەلای دایکی بەڕێزی دیارە هەموو کەسیش ئەو هونەرە نازانێت کە مەشوورە بەهونەری مامەڵە، کورد بەهونەری مامەڵە دەڵێت: هەمبان دەفین هەمبان بدەفی بەچەند شێوەیەك کچیش بۆ ئەوە شووی کردوە، ئازادی وەدەست بێنێت نایەویت جگە لەمێردی کەسی تر ئەمری بەسەر دابکات

*** *** ***

خەسوێك بەسەفەر دەچوو خەمی ئەوەی بوو دووای ئەو بووك بچێ نان بخوات بووکەکەی ناوی ئەسمەر بوو، بەبیری داهات دەوروبەری نان بەقوڕ سواق بدات بۆ ئەوەی ئەسمەر نەتوانێت نان بخوات ئەگەر بووك چوو نان بخوا شوێن پێی دیاریێت دواتر دەڕوات ئەسمەر زۆر برسی دەبێت زۆر بیر دەکاتەوە چۆن بگاتە نانی و شوێن پێشی دیار نەبێت، دەی دۆزیتەوە دەچێت کەرێك دێنێت سواری دەبێت تا دەگاتە نانی ونانديني و دەگەڕێتەوە،خەسو ،کە دەگەڕێتەوە تەماشای بەر دەرگا دەکات شوێن پێی کەرێ دیارە دەڵێت:

شوێن شوێن پێی کەرێیە

بلعات بلعا تێ ئەسمەرێیە

کەوابوو پێداوستی دەرگایەکە بۆبیرکردنەوە و شت فێربوون دەکاتەوە، دەکرێت بڵێین زەروریەتی پێداوستی مرۆڤ شارستانیەتی دروست کردووە، واتە: هەموو پێشکەوتنێك زەروریەت رابەری بووە، شوێن پێ شوێن پێ لەمێژە کورد سوودی لێ بینیوە بۆ راووشکار بۆ دیتنەوەی ئاژەڵەکانی، لەو رووەیەوە پیاوی کارامە هەبووە، وەك عەلی شوون هەرگر، کە خەڵکی کۆیە بوو بەناوبانگ بووە لەکوردستان و دەوروبەریش دەیان جار دزی کەشف کردووە، بەچەندان رۆژە رێ شوێن پێی لێ بزرنەبووە، هەندێك بەسەرهات لەناوچەکەمان هەیە ئێمە بە موڵکی خزمانی گوندی وەرتێی دەزانین ئەوانیش نازانم دەی خەنە سەر ئێمە یان کەسانی تر، ئایە راستن یان دروست کراون، ئەوەیان من نازانم! ئۆباڵ بە ملی ئەوەی گوێم لێ بووە:

دووکەس دەچنە شاخ بۆ مێش برینەوە، یەکیان گوریس لەیەکیان دەکات و بەشاخ دا شۆڕی دەکاتەوە، دوای ماوەیەك دەڵێت: کوڕە دەستم شل بووینە، راوەستە تاکوو تفە دەستێك دەکەم گوریس بەردەدا و تفەدەست بکات، کابرا لە شاخ دەکەوێت و پارچەپارچە دەبێت.

*** *** ***

جارێکیان یەکێك لە ئەفسەرانی عوسمانییەکان سەردانی خزمانی وەرتێ دەکات بۆ باج و سەرانە، زۆر بەخێری دێنن،دەیبەنە دیواخان و ئەسپەکەشی دەبەنە سەر کەپرێ سەیر دەکەن قاچەکانی، لە خوارەوە شۆڕ بووینەوە قاچەکانی دەبڕنەوەو هەردوو لێوی دەبڕن بۆ ئەوەی ددانی دەرکەون پێکەنی هێلکەرونێکی لە پێشدا دەنێن، بەیانی ئەفسەرەکە دێتە دەرەوە بڕوات تەماشا دەکات ئەسپەکەی لەسەر کەپرێیە، لاقیشی بڕاینەوە ددانیشی گرکردینەوە، هێلکەرونیشی لە بەرێیە، دەڵێت: ئەوەچییە؟ دەڵێن: لەبەر رێزی تۆمان ئەسپ بردیتە سەر کەپرێ، دەڵێت: ئەی لاقو لۆبڕینەوە؟ دەڵێن: بۆ ئەوەی باش بحەسێتەوە! لێو لۆ بڕینە، دەڵێن: تا پێبکەنیت، هەندێك لەپیاوەکانی ئەفسەرەکە دەڵێن: ئەو ملەتەشێتن... ئەفسەرەکە دەڵێت: با تاقیان بکەینەوە، دەچن کۆمەڵێك قالۆچە دەگرن لەگەڵ مێوژەرەش تێکەڵیان دەکەن و بانگی خەڵکەکە دەکەن، وەرن دەبێت ئەو مێوژانە بخۆن کە میوژەکان لەبەردەمیان دادەنێن، ریش سپیەکەیان کەناوی (مام مۆتك) بووە دەڵێت: کوڕینە وەزعەکە باش نییە، ( بەپێیان بخۆن بێپێن هەر ئێخۆنە) واتە: قالۆچەکان بخۆن، دواتر مێوژان بخۆن... بەڵێ، ئەو کەتنەیان بە ئەفسەرەکە کرد، ئەفسەرەکە کە دەبینێت قالۆچان پێش مێوژان دەخۆن، وازیان لێ دێنێت و دەڕوات.. لەناحیەی بالیسان بنەماڵەیەك هەیە بەناوی بنەماڵەی قالۆچان ئەکرێت ئەوبنەماڵە وەرتی بن !

جارێکی تر بووکێکیان دەچێت نارد لەکەندوێ بینی ئەستوندەك واتە کۆڵەگە لەبەردەمی کەندوو دەبێت بووکەکە لەپشت ئەستووندە تەشتە نارد هەڵدەگرێت، دەڵێت: وەرن دەستم عاسێ بووینە، چەندی بیردەکەنەوە نازانن چۆن نەجاتی بدەن، بە دوای مام مۆتك دەنێرن، مام مۆتك دێت و سەیری دەکات و دەڵێت: برۆن شوارکە هەناریکم بۆ بێنن شوارك دێت و دوو شوارك لە دەستی بووکەکە دەدات، بووکەکە تەشتە نارد بەردەدات و نەجاتی دەبێت، هەموویان بەیەك دەنگ دەڵێن: بەخوای مام مۆتك ناقربوو!

*** *** ***

جارێکی تر دەیانەوێت نێریەك نێرن بۆ میری سۆران بنێرن بێ لەوەدەکەنەوە پێویستە نێری بەدەست نوێژ بێت، کە دەگاتە بەردەستی میری سۆران کاتەکەش زستان دەبێت نێری داوێنە رووباری نێری توشی سەرمابوون دەبێت دەکەونە رێی و نێری دەپژمێت و دەستنوێژی دەشکێ. دووبارە دەگێرنەوەو دەی هارێنە رووباری چەند جار ئەوکارە دووبارە دەکەنەوە، دواتر نێری دەمرێت ئێستاش زۆرجار لەناوچەکەمان ناوەناوە نێری وەرتیان لەسەرزارانە.

*** *** ***

جارێکی تر ئەیانەوێت باج رەوان بکەن بۆ میری سۆران، زستانیش دەبێت بەفرێکی زۆر باریوە، وا بەباش دەزانن کەروێشکێك بگرن باجەکەی پێ رەوان بکەن، گوایە کەروێشك زووتر دەگاتە رواندز، هەرچۆنێکی هەبووە کەروێشك دەگرن و باجەکەی لێ قایم دەکەن و بەرەو رواندز بەری دەدەن، بەهارێ نوێنەری حکومەت سەردانیان دەکات و داوای باجی زستانیان لێ دەکات، دەڵێن: قوربان ئێمە لە مێژە باجمان ناردووە، کابرا دەڵێت: بە کێتان داناردوە؟ دەڵێن بە خۆش بزۆکێ. واتە: بەکەروێشکێ.

*** *** ***

هەر لە وەرتێ گوایە کەسێکیان دەچێتە سەر کارۆخی کەوێك لەسەر لێوێ شاخی لە هێلانە دێتە دەرێ و بەرەو مەکێ دەفرێت و دەڵێت فجوق فجوق... کابرا دەڵێت: مائەمن لەتو کەمترم، لەدوو کەوەکە دەچێتە سەر لێوێ شاخی و وەك کەوەکە دەڵێت: فجوق فجوق، خۆی لەشاخی فرێ دەدات پارچەپارچەدەبێت.

ڕێزم هەیە بۆ خزمانی وەرتێ، پیاوی خانەدان و تێکۆشەرو نیشتمانپەروەریان یەکجار زۆروە و دەیان شەهیدیان هەیە لەپێناوی رزگاری گەل و نیشتمان نموونەی گوندی گەرەوانە، لەمێژووی گەلەکەماندا زۆر خزمەتی پێشمەرگەو ڕەوەندانیان کردوە و وە لەرزگار کردنی شارۆچکەی باسرمە لە راپەرین دەوری بەرچاویان هەبوو من لەنزیکەوە هیمەتی ئەوانم دی جێپەنجەیان دیار بوو.

*** *** ***

**خار حەمەد :**

لە گوندەکەمان کەسێك هەبوو بەناوی خار حەمەد دەبوە کوڕە خاری بابم مەشوور بوو بەحەمەدە هێرِ لە و هێرِیە منیش بەشێکم وەبەرکەوتوە بە وەرەسە، چونکە دایکم لەوان بوو، نازانم بۆ کەس بەمن نالێ فەقێ هێرِ، کە زۆر هێرِم خار حەمەد تاقانە وپیاوی ماڵ بووە، کەدەچووە کاروانی دایکی خار حەمەد هێلکەی زۆری بۆ دەکوڵاندن، کە دەگەیشتنە قۆناغی یەکەم کاروان چییەکان بەخار حەمەدیان دەگوت خۆ خار حەمەد هێلکان ناخوات، یەکسەر خار حەمەد دەی گوت: نەوەڵڵا لە بەرەنگۆم هێلکە هینایەنە، واتە لەبەر ئێوەم هێلکە هینایەنە من ناخۆم ! دیارە ئەوەی تۆزێك تەمەنی هەبێت دەزانێت کەر چ دەورێکی بەرچاوی هەبووە لەژیانی جوتیاری لەخەباتی ڕەوای گەلەکەشمان کێی بووە؟ کێشەی من نیە من زۆر جار بەو گوێیانەم گوێ لە جووتیارانی ناوچەکمان بووە بەکەریان وتوە هەچە بابێ من! دیارە کەر لە ڕەنگ و باڵا جیاوازن وەك کەری رەش، کەری شین، کەری سپی و قاوەی، کورد دەڵێت:

ئەگەر کەر نەچوە بن باری
باری ببەنە کن کەرێ

لە کوردەواری کەری دێزە زۆر پەسند نییە، کەرێکی بەبرِو بلعاتە، زۆرجار کەری دێزە خۆی لەشاخی داوێت لۆ ئەوەی زەرەر لە ساحێبی بکەوێت، دەبێت بڵێم بەداخەوە لە رابردوو و زۆر کەسم دی، وەك کەری دێزە خۆی لە شاخی هاویشت، خۆی پارچەپارچەکردوو روو رەشی مێژووی گەلەکەی بوو، وەك کەری دێزەی کرد، لە زوو جووتیاران پێناسی کەر و ئەسپو ئێستریان کردووە، لە کارواندا لە کەریان پرسی:

قۆناغت کێندەرە؟
وتی تۆیز ئەزانی!

لەئێستریان پرسی؟

وتی ماخۆم دەزانی!

لەئەسپیان پرسی؟

وتی جۆرك دە زانی!

واتە کەر بەلێدان دەڕوات، وتیان ئیسترە قۆناغت کێندەرە؟ وتی خاوەنم دەزانێت، واتە بەستراپتەوە، بە هێزوتونای خاوەنی واتە خاوەنی چەندی توانای هەبێت تێستر دەڕوات، وتیان ئەسپە قۆناغت کێندەرە؟ وتی: جۆرك دەزانێت واتە: بارگیر زۆر بەتوانایە بەمەرجێ برسی نەبێت، لەپێناسەیکی تر دەڵێن:

هەورازی مێردان

لاو نیوی کەران

سەرەژێری ژنان

واتە هەوراز بۆ پیاوان ئاساییە، کەر حەز لە رێی لاو نیو دەکات نە هەوراز بێت و نە سەرەژێر ژنان حەز لە سەرەژێر دەکەن، لەکاتی رۆیشتن کورد دەڵێت: دووشت پەسندن، کەری کورکن بەرخی چرمن.

*** *** ***

**گورگ:**

گورگ هەرچەندە زۆربەی مرۆڤ و ئاژەڵان گۆشتخۆرن هەر ناوی گورگ بەدە، هەرچەند لە خواردنی گیانلەبەران زۆر بێ ویژدانە کە دەگاتە مێگەل دەیان سەر دەخنکێنێت، ئایە رەقی مرۆڤە، یان لە رەقی سەگە، یان بە نیازی ئەوە دواتر خاوەنیان کە لەشیان فرێ بدات ئەوبیان خوا یان نان بۆ خەڵکی تر پێ دادە، نازانم بۆ ئەوەندە بێوژدانە سەرەرای ئەو سیفەتە خراپەی وەك سەگ نییە چاوی لە دەستی کەس نییە، بۆ نانێك ملکەچی کەس نابێت؟ ئازادی خۆی بە هیچ شتێك ناگۆڕێتەوە دەست لەبەر کەس پان ناکاتەوە، وەك سەگ بۆ نانێك هاورەگەزەکەی خۆی پارچەپارچە ناکات، سەرەڕۆ بۆ کەس نابات، کورد دەڵێت: گورگ کەیی نابێت، گورگ دەڵێت:

عەمرو بابێمن مەڕ

دەخۆم دونگی تەڕ

خۆی ناکات لە لەڕەل

------------

واتە من مەڕ دەخۆم و ئەویش هەر خەریکی خواردنی خۆیەتی، یان دەڵێت :

عەمرویابێمن کەر

کەلۆی دەچم

گویانم لۆ دەکاتەچەپەر...

------------

عەمرت نەمینێ بزن

کە دمەوێت بناگوێی بگەزم

شوان وگۆبارو کسۆکم

بەدوودا هەر دەبەزن

واتە کە بۆ کەردەچم بیخۆم قەدەمی دەشکێت و ناتوانێت راش بکات تەنیا گوێکانی دەکاتە قەڵغانە بەرگری گوێش بۆمن ڕێگرنیە لەخواردنی، زۆر لەبزن نەڕازییە بەوەرزی زستان بەهاران کەدەبینێت کارۆکە ،واتە: بچکەبزن یاری دەکات و دڵخۆشە بەهاران بازبازانێ دەکات لەوێ بۆ ئەوێ دەڵێت کارۆکە لەبیرت نەچێ ڕۆژێك دێت دەتگەمێ یەك ڕۆژم بمینێ لە زستانێ کلکێت پێدەبەمەوە قونێ، کلکێت پێشۆڕ دەکەم لەسەرمان کلکێ دەقونێ دەنیەوە و چەقەچەقی درانانت دێ لەسەرمان.

من گوێم لە خەڵکی بەساڵاچوو بووە، دەیانگوت وەرزەکان شەڕ دەکەن، لەگەڵ یەکتر ئەگەر بەوردی بەدوای دادەچی بۆت دەردەکەوێت بەراستی وایە وەزەکان شەردەکەن لە چاردەی سێ، سەرمایەکی زۆر پەیدا دەبێت، پێی دەڵێن: سەرمای پیەژنێ، کورد دەڵێت: کۆڵی گەورە هەرگرە بۆ ئەوکات، یان هەمان وەخت کە دەکاتە سەرمای هەرمی پشکێو، واتە: ئەوکاتەی هەرمێ چەکەرە دەکات زۆر سەرمادەبێت پێویستە ئاگات لە سوتەمەنی هەبێت، سوتەمەنی ئەوکاتیش داربووە ئێمە بەداری گەورە دەڵێین: کۆڵ نێوان بەهارو هاوینان وەرز دەشێوێت، گەرمایەکی زۆر لەپڕ پەیدا دەبێت، نێوان پایزو هاوین بەهەمان شێوە، لە پایز و زستانیش هەروا، سەرمایەکی لەپڕ پەیدا دەبێت.

گورگەکان لە وەرزی زستان کەمەترسی مردنیان لێ پەیدا دەبێت، لەبرسان لەدەوری یەك کۆدەبنەوە هەموویان سەیری یەکتر دەکەن لە ناوەخۆیان بریارِ دەدەن یەکێك بکەنەقوربانی

هەموویان، یەکێك بێتە قوربانی باشترە نەوەك هەموویان لەبرسان بمرن، هەموویان بەو بڕیارە ڕازی دەبن دیارە کێشەیەکیان هەیە تاکو یەکێك لەوان خەوی لێ نەکەوێت و چاوی دانەخات نایانەوێت بەزیندی چاوان بیخۆن بۆیە ماوەی چەندان سعات بەرانبەری یەکتر دادەنیشن دواتر یەکێکیان دەخوێت ئەوە یاسایەکە گورگ پیادەی دەکەن، باشە یان خراپە من نازانم ئەگەر ئازای لەخۆیان بپرسە! سەیرە لە ناو مرۆڤایەتیش زۆرجار کەسێك دەکوژن چاوانی دەبەستن بۆ ئەوەی بەزیندووی چاوان نەی کوژن وەزۆرجار ئەو نەریتە پشتگوێ دەخرێت ئایە ئێمە لە گورگان فێری ئەو نەریتە بووینە یان ئەوان لەمە فێربووینە ئەوەش کەس نازانێ، لەڕەوشتی گورگ شتێکی سەیر هەیە، جارێك و دوان نییە بڵێین کارێك بووەو سوتفە بووە، دوو جار لەمن قەومایە و بەسەدان جاریش گوێم لەبەسالاچوان بووە هەمان ڕووداو، ئەویش گورگ:

لە هەزاری

دێتە هەژاری

واتە لەنێوان هەزارسەرە بزن یان مەر دەچێت ئەوانەی فەقیران دەخوات، نموونە لەساڵی ١٩٩٢ مامێکم هەیە مەشوورە بەچاکەوپیاوەتی لەگەڵ خەڵکی، وەزۆریش خۆشەوستە لەلای خەڵکی بەناوی حاجی ئەلیاس ڕۆژکیان گوتی فەقێ جیسکەکم بۆ دیاری کردووی، ئەگەر دەی بەیەوە منیش وتم: با هەر لەگەڵ حەیوانی بیت دووای دوو ڕۆژ مامم وتی فەقێ، وتم بەڵێ، وتی: قسەیەکی سەیرت بۆبکەم، وتم: فەرموو؟ وتی دوونێ گورگ پەلاماری حەیوانی دا بوو، ئەو جیسکەی بۆم دیاری کردبووی، بردبووی! وتم مامە دەزانم ڕاست دەکەی، بەلام من جیسکی خۆم نەدیت بوو، هەر دەمەوێت، گوتی مارخەرانەبی خۆمن لەبەر ئەوەی وەنارێم، ئەتو پیلان لێ بیزێوە، بەسەدان جار گورگ پەلاماری مێگەلانی داوە بزنی ئەمانەت و فەقیرانی خواردووە، هۆیەکەی چییە ئەو نهێنیەش کەس نازانێت! کێ ئازایە؟ ئەو دوونهێنیە لەگورگان بپرسی پێم وایە ئەوپرسیارانە دەبەینەگۆڕ.

باسی وشەیکم کرد ئەویش (پلان لێ بیزێوە) ئەو وشەیە چیرۆکێکی لەپشتە:

شوانێك لەناو شوانان دەیەوێت بچیتە شاری هەولێرێ شوانەکان ئەوە دەزانن هەریەکەو دەڵێت: لەگەڵ خۆت شمشارکم لۆبینە لەناو شوانەکان یەکیان دەڵێت هاتەوە پارەت بدەمێ شمشارەکەم لۆبینە، مام شوانی کە بەنیازە بچیتەشاری دەڵێتە کابرای قوربان ئەتو پیلانی لێ بیزێوە، واتە: مادام پارەی خۆت داوە بۆ تۆ دینم .

لەئێستریان پرسی جەنابت کوڕی کێیت؟ لە وەڵاما وتی ئەسپ خاڵە، شەرمی بەباوکی بوو، کە کوڕی کەرێییە، من زانیومە خەڵکیش هەبووە وتویانە کوڕی کێی وتویە خزمەی فلانم، تەك داوەشێی زەلام من بەخۆم کوڕی گاوانێکم کێ پێی پەسندە کێ پێی پەسەند نییە، با ئاوی سارد بخوات! باوکیشم هەرچەندە کوڕی حەمەدەمینی کۆشکێیە، بەڵام بە ڕەسوولی بێوەفاتێ مەشوورە، واتە من ئەوەی بێوەفاتێم، زۆریش پیرۆزە لام .

کورد پێناسەی هەردوو ڕەگەزی مرۆڤ دەکات دەڵێت :

سەری گەورە بۆ پیاوان سەروەتە!

سەری گەورە بۆ ژنان نسیبەتە!

واتە پیاوی سەربچووك پەسند نییە، بۆپیاوان سەرچەند گەورەبێت باشە، بۆ خوشکان سەری بچووك باشە، هۆیەکەی چیە من نازانم! ئەوەندە دەزانم حیکمەتێکی تێدایە، ئەگەر ئێوەبزانن قسەیەکی تریش هەیە، بە ژنی سەر بچووك دەڵێن: سەرباڕەکە ( سەرباڕەکە)وەك ئەودوانە پەسندن:

ژنی سەر باڕەکە

پیاوی سەرجوانەگا

ئەکرێت ئەوە نەهێنیەکە بێت واتە ژنی سەر بچووك زوو پیری پێوە دیارنییە واتەزوو پیرنابێت ئەکرێت ئەوەبێت و بیر کردنەوەی باشترە من گومانم نییە لە قسەی باب و باپیران ڕاست دەکەن، کورد لەپێناسێکی تر دەڵێت: دووکەس پەسند نین لە هەردوو ڕەگەز :

پیاوی دم لەبا

ژنی قون لەبا

واتە پیاوی لەخۆ بای و لوت بەرز پەسندنییە، ڕستەی دووەم: واتە ژنی قون لەبا ئەو ژنانەی بەرزی سمتیان هەیە، بۆ دوواوە نەهێنیەکەی چییە من نازانم ؟ وەلەپێناسیکی تر دەڵێت:

پیاوی درێژ ئاقڵی لە چۆکانە،

ژنی کورت ئاگای لەفیتنانە

واتە پیاوی بەژن درێژ زۆر پەسند نییە، زۆریان گێلەزەلامن وەژنی کورتەباڵاش پەسند نینە، بەردەوام خەریکی ئاژاوە و دروست کردنی فیتنەیە، لەپێناسەیەکی تر دەڵێت:

پیاوی خەپە و دم بیورانی

**لەبەری هەرێ تادەتوانی**

**ئەوانەی لوتیان وەك لوتی هەڵۆیە واتە قولاپین، پەسندنییە، واتە: گریەکی دیاری لەلوتی هەبێت، لوتی قەوچ بێت، لەپێناسێکی تر دەڵێت:**

**ژنت بەردە ڕەوێ**

**هاتەوە ماری تو نەهاتەوە هیچ**

**واتەناکرێت بەوەس وەسەبیت بەردەوام چاودێری خێزانت بکەی وازی لێ بێنە، ئەگەرژنێکی باشە پێوست بەچاودێری ناکات، ئەگەر ژنێکی خراپەبوو، بابڕواو لەکۆڵت بێتەوە لەپێناسەیکی تر دەڵێت:**

**( هەرامەی ) ژنان بەبەردەقانی پاس ناکرێت!**

**واتە بەکورتی واز لەژنەکەت بێنە دڵپیس مەبە، ئەگەر ژنێکی چاك دەرچوو ئەوە نیعمەتی خوایە، ئەگەر خراپیش دەرچوو ئەوە زوو توشی بەلای خۆی دەبێت و لەکۆڵت دەبێتەوە. لەپێناسەیکی تر دەڵێن:**

**پیاو خزمەت کارە**

**ژن چرای مارە**

**واتە ژیان بەبێژن تاریکستانە. لەپێناسەیەکی تر:**

**پیاو هەنەو پیاوژکەش هەنە**

**ژن هەنەو ژنۆکەش هەنە**

**سەیری منالەکەت بکە کە چووە ناو منداڵان بۆ گەمە واتە یاریکردن، ئەگەر وتی: کێ لای من دەبێت؟ تاگات لەو منالە بێت دەبێتە سەرکردە و باوەڕی بەخۆ هەیە، ئەگەر وتی: من لای کێ بم؟ تەمات بەو منالە نەبێت هیچی لێ چاوەڕێ ناکرێت!**

**لە دواتەمەنی گەنجی وردە وردە نەخۆشیەکان خۆیان پیشان دەدەن، وەك دران هێشان، پشت ئێشە و ئەژنۆ نالەباری دەزگای هەزم زۆر زۆری تر، لەنێوان پیاو ژن بۆرەبۆرو کنەکن پەیدا دەبێت، لەوکاتە ژنان قسەیەکیان هەیە دەڵێن:**

**هەوری هەر پنەپنە**

**نە مێردە و نەژنە**

## خۆشناو و دز و دزشاو

لەو گوندانەی خۆمان کوڕێك حەز لە کچێك دەکات، کچە بێخەبەرە لەو حەز لێکردنە کوڕەکە زۆر هەوڵ دەدات لە شوێنێك تەنها کچە ببینێت . چەند ڕۆژێك ئێواران کچەکە ئەرفێ (عەلەف)ی دەداتە ماراتی لە خانووی خوارەوە ڕۆژێکیان کوڕە زوو دەچێتە ناو ماراتی واتە شوێنی ئاژەڵان، خۆی لەناو ئاخوڕی مات دەکات بەو مەبەستەی کچەکە لە وێ ببینێت، زۆر چاوەڕێ دەکات، دواتر خەو دەی باتەوە، بەیانی لەگەڵ دەنگی مەلا بەخەبەر دێت و ڕادەپەڕێ!

لە خۆشناوەتی زۆرجار لەتەمەنێکی زۆر بچووك کچیان بە شوو داوە و ژنیان بۆ کوڕ هێناوە، یەکێك لەو گوندانەی خۆمان ژن بۆ کوڕەکەیان دێنن کوڕەکە دەڵێتە منداڵان بابچینە سەر ئەو دارەی بووکێ ببینین، دەچنە سەردارەکە، دواتر کەسێك دەڵێت: کوڕە فلان ئەتو چاکەی دەگەر منداران؟ ئەتو زاوای با بچینە کن بووکێ.

کوڕێکی تر ژنی بۆ دێنن من دەی ناسم، هەفتەی دوو جار ڕێی پێدەدرا لە بووك نزیك بێتەوە، شەوەکانی تر دایکی لەگەڵ خۆی دەنواند، تاکو کوڕە گەورە بوو، ئێستا بووەتە مرۆێکی مەزن .

لەو گوندانەی خۆمان کچ و کوڕێك لە بەیانی پێکەوە بووینە لە مازیان ئێوارە دەگەڕێنەوە گوندی، پێش بگەنە گوندی کوڕە بە کچەکە دەڵێت: ئەرێ فلان ماچەکم بدێ... کچ دەڵێت: ئەوەتی سبەینی ئەمە پێکەوەینە لەکێندەرت قونەدا لە نزیك گوندی ماچت بدەمێ، وەڵڵاهی تامی ناکەی عەمرت نە مێنێ ....کوڕە دەڵێت: دەوەڵڵاهی حەقی تووە ..

لەو گوندانەی خۆمان کوڕێك دەزگیرانی هەبووە، ڕۆژکیان لەناو باخچان دەگاتە دەزگیرانی و دەڵێت: ماچێکم بدی، ئەمدەیتێ و ناتدەمێ لێیان دەبێتە شەڕ، کچەکە بەردێك لە سەری کوڕەی دەدات و سەری دەشکێ و برای کچەکەش دەگاتێ، بە هەر دووکیان لێدانێکی باشی لێ دەدەن.

**چیرۆك:**

دایکێك سێ کچی جوان و جاحێلی هەبوون، هەرسێ کچەکە پرتەزمان بوون ئێوارەیەکیان بەتەمابوون داخوازی کچەکان بکرێت دایکیان بانگی کچەکانی کرد وتی کچم کە داخوازی هاتن ئەنگۆ قسەمەکەن، لۆ ئەوەی نزانن ئەنگۆ پرتەزمانن، هەرسێکیان وتیان باشە دایە.
داخوازی هاتن دانیشتن، کچەکانیش دانیشت بوون، لەوکاتە مشکێك پەیدابوو، کچێکیان وتی:

دایە ئەوەمستە

ئەوەی تر وتی

**چوەتونیٚ**

**ئەوەی تر وتی**

**ئەمن چنەدۆ میٚردی خۆم ترد**

داخوازیەکان گوێیان لەو قسانەبوو، هەستان و ڕۆیشتن.تەر بەقسەی داکیان کرد! ئەوەمستە واتە: ئەوەمشکە، چوەتونیٚ واتە:چوەکونیٚ، ئەوی تر واتە من قسەم نەکردن میٚردی خۆم کرد، کورد پێمان دەڵێت: ئاگادارین زۆرجار ڕێکەوت دەت گەینێتە ئامانج دوور لە هەوڵ و ماندوبوون، زۆر کەس پۆستێکی گەورە وەردەگرێت بە ڕێکەوت یان دەوڵەمەند دەبێت بەڕێکەوت یان دەبێتە پاڵەوان بەڕێکەوت من لەژیانم دا ئەو ڕێکەوتەم لەزۆر کەس دیوە، بە هەڵە خەرکی بە ئازایان نلسی، واش نەبووە،چونکە من ترسنۆکیم زۆر لیٚ دیوە، لە لای خەڵکی پاڵەوان بووە، دەنگم نەکردوە، ڕێکەوتم زۆردیوە، لە پڕ کەسێك لە بوارێك بووەتەپاڵەوان واش نەبووە!

**چیرۆك:**

هەبوو نەبوو کابرایەکی هەژاری دەستکورت هەبوو، تۆزێکیش گێلۆکە بوو، ژنەکەشی وەك خۆی وابوو، ڕۆژێکیان ژنەکەی پێی وت کابرا لۆ نابیە مەلا، ئەمنیش دەبمە مەلاژن، هەمووژنانی گوندی خزمەتم دەکەن، نابینی بە هەموو گوندی خزمەتی مەلا و مەلاژن دەکەن... پیاوەکە وتی: ژنیٚ ئەوەندە ئاسان نییە، ژنە وتی بەرێوەڵلا، ئەچینە گوندێکی ئەتوو بڵیٚ مەلامە و ئەمنیش دەبمە مەلاژن مار بارەدەکەن،لە ناوچەی خۆیان دوور دەکەونەوە، ئەچنە ناوچەیەکی کەس نایانناسی خۆیان هەڵدەکێشن پڕ بە کراسی،لە گوندێك لادەدن دەڵێن: مەلاو هەیە دەڵێن: نەوەڵلا بیٚ مەلاین ! کابرا دەبێتە مەلا، خەڵکی گوند خانوو پێداوستییەکانی بۆی دابین دەکەن ڕۆژی جومعە کابرا دەچێتە سەر مینبەریٚ.دەست دەداتە شیر، ئەوکات وابوو شیرێکیان بۆ مەلا لەدار دروست دەکرد، ڕۆژی هەینی مەلا لەدەستی دەگرت کابرا نازانێت چی بلێت، بە خەیاڵی دادیٚ بڵێت کورە بڕۆنە دەریٚ مزگەوت دەکەویٚ، بەخۆی ڕادەکات خەڵکیش ڕادەکات ئەوان دەچنەدەریٚ، مزگەوت دەکەویٚ، ئەو خەرکە کە ئەوە دەبینن دەست و پێی مامۆستا ماچ دەکەن، دەبیەنەوە ماریٚ.مامۆستا ناو ناوبانگی بڵاو بووەوە لە هەموولاێك خەڵکی بۆ دووعاکردن داتنە لای مامۆستا، مامۆستا بووە شێخ لەناو خەڵکی لە هەموو وڵات باس هەرباسی کەرامەتی شێخی بوو، شێخ دەوڵەمەند بوو تەکیەی دروست کرد لەو کاتە پاشایەك دزێکی گەورەی لێکرا زۆر هەوڵی دا بۆی ئاشکرانەبوو ئەوانەی دزیان لەپاشای کردبوو چل کەس بوون، ڕۆژکیان پێیان

وت شێخێك هەیە خاوەنی کەشف وکەرامەتە،لەدوای نارد و شێخ چووە لای پاشا و پێی وت مۆڵەتی چل ڕۆژت دەدەمێ ئاشکرات کرد، خەڵاتت دەکەم ئاشکرات نەکرد، لەسەرت دەدەم! شێخ دەڵێت باشە پاشا پێشەکی سەت لیرەی دەداتێ، شێخ دێتەوە و بە ژنەکەی دەڵێت: چت پێ کردم ژنە دەڵێت گوێش مەدێ خوا کەریمە.شێخ دەڵێت ژنێ ئەمن ئەو جارەی لەسەرم دەدرێت تا نەمردیمە چل قازی دەکرم هەمو ڕۆژێ قازەکی ئەخۆین ئەو چل ڕۆژەی بە خۆشی ڕائەبوێرین، ئەچێت چل قاز دەکرێت ئێوارە قازێك دەکوژنەوە و دەی خۆن دزەکان بەو مەسەلەیە دەزانن دزێك دەنێرن چاودێری شێخی بکات، ئێوارە دەچێتەپشت دەرگای مارێ شێخی شێخ دەڵێت: مەلاژن ئەوە لەچلان یەك، دزەکە کە گوێی لەوەبوو، بە ڕاکردن دەڵێت: برادەرینە من چوومەپشت دەرگای مارێ شێخی، یەکسەر وتی لەچلان یەك، وایەو وانیە دزەکان ئێواری دووەم دوو کەسی تریان ناردن بزانن دەنگوباسی شێخی وەرگرن شێخ قازێکی تریشی کوشتەوە و ئێوارە بەخۆ و مەلاژن خواردیان دزەکان لەپشت دەرگابوون، شێخ گوتی مەلاژن گوێش مەدێ، لەچلان دوو دزەکان ڕۆیشتن و هاتنە ئەو باوەڕەی شێخ ئەوانی ئاشکرا کردیە، بەپەلە چوونەوە لای برادەرانی خۆیان و وتیان: تەواو هیچ گومانمان نەما شێخ ئەمەی ئاشکرا کرد، بازێڕەکانی پاشا ببەینەوەمارێ، شێخ بردیانەوە لە حەوشێ مارێ شێخیان فڕێ دا، بەیانی شێخ تەماشای کرد زێڕەکان کەوتینە حەوشێان، هەریگرتنەوە و دووای خواردنی هەموو قازان زێری بۆ پاشابردنەوە،پاشاش خەڵاتی کرد و کردیە وەزیر، کە پاشا مرد بوو، بەپاشابەڵێ ڕێکەوت یان قەدەر شتی وازۆر دەکات و بەردەوامیشە بەردەوامیش دەبێت... کورد لەمێژە هەستی پێ کردوە، پەندێك دەڵێت: ڕۆڵە بۆ بەختی کەس مەگری .

**پرسیار:**

لە دەوروبەری خۆمان مامۆستایەکی بەرێز هەبوو ناوی نادەین، دووای نوێژی شێوان لە مزگەوت دادەنیشت، کەسێکی بەساڵاچوو پێی دەڵێت: مامۆستا شەرم نەبێ لە مێژە پرسیارێکم هەیە، مامۆستاش دەڵێت: کەرەم کە، کابرا دەڵێت: مامۆستا ڕۆژی قیامەت (کەر) زیندی دەبنەوە، مامۆستا زۆرزان دەبێت لەپرسیارەکە دەگات، دەڵێت کەر زیندی نابنەوە! تەنیا کەرێ عوزێر پێغەمبەری زیندی دەبیتەوە، بەڵام تۆرێ هەموو کەران دەکاتەوە، چیان لە کەران کردبێت، ئەویش تۆرێ (تۆڵێ) کەران وادەکاتەوە، کابرای پرسیاری کردبوو ماوەیەکی چاك دۆشدادەمینێ! مامۆستا هەستی پێ دەکات دەڵێت: فلان کەس خەمێ هەرمەگرە، خودا غەفوور و ڕەحیمە

خۆشناو و دز و دزشاو

*** *** ***

**کابرایەك سواری ماکەرێك دەبێت، ئەوڕۆژە زۆر گەرما دەبێت، لادەداتە بن بنەدار گێوژێك، پشوێك بدات چاوی بە(هەرامەی) ماکەرێ دەکەوێت، حەزی دەچیتێ، کاری خۆی دەکات، دواتر بە دەسرۆکێ بەرپشتێ خۆی وشك دەکاتەوە و دەسرۆك فڕێ دەدات، دەسرۆك بەبای لەکەدە گێوژێك دەئالێت، کابرا دەڕوات دوای چەند ساڵێك ڕێی دەکەوێتەوە هەمان شوێن، تەماشا دەکات دەورەی دارگێوژیان غەرەکردوە و بەسەدان پەڕۆکیان پێوە کردووە کۆمەڵێك ژن بۆ سەردانی هاتوون داوای شیفای لێ دەکەن، کابرا بە ژنەکان دەڵێت: ئەوەچییە ئەڵێن: ئەوە مەزاری شێخێکی گەورەیە، کابرا دەڵێت: خوای بەقوربانی (هەرامەی) منت کات، ئەگەرنا نابووە شێخ لەوکات ناوڕێك دەداتەوە پەلە گێوژێك دەچاوی دەچەقێت، ژنەکان دەڵێن: ها ئەوە کوێرەی کردی، کابرا دەڵێت:**

**بەخوای وەنیە باوەبێ**

**باچاوی منیش لۆ وی بێ**

**کورد لەمێژە دەڵێت: خەڵکینە پیاو ناکرێت بە قونەکی سواری سێ کەران بی، واتە ناکرێت پیاو جووتیارێت بازرگانیش بێ وئاسنگەریش بێت یان لەهەرپیشەیەك ناکرێت کار لەچەندان پیشە بکات بۆ نموونە لە کوردستان دکتۆرە کانمان هەریەك لەو دکتۆرانە چارەسەری هەمووکوس دەکەن لەبنی پێیەوە تاکو تۆقی سەری، بە هەزاران کەسیان بە داودەرمان کوشت.وەك: جووتیارە و سیاسەتمەدارە، بازرگانە و مووچەخۆرە، بەڵێندەرەو بەرپرسە و خانەنشینە، زیندانی سیاسیە ز بریندارى کیمیاوییە، پێشمەرگەی دێرینە و سێ مووچە وەردەگرێت. ڕۆژێك پێشمەرگە نەبووە و خزمەتی دەساڵی پیشمەرگایەتی بۆ کۆکرایتەوە، بەینی خۆمان بێت کۆنە جاشیش بووە لە بەلەدیە بەردەستیشە.**

**ئەوچیرۆکانە زۆرن نموونە بەپیرەژنێك دێنینەوە، پیرەژنێك هەبوو فەقیر بوو، دەرۆزەی دەکرد لە سەر جۆخینان، گەیشتە کەسێك وتی: برادەر دەنگوباسی جۆخینانی ئەو ناوە چۆنە، کابرا وتی: پیرە دایك ئەمرۆ لە شەش گوندان جۆخین هەردەگێرین پیرەژن وتی: یارەبی خوایە یان بم کوژە یان وەسەرجۆخینی هەر شەش گوندان رابگەم، تاخر پیرەژن وێراناگەی، ئەگەر خێزانت ژنێکی باش بوو ڕۆژێك بە ڕێوەیە پیاو بەئامانجی خۆی بگات.**

*** *** ***

## خۆشناو و دز و دزشاو

پیشتر باسم کردوە، ئامۆژگاری زۆرجار دەبێتەدڵشکاندنی ئەو کەسەی ئامۆژگاری دەکەی و لێت زوویر دەبێت، سەیرکەن ئەو ژنە ڕەخنە لەکاروکردەوەکانی مێردی ناگرێت:

ژن و پیاوێك هەبوون پیاوەکە جووتێ گاجوتی هەبوون، ڕۆژانە دەچووەجوتی ڕۆژێکیان زۆرماندوو بوو، بڕیاری دا واز لەجووتیاری بێنێت گاجووتان بە بزن بدات، بێتە ئاژەڵدار ئەوپرسەی بە خێزانی خۆی کرد خێزانی وتی مێردە ئەتو سەلامەت پێ چیت پێ باشە وابکە، گاجووتەکانی بردنە شار و بەبزنی داو گەڕایەوە ماڵەوە، ماوەیەك بووە شوان تەماشای کرد بزن بەخێو کردن زۆر قورسە ئەو کارە بەوی ناکرێت ئێوارەکیان لەگەڵ خێزانی دانیشت وتی: پیەژن پیت کوە بزنان بە ماین و تاژی بدەم؟ هەر کەرویشکان دەگرم ئەتووش لێنێ، ژنە وتی: چت پێ باشە وابکە، بزنی بردن فرۆشتنی ماینێك و دوو تاژی کرین ماوەیەکی چاك خەریکی ڕاوکردن بوو لەوێش بێزار بوو، بەرەو شاری ڕۆیی ماین و تاژیان بفرۆشی، لە ڕێگا گەیشتە کەسێك تانجێکی پاشایانی لەسەر بوو، هاتەخەیاڵی بۆ خۆی نەکاتەپاشا وتی کابرا وەرە مامەڵەیەك بکەین ماین و تاژی بەتانج بگۆڕینەوە، کابرای خاوەن تانج وتی وەی هەزارجار مامەڵەکە تەواو بوو کابرا تانجی پاشایەتی لەسەرناو بەرەو ماڵەوەچو گەیشتەسەر رووبارێکی گەورە هەستی بە تینی بوون کرد داهاتەوەئاو بخواتەوە تانجی پاشایەتی لەسەری بەربەوەوەو بە ئاوێ داچو زۆر هەوڵیدا بێ سوود بوو پاڵکەوت و لێی نووست. کابرایەکی تاجیر لەو ناوە پەیدابوو، وەی زانی کابرا نەخۆشە لەسەر ئەو رووبارە کەوتوە، وتی: کابرا هەستە نەخۆشی هەستاو وتی: نەوەڵڵا ویستم سەرەخەوێك بشکێنم وتی ئەی چ کارەی لێرە مەسەلی خۆی بە درێژی بۆتاجیر گێراوە تاجیر وتی ئێستا بچیەوە ماڵەوە ژنت ڕات دەگرێتەوە؟ وتی ئەرێوەڵڵا! سەت جار خۆشم بە قوربان دەکات، بازرگان دەڵێت: وەرە با مامەڵەیەك بکەین، لەگەڵت دێم ئەو چیرۆکەی بۆ خێزانی خۆ دووبارەبکەوە، ئەگەر دەنگی نەکرد و خۆی بە قوربان کردی ئەوە یەك بارە قوماشت دەدەمێ ئەگەر دەریشی کردی لەماڵێ، ئاماوی دەبیەپیاوی من، وتی: باشە ئێوارە دوای مەلا بانگدان، کابراچووە ماڵێ و تاجیر لە پشت دەرگای گوێی لەقسان ڕاگرت، کابرا دوای سەلام لە خێزانی و تەواوی بەسەرهاتەکەی بۆ خێزانی خۆی گێڕایەوە، خێزانی وتی: مێردە بەخێر بێیەوە سەرچاوان ماری دونیایێ پیاو پەیدای دەکەن، مادام بە خۆت سەلامەتی هەموو ماڵی دنیایێ بە قوربانی پەنجەیەکی تۆ بێ، کابرای تاجیر دەڵێت: وەرە دۆڕاندم، هەرسێ ژنم بە قوربانی ژنێ توبن. بارەقوماشەکە بەجێ دێڵێت و دەڕوا.

## خۆشناو و دز و دزشاو

کەسێك توشی ڕووداوێکی شەرمناوی بیێ، دەتواندرێت قسەیەکی باشی بۆ بکەی باری نموکەسە سووك بکەی کورد دەڵێت: قسەی خۆش کوێستانی دڵە.

*** *** ***

کابرایەك تازە ژنی بۆ کوڕەکەی هێنابوو، بووك وەك پەلیك لەو سەر بۆ ئەوسەر دەجولایەوە، لە بەرچاوی خەزووری لەپڕ بایەکی لێ بەر بوو! بووك زۆر شەرمی لە خۆ دەکردەوە خەزوور زۆر زان بوو، ویستی بووکەکەی لەشەرم دوور خاتەوە وتی: کچم شەرم مەکە ئەوە نیشانەی ئەوەیە نۆبەرەت کوڕ دەبێت، بووکەکە وتی: مامە ئێکی تریش بکەم، خەزوور وتی: نانا کچم دوو بەخێو ناکرێن، یەك کوڕمان بەسە .

کورد دەڵێت: مناڵ فەرخە گوجیلەیە چۆن فێری کەی وا دەردەچێت، زۆر راستە داری گۆپاڵ بە تەڕی دانییێ بە وشکی دەشکێت، واتە: مناڵ بە بچووکی دەبێت پەروەردە بکرێت.

*** *** ***

دایك و کچێك هەبوون داخوازی کچەکە هاتن، کچەیات مارەکرد جلك و خشریان بۆ کڕی ڕێژێکیان لەشکر هات کچە بگوازنەوە بەریبووك ڕۆژی پێشتر هاتبوو دایك تا درەنگی شەوێ ئامۆژگاری کچەکەی کرد بۆ بەیانی بووکیان سواری ماین کرد و ئالآیەکی سوریان بەسەردادا و بە رێ کەوتن لە گوندی دەرچوون دایکێ بووکێ بانگی کردن، بووکێ بگێڕنەوە بووکیان گێڕایەوە، سەری بردە بن گوێی بووکێ وتی: کچم نسحەتێکم مابوو، بووك وتی فەرموو دایە، دایك گوتی: (کچم هەمووشت بە تەڕی) دیارە ئەو ئامۆژگاریە دوو وشەیە ئەو دووشەیە زۆر گەورەیە راست دەکات هیچ شتێك بە وشکی و ڕەقی نابێت.

مار بەقسەی خۆش لەکون دێتەدەرێ، ئەگەر کەر نەچیتە بن باری باری بێنە کن کەرێ، ئەوە کارەکە رێك دە کەوێت، وڵاغی باش ئالیك بۆخۆی زیاد دەکات، واتە پیاوی ئازاو پاك و دڵسۆز و نەرمونیان و بەرێز دەستپاك و بە ناموس بەخۆی رێزی خۆی پەیدا دەکات، وا دەکات خەڵکی رێزی بگرن خۆشەویستی ناو خەڵکی بێت،خۆتان بە دوور بگرن لە مرۆڤ کوشتن، چونکە باب و باپیران پێمان دەڵێن: ئەوەی کەسێکی کوشت خۆی کوشت، چونکە باپیرانمان هیچ قسەیەکیان نەکردوە کە بۆیان نەسەلمابێت ، من بەچاوی خۆم دیوە ئەوانەی مرۆڤکوژن بە ڕێژەیەکی زۆر کوژراون، مرۆڤکوژ دووجۆرە: من پێم وایە هەموو کەس پێویستە مرۆڤ بکوژێت، ئەگەر ئەومرۆڤ ویستی وڵاتت داگیر بکات و شتەپیرۆزەکانت لێ بستێنێ و هەموو مافێکت لێ

زەوت بکات و وەك کۆیلە سەیرت بکات، من لاریم نیە لەکوشتنی ئەوکەسە، یان کەسێکی هاوڕەگەزی خۆت هەموو پیرۆزییێکی مرۆڤایەتی، بەڵام بە ناهەق کوشتنی مرۆڤ تاوانێکە بە هیچ پێوەرێك ناپیورێت!

***    ***        ***

دوو کەس پێکەوە دەچنە ڕاوێ، لە چیا یەکیان ئەیەوێ ئەوەی تر بکوژێت، کابرا دەڵێت: کاکە مەمکوژە ئاشکرا دەبی، کێشە بۆ خۆت و ماڵ و منداڵت دروست دەکەی، کابرا دەڵێت: دەت کوژم کەسیش نازانێت، کابرا دەڵێت: گوێت لەو دووکەوەیە دەخوێنن قسەت لێ دەکەن کابرا فشەی بەو قسەیە دێت و دەیکوژێت... دووای چل ساڵ کابرای زەلامکوژ لە ماڵێك داوەت دەکرێت، بە سودفە گۆشت کەویان دەبێت لە کاتی لەبەر دەمی دادەنێن، کابرا پێدەکەنی خاوەن ماڵ دەڵێت: قوربان بۆ چ پێکەنیت؟ کابرا مەسەلەی زەلام کوشتنەکە دەگێڕێتەوە خاوەن ماڵ ئەوەی کابرا دەبێت پەلاماری خەنجەر دەدات دەی کوژێتەوە، من بەدەگمەن زانیومە زەلام کوشتن بزر بێت، خۆتان دوور بگرن.... دەڵێن: میوانی سعاتەکی، جاسووسی ساڵەکی، کە میوانتان دێت زۆر وریابن کەم قسەبکەن، بە وریایی باش بجوڵێنەوە بەشی زۆری میوان جاسووسن، هەر شتێکی ناشاز ببینێت دەی باتە دەرەوە و بڵاو ی دەکاتەوە.

***    ***        ***

کابرایەك هەبووە خاوەنی بزن و مەر و گاجووت بووە، ڕۆژێك لە ڕۆژان شوان دێتەوە جیسکێك دیار نییە کابرا دەڵێت کوڕم تا زووە بڕۆن چیابڕۆنن بی دۆزنەوەز کوڕەکان دەڵێن: باوکە ئەو جیسکە گڕوو بووە، وازی لێ بێنە با گورگ بیخوا، باوك دەڵێت: ئەگەر بەقسەی من دەکەن بڕۆن بیدۆزنەوە کوڕەکان بەقسەی باوکیان ناکەن، دوای ماوەیەك بزنێك بزر دەبێت کوڕەکان ئەو مەسەلەیە بە باوکیان دەڵێن: باوکیان دەڵێت کوڕم بڕۆن بەدووای جیسکە گڕوو بگەڕێن، دوای ماوەیەکی تر گاجووت بزر دەبێت، بەباوکیان دەڵێن: باوکیان دەڵێت: کوڕم واز لە گاجووت بێنن بڕۆن بە دووای گیسکدا بگەڕێ... واتە ئەگەر لەشتێکی بچووك نەپێچیەوە، ئەوا وردە وردە شتی گەورەشی بەدوای دادێت، لە هەر شتێك لە هەر بابەتێك، ئەگەر مناڵەکەت هەڵەیەکی بچووکیش بکات ناکرێت هەڵوێستت نەبێ بە خۆشمان کە هەڵەدەکەین، بابچووکیش بێت، خۆمان سزا بدەین، بەشێوەیەك لەشێوەکان، بۆ ئەوەی ویژدانمان بەرەو کزی نەڕوات لێ ڕانایێت، واتە: خوو نەگرێت لەگەڵ هەڵە.

ئێمە زۆرجار کە توشی کێشەیەك دەبین نازانین بە نەرمونیانی بەرگری لە خۆمان بکەین لە جیاتی بەئاقلانە بەرگری بکەین باوەڕ بەو کەسە بێنین کە لێپێچەینەوەمان لەگەڵ دەکات توشی هەڵچوون دەبین، ئەوەندەی تر کێشەکە گەورە دەکەین لەسەرخۆمان من زۆرجار تووش بووىمە ئەسەر ئەوهەڵچونە بەتایبەتی کوڕە جووتیارانی وەك خۆم کە بەگەورەی هەندێك شت فێربووین بەهیمەتی کادیرانی کۆمەڵە کە توڕە دەبین دەبێنەوە هەمان کوڕە جووتیاری جاران، ( دز و دزشاو تێکەڵ دەکەین ) دەفەرموون ئەو پیاوەچۆن بەرگری لە خۆ دەکات لەبەرانبەر ( میری سۆران).

لەسەردەمی میری محەمەد کە ناسراوە بەمیری کوێرە، کەسێك کردارێکی حەرام زادەی لەگەڵ ژنێك دەکات ئاشکرا دەبێت ئەو دەنگوباسە دەگاتەوە میری کوێرە، دیارە میریش ناوناوبانگی بەدەوروبەر بڵاو بووبووەوە لەتوندی لەگەڵ ئەوکەسانەی هەڵەی بەئەنقەست دەکەن میر ئەمر دەکات کابرا بێنن، کابرادێنە بەرانبەر میر، میر پرسیاری لێ دەکات ئەو هەڵە گەورەیەت بۆ کردووە؟ کابرا دەڵێت میری گەورە قسەی بەر ئاگردان و هانەهانێ شیری لەیەك دوورە!

لەوکاتە میری سۆرە، ناناسێ میری کوێرە.

*** *** ***

لەگوندی بالیسانی ئەوکات دیارە کۆمەڵێك جولەکەی لێبووینە، لە خۆشناوەتی پایزان دابەستی باو بووە، هەموو ماڵێك هەوڵی داوە دابەستی هەبێت، ئەوەی هەژاریش بوو بەهۆی زەکات دەیتوانی خاوەنی دابەستییێك بێت، پایزێکی درەنگ دابەستییەکان لە ڕۆژێك دەکوژرانەوە و، دەکران بە قەرێ وردە وردە زستانان لەگەڵ ماش دەخوران، یان بۆ میوانی ئەزیز لەگەڵ هێلکە تێکەڵ دەکرا و دەخورا، ڕۆژێکیان یەکێك لە جووەکان لە دیواخان دەبێت، باس دێتە سەر دابەستی کوشتنەوە، یەکێك لە جووەکان دەڵێت: من پێم وایە زووە بیانکوژینەوە، جیرانەکانی منیش هێشتان نەیان کوشتینەوە، من بیکوژمەوە دەبێت بۆ جیرانەکان ببەم، کەوابوو هەربەشی جیرانان دەکات، ئەگەر بەتەنێ بیکوژمەوە پێم ناخورێت، ئەگەر هەموومان پێکەوە بکوژینەوە باشترە. ئاغا دەڵێت: بە شەو بیکوژەوە و بڵێ دزیان، جووەکە دەڵێت: خۆ ئەوەش دەکرێت، بۆ هەمان شەو ئاغە دەڵێتە پیاوەکانی بڕۆن بیدزن، پیاوەکانیش دەچن بەشەو دابەستی جووەکە دەدزن و بەوشەوە بەشێکی دەخۆن، جووەکە بەیانی سەیر دەکات دابەستی دزراوە، دەچێتەلای ئاغەو شکایەت بکات کە دابەستی دزراوە، دەڵێت: قوربان دابەستی منیان دزیوە، ئەگەر هیممەتێکم بۆ بکەی،

ئاغه دەڵێت: کارێکی باشت کردووە، هەربڵێ دزیان، جووەکە دەڵێت: بەخوای بەراستمە دزیان. ئاغه دەڵێت: ئائا هەروەبرێ فێرێکی باشە، ئاغە بەو فێرە دابەستی جووی خوارد!

*** *** ***

کابرایەکی دەوڵەمەند هەبوو خاوەنی بزن و مەڕێکی زۆر بوو، ڕۆژێك لە ڕۆژان خێزانی مەزگیرانی دەکردن زۆر حەزی لەگۆشتی بوو لەلای پیاوەکەی باس کرد، پیاوەکەی ئەوەندە ڕەزیل بوو دڵی نەهات جیسکێك بۆ خێزانی بکوژێتەوە، وتی: باشە دەچمە شاری جەرگوناوێکت بۆ دەکڕم. کابرا بەیانی سواری کەرێ بوو چووە شاری قەسابی دیتنەوە، جەرگوناو زۆر بوون لەسەر گرانی و هەرزانی زۆر گەڕا لەناو شار، دواتر ( جەرگوناو ) نەمان، وای بەباش زانی شەو بچێتەماڵێك تاکو بەیانی بەلکوو بتوانێت جەرگوناوێکی هەرزان بکڕێت، چوو لەدەرگای ماڵێکی دا، خاوەن ماڵ وتی: فەرموو وتی: میوان رادەگرن؟ خاوەن ماڵ وتی: میوان خێر و بەرەکەتە فەرموو، وەختی نانخواردن هاتوو نان داندرا، لەسەر سفرە ژنەکەی خاوەن ماڵ ڕووی لە مێردەکەی کرد، وتی: مێردە بکوتین یان بخۆین، مێردەکەی وتی: دەی خۆین ئەو جادەی کوتین! کابرای میوان زۆر ترسا، وایزانی دوای نانخواردن لێی دەدەن. وتی: کاکە من نان نا خۆم دەڕۆم، خاوەن ماڵ وتی: بۆ کاکە چقەومایە؟ میوان وتی: قوربان بەخۆت وخێزانت بڕیار و نەدا دووای نان خواردن بمکوتن، ژن و مێرد پێدەکەنن، میوان دەڵێت: بەچ پێدەکەنن؟ ژنەکە دەڵێت: برای باش ئاش لەخەیاڵێکی و ئاشەوان لەخەیاڵێکی، با بۆت باس بکەم من خێزانی کەسێکی تر بووم ئەو کەسە زۆر دەوڵەمەند بوو، زۆریش ڕەزیل بوو نە بەخۆی دەخوارد و نە مەسرەفی ماڵەوەشی دەکرد دووژمنیشی میوان و میوان داری بوو، دواتر مرد منیش لێرەم شاردەوە و ئەوماڵ و سەروەتەی هەی بوو بۆمن بەجێماو، دواتر من مێردم بەو پیاوە کردووە سێجەمە گۆشت دەخۆین، هەموو وەختی جەمان زۆرجار پێش نانخواردن چەند کوتکێك لە گۆڕی دەدەین، یان دووای نانخواردن ئەوە کارو پیشەمانە، جەنابت نانی خۆ بخۆ و مەترسە، نانیان خوارد و بە کوتکان کەوتنە لێدانی گۆڕی کابرای مردوو، کابرا زۆر تێك چو زۆر پەشێمان بووەوە بەیانی وازی لەجەرگوناو کڕین هێناو بەرەو ماڵ کەوتە ڕێ گەیشتەماڵەوە، ژنەکەی سەیری کرد بەدەستی بەتاڵ هاتیتەوە، وتی مێردە کوا جەرگو ناوت بۆ کڕیم؟ دەڵێت: نەوەڵڵا! بڕۆن بەرانی گەورە بینەوە بیکوژمەوە ژنە دەڵێت: بریا ئەتوجیسکەك لۆمن کوشتبایەوە، قیروسی لەبەرانی! کابرا دەڕوات و بەرانی گەورە دینیتەوە و هەڵ دەکێشێتە خەنجەرێ بەرانی بکوژێتەوە، ژنە دەڵێت:

بسمیللا میّردە! ئەتو شیّت بووی لۆ جیسکەکی ناکوژیەوە؟ کابرا دەڵیّت: ژنێ وسبە! ئەوەی ئەمن دیت یاخوا ئەتونەبینی، ژنە دەڵیّت چی بووە چ رویی دایە؟ کابرا دەڵیّت کچێ وازم لیّبینە، بەو چاوانەم دی ئەتویان ............ و ئەمنیشیان ئەکوتا)

دواتر بە درێژیی بەسەرهاتەکەی بۆ خیّزانی خۆی گێڕاوە و ناوەناوە زیافەتێکی بۆ منداڵەکان دەکرد و وازی لە ڕەزیلی هێنا، ئەمەش لەترسی ژن......و کوتکان!

*** *** ***

لەلای خۆمان ژن و پیاوێك هەبوون ژنە منداڵەکانی گەورە بووبوون، زۆریش لەگەڵ پیاوەکەی تەبانەبوو، کە پیاوەکە دەیویست بۆکاری خێر بچێتەلای، بە دەنگێکی گەورە دەیوت: کوڕە حەمەد برۆ دەرێ دز لەپشت مارێمەنە، منداڵەکان بە خەبەرداتن حەمەد بە هەناسە ساردی دەچووەوە سەر شەونوێنی خۆی و دەنووست. کابرا لە خەفەتی ژنەکەی ژنێکی هێنا، ماوەیەك خۆی لە کەونە ژنەکەی نزیك نەکردەوە، ژنە تەنگاو بوو، چووە لای و گوتی: مێردە خۆ ئەمن چ بەرام نییە هەر لە بەرمنداڕۆکان جاربەجار وەرەوە سەرەکێش لەمەبەدە. کابرا دەرێت: وەڵلاهی ژنێ زۆرم پێخۆشە، بەرا لەبەر دزان نەوێرم دەورووبەری مارێنگۆ پڕە لە دز ژنەکە دەڵێت: جاران وەبوو بەرا ماوەکە دزنەماینە! کابرا دەڵێت: مادام دز نەماینە هێوارێ مریشکەکی بکوژەوە میوانم. کابرا هێوارێ دەچێت تەماشا دەکات ژنەکەی جیسکێکی کوشتیتەوە و جەرگوناو بەجودا و گۆشت بە جودا، بێنگۆ ناخۆش تێری جەرگوناو خواردیە. ئەوەی نەترسێ زوو لەناو دەچێت، دیارە ترسیش وەك خوێ هەمووشت بەخوێ خوێش بەقیاسی خۆی، ترسیش دەبێت سنوورێکی هەبێت.

*** *** ***

پیاوێکی دەوڵەمەند هەبوو خاوەن مەڕ و ماڵاتێکی زۆر بوو، ئەو دەوڵەمەندە چاکە و پیاوەتی نەدەکرد، ئاگای لە فەقیر و هەژار و منالّانی هەتیو نەبوو، چاکەی لەگەڵ کەس نەدەکرد، تەنانەت خێریشی بۆ خۆش نەدەکرد دوای ماوەیەك ئەو پیاوە مرد، دوای ماوەیەك شوان ئێوارە هاتەوە و جیسکێك بزر بووبوو، براکان بەرە و چیا چوون بەدوای گیسك زۆر گەڕان زۆر هیلاك بوون کە بێ ئومێد بوون یەکێك لەوان وتی: براینە واز بێن با خێرێ باوی بیت! بەڵێ ئەگەر دەیان دیتەوە، ئەوخێرەشیان بۆ باوکی نەدەکرد! واتە باوکینە ئەگەر خۆتان کاری باش

**نەكەن چاكە و پیاوەتی نەكەن ئاگاتان لە خەڵكی داماو نەبێت منالّەكانتان شتێك دەكەنەخێر بۆتان كە بێ ئومێد بووینە لە دیتنەوەی.**

**ئەكرێت شتێك بڵێین كە هەموو سەردەمێك پیاوی ئەقڵ و تێگەیشتوو هەبووە، وابیرنەكەینەوە ئەوانی پێش ئێمە هیچیان نەزانیوە، تاك تاك پیاوی زۆر زیرەك و بلیمەت هەبووینە نموونەیەك دێنینەوە :**

**مامی باپیرم كە دەكاتە كێخوافەقێ پیاوێكی ئاقڵ و لە سەرخۆ بووە كەپێشتریش باسی ئەو پیاوەم كردووە لە ئازایەتی و مەردایەتی وێنەی كەم بووە، بڕیاری بێ بیركردنەوەو بە پەلەی نەداوە، كوڕێكی شوان دەبێت بەناوی ئەحمەدەسوور، شەو لەلای بزنان دەنوێت لەسەر كەپرێ بۆ ئەوەی چاوی لە بزنان بێت هەم لەگورگ لەدزیش دووریان خاتەوە، بەیانیەكیان بزنەكان دەر نەكراون ئەویش دەچێت بزانێت مەسەلە چییە؟ دەبینێت شوان لە خەودایە ئەیەوێت هەڵی بستێنێت تەماشا دەكات كوڕی بە خەنجەران كوژرایە، بانگی خزمان دەكات دەڵێت: بڕۆنە سەرقەبران كوڕم كوژرایە، دەچن كوڕە دەشارنەوە و تازی دادەنێن.تازی كۆتایی دێت زۆر لە خزمان و خەڵكی گوندی ناوی زۆر كەس دێنن ئەودەڵێت: وانیە ئەوانەی ئێوە دەڵێن كوڕی منیان نەكوشتووە وازبێنن دوای چەند مانگ مام فەقێ لەماڵەوە دانیشتووە، كەسێك دێتە لای بەناوی رەسوولی حەلیمێ كە بێكەسترین كەس بووە لەشێخ وەسانان، خەنجەرێكی بەرووتی لە دەست دایە و دەڵێت: مام كێخوا من كوڕی تۆم كوشت بەو خەنجەرە فەرموو بم كوژەوە مام كێخوا، خەنجەرەی لێ وەر دەگرێت بۆی دەكالانێ دەنێتەوە لەو كاتە خێزانی مام كێخوا فەقێ گوێی لەو گفتوگۆیە دەبێت پەلاماری داسێك دەدات پەلاماری كابرا دەدات تۆڵەی كوڕی خۆی بكاتەوە مام كێخوا پەلاماری ژنەكەی خۆی دەدات لێی دەدات، ژنەكە ئاوس دەبێت بەردەبێتەوە ژنەكەی خۆی دوور دەخاتەوە، دواتر ژنەكە بەو لێدانە منالّێكی لەبەر دەچێت واتە: ئەوە دوو منالّی فەوتان، بانگی خزمان دەكات پیان دەڵێت:خزمینە ئەوكابرایە بێكەسە و هەژارە هەڵەیەكی وای لەگەڵ مندا كردوە، بەخۆشی هاتووە بیكوژم من دەتوانم بی كوژم بۆیە نای كوژم، ئێوە كەس بۆتان نییە پێی بڵێن لەپشتی چاوت دوو بڕۆیە، دوای مردنی منیش واتە ئاك و لە ژیاندا ماوە ئەوەلێرە بەولاوە خزمی منە تەواو، بەڵێ ئەوە مام كێخوا فەقێ بووە لە كاتێك دا بنەماڵەبووینە وەخاوەن خزمێكی زۆر بووین.**

نە گوندەکەمان شێرەپیاوێکی ترهەبوو، بەناوی (حاجی فەقێ ئەحمەد)پیاوێکی گورجوگۆڵ بووە، شەوێکیان گورگ دێتە ماڵیان بەدوای گورگ دەکەوێ بەدار، گورگ دەکوژێ ئەو نازناوەی حوو کەوت، شەوێکیان لەگەڵ خێزانی دەنوێ منالێکی ساوایان هەبووە بەناوی ئایش لەگەڵ خۆیان دەینوێنن، لە سەر کەپرێ شەو منالەکە خۆی وەردەگەڕێت دەستی بەدایکی دەکەوێت ـیکی وادەزانێت مارە رادەپەڕێت دەڵێت: ئەحمەد هەستە عەزیای خواردم مام فەقێ ئەحمەد دەست لۆچەکی دەبات لولەی چەکی لەسەرقۆڵی کچەکەی دادەنێت وادەزانێت مارە دەی تەقێنێت منالەکە زیرە دەکات ئەوکاتە دەزانن عەزیانەبووە قۆلی کچەکەیان بووە، مام فەقێ ئەحمەد بەخۆی دکتۆریش بووە بەوشەوە دەرمانی کردوە پوورئایش چاك دەبێتەوە، مام فەقێ ئەحمەد لە بوو باپیران و لەژیانی خۆی هەموو ڕووداوەکانی دەزانی زۆرجوان باسی دەکردن، لە ڕووداوەکانی چەندان پشت ئاگادار بوو بەشێکی زۆری ئەو شتانەی من باسی دەکەم هونەرەکەی خار فەقێ ئەحمەدە، لە بنەماڵە دەچێتەوە سەر خزمانی بنەماڵەی لەیلێ .

*** *** ***

کەسێکمان هەبوو بەناوی (مام حەسەن) ناسراو بووە بە حەسەن سەوە، ماڵیان لە گوندی هەرمك دەبێت پیاوێکی سەیرو سەمەرە و قسە خۆش بووە، بەسەرهاتی زۆرن ڕۆژێکیان دایکی حەسەن دەڵێت: کوڕم برۆ گوندی مەلەکان ڕۆنی بکڕە ( جاران تەنیا ڕونی خۆماری هەبووە) هەندێك پارەش دەداتە حەسەنی بۆ ڕون کڕین مام حەسەن بە ڕێ دەکەوێت دەچێتەگوندی مەلەکان، کۆمەڵێك کەس لە بەردەرکی مزگەوت دەبن سلاو دەکات و چاکوچۆنی دەکەن ئەو کۆمەڵە کەسە خەریکی مامەڵەی چەکن، دواتر مام حەسەن خۆی دەکاتە مشتەری و چەکەکە دەکڕێت پارەی بۆ ڕون کڕینی هێنابوو، دەداتە کابراو دەڵێت: ئەوەی تر دووایی دەت دەمێ، خاوەن چەك ڕازی دەبێت ئەو چەکە چوار پاکەتە فیشەکی لەگەڵ بووە، مام حەسەن واز لە ڕون کڕین دێنێت و دەگەڕێتەوە ماڵەوە دایکی دەڵێت: حەسەن کا ڕونت کڕی ؟ حەسەن دەڵێت: دایە پارەی ڕونم بەچەك دا، دایکی دەست دەکات بەگریان کۆمەڵێك گلەیی لە حەسەن دەکات، دەڵێت: کوڕم ئەمە فەقیر و هەژارین خۆ ساحێب دووژمن نین چەکت لۆ چییە؟ بۆ ڕۆژی دواتر دەڵێت: حەسەن برۆ لای خاڵت کە دەکاتە حەمەدەمینی کۆشکێ کە دەبێتە باپیری من، (مام حەسەن) ئەو جارەیان بەرەو شێخ وەسانان دەچێت بۆ لای خاڵی، دوای چاك وچۆنی دەڵێت: خارە داکێ وەگۆ با هەندەك ڕونن لۆ بنێرێ لۆ گێژنێ حەمەدەمینی کۆشکێ دەڵێت: وەی بەسەرچاوان!

کەسی خاری، هەر ئەنگۆو رون، دایکت بە ڕونی لە من ڕازی بیت لەخزمەت دامەن یەك پەقرەجە رونی دەدەنێ و مام حەسەن دەڕوات لەنێوان گوندی بێراوە و شێخ وەسانان کانیەك هەیە بەناوی سماقە لەسەر ئەوکانیە مام حەسەن رونەکە و چەکەکەی دادەنێت تۆزێك دوور دەکەوێتەوە. دەست بەئاو بگەیێنێت لەپڕ قەرەباشکەیەك لەسەر دەستمەنجەرەکە دەنیشێت و دەسمەنجەر وەر دەگەڕێت رۆنەکە دەرژێت مام حەسەن بەپەلە خۆی ڕێك دێخیتەوە و پەلاماری چەك دەدات، سێرە لە قەرەباشکە دەگرێت و تەقەی لێوە دینێت قەرەباشکە دەفرێت دووردەکەوێتەوە مام حەسەن بەدوای دەکەوێت تاکو تەقەمەنی دەبڕێت قەرەباشکەشی پێ ناکوژرێت، شەرمێش دەکات بگەڕێتەوە لای خالی دووبارە بەدەستی بەتار دەچێتەوە گوندی هەرمك، چیرۆکەکە بۆ دایکی دەگێڕێتەوە، دایکی دیسان بۆ ماوەیەك دەگرێت دوواتر دەڵێت: کوڕم واز بینە دیارە خوای قسمەت نەکردیە گێژنێ شیوێ بخۆین.

*** *** ***

کێخوا عالی گوندی خەتێ،(ئێمە بە عەلی دەڵێین: عالی.) ماوەیەك فەقێی ڕووی تێ دەکات لە گوندی خەتێ کەسێك بەناوی حەمەدی فەقێی زۆر دەوڵەمەند بووە، کێخوا عەلی بەباش دەزانێت بە دووای دا بچێتە چیا و لە دوورەوە خۆی حەشار دەدات دەڵێت هۆێێێێێێێێ حەمەدی فەقێی ئەتو پیاوێکی باشی، ئاگات لە کێخوا عەلی بی، یارمەتی بدە، سێ جار دووبارەی دەکاتەوە و خۆی بزر دەکات، حەمەدی فەقێی وادەزانێت لە غەیبەوە ئەوەیان پێ وتووە، بەپەلە دێتەوە ماڵەوە و ئەوەی هەیتی لە ماڵەوە نیوەی بۆ کێخوا عەلی دەبات، کێخوا دەڵێت: ئەوەچییە هێنایتت؟ دەڵێ: کێخوا وسبە! لە غەیبەوە پیان وتم: ئەتو فەقێی برۆ یارمەتی بدە.

کورد دەڵێت: لەبەر خەرکی هەژار و قەردار نەبێت پیاوی گەواد دیار دەکەون، دیارە ڕەنگ و رووی قەرداران ڕەنگ و رووی پیاوی گەواد بزر دەکات.

لە گوندی خەتێ پیاوێکی زۆر قسە خۆش هەبووە بەناوی کێخوا ڕەسوول کە دەکاتە باوکی حاجی حامید، زۆر حەزی لە راوشکار بووە هەمبوو کاتیش پێنج فیشەکی پێ بووە، پیان وتووە واباشترە فیشەك زۆرتر ببەی، لە وەڵامدا وتویە ئەگەر پیاوم رێ لێ بگرن هەر پێنج کەس دەبن پێنج پیاویشم پێدەکوژرێن، ئەگەر گەوادیشم ڕێی لێ بگرن، بە دە ڕەختە فیشەکیش گەواد کۆتاییان نایێت!

*** *** ***

مام حسێن کانی بەردی و خزمێکیان دەچنە دەشتی هەولێر بۆ توتن فرۆشتن توتن فرۆشن و سواری کەران دەبن دەگەڕێنەوە ڕۆژەکە زۆر گەرم دەبێت لە ئاقاری چاویان بە بیستانەکی گندۆران دەکەوێت، ئەوانیش زۆر برسی دەبن، لەخۆشناوەتی لە سالآنی زوو گندۆرە زۆر بەکەمی دەکران، وەك شێتان پەلاماری گندۆران دەدەن، گندۆرە خەسلەتی وایە بەگەرمی بخۆی توشی( ڕەوانیت )دەکات ئەوان نازانن گوێ پێ نادەن باش گندۆران دەخۆن، دواتر هەریەکە و نیوە کۆشێك پڕ دەکەن و لەسەر کەرێ وردە وردە دەیخۆن دووای ماوەیەك (ڕەوانی )دەست پێ دەکات، ناوەناوە لە کەرێ دێنە خوارێ، دواتر کەلکی ئەوەی نامینێت سواری کەرێ بن زگ چوونەکە بەرەو زۆری دەچێت شلواریان لەپێ دەکەن، هەریەکەو بەچەپ و ڕاست بەلارێدا دەڕۆن، دادەنیشن و هەڵدەستنەوە شەرەتۆپ و تەقەش لە هەردوو لا بەردەوام بووە، زۆریش بەیەکتر پێدەکەنن، بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك ئەو کارە بەردەوام دەبێت، هەزارجوێنیش بەخاوەنی گندۆرە دەدەن .

*** *** ***

مەلایەك و کەسێك دەبنە ڕەفیق دەگەنە شوێنێکی چۆل و بێئاو وەختی نوێژی عەسریش دێت مەلا دەڵێتە کابرا وابزانم نوێژن ئەچن کابرا دەڵێت: ئانا مامۆستا دۆلکە ئاوەکم ڕێیە، مەلا دەڵێت: دەباشە با دەست نوێژان هەربگرین، نوێژێ لێرە بکەین، مامۆستا دەست دەکات بەدەست نوێژ هەڵگرتن. کابرا چەند جارێك دەڵێت: وەڵڵا مامۆستا ئاوم ڕێنە با نوێژت دەچوو مەلا تورە دەبێت و قوەت دەداتە زگی خۆی بایەکی گەورە لەخۆ بەردەدات دەڵێت: دەباشە کوڕم ئەوە ئاوت و بە چنەچو بابڕۆین!

*** *** ***

لەدەوروبەری خۆمان مۆستایەکی زۆرباش و بەرێز هەبووە، ئامۆژگاری نوێژکەرانی کردوە کەوا لەسەر پیشاو خۆیان نەرموشل بکەن بۆ ئەوەی بەباشی بەتار (بەتاڵ) بن، کەسێك ئەو ئامۆژگاریە پەیڕەو دەکات و لەکاتی دانیشتن بایێکی گەورەی لێ بەردەبێت دەڵێت دەباشە بەگونی مامۆستای ئەوەخۆم نەرم وشل کرد .

*** *** ***

لەو گوندانەی خۆمان کەسێك بووبووە دەروێش، وازی لەکاروکاسبی هێنابوو، خێزانی دەروێش داوای لەچەند ڕدێن سپێك کرد بەڵکوو هیممەتێك بکەن ئامۆژگاری بکەن با

**دەرویشایەتی خۆشی بکات و کاروکاسبیش بکات، ئێوارەیەکیان چەند ڕدێنسپی گوندی سەردانی ماڵی دەرویشیان کرد و گەلێك ئامۆژگاریان کرد، خێزانی دروێشیش دەڵێ: ئەدی پیاوەکە بە قسەی وانە هەرۆ ناو رەزی و هەندەکی بنێ پێمەرێ بکە و هەندەکی پەرژینی بکە و کۆرانە و مۆرانان بگرەوە. دەروێش رووی لە خێزانێ خۆی کرد و وتی: خانم ئەتو ئاگات لە کۆران و مۆرانێ خۆبی! خەمێ کۆران و مۆرانێ رەزت نەبی !**

*** *** ***

**ماۆستا سەلامی بێتواتە مەشوورە هەموومان دەی ناسین زۆر حەزی لەجگەرە کیشان بوو، بە رەمەزانان بۆ جگەرە شێت دەبوو، توڕەش دەبوو، رەمەزانێك کەسێك لێی دەپرسێ دەڵێت مامۆستا بە دەست نوێژی بەیانی دەتوانی نوێژی نیوەڕۆی پێ بکەی دەڵێت: بەڵێ قوربان دەبێت، کابرا دەڵێت نوێژی عەسریش، مامۆستا دەڵێت: بەڵێ دەبێت. کابرا دەڵێت نوێژی مەغریبیش مامۆستا سەلام دەڵێت کاکە برۆکەرێشی پێ بگێ رەحمەت لە بابت ! مامۆستا سەلام قسەکی تری هەبوو لە کوردەواری میوانی ناوەخت خاوەن ماڵ دەڵێت: میوانی ناوەخت نانی لەسەرخۆیە، واتە: هەرخواردنێکی لەپیشی دانێن نابێت نارازی بێت، ئەگەر مەلاسەلام چووبا ماڵێك ئەوقسەیان لەگەڵ کردبا، لە وەڵاما دەیوت بەڵێ راست دەکەن میوانی ناوەخت لەسەریەتی پشوو درێژبێت، تاکوو شیوێکی خۆشی بۆ لێ دەنێن نابێت پەلەپەل بکات .**

*** *** ***

**مەلائیبراهیمی گوندی بێراوە یەکێکە لە مەلا ناودارەکانی خۆشناوەتی خزمەتی زۆری بەئایینی پیرۆز کردووە، لە کۆتایی مانگی رەمەزان کەسێك پێی دەڵێت، بەخوای مامۆستا رەمەزانێکی خۆش بوو ! مامۆستا ئیبراهیم دەڵێت: وەی هەرزرێت لەگەڵ درۆیان کەنگێ رەمەزانێکی خۆش بوو، وەخت بوو هەموو بمرین لەگەرمان و لەتێنان بەو تەمەنەی لۆ درۆیان دەکەی؟**

**مام کێخوامەحموودی گوندی بێرۆیێ مەشوورە بەقسەی سەیرو سەمەرە، پیاوێکی باش و بەرێز و پۆشتەو پاك و خاوێن بووە هەمووکات ماینێکی هەبووە، زینی دەکرد و قیت و قۆز**

حەجمەرێکی دەبەر پشتێ دەنا، کە دەت دیت دەتگۆت میری هەمموو خۆشناوانە، زۆر خانەدانیش بووە. ڕۆژێکیان بە خۆی و کوڕەکەی کە ناوی حاجی بووە، بارەدار لە کەرێ دەنێن، حاجی منداڵێکی عەجوول بووە بارەکە بەئەنقەست بەلای بابی دادێخی، کێخوا دەڵێت: حاجی خەتای خۆمە ئەگەر لەسەر پشتێ لانکێم ......ی ئەوڕۆ وات ناکرد، حاجی کوڕیشی وەك باوکی پیاوێکی سحەو قسە خۆش بووە.

کورد دەڵێت ناکرێت مرۆڤ بێباوەڕ بێت، توشی ڕەشبینی بێت... لەهەمان کات دەڵێت: بووك لەسەر زینی یا ڕزق و یانسیب، واتە زۆر شت هەیە نزیکە ببێتە موڵکی تۆ، لەوانەیە لە دەستیشت بچێت و نەبێتە موڵکی تۆ .

لەهاوینی ساڵی (١٩٨٧ ) دیارە بەهۆی شەهیدبوونی خەڵکی گوندەکەم ئەوگەنم وجۆیەی لەلایەن خەڵکی چیندرابوو کەس نەبوو وەناوی بینێت، هەموو گەنم و جۆ مابوونەوە بەبێ خاوەن. منیش ئێسترێکم کڕی بوو وام بەباش زانی چەند پارچە جۆیەك بدوورمەوە دەست بەکار بووم، بۆ چەندان ڕۆژ دروینەم تەواو بوو، دواتر جۆخینم دروست کرد بە چەندان ڕۆژ کیشامەوە دواتر پەرەپوشێکی بچووك لەخوار جۆخینێ بوو، ئاگرم تێبەردا و لەبەختی من ڕەشەبا هەڵی کرد، ئاگر گەیشتە جۆخینێ و نەمتوانی بەرگری بکەم تەواوی جۆخین سووتا و لە دیاری دانیشتم، کە تەواو سوتا سواری ئێستر بووم و چوومەوە ماڵەوە، لە ماڵەوە وتیان: بە کێ گەیشتی؟ گوتم گێرەشم کردو جۆخینیشم هەڵگرت !!

کچێك بەبووك دەبەن و سواری ماینی دەکەن، بەرەو ماڵی خەزووری دەکەونە ڕێ دەگەنە ڕووبارێك کەسێك بەخەزووری دەڵێت: بووکێ بگرە با نەکەوێتە ڕووباری، خەزوور وەڵامی کابرادەداتەوە و دەڵێت: ماچم پێ دایە، کەتە ڕووباری بابکەوێتێ، بووك کە گوێی لەو قسە ناخۆشە بوو خۆی گورج دەکاتەوە و یەك ڕێشمە لەماینێ دەدات و وەك شەماری بەرەو ماڵی باوکی دەڕوات و باب وداکی پێی دەڵێن کچم چی ڕوویداوە ؟ کچە مەسەلەکە بۆ باوکی باس دەکات، باوکی دەڵێت: کچم پیشانت دا کچی بابی خۆتی، کارێکی باشت کرد، خەزوور دەگەڕێتەوە هەی داد هەی بێداد من ئەوقسەیەم بۆ خۆشی کرد و سوحبەت بووکردم، بابی کچە دەڵێت قوربان نیوەی سوحبەتی ڕاستیە و لێرە نەتان بینمەوە.

*** *** ***

ئاگاداری گورگیان کردەوە وتیان گورگە بڕیار دەرچوە ببیە شوان، گورگی داماو دڵخۆش نەبوو وتیان بۆ دڵخۆش نیت؟ خۆ کارێکی باشە. وتی: دەزانم کارێکی باشە، بەڵام دەترسێم درۆ بێت، کچێك داخوازی دێن بابی رازی دەبێت بۆ بەیانی دەستەخوشکەکانی سەردانی دەکەن پیرۆزبایی لێ دەکەن، کچە زۆر بەساردی وەڵامی دەستەخوشکەکانی دەداتەوە، ماوەیەکی تر مارەی دەکەن، دووبارە بە ساردی وەڵامان دەداتەوە، دووای ماوەیەکی تر بەربووك دێت و ئامادەی دەکات بەیانی خەریکە سواری ماینێی دەکەن دەستەخوشکەکانی پیرۆزبایی لێ دەکەن و لە پێشوازی بە رێکردنی دان، خانم هەر بە ساردی وەڵامیان دەداتەوە، یەکیان دەڵێت: ئەڵێ خوشکێ پێم نارێی لۆ هەندە بەساردی وەڵامن دەدەیەوە؟ بووك دەڵێت: باوەڕ بکەن تاکو کابرا ناوی خوای لێنەینی باوەڕ ناکەم.... تێگەیشتن؟

*** *** ***

چاکەو پیاوەتی ئەوەی خۆی بە مرۆڤ بزانێت پێویستە چاکە و پیاوەتی بکات، ئەوەی بە خۆی بڵێت پیاو ئەگەر چاکەیەکی لەگەڵ کەسێك کرد ناکرێت هەموو رۆژێ باسی چاکە و پیاوەتی بکات، بە چاویدا بداتەوە، بێتامی بکات، وەك ئەو نموونەی خوارەوە: کابرایەك دوو ئێستری پێنە و دوو سەربەرگ( ساقۆ)شی پێنە، دەگاتە کەسێك بەپێ دەڕوات دوای سەلام و کەلام دەڵێت قوربان فەرموو سواری ئەو ئێسترەی بە، کابراش سوار دەبێت ماوەیەك دەڕۆن باران دەبارێت دەڵێت: کابرا ها ئەو ساقۆیەش لەبەرکە، وردە وردە دەڕۆن کابرای خاوەن ئێستر و ساقۆ ناوەناوە دەڵێت: بەخوای بە هیلاك دەچووی نەت گەیشتبامێ، باش بوو سواری ئێسترێم کردی، ساقۆشم ریێدای کابرا بێتامی دەکات دەگەنە رووبارێکی گەورە،دەڵێت: قوربان تەماشام بکە ساقۆ لە بەردەکات و لەناو رووبارەکە درێژ دەبێت دەڵێتە خاوەن ساقۆ هەر ئەوەندە تەڕ دەبووم وانییە برام؟ دەبڕۆ بەجێشم بێڵە با گورگ بمخۆن باشترە لەو هەموو مننەتەی جەنابت! پەندێك هەیەنازانم مولکی کێیە؟ دەڵێت: ( بەردت پێ بێنن بەکوڵ، باشترە لە مننەتی پیاوی خوێری).

*** *** ***

خوشکان بە چیرۆك پێمان دەڵێن: پیاوەکان ئەوندە دڵپیس مەبن، هەموو ژن خراپ نین، لە خێزانتان بگەڕێن سەردان بکات و لەگەڵ ژنان دانیشێت و پیاوەتی بکات و بتوانێت میوان ئیدارە بدات و ..تاد

کابرایەك زۆر دڵپیسی لە خێزانی خۆی دەکات، هەر جولەیەکی کردبا چاوی تێدەبڕی ژنە محعوتیرا قسە لەگەڵ کەس بکات، زۆرجار بە مێردەکەی خۆی دەگۆت پیاوەکە غەدر دەکەی نەوەندە چاودێری من دەکەی! من ژنێکی باش و پاکم، لێم مەترسێ پیاوەکە ڕۆژێك نیە و دوونیە ستلمی دەکات و ژیانی لێ تاڵ دەکات... ڕۆژکیان ژنە لە ژیانی خۆی بێزار دەبێت و دەڵێت: مێردە دێرینە ئەگەر کاری وا بکەم ئاگاشت لێ نیە کردوومە، پیاوەکە دەڵێت: شتێکت پێ ناکرێ من ئاگام لێنەبی، ژنەکە بەرنامەیەك دادەنێت بۆ تەمبێکردنی مێردەکەی، ڕۆژێکیان لەگەڵ کەسێك ڕێك دەکەوێت و دەڵێت: دووای مەغریب وەرە پشت ماڵی ئێمە، پێك دێن کابراش دەڵێت: بەچاوان ژنە دوای مەغریب ئارد دە تەشتێ دەکات و دەست دەکات بە هەویر شێلان کە دەزانێت ژوانی نزیك بووە، بەتووندی دەڵێتە مێردی خۆی کوڕە پیاوەکە وەرە زووبە میزم لە بنەخۆ کرد، دەستم بە هەویرن دەرپێم لەپێکە! مێردیشی بەپەلە دەرپێی لەپێی خێزانی خۆی کرد و ژنە بەپەلە لە خانوو و سوڕایەوە و کابرای دەسەرەخۆ بەردا... دواتر هاتەوە کە هاتەوە وتی: مێردە هەستت بەچ کرد؟ کابرا دەڵێت: هەست بەچ بکەم؟ ژنە دەڵێت: زۆرم ڕەجا لێ کردی نەوەندە دڵپیس مەبە، لەگەڵم ژیانت لێ تاڵ کردم دە باوەڕ بکە بەخۆت دەرپێت بۆ کابرا لەپێ کرد، کابراشم سوار بوو ئەگەر دەشم کوژی ئەوە من ئامادەم ئەوەشم بەس لەبەر ئەوەی کرد کە بزانی ئەگەرکاری خراپ بکەم جەنابت هەست پێ ناکەی! کابرا وتی: تۆبە خانم من هەڵەبووم، کەوا بوو دڵپیسی لە ژنی باش زۆر زۆر خراپە، دڵپیس مەبن!

*** *** ***

پیاو لەو دنیایە خەم لەسەر هەمووشت هەڵ بگرێت ژیانی لێ تاڵ دەبێت، خۆتان بدەنە دەست قەدەر مام سەیدێك بە خۆی و کوڕەکەی لە کوردستانی باکوور گوند بەگوند بۆ سوننەتکردنی کوڕان گەیشتنە خۆشناوەتی و کوڕانی گوندی شێوەی سەروی سوننەتکردن و کەوتنە ڕێ بەرەو گوندی مەلەکان لەناو دەرەشێر شاخێکی بەرز و ڕێگایەکی سەختە، مام سەید ماندوو دەبێت و دادەنیشێت بەخۆی و کوڕەکەی پشوویەك بدەن پارچە شاخێك هاتوو وتی: مام سەید نەڕۆی هاتم، مام سەیدی کوشت و کوڕەکەشی سەلامەت دەرچوو.

**ڕووداو**

ژن و پیاوێك دەبن، ڕۆژێکیان قسە بەقسە پیاوەکە دەڵێت: من کاراترم لە تۆ، ژنە دەڵێت: نەخێر ئەوەی بەمن دەکرێت بەسەد پیاویش ناکرێت کابرا دەڵێت بەڵگەت چییە بۆ ئەوقسەیە؟

دەڵێت: دەتوانم بە ڕۆژێك ماڵێك وێران بكەم وەدەش توانم هەمان ڕۆژ ئاوەدانی بكەمەوە، پیاوەكە هەستە بابڕۆین بچینە بازاڕی دەچنە بازاڕی و ژنەكە دەڵێت ئەتو بەس سەیركەو زەینی خۆ بدێ و قسان مەكە، كابرا دەڵێت: بەسەرچاو گەورەم دەچنە لای بازرگانێك ژنە بەبازرگان دەڵێت: قوربان چ قوماش لەهەمان گرانترە جوانترە بۆم ببڕە كوڕەكەم حەز لەژنێك دەكات بە هەدیە بۆی دەبەم، لە بەرخاتری كوڕەكەم بازرگان دەڵێت: بەچاوان بۆی دەبڕی و دەڕۆن پرسیار بەپرسیار ماڵی بازرگان دەبینیتەوە، دەڵێتە مێردەكەی جەنابت لێرە ڕاوەستە ئێستا دێمەوە ژنە لە دەرگای ماڵی بازرگان دەدات دەڵێت: ئەمەوێت دەست بەئاوبگەینم ئەوانیش دەڵێن: كەرەم كە، ژنە دەچێتە ژوورێ و خۆی خەریك دەكات و قوماشەكە لە شوێنێك دادەنێت دەڕوات زۆری پێناچی. بازرگان دێتەوە ماڵەوە سەیر دەكات پارچە قوماشەكە لە ماڵی ئەوانە (مەلا كەرت گایە لە گوینە!) پەلاماری خێزانی خۆی دەدات و هەموو گیانی ورد دەكات، دەڵێت: ئەتو حەزلێكردنێ دەكەی و ژنە دەڕوات و ماڵ بەجێ دێڵێت ژنەش بەخۆی و مێردی لە دوورەوە سەیری ئەوبەزمە دەكەن، ژنە دەڵێتە مێردی مێردە ئەوە ئەو ماڵەم وێران كرد وایە؟ دەڵێت: بەڵێ وایە، ژنە دەڵێت: ئێستا دەچم ئەو ماڵە ئاوەدان دەكەمەوە دەچێت لە دەرگای ماڵی بازرگان دەدات، بازرگان وتی فەرموو خۆشكم چت دەوێت دەڵێت: من بەئیش هاتمە ماڵتان، پارچە قوماشێكم لە جەنابت كڕی بوو لێرەم لێ بەجێمایە، بازرگان قوماشی دەداتەوە و بەغار دەچێت داوای لێبووردن لە خانمی خۆی دەكات و دەی هێنێتەوە ماڵەوە، ژنە دەچێتەوە لای مێردی دەڵێت: مێردە دیتت چ بەزمێكم دروست كرد؟ ئەوە بەپیاوان دەكرێت ؟ كابرا دەڵێت: نەخێر قوربان! ئێوەی ژن كاراترن لە پیاوان ئەو كارانەی بەژن دەكرێن پیاو هەستیشی پێ ناكات، پاڵپشت بۆ ئەو چیرۆكانە كە توانای ژنان دەردەخات لە ململانێی گەلان و لەبەشی هەواڵگری، هەرشتێكی مەحاڵ بێت كە بەپیاوان نەكرێت، ژنان دێنە ناو ئەوگەمەیە كارەكان بەسەركەوتووی ئەنجامی دەدەن ئەوەندە شارەزان لەداوداناندوە كابرا هەرچەندی مەشقی پێ كرابێت بە هەرچوار پەلی بە داوێ وەدەبێ و هەستیش پێ ناكات وەك دەزگای مۆسادی ئیسرائیلی زۆر زیرەكانە لە خزمەتی مانەوەیان ژنان داوێنە ناو ئەوگەمەیە.

*** *** *** ***

كابرایەك دەچێتە گوندی هەرتەل بۆ سەردانی برادەرێكی دوای سەلام و كەلام، ئێوارە ماڵەبرادەری نیسك دێننەبەردەمی كابرا دەست دەكات بەنیسك خواردن، نیسك زۆر زۆر سوێر

نعێت کابرای میوان هەرچۆنێکی بووە لەبرسان تۆزێکی لێ دەخوات بەیانی دەڕوات لەسەر زینی هەرتەلێ بە خەیاڵی دادێت دەڵێت: واباشە من بچمەوە ئەومالە بڵێم نیسک و زۆر سوێر بوو، نعمزانی زۆر سوێرە، بەڵام دەنگم نەکرد، نەوەك بەگەرم بزانن بەڵێ، دەگەڕێتەوە هەرتەل دەڵێت: خوشکێ نیسکێ دوونێ هیوارێ زۆر سوێر بوو، بەڵام دەنگم نەکرد دوو بارە خواحافیز!.

*** *** ***

لەشوێنێکی تریش ئاماژەم پێ کردووە هەر ڕستەیەك کە هەیە چیرۆکێکی لەپشتە، (ڕیسیم نیبووە خوری) ئەوەی خوارەوە چیرۆکەکەیتی دایکێك و کچێك هەبوون کچەکە زۆرتەمبەڵ بوو بەتەمەنیش داچووبوو، دایك حەزی دەکرد بە شووی بدات ڕۆژێکیان بیری کردەوە، فێلێکی دیتەوە ڕۆژانە دەیان جار بانگی کچەی دەکرد.

بەشەوێ شەش باتمان

بە ڕۆژێ نۆ باتمان

پیاوێك لێی پرسی ئەو باتمانە چییە؟ وتی: کچەکەم زۆر ئازایە بە شەو شەش باتمان خوری دەڕێسێت، بە ڕۆژ نۆباتمان دەڕێسێت کابرادەڵێت: بۆ ئەوکچە نادەیە من ڕێك دەکەون دەی گوازێتەوە، ڕێژەیەکی زۆر خوری دەکڕێت دوای چەند ڕۆژێك کچە دەچێتە لای دایکی دەڵێت: دایە ئەتۆ منت توشی چی کرد؟ دایك دەڵێت کیژم خەمت نەبێت بەیانی بەکابرا بڵێ بچێتە سمتەکان، سمتەك کەرستەی مافوور دروست کردنە. کابرا بەیانی بەخۆی و بیور و تەبشوو دەچێتە چیای، دایکی کچە بە دوای دادەچێت، کابرادەست بەکار دەبێت دایکی کچە خۆی حەشار دەدات و بانگی دەکات و دەڵێت:

هۆهۆ هۆ کابرای لە سمتەکان

ئەگەر سمتان ببڕی ژنت دەمری

ئەگەر سمتەکان نەبڕی

ریست لێ دەبێتەوە خوری

دایکی کچە چەند جار ئەو رستەیە دووبارە دەکاتەوە، کابرا واز لە سمتەکان دێنێ، دەگەڕێتەوە ماڵەوە ژنی دەڵێت: کواسمتەکت هێنان؟ کابرا دەڵێت: ژنێ وازیینە لەغەیبەوە پێیان گوتم: سمتەکان ببڕی ژنت دەمری، ئەگەر نەبڕی ڕیست لێ دەبێتەوە، خوری هەزار ڕیس بەقوربانی تۆ بێت! کچە کە نەجاتی بوو مێردی خۆشی کرد.

**ئەوەیە کورد دەڵێت: دایکی عەیارە و لەهەزار ئاوی داوە لاقی تەڕنەبووینە، واتە زۆر زۆرزانە، کورد زۆر بەسەرهاتی خوشکان باس دەکات بە باش و خراپ.**

*** *** ***

**دیارە لەمێژە مەلایان کەمتر باوەڕیان بەشێخ و دەروێشان هەبووە، ئەگەر بیانەوێت دەری بپەن وە فەقێش تۆزێك بەبرو بلعاتن. مامۆستایەك و چەند فەقێیەك بەرە و دەشتی کۆیە دەڕۆن وەختی جۆخینانە بەمەبەستی زەکات کۆکردنەوە کەرێکی مێچکۆرەشیان وەر گرتووە بە مەبەستی گەنم کۆکردنەوە لەسەر جۆخینان لەڕێگا توشی دەروێشێك دەبن، مام دەرویشیش بۆ هەمان مەبەست هاتووە ردێنێکی بەرداوە و دەفێکیشی پێیە دەبنە هاوڕێ، لە شوێنێك دادەنیشن بەمەبەستی نانخواردن، کاکی دەروێش نان ناخوات مامۆستا و فەقێکان، داوای نان خواردنی لێ دەکەن نان ناخوا، دەڵێت: شێخم پێی گوتیمە تا بە کارێك تارەقەنەکەی نان نەخۆی زۆرداوای لێ دەکەن، نان ناخوا، دواتر دەڕۆن وردە وردە دەروێش لە برسان لەپەلوپۆ دەکەوێت. فەقێکان دەڵێن: مامۆستا رێمان پێ بدە بەزمێك دروست بکەین، مامۆستاش بەڵێن دەدات، فەقێکان بانگی دەروێش دەکەن دەڵێن: وەرە دەروێش کارێك بۆ ئێمە بکە بەکرێ و پارەت دەدەینێ و تۆش نان بەپارە لە ئێمە بکڕە. دەروێش دەڵێت: باشە. فەقێکان دەڵێن: دینارێکت دەدەینێ بڕۆ بۆ ئێمە خەریکی ئەو ماکەرەبە، دەروێش دەڵێت: ئاخر کو دەبێت فەقێکان دەڵێن: ئەی ئێمە مەلا نین. دەبێ ئەتو بەکرێ ئەو کارە بکەی بڕۆ بیکە، دەروێش پەلاماری ماکەرێ دەدات و دواتر دیناری خۆ وەر دەگرێت و دەی داتەوە فەقێیان بەنان، ئەوجا نان دەخوات ؟**

*** *** ***

**مەلا ئەحمەدینی بابی مەلا ئیبراهیمی بێراوە بەسەردان دەچێتە گوندی مەلەکان کەسێکش لەگەڵ خۆی دەبات ئەوکەسە چەکدار بووە واتە چەکی پێ بووە، وردە وردە دەڕۆن لەناو دەرەشیر. کابرای چەکدار چەك سوار دەکات و ئەیەوێت کەوێك بکوژێت، دواتر کەوەکە دەفرێت کابرا فیشەك لەبەر چەکی دەرنایەنێت و وردە وردە دەڕۆن پێش بەسەر دەرەشیر بکەون، کەسێك لە گەروی دەرەشیرێ دەردەکەوێت بەناوی ئەحمەدی سەنگەران ) مەلائەحمەدین دەڵێتە کابرای چەکدار ئەوچەکەم بدێ، ئەوە برادەری خۆمە دەی ترسێنم مەلا ڕووی چەکی تێ دەکاو سێرەی لێ دەگرێت و دەڵێت: کابرا دەستان هەرینە، ڕمبژنی چەك و بەربوونەوەی کابرا یەك دەبێت.**

مەلاچەك فڕێ دەدات وغاردە دات، سەیر دەكات كابرا مردووە مەلا زۆر دەگریێ و خۆی و كابرا سەركۆنە دەكات تازە بە چاچی، دواتر مەیتی كابرا دەبەنەوە.

*** *** ***

(بانێكەو دوو هەوایە)

دەگێڕنەوە دوو بنەماڵە ژنبەژنی دەكەن ڕۆژێكیان زاوا بەخۆی و خێزانی دەچێتە ماڵی خەزووری وەختی نووستن لەسەربانی بەچلەی هاوین بووك و كوڕ لەلای یەك دەنون، لەولاتر زاواو كیژ پێكەوە دەنون، خەسوو بەسەریان دادەگەڕێت، لێفە لەسەر كوڕ و بووك لادەبات و دەڵێت: كوڕم هاوینە گەرمە ئەولێفەچیە بەخۆو دادایە، مەبەستی ئەوەبووە كوڕو بووك لەئامێزی یكتر نەنون، بۆلای زاواو كچەكەی دەچێت لێفیان پێدادەتەوە و دەڵێت: كچم بەو سەرمایە بۆیەخۆدانادەن، كوڕەكە ئاگای لەداكی بوو، چی كرد وتی: دایە بانێكە و دوو هەوایە !

*** *** ***

ئەوجا بابێینەوە سەر باسی دەست پێكردنی شۆڕش و بەرخودان،پێشتر باسی ململانێی نێوان منداڵانی ئەمبێزم كرد بەتایبەتی بەرەی میرمەحمەری و میرووسی، نموونەی بنەماڵەی مەحموود بەگی بێراوەی میرووسی و میانی خدربەگی بالیسانی میرووسی، كێشەیان بەردەوام هەبووە، گوندی بێراوە منداڵ و نەوەی هەردوو لایان لێ دانیشتوون كە هەردووكیان میرووسین، نووسەری خۆشناو و خۆشناوەتی خۆی بە دوور دەگرێت لە ناساندنی بنەماڵەی مەحموود بەگ، دیارە لەبیری چوینە یان هۆیەكی تر هەبووە، ئەوەیان نازانم مەحموود بەگ كوڕێكی دەنێرێتە گوندی شیوە، ئەوانیش تەهابەگ دەنێرن بۆگوندی شیوە، كێشەو ململانیان زۆر دەبێت لەوكات مەخفەری پۆلیس لەبالیسان هەبووە، تەهابەگ دەست ڕۆیشتووتربووە لە ساڵح بەگ لەناو حكوومەت، ڕۆژێكیان پێش ئەوەی شەعب شەعبانێ دروست بێت لە سەر قسەی تەهابەگ مەفرەزەیەكی پۆلیس دەچنە گوندی شیوە، ساڵح بەگ دەگرن لەگەڵ كوڕەكەی بەناوی (مەمۆ ) لەئەصل ناوی ڕەشید بووە، براكانی ساڵح بەگ و خزمەكانی دەزانن ساڵح و كوڕی گیراون لەنێوان گوندی بێراوەو شیوە كەمینێك دادەنێنەوە و ساڵح و مەمۆ لەپۆلیسان دەستێنەوە، بەرەو چیا دەچنە ساوسێوۆكان، كە بنەماڵەی شێخی سەرانی لێ نشتەجێ بوون، هێزێكی گەورەی پۆلیس دەچێت بەدوایاندا لەبالیسان بۆ شیوە وناوێرن بەدوایاندا بچێن هەرچەند تەهابەگ هانیان دەدات ئەوهێزە دەگەڕێتەوە وازیان لێ دێنن.دوای ماوەیەك كوڕانی مەحموود بەگ ڕۆژێك دێنەوە بێراوە وە ئێوارە دەگەڕێنەوە

بۆ شیە بۆئەوەی خەڵك بزانێت ئەوان ڕۆیشتوون، دواتر دەگەڕێنەوەو دەچنەوە ماڵەکانیان، دیارە زاندراوە کە گەڕاونەتەوە ماڵەوە هێزێکی زۆری پۆلیس دێت دەورەی ماڵەکانیان دەگرێت بۆ بەیانی هەر زوو جەلال بەگ دەگرن ئەو کاتەی بۆ نوێژی بەیانی دەچێتە مزگەوت حاجی بەگ هەست بەو هێزە دەکات خۆی دەشارێتەوە،کە ڕۆژ هەڵدێت مەلای گوندی دەنێرنە لای ساڵح بەگ خۆی بدات بەدەستەوە، ئەگەر وانەکات منداڵەکانیشی دەفەوتێن ساڵح لەگەڵ مەمۆی کوڕی خۆیان دەدەنە دەست پۆلس، ئەوسێ کەسەیان دەستگیر دەکەن، ئەوانی تر رادەکەن ئەوە لە خۆشناوەتی سەرەتای ململانێی یاخی بوون بوو دژ بەحکومەت، کە شەعب شەعبانێ دروست بوو منداڵەکانی مەحمود بەگی گوندی بێراوە بوونە بەشێك لەلایەنگری شەعب شەعبانێ، ئەوسێ کەسەشیان کە دەستگیر دەکرێن ڕەوانەی بەندیخانەی هەولێر دەکرێن،کەسێکیش لەوێ بەند بووە. بەناوی زێرۆ بارزانی بەرنامەیەکیان لێ ئاشکرادەبێت، کە نیازیان هەبووە بەندیخانەی هەولێر بشکێنن ڕەوانەی (نوگرەسەلامانیان دەکەن، بۆ ماوەی هەژدە مانگ خزمەکانیان بەرەو بەرەی گەێ دەچن دژبە ئاغاکان ئەو ڕووداوەی باسم کرد سەرەتای یاخیبوون بووە، لەناوچەکەمان جگە لە چەتەکان، ڕاپەرینی یەکەم لە ناوچەکەمان لەقۆناغی دەرەبەگایەتی لە پێشتریش ئاماژەم پێ کردوە، ئاغەکان کەسێکیان دەکردە کێخوا کە دەست ڕۆیشتوو بایە ئەوکەسە دەبووایە لە بەرەبابێکی گەورەبایە، بۆئەوەی بتوانێت بالآدەست بێت لەگوندەکەی، ئەکرێت بڵێین لەپێش شۆڕشی ئەیلوول کێشەی نێوان جووتیارانی دەشتی هەولێر لەگەڵ دەرەبەگەکان کاریگەری لە خۆشناوەتی هەبووە، بەڵام زۆر بەزەقی نەبووە، چونکە ناوچەی ئێمە کەمتر شیوعی لێ هەبووینە. زیاتر پارتی کاریگەری هەبووە، سەردەمێك لە بالیسان جوڵەجوڵەك هەبووە دژ بەئاغایان، ڕۆژانە گەنج ومناڵ بەناو بالیساندا سوڕاینەوە دژ بە ئاغاکان وتویانە: با بژی با بژی میللەت، بڕوخێ ئیستعمار، لەو جۆرە قسانە و بەندو بەلۆرەش بەئاغاکان هەڵبەستراوە، لە خۆشناوەتی شۆڕشی کێخوایان، یان ڕاپەرینی کێخوایان دەستی پێ کردووە بەقەوم قەومانێ مەشوور بووە، یان شەعب شەعبانێ لەژێر کاریگەری ئاغاکان، دیارە جووتیارەکان شۆڕشیان کردووە دژ بە بەرژەوەندی خۆیان، ئاغاکان جووتیارانیان هان دەدا دژی حکومەت، جووتیاران بێخەبەر بووینە، کە حکومەت بەسەرۆکایەتی (عەبدولکەریم قاسم ) بەنیازی چاکسازی ژیانی جووتیاران بووە، واتە جووتیارانی خۆشناوەتی دژی بەرژەوەندی خۆیان دژ بە حکومەت ڕاپەرین، لە ساڵی ١٩٥٨بەرەو ساڵی (١٩٦٠) بۆشاییەکی سیاسیش هەبووە، پارتی ئەوکات دەست پێشخەرنەبووە. لە

خۆشناوەتی پێش ئەوەی پارتی شۆڕش رابگەیەنێت لە ناوچەکەمان بەناوی شەعب شەعبانێ ـسراوە، هەر کێخوایەك خزمەکانی خۆی چەکدار کردوە و لە ئامادەباشیدا بووە دژی حکومەتی ـمەرکەزی، بە هاندانی ئاغاکان.

راپەرینی دووەم: خەڵکی و بەشێك لەئاغاکان تێکەڵی شۆڕشدەبن، لە خۆشناوەتی بەکوشتنی ـسەدیق بەگ) شۆڕشەکە چووە قۆناخێکی تر، پەیدابوونی مەحموود کاوانی و مەلا ماتۆڕ و خەڵکێکی تر، ناوچەی ئێمە و دەورو بەریش بەرەو پیری شۆڕش چوون، وەك:

١ – شێخۆی دەراشی

٢ -حاجی برایم دەراشی

٣ – جەفعەر دەراشی

٤ – رەحمان مەلاساڵح

٥ –حاجی بۆررەزارێ

٦ - حەوێز کانی بەردی

٧ - حەسەن کانی بەردی

٨ – ئەسەعد کانی بەردی

٩ -کێخوا حەسەن زێوەیی

١٠ – کێخوا ڕەسووڵ بێتواتەیی

١١ -کێخوا ڕەفیقی سەردۆری

١٢ –ئەنوەربەگ بێتواتەیی

١٣ –حسێن سوێرەیی

١٤ –سولێمان سویرەیی

١٥ –کێخواتاهیر مێرگەسەری

١٦ - خالید مستەفا

١٧ –تەها حەمەد ڕەسوول

١٨ – حەمەد بەگی وەرێ

١٩ –کەمال بەگی وەرێ

٢٠ –ساڵح بەگ شەقلاوەیی

٢١ –مەحموود مەولوود خۆرانی

٢٢ – مام ونس بالیسانی

٢٣ –حاجی عەلی بالیسانی

٢٤ - حەمەدی مەلای بالیسانێ

٢٥ –حەسەن تۆفیق بەگی بالیسانێ

٢٦ –حاجی حەسەن توتمەیی ناسراو بە: حەسەنەکۆر

٢٧ –حاجی ئسماعیل توتمەیی

٢٨ –کەریم قادر عەولا خەتەیی

٢٩ –مستەفا حەمەد مەحموود خەتەیی

٣٠ – مستەفا عالی قادر خەتەیی

٣١ –سعیدبابکر شێخە خەتەیی

٣٢ – حاجی خدر برایم خەتەیی

٣٣ – کەمال مامەجەلکەیی

٣٤ – حاجی حەمەد میرۆستەمەیی

٣٥- عەزیز دەربەندی

٣٦- سمایل ئاقوبانی

٣٧-عەزیز شێخەی ئاقوبانی

٣٨-سامی رەشید بەگی بێتواتەیی

٣٩- مەلاقادر بێتواتەیی

٤٠- شێم حەمەدی چیوەیی
٤١-مەلا عەمەری شێخ مەموودی
٤٢- فەتاح مامەجەلکەیی
٤٣-وەسمان حوجرانەیی
٤٤-حەمەدەمین گەرەوەیی، سەر بە شەقڵاوە
٤٥-سابیر نووری میرۆستەمەیی
٤٦-مام وسو کاوانی
٤٧-حەمید کاوانی
٤٨ حاجی حەسەن مەلەکی
٤٩-رەحمان شێخ وەسانی
٥٠ رەسوول شێخ وەسانی
٥١ حەمەدەمین ئسماعیل شێخ وەسانی
٥٢-وسو ئیسماعیل شێخ وەسانی.ــــ یەکەم شەهیدی ناوچەکەمانە
٥٣-حەمەدومین دۆشاو شێخ وەسانی
٥٤- سالح حسێن شێخ وەسانی
٥٥- محەمەد سلێمان شێخ وەسانی
٥٦-حەمەدەمین خدر شیخ وەسانی
٥٧ عومەر حەسەن شێخ وەسانی
٥٨ – عەولاسۆر شێخ وەسانی
٥٩ –مام سادق شێخ وەسانی
٦٠- سمایل مەلەکی
٦١- عەلی جاجی محیەدینی سیساوەیی
٦٢ – عەولای عەزیزی سیساوەیی
٦٣- فاخیربەگی ئاری سیەکی
٦٤- مستەفا سیساوەیی

ئەو ناوانەی من ئاماژەم پێدا، ئەکرێت زۆرتربن لە سەرەتای شۆڕش، داوای لێ بووردن دەکەم لە هەر هەڵەیەك، دیارە زۆر زۆریتریش لەلای دوای شەڕی گەروی میاوە و دەوروبەری هێرشی رژێم بۆ دەوروبەری شەقڵاوە، ئەو هێزەی پێشمەرگە دەبنە دوو بەش بەشێك بلاوەی لێ دەکەن و بەشێك بەرەو بالیسان پاشەکشەدەکەن، هاتنی ئەو بەشەی بەرەو بالیسان دێت، ئاغاکانی بالیسان چەك دەکەن بریارەکەشیان ئەوە بووە، یان لەگەڵ ئێمە یان چەکەکەت بۆ ئێمە. دوای ئەو چەك کردنە ئەو هێزە بەرەو گوندی سەرکەپکان دەڕۆن بۆ لای ماڵی عەباساغا، لە رێی گوندی مەلەکان درواى ماوەیەك لە وێ ئەو هێزە دێتە بێتواتە و ماڵی ئەنوەربەگ ئیدارەیان دەدەن و خۆیان رێك دەخەنەوە، دیارە ئەنوەر بەگی بێتواتە لەو قۆناخە دەوری بەرچاوی دەبێت کاریگەری لەسەرتای شۆڕش بەرچاو بووە .

لەوماوەیە هەردوو بنەماڵەی میوسی و میر مەحمەدی لەگەڵ خەلکی دەوروبەر وەك کێخو حەسەنی شێخ وەسانان چەك لە رژێم وەر دەگرن و رەبایە لە دەوروبەری یالیسان دروست دەکەن. هێزی پێشمەرگەش بەرنامەیك دادەنێن کەوا بالیسان ئازاد بکەن، هیزیکی پێشمەرگە

سەرکردایەتی مەحموود کاوانی و ملاماتۆر ، خۆیان نزیک دەکەنەوە لەبالیسان و هەولدەدەن ئەمردوست نەبێت و خۆیان بدەنەدەست ئەوهەولە سەرناگرێت هەندێک خەلکی بیراوە و شێخ وەسانان دینەبالیسان بەمەبەستی بەرگری لە جاشەکانی بالیسان هێزی پێشمەرگە پەلاماری باتیسان دەدەن بە سەرپەرشتی مەحموود کاوانی و مەلاماتۆر شەڕەکە گەرم دەبێت لە گەرەکی مەیسیان لەو شەڕەدا زوو ژنێك ئاو بۆ جاشەکان دەبات و دەکوژرێت بە ناوی (فاتیمە ئەحمەد)، دواتر هێزی جاشەکانی میرووسی شکست دێنن بەرەو قەلاتی ئاغاکانی میر مەحمەری دێن،لە وێش پێشمەرگەکان دەوریان دەگرن بەتایبەتی سالح شێوەیی دەوری بەرچاوی دەبێت لەو شەڕە چوارکەس دەکوژرێن دوویان ئاغە و دوویان کرمانج، وەك حەمەد بەگ و یەحیابەگ، ئەحمەد حاجی بێراوەیی وقادر ناسراو بەقادری هەدلێ بالیسانی، دوای شەهیدکردنی سالح، شەو بەسەردادێت چەکدارەکان ڕادەکەن بەهیمەتی کێخواحەسەن شێخ وەسانی ڕزگاریان دەبێت و بەرە و چیای ڕەش واتە: چیای هەورێ دەڕۆن. هێزی پێشمەرگە خانووەکان دەسوتێنن، کۆمەلێك لە ئاغاکان دەستگیر دەکرێن کە بەشێکیان بەسالاداچوبوون وەك کەریم بەگ، حەمەد بەگی سۆر، کەمال بەگ و چەند کەسێکی تر، بۆ بەیانیەکەی چەند پیاوماقوولێك دەچنە لای مەلا ماتۆر و مەحموود کاوانی وەك: مامۆستا مەلا شێخ ئەحمەد بالیسان و حاجی حسێن و شێخ نەجمەدین و مەلاشێخ عەلی، داوا دەکەن ئەو ئاغیانە ئازاد بکەن مەحموود کاوانی وەك ڕێزێك بۆ ئەو بەرێزانە ئاغاکان ئازاد دەکەن، هەرهەمان پێشمەرگە دەچنە گوندی دەراش خانووی ئاغاکان ئاگر دەدەن مەحموودکاوانی مال و مندالی ئاغەکانی دەراش دێنیتە لای مالی کەریم بەگ لە بالیسان، چاودێرییان دەکات، بۆ ئەوەی کەس سوکایاتی بەمال و مندالیان نەکات، دواتر ئازاد دەکرێن، دیارە لەو شەڕە ڕژێم بە تەیارە گوندەکانی دەوروبەری بالیسان بۆردمان دەکات.

لە ئیدارەنەدانی دەرەبەگەکان نابوا هێزی پێشمەرگە بەو شێوەیە ڕفتاریان نواندبا، ئاغاکانیان پێشتر چەك کردبا، ئەنوەربەگی بێتواتە لە سەرەتای شۆڕش لە بەرەی گەل دابوو، دەوری باشیشی هەبوو، بۆ پشتی لەگەل کرد؟ دیارە هۆکار هەبوون بێ هۆنەبووە، من بەرگری لە بنەمالەی ئەنوەربەگ ناکەم، بەلام ڕاستیش ڕاستییە؟ ئەنوەربەگ لە مفاوەزات لە بێتواتە دەژیا.

پیاوێك کەنموونەی پیاوەتی و جوامێری بوو لەخۆشناوەتی، پیاوێکی شۆڕشگێڕ و ڕاستگۆ و مەردو و ئازابوو، ئەویش کێخوا هەمزەی شێخ وەسانان بوو، ئەوپیاوە مەشوورەلە خۆشناوەتی،

هەموو سیفەتێکی پیاوانەی تێدا بوو، زۆربرادەر بووین، منی زۆرخۆش دەویا، رۆژێکیان لەسەر توندرەوی کادیرانی پارتی ئەو چیرۆکەی بۆ گێرامەوە وتی:

لەساڵەکانی دوای مفاوەزات هەندێك ئیشم هەبوو لەلای (عەلی شەعبان) چومە لای و کارەکانم جێبەجێ کردن، ئەو رۆژە جومعەبوو وتم کاك عەلی من دەچمە جومعە عەلی شەعبان وتی: باشە بۆ نانخواردن وەرەوە لای خۆم، وتم نا چاوەرێی من مەکە، سەرێك لە ئەنوەربەگ دەدەم نانیش لەلای ئەو دەخۆم، عەلی شەعبان نە وتی برۆ لای نە وتی مەرۆ لای! خواحافیزیم کردوو بەرەو مزگەوت چووم، چاوم گێران ئەنوەربەگ لە مزگەوت نەبوو، دوای ئەوەی خوتبە تەواو بوو. زۆرکەس وتی میوانم بە، وتم: میوانی کەستان نابم دەچمە لای ئەنوەر بەگ، کە ناوی ئەنوەربەگم دینا خەڵك دەترسان..بەرەو ماڵی ئەنوەر بەگ چووم لە دەرگامداو ئەنوەربەگ بەپیرمەوە هات. کە چاوی بەمن کەوت گریان قورگی گرت بوو، ئەو گریا و منیش گریام، چوینە ژووری دانیشتین و نان هات و نانمان خوارد، دواتر کەوتینە گلەیی لەیەکتر، وتی: هەمزە کو وێرای بێیە لام؟ دۆست وبرادەرم ناوێرن سەردانم بکەن، وتم: ئەنوەربەگ شێخ وەسانی زۆر لەعەلی شەعبان ناترسن! وتی: هەمزە ئاگام لەوەیە، دواتر وتم ئەنوەربەگ جوان ناوەستێ لۆ جەنابت جومعان ناکەی؟ ئەتو پیاوێکی دیاری؟ وتی: هەمزە واز بینە، وەزعم باش نیە. وتم بۆ چی بووە؟ چ رووی داوە؟ وتی: لێی گەرێی باشترە، وتم: قسەم بۆنەکەی جارێکی تر من لەلای خۆت نابینیەوە، وتی: وازم لێنایینی. وتم نەخێر. وتی کێخوا هەمزە عەلی شەعبان بەردەوام چاودێریم دەکات و ئیهانەم دەکات. خەڵکی لەبەر عەلی شەعبان ناوێرن سەردانم بکەن، وەك دەست بەسەرێك وام، ناوەناوە خەبەر دەنێریت ژنەکانتان بنێرن گەنم پاك بکەنەوە، دەوەرە هەمزە تۆ لەشوێنی من بی کو دەچیە جومعەی کو چاوت لەبەرانبەر خەڵکی هەڵدێن عەلی شەعبان لە سنوور بەدەر ململانێی ئەنوەبەگ دەکات، زۆر بەزیرەکانە سەرەتا توانی زۆربەی بنەماڵە گەورەکانی خۆشناوەتی لەرێی کێخواو مەلا و شێخەکان بەرەو لای خۆی راکێشێ تەنها نەیتوانی کاریگەری لەسەر خەڵکی شێخ وەسانان هەبێت، توانی دەستێکی کەمیش باویتە ناو شێخ وەسانان، دیارە ئەو کاریگەریان نەبوو، وەك بنەماڵەی خزمانی لەیلێ وەنابووا خەڵکی خۆشناوەتی، پشت لە ئەنوەربەگ بکەن بەو شێوەیە من بۆ راستی قسەی کێخوا هەمزە بەدواداچونم کرد، ئەوکەسەی عەلی شەعبان دەینێریت کە خێزانی ئەنوەر بگ بچێت گەنم بۆ عەلی شەعبان خاوێن کاتەوە ناوی ( حسین حەمەد شێخە )ی شکارتەی بووە .. کێخواکانی خۆشناوەتی و شێخ و مامۆستایانی ئایینی هۆکار بووینە

ۆ رەزیلکردنی سەرکردەیەکی وەك ئەنوەربەگ.ئەوە ناکەمە پاساوی هەڵەکانی ئەنوەر بەگ، نەخێر ئەنوەر بەگیش توشی هەڵەی گەورەبوو، چاکەشیان هەبووە، خراپەشیان هەبووە. مەبەستم لە گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتە باسکردنی ئاماژەی کادیرانی شۆڕش بەو شێوەیە هەڵسوکەوتیان کردووە.

راستە دەرەبەگەکان کاری زۆر نابەجێیان بەرانبەر گەل و وڵات کرد، کە لەمێژووی گەلان نەگمەنە، بەڵام دەبووایە ئەوەندە توندیان لەگەڵ نەکرابا، کە بەقازانجی دووژمن تەواو بوو، من مەبەستم ئەوەنییە بەرگری لە ئاغان بکەم، بەڵام ڕاستی راستییە و دەبووایە ئێمە رێز لە ئاغاکان بنێین، لەقۆناغێکی وا هەستیار و ناسك چاومان لەتۆڵەکردنەوە قوچاندبا، چونکە ئەوان بەچەندان سەدە میر بووینە و ناکرێت بە ڕۆژێك و دوو هەمووشتێك لەدەست بدات، لەکاتێدا ئەوان خاوەن هێز و سامان بوون، ئەکرا لە قۆناغی رزگاری دەوری بەرچاویان هەبایە و ئەدوژمانیش دادەبڕان بەداخەوە شۆڕشی ئەیلوول لە ژێرکاریگەری کۆمەنیستەکان پێکهاتەی خەڵکی کوردستانیان واشێواند ڕێکخستنەوەی چەندان ساڵی تری دەوێت، کە بەزەرەری گەلەکەمان تەوابوو، بەشێك لەوان تاوانیان کردووە ئێمەش تاوانیان لەگەڵ بکەین چ جیاوازی دەبێت لەنێوان بیرکردنەوەی ئەوان و ئێمە؟ هیچ! کەوابوو وەك یەك بیرمان کردیتەوە بە قازانجی دووژمن تەواو بوو، چونکە دڵی کوردستانی باشوور خۆشناوەتییە، یەکەم هەنگاویان وێرانکردنی ئەودڵە بوو، بە کوشتنی میرانی سدیق بەگ، کوشتنی سدیق بەگ تا ئێستاش پاساوی نییە، کە لەبەرژەوەندیی گەلەکەمان کوژرابێت، هەندێك راستی هەیە گوتنی تاڵە و پیاو ناکرێت باسی نەکات. جیاوازی تاوانەکانی جەلالیەکان و ماڵی ئەنوەربەگ چ جیاوازی هەیە؟ جیاوازی (٣١ ) ئاب بەراوردکە لەگەڵ ئەوان .

یان ئیسلامیەکان و دەوری ئێران لە شەهیدکردنی پێشمەرگە، دیارە زۆرمان ئەوەمان لەلا رونە لە یاسا دەقێك هەیە کەس بەتەنیا تاوانبار نییە، بەڵکوو دەسەڵات و کۆمەڵگا و دەوروبەریش لەو تاوانەی شەریکە. من نامەوێ ئەو دەقە شی بکەمەوە خۆتان شی بکەنەوە، واتە: لەخراپەکانی عەلی شەعبانیش و ئەنوەربەگیش ئێمەی خۆشناوەتی بەشدار بووینە، نموونە دیارە لاریمان نییە لەهەر کۆمەڵگەیەك کەسی چاك وخراپی تیدایە .

چەند کەسێکی بارزانی هەندێك کاری زۆر نابەجێیان لە ناوچەکەمان ئەنجامدا، باسی کارەکان ناکەین لەبەر چەند هۆیەك رەحمان شێخ وەسانی لەگەڵ چەندکەسێکی مەرد وئازا

**کەوتنە کۆکردنەوەی ئیمزا سەردانی زۆربەی کێخوا و مەلا و شێخانی ناوچەکەیان کرد. هەموویان لەسەر ئەوکارە ناڕەوایانەی بارزانیەکان ئیمزایان کرد و بەڵێنیان بە ڕەحمان شێخوەسانیدا ئەوپەڕی هاوکاری ڕەحمان بکەن و پشتوپەنای ڕەحمان شێخ وەسانی بن. بەڵێ ئیمزایان کۆکردنەوە .. عەلی شەعبان کۆکردنەوەی ئیمزاکانی زانی و ناوی یەك بەیەکی ئەوانەی ئیمزایان کردبوو ناردنی بەدوایان دا و لە نووسراوێك دا بۆ سەرۆك بارزانی دووبارە ئیمزایان کرد کەوا ئەوەی ڕەحمان شێخوەسانی باسی دەکات وانییە و درۆیە، ڕێژەی ئیمزاکانی عەلی شەعبان زۆر زیاتر بوو لە ئیمزاکانی ڕەحمان شێخ وەسانی، زووتریش گەیشتنە سەرۆك بارزانی، ڕەحمان شێخ وەسانی سەردانی مەلامستەفای کرد و ئیمزاکانی لەپێش دانان و بە دەمیش ڕووداوەکەی بۆباس کرد. سەرۆك بارزانی لیستێکی پێشانی ڕەحمان شێخ وەسانی دا و بۆشی خوێندەوە، وتی: ڕەحمان ئەوەش ناوی ئەو کەسانەیە کەئیمزایان کردوە، مەلامستەفا گوتویەتی: ڕەحمان شێخ وەسانی بلێ: چیت بۆ بکەم؟ ئەوەی تۆ دەیلێی بە ڕاستی دەزانم، بەڵام کارەکە بەوشێوەیە، ڕەحمان لە کێخوا و مەلا و شێخانی خۆی زۆر توڕە دەبێت لەو بێ هەڵوێستیەیان، لەو لەناردان و لە بزماردانەیان... دەڵێت: سەرۆك من قسەم نەما و سەرۆك ئەسپێکی بە خەڵات دەداتێ و دێتەوە... بەڵێ ئەوەیە گەل و میللەت . مام حارس خەڵکی بالیسان پیاوێکی وشیار و بەهەڵوێست و مەرد بووە، زۆر قسەی خوشی لە دوا بەجێماون، یەکێك لە قسە بەنرخەکانی باس دەکەین: ماڵە بارزانیەك لەبالیسان بووە، دوو کوڕیان هەبوون بەناوی ( کاوە و نەورۆز ، بەشێك لەخەڵکی بالیسان بێتامی دەکەن لە ماستاو سارد کردنەوە بۆ ئەوماڵباتە بارزانییە، کە سنوور دەبەزێنن . مام حارس دەڵێت بریا بەبریای خوای با ئەمیش جارەکی کاوەو نەورۆزم وەبەر کەوتبان، لەئامێزێم گرتبان چ بکەم؟ ماریێ خۆم خەرابی، وەبەرم ناکەون، دوو ماچانیان لێ بکەم!) دوای شەڕی بالیسان بەشێکی زۆر هێزی پێشمەرگە بەرەو دۆڕ(دۆڵێ) هیان دەچن لە ١٧ / ٨ / ١٩٦٢ . شەڕی ئەسپیندارە ڕوو دەدات، پێم وایە (١٣ ) کەس لەو شەڕە دەکوژرێن، دواتر لە ٢١/ ٨/ ١٩٦٢ ی ناحیەی خۆشناویش ڕزگاردەکەن و خۆیان لە چیایی سەفین قایم دەکەن. بارەگا دادەنێن و ناوەناوە پەلاماری شەقلاوەش دەدەن، لەوکات پۆلیس دەوری بەرچاوی هەبووە. لەپەیوەندی کردن وەنەکردن، دیارە سەرۆك بارزانی لەو شەڕوشۆڕەی هیان لەنزیکەوە ئاگای لێ بووە، کاریگەریشی هەبووە، لەو شەڕە دیارە خەڵێکی زۆر بەشداری کردووە، پێوست بەناوهێنانیان ناکات. دواتر مەحموودکاوانی لەگەڵ هێزێك لەچیای سەفین دادەبەزن، بەمەبەستی پشوودان**

دێنە گوندی تاقوبان، لەسەر کانییێك دادەنیشن لەگەڵ مام حەوێز کانی بەردی و شێخۆی دەراشی و حسێن سوێرەیی و کەسێك بەناوی کەریم، کەسێکی تر بەناوی عەباس، فرۆکە بۆردوومانیان ئەکات و سێ کەس شەهید دەبن:

١/ عەباس شەهید دەبێت پێم وایە خەڵکی لای بادینان بووە .

٢/ حسێن سوێرەیی

٣/ کەسێك بەناوی کریم

شێخۆی دەراشی و مەحموود کاوانی بریندارەبن. مەحموود کاوانی دیننەوە گوندی بێراوە، بۆئەشکەوتی (شەم شەمۆر)

شەهیدەکانیش لە تاقوبان بەجلکوبەرگەوە ناژراون، سەرۆك بارزانی بەهۆی پەلاماری هەرکی و سۆفیەکان هێزێکی زۆر لەگەڵ خۆی دەبات، بەرەو بارزان دەگەڕێتەوە، لە گوندی بێراوە لە ئەشکەوتی شەم شەمۆر سەردانی مەحموود کاوانی دەکات و چەند فرمێسکێکی بۆ دەرێژێت، دیارە مەحموود کاوانی تەندروستی خراپ بووە، بارزانی مەحموود بە جێ دێڵێت و بەرەو بارزان دەڕوات، دواتر مەحموود کاوانی شەهید دەبێت، لە بێتواتە دەی نێژن. شەڕەکە دەکەوێتە سەفین و دەوروبەری، دواتر ڕژێم توانی هێزان داگیر بکاتەوە و بێسەروبەرێك لە ناوچەکە ڕوودەدات، ڕەوە جاشێك پەلاماری بالیسان دەدەن بە پاڵپشتی ڕژێم بالیسان دەگرنەوە، قیادەی جاشەکان غازی بەگ و ڕەشاغا و تەهابەگی شێرەیی و جاشەکانی ناوچەکە، وەك: ئەحمەد گزال و شێخ وەسانیەکان بەگشتی و زۆری تر بووینە، دوای چەند ڕۆژێك پێشمەرگەی گوندەکانی دەوروبەر و شێخ وەسانی دێنە پشتی بالیسان (بەردەلانك) بالیسان دەدەنە بەر ڕێژنەی گوللە، دواتر پاشەکشە دەکەن، لە شوێنێك دادەنیشن بۆ نانخواردن، جاشەکان پەلاماریان دەدەن و پێشمەرگەیەك شەهید دەکەن بەناوی : (حاجی ئیسماعیل) و دوو پێشمەرگە بە برینداری دەستگیر دەکەن بە ناوی: (مەحموود کەریم ناسراو بە بایی) دووەم (حسێن حەمەد سکتانی) بەدیاری دەیان دەنە دەست ڕژێمی ئەوکات، حوکم دەدرێن دواتر پەلاماری گوندی شێرە دەدەن لە هەمان ڕۆژ پەلاماری گوندی سوێرە دەدەن،( سلیمانی فاتێ) شەڕێکی مەردانە دەکات لەگەڵ ئەو ڕەوە جاشە، دواتر بریندار دەبێت بەبرینداری دەچێتە ئەو تیشەی باشووری سوێرە، لەوێش شەڕ دەکات تاکوو شەهیدی دەکەن، شەڕێکی چەند سەعاتی لە نێوان ڕەوە جاشێك و یەك پێشمەرگە دەقەومێت. دواتر پەلاماری گوندی چیوە دەدەن، ئەیانەوێت گوندی چیوە بسووتێنن، هۆیەکەشی ئەوەبووە حاجی بەدیع میوانداری سەرۆك بارزانی

کرد بوو، پێشتر جەنابی حاجی بەدیع گوندی چیوە دەکڕێتەوە بەبڕی ( ٥٠٠ ) دیناری ئەوکات. کە گەڕەکێکی هەولێر بەو پارەیە دەکڕا، دەبانچەیەکیش دەبەن هەزار ڕەحمەت لە گۆڕت حاجی بەدیع، هەموو ژیانت مەردایەتی بووە، بەمەردیش مردی.

حاجی بەدیع بانقی هەموو خۆشناوەتی بووە، بەهەژار و دەوڵەمەندەوە، حاجی بەدیع بەخۆی ڕۆمانێکە هیوادارم کوڕ و نەوەکانی شتێك لەسەر باپیریان بنوسن. ئەوپیاوە بەرێزە زۆر بە هەژاری و ماڵوێرانی ژیاوە، زۆری کوێرەوەری دیوە، دواتر دەوڵەمەند دەبێت.

دیارە بەدەوڵەمەندی لە خۆبای نابێت و گۆڕاری گاوانەتی وەك یادگاری پاراست بوو، زۆر ئاگای لەخەڵکی داماو بووە، خۆشبەختانە شوێنی بەدیع چۆڵ نەبووە و کوڕ و نەوەکانیشی جێی پەنجەیان دیارە لە پیاوەتی و چاکە و خێر بەخەڵکی داماو.

زۆر شت دەکەن لەپێناوی بەرژەوەندیی گشتی، دواتر جاشەکان دێنەوە بالیسان تەرمی شەهید سلێمان سوێرەیی دێننەوە بالیسان و بێڕێزیەکی زۆر بەرانبەر تەرمی شەهید دەکەن. بەتایبەتی تەهابەگ دواتر بەهەدیە بۆ داگیرکەر ڕەوانەی شەقلاوەی دەکەن. دوای شانزە ڕۆژ هێزێکی پێشمەرگە کە لە بێتواتە خۆیان ڕێك دەخەنەوە بەنیاز بووەینە چیای هەورێ و زینەتیریان لێ بگرێت، مەجالی ڕاکردنیان نەمینێ، جاسوسێك ئەو هەواڵە دەداتە جاشەکان و جاشەکان ڕادەکەن، بالیسان چۆڵ دەکەن لە ماوەی ئەو شانزە ڕۆژە خانووی تەواوی پێشمەرگەکان دەسوتێنن، خەڵکی خۆشناوەتی زۆرینەیان ناوچەکەچۆڵ دەکەن، بەرەو مەلەکان ودۆڵی شاورێ دەچن تاکوو بەهار ناگەڕێنەوە، ( کەریم بەگ) ئەو جارەیان لەگەڵیان دەڕوات وە سێبارە ڕژێم بە پاڵپشتی جاشەکان پەلاماری ناوچەکە دەدات.

هێزێکی دوژمن بەناوی (قوەی سەیار) بەرەو ناوچەکە دێت و زۆربەی خەڵکی ناوچەکە بەجێی دێڵن و زۆربەی گوندەکان دەسوتێن، دواتر ئەو هێزە ناوچەکە چۆڵ دەکا و بەهارێ خەڵکی ناوچەکەدێننەوە خانوو دروست دەکەنەوە. لەو کاتە پێشمەرگە گەشە دەکات لەو کات مەقەڕی هێزی پێشمەرگە لە کانی گوێزێ و کانی تەلانە و کانی سێورك و لەسەر مێرانی دادەنێن. لە لایکی تر بارزانی پەلاماری سۆفیەکان دەدات سۆفیەکان بەرەو سنووری تورکیا دەچن، توشی زستانێکی سەخت دەبن مەلامستەفا لێیان دەبوورێ و هەموویان دێنەوە دەشتە دیانێ. پێشمەرگە دەکەوێتەوە جوڵە و بەهیمەتی خەڵکی ناوچەکە و پەیدابوونی هێزی پێشمەرگە ڕوو لەزۆربوون دەکات ئەو هێزەی بالیسان پاشەکشە دەکات بۆ زینەتیر و سۆرەپەل، ڕژێم چەند ڕەبایەکی جاش لە

زینەتیر دادەنێت لەوکات دەبابەش دێنیت بۆ تۆپ بارانکردنی خەڵکی ناوچەکە و وەهێزی پێشمەرگە، هێزی پێشمەرگەش بەرانبەر ڕژێم سەنگەر دەگرن ... خەڵکی ناوچەکەمان بەهارێ دەگەڕێنەوە و خانوو دروست دەکەنەوە، دەبێتە بڕیار دەبێت هەموو کەس بچێتە سەنگەر ئەو پشتبێندە ئەمنیە دەبووایە هاوکاری پێشمەرگە کرابا، بە ئاو و نان و پشتیوانی بەرگری، لەساڵی ١٩٦٤ ڕژێم پەلاماری دۆڵی بالیسان دەدات بەجێش و جاش پەلاماردان دەگاتە گوندی توتمە و بالیسان لە گوندی توتمە سەربازێکی نامەرد پەلاماری خوشکێك دەدات، پیاوەکەش ویستویە بەرگری لە کەرامەتی خێزانی بکات، سەربازەکە مێردی ئەو خوشکە بەڕێزە شەهید دەکات، کە نلوی تەها بووە، سەربازەکە دوای شەهیدکردنی مێردی ئەو ژنە واز لەژنەکە دێنێت، ئەوەی من زانیومە ڕەسوول شێخ وەسانی کە ناسراوە بەرسوری کێخواخدری، ئەوسەربازە دەکوژێت و سوێندیش دەخوات دەست نەپارێزی لەکوشتنی سەرباز و جاش. زۆربەی خانووی گوندی توتمە دەسوتێنن، تەنها بەشێك لەبالیسان دەگرێت دواتر لەترسی بەرگری هێزی پێشمەرگە هەر هەمان ڕۆژ پاشەکشە دەکەن، بالیسان بەجێ دێڵن سەربازێکیان خۆی دادەبڕێت، بۆ توتن دزین دەکەوێتە دەست هێزی پێشمەرگە، هێزی دووژمن بەرەو زینەتیر ڕا دەکات لەوێ ڕەبایە دادەنێن و چەند دەبابەیەك جێگیر دەکەن و بۆردمانی ناوچەکە دەکەن، دواتر هێزی پێشمەرگە تۆپێکی سەد و بیست دێننە چیای شێخ وەسانان، بەسەرپەرشتی (مام علی) ناسراو بە(علی مستێ ) (مام فەقێ مێرگەسەر)یش یەکێك بووە لە تۆپهاوێژەکان، (ڕەفیق نێوەیی)یش یەکێك بوو لەتۆپهاوێژەکان، تۆپ باران بەردەوام دەبێت لە نێوانیان یەکێك شەهید دەبێت بەتۆپی دەبابە (مستەفا خەتی) بووە لەدەوروبەری گوندی سوێرە. لە دۆرە تیر بەسەرپەرشتی سۆفی بلۆك و سەعید هەروتەکەونی و حەوێز باویانەیی وچەند کەسێکی تر کەمینێك لەدۆرەتیر لەسەربازانی مۆڵەت وەرگرتوو دادەنێنەوە حەڤدە سەرباز دەکوژن، دەسکەوتیان یەك چەکی لەجۆری پەڕەشوت بووە (خەلیل سیتۆ )، بەوکوشتنە ناڕازی بووە بەتاوانی زانیوە، دواتر خەڵکی بەرەو پیی هێزی پێشمەرگە چوون، نەبوونی مووچەو ئیدارەی ماڵەوە و سەرباری ڕۆژانە بۆردمان کردنی گوندەکان و سوتاندنی داروبەرد کە بەبێ جیاوازیی لەنێوان پێشمەرگەو ژن ومنداڵ و پیرەپەککەوتە، ئەوەی گرنگ بوو ترس و تۆقاندن بووە لەلای دووژمن . دواتر ڕژێم زینەتیر و شاخی سۆرەپەل و کەپکی حەمەد ئاغا چۆڵ دەکات ئەو ناوچەیە کەوتەوە دەست پێشمەرگە دوای شەهید بوونی (مەحموود کاوانی) ماڵی (عوسمان بەگ ) بەدزی کەوتنە یارمەتی دانی شۆڕش دیارە بنەماڵەی ئێمە ماوەیەك لە

**گوندی سیساوه دەمینێتەوە، دواتر دەچنەشەقڵاوە لای عوسمان بەگ دەبنە جاش، لە وێش دابەش دەبن بەشێك لە شەقڵاوە بەشێك لە دەربەند باوكم جاشایەتی ناكات دەچێتە گوندی باشوورە لای ساڵح بەگ، دیارە ساڵح بەگ پیاوێكی نموونەییە لە بنەماڵەی ئەمبێزان، دوای چوار ساڵ خزمان گلەیی لە باوكم دەكەن كەخۆی لەوان دابڕیوە زۆری لێ دەكەن دەیكەنە جاش لەڕەبایەكان لەسەر پردی ڕوساكێ دایە، باوكم پیاوێكی باش بوو ئەوە پاساو نیە بۆ باوكم ڕاستیە ڕۆژێك لەڕۆژان ڕێگای بە پێشمەرگە و هاوڵاتیانی نەگرت شوێنی باوكم دەی ڕوانییە سەر جسری روساكێ كە ڕووبار هەڵدەستا چارە نەبوو دەبووایە پێشمەرگە و هاوڵاتیان بێنەوە سەر جسر، باوكم هاوكاریان بوو، نەباوكم لەپێشمەرگە دەترسان نەپێشمەرگە و هاوڵاتی لە باوكم دەترسان، ئەو ڕەبایە دەنگی دابووەوە لە چاكە و هاوكاری پێشمەرگە ئەوانەی لەژیاندا ماون ئەومەسەلەیە دەزانن چونكە باوكم باوەڕی بە جاشایەتی نەبوو، ساڵەكەی نازانم ڕۆژێكیان لە سۆركی شەقڵاوە شەڕ لەسەر یەكێك لەڕەبایەكان بووە و تەقەی لەسەر بووە هێزێكی زۆری جاش و جێش پەلاماری ئەو ڕەبایەیان دەدا، دوواتر ڕایان دەكرد، ماوەیەكی زۆر بۆردوومان دەكرایەوە بە تۆپ،دووبارە هێرش دەكرایەوە، دوواتر نەیانتوانی ڕەبایەكە بگرن دوو تەیارەی مێك پەیدابوون، بەخەستی ڕەباكەیان بۆردوومان كرد. دواتر ڕەبایەكە گیرا، پێم وایە پێشمەرگەیەك شەهید بوو، وام گوێ لێ بوو كە خزمی ماڵی (ڕەسوول فەقێ) بوو (ڕەسوول فەقێ) یەكێكە لە پیاوە تێكۆشەرەكانی گەلەكەمان شەڕی سەفین و ڕەسوول فەقێ و خزمانی دۆڵی هیران پڕشەنگدارە لە مێژووی گەلەكەمان، منیش درێژەم بە ژیانی منداڵی دەدا، ڕۆژانەم یەك درهەم بوو دەچوومە شەقڵاوە سەرفم دەكرد، درهەم زۆر بوو كەبابێك ومشن و شەكرۆكەی پێ دەهاتن.**

**شەقڵاوە چەند بەشێك بوو، لە فلكەی كاوێس دەستی پێ دەكرد لە پشت جادە پێیان دەوت گوند. لەو كاتوساتە خانیەكان زۆر خۆش بوون، درێژ دەبووەوە تاكو ناو خزمانی مەسیحی سابیراوەش هە بوو لە خوارەوەش بازاڕ هە بوو لەلای جسری ناو بازاڕ چنارێكی لێ بوو ڕۆژانە دەیان كەری لێ دەبەسترایەوە، لەگوندەكانی لاسە و بەرەكە و گەرەوان و قادیانەو مامە جەلكە و كەورگۆسك و ماوەران ودەربەند، بەیانیان خەڵكی ئەو گوندانە ڕوویان لە شەقڵاوە دەكرد بۆ ساغكردنەوەی دار بۆ سوتان و ماست و میوەجاتی جۆراو جۆر و هێنانی چرۆ بۆ كەپرو سابات هێلكە و میوەجاتی جۆراو جۆر، كڕینی پێداویستی ڕۆژانەیان زۆربەی كەرەكان لە بن ئەو چنارە دەبەسترانەوە زۆڕە زۆڕی كەران دنیای پڕ دەكرد، زۆرجار شەڕەكەر دروست دەبوو...**

دیاره شەقڵاوه شارێکی گەشتوگوزاری بووه، ناو و ناوبانگی خۆی هەیە، لە ڕووی ئایینی لە دوو بەش پێك دێت : موسڵمان و برایانی مەسیحی، برایانی مەسیحی دەوری بەرچاویان هەبووه لە ڕووی بەرەو پێشخستنی شارستانیەت لە شەقڵاوه و دەوروبەری لەڕووی پەروەردە ئەوان پێشەنگ بوون، زۆربەی مامۆستایان مەسیحی بوون، لە ڕووی تەندروستی زۆربەی کارمەندان دکتۆر و مزەمید و پەرستاری ئەوان بوون. ئەوکات خەڵکی ئێمە لایان شەرم بوو کچ ببێتە ستەر، لەناو شەقڵاوه دەیان پیاوی سەردەمی خۆی هەبووه وەك (مەلاگچکە،خالیدە فەندی، قمشە جوبرائیل و سالح بەگ و محەمەد فەندی خلیل خۆرانی و شاعیر، ئەحمەد فەندی و سەید تائیب و ئەداشێر و شەماشە میخایل و برایم کاکۆ و مەحمودی ملاسەعید)ی ..تاد. لە شێرەژنیش بێبەش نەبووە، وەك (فاتە هەلۆ و فایزە) مەشوورە بە (فایزە کۆر). هەزاران پیاوی پۆشتەو قیت وقۆزی خاوەن سامانی خۆ فرۆش بەقوربانی فایزە کۆر و فاتە هەلۆبن. بژی فایزە کۆر و فاتەهەلۆ. ئەو کات خەڵکی شەقڵاوه پەیوەندییان خۆش بوو، خانووەکان خشتو بەرد بوون، زۆربەیان دوو قات بوون ڕووناك و خۆش بوونە وەبیرم دێ ئەوکات بەشێك لە ئالاتی بەلەدیەی شەقڵاوه، بەگوێدرێژ بوو، ناکرێت پوور عانێ کە ناسراوە بەعانەڕووت باس نەکرێ، دۆستی هەموو شەقڵاوه و ماڵان بوو. زۆربەی خەڵکی دەناسی، ئەنوەر قەساب و شەقڵاوه، ئەنوەر پیاوێکی بەڕێزو ماقوول بوو، ئەگەر سەر خۆش نەبایە! ئەوەی گرنگە باسی بکەم دڵسۆزی ئەنوەر و کوردایەتی دووشتی لێك دانەبڕاو بوون. زۆرکەس کە خۆی بەپیاو دەزانی و نوێژ و ڕۆژیشی دەگرت وەك سەگ لەپێش پیاوانی ڕژێم سەمای دەکرد، بەڵام ئەنوەر ڕۆژێك لە ڕۆژان نەچاوی لە پارەی ڕژێم بوو، نەبووە پیاویان. ئەنوەر من ماوم بۆ مێژوو ئەوشاهیدیەت بۆ دەدەم بەگۆڕی (حەمیدی) کە لەنزیکەوە ئەنوەرم باش دەناسی بژی ئەنوەر قەساب و کوردایەتی.

ڕۆژێکیان کۆمەڵێك لە پێشمەرگەکانی شەقڵاوه دەچنە بێترمە بۆ دەستگیرکردنی پیاوانی ڕژێم هەموشیان برادەری ئەنوەر قەساب دەبن، پێشمەرگەکانیش ئەیانەوێ گاڵتە لەگەڵ ئەنوەر بکەن، پێشمەرگەکان خۆیان دادەپۆشن ئەنوەر نایان ناسێ، دەشزانێت پێشمەرگەن نازانێت چ لایەنێکن شەقەیەك لە ئەنوەر دەدەن ئەنوەر دەڵێت: بژی مەلامستەفا شەقێکی تری لێ دەدەن ئەوجارەیان ئەنوەر دەڵێت: بژی مام جەلال . شەقەیەکی تری لێ دەدەن ئەنوەر ئەوجارەیان دەڵێت کوڕە بژی کورد وکوردستان. پێشمەرگەکان خۆی لێ ئاشکرادەکەن و ماچی دەکەن. داوای لێبووردنی لێ دەکەن ئەویش داوەتیان دەکات.

بۆ مێژوو لە ساڵی ١٩٦١ەوە تاکو ساڵی ١٩٩١ شەقڵاوە وبەکاوانیانیش ڕۆژێك لە ڕۆژان پێشمەرگە و شەقڵاوە لێك دانەبڕاون، ماڵی عوسمان بەگ کەم و زۆر ڕەچاوی ئەو وەزعەیان کردووە چاوپۆشیان لە زۆر شت کردوە، ئەکرا وەك زۆر ئاغەی تر شت بکەن وەپێشیان دەکرا، دیارە خۆیان پاراست دەستیان خۆش.

حەمەشێتەك هەبوو لە مزگەوتی گچکە ئەژیا کە تووڕەیان دەکرد، دەی وت: حەفتێ بابی بابت بگێم... (مام عەزیز بەگ ) و شەقڵاوە ناسراو بە (مەقۆ) ئەو پیاوە خووەکی غەریبی هەبوو، ئەویش نووسینی ناوی خەڵکی بوو لەسەر دیوار، پشتی لەدیوار دەکرد دەی نووسی دەستخەتی زۆر خۆش بوو. کاکە (سەلمان و مام عەولابوون) زبلی ماڵاتیان ئەگواستەوە، بەگوێدرێژ و عەرەبانەی دەستی، بنەماڵەکانی شەقڵاوە ناوی سەیروسەمەرەیان هەیە، با ناویان نەهێنم، نەوەك تووڕەبن. بۆ مێژوو من زۆر لە شەقڵاوە ژیاوم زۆرینەی خەڵکی شەقڵاوە پیاوی خراپ و خۆفرۆشی زۆر کەم بووە، بە هەردووپێك هاتەکە واتە ئیسلام و مەسیحی، ڕژێم نەیدەتوانی بەکاریان بێنێت، دژ بەگەلەکەمان، ڕژێم بەشێك لەوانەی بەکاردینان، کە لە گوندەکانی دەوروبەر لەترسی پێشمەرگە ڕایان کردبوو ئەوانەی لە ١٩٦٠ بۆ ١٩٧٠، وە لە ١٩٧٦ بۆ ١٩٨٨ لەشەقڵاوە دەژیان ناسراویشن دیارە ئەو تاقمە خۆفرۆشە شتێك نەما نەیکەن. لەشەقڵاوە وردە وردە چوونە زبڵدانی مێژوو، خەڵکی سەربەرزی شەقڵاوەش بەخۆشی و بەئازادی دەژین.

شەقڵاوە گازینۆ و چێشتخانەی لێ بوون، خواردن زۆر هەرزان بوو، بە یەك درهەم نان و کەباب دەخورا، کۆکە و مشنیشی پێ دەهات ئەوکات کەمتر خان و لە ناو باغچان هەبوون، زۆربەی دارگوێز و ئەسپیندار و مێوەجات بوو کۆرانەیەك هەبوو لەلای جۆت سولکە لەلای ماڵی سەید تالیب داتەوە سەرجادە، کۆرانیکی خۆش بوو، بەهاوینان پڕبوو لە مێوەجات بوو، پایزان ئەوەی بەو کۆرانەدا ڕۆیشتبا بەشی خۆی گوێزی دەخواردن، ئەوانەی بەبا هەردەوەران، لەو کۆرانە تیشکی خۆرت نەدەدی، کۆرانێکی تر لەلای ماڵی د. کەمال خۆشناو دەستی پێ دەکرد، بەپێش خانووی ماڵی جەمیل کاریسدا داتە خوارێ، ئەوەشیان کۆرانێکی خۆش بوو، کانی و کانیاوی زۆر بوون بازاڕی کانی سەقاوێ زۆر گەرم بوو، زۆربەی خانمانی دەوروبەری مزگەوتی گەورە بۆ نوێژو شوتنی جل و بەرگ دەهاتنە کانی سەقاوێ. لە سەروی مزگەوتی گەورە بەلای ڕۆژهەڵات گازینۆیەکی لێ بوو شەوان ئەو گازینۆیە بەبەرناکەوت، خەڵکی لە سەر جادەش لەدیاری دەوەستان ئەوکات تەلەفزیۆن زۆر کەم بوو لە ماڵان دەنگ و دۆزێك پەیدابوو گوایە چوینە

سەرمانگ شەڕە قسە لەناو خەڵکی دروست بوو لەسەر چون و نەچونی سەرمانگ، لەلایەن زۆربەی مامۆستایانی ئاینی ئەوکات ئەوەی باوەڕیە چونە سەرمانگ هەبووایە بە کافر ئەژمار دەکرا، زۆرینەی خەڵکی لایەنگری مامۆستایانی ئاینینی بوون. لەدەوروبەری مزگەوتی گەورە بەیانیان دەیان پیەژن بەسواری کەرێ دەدیترا بۆ هێنانی ماست وپەنیر و ژاژی و تەماتەو چشتی تر . لە سەروی پردی رۆساکێ گۆمێکی قول هەبوو پێیان دەوت گۆمێ روساکێ، شوێنەکەی بوویتەجسری نوێ، زۆربەی گەنجانی شەقڵاوە قەرزاری ئەو گۆمەن لەو گۆمە فێری مەلە بوون، رۆژانە شەڕە بەرد رووی دەدا لە نێوان گەنج و منداڵانی گوندی دەربەند و لە گەل گەنج و منداڵانی شەقڵاوە، ئەوکات شەڕە بەرد خۆش بوو، شەڕەکە رۆژانە بوو زۆرجار ئێمە دەمان دۆڕاند یان نەوان، سەر شکانی تێدابوو، لە هەردوو لاوە ئەوکات ئاو و رووبار زۆر بوون. ئاوی شەقڵاوە لە دەربەند ماش و برنج و شتی تری پێ دەکرا. ئەوکات ماسی زۆر بوو ماسییەکان خۆماڵی بوون، زۆر بەتام بوون زۆرتر ئەوکات خزمانی مەسیحی ماسییان دەخوارد پایزان کە رووباری شەقڵاوە ماوەران بەرەو وشکی دەچوو ماسیەکان ئاویان نەدەما، رێژەیەکی زۆر ماسی دەمردن خەڵکی کەم دەیان خواردن. منداڵ بووم شەوێکیان هێزی پێشمەرگە پەلاماری گوندی دەربەندیان دا دووکەسیان کوشتن کەچەکدار بوون، بەناوی:( قادر و مستەفا ) پێم وایە برا بوون دواتر پاشەکشەیان کرد بۆ بەیانیەکەی پۆلیس هات و تەرمەکانیان بردنە شەقڵاوە، بۆ یەکەم جار بوو من کوژراو ببینم، زۆر ترسام دیارە کۆمەڵێك پرسیارم لە باوکم کرد، بۆ کوشتنیان پێشمەرگە چییە و جاش چییە؟ باوکم وەڵامی دامەوە و تێی گەیشتم. باوکم رادیۆی هەبوو هەموو ئێواران رادیۆی دەکردەوە، رادیۆ قسەی ناشرینی بەجاشەکان دەدا، وەك ئەی جاشە رووڕەشەکان زۆری تر، ئەوکات شتێکم لەبیرە دەیان گوت حکومەت دەست و پێی عەزیزدەربەندییان بەستوە و بەقوون رووتی لەسەر سۆبەی عەلاودینیان داناوە. دیارە من لەو دووایە زانیم کەمام عەزیز دەربەندی پیاوێکی ئازاو تێکۆشەربووە. پێم وایە ساڵی ١٩٦٩ بوو لە گوندی دەربەند قوتابخانە کرایەوە ئێمەی منداڵانی گوندی دەربەند ناو نوس کراین لە پۆلی یەك، چونکە بۆ یەکەم جاربوو قوتابخانە دەکرایەوە تەمەنەکان جۆراو جۆر بوون، دوو مامۆستامان بۆ هاتن بە ناوی مەربێل و سولاقە هەردوکیان خزمانی مەسیحی بوون، دەرسمان خوێند تاکو گەیشتینە پیتی (ش) کە دەرسەکە بەناوی (شوشە شیر) بوو .

بەهار بوو کۆچەریان دەچونەکوێستان کەلەمەکتەب بەربووین من لەگەڵ منداڵان دەستمان بە یاری کرد، دواتر چومەوە ماڵەوە،دوای دوسەعات بەبیرم هاتەوە کە جانتام لەبیر کردووە. پێشتر وتم هێرم ! چومەوە شوێنەکە لەوێ نەمابوو ماڵە کۆچەریەکان بردبوویان ئیتر من نەچومەوە خوێندن و وازم لە مەکتەب هێنا، هۆیەکەشی ترس بوو لەماموستا ئەوکات . ماموستا زۆر توند بوون یان دەکرێت ئێمە ئەوکات وەك پێویست نەبووبین، یان باوك و دایکمان پێیان باشتر بوو. ببینە شوان یان گاوان لە هەموو بەهارو پایزان کە کۆچەران دەچوون و داتنەوە، بە دەیان رۆژ دەوروبەر پڕ دەبوون لە کۆچەر، کۆچەری یەکجار زۆر بوو وەك خزمانی هەرکی وخزمانی دەشتێ و خەیلانی و مام سارو زۆری تر.

مفاوەزات دەستی پێ کرد، لەنێوان رژێمی ئەوکات و سەرکردایەتی کورد رێککەوتن لەسەر ئۆتۆنۆمی بۆ گەلەکەمان یەکێك لە داخوازی سەرکردایەتی کورد چەك کردنی جاشەکان بوو. باوکیشم وەك هەموو جاشەکان چەك کرا، باوکم بێ ئیش مایەوە بووە گاوانی گوندی دەریەند، دوای ماوەیەك لەپڕ هەردوو چاوی لەدەست دا، ناچار من بوومە گاوانی گوندی بەو تەمەنە ئەوەی بەلامەوە زۆر خۆش بوو ئەوکات کەرێکی سپیمان هەبوو رۆژ تا ئێوارە لەسەر پشتی بووم، (شا)ە بە سەپان نازانی... رۆژێکیان بووە تەقە لە کەندێ برقێ کە دەڕوانیتە رۆژهەلاتی پردێ روساکێ، ئەوکات جادە بەسەر کەندێ برقێ دەڕۆیی، بۆ بەیانیەکەی دەنگ بلاو بووەوە گوایە چەند کەسێك کوژراون،وەفدێکی عێراق بووە لەلای سەرۆك بارزانی گەڕاوەتەوە، پۆلیسی شەقلاوە کەوتە گرتنی خەڵکی دەورو بەر خەڵکیان ئەزیەتدا بەتایبەتی شوان و گاوان، دوواتر (شێخ رەسوول مامە جەلکەیی) وتی من دەزانم ئەو وەفدە کێ کوشتی، چەند ناوێکی دا ئەوان گیران و خەڵکی ئازاد کرا، شێخ رەسوولێ لەلایەن بارزانی خەلات کرا، دواتر بووە موراقیبی کرێکارانی جادەی سیساوە و هەریر دوو جەمەدانی سۆری دە بەست، شای بە سەپان نازانی... شێخ رەسوو پیاوێکی ئازابوو لەشەڕی ١٩٧٤ عەدەد دۆشکە بوو، لە چیای (کلاو قاسم) ڕاستەو خۆ شەڕی لەگەڵ تەیاران دەکرد دەور دەوری ئەو بوو!

لە دوای هەرەسی شۆڕشی گەلەکەمان شێخ لەسەر ئاشکراکردنی بکوژانی وەفدەکە توشی دووژمنایەتی بوو، لەسەر ئەو ڕووداوە برایێکی شێخ ڕەسوول قۆلێکی لەدەستدا. شێخ رەسوو ساڵی (١٩٧٦ ) بووە پێشمەرگە و دواتر لەلایەن چەند کەسێك بریندار بوو، بەبرینداری خۆی دایە دەست ڕژێم و ڕژێم شوێن بزری کرد، شێخ ڕەسوول پیاوێکی گورجوگۆڵ بوو، من نەمدیوە نە

کورد پیاوێکی وا گورجوگۆڵ هەبوو بێت. قسە خۆش بوو دوو قسەی ئەو پیاوەم لە لایە لە ساڵی ۱۹۷٥ ماڵی لە شەقڵاوە بوو لە خانووی ماڵی ساڵح بەگی شەقڵاوە لەسەرووی ماڵی عوسمان بەگ کە ئەوقسەی گێرایەوە من لەماڵیان بووم، جیرانی ماڵی خوشکم بوون، ڕۆژێکیان لەگەڵ باوکی دەچێتە ناو ڕەزی بە مەبەستی جوتکردن و ڕەز برین باوکی پێی دەڵێت: ڕەسوور برۆ لە کەندە( نەفتیێ) تکریە ئاوێك بێنە نوێژی پێ بکەم، شێخ ڕەسوول کتری هەل دەگرێت و ڕادەکات، کتری پڕ لە ئاو دەکات و ئاگر هەڵ دەکات تاکو دەکوڵێت بە غاردان دێتەوە لای باوکی، کتری دداتە باوکی، باوکی دەچێتە پەنایەك دەست بە ئاو بگەیێنێ، دواتر ئەو ئاوە گەرمە بە هەرامەکەی دادەکات و ڕادەپەڕێت و دەڵێت: هەی دایکت بگێم ڕەسوورۆك... بەقون ڕوتی پەلاماری شێخ دەدا و شێخ ڕادەکات. جارێکی تر شێخ جوت دەکات هەست دەکات کونە زەردەواڵە لە شوێنێکە خۆی لێ لادەدا و ناکێلێ، باوکی تووڕە دەبێت پێی دەڵێت: بۆ ئەو شوێنە ناکێڕی؟ شێخ دەڵێت: بەمن ناکرێت ئەگەر نەڕازی وەرە بیکێڵە باوکی دێت هێسترەکانی لێ وەردەگری تا باوکی دەگەڕێتەوە لە خەتی دووەم ئەو دارێك لە کونە زەردەوارەکە وەر دەدات و ڕادەکات، زەردەوارە پەلاماری باوکی و ئێسترەکان دەدەن، ئێسترەکان ڕا دەکەن بەلایەك و باوکی بەلایەك هەموو کەرستەی جوتکردن دەشکێنن،چەندان زەردەوارە بە باوکییەوە دەدەن، دیسان شێخ ڕەسووڵ ڕا دەکات .

باوکم ماڵی بارکرد چوینەوە گوندی شێخ وەسانان ماڵی عەیشە بەگ خانووێکیان داینێ تەوێڵەی کەر و مانگا بوو، هەندێکمان خاوێن کردەوە ماڵمان دانا، یەکێك لە کێشەکانی ڕووبەڕووی من بووەوە، ك ەدەچوومە ناو منداڵان پیان دەوتم:( فەرخە جاش! ) زۆر پێی تێك دەچووم، چاریش نەبوو، شەڕی ئەو هەموو منداڵانە بە من نەدەکرا، من تاقانەش بووم، برام نەبوون لەسەرم بکەنەوە. دەکرێت سوپاسی ئەو ماڵانە بکەم، ئەو فرخەجاشە بۆمن بووە دەرسێکی باش، کە قەت خیانەت لە گەلەکەم نەکەم. ئێمە کە ماڵمان لە دەربەند بوو ئەسپێمان نەبوو ئێمەی منداڵ نەشمان دیت بوو، هەر شەوێ یەکەم بە هاتنی خەڵکی بۆ بەخێرهاتنمان، ماڵیان ئاوابێ ئەسپێی ڕەشوسپیان بۆ هێنناین، دیارە ئەسپێی ڕەش بۆ ئافرەتانە و ئەسپێی سپی هیی پیاوانە.. ئەسپێیەکان بە وەفابوون، جار ئەوجار بوو ئێمەیان بەجێ نەهێشت. سەرەتا زۆر ناخۆش بوو، دواتر لەگەڵیان لێ ڕاهاتین. ئەوکات ئاودەست نەبوو بەیانیان دەستت دەکردە مەسینەیەك یان کترییەك

لەپەنایەك دادەنیشتی، لەبەرچاوی خەڵكی ئەوكارە شەرم نەبوو، لە كاتی خۆقەیم كردنەوە هەمووكەس تەماشایەكی نیفۆكانی دەكرد و راوە ئەسپێیەكی سوكی دەكرد.

باسی ئەسپێمان كرد، لەزوووەوە كەسێك زۆر ئەسپێی تیدابان بەتایبەتی هاوینان دەچووەپەنایەك شارەمیروستانێكی دەدیتەوە جلكی دادەكەناندن، لە دەوروبەری كونەمیروستانی بلاوەكردنەوە، بە ماوەیەكی كەم ڕەشك و ئەسپێیان نەدێشت، هەموویان دەگواستەوە سوپاسی ئەوكەسەش بوون كەداوەتی دەكردن. دواتر كابراجلەكی دەبەردەكرد، یەك ئەسپێ و ڕەشكی تێدا نەدما مێروستان راوچییێكی باشن ئەو فێڵە كاروانچیەكان زیاتر بەكاریان دینا. من دیومە باڵدارانیش بەتایبەتی قەلەڕەش ناوە ناوە پەڕوبارەكانی لەسەر كونە میروستان بلاو دەكاتەوە. میروەكانیش هەموو زیندەوەرێكی ناو پەڕوباری قەلەڕەش دەخۆن و پاكی دەكەنەوە. بەراستی ئەسپێ بەلایێكی گەورەبوون. لە ژیانی پێشمەرگایەتی زۆرجار بە هۆی نەپرژانە سەر خۆشوشتن لەكاتی شەڕو بەرگریدا، ئەسپێ پەیدادەبوو یان هەندێك جار لەهەندێك ماڵان كە بەتانی وەردەگیرا ئەسپێ میوان دەبوون، زۆر جار برادەرانی كە لە بەندیخانەكانی ڕژێم بەندبووینە زۆر نارازی بووینە،لە مام ئەسپێ زۆر بێوژدان بووینە، لەخوێن مژینیان لێدان و برسەتی و هەست بریندار كردن، ئەسپێش بەلایەكی بووە..واتەئەسپێش دەوری هەبووە لە هاوكاریكردنی پیاوانی ڕژێم....

خەڵكی خەریكی خانوو دروست كردن بوون، هەرەوەزی و هاوكاریكردن لەنێوان خەڵكی هەبوو، وردە وردە ژن و ژنخوازی كەوتەوە نێوانمان، واتە بەرەی شۆڕشگێر و بەرەی خاین دیارن. ڕەحمان شێخ وەسانی كێخوا هەمزە دەوری بەرچاوی هەبوو لە هێوركردنەوەی پەیوەندی كۆمەلایەتی و دروست بوونەوەی خزمایەتی خەڵكی شێخ وەسانان. هەندێ شتی جوانی تێدابوو لەوانە قەرەغەدانان، كەسێكیان دەست نیشان دەكرد ئاگایی لە هەموو بەروبوومێكی گوند دەبوو. ئێواران خارخدر دەچووە سەربانی مزگەوتێ و دەی گوت: هۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆ ڕەحمەتی لەوی لەبابێوی فلانی كوڕی فلانی بووە قرەغەچی، بە ئەمرێ ڕەحمانی هۆۆۆۆۆۆۆۆۆی .ئەو ئاگاداریە سێجار دووبارە دەكرایەوە.

هەر ئاژەڵێك زەڕی كردبا ئەو كەسە بۆ خاوەنی دەبردەوە و پارەیەكی ڕەمزی لێ دەستاند، بۆ مازوو چنینیش كەسێكیان دەست نیشان دەكرد ئەو كەسە بۆی هەبوو ڕۆژێك بۆخۆی مازی بكات. كە مازوو پێدەگەیی ئێوارە پێش بانگی مەغریب مام خدری خەجیجێ هاوای دەكرد بەو شێوەیە:

هۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆۆی ڕەحمەتی لە وی لەبابی وی سبەینێ بەردانی مازیانە هۆۆۆۆۆۆۆی. چەند جارێك ئەو رستەیەی دووبارە دەكرایەوە، ئەو شەوە خەركی خەریكی خۆ ئامادەكردن دەبوون، بۆ بەیانی خۆراك وچاو كەلوپەلی پێویستیان ئامادە دەكرد وەك چەلانگ دەبەر ئاونان، بۆ ئەوەی سیلمە توند بێتەوە و تورەكە و مەتارەش پێویست بوون. دیارە ئەوەی مەتارەی نەبا لولكەی هەبوو... مەتارە هەبوون، بەڵام هەمووكەس نەی بوو لولكە هەبوون لە پێستی بزن دروست دەكران و قەمیشێكی تێدەخرا ئاوی لولكە زۆر خۆش بوو، بەیانی لەگەڵ مەلا بانگدان خەڵكی بەرەو چیای بە ڕێ دەكەوتن هەر لەتەمەنی دەساڵی بەسەرەوە لەو كارەش شتی خۆش و سەیر روویان داوە، یەكێك لەو ڕووداوانە كەسێك پێشتر بە دزی گەڕانێك بە چیا دەكات و دارێك دەبینێتەوە مازی زۆری پێوەنە دەست نیشانی دەكات، ئەو ڕۆژەی بەردانی مازیان كابرا بەهەموو پداویستییەكان لە ئێوارە وە بەدزی دەچێت لەبن دارەكە دەنوێ، بەو مەبەستەی پێش هەموو كەس دەستەگوڵی خۆی بووەشێنێ كەسێكی تریش ئەو دارەی دیوە. كەسی دووەم بەیانی زوو دەچێت بۆلای دارەكە دەبینێ كەسێك لەبن دارەكە نووستوە، زۆر بەنەرمی دەچێتە سەردارەكە و مازووەكان دەچنێ و دەڕوا كەسی یەكەم خەوی زۆر خۆش دەبێت، ڕۆژ گەرم دەبێت ئەوكات لە خەو هەڵ دەستێت، سەیری دارەكە دەكات یەك مازووی پێوە نەماوە، لە بەردانە مازوو هەلێكی زێرین هەبوو، بۆ ئاشقان و یەكتر بینین و دەست لەملان، بۆ چەند سائێك ئەو كەژو چیایە پڕ دەبوو لە ئاوازی بە لۆرە و حەیران و حەیرانۆك وردەوردە بۆ نیوەڕۆ لە( كانییێ ریخیّ ) نزیك دەبوونەوە ( مام عەلی مستێ ) خەركی لای بارزان پیاوێكی باش و نیشتمانپەروەربوو،لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك تۆپهاوێژ بوون لە(بنگەرو) ، بنگەرو: شوێنێكە لە چیای شێخ وەسانان بڕیارێكی دابوو ئەوەی بەكانی ریخیّ بڵێت كانی ریخیّ دەبووایە مریشكێك جەزا بدات، ناوی گۆڕی بوو بە ناوی كانی( شۆڕش) ،كانیەكەشی جوان چیمەنتۆ كردبوو، شوێنی ئاوخواردنەوە بۆ مرۆڤ، دوو كۆلی ئاویش بۆ ئاژەڵ دروست كردبوون. بۆ نیوەڕۆ هەموویان داتنەوە سەركانی دوای دەموچاو شوتن و ئاوخواردنەوە، چالێنان وناغواردن و نوێژكردن، دوای پشویەكی كەم...كوڕان وەك نێرە كەوی بەهاران گەرم دەبوون دەستیان دەكرد بەشایی و خۆنواندن، لە بەرامبەر كچان شایی گەرم دەبوو، وردە وردە كچان دەخزانە ناو شایی تاكو هیلاك دەبوون و وازیان لە شایی دێنا و بەچیادا بڵاودەبوونەوە... ناشكرێ نەڵێین كچان و كوڕان یەكتریان نەبینیوە و ڕازو نیازیان بۆ یەكتر باس نەكردووە. بەڵێ ئەو بەزمەش هەبووە ...

❊❊❊ ❊❊❊ ❊❊❊

. لە ناوەراستی ساڵی پەنجاکان کۆمەڵێك لە خەرکی شێخ وەسانان دەچنە مازیان لە چیای (رەش)کە ئێستا پێی دەڵێن: چیای هەوریێ. لە سەرکانی (سێ ورگێ ) ئەو کانیە دارچنارێکی لێیە قۆناخ دادەنێن، کات ئێوارە دەبێت لەو کۆمەڵە خەڵکە دوو قەیرە کچیان لەگەڵ دەبن وە کەسێکی تر گەنج دەبێت بەناوی (حەمەد حسێن)، حەمەد گەنجێکی سۆر و سپی و چاوشین بووە، دووکچەکە بە حەمەد دەڵێن: حەمەد برۆ سەر چنارێ پەلکە چنار لێ بکەوە، ئەمە شەوێ لە سەر دەنوین کە دنیا بێ دەنگ بوو بە دزی وەرە لە بەینی ئێمە بنو تابەیانی خۆوخوای خۆت! حەمەد کە گوێی لەو قسەخۆشە دەبێت سەرخۆش دەبێت و چاوی تاری دەبن و دەچێتە سەر چنارێ دەست دەکات بە لێ کردنەوەی پەلکە چنار لە خوارەوەش دوو کچەکە کۆی دەکەنەوە، حەمەد ئاگای لە خۆ نییە لەبەر خەیاڵی شەو، لەپڕ کەدە چنارێك لەژێر پێی دەشکێ و حەمەد زۆر خراپ بەر دەبێتەوە و پشت و لاقی دەشکێن. حەمەد لە خۆ دەچێ، ڕاوەکە بەتاڵ دەبێت بارەچرۆێك دەکەن و حەمەد لەناو دەنێن و دێیننەوە شێخ وەسانان، حەمەدی تاقانەو بێ باوك لەپیستان دەنێن، تاکو تۆزێك چاك دەبیتەوە دیارە ئەوکات دکتۆر و دەرمان نەبووە، هەندێك دەرمانی کوردی و بەیتار هەبووینە و بەس.

دەبێت خار حەمەد چەند ئازاری کێشابێ؟ حەمەد تاکو ئەوساڵانە مابوو، دیارە بەلاق وپشتی شکاو تاکو مردیش نەی توانی ئەو دوو کچە ماچ بکات، دیارە حەمەد هێتم و تاقانەش بوو، دایکی حەمەد شێرەژن بوو خەڵکی نازناوی عەیشە بەگیان لێ نابوو.

بۆ مێژوو لە دەرەبەگایەتی ئاغە نەوێراون بێنە گوندەکەمان، نیشتەجێبن، بنەماڵەی ئەمبێز زۆرجار خۆیان ئاقی کردیتەوە و ئاغایان ڕەوانە کردووە، سەری نەگرتووە، ئەو ژنە وەك هەرپیاوێك جوتکردن و دارهێنان و دروێنەو کاروان کردن هەر کارێك بۆ ئەوەی کوڕە تاقانەکەی بەخێو بکات و ژنیشی بۆ حەمەد هێنا و منداڵەکانی حەمەدیشی گەورەکردن، نەی هێشت ئەو بنەماڵەیە کۆتایی پێ بێت، هەرژی عەیشەبەگ.

شێخ وەسانان هەندێك شتی تێدایە کەدەگمەنە لە کوردستان، نموونە: بۆ ماوەی چەند ساڵێك ژنێك دەکەنە کێخوای گوندی کە بنەماڵەیەکی دەست ڕۆیشتووش نەبوون، لە هەمان کات هەموو بنەماڵە گەورەکانیش ڕێزیان لەو کێخوایە ناوە و ئەمریشی جێبەجێ کراوە، ئەو کێخوایە ناوی کێخواخەجیج بووە، مەشوور بوو بە خەجێ عەباسی، لە بنەماڵەی عەباسان بوو. دەکرێت باسی شتێك بکەم لەشێخ وەسانان چەندان بنەماڵەی گەورەی لێ بووە، کەس نەوێراوە لە خار

حەمەد بدات، لەترسی ریش سپیان بڕیاریان دابوو حەمەد تاقانەیە و بێ کەسە، ئەو دەیتوانی ـە خەلکی بدات کەس بۆی نییە لە حەمەد بدات.

بەداخەوە، لەو ڕۆژگارە کەخۆیان بە رۆشنبیر و مسەقەف دەزانن ڕەچاوی بێکەس و فەقیر و هەتیوی ناکرێت، دیارە لەکاتی مازی چنین لەگەڵ مار شتی سەیر روویداوە. لە ناوچەی ئێمە ـەر جۆری مارمان هەیە، وەك: ماری( کۆرەوەبیاب)مارێکی قوتەیە و گەورەیە، لە جوڵە ـەرمونیانە، زۆر مەترسیدارە، ماری(شینی گانگێو) واتە بەگاجووتیش وەبدات نەجاتی نابێت، ئەو جۆرەیان زۆر جار پەلاماری مرۆڤ دەدات بەبێ هۆ، جۆرێکی تر بۆرەی (مل باریکە) ئەوەشیان مەترسیدارە. جۆرێکی تر بۆرەی (مل ئەستور)ە، سەرپانە، ئەوەشیان مەترسیدارە، جۆرێکی تر مارێکی زەردی باریکە، زۆر تیژڕەوە ئەوەشیان پەلاماری مرۆڤ دەدات. جۆرێکی تریان ڕەشی دێزەیە ئەوەشیان مەترسیدارە، جۆرێکی تر (ڕەشی بنزگ سۆر)ە، جێی مەترسی نییە. مارێکی ترمان هەیە ڕەنگاورەنگە باریکە، لە ناو شاخ دەژی مەترسی نییە. دیارە لە دارستان مار زۆرە. مازی چنینیش لە دارستانی چڕوپڕە، زۆر جار مار پێوەدان رووی داوە، لەکاتی مازی چنین یان ـەکاتی رۆیشتن، یان مارەکە لە سەردار بووە، یان لە کونەدار دابووە نموونەی مام حەمەدی کوڕی کێخوا حەوێزی شێخ وەسانان بەسەردار دەکەوێت دەست لەسەر کونەدار دادەنێت مار پێوەی دەدات، دوایی بەکاریگەری پێوەدانی مار کۆچی دوای دەکات. یان نموونەی شەهید فەتحوڵڵا بالیسانی ناوبراو پیاوێکی تێکۆشەر و بەرێز و خانەدان بووە، لەچیای ڕەش مار پەلاماری دەداو شەهیدی دەکات، وەزۆر جار لە کوردەواری و ناوچەکەشمان کە مار بە پەنجەی کەسێکی وەدابا کەسی ئازا پەنجەی خۆیان بە داس قرتاندووە.

پەیوەندی مرۆڤ و باڵداران لەسەر دیتنەوەی مار، من و خەلکێکی یەکجار زۆرئەوەی لەلادێ ژیابێت ئەو شاهیدیە دەدەین، کە باڵداران بە گشتی و کێشکەی ماڵان بەتایبەتی، لە کاتی دیتنی مار بەجوڵەو بارەفڕکە و بەجریوە جریو بانگی مرۆڤ دەکەن، دەڵێن: وەرە کاکی مرۆڤ دووژمنێکی ئێمە و ئێوە لێرەیە، بیکوژن . من بەدەیان مارم بەو شێوە کوشتووە" کە باڵداران بانگیان کردوومە بە تایبەتی بەهاران مارەکان هەولێ دەدەن بەچکە کێشکە بخۆن.

شێخ وەسانان وەك دەولچەتێکی سەربەخۆ دەژیا" خاوەنی کۆمەڵێ یاسای تایبەت بە خۆیان بوون" وەك دانانی( قەرەغەچی)کەلە سەرەوە ئاماژەم پێدا، قەرەخەچی دووکاری لێك جیان، یەکیان تایبەت بوو بە مازیان، کەس بۆی نەبوو مازیان بکات تاکوو کاتی خۆی نەبێت، دووەمیان

تایبەت بوو بە چاودێری تاژەڵە خۆماڕییەکان، بۆ ئەوەی زیان لە ڕەزوباغی جووتیاران نەدەن، لە هەمان کات کەس بۆی نەبوو داری کرۆسك ودارەبەن و داری گێوژ، داری مازوو ببڕێ، دیارە ڕەحمان شێخ وەسانی دەوری هەبوو لە جێبەجێکردنی ئەو قانونانە. مام ڕەحمان ناوەناوە داتە سەر ڕێی دارکەران، ئەوەی داری مازوو کرۆسك و گیوژ و دارەبەنی بڕیبا، دارەکەی بۆ مزگەوت دەبرد زۆرجار لەسەر داربڕین لەگەڵ گوندەکانی دەوروبەریش کێشە دروست دەبوو...

لە کاتی تازی کەسێك یان بنەماڵەیەك بۆ ماوەی سێ ڕۆژ هەموو خەڵکی نانی دینایە مزگەوت واتە: خاوەن تازی کەمتین مەسرەفی دەکرد، لە بووك گواستنەوەش بە هەمان شێوە خەڵکی بە گشتی کەم دەرامەت بوون.

نموونەیەکی کەسێك دێنمەوە لەسەر دەستکورتی: لە گوندەکەمان تازیە دەبێت ئەو بەڕێزە بە خێزانی خۆی دەڵێت: بەیانی میوان زۆردێن برنج لێ دەنێین. وەختی (سەلە)هێنان دەبێت، (سەلە)ی هەموو خەڵکی دێت تەماشا دەکات سەلەی ئەو دیارنییە، چەند میوانیکیش چاوەڕێی (سەلە)ی ناوبراون، چونکە عادەت وابوو لەناو میوانان خەڵکی گوندی دابەش دەبوون... لە مزگەوت دێتەدەر دەڵێت: کوڕەکەی من دیارنییە کەسێك دەڵێت: وەڵڵا هات لێرە بەربووەوە شێوی لێ ڕژا، کابرا دەڵێت: پەکوو زێدە لە ڕۆژان ئەورۆ برنجیشن هەبوو!

شێخ وەسانان لە پاراستنی سنووری گوند لەگەڵ گوندەکانی دەوروبەر زۆر بە خەم بوون، زۆر جار بە زۆریەی گوندی پەلاماری گوندەکانی دەوروبەریان دەدا زۆر بە کەمی ملکەچی زۆرداری بووینە، بۆ نموونە: بە درێژایی قۆناغی دەرەبەگایەتی کەمترین باجیان داوە،لە زەمانی عەلی شەعبان تاقە گوندبووە باجی نەداوە، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە سەرباری کێشە ناوەخۆیەکان یەك دەنگ بووینە، لە بەرانبەر کێشە دەرەکیەکان،دووبنەماڵەی گەورەی لێ بووینە کە دەوری بەرچاویان هەبووە: بنەماڵەی سۆفی خدر، دواتربووبووە سۆی خدر، ئەو بنەماڵەیە پیاوی باشو بەڕێزیان هەبووە، وەك: کێخوابرایم کێخواخدر کێخوا هەمزەو شەهید ڕەسوول خدر و ڕەحمان شێخ وەسانی حاجی سلێمان و براکانی و زۆری تریش.... بنەماڵەی مامەسێنی دواتر بووەبە بنەماڵەی مستی حەوێزی دوواتربووە بنەماڵەی کێخوا حەسەن پیاوی باش و بەڕێزیان هەبووینە، وەك: مستی حەوێزی کێخواعالی کێخوا حەوێز، کێخوا فەقێ حەمەدەمینی کۆشکێ، کێخوا حەسەن، فەقێ خدر... جگە لە مام کێخوایان دەیان پیاوی بە ناوبانگی هەبووە وەك، ئەحمەدی سەلەقی، عەولای گابڕەی، فەقێ سمایل جەردیس، وەستا ڕەسوولی حەوێزی، مام وەیسی وەستا واحید

مستەفا، تەهارەش، ئەحەمەدی حاجیلە و حەمەدەمینی سمایلی: حەمەدەمین دزشاو، مستی گچکە، عەولاسۆر، سۆفی عەولا وەستا سمایل، حاجی ئەحمەد حسێن،حاجی فەقێ ئەحمەد، مستەفای تەهارەش و مەلا ئەحمەد و حەمەدەسۆر، وعومەر رەحمان و مەلاخدری حافز و خار خدر و مەلامحەمەد و مەلای رەش و مستەفای برای و خار عالی بابیی و حاجی فەقێی برای خار عالی و حاجی فەقێی ماڵی حاجیان و سۆفی مستەفا و دەیانی تر...خەڵکی شێخ وەسانان نەکاروکاسبیش زۆر ئازا بووینە و ئێستاش ئازان، یەکێك لەشتە خۆشەکانی شێخ وەسانان لە زستانان بەفر بارین وفڕێدانی لەسەر خانیان وچرۆهێنانەوە بەپشتێ و کە بەفر زۆر دەباری بەوڵاغ ئەوکارە ناکرا دەبووایە چرۆ بەپشت بێننەوە بۆ بزن و مەڕ خەڵکی زۆر بەشدار دەبوو، چونکە دەیانزانی کە گەڕانەوە، دزینێکی باشی و گەرم وپڕ لە روونی خۆماری دەخۆن.شەوانی زستان چیرۆکەوان هەبوون چیرۆکی سەیر و سەمەرەو پڕ لە ترس دەگوتران، ئەوکات لە ناوەرۆکی چیرۆکەکان زۆر باسی چین و ماچین دەکرا، لە قەسر و باغ و گوڵ و گوڵزار کە ئەو شتانە لەلای ئێمە خەیاڵ بوون. زۆربەی چیرۆکەکان دێو و ئەحمەدی تێدا بوون. دێوی رەش و دێوی سپی هەبوون، ئاشق وئا شقایەتی تێد بوو، لە فیلمی ئێستا زۆر خۆشتر بوون، شەوچەرە هەبوو مێوژ و قەزوان و چەقەلەو گوێز شتێك هەبوو پیان دەوت(خەمیس) خەمیس خواردنێکی زۆر خۆش بوو، وزەبەخش بوو، زۆریش بەهێزبوو، ئەگەر سەت غەرامێك خورابا هەستت بەهێزێکی زۆر دەکرد، پێك هاتەی خمیس مێوژ و تاوك و قەزوان و کاکڵە چەقەلە و کاکڵە گوێز و هەموویان پێکەوە دەکوتران( دەجونی دا)، ئەوە دەبووە خەمیس، لە زۆربەی گوندەکان لە دۆڵی بالیسان رەزی تریان هەبوون، جا زۆر یان کەم،خەڵکی شێخ وەسانان زیاتر لە گوندەکان پشتیان بە رەزی دێمەکار دەبەست بەهۆی کەمی ئاو لەگوندەکە چونە ناو رەزان تایبەتمەندیی خۆی هەبوو، بەیانیان بە هەموو پێداوستیەوە هەرکەسەو سواری کەری خۆ دەبوو، ئەوەی جوتوگاشی هەبوون، دەی دانەپێشەخۆ و بەوبەیانییە جوڵەیەکی زۆر بەناوگوندی دیار بوو، وەك ئەوە وابوو بچنەتاجیری، لەسێ چوار لاوە قافڵە دەکەوتنە رێ ماندونەبوون لە یەکتر و چاك وچۆنی بەردەوام بوو.لاوان بە رێوە حەیران و گۆرانیان دەوت، هەر لەسەر پشتێ کەرێ چیسەکەیان دینا دەرێ و جگەرەکیان تێ دەکرد، بەوبەیانیە دەنگی خەڵکی و چێڵ وبارەبارِی کار و بەرخو زرە زرِی کەران و راوەستە وهاتم و بەجیم مێرە و گیات بردیە و خۆ شەکروچات لەبیر نەکردیە و هەندێك توتنێ دەچیسەکەی کە، کورە هۆ حەمەد ئەدی قەول نەبوو بێیە ئاری من؟ وەڵڵاپێم نەکرا. کچێ هۆ عەیشێ وەرە

سواری کەریّ بەو ئەنگۆ برۆن ئەمن هاتم، ماندی نەبن. ئەوە ئەچنە کێندەر؟ ئەچینە ڕەزی بنگەرویّ، ئۆعەوەرە..هەچە بابێمن. نیوڕانی وەرە کنەمە. لۆنانی باشە ئەگەرمیوانم نەهاتن دێم. قادر زۆرت مایە؟ نەوەڵلا دووڕێزەم ماینە کەلێبوومەوە دێمە ئاری نگۆ ...ئەگەریزانی بوارە کانییّ کنەنگۆ ئاوتێدامایە؟ ئەدی برا تاجۆزەردان ئەمینیّ ...... ئەو قسانە و هەزاران قسەی تر دەکرا، ئەو کاتەی من لەبیرمە بەشێك لەپیاوە بە ساڵاچووەکان توتنیان بە باسقەننە دەکێشا.باسقەننە واتە( قنەو دارجگەرە ) کە بەیەکەوە بەسیلمە گرێدەدران و هەڵدەگیان. لەو سەفەرە خوشکانیش بەشدار دەبوون هەرکەسە و دەچووە ناو ڕەزی خۆی، پێش هەر شتێك ئاگر هەردەکرا و چا لێ دەندرا، ئەوکات دەست بەکاردەکرا وەکوو برینی ڕەز، یان کێلانی یان بەرژین کردن، دەبووە هۆ هۆی جووتیاران لەسەرە هۆبان جووتیارەکان پڕ بەدەنگی خۆیان سەڵەواتیان لیّ دەدا وەك:

ئۆ وەرە لەویّ سەری، هەزار سەلەوات لە پێغەمبەری

یان ئۆعە وەرەوە دەبەرملانت مرم بەرخێمن

یان ئۆعە وەرە، پشتیّ پشتیّ

یان دەگوترا مەرس مەرس بەخورامی ملانت بم مەرس: ئەوشوێنانەیە کە دەکەوێتەپشت بەردو دار وقوڕنە .

گۆرانی و سەلاوات لێدان و دەنگی بولبولان و دەنگی کەوان تیکەڵ دەبوو. لەو وەرزە ماکە و خۆی لەنێرەکەوبزر دەکات، بە مەبەستی هێلکەکردن نێرەکە و کەوچاوی دنیا نابینیّ و هەست بەترس ناکات ئاگای لەخۆ نییە لەبەرخانمیّ لەوبەرد بازدەداتە سەرئەو بەرد خەریکی خوێندنە خۆی بەپاشای دارستان دەزانی، ئەو جۆرە سەلاوەتانە زۆر بوون لەچیا دەنگی دەدایەوە، دوای چەند کاتژمێرێك وەختی ئەوەدات یەك دەی وت: هۆهۆ قادر وەرە پشیەکی بدیّ و چایەکی بخۆوە. یان هۆ فلان وەرە ئێکیّ تیکە، واتە وەرە جگەریەك بکێشە وەختی نانخواردنی نیوەڕۆش جیرانەکان یەکتریان داوەت دەکرد، بەشێك لە خواردنەکانی ناوڕەزان: ماست، هێلکە، ساوار پیواز ترشۆکە، کەلەناو ڕەزان هەبوون، ئەوە باسی چاش ناکرێت، بەردەوام هەبووە، لە بە هاران دەیان کانی لە دەورووبەری ڕەزان هەیە پێیان دەڵێن (بواراو) لەکاتی بانگدان چەندان بانگ دەدرا دوای نوێژکردن دەستدەکرایەوە بەکار کردن، لە عەسر وردەوردە خەلکی بارەچیلکێك یان بارەدارێکیان دەکرد. یان دوو بەردەسیلەیان لەگەڵ خۆ دیناوە ماڵەوە، بەرێ دەکەوتن دووبارە قافلە بەرەو گوندی بەرێ دەکەوتەوە کە داتنەوە لە ڕێگاش گۆرانی و حەیران دەگوتران، لە گوندی بەزمی گەنجان دەستی

ێ دەکرد، چاوچاوانێی سەریانان و چونەسەرکانی بۆنوێژکردن، بەشکیان ئەو نوێژەیان لە حەرامزادەیی بوو، کچانیش کە دەیانزانی گەنجان گەیشتنەوە گوندی، ئەوانیش دەجوڵان بەرەو کانی چوتی بەشێك لەو کچانەش لە حەرامزادەیی بوو، زۆرجار ئاویان لەماڵەوە دەڕشت بۆ ئەوەی ێنەکانی و چاوچاوانی لەگەڵ گەنجان بکەن، زستانانی گوندی زۆر خوشە: ئێواران خوشکان مێوژە رەشیان کلك دەکردن و دواتر لەبەر ئاویان دەکردن دەبووە خۆشاو ئەوەی لە وان خۆشتر بوو، ێحتکەهەنجیر و ئەستورکە هەنجیر و لەتکە سۆرکە بوون، زۆر کەس هەرمێیان لە دێی چرۆی دادەنا ۆ زستانان، بەڕۆژیش شەرەبەفر و کەلانە لەسەر گوێز و چەقەلە و مازیان دەکرا، لەلایەن مناڵان ـ جوغجی جوغجی یاریکی خۆش بوو، چاوچاوانێی سەریانی لەنێوان کچ و کوڕان هەر باسمەکە. گەنجان ئێوارە لەسەر بانان کۆدەبوونەوە، چونکە بە رۆژ کەمتر دەکرا یەکتر ببینن و لەدەوری بۆریە سۆبە کۆدەبوونەوە بۆ چەند مەبەستێك یەکتردیتن و چاوچاوانێ لەگەڵ کچان و باسی سیاسەت و ئەو دوایانە ململانێی حیزبایەتی و پەیداکردنی زیارە و لەوبابەتە، دارقەدکردنی گەنجان و زۆرجار ئێواران گەنجەکان بە بەردەمی ئەوماڵانەدا دەڕۆیشتن کە کچیان هەبووایە، بۆ ئەوەی داکی کچەکە بانگیان بکات بۆ دار قەد کردن بۆ ئەوەی لەبەرچاوی کچەکەیان خۆ بنوێنن و خۆی لەلای داکی کچە شیرین بکات چرۆ نان وخوێراوککردنی و باحەباحی مەڕان و بارەبارِی بزنان و گێرانی خانووەکان و دووکەڵی بۆریە سۆبە و دۆشاو و ڕۆن و شلەساواری بەقەرێ و کوغجی و دۆشاو و ماشێ پڕ لەقەرێ ودۆین و داندۆك و گەنمە کوتای بەڕون وپیوازێ... زۆر خۆش بوون، ئێواران لەسەر بانی بۆنی هەموو شیوانت دەکرد، گوندانی دەوروبەرمان قسەیەکیان لەسەر ئێمە هەبوو دەیان وت: شێخ وەسانی وارێن ( زبەینان ) لە باتی بەیانیان. فرەی ماشێ لە دەنگێ قورئانێ خۆشترە، جووتیاران بەو فەسڵە سەردانی خار عەلی یان دەکرد وەك تراشینی ئامۆر و رێك خستنی مژانە و کەرستەی جووتیاری...بە گەنج و مناڵەوە بەری پڕبوون لە مێوژو قەزوان ئەوکات گوڵەبەڕۆژە ناخورا، ناوەناوە نیشانەیەکیان دەستنیشان دەکرد، بەتایبەتی جلیتێك لەبەرانبەر گوندی دروست دەبوو، تاجلیت دەشکا، تەقە بەردەوام دەبوو، گوندەکانی دەوروبەرمان قسەیەکیان هەبوو ئەیان وت: ئەگەر حەشر بە زستانان بکرێت ئەوە شێخ وەسانی لەپێش هەمووکەس دەچنە بەهەشتێ، بەهاوین حەشر بکرێت ئەوە شێخ وەسانی لەدوای هەمووکەسن! شێخ وەسانی بەزستان لەوپەڕی بەدینیدا بوون زۆربەی نوێژەکان بە جەماعەت دەکران، ئێوارەی هەینی مەلاخدر و یەکێکی تر بەجوتە چەندان سەڵاوەتیان لێ دەدا و نیشانەی ئەوەبوو بەیانی هەینییە دواتر بانگ دەدرا شەوانی

**هەینی مزگەوت غرمەی دات لە زکرو تەهلیل، بە هاوینان وانەبوو خەڵکی کەمتر لەگوندی دەبوون.**

**ڕۆژێکیان هاوین دەبێت ئەوکاتی واباو بوو ئەگەر چل کەس تەواو نەبێت جومعە بەبەرناکەوێت سی و نۆ کەس ئامادەدەبن، کەسکیان کەم دەبێت لەوکات کەسێك بەناوی مام عەولا ناسراو بوو بە عەولاشین، بەلایاندا دەڕوات دەڵێن: مام عەولا وەرە بە تۆ جومعە تەواو دەبێت، دەڵێت: بەمن تەواو دەبێت؟ دەڵێن بەڵێ . دەڵێت دەوەللا نایێم.**

*** *** ***

**پیاوێکمان هەبوو ڕۆژانەپرسیاری زستانی لێ دەکرا، ئەویش ناوی خار خدر بوو، ناسراو بە خدری خەجیجێ. ئەو پیاوە سەری لە هەموو وەرزەکان دەردەچوو لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا کۆمەڵێك شاخ و لوتکەی لەگەڵ بنەدار دەست نیشان کردبوو، یان ئەویش لە کەسانی پێش خۆی وەرگرت بوو، بست بە بست لەڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا ناوی تایبەتی هەبوو، بەوە دەیتوانی هەموو فەسلەکان بزانێت، چلەی زستان چل ڕۆژە، دابەش کراوە بە: پیت و پارۆس و مێرەم و ئۆغەن و خدرو لاس، سەرەتای پیتێ ساڵ ئارۆز دەبێت، واتە زستان بەرەو سەختی دەچێت:**

**پیت وپارۆس**

**ساڵ بوو ئارۆز**

**ئەگەر لە پیتێ بباری ئەوە ساڵەکەخۆش دەبێت**

**پیتێ پیت کرد**

**سارێ فیت کرد!**

**ئەگەر لەمێرەمێ بەفر باری لە ئۆغەنێ خۆش دەبێت:**

**مێرەم ئەبێنێ**

**ئۆغەن ئەشکێنێ**

**لە خدر ولا س سەرما وردە وردە بەرەو کەمی دەچێت کە خدر ولاس تەواو بوو دەڵێن:**

**خدرو لاس**

**ساربوو خەلاس!**

دیارە بەنەمانی خدرو لاس . چلەی زستان کۆتایی دێت ڕۆژ گەرم دەبن. دیارە لە خۆشناوتی لە زۆربەی گوندان کەشناس و وەرزناسەکان هەبوون، پیاوی زۆرزیرەکیش هەبووینە. سەرپشکی گوندانیش گوندی( گڕاو بووە) زۆر بەتواناببووینە خەڵکی گوندی گڕاو لە وەرزناسین وەلەگوندی کانی بەردی خۆمان دوکەسی زۆر بەتوانا هە بووینە زانیتیان بەزستان و هاوین لەچکات ژمێرێك بەفر یان باران دەباریت، ئەتوانین یەك نمونە بێنینەوە مام ئەحمەدکانی بەردی کەناسراوە بەمام ئەحمر ڕۆژکیان چلەی هاوین دەبێت کەسێك خەریکی تووتن ئاودان دەبێت مام ئەحمر تەماشا دەکات کابرا توتن ئاو دەدات پێی دەڵێت براله توتنێ ئاومەدە پاشی دەمێکی دی باران دێت، بلشی لەگەڵە. توتنێت لێ خەراب دەکات، کابرا سەری سوڕ دەمینێت و باوەڕیشی بە مام ئەحمەری هەیە تەماشاش دەکات ئاسمان هیچ هەوری لەبەرنیە و چلەی هاوینیشە..ژنێکیش کە خزمی خۆیتیان گەنمی ڕاکردووە، بۆ ئەوەی وشك بێتەوە بە ژنەکە دەڵێت: بڕۆ گەنمی خۆت ببەوە ژووری، با لێت تەڕ نەبێ، دوای کاتژمێرێك هەور پەیدادەبێت و بارانێکی زۆر دەباریت. ئەو چیۆکانە یەکجار زۆرن، کە پێشبینی بەفر و بارانیان کردووە، ناکرێت هەموویان بنووسین، دیارە مام ئەحمەر ئەو زانیارانیەی لەباوکی فێربووەو گەشەی پێ داوە.

*** *** ***

لەپیت و پارۆسێ بەفر داخوازی (گوێزبەلە) دەکات ... بەفر نوێنەرێك لەسەر مستەوای بەرز رادەسپێرێت بۆ لای گوێزبەلە، کە مێردی پێ بکات، نوێنەر دەچێت و دوای چاك و چۆنی بە گوێزبەلە دەڵێت: من بەئەمری بەفر هاتووم ئەیەوێت شووی پێ بکەی، گوێزبەلە لە حاڵەتی مت بوون دایە ، دەڵێت: قاسید من بێتوانام، تاقەتی مێردکردنم نییە جارێ، ئەگەر بەرەو باشی چووم وەلامی بەفر دەدەمەوە، لەکۆتایی مانگی دوو گوێزبەلە چەکەرە دەکات و حەزی لە مێردکردن دەبێت، دەچێتە لای بەفر دەڵێت: قوربان من ئامادەم ئێستا مێردت پێ بکەم و لە خزمەتت دام، بەفر دەڵێت:

گوێزبەلێ کورکنێ
چۆرچۆڕەم کەتیتە بنێ
نەم ماوە حاری ژنێ

ئەوکاتە ڕۆژ درێژ دەبێت و ئەرزیش گەرم دەبێت بەفر بەرەو نەمانە کورد دەڵێت:

لەئاداریٚ بەفربباریٚ

تاگویێ داریٚ

نامینیٚ تا هێواریٚ.

ئاداریٚ دۆلە داریٚ

لێرەنا لە شەنگاریٚ

هەژدەی ئاداریٚ

مەگرە لەبواریٚ . واتەساڵی واهەیە بەهار درواەدەکەوێت .

لەو کاتەی بەهار لەوپەڕی خۆنواندن دایە شاخێکمان هەیە پێی دەڵێن:(ڕاز و شۆپە)جوانترین شاخە لە کوردستان، بەتایبەتی بەهاران، ئەوشاخە دەوڵەمەندە بە ڕێواس و کوارگ و کاردی و لوش و سۆریازە و زۆر شتی تر ..بەیانیان لەگەڵ مەلابانگدان خەڵکی گوندی بە هەردوو رەگەزەوە روویان لەو چیایە دە کرد، قاسپە قاسپی کەو بولبوول قیژەقیژی قەلەبەرخۆرۆرە و شۆڕشوڕی ئاو ودەنگی قاژەو قوغە قوغی قەلەڕەش و چریکەی بازو قاقای کوڕو کچ و وشەی هەلۆ و دەنگی دارەشان و باعەباعی بزنان و کارۆکان و گۆرانی و حەیران و حیرانۆك و بەلۆرە وغەنمەی باران و تەڕکردنی سنگ وبەرۆکی کچان تێکەڵی یەکتر دەبوون... باسی دەست لە ملانی کوڕ و کچانیش هەرمەکە.. ئێستا ئەورۆژگارە بووەتە خەیاڵ و پێم وایە دووبارە نابێتەوە و نا گەڕێتەوە... هەزار پارکی سەردەمی ئێستای بەقوربان بێت، دیارە گیاوگۆلەکانیش کە بۆ خواردن دەشیان وەك رێواس، گوارگ- قارچك، لوش، سۆریازە، هەندرێشە کەنگر لوشەبرا . ترشۆکە و نێرکەشوان زۆرشتی تر، لوتکە شاخێك هەیە پێی دەڵێن: کەپکی حاجی شایەر گوایە حاجی شایەر لەسەر ئەو لوتکەیە گۆرانی گوتووە، لەو بەهارە جوان و رەنگینە لە کاتی چونە رێواسان کەسێکی تر ڕکەبەری بووە و وەك ئەویش وەستا نەبووە، لە گۆرانی دانان بە دزی بۆی چوە و لەشاخی فڕێداوە، ئایا کابرای لە شاخی فرێ دراوە، حاجی قادری شیخ وەسانانی شاعیر بووە یان کەسێکی تر نەزاندراوە. وردە وردە بەهار کامڵ دەبوو، رۆژان ئێواران خەڵکی دەچووە توو خواردن لە توانیش تووەسۆر زۆر خۆشبوون، وەختی تووان کلۆ زۆر دەبوون، زۆربەی بەهاران چۆلەکەیەك بە ڕێژەیەکی زۆر سەردانی ناوچەی خۆشناوەتییان دەکرد، بەناوی: ( خەزایی) لە قەبارە وەك رەشوێرە وایە، رەنگی بەرە و بۆزی دەچێ، ئەو چۆلەکەیە هەر لە بەیانی کلۆ دەخوات تا ئێوارە زۆر سەیرە قەت تێر ناخوات، لەلایەن جووتیاران زۆر پیرۆزە. ئەگەر بەرانی بەهار بە ڕێژەیەکی زۆر لێی

ئلیان جووتیاران دەچوون ئەوانەی دەکەوتن دەیان هێنانەوە ماڵەوە و گەرمیان دەکردنەوە و دوواتر نۆزادیان دەکردن، ماوەی چەند ساڵێکە ئەو خەزایانە دیارنین هۆیەکەی چییە؟ من نازانم، وردە وردە وەختی گیا دروین دات و بە دووشێوە گیایان وشك دەکردەوە، بە ڕیسی و باقە ریسی گیا بلەدراو لەبەر یەك تێك هەڵکێش دەکرا، لەبەر ڕۆژ ڕایان دەکرد، ناوەناوە وەریان دەگێڕا تا وشك دەبوو. ئەوکات و ساتوەختی کورە دەرکردنی مێشەهەنگ دەستی پێ دەکرد، ئەوانەی مێشیان هەبوون ماوەیەك بەو کارە خەریك دەبوون. یەکێ لەشتە خۆشەکانی گوندی شێخ وەسانان ڕۆژانی جەژن بوو، ئەوکات زۆربەی ساڵان پێش جەژن جلکوپێلاو بۆ منداڵان دەکرا، خۆشترین ڕۆژ ڕۆژی جەژن بوو، لەبەیانی زوو نان دەخورا، زۆرجار برنج لەزۆربەی ماڵان ڕۆژی جەژن برینج هەبوو، بەشێکی زۆر ئەو ڕۆژەش برینجیان نەبوو، ئێمە برینجمان هەبوو، هۆیەکەش ماڵی خارم لە گوندی باشوورە بوون، ئەو گوندانەی دەشتی هەریر برنجی خۆماریان دەکرد، برینجێکی زۆر بەتامبوو، باوەڕبکەن بەشێکی خۆشی جەژن بۆ منداڵان برینج وگۆشت بوو، برینج وگۆشتیش بەیانیان ئامادە دەکرا، پیاوان کە لە نوێژی جەژن داتنەوە، نانیان دەخوارد، دوواتر بەماڵان دەگەڕان بۆ گەردەن ئازای و گەنجان بە کیژ وکوڕەوە یان ئەوانەی شووشیان کردبوو ئەوانەی ژنیشیان هێنابوو، تەواوی منداڵان لە تەمەنی جۆراوجۆر ناوگۆڕستانی شێخ برایم زەردوسۆر دەکرا، گروپ گروپ دابەش دەبوون دارەدلامەیان هەڵدەخستن، ئەوەی مەترسی تێك چونیشی هەبایە، بەیانی ئاوی سماقی دەخواردەوە، دەست دەکرا بە گۆرانی گوتن هەر گروپێك لەئاوازێك لە هەردوو سەری دارەدلامە دەبووایە دوو کەسی بەهێزبن و شارەزایشی دەویست، ئیتر فرسەتێك بوو بۆ راوە کوڕ و راوەکیژ، ئەوگۆرانیانە دەوتران کە ئاوازەکەی لەگەڵ دارەدلامە دەگونجا، وەك :

ڕەشەڕەیحانێ بنی لە گۆمە
یارێکم هەیە لەچەشنی خۆمە
ئەوسار حەفت سارە پاوانم کردی
کە لۆ من نەبووی وەم زانی مردی

...............................

ڕەشەڕەیحانێ خۆمی پێ ڕەشکەم
لە دوای باڵای تۆ دڵ بەکێ خۆشکەم؟

...............................

**بە دارێم وەکەن بەدارە بەنێ**
**بم سوتێنن ئاگرم بەردەنێ**
**ئەگەر نەسووتام چاو جوانێم دەنێ**
**بە دارێم وەکەن بەدار جۆخینی**
**باسکانم بەستن بە وێ دۆخینێ**
**قۆریەوسەماوەر سۆر بوون لەخوینێ**
**چخوشکم نینە بیدەم لەوخوینێ**

**.................................**

**مانگەشەو خۆشە دەی دا لەبانی**
**ماچکردن خۆشە ڕان لەسەر ڕانی**
**ڕەشەڕەیحانێ لە پەنا گردی**
**بە خۆم لێرانە و یار لەغەریبی .............هتد.**

**تاکو مەلا بانگی نیوەڕۆی دەدا ئیتر بەرەو ماڵەوە بەپەلەپەل نان دەخوراو گۆڕستان خۆت بگرەو هاتین.**

**وردە وردە جۆ دروین و گەنم دروێن دەستی پێ دەکرد دەیان وت:**

**جۆ دەڵێت:**

**بەمووس بم درون**

**گەنم دەڵێت :**

**بەگۆپار بم droون**

**واتە جۆ ئەگەر بەتەڕی نەی دروی، زۆر هەر دەوەرێ واتە بە کەرستەیەکی تیژ بم درون، گەنم هەرچەندی وشك بێت باشتر قەڵە و دەبێت، دروینیشی ئاسان ترە، وای لێ بێت بە گۆپاڵ دروێن بکرێت. چەند نموونەیەك لە گۆڕانی گەنم دروین دێنینەوە:**

**هەدارە دارە دارە** | **بێراییەکت لۆ دەکەم**
**دارلە داران هەر بردی** | **بێراییەکی سەرشۆرە**
**سینگت تەختەو ڕەوڕەوە** | **لە ریشی قەرەپۆشینێ**
**وەستاکاران تێك بردی** | **لە وردەخاڵان بنۆڕە**

ئەگەر ئەتو دۆستێ منی
ببیە گەورەی سووورداشی

نیشانەم پێ وەگۆڕە
ئەوحەسوودیەت پێ دەبەم

نیشانەچ نیشانە
لەگەڵ گولەی وەرداشی

هەینۆك و كلدانە
بەژنۆكەت دارە دارە

لەكن كیژان هەرزانە
داری دەم جۆگەو ئاوان

لەكن كوڕان گرانە
حەسوودیانت پێ نابەم

.... .... ....
ببیە میری خۆشناوان

بێرایەكت لۆ دەكەم
ئەو حەسوودیەت پێ دەبەم

لەبێرایەی مەزنە
لۆ گولەی رەش دەكەی چاوان

مەحبووبەك دانیشتییە
بە ژنەكەت دارە دارە

لانكێ بەپێی دەژەنێ
دارێ شیوێ شێخانێ

لایەلایەی بۆ دەكات
سەر كەدی هاتینە خوارێ

ناوی خوای لەگەر دینی
لۆ تو دەكەم جۆلانێ

بە ژنۆكەی دارە دارە
بە رۆژێ خەنجەرم لۆدێن

داری دەم جۆگەو ئاشی
بەشەوێ گولەم لۆدێنە خوارێ

حەسوودیانت پێ نابەم

-----------------

گۆرانیەكی تری گەنم درووێن:

هەی لەیلم لەیلم
لەیلم ناز مەكە

لەیلم ناز مەكە
شەمامەی خار خار

شەمامەی خار خار
تەرحی نێرگزە

تەرحی لیمۆیێ
بەدیاریم لۆهات

بەدیاریم لۆ هات
لەلای رواندزە

لەشاری كۆیێ

هەلەیلم لەیلم

**ئەوەشیان گۆرانیەکی شاییە:**

هەمینێ کراس تەنکۆکە
تێم رادێت مەمکۆکە
ئەوشایەی دای دەبەستم
هەر کیژێ نێتە دەستم
سەت بەندی پێ هەڵ دەبەستم
بەند لەبەندێ خۆشتربێ
خونچە لەگوڵان جوانتر بێ
ئەوا لەشایی دامە و
هەمینم لەدەستی دایە

ئەمن خەمی خۆم نیە
گولەی لەدیار وەستایە
گولە خێرێ لەخۆ نەبینی
هەمینم زەوق نەمایە
جوانێ لۆنایە شایێ
شایم لەبەرخاتری تۆیە
کارمامزێ لەخرەبەردێ
دەخوات گوفکێ هێرۆیە

..............................

لەدوای هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری عوسمانی سەربازێکی زۆری کورد گەڕانەوە بە ماڵ ومنداڵی خۆیان شاد بوونەوە یەکێك لەوان( مام وەیسی ) شێخ وەسانی بوو، مام وەیسی لە وێ بووبووە وەستایەکی کارامە، واتە: لە ڕووسیا کە زیاتر لە دەساڵ لەوێ بووە دوای ماوەیەك کە تورکەکان هەرەس دێنن، سەربازە دیلەکانی تورکان ئازاد دەکەن، مام وەیسیش یەکێك بووە لەو سەدان هەزار سەربازانەی ئازاد کراون، لەلایەن ڕووسەکان دواتر مام وەیسی ژن دێنێت و دەبێتە باوکی چەند منداڵێك غوربەتی وڵاتی خۆی وازی لێ نایەنێت و دەگەڕێتەوە منداڵەکانی بەجێ دێڵێت وردە وردە بە سوود وەرگرتن لە ئەستێران دەگەڕێتەوە دیارە کەمتر وێراوە بە ڕۆژ ڕێ بکات لەبەر دز و ڕێگر، چونکە ڕێژەیەکی باش لیەی زۆری پاشەکەوت کردبوون، دیارە پێشتر خانووەکانی ناوچەکەی ئێمە بەشی زۆری بە ئەستوندە بووە و جیاوازی نێوان ئاژەڵ و مرۆڤ پەرژین بووە. ناهەقیش نەبووینە تا حکومڕانی تورکان بووە لەبەر باج وسەران نەپرژاینە سەر خۆش گوزەران، مام وەیسی بە هاتنەوەی خانووەکانی ناوچەکە دەگۆڕێ بەشێوەیەکی هەندەسی دەیان کاتە دووقات، خوارەوە بۆ ئاژەڵ و سەرەوە بۆ مرۆڤ، گۆڕانێکی گەورەبووە لەو سەردەمە بۆ پاك و خاوێنی و دەیان شاگردی کردووە بە وەستا وای لێ هاتبوو لەهەموو خۆشناوەتی و دەوروبەر خەڵکی لە شێخ وەسانان وەستایان دەبرد بە مەبەستی خانوو دروست کردن، خانوودروست کردن بەلاێکی گەورە بوو، لەو سەردەم ئەگەرکەسێك خانی دروست کردبا ئەو ساڵە دادەبڕا لەکاسیی

واتە نەی دەتوانی کارێکی تر بکات، زۆرجار لەبەهار دەست بەخانوو دەکرا پایزێکی درەنگ کۆتایی دات... هۆیەکانی ئەوکەسەی خانووی دروست دەکرد دەبووایە کەرستەپەیدا بکات وەك سەردەر، سەر پەنجەرە، داری تایبەتی دەویست و دەبووایە بتراشێن ئامادەبکرێن، گورگە سواندەی خانووی لەسەر دەوەستیێ، دەبووایە ڕێژەیەکی باش گورگە پەیدا بکات... قیسپ بەلاّیەکی گەورە بوو ڕێژەیەکی زۆری دەویست، بەرد هێنان، دەبووایە بەردەکان کلك و گوێ کرابان لە چیا بەکەر و بەبەرد کێش دەگوازرانەوە، هەرجارێ لە نێوان شەش بەرد بۆ هەشت بەرد دەگوازرانەوە.. چەندان ڕۆژی دەویست ئەوکارە دواتر پەیداکردنی بەردەسیلە کە ئەرکێکی دژوار و پڕ ئەزیەتە بەردەکان دەبووایە، لەنێوان پەنجا سانتیم و کەمتر نەبانە لە هەموو قوڕنەکان لە هەر ڕێزەیەك دوو بەردەسیلەی دەویست دوواتر خشت برین، پەیداکردنی کاو و زۆرجارخۆڵ هێنان بەپشتی کەرێ و ئاوکێشان و قوڕگرتنەوە و برینی خشت کارێکی قوڕس بوو، بەتایبەتی ئەوکەسە ئەگەر دەست کورت بایە ڕاستە هاوکاری دەکرا، بەلاّم هاوکاری دیاری کراو بوو..پەیداکردنی وەستاو کرێکار و دواتر دارەڕێ و قیسپ هاویشتن دەبووایە چەندان بارەچرووش هاتبان‌دوای هەمووشتەکان شەرێکیان لەلایەن خەڵکی هەرەوەزی بۆ دەکراو خۆرەبان(خۆڵەبان) دەکرا، لەخۆرەبانیش دەبووە هەرا ململانێ دروست دەبوو ئەوکەسەی جەواری دەگرتەوە، یان گونیە ئەگەر زۆری پڕکردبان ئەوە لەسەریان بە جەواری بەتاڵ لەو کەسە دەدرا ئەو کارەپایزان دەکرا، زۆرتر بە مانگەشەوان دوای خۆرەبان ترێ دابەش دەکرا، تاکو تێر دەبوون، دواتر دەبووە شەڕەترێ، بەراستی خۆش بوو.

دوای خۆرەبان نۆرەی مارنجکردن دەهات، دەبووایە دەیان بارەخۆر بێنی لەدووری گوندی لەجۆری خاکی سپی دواتر لەسەرەد کردن و شێلان ودواتر بەکارهێنانی ئەوەی باسم کرد، بەقسە ئاسانە کە خانوو تەواو دەبوو قوربانییێکی بۆ دەکرا و خوێنی ئەو ئاژەڵە لەسەردەری خانوو دەدرا. من پێم وایە ئەو قوربانیە بۆ چاووزار بوو، واتە بۆ چاوپیس و دەم پیسەکان، چونکە خەڵکی ئێمە لەچاووزار دەترسا. مام وەیسی زۆر بەناوبانگ بووە تووڕکی و ڕووسی زۆر باش زانیوە، پیاوێکی زۆر ئازاش بووە، لە کاتی عوسمانیەکان مام وەیسی تەتەر دەبێت، بە کەرێ ڕۆژکیان لە دۆڵێك دەبینێت پێنج ڕێگر خەریکن کاروانێکی بازرگان رووت دەکەن، مام وەیسی دەنگیان دەداو لەبەریان دادەنیشێت، پێنج کەس دەبن چواریان دەکوژێت، یەکیان بە بریندازی ڕادەکات، بازرگانەکان پەلاماری مام وەیسی دەدەن و ماچی دەکەن کەلوپەلێکی زۆری پێشکەش دەکەن، دواتر لەلایەن دەوڵەتەوە بە چەندان مەدالیەی ئازایەتی، خەلاّت کراوە پێم وایە لەساڵی

**(١٩٧٢) مرد، هەزار رەحمەت لەگۆڕی. ( پیاو ئەوپیاوەیە هونەرێك بنوێنێ، ناوبانگی پارە نامێنێ.)**

**وابزانم ساڵی (١٩٧٢) بوو بڕیارێك دەرچوو که پێشمەرگەکان پەروەردە بکرێن بە شێوەیەکی زانستی سەربازی، فەوج بکرێنەوە بەناوی (حەرەس حدوود) لەو فەوجانە یەکیان لە بالیسان کرایەوە زەوی کرا و ناو نووسین دەستی پێ کرد، ئیدارەی فەوج رێك خرا گۆڕەپانی مەشق دروست کرا، کەسێکی شارەزا داندرا بوو بەناوی ( عەریف سالح مەرگەیی )پیاوێکی شارەزا و گورج و گۆڵ بوو، ئاگاداری سەربازەکان دەکاتەوە بەیانی سەعات شەش ئامادە دەبن، بۆ بەیانیەکەی عەریف خدر لە زرە زرِی کەران بەخەبەردێت، کە دەچێتە دەرەوە زیاتر لە سەت کەر لە دەورو بەری فەوج بەسترایتەوە، هەر هەمووشیان دەزەڕن، عەریف خدر لە توڕەییان شێت و هاردەبێت سەربازەکان کۆ دەکاتەوە و سەیریان دەکات، هەموویان سەر بە جەمەدانین هەریکە و چیسەکەیەکی بە لا تەنیشتی دا شۆڕکردیتەوە نیو کیلۆ توتنی تێدایە! زۆریان دارجگەرەشیان لەبەر پشت داناوە، هەندێکیان خەنجەری پێیەو تەزبێحێکی لێ ئاڵاندوە برنۆیەك و دوو ڕەختەی بەستوە، هەموویان گۆری و بەلەك پێچیان لە پێیە،عەریف خدر روویان تێ دەکات و دەڵێت: براینە سەربازی وەك پێشمەرگایەتی نییە بەیانی کەس کەر لەگەڵ خۆی ناهێنێت ئەگەر هێناشتان دوور لەفەوج لە پەنایێك بیان بەستنەوە کەدێنە مەیدانی مەشق چیسەکەو خەنجەر و تزبێح و بەلەك پێچ و چەك و تەقەمەنی مەهێنن خۆ ئێمە ناچینە شەری فەلەستین شەر بکەین ئەمەپێوستیمان بەمەشقی سەربازیە، شارەزا بوون لەچەك چەندچکێکی جۆراو جۆرن پێویستە ئەویش من دابینی دەکەم ئەمرۆ برۆنەوە بەیانی بەو شێوەی من وتم دێنەوە عەریف سالح زۆر پێیان ماندوودەبێت یەکێك لە سەربازەکان بەناوی حاجی حسێن شێخ وەسانی بووە زۆرلەگەڵی هەولدەدات فیری رۆیشتن نابێت وازی لێدێنێت ئێستاش مام حاجی نازانێت جوان بروات!**

**ئەوانەی خانیان سوتابوو برە پارەیەکیان وەرگرت بەمەبەستی خان و دروست کردنەوە خەڵکی دەستیان کردەوە بە خانوو دروست کردنەوە بە شێوەیەکی هەرەوەزی لەهەمان ساڵ جادە بۆگوندی بە تەورو پێمەرە دروست کرا بە سەرپەرشتی ڕەحمان شێخ وەسانی واتە لە ساڵ( ١٩٧١) سەیارە پێی نایە شێخ وەسانان .**

لەو کاتە حەمام و ئاو دەست نەبوون هەرکەسێك شەوێ لەگەڵ خێزانی کاری شەرعیان کردبا. دەبووایە پێش مەلا بانگدان چوبانە کانی بۆ خۆ بسمیل کردن زۆرجار هەندێك لەپیاوە قسەخۆشەکان لەترسی ئاوی سارد لەجیاتی بڵێن نیەتم هەیە غوسل لەخۆم دەریکەم دەیان وت: لەنیەتی گوم خوارد! جارەکی تر کاری وا نەکەم ئەونەریتە لە زۆربەی گوندەکانی خۆشناوەتی و دەوروبەرمان هەبوو کەس شەرمی لەکەس ناکرد، بەیانیان سڕەبوو بەفریا شەختەبا کێشە نەبوو کوڕو باب سڕەیان دەگرت.

شەوان بنجیێ گەرمە

هەرامەش بێشەرمە

ناحەقیش نەبوون بە تایبەتی زستانان زۆرجار دەبووایە شەختەی کانی بشکێنن بۆ خۆ شووتن ئەو خۆشوتنە بۆ هەردوو رەگەز وابوو، نابووا نوێژی بەیانی چوبا پیاوێکمان هەبوو سەری رووت بوو بەهۆی کەچەری ئەوکات هەندێك لەپیاوەکان شەرمیان دەکرد کەس سەریان ببینی، بەیانیان کە دەچوو غوسل لەخۆی دەربکات، دەبووایە راوەستێت تاکوو سەرکانی چۆڵ دەبوو هەندێك لە گەنجان فێر ببوون بە ئەنقەست سەرکانیان بەرنادا تا تیشکی رۆژ پیدادەبوو، ئەو پیاوە نوێژی دەچوو، کوڕێکی ترمان هەبوو بەناوی جەلال ئەحەمەد، پیاوێکی زۆ گاڵتەچی بوو، خۆشەوستی هەموو گوندی بوو. کەچەریش بوو، جەلال کە دەگەیشتە ئەو کەسانەی بە ناوهێنانی کەچەری توڕەدەبوون جەلال کراو جەمەدانی لەسەری دەکردن و لەبن قۆڵی خۆی دادەنان، کەچەرەکان سەیری جەلالیان دەکرد جەمەدانی لەبن قۆڵی خۆی دادەنێت، کۆمەڵێك جوێ نیان بەجەلال دەدا، جەلالیش بەیەك وشە دەی وت: باشە من چیم کردوە کەچەرەکان بەو قسەیە زیاتر تووڕە دەبوون جوێنی زیاتریان بە جەلال دەداو باسی کەچەریشیان ناکرد، جەلال شەرمی بە کەچەری خۆنەبوو.. بەداخەوە ئەو پیاوە بەرێزە بەچەکی کیمیایی بەخۆی و خێزانی شەهید بوون، کەس لە گوندەکەمان لەگاڵتەکردن دەرەقەتی جەلال نادات چونکە قەت بە هیچ قسەیەك توڕەنابوو، دواتر شتێکیان بۆ جەلال دروست کرد لەنێوان گوندو چیا ناوەناوە گەنجەکان کۆمەڵێك بەردیان لەقەراغ رێگا کۆدەکردەوەو گوایە جەلال پەلاماری کەرێی داوە، شەهید جەلال ئەی ویست واپیشان بدات بەوکارەش توڕەنابیت بەڵام کەدەگەیشتە لای کۆمەرەبەردەکان، ئەگەر کەسی لێ دیارنەبا کۆمەڵەبەردەکانی لەوناوە نەدەهێشت گەنجەکان دووبارە دروستیان دەکردەوە، باوەڕناکەم

**لە ناو مرۆڤایەتی کەسێك وەك جەلال منداڵەکانی خۆی خۆش ویستبێت، ناوبراو ئەندامی کۆمەڵەی رەنج دەرانیش بوو.**
**لە مێژە لەناو کوردەواری کۆکردنەوەی بەرد لەقەراغ رێگاکان نیشانەی رووداوێکە!**

*** *** ***

**دیارە لە هەموو زەمانێك ئەشق و ئاشقایەتی هە بووە، لە گوندان هەرچەندە بەربەست زۆر و مەترسیدار بوون، بەڵام ئەشق گوێ بەترس نادات، لە گوندان فرسەتی ئاشقان زۆر بوون، وەك کارە هەرەوەزیەکان و دروێنەی گەنم و جۆ و چونە مازیان و قەزوانان توتن چاندن و دەستاڕلێ کردن و ساوار کوتانەوە و چوونە سەرکانی بۆ هێنانی ئاو و زۆرکاری تر.. ئەو کارانە فرسەتی چاك بوون بۆ یەکتر دیتن و دیاری کردنی شوێن و کاتی دیتن. ئەوەی بەلای من جێگای رێز بوو بە دەگمەن ئاشقایەتی ئەو کات بۆ ڕابواردن نەبووە، بەڵکوو بۆ هاوسەرایەتی بوو.**

**گاوانی لە هەموو گوندێکی کوردستان هەبوو، لە گوندەکەی ئێمە بە برێك پارەی دیاریکراو، رۆژێك نان، ڕۆژێك خێزانی گاوان یان کچی گاوان سەلەیەکی هەڵدەگرت ماڵ بەماڵ دەگەڕاو نانی گاوانی دەستاند، دەی وت: ماریٚ نانی گاوانی . کابانی ماریٚ تیٚ دەگەیو نانی دینا واتە: سەرەو نانێك وە ئەگەر چێڵ لەچیا زابا گاوان ئێوارە چێڵ و گۆلکی دینانەوە بۆ خاوەنی و کێشتانەشی هەبوو، ئەگەر چێل ئێوارە دیار نەبایە لەسەر گاوانی بوو، لەگەڵ خاوەنی لە دوای بگەڕێت تاکوو دەی دۆزێتەوە، زۆرجار کە کەسێك دەبووە گاوان چەند ساڵێك لەقەبی گاوانی پێوە دەنووسا .**

**ژنان دەچوونە سەر کانی جلکیان دەشوتن، دەبووایە هەموو ماڵێك کوتکی جلك شوتنی هەبووایە جلکیان بەلێدانی کوتك ئەشوت. من ئێستاش دەو جلك شوتنە نەگەیشتم، سەیرە لەئێران و پاکستان و هیندستانیش بەکوتك جلکیان دەشۆن ؟**

**مۆدیلێك پەیدا بووبوو دەبووایە هەموو ماڵێك دەستشۆری هەبووایە، کە نان دەخورا لە هەمان ژوور دەست دەشۆران، یان دەستنوێژی پیٚ هەردەگیرا.**

*** *** ***

**یەکێك لە پیاوە قسە خۆشەکانی ناوچەکەمان با ناوی نەبەین، گەنج دەبێت و ژنی بۆ دێنن ئێوارە باوکی پێی دەڵێت: کوڕم ئابوویە پیاو، ئەوەژنم لۆ هینای، دەهەستە نوێژەکی بکە. ناوبراو**

بلتگی بووکێ دەکات دەڵێ: مەسینە و دەست شۆرێم لۆبینە بووك مەسینەو دەست شۆر دێنی زلوا زۆر بەفیزەوە دەست و چاوی دەشوات، بووکیش ئاوی بۆ لێ دەکات زاوا قاچی بەرز دەکاتەوە بۆ سەر دەست شۆر بایکی گەورەی لێ بەر دەبێت، زۆر شەرم دەکات لە بووکێ پەلاماری خەنجەرێ دەدات دەڵێ: ئەگەر بە شێتم نەزانن قونێ دەت دەمە بەر خەنجەرانن دەم براوون ئەودەمە نەبی لە کن بووکێ حەیام ئەبەی!

هەندێك خورەوشت ئەوکات باوبوو لە گوندەکەمان و ناوچەکەش، لەوانە زۆربەی ژنان تاسیان هەبوو، هەندێکیان بەردەوام لەسەریان دەنا هەندێکیان بە مناسەبات لەسەریان دەنان بەکۆمەڵێ قوماشی ڕەنگاو ڕەنگ دەپێچرایەوە، بەسەدان دەرزی ڕەنگاوڕەنگ دەنەخشێندرا.تاس لەناو فۆلکلۆری خۆشناوەتی زۆر باو بووە.مەشوورە لەکوردستان نازدارێ سەر بەتاسێ خۆشناوان، نموونەیك دێنینەوە،

کوڕ بە هێرۆیێ هەردەڵێت:

هۆ هێرۆ لەوی تیشێ

هێرۆ هێرۆ هێرۆ

هۆ ماینێ سەر بەرِیشێ

هێرۆ هێرهێرۆ

هۆ ئام ئام هات لەناو توانە

هێرۆ هێرۆ هێرۆ

هۆ تاسی زێری لێ جوان

هێرۆ هێرۆ هێرۆ

هۆ پرچی لەسەر ملانە

هێرۆ هێرۆ هێرۆ

هێرۆ، وەڵامی کوڕ دەداتەوە دەڵێت:

هۆ من ترێی تایەفیمە

هێرۆ هێرۆ هێرۆ

هۆلەسەر بەردی سپیمە

هێرۆ هێرۆ هێرۆ

هۆ خوشکێ تفەنگ چیمە
هیرۆ هێرۆ هێرۆ
خوشکێ شێخ نەبیمە
هیرۆ هێۆ هێرۆ
شێخ نەبی برامە
هێرۆ هێرۆ هێرۆ
گەردەنی چرایە
هێرۆ هێرۆ هێرۆ
شێخ نەبی نەمایە
هێرۆ هێرۆهێرۆ
مردن ئەمری خوایە
هێرۆ هێرۆ هێرۆ
هۆ ماینێ برام زایە
هێرۆ هێرۆ هێرۆ
هۆ بەکۆتکێم ئاودایە
هێرۆ هێرۆ هرۆ
کۆتك وەرگەڕایە
هێرۆ هێرۆ هێرۆ
براژنێ لەمن دایە
هێرۆ هێرۆهێرۆ
براژنێ خوابت گری
هێرۆهێرهێرۆ
لەهەیوانێم دەنوینی
هێرۆهێرۆهێرۆ
لێفێم لێ دەستینی
هێرۆهێرۆهێرۆ

بەجلانم دەنوینی

هێرۆهێرۆهێرۆ

تاوێ مەشكێم پێ دینی

هێرۆهێرۆهێرۆ .

دووا ژن لەگوندەکەمان تاسی لەسەری دەنا ناوی پلکە (حەنیف) بوو،خێزانی مامۆستا مەلا قادر بەچەکی کیمیا بریندار بوو، دواتر شەهید بوو.

خەزێم باو بوو زۆربەی ژنان خەزێمیان هەبوو،خەزێمیش شوێنی خۆی هەیە، لە ئەدەبیاتی ئیمە وەك:

حەیران دەریم لە گۆرێ پایە (گۆرێ پای دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای گوندی شێخ وەسانان)

خەزێمی زەردە ژەنگێ لێ دایە

ئەگەر ئەنگۆ یارێمن ناس ناکەن

بێرییە و لەپێش مێگەلان دایە

زۆرلەژنانم دیوە، شەددەیان لەسەری ناوە، وەك پیاوان، دیارە ئەو ژنانە بە ڕێز و خاوەن هەیبەت بوون، وەك کورد دەڵێت: سەرەژن بوون، مامۆژنێکم هەبوو، بەناوی هەمین ئەو ژنە ئموورگێڕێکی گەورە بوو، زۆر میوان دۆست بوو قەت پرسی بەمام ناکرد لەمیوان ومێوانداری، هەموو کات میوانی هەبوون، بەرامبەر بە پیاوان شەرمی نەبوو، لە گوندەکەمان پیاوێك نەبوو جوێنی پێ نەدا، کەسیش جوێنی ئەو ژنەی پێ ناخۆش نەبوو، زۆریش دەوڵەمەند بوون، هەمووشی لە سایەی ئەوژنە بوو، یەکێك لە شتەجوانەکانی ژن و کچان بسك بوون، لوولیان دەدان، بەسەر سنگیان داداتەخوارێ، زۆرجارکچان دەستماڵیان لەسەری دەناو، بسکیان لەسەرسەری گرێ دەدا جوانی خۆی هەبوو، کەماریان دەدیت هەردوو بسکیان لە ناو دەم دەنا، گوایە مار ناتوانێت بڕوات و دەی کوژن، بسك لە ئەدەبیاتی گەلەکەمان شوێنی خۆی هەیە:

حەیران یاخوا بت گەمێ بەتاقی تەنێ

بسکانت برند کەم ماچ کەم گەردەنێ

حەفت سارە بەتەمای دوو چاوێ جوانم

چ بکەم حەیران داك و بابت نامدەنێ

کەزیش زۆر سرنج راکێش بووە و ناوی لەحەیران لاوك هاتووە، بە تایبەتی ئەو کچەی دووانزە کەزی هەببووبێ وەك:

حەیران دەرێم بتگەمێ، بەتاقی تەنێ
دەستەکت باوێمەسەر ملی ٚ بە کەزی
بەدەستی دی دەرێنم شەمامان شەمامێ باغەرێ

---------------------

پەند ێکی خۆشناوتی هەیە باسی ئەوەمان بۆ دەکات دەڵێت لە ژیاندا هەموو ئارەزووێکتان جێ بەجێ نابێت، بۆیە خەمی لێ مەخۆن گاوانی گوندی سیساوە، دەڵێت:

ئەگەر دەچمە بن تاتی نان، هەیە کوزەرەنیە!
ئەگەر دەچمە سەرتای کوزەرە هەیە نان نییە!

(بن تات) شوێنێکە لەرۆژهەڵاتی گوندی سیساوە شوێنی ڕەوەندانە.

( سەرتا ) ناوێکی کۆنە مانای نازانم کانیاوێکی گەورە بوو، ئەکرێت مانای سەرەتای کانیاوەکان بێت، تاکو گوندی بەریان سوودیان لەو ئاوە دیوە، هەندێك ئاوی ترە، کانیاوی سەرتا چەند ساڵە وشك بووە، کوزەرەی زۆر لێ بووە، لە سیساوە بە خوارەوە تاکو گوندی باشوورە، شوێن شارستانێکی کۆن هەیە، بەتایبەتی لەنێوان هەردووگوندی باشوورە، باشوورە ئەکرێت لە ئاشورا هاتبێت، یان لەئاشورییەکان ئەوناوە بەجێمابێت، ئاشورییەکان، یان سەرکردەی ئاشورییەکان، گەلێکی دڕندە و وێرانکەربووینە، بۆ ماوەیەکی زۆر حوکومڕانی کوردستان بووینە، مێژوویەکی خوێناویان هەیە، لە توانای مندا نییە بەدوایدا بچم.

*** *** ***

دیارە لەخۆشناوەتیش جوێن هەیە و لەوانەیە جوێنی تایبەتیشمان هەبێت، توك و جوێن زۆربوون ئەوەی وەبیرم ماوە:

( یارەبی ئاگر و دەمارێدا نەمێنێ،چاوبەجیقێ، سەری دەخمێ نێن... ئەگەر ژن بای ئەیاغواستی، ئەگەر ژن بای تەراق(تەڵاق) نادرای، سەرشینێ سەری دەهەشێنێی.. سەر بەڕەشك و ئەسپێ، نۆمێردان ئەکەی، بێم لێکت هەر دەزرێنم،جادووکەری، بە مەکرو حیلێ، سەربەهەشێ، گەرۆکی دووزمانی، ئاگرو دەمارێ بەربی، (.. هەرامە پانێ.... ئێ براێمنت تێ، ئی بابێ مت تێ)،

(سەرشینێ سەر بەتارێ،کێرانت کوندەت گەیاندەوە مارێ؟) واتە قسەت گەیاندەوە ماڵێ،خۆ دەبەرکەران نیی، ئەی کەرت کەویتێ، دێرەلووس چاوپانێ، ئەوە جون و توکی ژنان بوون لە ناوەخۆیان.

*** *** ***

**پیاوانیش ئەو جونانەی بەژنانیان دەدا:**

(قولابە سە، قولابەجوی ،گوو خواردن لۆت و نەهاتیە، ئەرێم مستەکت لەبەری لموزی دەم،چەقەچەقێ مەکە، ئەرێ سەیی،نوزەنوزێ تو تەواونەبوو، ئەترێ هەرسی بۆرە بۆرێ ئەکەی،داك وبابانت بەهەسپان .......م، دیارە جوینی پیاوانیش دیارن.

زۆریتریشن، داوای لێبووردن لە خوشکان دەکەم، بەڵام من زۆرجار لەدیار شەڕەژن بوومە و ئەوقسانەم گوێ لێ بووە. لێرە پێم باشە ئاماژە بەشتێك بدەم، زۆرجار گوێ بیستی گازاندەی خوشکان دەبین کە گلەیی لە توندو تیژی پیاوان دەکەن، بەرانبەر بەخوشکان . من پێم وایە بەشەکی ئەو توندو تیژیە دەبوایە خوشکان گلەیی لەخۆیان بکەن، چونکە ئەو کوڕە لە تەمەنی یەك ڕۆژی لەبەردەستی ئەوانە، تاکوو گەورە دەبێت ئەگەر دایك وشیار بوو، دەتوانێت ئەوکوڕە وا پەروەردە بکات کە گەورەبوو ڕێز لە ڕەگەزی مێینە بگرێت.

کورد دەڵێت: دار بە تەڕی دانێت، بە وشکی دەشکێت. یان کورد دەڵێت: منداڵ وەك بەچکە سەگ وایە، چۆن پەروەردەی بکەی وا دەردەچێت، واتە دایکان دەتوانن مناڵەکانیان بە نەرمونیانی پەروەردە بکەن، بۆیە تاکوو دایك دایکێکی وشیار و ڕۆشنبیر نەبێت کۆمەڵگایەکی نەرمونیانمان نابێت.

خەڵکی ئەوکات زۆر لە( لەمەچێتر )دەترسان، بەتایبەتی خوشکان، هەموو کەس نوشتەی هەبوو، نوشتە زۆر جۆری هەبوو، بۆ (چاووزار شێتی، نەخۆشی، باڵابەژن بۆ منداڵ نەمردن، بۆتاشقایەتی، زۆرجار بۆ لێککردنی کچ وکوڕ، یان ژن و مێرد بپاراستن لە مەچێتر، ژنان ئەگەر جلکی جوانیان هەبووانە دەرزییان لێ دەدا، گوایە لەمەچێتر نزیکی دەرزی نابێ.

ژنان زۆر لە(شەوە) دەترسان کە مناڵێکیان ببوایە داپیر زوو داوای قورئانێکی دەکرد، لەلای سەری ژنەکەیان دادەنا، بۆ ماوەی حەوت ڕۆژ، زۆرجار زیاتریش ژنان تۆقی بوون، لەو شەوە،

**(شەوە) چییە؟ کەس نازانێت؟ پێ دەچێ شەوە، یان ترسی شەوە لەناو مرۆڤایەتی و کورد زۆر کۆن بێت، بە وەرەسە بۆمان مابێتەوە.**

**ئەگەر ژنێك زگی هەبووایە کە مارێکیان کوشتبا بەرەو ئاسمانیان هەڵ دەدا، ئەگەر کەوتبا سەرپشت ئەوە نیشانەی وابوو ئەو ژنە کچی دەبوو، ئەگەر کەوتبا سەر زگ نیشانەی کوڕدەبوو، ئەگەر ژنێك منداڵ بوونی دوواکەوتبا لەکاتی منداڵ بوون ئەوا دەبووایە با گوردانی مزگەوتی بۆ کێل کرابایەوە؟ ئەگەر منداڵ لەکاتی جولانی لەلای سەرەوە جولەی کردبا، ئەوە نیشانەی ئەوبوو کوڕە، بەپێچەوانەشەوە.**

**دایك ئایشمان هەبوو، لەو ساڵانە مرد، خودا عافوی کات، زۆر باوەڕی بە(شێخ باوەدین) هەبوو، کە گۆڕستانێکە لە شێخ وەسانان،کە دووعای بۆ کەسێك دەکرد دەی وت: ڕۆژە مەترسێ زنجیرێ رەسوولەڵلا و شێخ باوەدینم تێك بەستینەوە، ئەو ژنە دایکی هەموو گوند بوو، بە هۆی مامانی ماوەیەك بوو خەریکی خانوو کردن بوون، ئەوەی خاوەن خێزان بوو ناوێرا هاوکارییان نەکات، لەترسی خێزانیان! چونکە دایك ئایش دکتۆری هەموو ژنانی گوندی بوو.**

**زۆرجار دەموچاوی منداڵیان بە ئەنقەست ناشوت لە ترسی چاوپیس خەتێکی بە تەنییان بە دەموچاوی منداڵەکەدا دینا، بۆ نەشیرنکردنی ئەبەر چاوی خەڵك، لەترسی چاوپیس، کورد چاوپیسی و دەمپیسی پێکەوە بەستوونەتەوە، (وەك چاووزار ) بۆ پاراستنی بەرو بوومەکانیان، لەچاووزار، کە لەسەری کەری مردوویان قەپێلکە هێلکەی بەتاریان نارەکەر هەڵ دواسرا، بۆ ئەوەی بەچاوینی نەچی، زۆرجار داری تاوکیش بەکار دات بۆ هەمان مەبەست.**

*** *** ***

**چیرۆکێك هەیە گوایە کابرایەکی مەشوور هەبووە لە چاوپیسی ڕۆژێکیان چەند کەسێك لەلای دەبن، سوارێك بۆ لایان دێت پێی دەڵێن: بە چاوان تیرێکی باوێ، ئەویش تیری خۆی داوێتێ بەچاوان، دەڵێت: سەیری کەن بەڕاستی سوارێکی باشە، کێ دەرێ سوار نەماینە ئەسپی ئەوهەم نەدیتیە، زۆر ئەو ڕستەیە دووبارە دەکاتەوە، کاریگەری نابێت.دەڵێت: برادەرینە ئەو سوارە قافی تەنگەی ئەسپی داری تاوکە، چاوی پیس کاری لێ ناکات.**

*** *** ***

**لە گوندەکەمان کەسێك هەبووە مەشوور بووە بە چاوپیس ناوی مام تەهابووە لەبنەماڵەی سۆیخدری بووە، خۆشی هەستی پێ کردوە زۆرجار لەگەڵ ڕاوچیان بەبێ چەك چوویتە ڕاوێ! ئەو**

بەچاوان ڕاوی خۆی کردووە، کە بزنە کێوی دیوە تەماشای کردوە و بەبالاَی بزنە کیوی هەلّ داوە، کێویەکە لەشاخ کەوتوە و چووە سەری بڕیوەدەلّێن: تەیری لە ئاسمان دابەزاندوە...

منالّ نەخۆش بووبا هێلکە و گولیان لە شلکەی سەری دەنا، منالّ ترسابا مزیان لە سەرسەری دەتواندەوە، یان پۆلی ئاگر دەخرایە ناو ئاو، لەسەرسەری منالّەکە لەگەلّ کزەکز دەترسا و گوایە چاك دەبێت. نا بوا کەس شیر ببینێ دەیان وت منالّ و شیر وەك یەك ناسکن لە بەرامبەر چاوپیس، یان زۆرجار منالّیان سەرەو بن دەکرد، گوایە فرچکی کەوتووە، ژنێك منالّەکەی سەرەو بن دەکرد و دەی وت:

فرچکەوەجێ فرچکەوە جێ

فرچکێ مام ڕێوی بچێ لەجێ

ئێ کوڕێ من بێتەوە جێ

---

هەموو منداڵێك کۆسکی هەبوو(شێوەی لەکراو دەچو بەلاّم کلاّو نەبوو) ئەگەر منداڵێك کۆسکی لەسەر نەبووایە دەیان وت داکی ژن نییە. ئەگەر منالّێك خێلە بایە، گوایە بەقۆلّێك برندکراوە. دایکی من زۆر منالّی چاك دەکرد پەنجەی گەورەی لەدەم دەناو سەری زمانی پالّ دەدا بۆ سەرەوە، منالّەکە لە خێلایەتی چاك دەبووە. ئەکرێت بەخوشکان بلّێین منالّەکان بە قۆلّێك بەرز مەکەنەوە بۆ ئەوەی خێلەنەبن ئەو کۆسکە لەسەری منالاّن لەپکەیەکی شینیان پێوە دەکرد، تایبەت بوو بە چاووزار، کەسێك سەری هێشابا سەریان دادەکوتاو یان لەسەر پشتێ سەریان لەناو بێژنگێ دا، دەنا تاکو سەری سڕ دەبوو سەر ئێشەی چاك دەبوو.

ئەگەر کەسێك دلّەکوتێی گرتبا، دەیان بردە لای کەسێك کە گوورگی کوشتبێ تیوکەوانی دار هەبوون، تیری دەکەوانێ دەناو ئەی کردە هەراو دەی گوت: ئەها گورگە لێمدا لێمدا، کوشتم دوسێ تیری لە شانی چەپی نەخۆش دەدا دلّە کوتێی بەردەدا.

باوەڕ وابوو مریشك بانگی بدات دەبێ سەری ببڕن، ئەگەر وانەکەن سەری ماخۆ دەخوات، باوەڕ وابوو خۆلّبارین دوو هۆی لەپشتە یان غەزەبە یان پیاوێکی ئیمانداری گەورە مردووە. لەسالاّتی زوو سالّێ چەند جارێك خۆڕدەباری ئەویش ئاماژە بوو بە دووشتەی لەسەرەوە باسم کرد. باوەڕ وابوو لەکاتی بوومەلەرزە هەر کەسێك بتوانێت سێ جار دەست لە ئەرز بدات بلّێ دەستم بەدەرمان بشێ ئەگەرنەوکارەی پێ کرابا ئەوە دەبووە دکتۆر. شەوان ژنان زۆریان خۆیان ئەپاراست لە ناو

رشتنی گەرم لەترسی سوتانی (لەمەچێتر ) نابووا سێ شەم و چوارشەم کۆر کرابا گوایە لەمەچێتر کۆرێ دەکەن، باوەڕ وابوو ئەگەر کەسێکی چاوپیس تیەکی لە کەسێك دا با، بەدزی بەمەقەس پارچەیەکی بچووك لە جلو بەرگی چاو پیسەکە بکەنەوە لەلای ئەوکەسە بیسوتێنن کە چاووزاری لێ کراوە. ئەگەر کچێك بەبووك چووبا دەستەکی لە پشتێ دەستەخوشکی خۆ دەدا، بۆ ئەوەی ئەویش مێرد بکات،ناو ڕشتن لەلایەن ژنان کە کەسێکیان بۆ سەفەر دەچوو... باوەڕوابوو لەکاتی سەفەر پڕمین بەلاّبوو، ئەگەر پێلاّوی کەوتبانە سەر یەکتر ئەوە خاوەنی سەفەری دە کەتەپێش، ئەگەر بەسەر منداڵتدا بازبدابا، دەبووایە دوو بارەی کەیەوە، باوەڕوابوو ئەگەر گێرکە واتە مێروی ورد لەناو ماڵ بن نیشانەی بەرەکەتە. ئەگەر لەگوندی کەسێك بمردبا ئەگەر بچووك با ئەوە یەك حەفتە کەس کۆری ناکرد. واتە جل شوتن نەبوو ئەگەر گەورەبا هەندێك جار یەك مانگی دەبرد، تا خاوەن ماڵ لەبەر چاوی گوندیان جلی هەر نەخستبا کەس کۆری ناکرد ژنان نابووایە خەنەلەسەری بنێن بۆ پیاوانیش سێ ڕۆژ کەس بۆی نەبوو ڕدێن بتراشی، ئێستاش کەمی لەو نەریتانە ماوە.

ناوك کەوتن باو بوو ژن و پیاو ناوکیان دەکەوت کورد لە ڕابردوو وەك ئێستا دڵپیس نەبوو لە هەندێك شت، زۆربەی پیاوان ژنان ناوکیان دینانەوە.

بەهاران ڕۆژێکیان تاگاداری خار خدریان دەکردەوە بانگ رابیرێ خار خدر بەدەنگ خۆشو گەورەکەی دەیوەت : (هۆززززززی، ڕەحمەتی لەوی لەبابێ وی سبەینێ جۆگە هینانەبەئەمرێ ڕەحمانی هۆززززززززززززی، واتە: ڕەحمان شێخ وەسانی هۆ ززززززززی ئەو ڕستەیە چەندجار دووبارە دەکرایەوە بەیانی گەنجەکان وەك شێر بەردەبوونە جۆگە گشتیەکان جۆگەکانیان دەبردن،

بەهاران دووای بارانبارین خەڵکی دەچوونە کەپران هەرکەسە و لەسەر ئەرزی خۆی کەپر و ساباتی دەکرد (هەرزارەی ) کەکوندەی لەسەر دادەنرا، کوندەی ئاوخواردنەوە دروست دەکرا، ئەو ماڵەی کچی گەنجیان هەبایە زوو خەمی گوڵ و ڕەیحانی دەخوارد و کوڵێکی دەکرد گوڵ و ڕەیحانی دەچاندن .

خەوی سەر کەپرێ زۆر خۆش بوو، پێشخەوت لێ بکەوی سەیرکردنی ئەستێران خۆش بوو. بەتایبەتی کە دادەڕژان قەمەرستاعیەکان لە جوڵەدابوون، ئێمە وامان دەزانی ئەستێرەنە دەڕۆن . ئەوەی هەمموومان لێی دەترساین کوندەپەپۆ بوو کە شەوان لەسەر دارەکانی دەورو بەر دەی خوێند دەیان وت ئەو مەملەکەتە وێران دەبێت. کوندە پەپۆ لەلایەن خەڵکی تەیرێکی ناپەسندە

و هەواڵی وێرانی پێیە. زۆرجار پیاوان بەردیان دەگرتە ئەودارەی کوندەپەپۆی لەسەری دەخوێند و تەریان دەکرد .

ڕدێن سپی و پیاو ماقول کۆدەبوونەوە کەسکی باوەڕ پێکراویان دەکردە میاو ئێوارە بانگیان ڕادەهێشت بەو شێوەیە هۆ زززززززززززی فلانی کوڕی فلانی بووە میاوبەئەمریێ (ڕەحمانی )کەس ئاوی لە دوونەبڕێت هۆززززززززی بە دەگمەن کەس ئاوی لەدوکەس نابڕی تاکەو میاو بڕیاری نەدابا جۆگە فەرعیەکان هەرکەسە و بۆخۆی دەبرد ، کەئاو کەم دەبوو بۆ ئەوەی میاو توشی کێشەنەبێت و خەڵکی کێشە لەگەڵ یەکتر دروست نەکەن، چەند ردێن سپیەك دەبوونە لێژنە و ئەمریان بەمیراو دەکرد ئاو بدە فلان وفلان وەك پەرلەمان وحکوومەت، حکوومەت دەکەوتە ژێر ئەمری پەرلەمان لەو حاڵەتە جەماوەر سەرۆکی حکوومەتیان تاوانبار ناکرد کارەکە دەکەوتە سەر نوێنەری بنەماڵەکان لەو لیژنەیە دابوون. دەکرێت سیاسەتمەدارانی خۆمان دوور لەسیستەمی سیاسی جیهانی پەیڕەوی جووتیارانی خۆمان بکەن کە هەموویان لەسەر بەرژەوەندی گشتی ڕێك بوون، سەرباری دەیان کێشەی کۆمەڵایەتی ناوەخۆ کە کێشەکان کێشەی گەورەبوون لەو سەردەم وەك کوشتن و ژن هەڵگرتن، بەڵام لە بەرژەوەندی گوند هەموویان ڕێك بوون... بڕیار دەدراو جێبەجێ دەکرا.لەکاتی کەسێك مردبا هەرجەنابی خارخدر ئاگادارەدەکرایەوە، کە ناوی مردووەکە دەهات خارخدر دەی زانی گۆڕەکەی لەچ گۆڕستانێکە چونکە هەر بنەماڵە و گۆڕستانی خۆی هەبوو، خارخدر دەچووە سەربانی مزگەوتێ و دەی گوت: هۆززززززززززززززی ڕەحمەتی خوا لە وی لە بابێ وی فلانی کوری فلانی مردووە هەڕونە سەر قەبران، لە قەبرستانێ فلانی واتە هەرگورستانێك ناوی خۆی هەبوو وەك شێخ باوەدین، بندارونان، ماندیان شێخ زێندین، چاکی سارداوێ، هۆزززززززززززی ئەوبانگەوازە سێ جار دوو بارەدەکرایەوە.

*** *** ***

بەهاران مێگەلەبزن و مەڕ زوو لە گوندی دەردەچوون، لە کاتژمێر نۆ مێگەلەکان داتنەوە دەوروبەری گوندی بەمەبەستی بێرکردن کە وەختی چونیان بایە بیریەکان بانگی یەکتریان دەکرد. ئەوەی من دیومە بێرییەکان خۆیان دەڕازاندەوە و دەسماڵێکیان لەسەری دەبەست و لەدواوە گرێیان دەدا بۆ بەدەرکەوتنی بسك و کەزی و گەردەنی زەردیان جلوبەرگیان ڕەنگاوڕەنگ وگوڵدار بوو

**هەریەکە و دەسمەغەرێکیان لەدەستی دەگرت و بەکۆمەڵ بەرەو بێریکردن دەچوون قاقلو پێکەنینیان لە دوورەوە هەستی پێ دەکرا.**

**زۆر جار لەهاوینان خەڵکی توشی گرانەتا دەبوون دووای نوێژی شیوان بانگیان رادێشت:**

**هۆێێێێێێی**

**بەشەو دەگری تا**

**بەڕۆژ بەردەدا**

**ماخۆی چارچاوان چارچار واتە خاوەن دووژن .**

**چ دەرمان دەدا**

**هۆێێێێێێی ئەبووایە سێجار دووبارەکرابایەوە.ئەو کەسانەی دوو ژنیان هەبوون ئەوان بۆیان هەبوو، وەڵام بدەنەوە و دەرمان دەست نیشان بکەن، ئەوەی وەڵامی دەدایەوە دەی وت:**

**هۆێێێێێێێێێی**

**هەرمەگرن خەمانە**

**دەرمانی زۆر ئاسانە**

**مریشك رەشی دەرمانەهۆێێێێێێێێێێێێێێی**

**ئەو بانگەوازانە بەهارو هاوین و پایزان دەکران لەو وەرزانەی باسم کردن وە ئەوکات شەوان دەنگ باش دەڕۆی سەیارە و تەلەفزیۆن نەبوو، زۆرشتی تر نەبوو... کە دەنگەدەنگ و ژاوەژاو دروست بکەن، ئەوەی لە هەمووی خۆشتر بوو دەنگی ڕادیوی تاران بوو بەکوردی بەتایبەتی چیرۆکی شەوان ئەگەر هەڵەنەبم بەناوی (هەبوو نەبوو) من نازانم ئەو چیرۆکانە کوردی بوون یا فارسی بوون دەکرانە کوردی بەهەرحاڵ کاری من نیەو ئیشیشمان لێرە پێ نینە...ئەوەی گرینگ بوو چیرۆکەکان زۆرخۆش بوون، ئەوەی ڕادیۆی نەبوو شەوان دەچوە ئەو ماڵانەی ڕادیۆیان هەبووایە ، ئەوەی لەوەش خۆشتربوو ئەوانەی گوێیان لەو چیرۆکەدەگرت بەیانی لەلای یەکتریان باس دەکرد و باسی پێشبینیان دەکرد لەو چیرۆکە شرۆڤیان دەکرد وەك ئێستاو دراماکانی تەلەفزیۆن.**

**زۆرجار مانگ دەگیرا، دەبووە سەڵەوات لێدان و دەف لیدان و تەنەکەلێدان، ئەوکارە بەردەوام دەبوو تاکو مانگ دەردەکەوتەوە چەند نموونەیەك لەو سەڵەواتانە:**

**لەجەهەنەمێ لێژە لێژە**

**تێیدانە مارێ سەر درێژە**

بۆ ئەو کەسانەی کە تەرکە نوێژە
حەبیبی عالەم محەمەد سەڵەوات

................................

ئەی حەبیبی ئەی هەیە
هەموو دەردان دەرمان هەیە
دەرمانی گوناهانیش تۆبەیە
قەبر تەنگە و مارێمەیە
حەبیبی عالەم محەمەد سەڵەوات

-----------------

گورەڵەك پەیدابووە لەمەدینە
بۆنی دەڕوات چین بە چینە
ئەوەمحەمەدمستەفایە چرایی دینە
حەبیبی عالەم محەمەد سەڵەوات

-----------------

تۆ حەبیبی حەیی ئەکبەری
بو موئمینان سەردەفتەری
هەتا دنیا دەگاتە سەری
رەفیقی ڕۆژی مەحشەری
حەبیبی عالەم محەمەد سەڵەوات

-----------------

لەسەربەردی سەخرەتوڵڵایە
داك ئامینەو باب عەبدوڵڵا یە
لێی زهور بوو رەسوولوڵڵا یە
حەبیبی عالم محەمەد سەڵەوات

-----------------

جەهەنەمیَ هوە هوە

## خۆشناو و دۆ و دۆشاو

تێی دان ماریێ سەربەموە
بۆ ئەوکەسەی قسە لە ڕووە
حەبیبی عالەم محەمەد سەڵەوات

------------------

قوربانت بم شایی مەدینە
بۆنت دەڕوا چین بەچینە
ئەو محەمەدە و چرای دینە
حەبیبی عالەم محەمەد سەڵەوات

---

لە ئاسمانان دێتن دەنگە
لەبەر بەندان دەبڕێت ڕەنگە
مارێمەیە و قەبری تەنگە
حەبیبی عالەم محەمەد سەڵەوات

---

لەبەر تاویێ بیێ سێبەرە
وەك ئاوینە شۆق لەدەرە
محەمەد مستەفایە سەردەفتەرە
حەبیبی عالەم محەمەد سەڵەوات

لەشێخ وەسانان کۆمەڵێك دوکاندارن هەبووینە زۆربەی پیداوستی گوندیان دابین دەکرد وەك مەلا ئەحمەد و دواتر حاجی فەقیێ مستەفا و حاجی رەسوولێ وحەوێز وحاجی فەقیێ حەسەن و مام حاجی عەوڵڵای عەتار مەلاخدری نابینا هوردەوارەی دەفرۆشت: وەك فتیلە فانۆس بەردەچەرخ. قولابەشخارتە، دەفتەرەجگەرە، لەوبابەتە. مام حاجی عەوڵڵا پیاوێکی نابووت دیار بوو، بەڵام زۆر قسە دروست بوو خۆشەویستی هەموو خۆشناوەتی بوو، ئەگەر لە بەژن و باڵا و نابووت نەبایە توشی دەیان کێشەدەبوو، چونکە لەگەڵ قسەکردن بەردەوام برۆی بەرزو نزم دەکردەوە. واتدەزانی بەردەوام پیدەکەنی قوماش فرۆشیش بوو، کاری لەگەڵ ژنان بوو، چونکە لە ڕابردوو

نەسەر برۆبەرز کردنەوە کارەسات رووی داوە. زۆرجار لەبەهارێ تاکوپایزان شت بەقەرز لەدوکانان دەبردرا، لە پایزان بە پارەی مازیان و توتن و چەقەلەو قەزوان و سماق و پارەکە دەدرایەوە، یان بەروبوومەکەیان وەر دەگرت، هەندێك جار بە سەلەمیش قەرز دراوە واتە ئەوەندە پارەت دەدەمێ بەروبوومەما کانت بۆمن لە پایزان، زوو بە ولاغ بەروبوومەکانیان دەبردە شاری کۆیە، دواتر بەرەو سەرجادەی( سەرتای) و اتەرێژئاوای گوندی شێخ مەموودیان،لەو کاتەی نەوت سوودی لێ دەبیندرا، بە تەنەکە لەلایەن ئەودوکاندارانە دەفرۆشا بە شوشە، یان زۆرجار هەرماڵە و پایزان تەنەکە نەوتێکی دەکڕی، دەبووایە بەشیان بکات تاکو بەهارێ.

شۆق دەرەکان دیارە بۆماوەی چەندان سەدە لە گوندەکان دوو شت هەبووە، شەوان بۆ رووناکی یەکەمیان هەمووخانوویەك کونێکی نزیکەی نیو مەتر تێ دەکرا بۆ دوو مەبەست، یەکەمیان: لەڕۆژدا ڕووناکی دەدا، لەخوار ئەو کونە تەندوور هەبوو، ئاگریان تێدا هەڵدەکرد، شەوان ژوورەکەی ڕووناك دەکردەوە و دووکەڵی ئاگریش لەو کونە دەچووەدەرێ. بۆ ڕووناکی ڕێگاو بانی ناو گوند و چونە ژوری ئاژەڵان ، چەندان داریان لە شێوەی کلکە تەور زۆر بەباشی دەکوتا و لەکاتی پێویستی ئاگریان دەدا بۆ رووناکی، وەك: لایت بە کار دات، کە کاریان پێ دەبڕا دەیان کوژاندەوە، لەکاتی پیویستی بەکاریان دیناوە. دواتر (قندیا)پەیدابووە دواتر بووە(فانۆس) دواتر ئەوماڵەی خواپێداو بوو (لۆکزی) هەبوو. کابرایەکی لای خۆمان دەچێتە شاری و دوو تەنەکە نەوت دەکرێت و لە کەرێ قەیم دەکات و و دەگەرێتەوە دیارە تەنەکە نەوت دزەی کردووە و تا دەگاتە مارێ کورتان و پشتی کەرێ بە نەوتێ تەڕ دەبێت یەکێك دەی بینێت، دەڵێت: برادەر ئاگاداریە! نەوت پشتێ کەرێ دەسوتێنێت دەڵێت: باشە دەگاتەوە ماری ئاگر دەکورتانی بەردەدات بۆ ئەوەی وشك بێتەوە و کەری بەستەزمان ڕادەکات و دواتر کەرەکە دەسوتێت و دواتر دەتەقێ .

زۆرجار قەرد کردنی نەوت بە شوشە ئاسایی بوو، هەموو پایزان دەبووایە خەلکی قەسپ و خورما و حەلواو سەیلان بکرێت ئەوشیرنیانە بەکارتەی توتن دەکرا، کارتەی توتن بۆ مەران بەکاردات پێیان دەوت کارتە ڕون، زیاتر قەسپ کڕین بە کارتە دەگۆڕدرایەوە، بە دەگمەن جیان چێشتی لێ نابا بێ مارەجیان نای خوارد.

ئەوەی لای من سەیرە ئەوکات بەهاران جگە لەتەیروتاری ناوچەکەمان بە هەزاران تەیری ڕەوەند سەردانیان دەکردین تاکو پایز لەلامان دەمانەوە وەك( تفتیلك، مام سەیدۆکە: ڕەنگی سەوز بوو. زەردوێرە، زەردوێرەی گەورە گاپەل و قەرەباشکە)و دەیان بولبوولی لە ڕەنگ و

رووخسار و دەنگی جیاواز سەردانیان دەکردین. لە دوای مەلا بانگدانی بەیانی گوێبیستی هەزاران ئاوازی جیا لە یەکتر دەبووی. ئەو کات خەڵکی زوو دەنووستن و بەیانیان تێر خەو دەبوون لەسەر کەپرێ بە شنەبای بە یانیان و دەنگی دەیان باڵدارو بولبوول تێکەڵ دەبوون، لە هەمان کات ئەوەی زۆرناخۆش بوو هەموو ماڵێك کەری هەبوو،هەندێکیان دووکەری هەبوون، خەسڵەتی کەریش بەیانیان زۆر دەزەڕی، کەریش زۆر دەستەوەستانە لەبەرانبەر گورگ دەبووایە لە نزیك ماڵەوە بیبەستنەوە، لەترسی گورگ، هەر بۆیە دەنگی زۆر لە نزیکەوە دەهات.

***   ***   ***

لە سەرەوە باسی (١٩٩٢ ) م کردووە کەماکەرێکم چۆن کڕی بوو، لە هەژاری لەهاوینی هەمان ساڵ ماکەرم لە نزیك ماڵی خۆ بەستبووەوە، بەیانی منداڵەکان وتیان کاکە کەرێ مە برینی لەقاچی دانە، بەپەلە بۆلای ماکەرێ چوم، تەماشام کرد برینێکی گەورەیە گورگ پەلاماری دابوو. وازیشی لێ هێنابوو، خەمێکی گەورەبوو. چونکە بەیتەریە تەنها لە شەقلاوە هەبوو، دواتر وتم دەی دەیبەمە نەخۆشخانەی بالیسان، ئەوکات بنکەبوو دواتر وتم: جوان ناوەستێ، خۆم دەچم دەرمانی بۆدینم. برادەریك لەوێ بوو یاریدەدەری پزیشکی بوو بەناوی( ئیسماعیل )ئێمەپێمان دەگوت : د . ئیسماعیل، پیاوێکی باش و بەرێز و زۆرخزمەتی ناوچەکەی کردووە، پێم وایە خەڵکی کەرەکێ ئاسیناغای بوو. چومە لایان دووای سەلام وکەلام وتم: برادەرینە من دەزانم ئێرە بنکەی بەیتەریە نیە، دەزانم بنکەی تەندروستی مرۆڤە، بەلام کەرم بریندارە و گورگ پەلاماری داوە، ژیانی خۆم ومنداڵەکانم بەسترایتەوە بەپشتی ئەوکەرە، دەرمانم بدەنێ بۆ ئەوەی دەرمانی بکەم، دیارە ئێمە لە ژیانی مەجبووری پێشمەرگایەتی زۆرشت فێربووبووین. وەك مەردان قسەکانی من کاری تێکردن و دەرمانی پێوستی زۆرباشیان دامێ وەك ئەمپسلین و دیتۆڵ و لەفاف و شتی تر بۆ ماوەی یەك هەفتە کەرم چاك کردەوە، سەیرەکە لێرە بوو ئەوشەوە پەلاماری سێ کەرانی دابوو، خاوەنی هەرسێکیان یەکێتی بوون! وەك ئەوەوابوو کێشەی لەگەڵ یەکێتی هەبێت باشە کاکی گورگ تۆی بەرێز کێشەت لەگەڵ حیزبایەتی چییە؟ دووی برینداركردبوون، یەکیانی خواردبوو.

زۆرجار ولاغم نەشتەرگەری کردووە، بۆنموونە گاجووتەکانی ماڵی مام حاجی عەزیز حەمەد. گاجووتەکان بەشەڕهاتبوون یەکیان بە سەربەردێکی تیژ داکەوتبوو، نزیکەی (٥٠ ) سانتیە

پێستی شانی شەق بووبوو... داوایان لێ کردم چارەسەرێکی بکەم، منیش بە درێشە هەردوو لای پێستەکەم کون کردن و برینەکەم جوان بە دیتۆڵ شوت و بە شوژن و داوی تزبێح برینەکەم جوان دوریەوە،گاجووت وردە وردە برینەکەی سارێژبوو .

ماینێکی سابیر خالید بەرەو کزی دەچوو پیشانی منی داو زانیم ماینەکە نەخۆشی سندانی گرتوە، ماینەکەم نشتەرگەری کردوو چاکم کردەوە. ئەو کارانەم زۆر دەکردن وە ئەو نەخۆشانەی دەرزییان وەردەگرت من دەرزیم لێدەدان. واتە من دکتۆری مرۆڤ و ئاژەڵیش بووم چەندان کەسی سوتاویشم چارەسەرکردووە، چەندان کەری شەمووسم خەساندووە.

*** *** ***

بابێینەوە سەر باڵندەکان بەداخەوە بەرەو کەمی دەچن، هۆیەکەی چییە؟ یان باڵندەکان دەزانن وشکە ساڵی هەیە من سەری لێ دەرناکەم هەر ئەوەندە دەزانم ئەو کەم بوونە دوای کیمیاباران رووی دا، تاکو ئێستاش بەردەوامە، گیانلەبەرێکی ترمان هەبوو رێژەیان یەکجار زۆربوو بەناوی (داکەمار) لەپێکهاتەی وەك خەمەگرۆ وایە، دیارە رەنگی سەوزە و زۆریش جوان بوو، داکەمار بەدەگمەن نەبێ نەماوە لەناوچەکەمان ئەوەی لەلادێ ژیابێت بە هەزاران جار لەو داکەمارە ترساوە وامان دەزانی خشەی مارە، ئایاباڵدارەکان بەرەو نەمان چووینە، یان دەکرێت بڵێم لێمان تورەبوو بن کەسیش زمانی ئەوان نازانێت بچێتە ئەفریقاو بلێ برادەرینە ئێمە بێ تاوانین ئەوەی کیمیای باراند بەشێك لە عەرەبەکان بوون ؟ ئێمە نەبووین وەرنەوە سەدام و داروودەستەکەی ئێوەخۆش کوردستان کوردستانێکی ترە و ئێستا رێخراوی کوردستانی سەوزمان هەیە و رێژەیەکی باشیش پۆلیسی دارستانمان هەیە بۆ پاراستنیان، هەرچەندە لەسەرەتادایین، بەراستی ناشکرێت ناوی عەرەب نەبەین بەگشتی چونکە ئەوەی دەستیشی لەتاوان نەبووە، زۆربەیان بێدەنگ بوون بێدەنگیش نیشانەی رەزامەندییە! لەوپەڕی متبوون و بێدەنگی دابوون، کەوابوو بێدەنگی نیشانەی رەزامەندییە. لە وەتی عەرەب هەیە هەروایە و واش دەبێت کارێکە و بووەتە وەرەسە بۆیان، تاماون دەکوژن هیچیش بەهیچ ناکەن. کوشتن لەناو عەرەب نەریتەلە پێش ئیسلام و دوای ئیسلامیش بەردەوامە، کورد لە کۆن ئەوەندە بێڕێزی بەژن نەکردووە تا ئەو ساڵانەش هەزاران پیاو بەناوی داکی دەناسرا وەك رەسوری پیرەفاتێ، کە باوکم یەکێکە لەوان خدری خەجیجێ، عەلی مسریێ،عەلی هەمینێ و بە هەزارانی دی ،کورد دەڵێت :

**گواوان حەمەد برد**

**گواوێ حەمەدیش ئەمن بردم**

**عەرەب وێران بوو سەروەت وسامانیان خەڵکی تر بەخۆشی پێی دەژی ئەوانیش ئێمەیان وێران دەکرد، کورد دەڵێت:**

**کەرێ لەکن کەرێ ببەستییەوە، یان خوی دەگریت یان رەنگی! ئێمەی کورد لەوان فێری زۆر شت بووین، کە موڵکی ئێمە نییە، دەتوانین نموونەیەك بێنینەوە، عەرەب شەرمیان بەکچ بووە، بە زیندی ژێرخاکیان کردووە، کورد ئەو کارەی نەکردووە، کورد دەڵێت:**

**پیاو خزمەت کارە**

**ژن چرای مارە**

**ئەگەر زۆردوور بگەڕێینەوە کورد ژنی وەك خواوەند پەرستوە، کە ئێستاش لە چەند ناوچەیەکی هیندوستان باوە، ئێمەش ئامۆزاو بنئامۆزای ئەوانین، سەیرە لەناو کورد ناوە ناوە تاقمێك پەیدا دەبێت رەنگ و رووی عەرەب دەپۆشن، ئایینی ئیسلام لەنەریتی عەرەب دەبینن، نەوەك ئایین ئەو بیرکردنەوە نیشانەی گێلیەتیانە، پێیان خۆش بێت یان نا... ئایین مەسەلەیەکە و نەریت مەسەلەیەکی ترە، با ناوی کەس نەبەین.**

**سەیرکە بەشێك لە عەرەب لەڕابردوو چۆن بووە، برادەرێکی بە تەمەنم هەبوو کە عەرەبی موسڵاوی بوو، بەناوی (باوکی محەمەد) مەشوور بوو لە شەقامی دەواسەی لە موصل بازرگان بوو... ڕۆژێکیان زۆر گلەییم کرد، لە بێ هەڵوێستی عەرەب لە بەرانبەر جینۆساید کردنی گەلانی کوردستان و کورد ... لە وەڵامدا وتی: برادەر گەلی کورد زۆر نەزانن، کە تووڕە دەبن دەڵێن: دایکی عەرەب دەگێم ... نازانیت عەرەب توشی چ کارەساتێك بووە؟ وتم کوا کارەسات بەسەرتان داهاتووە؟ وتی: ڕۆڵە ئێوە لەبەردەردی خۆتان ئاگاو لە دەردی ئێمەنییە. ساڵانە لە موصل بەعسیەکان دەورات دەکەنەوە بۆ گەنجان بەتایبەتی تەڵەبە شکست خواردووەکان لە خوێندن، دوای شەش مانگ کە تەخەرووج دەکەن پێیان دەڵێن: دایك و باوکاتان بێنن، هەرکەسە و دایك وبابی دێنێت، پێش ئەوەی شەهادە بدەنە دەستیان پیان دەڵێن: تف لەدایك و بابتان بکەن، لە پێناو بەرژەوەندی حیزب و سەدام حسێن خوا بیپارێزێت ... ئەوەی ئەوکارەی ئەنجام دا شەهادەی دەدرێتێ و خەڵاتیش دەکرێت، بەبڕەپارەیەکی باش و خانوو و سەیارە دەبێتەکادیری حیزب . ئەوەی تف لە دایك وباوکی نەکات بە شەقوشیلاق دەری دەکەن کەوابوو کەسێك تف لەدایك وباوکی بکات**

ـایکی هەزاران کورد وعەرەب دەگێت لە ڕۆژێکدا، کابرای عەرەب ڕاست دەکات ئەو هەموو ڕێشمە پەیدا نابن؟

*** *** ***

با باسێکی (گێشکە) بکەین گێشکە کارێکە بەبێژینگ دەکرێت لەلایان دایك و خوشکان ـە پیشەی جووتیاری،جاران هەر ژنێك گێشکەی نەزانیبا پێیان دەوت مارەیی نەهاتووە، واتە: ـاتوانێت کاروباری ماڵە مێرد رابپەڕێنێت، ژنان ڕازی نابوون پیاوان دڵی ئاژەڵ بخۆن گوایە لە شەرکردن دڵیان دەلەرزێ .

*** *** ***

**شێخ وەسانان و میوەجات:**

شێخ وەسانان هەرچەندە گوندێکی نیمچە دێمە، لە هەمانکات بەئازایەتی خۆیان خاوەنی زۆرشت بوون، لە گوندەکانی دەوروبەرمان نەبوو، یان کەم بوو، نموونەی جۆرەکانی هەرمێ وەك: سۆرکەبەربەنی، جۆخینی،لاسۆر،چاورەشۆك، هەرماسی، هەرمێ پایزی، هەرمی شینکە، ئەوجۆرەیان گەورەن، کرۆسك، چەقەلە-باوی. ئەوانەی ناوم بردن هەموویان هەرمێن هەریکە و لەتام و ڕەنگ جیاوازن هەمووشیان دێمین واتە: ئاویان ناوێ تەنها بەهاران بن پێمەڕە دەکران و ئاقیش دارێکی دێمیە، بەداخەوە خەرکە لەناو دەچن ئەگەر دڵسۆزانی گەلەکەمان بەرنامەیەکی بۆ دانەنێن. چونکە ئەو جۆرە هەرمێیانە دەگمەنن، موڵکی خۆمانن. شێخ وەسانان بەتریش بەناو بانگە جۆرەکانی وەك : ڕەشمێری، ڕەشیجونیانی، ڕەشیشار پەسیانەیی، سپی، زەرتکە، سۆراو، تایەفی، گاگۆشتی، تۆری، چۆمیلگە)

داری کرۆسك لە شێخ وەسانان یەکجار زۆرە،خزمانی دۆم بۆ دروستکردنی دمکەشەنە سوودی زۆریان لە داری کرۆسك دەدی، لە سەرەتای نۆسەتەکان گرانی روو لە کوردستان دەکات، خەڵکی تووشی برسیەتی زۆر دەبنەوە، خەڵکی شێخ وەسانان کەمتر برسی دەبن بەهۆی هەبوونی مێوژ و کرۆسك ئەو شتانەی لەسەرەوە باسم کردن، بە ساڵاچوان دەیان وت کرۆسك خواردنێکە کێشەی هەیە تووشی قەبزیت دەکات، وە مێوژ بۆماوەی چەندان مانگ دەتوانێت مرۆڤ بەتەندروستێکی باش بیهێلێتەوەو لەبرسان نەمرێت ، داری تو، لەکوردستان دارێکی پیرۆزە خلکی ڕێزی دەگرێت لە هەمووگوندان ئەوانەی جۆگەی ئاویان هەیە دەبووایە لەسر هەر ئەزێك لە نزیك(شلەگە ) شەلەگە بەوشوێنەدەوترێت کەئاو بۆزەویەکەی لادەدات، دارێکی تو چێندرابا، وەداری تو کەمتر

خەڵکی دەیان بڕی زۆرجار بەمەبەستی نوێکردنەوە دەبرا یان بۆ هەندێك پێداوستی زۆر پێویست وەك: دروستکردنی تەختە بۆ دەرگا و سەردەری دەرگا، یان بۆ کۆڵەکەی مزگەوتان لە ناو حەوزی مزگەوتان چونکە داری تووو لەناو ئاو بەسەدان ساڵ خۆی ڕادەگرێت، بۆ کۆڵەگەی مزگەوتانیش بە کاردات بۆ تەختەی تەپکەی کەوگرتن بە کاردات، چونکە ئاو هەڵناگرێت، یان بۆ ئەسپەرەی پیمەڕەش بە کاردات دیارە بۆ خواردن دەچێندرا و دۆشاویشی لێ دروست دەکرا لەگەڵ تورەق. دیارە توو لە توشەر متربە دەکرێت توشەر سێ جۆری هەیە: جۆرێکیان پەلك پانی جوانە. جۆرێکیان: نەوردە و نەپەلك پانە. جۆرێکی تریان زۆر پەلك وردە، پێی دەرێن (تومازیلە) جۆرێکی ترمان هەیە گاتووی پێ دەڵێن ئەگەر بیخۆی دەستت بە ڕەنگ دەبن، بۆ خاوێنکردنەوەی چەند گاتووێکی کاڕك دەستت پێ بشۆ، پاك دەبێتەوە.

ئاژەڵداری بەبێ شوان ناکرێت وشوانەتیش وەك هەرکارێك خۆشی و ناخۆشی تێدایە، یەك لە وەختە خۆشەکانی شوانان بەهارنە ئەوکاتەی بێری دەچنە بێری کردن، فرسەتێکی زیرین بووە بۆشوان هەولی دابا دڵی یەکێك لەو کچانە نەرم بکات بۆ هاوسەری ژیانی چونکە لەو وەرزەنەبێت شوانی قوربەسەر وەرزەکانی تر شەوبۆشەو داتەوە گوندی، وەشتیکی خۆش هەیەلەشوانەتی لەوەرزی پاییزان ئەویش شەوینە شەوین لەکات ژمیری دووی شەو بەولاوە دەنگ لەمیگەل دەدەن بۆشەوین لەوکاتە دارەکان گەلادەوەرینن بەتایبەتی پەلکەدارەبە ن و بەڕو کە بزن و مەڕ زۆرحەزی لێیە بەوشەوەفێنکە لەناودارستان بزنەگەل چرپەی دێت دەنگی شمشاڵ و زەنگورو شنەبای پایزان تیکەڵ دەبێت وە لەدوای پەرەکەوتن بەرەو پایزێکی درەنگ شوانەکان بزنەگەل تێکەڵ دەکەن و شەوان لەوێزان دەمیننەوە.

شاخێکمان هەیە لەشێخ وەسانان پێی دەڵێین راز زۆر بەرزەو دوو بەشە برندیەکەی بەشی خوارەوەی زیاتر لەسەت مەترە درێژیەکەی زیاتر شەش کیلۆمەتر دەبێت، هەرشوێنەو ناوی تایبەتی خۆی هەیە وەك : دەرەدار، تاتی فلان، کەپکی حاجی شایر سۆری خەرتەلان ....: خەرتەل جۆرێکیشە لە دارەش و هەلۆ . خەندەك، ئەشکەوتێ، رفتی، کەندو شوتك و ...هتد. ئەوشوێنەی لەنێوان پایزو زستان شوانان بزنەگەلی لێ ڕادەگرن ناوی( سۆری خەرتەلانە )بارانی لێی نادات.

کورد دەڵێت: سێ شت زۆر خۆشن:

خەوێ بن کەپکی

ئاوێ شەوی دێمکی

**ماچیٚ کیژی خەرکی**

*** *** ***

**مامیٚکی سەیرو سەمەرەم هەبووە بەناوی (مام عالی) پیٚیان دەوت (عەلۆ) مام عالی میەشوان بووە واتە بەتەمەن لە هەموویان گەورەتر بووە، شەویٚك باران دەباریٚت بە شوانەکان دەلیٚت: هەستن برۆنە ناو (رازیٚ) شاخی بکوتنەوە با درۆپان نەکات. شوانە بەستەزمانەکان دەبووایە چەند کیلۆ مەتریك بەرەو رۆژهەلاٚت چووبان بەوشەوە باران وتاریکە سەتەتریٚك زیاتر سەرکەوتبان و دوو بارە چەند کیلۆمەتریٚك بەرەو رۆژئاوا هاتبانەوە، تا دەگەیشتنە ئەو شویٚنە شویٚنەکەش یەکجار پان و بەرینە دەوەرە ئەو هەموو شاخە بەپیٚ بکوتنەوە تاکوو درۆپان(دلۆپان) نەکات ! زۆرجار بە شەو ناردوونی بۆ ئەوبەری گوندی مەلەکان بۆ تریٚ دزین، مامم بلعاتی زۆر سەیری هەبووینە.**

**مام ئەحمەد سەلەق هەبووە لە گوندی گابرە، نزیکەلەشیٚخ وەسانان وەزوتر گەرەکیٚك بووە نەشیٚخ وەسانان مام ئەحمەد پیاویٚکی باش وخانەدان بووە. رۆژیٚك میوانیان دیٚن کوریٚکی هەبووە، بە ناوی وسوو، وسوو گەنج بووە، تازەپیٚگەیشتووە، دەلیٚت: وسوو برۆ گوندی قەندەشەکریٚك بیٚنە لۆ میوانان چای لیٚنیٚن، وسوو دەچیٚت و قەندەشەکر دیٚنیٚت لەسەر بناوانیٚ گوندی دەگاتەمامم، مامم دەلیٚت وسو ئەوەچییە ویٚتە؟ دەلیٚت: قەندە شەکرە میوانن هاتینە شەکرن نەمابوو لۆ چایەی، دەلیٚت وەرە ئەوئاوە بەکن مارینگۆدا دەروات قەندەشەکری لیٚرە دەبەر ئاویٚ دەنیٚین ئاو لەکن مارینگۆ شیرن دەبیٚت با چای پیٚ لیٚ بنیٚن! وسوو غەریب بووە و رازی دەبیٚت، مامم شەکر دەبەر ئاویٚ دەنیٚت و شەکرەکە دەمیٚژی بە وسووش دەلیٚت: برۆ خواریٚ بزانە شیرن بووە، وسووی بەستەزمان هەر ئاویٚ دەخواتەوەو دەلیٚت: شیرن نەبووە، تا شەکرەکە دەتاویٚتەوە. دەلیٚت وسوو ئەتو برۆ ئاو شیرین دەبیٚت وسووی ماروێران دەچیٚتەوە پیٚی دەلیٚن: کواشەکر؟ وسوو بەسەرهاتەکەی دەگیٚریٚتەوە، لیٚدانیٚکی باشی لیٚدەدەن .**

**حاجی وسووی غەریب کە گەورە بووە کەسیٚکی قسەزان و گورجوگۆل بووە، بەپیاوماقوول ئەژمار کراوە. پیاویٚکی نیشتمانیش بوو، چەندان سالٚ پیٚشمەرگەبوو لە هەر مەجلیسیٚك با، ئەو مەجلیسە گەرموگوڕ دیاربوو،لە زانیاری مەشقی سەربازیش زۆرشارەزا بوو. کورد دەلیٚت:" کار هەر دەبن سەوان دا نابن" .**

**کورد دەلیٚت : " هەر کەللە و سەدایەکە"**

واتە هەرکەسەو خاوەنی بیرکردنەوە خۆیتی، هەرکەسە و بە خەیاڵی لەلای شتێکە و ئارەزوی شتێکە، لە گوندی بێراوە ژن و پیاوێك هەبوون، بەناوی: (سۆفی حسێن وپلکەعەیش ) ئەو ژن و پیاوە دەچوونە هەرشوێنێك دەستیان دەکرد بە شایی و تۆزیان لە قوڕێ پەیدا دەکرد، زۆرجار شاییەکە زۆرگەورە دەبوو، چەندان کاتژمێر بەردەوام دەبوو، ئەمەش بەبێ هۆ !

*** *** ***

پیشەی وەستایی، زۆربەی خەڵکی شێخ وەسانان وەستای خانوو بوون دەستی باڵایان هەبوو لە دروستکردنی خانوو لەگوندەکانی دەور و بەرمان، لەهەمان کاتیش ئاژەڵداریش بوون. گوندەکەی ئێمە جیاواز بوو لە هەندێك بیرکردنەوە لەگەڵ ناوچەکەمان،لە گوندی زێخان بنەماڵەیەکی لێیە، شێخی ناوچەکەمان بوون شێخی ئەو کات شێخ ئەحمەد بوو، خەڵکی شێخ وەسانان هەموو جەژنان سەردانی ماڵی شێخیان دەکرد، لەگەڵ خۆیان قەندەشەکرو کەرەباب و مریشك وجیسك ومەڕو کاورو بارەدار و ...تاد بۆ دەبرد. شێوەی چونە ماڵی شێخ یاسای خۆی هەبوو، مەلاخدر پیاوێکی حافز بوو سواری کەرێکی سپیان دەکردو و دەفیان دەدایە دەست. مەلا خدر دەیان قەسیدەی لە بەربوو وەك نالی و ناری و مەحوی و ئەحمەدی موختار و ئەحمەدی کۆر و سافی هیرانی وزۆری تر، خەڵکی ئامادەی رۆیشتن دەبوون لە لای گۆڕستانی شێخ باوەدین رادەوەستان، تاکوو زۆرینە ئامادەدەبوون، بە رێ دەکەوتن بۆ ماڵی شێخ ئەحمەد لەساڵی (١٩٧٣ ) منیش لەگەڵ باوکم چووین، یەکەم هەنگاو مەلاخدر دەستی پێ دەکرد دەی وت:

یا ئەحەد و یاسەمەد پەنجا شێست کەس پێکەوە دەیان وت: (سەلی عەلاموحەمەد) ئەو دەنگە دەگەیشتە گوندەکانی دەورو بەرمان ئەو بەزمە لە شێخ وەسانان دەستی پێ دەکرد تاکو گوندی زێخان، تا دەگەیشتینە ماڵی جەنابی شێخ . کەسێکمان هەبوو لەگوندی شیە ناوی( حاجی مەولوود ) بوو ئەوپیاوە باوەڕی بەشێخان نەبوو، زۆرجار بەجوێن پەلاماری ئەو ماڵەشێخەی دەدا بە ئاشکراو بەبێ ترس کە شێخ وەسانی دەدیتن دەچونە ماڵی شێخ دەی وت: دیسان شێخ وەسانی چون شێخی باوینە سەر ژنێ خۆ! شێخ پێشوازی لێ دەکردن ئەوشتانەی بۆ ماڵی شێخ دەمانبردن دەدرانە دەستی دەروێشان، کەرەکان دەبەسترانەوە و زڕە زڕ ناوچەکەی پڕ دەکرد .

بیرمە دوای دەستنوێژ هەڵگرتن، وردە وردە بەرەو تەکیە چوین، لە وێ دەست ماچکردنی شێخ دەستی پێ کرد، منیش دەستی شێخم ماچ کرد و دانیشتین شێخ بە جلوبەرگی سپی لە لای سەرەوە

دانیشت. زۆر بە هەیبەت داتە بەرچاوم، من چاوم بڕی بووە شێخ. زۆر بە وردی سەیری شێخم ئەکرد دوایی بەخێرهاتنی یەك یەکەیانم کرد و هەندێك ئایەت و حەدیسی خوێندەوە ئامۆژگاری خەڵکی کردو و وتی بە هەمووتان چاوتان لە مەلاخدر بێت.داواکاری نوشتە دەستی پێ کرد لە جەنابی شێخ، پێشتر نوشتیەکانی ئامادە کردبوون لە ژێر دۆشەکی دانابوون لە ناو دەفتەرێك، پەرە قاقەزێکی لاکێشەوجوان دەی نوشتاندنەوەو دەی دایە داواکاری نوشتە.

باوکم وتی جەنابی شێخ دوو نوشتیان لۆمن بکە ئەمن کوڕو ژنم شێتن، دانیشتوان پێکەنین شێخیش زەدەیکی کرد، بەو قسەی باوکم هەستم بە سوکایەتی کرد شێخ ئاماژەی بە من کرد وتی وەرە..باوکم وتی برۆ دەستی شێخ ماچ بکە، منیش دەستی شێخم دووبارە ماچ کردو شێخ لەلای خۆی دابنام، دەستی بەپشتیێ داهێنام ودەستی کرد بە لێو بزاوتن من تێی نەدەگەیشتم چی دەوت، وتی: دەمت بکەوە، منیش دەمم کردەوە،(تفێکی) لە ناو دەمی من کرد، من زۆرتێك چوم، تفەکەی شێخم لە ناو لەپی دەستم کردو لە پشبێندی خۆم هەڵسوی، شێخ دوو نوشتەی دایە دەستم چوومەوە لای باوکم... دوای نوشتەکردن کۆتایی هات، جەنابی شێخ چوو دەست نوێژ هەڵبگری هەموان لەبەری هەستان دواتر شێخ هاتەوە بانگ دراو دەست کرا بەنوێژ.دوای نوێژ خواردن هات ساواریان لێ نابوو نان و چاخوراو مەلا خدر وتی خزمینە، دەستی شێخ ماچ کەن بابڕۆین ئیتر پیاو ئەو پیاوەبوو زوو بگاتە دەستی شێخی ماچی بکات قافڵە ئامادەبوو هەرکەسەو سواری کەرەکەی خۆی دەبوو.شێخ هات و بە رێی کردین لە گوندی زێخان تاکو شێخ وەسانان دەف لێدان و زیکر و تەهلیل بەردەوەوام بوو. من بیم هەر لە لای تفەکەی شێخی بوو، بڕیاریشم دابوو نوشتیەکان لەناو ببەم، بەهۆی تاقانەیم باوکم دەیان نوشتەی بۆ کردبووم، بۆ ئەوەی دووریم لە هەموو بەڵایەك حەمالیەکیان بۆ دروست کردبووم،حەمالیە: وەك مەغزەنە بۆ پاراستنی نوشتە لەپیست یان لە قایش دروست دەکرا، لە لەپی دەست گەورەترە دەیان نوشتەم هەبوو، لە کورتەك لە قۆرنجی راست قەیم دەکرا گەیشتمەوە ماڵەوە، دایکم کورتەکی لەبەرکردم حەماڵیەکەی کردەوە و نوشتەی دەناوناو بەداو دەرزی رێکی خستەوە دایەوە دەستم کە دایکم چووە کانی موسێك وشخارتەیکم پەیدا کرد لە گوند دوورکەوتمەوە حەمایلەکەم پارچە پرچە کردو ئاگرم تێ بەردا لەو کاتەوە بریارمدا هەرچی نوشتەیە لەناوی ببەم، رۆژانە کارم ئەوەبوو هەر منداڵێکم دیتبا نوشتەی پێوەیە، بە دزی لێم دەکردەوە و لە پەنایەك دەم شاردەوە، بۆ ماوەی چەند ساڵێك نوشتەم زۆر کەم کردەوە. لە شێخ وەسان خەڵکی پێیان دەوتم: کافر بووە، بێدینە، دەیان قسەی تر وای

لێهات بوو من و نوشتە ببووینە دووژمن. نوشتە لە شێخ وەسانان بەرەو کەمی چووبوو وای لێهات بوو، هەموو خەڵکی گوندی دەیزانی من بەدوای نوشتەدا دەگەڕێم بۆ ونکردنی... ئەوەی بەمنداڵان وەبوو کە پێیان دەوتم لێم دەکردنەوەدەم سوتاندن یان لەشوێنێك دەم شاردنەوە بە هۆی تاقانەیم و بێ برایی، زۆرجار لێدانیشم دەخوارد، بەڵام هەر کۆڵم نەدا لە نوشتە ونکردن و سوتاندن.

سەرکۆتیش کێشە بوو، من سەرکۆتیش بووم،واتە: پیاو نەبووم چونکە سەرکۆت بووم .

*** *** ***

مەلاخدر بەهۆی نەخۆشی (خروکە) لە تەمەنی جوانی هەردوو چاوی لە دەست دابوون. پیاوێکی قسەخۆش و زیرەك بوو قورئانی پیرۆزی بەتەواوی لە بەربوو، بە دەیان کەس لە سەر دەستی ئەو قورئانیان خەتم کرد. لەو تەڵەبانە بەشێکیان بوونە مەلا زۆربەی نوێژەکانی بە جەماعەت دەکردن، زۆرجار پیاوە بە ساڵاچووەکان لە دوای نوێژی عیشایان کە بەفر دەکەوت ماڵی خۆیان پێ نازانی کە چاو ساغ بوون، مەلاخدر دەستی دەگرتن و دەی بردنەوە ماڵەوە، زۆربەی قەسیدە شیعریەکانی لەبەر بوون، بەدەستی خۆت نەبوو کە دەنگی مەلاخدر دەهات دەبووایە گوێی لێ بگری، ئەو خۆشەویستی هەموو خەڵکی گوند بوو.

مەلا خدر لە بنەماڵەی دەرمانیانە، زۆربەی ڕۆژەکان دەعوەت دەکرا وەك بەرانی سوڵتان مەحموود ئازاد بوو، لە هەرماڵێك لەو گوندە کەس بێ مەلاخدر خواردنی خۆشی ناخوارد. ئەوەندە قەڵەو بوو دەڵێی کوریەش بوو. من و تۆش ئەگەرخواردنە خۆشەکانی هەموو گوندی بخۆین دەبینە کوڕیەش. پیاوێکی ئازابوولە چارەسەر کردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکان. پیاوێکی قسەخۆش و سوحبەت چی بوو ڕۆژێکیان بەسەرهاتێکی خۆی بۆ گێڕامەوە وتی: پێش ئەوەی چاوان لەدەست بدەم بەهار بوو، پێیان وتم برۆ کەرێ لەناو ڕەزی ببەستەوە منیش چوم لای کەرێ و ئەو گوریسەی بە کەرێ وەبوو، زۆر درێژ بوو، منیش زۆر حەزم لەپشبێند بەستن بوو، نەشم بوو، سواری کەرێ بووم و گوریسەکەم قاف قاف لە کەمەری خۆم بەست کەوتمە ڕێ لەخوار ماڵی خۆمان، کەرێك پەیدابوو پەلاماری کەرەکەی دام کەرەکەی من ڕای کردوو من بەربوومەوە بۆماوەی زیاتر لەسەت مەتر من بەدارو بەرد دەکەوتم هەتا هەموو گوریسەکە قافەکانی بوونەوە وردوخاشی کردبووم. چەند هەفتەیەك لەسەر جێی کەتم، جارێکیان لە ماڵی ئێمە میوان بوو بەبابی منی وت: مام ڕەسوور مەمنونی خوایبە پیرەژنێ توو لوشکان ناوێ! ئێمن لوشکان داوێ!

ﺆ جاری دووەم میوانمان بوو بابم وتی: مارت خەرابی مەلا خدر دەگەر ئەو قسەی کردت ئێمیش ێیری لوشکان بووە.

مەلا خدر زۆرجار بۆ غوسل لە خۆدەرکردن بەچلەی زستان بەنیوەشەو دوو کیلۆمەتر لە ﮔوندی چویتە سەر کانیێ( نوسیانێ )، خۆی دەشوت و دەگەڕایەوە، جاری وا هەبووە مەترێك بەفر هەبووە.

ئەو پیاوە بەڕێزە لە ساڵی (١٩٧٥) ڕژێم لە مزگەوتی شێخ وەسانان بە داری مزگەوتیان هەڵواسی بوو، گوایە چەکی هەیە زۆریان ئەزیەتدا ئەو پیاوە لە تۆپ و تەیارە ناترسا زۆرحەزی لە مەجلیسی ژنان دەکرد، ڕۆژێکیان بە لای ماڵە خزمێکی خۆمدا رۆیشتم تەماشام کرد لەبن سەباتێ دوو ژنی خزمی خۆم لەگەڵ مەلا خدر دانیشتون، چایان دەخۆاردەوە یەکیان باوەشینی لێ ەکرد و یەکیان چایەی بۆ تێ دەکرد، منیش چومە لایان دووای چاکوچۆنی وتم مەلاخدر دووعایەکی دەکەم بڵێ ئامین، وتی: ئامین دەبڵێ: مێردی ئەو دوو ژنە بمرن مێرد بەتو بکەن. سێ جار ئەو قسەیەی پێی دوو بارەکردمەوە ئەی وت... چت گۆت دەبرێوە، دە برێوە، ئەمنیش دووبارەم ەکردەوە .سەیرەکە لەوەبوو مێردی هەردووکیان مردن، مەلا خدریش مرد.

*** *** ***

لەشێخ وەسانان وەك هەموو گوندەکانی دەوروبەرمان ئێمە چەندان گۆڕستانمان هەن هەر یەکە و بە ناوی شەخسێك دەناسرا... زۆربەشیان دکتۆری بەشێك بوون، واتە تایبەتمەندیان هەبوو، وەك: چاکی سارداوێ، بۆ باداری باش بوو، بەمەرجی نان وپیوازەێکت بەجێ هێشتبا. شێخ باوەدین دکتۆری گشتی بوو، بۆ هەردەردێك لە مناڵ بوون تا دوایی زۆری تریش. لەشێخ وەسانان باوەڕ وایە زۆربەی کوڕەکان دەستی شێخ باوەدینی نیشانەیان تێدایە. گوایە منیش یەکێکم لەوان.

کێلێك لە باکووری گۆڕی (شێخ باوەدین) هەبوو بەردەکە خۆی سروشتی بوو، کونێکی تێدا بوو، گوایە بە باداری ئەو شەخسە قاچی بەباداری کون بووە، خەڵکی بادار واتە: ئەوانەی ڕۆماتیزمیان هەبایە. دەچونە سەری دەبووایە نانێك و پیوازت پێبا شێخ باوەدین کە پێشتر باسم کرد، بەردێکی لەسەر کێلی هەبوو کە پایزان باران دوا دەکەوت ئەوبەردەیان لەکانی دەرمانا و دادەنا و بزنێکی بۆ سەردەبڕا، گوایە باران دەباری! من دیومە زۆرجار دەباری، چۆن دەباری ئەوە وەڵامی لای من نییە؟ ئەو بەردانانەش لە ناوکانی دەرماناوێ دەبووایە لە بنەماڵەی (حاجیان) بێت. لە ساڵی هەشتاکان ویستم بەردەکە بزرکەم، نەکرا. توشی گەورەترین کێشەبووم دووسێ

گۆچانیشم خوارد بە دەستی کوڕەخاڕێکی باوکم، بە ناوی خارحەمەد لە شوێنی خۆم داناوە. ئەو کات من کۆمەڵەیەکی توندڕەو بووم. لەناو ئەو هەموو نەریتە سەیر و سەمەرەیە شەڕەکە گەرە بوو، لەنێوان من و گوند بەڵام کۆڵم نەدا و من سەرکەوتم دیارە ئەومل ملانێیە بەقسە خۆشە وردە وردە بەهیمەتی برادەران وەك مەلا مغدید و زۆری تر شێخ وەسانان بووە خاوەنی زیاتر لە (٢٥) ئەندامی کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان. جگە لەدۆست و لایەنگر، دیارە هەر یەکێك لەوان کاریگەری خۆی هەبوو. بەداخەوە، لە بۆردمانی کیمیابارانی گوندەکەمان زۆریان شەهید بوون و بەشێکیان برنداربوون ... من ئەگەر هەڵەنەبم پێم وایە شێخ باوەدین هیچ پەیوەندی بە ئاینی ئیسلامەوە نییە، بەڵکوو ئەوشەخسە لەسەر ئایینی زەردەشتی بووە، چونکە پیر و باوە لە ئاییینی زەردەشت بەکار هاتووە ئەو بەردەی لەسەرگۆڕی شێخ باوەدینە لە شێوەی ڕۆژ دروست کراوە، لە شێوەی تۆپە وە قورسایی نزیکەی چل کیلۆ دەبێت. هەموو خەڵکی شێخ وەسانان لە شێخ باوەدین دەترسان و دەترسێن، تەنیا من دەوێرام نێرگز و کاردی . بێنم لەو گۆڕستانە... دوروسێ کونەشاخ لەشێخ وەسانان هەبوون، کچ وکوڕ سێ بەردی بچووکیان فڕێ دەدا ناوئەو کونانە، ئەگەر بەردەکان مابانەوە گوایە مرازیان حاسڵ دەبوون لە چیای شێخ وەسانان چەندان لات(کەلینە شاخ)ی لێ هەنە، پڕن لە نێرگز پێ یان دەڵێن:( جۆرە) نێرگزەکان دوو قاتن زۆرجار هەر کەدێکی دووانزە نێرگزی پێوەیە، ئەوجۆرەیان لە کوردستان دەگمەنە شوێنەکەشیان زۆر عاسێ و سەختەن).

چین لە گورستانی( شێخ باوەدین) ئەو جۆرەیان چێندراون، بە ڕێژەیەکی زۆر لە هەموو خەڵکی شێخ وەسانان، تەنیا من دەوێرام نێرگزان لەو گۆڕستانە بکەم، لە بەهاری ساڵی (١٩٩٢ ) چوومە شاخەکانی دەوروبەری گوندی بە مەبەستی کاردی کردن زۆرگەڕام کاردیم نەدیتەوە. گەڕامەوە بەرەو گوند ڕێگاکەم دەکەوتە نزیك شێخ باوەدین، تەماشام کرد بە دەیان قۆپەنە کاردی شنەشنی دێت، هەر قۆپەنەو پڕ بە ئامێزێ بۆی چوم و چیتم لەخۆکردەوەو پڕم کرد. چومەوە ماڵەوە دوای سەلاموکەلام دەبووایە درۆیەك بکەم، وتمە گەورەی خۆم، گەورەم ئەوڕۆ چومە لاتێ (مریەمێ )، لاتێ مریەمێ لە شوێنێکی زۆر سەختەکاردی باشی لێ دەڕوێ گوایە بەس مریەم ـوێراوە بچێتە ئەوشاخە، زۆرنەمابوو لە شاخی بکەوم باش بوو نەکەوتم ئەها چەند کاردیم هێنایە؟ لەو کات کاردیەکەشم پیشاندا. گەورەم شارەزای برو بلعاتەکانی من بوو، باوەڕی نەهات و سەیرێکی کردم و تیتەو کاردیە کاردی شاخی نییە، کاردی سەر قەبرەستانییە!

مشتومڕێکی زۆرمان لێ پەیدابوو، دواتر سوێندی گەورەی خوارد کە ڕاستی پێ بڵێم، ڕووخام و وتم بەڵێ ئەو کاردییە کاردی بچووکی شێخ باوەدینیە! کەرکەوت و کوندەدرا، مامۆستایەکمان لە گوند هەبوو گەنجێکی زیرەك و تێگەیشتوو بوو ناوی (م.حەیدەر عەبدوڵلا )بوو وتم: خانمی گەورە بڕۆ لای مامۆستا حەیدەر ئەگەر وتی: بابیباتەوە، دەی بەمەوە، ئەگەر وتی: لێی بنێ کاردیەکە لێبنێ، گەورەم بەرە و ماڵی مامۆستا چوو من پێشبینیم دەکرد مامۆستا دەڵێت: بڕۆ نێبنێ، خانم هاتەوە و وتم مامۆستای چ گۆ؟ گۆتی: مامۆستای وەگۆ بڕۆ لێبنێ لۆ جیرانانیش ببە و هەندێکیش لۆ من بینە. بەڵێ، ئێستاش خەڵکی شێخ وەسانان زۆر لە شێخ باوەدین دەترسێن!

*** *** ***

باسی شاخ و شاخەوانیمان کرد، لە گوندەکەمان کەسێك هەبوو بەناوی (خەلیفە خدر ) لە بنەماڵەی سۆیخدری، پیاوێکی سادە و بالابەرز و قسەخۆش بوو، ڕۆژێکیان لەگەڵ خێزانی خۆی دادەنیشێت و چا دەخۆنەوە و باسوخواس دێتە سەر قسمەت خێزانی دەڵێت: ئەمن باوەڕم بەقسمەت نییە، لەوکاتیش پیارەی چا بۆ دەمی دەبات بیخواتەوە، مام خدر پشتەدەستێك لە پیارە دەدات و دەڵێت: دەئەوەقسمەت نەبوو بیخۆیەوە، دەمولووتی خێزانی خۆی بریندار دەکات! ئەوپیاوە بەهرەیەکی زۆر سەیری هەبوو،ئەویش شاخەوانی بوو. ئەو پیاوە وەك سمۆرە بە شاخی سەردەکەوت بۆ مێش بڕینەوە وە هەر مێشێکی دەیبڕیەوە، سینگەدارێکی لە شاخی دەکوتا و وەك نیشانە، کە سەیری ئەو شوێنانە دەکەیت کە ئەو پیاوە بۆی چووە سەرت سوڕ دەمینێ، کارێکە عەقڵ نای بڕێت، باوەڕ ناکرێت لە مرۆڤایەتی کەسێك هەڵکەوتبێت وەك مام خدر شاخەوان بێت. لەو ساڵانەی دوای تەمەنی زیاتر (٩٠) ساڵی ئەو پیاوە ئەشقی گەورەکچێك بووبوو، بە ئاشکرا باسی دەکرد و کەسوکاری کچەش دەیانزانی و خەڵکی گوندیش لەبەر زۆری تەمەنی ئاسایی بوو. لەساڵی پەنجاکان گەنجێك بەناوی:(عەبدوڵلا سۆفی ئەحمەد) شوانی ماڵی (ئەحمەد سەلەق) دەبێت، مام ئەحمەد ژن بۆ کوڕێکی دێنێت بەناوی حەمەدەمین . محەمەد بزنەکانی ئەو ڕۆژە بەتەمای شوانی تر دەکات دێتەوە و بۆ شایی محەمەد زۆر گۆرانی دەڵێت، لای ئێوارە بەخۆی و سەگەکەی دەچێتەوە چیا بۆلای بزنان لای ئێوارە بە خەیاڵی دادێت بچێتە لاتێ نێرگزان، لە لاتێ ( بەرسۆری ) باقە نێرگزێك بۆ زاواو بووك بباتەوە، پێش بگاتە نێرگزان بەردەبێتەوە و دەمرێت. بزنەکان دەچنەوە ماڵێ و شوان و سەگەکە دیارنییە شەویش بەسەردادێت، خەڵکەکە مشاوەش

دەبن بەرەو چیا دەچن هۆ شوان هۆ محەمەد، کەس وەڵام ناداتەوە سەگەکەی کە گوێی لە خەڵکی دەبێت بانگی محەمەد دەکەن دەست دەکات بە رەوین و نوزەنوز وەك گریان، بە دوو دەنگی سەگەکە دەکەون لێی نزیك دەبنەوە سەگەکە لەلای محەمەد کەوتووە کە سەیردەکەن محەمد مردووە، سەگەکە دەکەوێتە دوو مەیتی محەمەد تا ماڵەوە بەڵێ ئەوەش وەفای سەگ بۆ محەمەدی جوانە مەرگ!

لە هەمان ساڵ لە گوندی خەتێ دەروێشێك پەیدابوو بەناوی دەروێش محەمەد، ناوبراو شیرێکی پێ بوو مەترێك درێژتر بوو، بەو گوندانە دەگەڕا و هەواداری پەیدا دەکردن، دەیان دەروێشی هەبوو بە تایبەتی لە شێخ وەسانان، ئێمەی شێخ وەسانی وا خولقاوین لە هەمووشتێك لەپێش خەڵکی داین، لە هەر گوندێك چەند رۆژێك دەمایەوە بۆ زیکر کردن. سەر گۆڕستانەکانی هەڵ دەبژارد دەروێشەکانی بە شیر دەکوشتەوە، بە هیچ شێوەیەك ناچووە مزگەوتەکان گەنجەکان دابڕابوون لە کاروکاسبی، خەڵکی ببوونە دوو بەش بەشێکیان بەپیرۆزیان دەزانی هەندێ کەسیش بە شێتیی دەزانی، چووبا هەر گوندێك مەلای ئەو گوندە خۆی دەشاردەوە لە ترسی کوشتنەوە، چونکە مەلایان باوەڕیان بەو تیربازیە نەبوو، مامۆستایانی ئایینی زۆری لێ دەترسان، هەموو تۆقیبوون لە دەروێش محەمەد چووبا هەر گوندێك مەلای گوند خۆی بزردەکەرد، بۆیە مەلا کۆبوونەوە و چونە لای (عەلی شەعبان) داوایان لێ کرد سنوورێك بۆ ئەو دیاردەیە دابنێت، (عەلی شەعبان دەستگیری کرد و رەوانەی لای رایتیان کرد بۆ ماوەیەك دواتر ئازاد کراو بۆخۆی بە تەنیا دەژی بەتەواوی لەپەیوەندی کۆمەڵایەتی دابڕاو لەو ساڵانەمرد.

*** *** ***

ناوی (عەلی شەعبان)مان هێنا، دیارە علی شەعبانیش بێ کەموکورتی نەبووە، وەك هەرکەسێك، (عەلی شەعبان) کابانێکی باش بوو بۆ کورد، بۆ پارتی پیاوێکی بەهەیبەت و خاوەن کەسایەتییێکی بەرز بوو، زۆریش ئازاو لێزان بوو. لە بەڕێوبردن خاوەنی مەڕو بزن و قەڵ و زۆر شتی تر بوو، لە ساڵی (١٩٧٠) بۆ (١٩٧٤) (عەلی شەعبان) باجی وەردەگرت، بەناوی زەکات. لە هەر ناوچەیەك شانە و سەرۆك شانەی دانابوو، زۆر جار ئەگەر بەرووبوومی جووتیەر کەمبا و بەتەنەکە دیارنەبا، بە کڵاو دەیەکیان لێ دەستاند. لە نێوان هەردوو زێ تەنیا شێخ وەسانان باجیان نادایە. (عەلی شەعبان) شێخ وەسانی ملکەچی (عەلی شەعبان) نەبوون.

ئەمەش بەهیممەتی ڕەحمان شێخ وەسانی و خزمانی گوند. (عەلی شەعبان) زۆر هەوڵیدا گوندەکە ئەچاڵ یەکتر دەرپێنێت نەیتوانی!

ڕۆژێکیان زستان بوو، بەفر زۆر باری بوو، چەند گورگێك چەند مەڕێکی (عەلی شەعبان) ئەخۆن... (عەلی شەعبان) بڕیار دەدات هەموو خەڵکی خۆشناوەتی ڕوو لە چیای نووسەك و چیای هەورێ و سۆرەپەل و کراو قاسم بکەن، بە مەبەستی گورگ کوشتن، ئەوڕۆژە دنیا خرابوون بوو، لە تەقە بە هەزاران فیشەك تەقی، بۆ خاتری مەڕەکانی کاك (عەلی شەعبان) سەیرەکە ئەوەی بوو تاقە گورگێکیش نەکوژرا، باوەڕناکەم سولتانەکانیش بڕیارێکی وایان دابێت!

باسی باج و شێخ وەسانان کرا، لە مانگی ( ٧ / ١٩٧٣ ) مام حاجی ڕەحمان بەخۆی و چەند کەسێك خەریکی پاککردنەوەی زەوی دەبن لە خوارگوندی کەسێکی گوندی دەچێت و دەڵێت: مام حاجی ڕەحمان میوانت هاتینە، مام حاجی دەڵێت: واز لەئیشی بێنن باپڕۆین مادام میوان هاتینە، دواتر لەو کەسە دەپرسێت میوان کێنە؟ دەڵێت: دوو بارزانینە؟ مام ڕەحمان دەڵێتە کابرا بڕۆ با ئەوان بێنە ئێرە، دەستدەکەنەوە بە کارکردن، دوای ماوەیەك دوو بارزانی هەریەکە و برنۆیەکی دارشوشەیان پێیە و چەندان ڕەختە فیشەکیان بەستوە، بەدەردەکەون... دووای چاکوچۆنی پێیان دەڵێت: خێرە فەرموون؟ بارزانیەکان دەڵێن: کاك (عەلی شەعبان) ئێمەی ناردوە بۆ وەرگرتنی زەکات لەشێخ وەسانان. مام حاجی ڕەحمان دەڵێت برادەرینە ئێوە قاسیدن میوانیشن، ئەگەرنا هەردوو گوێم لێدەکردنەوە لۆ (عەلی شەعبان)م دەناردنەوە، هەستن لەبەرچاوم بڕۆن. بارزانییەکان دەڕۆن جارێکی تر کەس نەهات باج وەرگرێت لەخەڵکی شێخ وەسانان. من بەدوای هەندێك ڕووداوی عەلی شەعباندا چووم، بۆم دەرکەوت بەشێك لە توندی عەلی شەعبان دەستی خەڵکی ناوچەکەمانی تیدابووە. عەلی شەعبان کۆمەڵێك چاکسازی لە ناوچەکمانی کرد، وەك ڕێگاوبان و چاککردنی کانی وکانیاو و دروستکردنی مزگەوت ئاودەست بۆ ژن وپیاوان... لەپەنای ئەوکارەباشانەش هەڵەی دەکردن، کۆمەڵێك بارزانی لەبن باڵی عەلی شەعبان خەریك بوو دەست بژێری کچەجوانەکانی خۆشناوەتی بکەن، چەندان ڕووداو ڕوویدا... نامەوێت باسیان بکەم... خەڵکی خۆشناوەتی ئاگاداری ئەو ڕووداوانەن، لەو بارزانیانە ئەوەی من زانیومە تەنها ئاغجۆ بارزانی بەپاکی هاتە ناوچەکەمان و بەپاکیش بەجێی هێشت و پیاوێکی مەیدانیش بوو.

له دوای ساڵەكانی ١٩٧٣، شەش حەوت كەس لە لایەن سەرۆك بارزانی ڕەوانەی گوندەكەمان كران، وەك دەست بەسەر،كە كێخوا هەمزە چاودێرییان بكات بۆشیان نەبێت لەو سنووره دەرچن، ئەو دەم قسە لە ناوگوند بڵاو بووەوە كە ئەوانە لە كوردستانی توركیا هات بوون، بۆ لای سەرۆك بارزانی بە مەبەستی هاوكاری كردنیان بۆ شۆڕش كردن لە كوردستانی توركیا... مەلامستەفاش لە جیاتی هاوكارییان بكات دەست بەسەری كردبوون، باشترین جێش بۆ بزركردنیان شێخ وەسانان بووە، هەموویان مەلای زیرەك و بە توانابوون بەژن درێژ و ئەستووری جوان بوون، ڕەنگ و ڕوویان سپی وسۆر بوو، شامیەپیاو بوون... كە سەیرت دەكردن كەسایەتیان بەدەر دەكەوت. دوای چەند ڕۆژێك كێخوا هەمزە سەردانی (عەلی شەعبان) ی كرد، بە عەلی وتبوو برای بەرێز بڕیاری سەرۆك لە سەر چاوان، دیارە جەنابت دەزانی گوندەكەی ئێمە زۆر بێئاوە ئەمە لۆخۆمان ئاون نییە چ لەویەدبەختانە بكەین؟ عەلی دەڵێ هەمزە جەنابت چت پێ باشە؟ هەمزە دەڵێت: من گوندی كانی بەرد بەباش دەزانم لەوێ ئاو هەیە و لەمەش نزیكن چاومان لێ دەبن، عەلی شەعبان رازی دەبیت ئەو پیاوە شۆڕشگێڕانە لە گوندی كانی بەرد دەمێننەوە، خەڵكی خێریان پێ دەكردن، ئەوانیش یارمەتی جووتیارانیان دەدا پەیوەندی كۆمەڵایەتیان زۆر بە هێزبوو. زۆربەی كەسایەتی ناوچەكە ببوونە برادەریان، بە تایبەتی خزمانی كانی بەرد ئەو بەڕێزانە لە گوندی كانی بەرد مانەوە، تا شەڕی ١٩٧٤ (مەلاپالۆ) چووە شەڕگەی بێتواتە بە نیازی شەڕ كردن دژی داگیر كەر (عەلی شەعبان) رازی نەبوو، چەكی پێ بدات لە كاتی شەر (مەلا پالۆ) لە ڕكی ()عەلی شەعبان) بەگۆپار واتە بە گۆچان دەچیتە ناو شەڕەكەو بە پێوە پێشمەرگەكان هانی دەدات لەو شەڕە، پێشمەرگەكان ورەیان زۆر بەرز دەبێتەوە سەركەوتنێكی گەورە تۆمار دەكەن (عەلی شەعبان) دێتە لایان بۆ دەست خۆشی دەبینێت (مەلا پالۆ) لەوێیە، پێی دەڵێت: ..كوێی تە چتكەی وێرێ .. دەڵێت: هاتیمە شەڕ بكەم لەسەر خاكی باب و باپیران، پێشمەرگەكان دەڵێن: كاك عەلی سەركەوتنی ئێمە بە هۆی هاندانی ئەو بوو، داوات لێ دەكەین چەكی بدەیە.

(عەلی شەعبان)رازی دەبیت دەڵێت پالۆ چ چەكت بدەمێ؟ پالۆ دەڵێت: ڕەشاشی برنۆ خۆزە دەوێت، ڕەشاشێكی برنۆ خۆری دەداتێ، تاكو كۆتایی شۆڕش (مەلاپالۆ) و برادەرەكانی لە هەموو شەڕەكان وەك گەڵای داران سەربازی داگیركەریان هەڵدەوەراند، دیارە دواتر هەموویان دەتوانن چەك وەربگرن ئەگەر ناوەكانم هەڵەنەكردبن:

١- محەمەد پالۆ

٢- مەلا عەبدوڵلا

٣ - شەهید (فەرمان ) لە شەڕگەی بێتواتە شەهید بوو لەساڵی ١٩٧٤

٤ - هەڤاڵ سەلام

٥ - مەلا عەبدوڵلای بچووک

٦ - هەڤاڵ یوسف

٧-مەلا حەمید

٨-هەڤاڵ عەبدی

-٩ هەڤاڵ عەلی

لە سەرووی تیشی شەکرۆك، کە دەکاتەرۆژهەڵاتی باشووری گوندی شێخ مەمودیان ڕۆژانە کۆمەڵێك سەرباز بە ڕۆژ دەچوونە شوێنێك، ئێوارە چۆڵیان دەکرد.(عەلی شەعبان) بەزۆر کەس دەڵێت بڕۆن بیانکوژن کەس لەخۆی ڕانابینێت پالۆ دەڵێت: من دەیانکوژم، شەو دەچێتە شوێنی سەربازەکان، بەیانیەکەی ئەو کۆمەڵە سەربازە بەرەو هەمان شوێن دێنەوە، مەلا پالۆ هەموویان دەکوژێت و دەگەڕێتەوە مەلاپالۆ لە زۆربەی شەڕەکان بە پاڵەوان ناسرابوو.

ئەو چیڕۆکە دووردرێژە بە کورتی باسی دەکەم، ئەو کۆمەڵە شۆڕشگێڕە دوای هەرەس ئاوارەی ئێران بوون لە ساڵی ١٩٨١ مەلا پالۆ یەکێك بووە لە قیادەکانی لەشکری ئیسلامپەیوەندی هەبووە لەگەڵ بەرێز مام جەلال، ئەو پەیوەندییە مام جەلال باشتری لی دەزانێ من کەمی لێ دەزانم. ئەوکات بەشێکی زۆری لەشکری ئیسلام لە پێشمەرگەکانی یەکێتیی پێك هاتبوون، کە بڕیاری چەککردنی ئەو هێزە درا مەلا پالۆ لە لایەن ئێران دەست گیر کرا، دوای ماوەیەك مەلا پالۆ لە بەندیخانە ڕادەکات بە جلکی شێوەی مەلایانی ئێران خۆی دەگەینێتە کوردستانی ئێران، ئەیەوێ بەرەو لای بەرێز مام جەلال بێت لە ڕێگا توشی پێشمەرگەکانی دیموکرات دەبێت، پێشمەرگەکان تەماشا دەکەن ئاخوندێك دەبینن دەیگرن هەندێکش ئەزیەتی دەدەن، نیازیان هەبووە بیکوژن پالۆ دەڵێت کورینە مەم کوژن من پێشمەرگەی یەکێتیم، هەر چۆنێك بێت قەناعەت بە پێشمەرگەکان دێنی، کە نەیکوژن... پێشمەرگەکان بروسکە بۆ شەهیدی سەرکردە د. قاسملۆ دەکەن، جەنابیشی پەیوەندی بە مام جەلال دەکات... مام جەلال دەڵێت: زۆر بەڕێزەوە بۆ لای منی ڕەوان کەن، ئەو جارەیان پێشمەرگەکان ئەسپێکی بۆ پەیدادەکەن بۆ لای مام جەلال دەیبەن، مەلاپالۆ بە ئارەزوی خۆی دێتەوە گوندی کانی بەرد، ناو براو دوو ماڵ و منداڵی هەبووە،

یەکیان لە تاران بوو، یەکیان لە بەغدا. لە ساڵی ١٩٨٣ کە مفاوەزات کرا، لەگەڵ ڕژێم ئەوانەی بەغدا هاتنەوە گوندی کانی بەرد، منداڵەکان گەورەبووبوون، زمانی کوردیان نەدەزانی پاڵوش عەرەبی نەدەزانی لەگوندی کانی بەرد باب و دوو کوڕ بۆ پێداویستی ماڵەوە دەچونە بالیسان. قسەکردن لەنێوانیان نەبوو، بە ئاماژە نەبێ لە ساڵی ١٩٨٥ دووجار هەوڵیدا ماڵ و منداڵی ئێرانیش بینێتەوە، بۆی نەکرا! یەکێك لە سەفەرێکان من و کاکۆ تەهای کانی بەردێ بووینە ڕەفیق، لەگەڵ مەلاپاڵۆ لەهاتنەوەن لە دۆڵی باڵەیان ڕژێم ڕێگای گرتبوو ماوەی (١٥) ڕۆژ لەماڵی قادرخەبات ماینەوە.

لە پێناسەی قادرخەبا، هەر ئەوەندە دەکرێت بڵێین: قادر خەبات قادرخەباتە و تەواو. من ناتوانم چیتر باسی بکەم، قادرخەبات وەك کەس نەبووە و کەسیش وەك ئەو نابێت لەپیاوەتی و مەردایەتی. بۆماوەی (١٥) ڕۆژ نزیکەی (٦٠) میوان لەماڵی خەبات بووین پێویستە کوژە پەیکەری زێڕ بۆ قادر خەبات بکات. قادر خەبات لە دووای هەرەسی شۆڕشی کورد بەداگیرکەری وت: دڵتان خۆش نەبێت هێشتان من و قەندیل لە مەیدانین. مەلاپاڵۆ لە ساڵی ١٩٨٦ بەنیازەی مام جەلال بیکاتە لێپرسراوی بەشی سەربازی لەسنووری بادینان، لەگەڵ ئێمە هات سەردانی مام جەلالی لە دۆڵی جافەتی کرد. لە سنووری گوندی سکتان لەگەڵ ئێمە سواری تەرەکتۆربوو تەرەکتۆر وەرگەڕا، زۆر ئەزیەتی دیت. وردە وردە گەیشتینە دەشتی کۆیە، لە گوندی کانی بیی، پێکەوە چوینە سەرزێ، باوەڕم نەبوو ئەو پیاوە قوڕسە مەلە بزانێت وەك مەقەس زێی بڕی و چوە ئەوبەر، من دڵخۆشم توانیم لەو سەفرە زۆرخزمەتی بکەم، چونکە بەهۆی وەرگەڕانی تەرەکتۆر تەندروستی باش نەبوو، دوای سەردانی مام جەلال هاتەوە ناوچەکەمان، دووبارە مام جەلال بە دوای دانارد بۆسەرکردایەتی، لە خوار گوندی کونەفلووسە، لەگەڵ کەسایەتیەکی گوندەکەمان بەناوی حاجی ئەحمەد کەسێکی گوندی کونەفلووسە، لەلایەن مەفرەزە خاسەکی شەهیدیان کرد، بەداخەوە ئەوە پاداشتی مەلا پاڵۆ بوو، بەدەستی خۆفرۆشان ماڵ و منداڵی بەبێکەسی مایەوە، ئانەنفالەکان لە ڕێگای چەند خێر و مەندێك ڕەوانەی کوردستانی باکوور کرانەوە. منداڵەکانی لە ئێرانیش پێم وایە چونەوە کوردستانی باکوور، ناوی تەواوی (شەهید عەبدوڵڵا لەوند جەنگیز خەڵکی شرناخ جۆلەمێرگ) بوو. دوو کوڕی دەناسم یەکیان ناوی جەماڵە ئەوەی تر عەبدولڕەحمانە. ناوەناوە جەمال سەردانمان دەکات، ساڵی ڕابردوو هاتە لا. منیش لە ڕێگای چەند برادەرێك ناردمە لای هێرۆخان هاوکاری باشی کردبوو، دواتر لە زاخۆ

تەنەفۆنی بۆ کردم زۆر دڵخۆش بوو، دیار بوو هێرۆخان دڵی خۆش کردبوو، گۆڕی ئەو قارەمانە لە چووکی خدر خەزایە لەنێوان گوندی کانی بەرد و بالیسانە.

بەسەرهاتی ئەوپۆلە تێکۆشەرە زۆر لەوەگەورەترە کە من دەیزانم، لە وانەیە ئێستاش بەسەرهاتی ئەوتێکۆشەرانە کۆتایی نەهاتبێت، بریا خۆیان شتێکیان لەسەر رابردووی خۆ بنوسی. پێم وایە ئەگەر هەڵە نەبم (٧٢) یان (٧٣) بوو، هێزی پێشمەرگە دەورەی گوندی کەلەکینیان گرت هۆیەکەی چی بوو؟ من نازانم دواتر کۆپتەرێك هات و ماڵباتی حسێن ئاغایان هەلگرت و رۆیشت، هۆیەکەی پێش وازی نەکردنی بارزانی بوو لە شێخ ئەحمەد و حسێن ئاغە، لە کاتی چونیان بۆ پیرۆزبایی بە بۆنەی بریاری حوکمی زاتی. دروستبوونی ساردایەتی لە نێوانیان چونکە حسێن ئاغا لە ساڵی ١٩٧٠ سەردانی شێخ ئەحمەدی سوورچی دەکات داوای لێ دەکات وەك سەرۆك هۆزەکانی کوردستان پێویستە سەردانی سەرۆك بارزانی بکەن، شێخ ئەحمەد سەرەتا رازی نابێت ئەو پێی وایە سەرۆك بارزانی پێشوازییان ناکات حسێن ئاغا واز ناینێت شێخ رازی دەکات بەرێ دەکەون لەوێ دوو رۆژ چاوەڕێ دەکەن سەرۆك نایان بینێ، شێخ تورە دەبێت و هەندێك قسەش بە حسێن ئاغە دەڵێت. دیارە بەخراپیش باسی بارزانی دەکات من ئەوقسەیەم لە کەسێکی خزمانی سوورچی گوێ لێ بوو، بەناوی سدیق وایە وانییە ئۆباڵ بەملی ئەو. هۆیەکی تر، من نازانم هەر ئەوەندەم لە بیرە گوایە حسێن ئاغە بە کۆپتەر بەرەو موسڵ چووە شەرەکە دەستی پێ کردووە، لە کوشتن وسوتان و تالان زۆر زێدەڕەوی کرابوو، زۆری عەشیرەتی سوورچی بەرەو شاری موصڵ رایان کرد، سووتان و کوشتن و تالان رووی دابوو، دواتر لە گوندی بجیلێ دەورە کرایەوە، بۆ هێزی پێشمەرگە کە زۆربەی خەڵکی ناوچەی ئێمە بەشدار بوو، لە سەر چەکی قورس بوو وەك و تۆپ و دۆشکەو ...هتد.

*** *** ***

ئەکرێت باسی کەسێکی تریش بکەین کە لە بالیسان دەست بەسەربووە، دوای پەلاماری ناوچەی سورچیایەتی کەسێك لەماڵباتی شێخانی سوورچی ( بەناوی شێخ قادر) خۆی و سێ خێزانی و کورێکی بەناوی حسێن رەوانەی بالیسان دەکرین، وەك دەست بەسەر. ماڵیان لەنزیك کانی گەورەی بالیسان بوو، لە خانووی حەسەنی عەودی، بەرەو رۆژهەڵات. ئەوپیاوە بەماوەیکی کەم بووەدۆست وبرادەری زۆرکەس بەتایبەتی شینکۆ کە ناوی کازم بووە، بە شینکۆ بە ناوبانگ بووە، ئەو پیاوە جووتیاران ئیدارەیان دەدا، وەك ئارد وساوار شتی تر بۆی نەبوو لەسنووری بالیسان

دەربچێت وەك مەلاپالۆ و برادەرەکانی کە لە سەرەوە ئاماژەم پێ کردوون... دوای هەرەس شێ
قادر ئاوارەی ئێران بوو، زۆرجار بۆتازی کردن لەخەڵکی بالیسان سەردانی بالیسانی کرد
نموونەی تازی شینکۆی ئەوەی من زانیومە شێخ محەمەد تاهیری باتاس بە دزی هاوکاری شێ
قادری کردووە. شێخ محەمەد تاهیر لەگوندی باتاس پیاوی سەردەمی خۆی بووە. لە بیرم دێ وتی
شەڕ دەستی پێ کردەوە، خەڵکی شارەکان بە لێشاو بەرەو ناوچەشاخاویەکان هاتن، بەشێکی
بەرەو ناوچەی گەلاڵە و چۆمان دەچون ئێزگەی دەنگی کوردستان کردبوویە هەرایەك پێت و
دووبەیانی ڕژێم دەڕوخێ لەخۆیەوە دەیان تەیارەی دەخستەخوارێ خۆشیەکەشی لەوەبوو خەڵکی
باوەڕی دەکرد، هەموو شتێك ڕۆژگاری خۆی دێتەوە، ئەوکات کەروماین و ئێستر زۆر گرینگ بو
بۆ خەڵکی شاران بە کرێیان دەگرتن بەرەو لای گەرارە و چۆمان. دوو ئەوەی شەڕ دەستی پێ کرد
هێزی بێتواتە زۆر بەجوانی شوێنەکانی خۆی گرت وەك کەپکی حەمەد ئاغا و سۆرەپەل و زنجیر
و شاخی سۆرو کلاو قاسم و شیشارو ماکۆك و تا دوایی.... هێزی بێتواتە عەلی شەعبان بزو
ئوموورگێڕێکی باش بوو، هێزی سەفینیش زۆر خۆڕاگربوو، هێزی دەشتی هەولێر خۆڕاگری پێ
دیارنەبوو، زۆر بەبێ سەروبەری گەیشتنە ناوچەکەمان، ناوچەی خۆیان چۆڵ کرد کە ناوچەیەکی
ستراتیجی بوو بەشێك لە هێزی بێتواتە لە ناوچەی هیزۆپ توشی شکستێکی گەورەبوون ئەگە
هەڵەنەبم پێم وایە بەشێك لەشکەستی هێزی بێتواتە دەگەڕێتەو بۆ هێزی دەشتی هەولێر
هێزەکانی تر چونکە هەیبەت سوڵتان هێزێکی دەشتی هەولێری لێبوو بەتالیوێنی ٣٦
بەسەرپەرشتی سمکۆ عەلی هێزێکی پێتواتەش لە هێزۆپ و دەورووبەری بوو بەرۆژهەلات
ڕۆژئاواوە. ئەو هێزە بۆ هەر ئەگەرێك بوو، لەو سەروبەندە، عەلی شەعبان سەردانیان دەکا
وەزعەکەی بە دڵ نابێت بە تایبەتی لە بەرپرسەکان ڕازی نییە، وەك پێوست خۆیان ئامادەنەکرد
بۆ شەڕ، داوای کۆبوونەوەکی بەپەلە دەکات عەلی شەعبان پێشبینی خراپ لەو هێزە دەکا
پێشبینییەکەشی ڕاست دەرچووە، کۆبوونەوە دەکە ئەوانەی زاندراون لەو کۆبوونەوەیە:

١ / عەولاسۆر شێخ وەسانی
٢/ شینەی بۆری
٣/ کەمال بەگی وەرێ
٤/ باوەکرباڵیسانی
٥/ تەیب هەرەوەنی

**٦/ وەلی مستەفا مەنتك**

**٧/ حاجی مستەفا شاوری**

**٨/ سدیق خۆرانی**

**٩/ حەمید خۆرانی**

ئەکرێت زۆرتریش بووبن من نەمزانی بێت، دەکەونە گفتوگۆ عەلی شەعبان قسەیەکی خراپ ـە دەمی دادێت و دەڵێت: ئێوە نابنە مرۆ عەولاسۆر شێخ وەسانی بە خەنجەر پەلاماری عەلی شەعبان دەدات عەلی شەعبان دەڵێت: ئاشاکی تۆ عەولاسۆر. خەلیل سیتۆش دەست بۆ دەبانچە ـعبات بەو نیازەی لە عەلی شەعبان بدات دواتر ناوبژیوان دەکرێن. علی شەعبان بەتوڕەبوون ـەڕوات بەرپرسەکان هەر یەکە و دەچێتەوە لای هێزەکەی خۆی دووای چەند ڕۆژێك ڕژێم بە ـتۆپەیەکی زۆر دەبابە لە هەیبەتسوڵتان دێتەخوارێ بۆ هیزۆپ زۆربەی هێزەکان کەمتەرخەم بووینە، عەولاسۆر شێخ وەسانی کوڕێکی خۆی بەناوی فارس بەپەلە ڕەوانەی لای شینەی بۆری دەکات کە لەژێر پردی هیزۆپ بووینە، بە شینەی بۆلی دەڵێت: قوربان بابم منی نارد هێزی دووژمن زۆر لێتان نزیك بووە، دیارەفارس ترسی هەبووە شینەی بۆلی دەڵێت: کوڕە چنییە لۆ هەندە دەترسێی لەپڕ پێشمەرگەیەکی خۆیان دەڵێت مام شینە دەبابە گەیشتنە ئێرە تاکو خۆیان قەیم دەکەنەوە دەبابە دەگەنەسەرجسر دەبێتە هەرات هەراتن و بێسەروبەری دەبابەکان دەکەونەتەقەکردن، بەشێك لەهەڵاتووەکان دەکوژن کە زیاتر لە(٣٠)پێشمەرگە شەهید دەبن. بەشێك خۆیان لەژێر گیشەگەنم دەشارنەوە و کۆپتەرو سەربازیش دەگەنەشەرگەکە کۆپتەرەکان بە نزیکبوونەوە لە گیشەگەنمەکان بای پەروانەی کۆپتەرەکان گیشەگەنمی دەبەنە ئاسمان و پێشمەرگەکانیان، بەدیل دەگرت، زیاتر لە (٤٠) پێشمەرگەیان بەدیل گرت بەشێکیان برینداریش بوون.

بێسەروبەرێکی زۆر ڕوودەدات ئەو بەشەهێزەی بێتواتە پەرتوبڵاو دەبن بەرەوسکتان و بەرەو بیتوێن و هەندێکیان دەپەڕنەوە بۆ ئەو بەری مەرگە، لەو ڕووداوە شەش پێشمەرگەی شێخ وەسانی بەدیل دەگیرێن، چەندیان لە وانە برینداربوون، دوواتر باسیان دەکەین چییان بەسەرهات، وردە وردە ئەو هێزەپەرتوبڵاوە دەگەنەوە بارەگای هێز و حکوومەتیش بەرەو بیتوێن دێت دەنگۆیەك هەبووە سەرۆك بارزانی وستویە شینەی بۆری و چەند کەسێك بەند بکات دیارە سەرکەوتنی دووەم بارزانی پەشیمان دەکاتەوە، حکوومەت ئەیەوێت بەرەو چیای ماکۆك پێشڕەوی بکات دیارە ئەو

هێزانەی باسم کردن ئەوجارەیان لەترسی شکەستی هێزۆپ باشتر خۆیان ئامادە دەکەن بێ پێشڕەوی دەکات، ئەوڕۆژەی پەلاماری چیای ماکۆك دەدات بەیەك ڕۆژ (٥) جار پەلامار دەدات شکست دەخوات شەڕیش بە سەردادێت زیانێکی زۆر بەر ڕژێم دەکەوێت، تۆڵەی شکستی هێزۆپیان کردەوە، شینەی بۆری لەوشەڕە دەسکەوتی (٢)ڕشاشی سەتخۆری لەگەڵ ٦ کەلاشینکۆف دەسکەوتی عەولاسۆر شێخ وەسانی (١) ڕەشاشی سەتخۆر لەگەڵ ١٠ کلاشینکۆف، دیارە هێزەکانی تریش دەسکەوتیان هەبووە، ئەوەی بەشداری ئەوسەرکەوتنەی کردووە، ئەو قارەمانانە بووینە:

١-تەیب هەرەوەنی
٢- وەلی مستەفامەنتك
٣- کەماڵبەگ وەرەیی
٤- شینەی بۆری
٥- عەولاسۆر شێخ وەسانی
٦/ باوەکر بالیسانی دیارەباوەکر بالیسانی، دوواتر شەهید بوو.
٧/ زەعیم عەلی.
٨/ مولازم حسێن شەهید بوو.

دیارە دووژمن لەو شەڕە زیانێکی بێژمارەی لێ کەوت زیاتر لەپەنجا لاشە لە بەردەستی هێزی پێشمەرگەبووە، ئەو شەڕە دیارە بەتەنها بەرپرسەکان نەبووینە هەر بەرپرسە و دەیان پێشمەرگەی لەگەڵ بووە .

یەکێك لەقارەمانترین پێشمەرگە بەناوی خەلیفە بووە و دوواتر شەهید بووە.

دیارە ئەو شەڕە درێژەی کێشا و بۆ ماوەی (١٤) ڕۆژ هێرش بەردەوام بوو بەتۆپ وتەیارەی هێزی پێشمەرگە وردە وردە باشەکشەی دەکرد بەرەو سەرەوەی ماکۆك، لەو کات سەید کاکە هێزێکەوە دەگاتە شەڕگەکە و ڕژێمیش دەست دەکات بەپەلاماردان هێزەکەی سەید کاکەو هێزی بێتواتە ئەوجارەشیان دەردێك بە سەربازانی ڕژێم دەکەن با بە دەواری شڕی نەکردبێت!

جگە لەبریندارانی ڕژێم (٧٦) لاشەی سەربازانی ڕژێم دەکەوێتە دەست پێشمەرگە، دواتریش بەفریش هاوکاری هێزی پێشمەرگە دەکات، لەو شەڕەش دەسکەوتی شەڕ زۆر بووە، من کە باسی ئەو شکەست و سەرکەوتنە دەکەم لە وانەیە ڕووداوەکەم وەك پێوست نەزانیبێت، باشدەزانم ئەو

شەڕە بە ماوەی یەك ساڵ هەر ئەوەنیە کەمن باسم کردووە، بەڵام بەباشم زانی بڕێکی لێ بینووسم مبەر چیرۆکی ئەو (٦) پێشمەرگەی شێخ وەسانان کە لەو شەڕە بەدیل گیران.

لەو (٦) کەسەی شێخ وەسانی لە شکەستی هیزۆپ دوویان بەسەختی بریندار بوون: حەمەدەمین ئیسماعیل وسو ) بەرپرسیان بوو، بەسەختی برینداربوو بوو گوللەیەکی دۆشکەی بە بەر دەموودانی کەوتبوو سەعید عەبدوڵلا )برینداربوو. هەروەها حسێن ڕەحمان حەسەن و عەبدوڵلا قادر ناسراو بە حاجی شێخ وەسانی و، عەلی ئەحمەد حەمەد، عەلی حەسەن وسو... لەگەڵ دیلە هاوڵاتیەکانیش وەك شوان و گاوانیش بەدیل گیابوون،ئەو کۆمەڵە پێشمەرگەیە لەگەڵ دەیان پێشمەرگە و هاولاتی و شوان و گاوان بەرە و کەرکەك دەیان بەن،دواتر ڕەوانی موصلیان دەکەن حەمەدەمین ئیسماعیل کە بەرپرسی ئەوشێخ وەسانیانەبووە برینەکەی زۆرسەخت بووە، لە نەخۆشخانەی سەربازی بەدەست و پێی کەلەمچەکراو چارەسەری دەکەن ئەوانی تر بەرەو موصل دەبەن، دوای ماوەیەك سەدان کەس بەیەك ڕۆژ مەحکەمە دەکەن هەموویان بڕیاری لە سێدارەدانیان بۆ دەردەچێت. کەسێك بەناوی (مەلاقادر ) خەرکی شارۆچکەی پردێ دەبێت، یان دەوروبەری شاعیربووە، لەو شەڕە دەست گیردەکرێت یان لە شوێنێکی تر ئەوە نەزاندراوە، دەست دەکات بە قسە دەڵێت: حاکم تۆ پیاوێکی زۆربێ ویژدانی ئەوانەی جەنابت بڕیارت بۆ دەرکردن کە لە سێدارە بدرێن زۆربەیان شوان و گاوانن، تەنها من پێشمەرگە و فەرماندەیان بوویمە، بە سەدان سەربازی ڕژێمم کوشتوە و بە کارێکی ڕەواشم زانیوە بەرگری بووە لە خاك و نیشتیمان... چی لەگەڵ من دەکەی دەستت خۆش بێت. بەڵام زۆربەیان چ تاوانیان نییە حاکم گوێ بە مەلا قادر نادات وردە وردە دەست دەکەن بە لە سێدارەدانیان مەلا قادر هەر زوو لە سێدارەی دەدەن شەهیدی دەکەن، دوای سێ مانگ حەمەدەمین ئیسماعیل وسو لە کەرکووك دەی بەنەوە ناو برادەرەکانی لەموسڵ دەی بە نەژووری برادەرەکانی خۆی، لەپەنایەك دادەنیشێت نەبرادەرەکانی کە خزمی خۆی بوون ئەو دەناسن نە حەمەدەمین ئەوان دەناسێتەوە. دیارە هۆی یەکتر نە ناسینەوە هەموویان پیس و پۆخل و ڕدێن نەتراشاو بۆ ماوەی چەند مانگ دواتریەکتر دەناسنەوە. بە قسەو بەدەنگ حەمەدەمین سەیر دەکات یەکێك دیار نیە بەناوی حاجی شێخ وەسانی،لێیان دەپرسی کوا حاجی؟ دەڵێن حاجی لەسەر مردنە یەکسەر دەچێتەلای حاجی، حاجی ناتوانێت قسەش بکات و ڕەنگێکی سپیشی هەیە لە ڕەنگی مردووان دەچێت، حەمەدەمین سەیری جلوبەرگی حاجی دەکات بە هەزاران ئەسپێ و ڕشك

لەجلوبەرگی حاجی دایە. بەبرادەرەکان دەڵێت: زووبن وەرن دوو کەستان ئەسپێی لەسەری بکوژن منو فلان وفلان لە جلکەکانی ئەسپێ دەکوژین، نەخۆشی حاجی ئەسپێ خوێنیان لە حاجی نەهێشتووە بۆ ماوەی یك هەفتە راوە ئەسپێ دەکەن لە جلوبەرگی حاجی، حاجی رۆژبەرۆژ زیندو دەبێتەوەو وای لێ دێت رۆژانە بەخۆی راوەئەسپێ بکات حەمەدمین ،حاجی لەمردن نەجات دەدات . ئەو خزمانەی شێخ وەسانان نزیکەی دووسێ ساڵ چاوەڕێی لە سێدارەدان بوون، تاکو ئەو کاتەی سەدام خۆی کرد بەهەموو شتێك و بوو بە سەرۆك کۆمار و عەفوعامی دەرکرد و ئەوانیش رزگاریان بوو.کەهاتنەوە باسی بەندیخانەیان بۆ دەکردم، بە قسە ناگەڕێتەوە سەرباری برسیەتی و لێدان شەڕی دەروونی کە ڕۆژانە خەڵکیان لە لای ئەوان دەبرد، کە گەڕانەوەیان نەبووە، کێشەی گەورەیان لەشکری ئەسپێ بووە. بێنە بەرچاوی خۆت سێ ساڵ خۆنەشووتن دەست نەشووتن ڕدێن نەتراشین، بەر نەکەوتنی تیشکی ڕۆژ بەهاوینان، نەبوونی فێنك کەرەوە لەموسل نەبوونی، گەرم کردنەوە لە زستانان، ئەوەی من گوێم لەوان بووە ناگەڕێتەوە. نازانم زۆر بە کەمی باسی شەهیدانی لەسێدارەدراوی موسڵ دەکرێت کە سەدام دەستی بەسەر حوکمڕانی عێرق دا گرت لێبووردنێکی گشتی دەرکرد، ئەو خزمانەی شێخ وەسانان ئازاد کران، زستان بوو بەفر زۆر باری بوو،خەڵکی پێشوازیەکی شایستەیان لێ کردن وە هەموو ناوچەکە هاتنە بەخێر هاتنەوەیان لە ١٦/٤/١٩٨٧ لەو بەد بەختانە دوویان بەر چەکی کیمیا کەوتن و دوواتر زیندەبەچاڵ کران گۆڕیشیان تاکو ئێستا ونە، کە ئەو دوشەهیدەبوون، یەکەم: حەمەدەمین ئیسماعیل وسو، لە کارەساتی کیمیابارانی (١٦ /٤ / ١٩٨٧ لەگەڵ (١٧) خزمی شەهیدبوون بەخۆی وبراکەی ...تاد.
دووەم: سەعید عەبدوڵڵا وسو، خۆی ودایك ومناڵێکی شەهید بوون.

هەر لەوکۆمەڵەپێشمەرگەیە شەهید حاجی کەنەجاتیان دا ئەسپێ نەی خۆن ناوبراو لەساڵی (١٩٧٩ ) بووە وە پێشمەرگە پیاوێکی ئازاو هێمن و دڵسۆز و پشوودرێژ بوو، بەشداری دەیان چالاکی کردووە، دووایین چالاکی لە قوپی سۆری سەرگەڵوی میاوە بەخەستی بریندار بوو، بە برینداری دابەزی بۆ گوندی گەرەوان بە برادەرانیشی نەگوت بوو من بریندارم، لەپەنایەك بەمنی وت منیش کەرێکم بۆ پەیداکرد بەتەنیاکەوتەرێ بۆ گوندی بەرەکە ولەوێش بۆبالیسان لەکاتێکدا برینەکەی زۆرسەخت بوو، لە ( ١٦/ ٤ / ١٩٨٧ دووبارە بەسەختی بەچەکی کیمیاوی بریندار بووە، زۆر بێ هێز بوو چاویشی کەم بینا بوون، لە ساڵی ١٩٨٩ بەپارتیزانی دابەزی و لە دۆڵی شاورێ، کۆمەڵێك جاشی خاین لە کەمینێك دا غازی بێراوەیی شەهید دەکەن و حاجی شێخ

چـاتیش به سەختی بریندار دەبێت و بەرگرییێکی زۆر دەکات به برینداری تاکوو نەجاتی دەبێت حەمست خاینان. بەداخەوە له (٢٠٠٥) شەهید بوو، بەخۆی و خێزانی بەکاریگەری کیمیا، منالێکیشیان هەر له سەرەتای کیمیاباران شەهید بوو، حاجی ناوی ( عەبدوڵڵا قادر ئەسعەد ) . ناسراوە به حاجی شێخ وەسانی، هەزار ڕەحمەت لەگۆڕت شۆڕشگێڕی گەلەگەمان.

مام حەمەدەمین پیاوێکی بەهەیبەت و دڵسۆز بوو بۆ گەل و نیشتیمان، له سەرەتای شۆڕش پێنج چەکی هێنان، دابەشی کردن بەسەر کەس و کارەکانی و کردنیە پێشمەرگە و بردنیە حەرەکانی بەرگری له گەل و نیشتیمان. زۆر برادەرم بوو، ڕۆژێکیان (کاك مەلا بەختیار ) میوانی دەبێت ئەو مەلا بەختیار ناناسێت مەلابەختیار هاوکاری دەکات، له کاری جووتیاری مەلابەختیاریش دووای نان خواردن دەست دەکات بەقسە نازانێت مام حەمەدەمین یەکێك بووە له سەرکردەکانی شۆڕشی ئەیلوول، دەست دەکات بەقسە زۆر زەمی بنەماڵەی بارزانی دەکات لەسنوور دەردەچێت، ئەوەندەی زەمی قیادە مۆقەتە دەکات مام حەمەدەمین خۆی بێدەنگ دەکات، تاکوو مەلابەختیار خۆی دادەوەشێنێت لەقسە کردن، دواتر دەڵێت: مامە رات چییە لەسەر قسەکانی من؟ مام حەمەدەمین پیاوێکی زۆرزان و دنیا دیدەبوو له وەڵامی مەلابەختیار دەڵێت: کاکە براینە ئەو دوو گاجووتە دەبینن لەپێش ماڵم بەسترابنەوە، ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ. دەڵێت هەردووکیان گاجووتی منن، هەردووکیانم خۆش دەوێن، بەڵام له جووت کردن خەتی کێیان خۆشتر بێت ئەویانم لەوەی تر خۆشتردەوێت، دوو سەعاتە قسان دەکەن، شەرتی قسە نییە شەرتی کردارە، کێش کرداری بەرچاو بوو بۆ گەلی کورد من ئەویانم خۆشدەوێت مەلابەختیار بێدەنگ دەکات . ڕۆژێکیان پێم وت کێخوا حەمەدەمین، وتی من کێخوانیم! حاجی عەولای ئامۆزا کێخوایە وتم مەعنای چییە؟ وتی وەرە بابۆت باس بکەم :

وتی من بەتەمانیم له شێخ وەسانان بڕم، نیازی هەولێرم هەیە، له هەولێر خانووم هەیە، لێرەش ئەو کۆڕیتەسەیەم هەیە! ئەگەر بچمەوە هەولێر دەبێت ببمە جاش، بە خۆم و کوڕەکانم کەوا بوو ناچمە هەولێر بۆ ئەوەی توشی جاشایەتی نەبم، لێرەش خانووەکەم بەکەلکی کێخوایەتی نایەت، حاجی عەولای ئامۆزا دیواخانی هەیە و نانیشی هەیە کەوابوو کێخوایەتی بۆ ئەو باشە نەوەك بۆ من بەداخەوە مام حەمەدەمین ناسراو بەحەمەدەمینی سمایلی، له کاتی کیمیاباران خۆی و خێزانی تەواوی منداڵەکانی شەهید بوون و زیندە بەچاڵ کران تەنیا دوو کچی نەجاتیان بوو، زیاتر له دە کەسیان شەهید بوون.

خۆشناو و دۆ و دۆشاو

*** *** ***

(ڕەوینەوە ) لە کوردەواری بۆ ئاژەڵ بەکاردێت، دیارە مرۆڤیش دەڕەوێتەوە، ئاژەڵ کە هەست بەشتێکی نامۆ دەکات دەڕەوێتەوە، بەڵام دوای ڕاکردنێکی کەم ئاوڕێك دەداتەوە لە دوای خۆی. ئەوەی لەبەری ڕاکردووە چییە؟ ئایە هەر لەدوایتی یان نا؟ کورد لەمێژە دەڵێت ئەگەر مرۆڤ ڕەویەوە وەك وئاژەڵ نییە، بەڵکوو خراپتر لەئاژەڵ دەڕەوێتەوە. شتێك هەیە لە هەوالگری پێی دەڵێن، چەکی مەترسیداری پڕوپاگەندە، کە زۆرجار ئەوچەکە لە لەشکر و تۆپ و دەبابە مەترسیدارترە، ئێمەی بەدبەخت لە ڕابردوو بەشێکی زۆرمان ئەو چەکەمان بە هەند هەرنەگرتووە. دووژمن قسەیەکی بلاّودەکردەوە ئێمە باوەڕمان دەکرد و زۆرجار گەورەتریش دەکرا لەلایەن خۆمان. ئەوەشیان لە ناوشاری خۆمان بوو... پێویستە کە قسەیەك دەکرێت ئێمە شرۆڤەی بکەین ئەو قسەیە چییە سوودی چییە؟ زیانی چییە؟ یان سوودو زیانی بۆ کێیە؟ ئێمەی کورد سەیرە زۆرجار لە مێژوودا دەڕەوینەوە، سەیرەکەی لە وەیە تەماشای دواوەی خۆمان ناکەین، ئایە ئەو مەترسیەیەی لێی دەترسین بە دوامانەوەیە یان نا ئەوشتەچییە ئێمە گوێ بەو شتەنادەین کە ڕەوینەوە هەر ڕادەکەین، دەکرێت لێرە بەولاوە کە ڕەوینەوە ناوە ناوە ئاوڕێك بدەینەوە، نازانم لەمێژ قسەیەك هەیە دەڵێت: هەراتن نیوەی دەسوەکەرە. من لەگەڵ ئەوەنیم، ئەو قسەیە پاساوی ترسنۆکییە، با منیش بیکەم .. قسەیەکی تر هەیە، دەسوەکەر پیرۆزە. لە ساڵی ۱۹۷٤ من لە شێخ وەسانان بووم وەرز هاوین بوو، هەر ئەوەندەم زانی وتیان هات، چ هات؟ حکوومەت هات. سەد دەبابە دەڕێیی دایە،خزمانی گوندی خەتێ و بێرێ و توتمەو بالیسان گەیشتنە شێخ وەسانان بەرەو بێراوەو شیوە، ڕایان دەکرد کانی بەرد وشێخ وەسانان ڕوویان لە چیا کرد،خەڵکی گەیشتە مەلەکانێ خەڵکی ئەو هەموو دۆڵە لە ڕاکردن دابوون، کەس برای کەس نەبوو، دەت وت ڕۆژی حەشرە. ناوچەکەچۆڵ بوو، بۆ ئێوارە دەنگوباس پەیدابوو، گوایە جیبێکی وەسەت لەلای زینەتێی دیترلوە کەسەێك لەو دۆڵە نەچووەتە سەرشاخی سەیرکات بزانێت مەسەلە چییە؟ هات هەرێ کوڕە هات هەرێ. لە هەمانکات دەنگی یەك گولە نەبیسترا! چییە نازانم! هات هەرێ دەبابە هاتن! ڕەوینەوە زۆر جاریتر ڕویداوە، لە هاتنی حەرەسقەومییەکان بۆ کوردستان ڕەوینەوە قەوماوەڕەوینەوە لەکاتی قوەی (سەیار ) ڕووی داوە، بۆ مێژوو لەوکات و سات ڕژێمی سوریا هێزی ناردووە بۆ هاوکاری ڕژێمی ئەوکاتی عێراق.لە ساڵەکانی ۱۹۹۱ کەوا سێ بەشی کورد ڕەویەوە لەکاتێك دا چەك و تەقەمەنییەکی بێژمار کەوتە بەردەستی کورد، لە هەمانکات هاوپەیمانەکان ڕژێمیان نیوە مردوو

کردبوو، له ساڵه‌کانی(١٩٩٦ ) وه (١٩٩٧) ڕه‌وینه‌وه یه‌کجار زۆربوو، ئه‌کرێت دوو ڕه‌وینه‌وه‌ی خۆم و ده‌وروو به‌رم باس بکه‌م. له( ٣١ ) ئاب که هێزێکی داگیرکه‌ر په‌لاماری هه‌ولێری دا، هێزی ئێمه واته یه‌کێتی توشی شکستێکی گه‌وره بوو، به‌ره‌و سنوور ڕامان کرد، یان پاشه‌کشه‌مان کرد، یـن ڕه‌وینه‌وه. دیاره ناهه‌قیش نه‌بووین، ئه‌وه‌یان باڵێ گه‌ڕێن بۆ مێژوو.. من به‌پارتیزانی له شێخ وه‌سانان مامه‌وه، دووپێشمه‌رگه‌ی تریش نه ڕۆیشتبوون، دواتر یه‌کمان گرته‌وه. یه‌کێك له‌و پێشمه‌رگانه ناوی (جه‌مال که‌مال) بوو، چه‌کێکی له شوێنێکی حه‌شاردابوو، دواتر چه‌که‌که دزرابوو، گومانی له دووکه‌س هه‌بوو، داوای له من کرد به ڕۆژ بچینه‌گوندی گابڕه. گابڕه‌گوندێکی بچووکه له نزیك گوندی شێخ وه‌سانان، دواتر برایه‌کی جه‌مالیش په‌یدابوو، بووینه سێ که‌س، به ڕێکه‌وتین بۆ گوندی گابڕه ئه‌وکه‌سانه‌ی گومانمان لێیان هه‌بوو، که چه‌که‌کیان بردبێ چووینه لایان . که‌تینه گفتوگۆ یه‌کێك له‌وان وتی: ده‌ڕۆن بڕۆن ئه‌گه‌رنا خه‌به‌ری پارتی ده‌ده‌م و ده‌ڵێم جه‌لالی لێره‌نه! له‌گه‌ڵ ئه‌و قسه‌یه بووه‌شه‌ڕمان، هه‌ندێك سه‌روگوێیان شکاند یه‌کیان ڕای کرد منیش ته‌قه‌م لێ کرد به‌بڕی نزیکه‌ی ده‌گولله باش بوو نه‌کوژرا، ڕای کرد به‌ره‌وگوندی کانی به‌رد که خه‌ڵکی شێخ وه‌سانان گوێ بیستی ته‌قه‌کانی من بوون، وایان زانی پارتی گه‌یشته گوندی گابڕه! له ته‌مه‌نی ده‌ساری به‌سه‌ره‌وه ڕاده‌کات به‌ره و چیا که ئه‌وان ڕایان کرد و ده‌نگه‌ده‌نگ په‌یدابوو، ئێمه‌ش وه‌مانزانی پارتی گه‌یشته شێخ وه‌سانان ئێمه‌ش به‌ره‌و چیا ڕامان کرد، له‌کاتی ڕاکردنی خه‌ڵکی شێخ وه‌سانان به‌ره‌و چیا چه‌کدارێکی پارتیش به‌ناوی:(عه‌زیز سۆفی مسته‌فا) له‌گه‌ڵ خه‌ڵکی گوندی ڕا ده‌کات، یه‌کێك لێی ده‌پرسی عه‌زیز تۆ بۆ ڕاده‌که‌ی؟ ئه‌دی ئه‌تو پارتی نی؟ له وه‌ڵامدا ده‌ڵێت: (په په پارتی) گێلمه گێلمێ نزانی ! دیاره عه‌زیز تۆزێك زمانی لاڵه...

ئه‌و کوڕه‌ی له‌بن ده‌ستی ئێمه ڕای کرد به‌سه‌ر و گوێلاکی خوێناوی ده‌چێته ڕێکخراوی پارتی، سه‌لام ده‌کات و براده‌رانی ڕێکخراو ده‌ڵێن: ئه‌و خوێنه‌چیه ده‌ڵێت: جه‌لالیان لێدام. ده‌ڵێن: جه‌لالی له کوێن ؟ ده‌ڵێت: له‌شێخ وه‌سانان، له‌گه‌ڵ ئه‌و قسه‌یه ڕێکخراو سواری سه‌یاران ده‌بن و ئه‌وانیش ڕاده‌که‌ن ده‌وه‌ره سه‌یری ئه‌وهه‌موو ڕه‌وینه‌وه بکه به منیشه‌وه به‌بێ هۆ !

ڕه‌وینه‌وه‌ی دووه‌م: دوای هێرشه هاوبه‌شه‌که‌ی پارتی و ده‌وڵه‌تی توورکیا بۆ سه‌ر یه‌کێتی نیشتیمانی کوردستان، من به‌مه‌به‌ستی تازیه‌ك ڕۆژێك پێش هێرشه‌که مۆڵه‌تم له‌کاك (مسته‌فای سه‌ید قادر) وه‌رگرت چوم ه‌شارۆچکه‌ی سه‌روچاوه و کاك مسته‌فا پێی وتم: یه‌ك شه‌و مۆڵه‌تت هه‌یه، هۆی یه‌ك شه‌وم ئه‌وه‌بوو: مه‌لانه‌جم شه‌هید بووبوو، هه‌موو باره‌قوڕسه‌که‌ی

فەرماندەکەمان کەوتبووە ئەستۆ. تازیەکەم کرد و بەمەبەستی گەڕانەوە هاتمە سەر جادەی نێو بازار، لەپڕ سەیارەی ئیدارەی خۆمان بەلای مندا ڕەت بوو نزیکەی چل پێشمەرگەی هەڵگرت بوو. سەد مەترێك لێم ڕەت بوون، ڕاوەستان هەر چل پێشمەرگە بانگیان کرد، هاورێ فەقێ وەرە هاتە منیش بە ڕاکردن بۆلایان چووم تا گەیشتمە ئەوان، لە دڵی خۆم ئەم وت دەبێت نەگیرێم تادەیان گەمێ، سواربووم و سەیارە ڕۆی لەسەر سەیارەکە وتم برادەرینە چی ڕوویداوە؟ وتیان: پارتی و تورکیا هات. گەیشتینە حاجی ئاوا، دواتر چوارِ قورنە لەنێوان ڕانیە و چوارقورنە وتم برادەرینە تۆزێك ڕاوەستن ئیشم هەیە. ماڵیان ئاوابێت ڕاوەستان باوەڕبکەن زۆرترسابووم لەگەڵ برادەرانی کەوتمە گفتوگۆ وتم برادەرینە تێم بگەیەنن چی بووەو چی ڕوو یداوە؟ وتیان پارتی و تورکیا لە کەپکی حەمەد ئاغا پەلاماری داین. وتم باشە برادەرینە شەڕ لەکێوێیە و ئێوە لێرە بۆ ڕا دەکەن و ئەمنیش و پساند ؟ لەو قسانەدابووم کاك تەها کانی بەردی لەڕانیەداتەوە ئەویش مۆلەت بوو وتی فەقێ چ دەکەن لێرە؟ وتم: من پسایمە لەترسان، حاروحیساب وایە بابڕۆین گەیشتینە حاجیاوە پارتی لێ نەبوو گەیشتینە سەروچاوە و شکارتە و میرگەسەر پارتی لێ نەبوو، گەیشتینە بالیسان بەرە و توتمەچوین پارتی وجودی نەبوو، لە نێوان بالیسان و توتمە گەیشتینە هێزێکی خۆمان کاك جەبار فەرمان و کاك مستەفای سەید قادری و مامۆستا عەزیز و عوسمانی حاجی مەحموود، کۆمەڵێك پێشمەرگەیان لەدەوروبەریوون چوینە لایان و وتیان ئێوە زۆرپاك و خاوێن دیارن، وتمان لەشار بووین، جەبار فەرمان وتی هاورێ فەقێ هیممەت بکە، کاك (عەدنانی حەمەی مینە) لەو کێوەیە برۆ هاوکاری بکە، وتم: باشە تاکوو من لێیان نزیك بوومەوە کاك عەدنانیش دابەزی کاك عەدنان زۆر زیرەکانە پاشەکشەی کردبوو، لە کەپکی حەمەد ئاغ دانەبەزی بوو بۆ دەشتی گوندی خەتێ چیاو چیا پاشەکشەی کردبوو، بۆ مێژووش هێزەکەی کاك عوسمان حاجی مەحموود پشێوی پێوە دیار نەبوو، شوێنەکانی خۆشیان چۆڵ نەکردبوو، هێزێکی باشیشی دایە من دابەشم کردن لە قۆپی سەرگوندی توتمەو میان و چەند شوێنێکی تر کاك عوسمان پیاوێکی بەهیممەت و نەرمونیان بوو بووبووە خۆشناو، ماوەیەکی زۆر لەناوچەکەمان بوو... لە ئێمە شارەزاترە لەشاخی سۆرو کڵاو قاسم بەڵێ، ئەوە ڕەوینەوەی پێ دەڵێن، چونکە ڕاکردن ترست لەدووە ڕەوینەوە هەست بەترس کردنە.خەڵکیش ناهەق نەبوو لەڕەوینەوە، چونکە بە بەرچاوی خەڵکی لە گوندی توتمە گاوانی گوندی بەناوی (میرنەحمەد مەلەکی) کوژرا کە تەنها گاوانی گوندی بوو، لە گوندەکانی خۆشناوەتی بێ ڕێزیەکی زۆر بەمەلاو حاجی و ریش سپیان کرا.

**ـلو شەرم دەکات باسی بکات ! ناشکرێت باس نەکەین دوای لێدانێکی زۆرلەمەلا کەمالی گوندی ێرلوە، قۆڵیان شکاند، زۆریان لە خەڵکی دابوو، زۆر ئەزیەتی مەلا تەهایان دابوو. لە هەندێك گوندان سواری سەرپشتی ریش سپیان بووبوون، یان مەجبووریان کردبوون وەك ئاژەڵێ چوارپێ بڕۆن بە ڕێ داو زۆر زۆری تر. سەیرەکەش لەوەبوو بەشی زۆریان دۆست ولایەنگری پارتی بوون، چونکە ئەوەی یەکێتی بوو یان دۆستی یەکێتی بوو خۆیان حەشاردابوو ئەو دووساڵەی باسم کرد ڕاکردن زۆر زۆر بوو، لەناو هێزی پارتی و یەکێتی ... ڕەوینەوەی سێیەم: من و هاوڕێ کاوە و چەند برادەرێك لە کوری تەنگ لە ئالانە دەشاخی دابووین، جێگامان زۆر باش بوو، بەسەر دەوروبەر دا باڵادەست بووین ..( جەبار فەرمان ) ئاگاداری مەلا نەجم دەکاتەوە، کەوا لە ئالانە و دەوروبەری پاشەکشە بکەن، وەرنەوە کەپکی حەمەد ئاغا، زانیاریمان هەیە هێزیکی پارتی و تورکیا بە نیازە پاڵپشت بە هێز ئاسمانی پەلامارمان دەدات مەلانجم وابەباش دەزانێت، دەست لە ئێمە نەدات کە ژمارەن حەوت پێشمەرگە بوو، شوێنمان باش بوو مەلانەجم ئاگاداری هێزەکەی دەکاتەوە کە پاشەکشە بکەن بۆ کەپکی حەمەد ئاغا، ژمارەی هێزەکە ئێمە زیاتر لە (١٣٠٠) کەس دەبوو، بەبیستنی ئەو هەواڵە زۆربەی هێزەکەی ئێمە ڕەویەوە بەشێکیان گەیشتنە قەڵادزە و دەوروبەری، ئێمەش ئەوشەوە لە شوێنی خۆمانماینەوە، بۆ بەیانی نزیك کاتژمێر دەی ڕۆژی دووەم، ئێمە هەر لە شوێنی خۆبووین ئەو شەوڕۆژە پارتی نەیدەزانی ئێمە ئەو ژمارە کەمەین، بەخۆشمان نەماندەزانی ئێمە بەتەنیا شەڕ دەکەین مەلانەجیمیش کەبەرەو کەپکی حەمەدئاغا دەچێت مینیکی لەژێر سەیارە تەقی، کە پارتی دانابوو . ئەو هێزەی لەگەڵ ئەویش دەبن بێسەروبەر دەبن مەلانەجم خۆی و دوو پێشمەرگە دەچنەوە سەر کەپکی حەمەد ئاغا بۆ ڕۆژی سێیەم من گەیشتمەوە مەلانەجم. پارتی لە ئێمە وەخەبەر هات و ئێمەش زۆر ئازایانە هەراتین و ڕەوینەوە. سەیرەکە لەوەی بوو پارتیش لە ئێمە خراپتر دەرویەوە، من ئاگام لە ڕەوینەوەی هێزی پارتیشە باتوڕەنەبن خۆیان باسی بکەن باشترە . من پێم وایە بەشێك لەو ڕاکردنە دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی چەند ساڵ بوو ئەو هێزانە دە شەڕ دابوون، ماندوو بووبوون لە شەڕ تێر بووبوون، یان بێزار بووبوون، یان فێر بووبووین باشتر بیر بکەینەوە.**

*** *** ***

**لە هاوینی ١٩٧٤ ڕژێم بە بەرنامە کەوتە بۆردومانکردنی گوندەکانی کوردستان بەتەیارەی جۆراو جۆر وەك: باجەر تەیارەی میك وەسیخۆش بەکار دەهات، ساروخەکانیان هەمەجۆر بوون وەك**

شێستیر، سارۆخی بچووك پەڕدار بوون، سارۆخی (٢٥٠ ) کیلۆی و (٥٠٠ ) کیلۆی وە(١٠٠٠ کیلۆی که پێیان دەوت ناپالْم له زۆربەی ناوچه رزگار کراوەکا ن و له دۆڵی خۆشناوەتی ڕێێ نەبوو چەند گوندێك بۆردمان نەکرێ، هەندێك گوند به تایبەتی وەك چیوەی سەرێ و هەرمك و شیوه و بێراوه و شێخ وەسانان وکانی بەردو بالیسان وتوتمەو خەتێ و هەروتەکەون و بناوی و دۆڵی مەلەکان نازەنین و فریز دۆڵی سماقوری و گەرەوان و وەرتێ و زۆ رشوێنی تر له هەموو گوندان شەهید وبریندار هەبوون به تایبەتی هەرمك کارەسات بوو، به یەك ڕۆژ که له (١٦ / ٢ / ١٩٧٥) ١٦ کەس شەهید بوون بۆردمانەکان کێشەی نەبوو کێ دەکوژی منداڵ ژن، پیر ئاژەڵ،داروبەرد تەیروتار گرینگ ئەوەبوو کورد بکوژن، یان هەمووشتێك بتۆقێنن تایه عەرەب ڕۆژێك له ڕۆژان داوای لێبووردن لەگەلانی کوردستان دەکات؟ باوەڕناکەم! چونکه ئەوەتی هەن یەك شت دەزانن ئەویش بکوژە. له گوندی هەرمك له خانەوادەیەك ( ٥) کەس شەهید بوون که ماڵی کاك سەباح میرگەسەریه وەله خانەوادەیێکی تریش ( ٧) کەس شەهید بوون یکیك له جو نەمەرگەکان که بووکی حوت ڕۆژە بووه به ناوی( کابان ) ، وه له گوندی بناویه له بەردەرکی مزگەوت چوارکەس شەهید بوون ئایه هۆیەکەی چیه خۆشیان نازانن .مەبەستم هەموویان نیه پیاوی باشیان هەیه دیاره له زۆری ڕێژەی عەرەب باشەکەیان کەمه زۆریش کەمه ئەگەر باوەڕیش ناکەی مێژووی خوێناوی عێراق بخوێنەوە ئەو کاته جەنابیشت دەڵێی: کابرای خۆشناو ڕاست دەکەی ئەوەتی عەرەب هەیه بەس دەکوژی هیچیشی به هیچ نەکردوه و ناشکات،چونکه نەریتێکه و تایبەت بەخۆیانه به ئاسانی دەستبەرداری نابن، به درێژایی هەزاران ساڵه گەلی خۆیان دەکوژن لەسەر مەزهەب .ئەی چۆن ئێمه ناکوژن......؟

*** *** ***

له هاوینی ١٩٧٤ مانگی حەوت حاجی ئەحمەد و قادر له سەر جۆخینێ بوون بۆ لێك دەرکردنی کاو و دان، زەینەب به خۆ و دوو کچی تەمەن دووسێ ساڵه خەریکی نان کردن بوو. منداڵەکانیش یارییان دەکرد، سەلامی خرپنی تەمەن سێزدەساڵه له لای داکی دانیشت بوو. دوو تەیارە پەیدابوون پەلاماری گوندیان دا، قادر عەلی پارچه پارچه بوو، حاجی ئەحمەد زۆر به سەختی بریندار بوو، سەلامی جوان و خرپن شەهید بوو. خوشکه زەینەب لەکاتی تەیارەکان دادە ڕژێن به مەبەستی ساروخ فرێدان، دڵی خەبەر دەدات که نیازیان کوشتنی منداڵەکانه، له بەر نانی هەڵ دەستێ و به غاردان خۆی دەگەینیته منداڵەکانی هەر دوو منداڵەکه دەخاته ژێر خۆی و

چ قەڵغان، بۆ ئەوەی خۆی بکاتە قوربانی منداڵەکان واشی کرد، سارۆخێك لە نزیك زەینەب نحات دەیان پارچە بەر زەینەب دەکەوێت، زەینەب بە برینداریش لە سەر منداڵەکان هەڵناستێ تاکو تەیارەکان دەڕۆن. منداڵەکان بە سەلامەتی نەجاتیان دەبێت، زەینەب زۆر بە خەستی بریندار بوو، بەو برینانە بەپشتی ئێستر ڕەوانەی ئێران کرا، بە مەبەستی چارەسەری، بەداخەوە لە غەریبی مردوو گۆڕەکەشی ونە، زۆر بەداخەوە!

***   ***   ***

شەڕ زۆر گەرم بوو لە ماکۆك و کەپکی حەمەد ئاغا و شاخی سۆر، تەیارەکان زۆر بە خەستی سەنگەری پێشمەرگەکانی بۆردوومان دەکرد، سەرباری تۆپبارانکردنی سەنگەرەکان یەکێك لە جۆرەکانی گوللەتۆپەکان لە سەرسەنگەرەکان دەتەقیەوە، واتا:لە مەسافەی پەنجامەتر لە ئاسمان کە چەکێکی سوتێنەر بوو. هاوینەکەی باش بوو، کە گەیشتینە زستان ئەو ڕۆژانەی بەفر و باران نەبایە بەو سەرماو شەختەو سۆرە بەندە پێش گەزەنگی ڕۆژ نابووا کەس لە گوندی بمینێ لەترسی تەیارە کەتەماشای منداڵت دەکرد، بەجلکی دڕاو و بە پێخواسی لە سەرمان و لەترسان و لەبرسان دەلەرزین. لە بەرچاومە قەت لەبیرم ناچی منیش یەکێك بووم لەوان زۆر لەتەیارە دەترسام، هەقە جیلی نوێ ڕەچاوی باری دەروونی ئێمەبکات هەندێك لێبووردنیان هەبێت بەرانبەر بە ئێمە ئەگەر توشی هەڵەیەکیش بووین لێمان ببوورن، ئەوەی ئێمە دیومانە ئەو جیلە بیبینێت نموانەیە شێتیش بن، هەموو گوندە ڕزگارکراوەکان وەك ئێمە و خراپتریش دەژیان؟ نموونەی شاری قەڵادزە بە ناپاڵم دەیان قوتابی شەهید کرد، هەموو بەیانیان هەر لە ئەشکەوتان نانمان دەخوارد تاکو پێش مەغریب ناداتینەوە، باری گران لە سەر خوشك و دایکان بوو، بە شەو نانیان دەکرد و شیویشیان بۆ بەیانی لێدەنا.

ناکرا لەو زروفە سەختە پشت لە کاروکاسبی بکەن، دەیان جار لەکاتی دروێنە کە دەنگی تەیارە دەهات وەك کەوبارە خۆیان دەشاردەوە لە هەر شوێنێك ئیشت کردبا وەختێکی پێویست بووبا، پێش هەمووشتێك دەبووایە کونە تەیارە لێ بدەی. هاوینان لە کەپران زۆربەی ماڵان کونە تەیارەیان لێ دەدا، خەمێکی تر خەمی باب و براو کەس بوو، لە جەبهەکان ئەوانیش خەمی ماڵ و منداڵیان بوو، پارەش زۆر کەم بوو، ئەگەر پارەش هەبووایە کەرستەی خواردن کەم بوو، نە دەگیشتە ناوچەکەمان بە قاچاغ بوو، لە ڕێی شاری کۆیە بە قاچاغ و بەپشتی وڵاغ

**دەهات،نەخۆشخانە نەبوو داوودەرمان بە دەست نەدەکەوت، بەشێکی زۆر وردە وردە بەرەو ئێران دەڕۆیشتن لە برسان و لەترسان.**

**دیارە لەسەران سەری کوردستان شەڕو بەرگری هەبوو، لەلای ئێمەش شەڕ گەرم بوو لە چیایی ماکۆك شیشار لە سەرەتایی شەڕەکە دوژمن نەی توانی پێش ڕەوی بکات بە سەدان پێشمەرگە شەهید و بریندار بوو هێزی پێشمەرگەو فەرماندەکان دەوری بەرچاویان هەبوو و،(عەلی شەعبان) سەرباری خۆسەپاندن بەسەرناوچەکمان و دەوروبەری زۆرداری، کۆمەڵێ سیفەتی سەرکردەیی تێدا بوون، پیاوێکی نەترس بوو، بە هەیبەت و خاوەن بڕیار بوو، بڵێین دەوری بەر چاوی هەبووە، ئەوەی گوێم لێ بووە ئەوکات باسی هیمەتی دکتۆرخالید دەکرا، کە دەوری بەر چاوی هەبووە لە ڕامالینی سوپایی داگیرکەر، لە چیایی ماکۆك. لە قۆڵی ڕۆژئاواش بە هیمەتی پێشمەرگە و سەرکردەکانیان وەك: تانجۆ و ڕەحمان شیخ وەسانی و زۆری تر، ڕژێم نەیتوانی چەند مەترێك بێتەپێش. لەشەرێك دا، رەزا شیعەیی، دەبابەیەکی شکاند، رەزا لەلایەن بارزانی خەلآت کرا، لە شاخی سۆر و کراو قاسم پێش لە ڕژێم گیرابوو، ڕژێم بەردەوام بە تۆپ وتەیارە شەرگەکانی ئاگر باران دەکرد، شێخ ڕەسوول مامەجەلکەیی، لە کراو قاسم عەدەد دۆشکەبوو ئەوپیاوە نەیدەزانی ترس چییە؟ هەر لە بەیانی تا ئێوارە شەڕی لەگەڵ تەیارە دەکرد، وەك نێرەکەو بە دۆشکە دەیخوێند وەزعی پێشمەرگە لە ڕۆژهەلآت و ڕۆژئاوا زۆر باش بوو، دوژمن لەبەرەو پێشچوون بێ هیوا بووبوو، لە ڕۆژئاواش دەیان پێشمەرگە شەهید وبریندار بوون، ئەوەی ئەوکات گوێم لێدەبوو، دواتریش چەندان بەسەرهاتم گوێ لێ بووە، خەڵکی کوردستان گلەییەکی بەرچاویان لە بارزانییەکان هەبوو، وەك جیاوازی کردن لەنێوان خەڵکی و بارزانیەکان لەڕووی چەك و تەقەمەنی لەڕووی هاوکاری پارە، بۆ نموونەوەك: چەکی برنۆی دارشوشە زیاتر دەدرایە بارزانییەکان. لە بێتواتە چەك دابەش دەکرێتە سەر کۆمەڵێك پێشمەرگەی بارزانی و سۆرانی. ئەوەی سۆرانیەکان هەمووی چەکی برنۆی ئاسایی بووە، ئەوەی بارزانییەکان دار شوشەبووە. کەسێك بەناوی (حەمەڕەش) لەناو ئەوپێشمەرگانە دەبێت بەچاوی خۆی جیاوازییەکە دەبینێت دەکەوێتە ناڕەزایی کە عەیبە جیاوازی دەکەن، بارزانیش وەك ئێمەپێشمەرگەن چییان لە ئێمە زیاترنییە، لەسەر ئەوقسانە کاکە حەمەڕەشی دەگرن هەمووگیانی ورد دەکەن، لێدانێکی باش دوای پانزە ڕۆژ ئازادی دەکەن و دەیکەنە کرێکاری نانەوا لەبێتواتە. ناوبراو لەفرسەتێك ڕادەکات. بەسەرهاتێکی تر، لەدەمی مام مەحموود خۆرانی پشت سەفین ڕۆژێکیان بەئیش دەچێتەلای**

مەقەری سەرۆك بارزانی لەو سەفەرەی بۆ ماوەی چەند ڕۆژ لەوێ دەمینێتەوە، ڕۆژانە دەچێت نان بینی لە فڕنی کەسێکی سۆرانی دوو جەمەدانی سۆری بەستینە و بەسۆرانیش قسە دەکات، ئەوکاتیش ئێستاش لەلایەن خەڵکی ئاسایی نییە سۆرانیەك جەمەدانی سۆر ببەستێ، خەڵکی بەچاوێکی کەم سەیری دەکات دیارە مام مەحموود خۆرانی هەموو ڕۆژێ بەغەرەزەوە سەیری ئەو کەسە دەکات دوای کارەساتی (١٩٧٤) بەسودفە مام مەحموود لەگەڵ کەسێك بووە ئەوکەسە بەمیوانی دەچێتە ماڵی کەسێك دووای سەلام و چاك و چۆنی، مەحموود خۆرانی سەیر دەکات خاوەن ماڵ کابرای سۆرانییە کە دوو جەمەدانی سۆری دەبەستن،دوای دانیشتن،مام مەحموود دەڵێتە کابرای، کابرا ئەتو فلان کەسنیت، دوو جەمەدانیت دەبەستن ؟ کابرا دەڵێت: بەڕێوەڵڵا من بووم. مام مەحموود دەڵێت: خێر بوو ئەودوو جەمەدانیەت لەسەری دەنان، کابرا دەڵێت لە خۆشی نەبوو ئەمری سەرۆك بارزانی بوو. بابۆت باس بکەم بۆ جەمەدانیم سۆر بوون، من لە فلان گوند دادەنیشتم، لە باڵەکایەتی دوو ئێستری باشم هەبوون، ڕۆژێکیان دوو کەسی بارزانی پەیدابوون وتیان ئێستران کورتان کە بابڕۆین منیش ئێسترم کورتان کردن و ئەوان سواری ئێسترەکانی من بوون، منیش کەتمە دوایان، ئەو بێویژدانانە زۆر بەتوندی ئێسترەکانیان دەڕواند منیش دەبووایە لەدوویان غاربدەم، زۆر هیلاك بووم، گەروم لە تینان وشك بووبوو، ئەوەندەی غاردەم، دواتر بانگم کردن وتم ڕاوەستن، ڕاوەستان و تم برادەرینە خودا هەڵناگرێت بەو شێوەیە دەڕۆن ناوەناوە یەکتان وەرنەخوارێ منیش با ماوەیەك سواری هێسترێ بم، یەکیان وتی: برۆ ( سەی پیس) ڕانەوەستی، کە گوێم لەو قسەیە بوو شێت بووم،ئێستر ئێستری خۆم بێت و بشم کەنە (سەگ )، ناوی خوام لێهیناو کابرای بارزانی برنۆی لە پیشەخۆ داناو پەلامارم دا و دەستم گەیاندە لولەی و برنۆم کەوتە دەستم و سوارم کرد بە ئەوەی ترم گوت: چەکت دانێ ئەگەرنا هەردووکتان کوژراون. ئەویشم چەك کردو ئێسترێکم لە دوو ئیسترەکە خست و سواری یەکیان بووم و هەردوو بارزانییەکەم دانەپێش خۆ، بارزانیەکانم مشاوەش کرد ئارەقیان لەتۆقێ سەری دەبنی پێیان دەڕۆی هەردووکم بردنە مەقەری بەتالیۆن. چیرۆکەکەم بۆ گێرانەوە ئەوان دەست خۆشیان لێ کردم، چەکیان دایەوە ئەودوو بارزانیە و ڕۆیشتن. دواتر من لە رایەتێ بانگ کرام لێدانێکی باشم خوارد دوای ماوەیەك لەبەندیخانە ڕۆژێك دەریان هێنام و بردمیانە لای سەرۆك بارزانی کە چوم بارزانی پیاسەی دەکرد گۆپالێکی پێ بوو وتیان: ئەزبەنی ئەو مرۆیە دوو بارزانی چەك کردوونە، بارزانی گۆپالێکی بۆ زگی هێنانم و وتی تو ئەومرۆیەی مرۆیی من چەك بکەی؟ وتی: برۆن دوو جەمەدانی سۆری بۆ

بێنن، دوو جەمەدانی سۆریان هێنان و دایانەدەستم وتی: بیبەستە منیش هەردوو کیانم بەست بارزانی وتی: ئەو دوو جەمەدانیانە نەبەستی دەتکوژم، بڕۆن با لە فرنێ شۆل بکات، من بووم خزمە کاری ئەوانەی نانیان دەکرد، تاکوو شۆڕش تێکچوو، ئەوەبوو چیرۆکی جەمەدانیەکانی من.

وەزۆرشتی خراپتریش ڕویدایە باس نەکردنی باشترە دیارە لەناوبارزانیەکانیش پیاوی مەرد هەبووە نموونەی (تاغۆ، عەلی مستێ و، مام رەمەزان ) و زۆری تریش عەشیەتێك بێ پیاوی باش نابێت، لە ناوچەکەمان زۆرجار باسی (عەلی شەعبان ) دەکرێت بە خراپە لە ڕابردوو کە دووای خراپەکانی (عەلی شەعبان) دادە دەچی، بەشێك دەستی خەڵکی خۆمانی تێدابووە، دەبێ هەڵەی گەورەیان بە(عەلی شەعبان) کردووە، یەکڕیزی و یەك هەڵوێست نەبووینە، لە کارەکانی عەلی شەعبان بەڵێ کێشەکە لێرەیە.

ئەتوانین نموونەیەك بینینەوە کۆمەڵێك مە لامان هەبوون باناویان نەدەین باشە یەکێ خەرکی شاری کۆیە بوو لەلای عەلی شەعبان کاریان ئەوەبوو فەتوای شەرعی دەریکەن . عەلی شەعبان جێبەجێی بکات. کەسێك بەناوی مستەفا ئەگەر هەڵەنەبم پێم وایە خەڵکی گوندی (حوجران ) بووە هەڵەیەکی لەگەڵ ژنێك ئەنجام دابوو... لەلایەن عەلی شەعبان دەست گیرکرا جەماعەتی فەتوا بریاریان دا کەوا مستەفا رەجم بکرێت! دیارە لەشەرع رەجم هەیە، بەڵام کۆمەڵێك شەرت و شروتی هەیە، وەك بەردەکان لە دنکە نۆك گەورەترنەبن، نابێت لە کلتی هاویشتن قۆڵت بکەیەوە، بەردەکانیش ڕێژەیان دیارە. لە رەجم کردنی ئەوکەسە هیچ شەرتێکی شەرع رەچاو نەکراوە، بەڵکوو بە بەردی زیاتر لە دەکیلۆ و سێ کیلۆ، کابرا لەبەری دەکشایەوە و پەتەپلی سەری مستەفایان دادەدا لە ناکاو مستەفا لە بن بەردان رادەپەڕی لە ترسی گیانی کەسێکی بارزانی دیداتە بەر برنۆیان و دەیکوژێت! نازانم چیی بڵێم لەسەر ئەو بارزانییە؟؟ لەهەمان کات جەماعەتی فەتوا لە دیارمستەفا وەستاون، مستەفایان ورد ورد کرد بە بەردی گەورە تاکو مرد بەمردیش وازیان لێنەدەهێنا، ئەوەفەتوای مامۆستایان و ئەوەش بریاری جێبەجێکردن لەلایەن عەلی شەعبان؟! علی شەعبان هەرکارێکی نابەجێی کردبێت هەرتاوانێکی کردبێت، مام خۆشناو راوێژکاری بوون وەك کێخواو مەلا و شێخەکانی دەوروبەرمان، کەوا بوو وشیارکردنەوەی گەل زەرووریەتێکی گەورەیە ئەگەر گەل وشیاربێت پێوست ناکات هێزو چەك و تەقەمەنیت هەبێت، لە کوردستان ئەگەر چەکی نەوەویشمان هەبێت گەل ناوشیاربێت وەك ڕابردوو لەئێستاوە بەتەمای هیچ مەبن..دووێنێ بوو بەشێکی زۆر ئەو گەلە

حصتی خۆی ولاتی خۆی ویران دەکرد، وەك مەیموون سەمای لەپێش دووژمنان دەکرد، بەناوی حش و مەفرەزەخاسە و جاسووس و زۆر شتی تر کە ڕووی دەوێت باسی بکات... ئەمڕۆش زمانیان حو بست درێژە!

*** *** ***

من وەك خەرکی بیرناکەمەوە لە زۆردار، چونکە زۆردار لە خۆیەوە دروست نابێت، بەڵکو خەڵکی نا وشیار دروستی دەکات، دیارە خەڵکی ناوشیاریش کەم نین، ڕێژەیەکی زۆر پێك دێنن لەهەر گەل و نەتەوەیەك . دەکرێت بە چەند وشەیەك پێناسەی خەڵکی ناوشیار بکەین هەرکەسێك چلو لەڕاستی بنوقێنێت و بەرژەوەندی گشتی بخاتەژێرپێی لەبەر بەرژەوەندی خۆی ئەوکەسە حوشیارە... ئێمە کێشەیەکی زۆرگەورەمان هەیە ئەویش کەسێك من تێرکاو پۆشتەم کات و پارەی بخشم بداتێ، کێشەنییە گەل و ولاتەکەم ویران دەبێت یا نا لەژێر هەر ناوێك بێت داروبەردی بۆ دەسوتێنم گرنگ تێرم کات! ئەوەشمان وەك تاژەڵێکە با ناوی نەهێنین، سیفەتێکی ترن هەیە ئەویش باوەر بەخۆ نەبوونە وەك شێر و ڕێوی لێ دێت، خۆمان بەڕێوی دەبینین بێگانەش بەشێر دەبینن. ئێ برای ئەزیز مرۆڤ هەرمرۆڤە چ عەرەب بێت، یان فارس یان تورك یان کورد. هەموومان زۆربەی خەسڵەتی یەکترمان هەیە، ئەوەی جیاوازە ئاستی وشیارییە، لەنێوان مرۆڤەکان دەگەرێتەوە سەر وشیاری و دڵسۆزی بۆ بەرژەوەندیی گشتی... کێشەیەکی ترمان هەیە زۆری ناوشیار و کەمی وشیار زۆرینەی ناوشیار بالادەستەو گونی خۆی و گێزەر لێك ناکاتەوە، وشیارەکەش دەبێتەسوتەمەنی ... جوگرافیای کوردستان وا هەڵکەوتوە ئەگەرکورد خیانەت نەکات لەگەل و ولاتی خۆی کەسیش پێش لە دووژمن نەگرێ دووژمن ناوێرێت بچێتە زۆربەی شوێن،کورد دەڵێت کەروێشکی هەر ناوچەیەك بە تاژی ناوچەکە نەبێت راو ناکرێت. ڕووڕەش بن خاینان. لەسەرەوە باسی خزمانی بارزانیانم کرد بارزان وبارزانیەکان لە بەرگری و قوربانیدان لە کوردستان شاراوەنییە پشکی شێریان بەرکەوتوە، لە ڕاگواستن و دابەش کردنیان بەسەر گوندەکان ئەگەر هەڵەنەبم لە سیەکان بەسەر گوندان دابەش دەکرێن، خەڵکی خێریان پێ دەکردن، من ئەو قسەیەم لەباوکم گوێ لێبووە دەی وت : لەجیاتی ڕون بۆ چێشت لێنان، قەزوان و گوێزیان بەکاردینا لە هەژاری. واتە ئەو هۆزە لە ١٩٤٥ تاکو ١٩٩١ بەردەوام لە شەڕ و کوشتوکوشتار و ڕاگواستن و دابەشکردن و ئاوارەبوون و تاکار گەیشتە زیندەبەچاڵکردنیان بە کۆمەڵ...هتد.

ئەوەی تۆزێك ویژدانی هەبێت دەبێت ڕێز بۆ ئەو هۆزەدابنێت لێرە و لەوێ هەڵەو غەدریش هەیە، دیارە ئەوانەی کاری خراپیان کردوە ئەوەیان مەسەلەیەکی ترە، ئەگەر بەوردی و بەوژدانەوە بەرابردووی مەلامستەفادا بچی لەساڵی (۱۹٦۱ تاکو ساڵی ۱۹۷۰ بەراستی ئەوپیاوە پاڵەوان بووە، پیاوێکی بە توانابووە. پیاوێکی ئازابووە، لەناو ئەو هەموو کێشەقورسانەی ئەوکات کە ڕووبەڕووی ئەوپیاوە بووەتەوەئەوکات کێشەکان یەکجار قورس بووینەو تێکەڵاوبووینە شەڕی ڕژێم و شەڕی دەرەبەگەکان و شەڕی شوعیەکان و شەڕی جەلالیەکان و شەڕی نەبوونی و شەڕی ناوشیاری پێشمەرگە و دەیان ودەیان کێشەی تر. سەرەنجام بۆیەکەم جار کورد لە زاخۆ تاکو خانەقین هەست بە کوردایەتی بکات و هەست بەیەکرێزی و هەبوونی خۆی بکات، یەکێتی گەل دروست دەبێت کە گۆڕانێکی گەورە بووە لە وشیاری نەتەوەکەمان، دوور لە میرومیرایەتی و ناوچەگەریەتی. من وەك فەقێ ڕێزم بۆڕابردووی ئەوپیاوە هەیە، کەسیش بێ کەموو کورتی نییە. بۆ خۆم ڕقم لێتە بۆ تۆنا، واتا ئێمە کە ڕقمان لەبارزانیەکانە لەسەر هەڵەکانیان بێت، با ئەو ڕقەمان نەگاتە ئەو ئاستەی دووژمن پێی دڵخۆش بێت، بۆخۆمان ڕقمان لەبارزانیەکان بێتەوە نەوەك بۆدووژمن. بارزانی و بارزانیەکان خوێن و گۆشتی ئێمەن برای ئێمەن، زۆرجار هەندێکمان لە ئێمە و ئەوانیش قسەی بێ مانا دەکەین، وەك بارزانیەکان واو وان، یان ئەوان دەڵێن: سۆرانیەکان وا و وان، ئەو قسانە زۆر بێ مانان خزمەتی کەس ناکات، تەنها دووژمنان نەبێت. پێویستە کورد شتێك بکات بارزانیەکان گومانیان نەمینێت، لە پارت و ڕێکخراوی جیا جیا. پێویستە حیزب و ڕێکخراوەکان کار لەسەر ئەوە نەکەن ئەو بنەماڵەیە بەرەو نەمان ببەن..بارزانیەکانیش پیویستە خۆیان لەگەڵ ڕۆژگار و سیستەمی سیاسی بگونجێنن، کەوابوو بە هەموومان خزمەتی گەل و نیشتمانی خۆمان بکەین، ببینە سێبەریش بۆ پارچەکانی کوردستان و تەنانەت دووژمنانیش، من بەگوێرەی تەمەنی خۆم لەگەڵ دووکەسی بارزانی لەنزیکەوە پێکەوە ژیاوم لەساڵی ۱۹۹۲ ئەوانیش مام تانجۆ بارزانی و مام ڕەمەزان. مام ڕەمەزان ماڵی لە بێخمەبوو ئەوکات ئەودوو پیاوە نموونەی پیاوان بوون، لە هەموو ڕووێکەوە دتوانم شایدی بۆ تانجۆ بارزانی بدەم، چونکە ئەو پیاوەگەورەیە زۆر لە خۆشناوەتی ژیاوە، بە هەموو تەمەنی خۆی غەدری لە کەس نەکردوە، خۆی پێ لە خەڵکی گەورەتر نەبووە، دەست وداوێن پاك بووە، تا بڵێی پیاوێکی ئازاش بووە، شەرنەماوە بەشدارنەبێت، لە ناوچەکەمان وەسفی ئەو پیاوە تەواونابێت، ئێمە برای یەکترین زۆربەمان بە ئەقڵی حیزبایەتی دەڕوانینە یەکتر و ناکرێت لەبەر چەند کەسێك سەدان

هەزار کەس تاوانبارکەی.. قابیلی قبوولّ کردن نییە ، ناکرێت کراوی عەلۆی لەسەری جەلۆی نێین!
لە هەموو ناوچەکانی کوردستان پیاو هەیە و پیاوۆکەش هەیە. من پێم وایە ئەوەی بەخۆی بلێت کوردم دەبێت سەری رێز بۆ ئەو خوشکە بارزانیانە دابنوێنیت، کە بەبێ پیاو دەژیان لە هەریرو هەولێر و دەوروبەری من قەت ئەورۆژانەم لە بیرناچێت، بە ڕووسوری بە کرێکاری و کاری دەست نتێکیان بۆ منداڵان پەیدا دەکرد وەك دروینەوەی نۆك و هەڵقەناندنی پیواز و گیشەکردن و دروستکردنی دووگرد و گۆرەوی و لیفە و شتی تر بەراستی کارێکی سەخت بوو بۆیان و رۆژگارێکی سەخت بوو بۆ ئەوان... سەرباری لەدەست دانی ئەزیزانیان ڕووبەڕووی دەیان کێشە دەبوون، بەهەزاران کچی ناسك ونازداریان شویان نەکردوو پرچی سپیان نواندەوە لە چاوەڕێی ئەزیزانیان.

ناکرێت باسی شتێك نەکەین ئەویش بەشێکی زۆر خەڵکی کوردستان و بەتایبەتی هەولێری خەڵکی بە شەرەف و دڵسۆز بۆ گەل وڵات هاوکاریان دەکردن زۆر جار کەرستەکانی دروستیان دەکردن.خەڵکی دڵسۆزو نیشتیمانپەروەر ئەو کەرستانەی پێوست نەبوو، دیارە لێی دەکرین بەپارەیەکی باش وەك هاوکاری کردنیان... لە هەمانکات مستەشارەکان مێزیان بۆ پێپەتیەکان و کورە ...ن، دەڕازاندەوە ئەوەندە لووت بەرزو لەخۆبایی بوون ئەوخوشکانەیان لەسەر شەقامەکان نابینی، سەیرەکە لێرەبوو حەیاچونەکە لێرەبوو یان بێ حەیای لێرەبوو بێناموسی لێرەبوو، بە زستان هەزارکەس کە ڕۆژانە ئەو خوشکانەیان دەدیت لەسەر شۆستەی شەقامەکانی هەولێر وەك (هەرامە) بۆ دووژمن هەڵدەپەڕین، نە شەرم و نەحیا،خۆشیان بە پیاودەزانی و ڕانکو چۆغەری مەرەز لەبەر و پێڵاوی بن پەڕۆ لەپێ و نیشانی ئازایەتیان لەلایەن دووژمن بە بەرۆکیەوە دەکرا، شانازیشیان پێوە دەکرد!

*** *** ***

ناڵێم کورد پیاوی تێدا نییە دیارە بەوچاوانەم بە هەزاران گەنجی ئەو گەلەم دیت سنگی خۆی کردە قەڵغان بۆ بەرگری لەمانەوەی گەل و شەرەف وکەرامەتی وڵاتەکەی، بەڵام من پێم وایە لە رابردوودا بەشی زۆری کورد ترسنۆك و بی هەڵوست بووە، ئەوەی بلێت کورد هەمووی ئازایە و شێرە من دەڵێم سێ بەشی کورد لە ڕابردوو ترسنۆك و بێ هەڵوێست و ڕێویش نەبوو سەد خۆزگەیان بە ڕێوی، بەڵکوو لە ڕەگەزی کەروێشك نزیك بوون، بەڵگەشم بۆ ئەوە: ئەورۆژەی بارزانیەکان دەوردران و بێسەروشوێن کران، ئەگەرخەڵکی کورد هەڵوێستی هەبایە و بڕژابانە

سەرشەقام من پێم وایە ئەو ڕێژەیە زیندە بەچاڵ ناکران دوای ئەو کارەساتە دووژمن دە میللەتە گەیشت، بۆیە (پرۆسەی ئەنفالیشی ئەنجام دا چەکی کیمیایشی بەکارهێنا )، زانی ئەو گەل هەڵوێستی نابێت و زۆر زووش ئەو کارەساتە لەبیر دەکات واش دەرچوو یەك نموونە دێنینەوە: دوای ئەنفالەکان (سەدام حسین ) سەردانێکی کوردستانی کرد لە هەولێر بەرەو شەقلاوە و هەریر و گەلی عەلی بەگ و دواتر بۆ سەری گارە و زۆرشوێنی تر ... خۆزیا ئەو فیلمە دەتان دی کە لە تەلەفزیۆن پەخش کرا، لەو شوێنانەی سەدام سەردانی دەکردن، کوڕ ئەو کوڕە بوو غار بدات و بگاتە ئەو پیاوە خۆشەویستە و چاوی بە سەدامی قارەمان بکەوێت چەپڵە و بژی سەدام و بابم زێڕە و دایکم زێڕە، سەدام زێڕە. وشەی زێڕە بووبووە وێردی سەر زاری زۆربەی خەڵکی دەیان کەس لە دڵسۆزی بۆ سەدام کەوتنە بن پێیان و بریندار بوون، پێی نەکرا، جەنابی سەدام ببینێت، رێزم بۆ خەڵکی بە شەرەف و تێکۆشەری ئەو شارانە هەیە دەزانم ئەوانیش لەو ڕۆژە غەمبار بوون، منیش لە شوێنی سەدام بام دەموت ئەوەی لەگەڵ کوردم کردووە زۆریش کەم بووە ...کە بە هەزاران کەسی بێگوناهی ژێر خاك کردبوو کە هێشتان خوێن و گۆشتی هەزاران خوشك و کچی ناسك و نازدار و منداڵی شیرەخۆرە لە گۆڕە بە کۆمەڵەکان، ئێسك و گۆشتیان لەیك جیانەببوونەوە، هێشتان بۆن و کاریگەری کیمیا لە هەڵەبجە و دەوروبەری و سێوسێنان و دۆڵی جافەتی و گۆپتەپە و فریز و وەرێ و بالیسان و شێخ وەسانان و خەتێ و توتمە و مەلەکان و بۆتێ و چەندان ناوچەی تر و بادینان هەر مابوو... هێشتان سەتان منداڵی بزربوو نەیدەزانی داك وباوکی کێنەو چیان بەسەر هاتووە؟ دیارە زۆربەتان ئاگاداری ڕووداوی ئەنفال و کیمیابارانن، تەنیا لە بالیسان و شێخ وەسان زیاتر لە (٤٠ ) منداڵ لە تەمەنی یەك شەوە کە منالی شەهید محەمەد بیکەیسی بوو، تاکو تەمەنی (١٣ ) ساڵان شەهید کران کە دوا تەمەن ئەرسەلانی (١٣) ساڵان بوو... ئەنفالیان کرد، کورد دەڵێت : گەوادی، سەرەتایەکەی ناخۆشە دواتر لێی رادێی... بەداخەوە، بەشی زۆری کورد فێری لێراهاتن بووبوو، ئەوکات من پێم وایە ڕژێم دوای بێسەر و شوێنکردنی بارزانییەکان و بێ هەڵوێستی زۆرینەی گەلەکەمان دە و مللەت گەیی، بۆیە هەنگاوەکانی بەبێ ترس نا بۆ جینۆسایدکردنی گەل و ولاتمان.دەتوانم شاهیدی ئازایەتیان بۆ بدەم بەڵێ، لە ڕاوەستانیان لەبەردەرگا و دەست لەسەرسنگ و کورد کوشتن زۆر ئازابوون!

*** *** ***

گەنجینە ئەوە ڕابردووی ئێمە بوو مێژوونووسان هەڵتان نەخەڵەتێنن، من مێژوونووس نیم، پیلوڕێکی نەزان و گێلۆکەم، زۆر دۆست و خزمان بەفەقێ شێت ناوم دێنن، بەڵام ئەو شتانەم بەچاوانەم دیوە، زۆرشتی خراپتریشم دیوە، ناکرێت هەمووی باس بکەم، بۆئەوەی توشی ڕەشبینیتان نەکەم! درۆشتان لەگەڵ ناکەم ئەگەر درۆم کردبێت شیری دایکی خۆم لێ حەرام بێت. قسەکانی من ڕاستین ئێوە وەك ئێمە ترسنۆك مەبن، چونکە لەسەداپێنجیش کەمتر ئامادەی قوربانیدان نەبوون بە شێوەیەکی مەیدانی دوور لە قسە، داواکارم لە گەنجی ئەمڕۆ دوارۆژ پێش هەرشتێك بەرژەوندی گەل و وڵات ڕەچاوکەن قەت پشت لە گەلی خۆیان نەکەن چونکە هەرچی بۆ دووژمن بکەی بێ سوودە و شەرمەزارییە..پیاو ڕیسوای دنیا و قیامەت دەبێت، بەژەوەندی هەموومان لە یەکرێزی دایە، لە تەبایی دایە دەشکرێت بیرکردنەوی جیاجیامان هەبێت، بە هەموومان ڕۆژانە بیربکەینەوە خەتێکی سوور هەیە ئەویش بەرژەوەندیی گەل و وڵاتە دەستەلاتدارانی خۆتان خۆش بوێت و ڕێگریشیان لێ بکەن لەو هەڵانەی دەیکەن، واتە پشتوپەنای دەستەلات بن و با لێشتان بترسێن... بێدەنگ مەبن. خوا نەخواستە با ئێوەش لە هەرامە لێڕانین، چونکە چ دۆست چ دووژمن بە چەوسێنیتەوە هەر چەوساندنەوەیە ...نموونەیەکی جوانمان هەیە لە یەکڕیزی، ئەویش بەرهەمی ڕاپەڕین کە بە هیممەتی هەموو لایەك بوو، هەق نیە بترسێین لە بژارکردن زەویەك ئەگەر بیکەیە کردار، بێگومان بژار دینی، پێویستە زۆر وریابین بۆ بنبڕکردنی بژار، نەش ترسێین بەزەیش باڵمان بەسەردا نەکێشێت لەبژار کردن ...لە ئێستاوە سەرکردەکانمان پێویستە خەمی هێزێکی یەکگرتوو دڵسۆز و وشیار و شارەزا ئامادەبکەن خەمی ئامادەکردنی چەك و خواردن بخۆن و ئامادەی بکەن بۆ هەر ئەگەرێك بە چەپڵەی دۆست و لایەنگرانی حیزبەکەیان هەڵ نەخەڵەتێن و لێی بخەون زۆر شت ماوە و دەبێت بکرێت بۆ ئەوەی جارێکی تر کەسێك قودرەت نەکات بۆ زەوقی خۆی گەمە بەئەقڵ و خوێنی ئەو گەلە بکات. ئێمە لەڕابردوو باوەڕمان بەخۆ نەبووە ئایە باوەڕ بەخۆنەبوون نیشانەی ترسنۆکی نیە؟ بەڵێ نیشانەی ترسنۆکی بووە، لە یەکتر کوشتن زۆر ئازاین، لە بەرانبەر دووژمنان زۆر ترسنۆکین نیشانەی ئەوەیە خۆمان ناناسین دووژمنیش ناناسین ئەوەی خۆی نەناسێت و دووژمن نەناسێت خۆی ئامادەنەکات بۆ هەر ئەگەرێك پێش ڕووداوەکان نەکەوێت، سەرکردە نییە و بۆ سەربڕین باشە، ئەگەر خۆشی بەسەرکردە بزانێت پولەکی قەڵپ نایێنێت... ئەوانەی لە دەستەلاتن پێویستە بە خۆیان دابچنەوە، ئەوەی لە دەرەوەی دەستەلاتیشە پێویستە بەخۆی سنوورێك دیاری بکات،

شتێك نەكات زەرەر بە بەرژەوەندیی گشتی بگەینێت لەلایەك ململانێی دەستەڵات بكات و لەلایەك خۆی بە پشتوپەنای دەستەڵات بزانێت، لەخزمەتی گەل و وڵات كارێك نەكات دەستەڵات بترسێنێت دەست بگرێت بەودەستەڵات و بەرداری نەبێت لەترسان، یان گەمەیەكی ناشەرعی بكات، بەیانی هەمان گەمەی لەگەڵ بكرێتەوە، ئەوكات دەبێت ئێمە لەهەمان بازنە بسورێنەوە بەسەر لێشێواوی لەسەت بێینەوە سفر لێرەش هەموومان زەرر دەكەین

كورد دەڵێت :

قسەی حەق رەقن

هەردەرێی مەترەقن

دەچاوان ئەچەقن!

***       ***       ***

لە دوای راپەرین شتی سەیر رووی دا، هەركەسێك مەقەرێكی دەكردەوە و هێزێكی پێك دینا، بە هەر شێوەیەك بایە دەبووایە ئەو هێزە تێر بكات بازگەیەكی دادەنا و دەستی دەكرد بەباج وەرگرتن بەناوی شیرینی، هەرچەندە كاك نۆشیروان هەوڵیدا ئەو زاهیرەیە تێك بشكێنێت پێی نەكرا، كورد دەڵێت: سوارێك بەتەنێ تۆزێ ناكات، هەرچەندە سوارێكی باش بێت‌وایە كاك نۆشێروان تۆزی نەكرد .

بابێمەوە لای خۆم،ئێمەش لە ماڵەوە لەو پەری هەژاری دابووین، پێڵاوم بەدەیان شوێن پنی كرابوو، ئەوكات پێڵاوی لاستیق باو بوو لەوە زیاتر نەبووەمن زۆر بێ جلك و بەرگ بووم خواردنمان لەو پەری خراپی دابوو، یەك درهەمم هەبوو، هەموو رۆژێك دەیان جار سەیرم دەكرد .

رۆژێكیان لە ماڵەوە تورەبووم كەتمەرێ بەرەو گوندی گەرەوان شۆرش میوان خانەی دانابوو، بۆ هەموو كەس، بۆی هەبوو نان بخوات گەیشتمە گەرارە بوومە شاگرد لە كەباب خانەیەك رۆژی بە هەشت پەنجایی، ماوەیەك لەوێ مامەوە جلك و بەرگم كری پۆشتەبوومەوە خواردنیشم باش بوو، وردە وردە خرپن وجوان بووم، چەند دینارێكم پەیداكرد، گەرارە ببووە شارێكی گەورە رۆژانە بە تەیارە\ بۆردمان دەكرا لە هەمان كات ژیان ئاسایی بوو هەموو پێداویستیەك لە گەرارە بەدەست دەكەوت. بەباشم زانی بچمە ئێران زانی بووم خەڵكی گوندەكەمان لە شوێنێكن بەناوی ( بابك )ئەو ساڵە زستان زۆر سەخت بوو، حاجی ئۆمەران بە چەندان مەتر بەفری لێ كەوت بوو گەیشتمە شارۆچكەی( خانێ)، لەوێ بەماشێن بە رێكەتین بەرە و ناوچەی دیزفول گەیشتمە

ئۆردوگای بابك، ئۆردوگایەکی گەورە بوو، ناوە ناوە خانووی لیّ بوون، ئەوەی تر هەمووی خێمە بوو، بەهەر شێوەیەك بوو خزمانی شێخ وەسانانم دیتەوە لە ماڵی حاجی حەمەدەمین مامەوە،حاجی حەمەدەمین پیاوێکی بەڕێز و میوان دۆست و دەست کراوەبوو، نازناوی دۆشاو بوو، ناوبراو لە سەر دۆسۆزی ئەو ناوەی بەسەر دابڕا بوو، لە ساڵەکانی شەستەکان حاجی حەمەدەمین ڕەزی جاشەکانی دەکردە دۆشاو بۆ پێشمەرگە لەوەوە ئەو نازناوەی بە سەردا بڕا... ئەو ئۆردوگایە نزیکەی (١٦ ) هەزار کەس دەبوو، لە ڕووی ئیدارەوە زۆر باش بوو نەوت لە بڕان بوو خواردن و میوەجات هەر بەس مەکە، ئەگەر بە وردی باسی بکەم لەوانەیە باوەڕنەکریّ بازاڕو دوکان و وردە مامەڵەی تێدا دەکرا وە خەڵکی دەردەچوون بۆ کرێکاری لە کێڵگە کشتوکاڵییەکان، شەڕە خزمانیّ ناوەناوە سەری هەڵ دەدا، دواتر شەڕە عەشیەت دەستی پیّ کرد. کەسێك کوژرا دەیان کەس بریندار بوو، شەڕەکە بە تەور و خاکەناس و بەرد دەکرا، کە دەبووە شەڕ وەك تەزرە بەرد دەباری، ئەزانن هۆیەکەی چی بوو ؟ ئەوەندەی گۆشتی جۆر بەجۆرو میوەجاتی جۆراوجۆر بخۆن برنج و فاسۆلیا بخۆن هێزی پێشمەرگەش لە کوردستان لە شەڕێکی سەخت و لە ڕووی چەك و تەقەمەنی ناهاوسەنگ و تینی و برسی و بەنانە ڕەق ئیدارەی دەکرد، تۆ سەیرکە دەیان ئۆردیگا و تەنها ئۆردیگای بابك شانزە هەزارکەس بوو،خەریکی خواردن و خەوبوون بەوەش رازی نەبوون، خەریك بوو یەکتر قڕبکەن. باش بوو دواتر ئەرتەشی ئێران بووە ناوبژیوان ئەرتەش نەها تبا خەڵك زۆر دەکوژرا و یەکتریان بەهیلاك دەبرد لەسەر چی؟ لەسەر هاربوون، ئەو هەموو فیتە پیاوە نەشەرم و نە حەیا ڕۆژ تائێوارە لە دیار ژنان دەوەستان ببوونە ڕەجەب چاویان هەر لەوەبوو خێزانیان نانیان بۆئامادەبکەن، لە کوردستان و لەسەر سەد هەزار کەسێك ئاگر و ئاسن دەباری، ئەو هەموو میللەتەش لە ئێران لە خەباتی زگ تێرکردن دابوون لە شارەکانیش یان ئەو شوێنانەی لە بەردەستی ڕژێم دابوون، خەریکی جاشایەتی و کورد کوشتن بوون، من دەڵێم لەسیّ بەشی ئەومیللەتە بەشێك سوتاوە بۆ گەل و وڵات، ئەوەی تر نازانم چ ناوێکی لیّ بنێین؟

گەنجینە بەباوەڕی ئێوە چناوێك باشە؟ ئەتوانین یەك نموونە بێنینەوە تەواوی هێزی پێشمەرگەی یەکێتی، کە گەورەترین هێز و کاریگەرترین هێز بوو، خۆی لە دەهەزار پێشمەرگەنادا، هەمان کات زیاتر لە نیو ملیۆن جاشمان هەبوو!

دەنگ و باس پەیدا بوو گوایە شۆڕش تێکچووە،بە نسبەت خەڵکی ئەو هەواڵە کارەسات بوو،خەڵکی توشی شۆك بوو لە هەمان کات توشی ڕەشبینی بوو ئەوساردایەتیە زۆری

خایاندپیاوانی ڕژێم بەهاوکاری ئێران پەیدا بوون لەدوایدا داوایان لە خەڵکی دەکرد بچنەوە عێراق ئەوانەی خۆیان ناو نوس کرد بۆ گەڕانەوە لەلایەن خەڵکی توشی لێدان هاتن دیسان ئەرتەش هاتە ناو کێشەکە لەو گەڕەکەی منی لێ بووم، یەکەم کەس مەلا ئیبراهیمی گوندی بێراوە گەڕایەوە لەلایەن خەڵکی ئەزیەت درا پێیان نەخۆش بوو بگەڕێتەوە دووبارە ئەرتەش هاتە ناو کێشەکە دواتر هەر ڕۆژ وردە وردە خەڵکی گەرانەوە دواترئۆردووگاکان گواسترانەوە شوێنێکی کوێستان، لەوێ باوباران وقور خەڵکی بێزار کردبوو ڕۆژێکیان لەبیرم نیەکێ بوون چەند بەرپرسێکی پارتی بەناو ماڵان دا دەسوڕانەوە و بڕێك یارمەتی پارەیان دابەش کرد بەسەرخەڵکی بەگشتی لەوێش کۆبوونەوە بەخەڵکی دەکرا و هانیان دەدان بگەڕێنەوە گەرانەوە دەستی پێ کرد.

با بەکورتیش باسی خۆم بکەم من ئەوکات تەمەنم لە چواردە بۆ پانزە ساڵان بوو، لە ماڵە خزمێکی خۆم بووم، بەشە ئازوقەی خۆم هەبوو، ئەوماڵە خزمەم ماڵیان ئاوابێت هەموو کارێکی ناو ماڵیان پێ دەکردم، وەك کارەکەرێك بەیانیان دەبووایە زوو لەخەو هەستم بچمەگوندێکی جیرانی ئۆردیگا پەلکە چەوەندەر بکرِم، دەسکی بە تومەنێك، دەم هێنانەوە ماڵەوە.. چام لێدەناو ئەوانم لەخەو هەڵ دەستاند، کە جەنابیان لەخەو هەڵدەستان نوینەکانم هەڵدەگرت، نان و چام دەدانێ و هەردەسکێکی چەوندەرم دەکردەوە دوو دەسك ئەوەش ئەمری خانمی ئەوماڵە بوو،لە کۆڵم هەڵدەدان ئیتر بڕۆ و بگەڕێ هۆی سلق هۆی سلق، دەسکی بە تومەنەکی، کە داتمەوە ماڵەوە دەستم دەکرد بەقاپ شوتن و ئاوهینان، دوای نان خواردنیش دووبارە قاپ شوتن و ئاوهینان بە تایبەتی لە ئۆردووگای کوێستانی ئاوەکە دووربوو لەگەڵ کچان بیبوومە کچ،کچەکان شەرمیان لەمن نەما بوو بیووینە دەستە خوشك ئەوئاوهینانەش دەبووایە بەپێخواسی کرابا، چونکە هێشتان ناو ئۆردوگاکە چەگر ڕێژ نەکرا بوو، ڕۆژانە ئەو میللەتە بەردەبووە ناو گەنم و جۆی ناوچەکە، بۆ کەنگرکردن چۆن بەهاران خەڵکی دەودەریاچەکان لە ترسی قازوو قورینگ ئیشکە دەگرن، خەڵکی ناوچەکەش دەبوونە پاسەوانی دەغروداني خۆیان ڕۆژانە دەیان جار بانگەوازی دەکرا بەوشێوەیە: بۆئاگاداری بۆئاگاداری ئەوانەی دەچنەوە عێراق بابێن خۆیان ناو نوسکەن، سەرەتا ئەوانەی ناوی خۆیان دەنووسی وەك شەرمێك بوو، لەناو دەرو جیران دوواتر ئەوە نەما، بەلێشاو خەڵکی خۆی دەنووسی منیش ناوی خۆم نووسی و گەڕامەوە بەتانیەکیشم لەگەڵ چەند دینارێك لێژنەکە پێیان دام. گەڕامەوە گەیشتینە باقووبە ماوەی دوو ڕۆژ لەوێ ماینەوە، دواتر بە ڕێکراین بۆ هەولێر، ناکرێت پیاوەتی برایانی عەرەب لە بیر کەین بەتایبەتی برایانی شیعە لە

پێشوازی ئەو خەڵكەی كە مەنفی دەكران لە كوردستان یان ئەوانەی لە ئێران دەهاتنەوە، ڕژێم سەر قەزا و ناحیە و گوندەكانی دابەش دەكردن خەڵكی بەجوانی پێشوازییان لێ دەكردن، دەكرێت بڵێین لە ساڵی(١٩٩١ ) تۆڵەمان بۆ كردنەوە لە هاوكاری كردنی سەربازەكانیان نەمان كوشتن، بەڵكوو نان و پارەو جێورێشمان بۆ دابین كردن. گەڕامەوە هاتمەوە شێخ وەسانان نەوەی من دیتم یارەبی ئێوەی جیلی دوای ئێمە نەی بینن من هەندێك جار قسەی هەڵەق وبەلەق دەكەم باوەڕ بكەن ئەوەی من دیومە ئێوە بتان دیتبا قسەی زۆر خراپ ترتان دەكرد، دەورووبەری گوند هەمووی ڕەبایەبوو دەیان مەعەسكەری لێنشتەجێ كرابوو وەك خوار گوندی خەتێ و ئاتیسان مێرگەسەر و گوندی كانی بەرد زۆربەی شاخەكان ببوونە رەبایەی سەربازی وەك دەرەدارو نەرمشیو شاخی تارینان و نزیك شۆپە و چیای رەشكان و مێران و زۆرشوێنی تری شوێنە ستراتیجیەكان وردە وردە كەوتنە جاسووس دروست كردن، جاسووسەكانیش لەسەر یەكتر جاسووس بوون بۆ ئاشكراكردنی چەك و تەقەمەنی... رقی دەیان ساڵەی كێشەكۆمەڵایەتیەكانی خۆیان بە جاسووسی تۆڵەیان لەیەك دەكردەوە فرسەتێك بوو بۆ ئەو میللەتە نەزانە، نەك هەر حەزیان لێ بوو گۆشتی یەكتر بڕزێنن بەدەستی دووژمن، بەڵكوو حەزیان دەكرد بەدەستی دووژمن نیسكەكانیش وردووخاش بكەن، بەشێك لە دەرەبەگەكان دەیانویست تۆڵەی چەندان ساڵ بكەنەوە، جوتیارانیش بە هەمان شێوەی ئەوان جاسووسییان لەسەر دەرەبەگەكان دەكرد و لەسەر جووتیارانی هاوپیشەی خۆیان وای لێهات باوەڕ لە نێوان ژن ومێرد نەمابوو، خەڵك لە دار و دیواریش دەترسان... ڕۆژ نەبوو لەو گوندانە چەندان كەس فەلاقە نەكرێن، بە شێوەیەكی وایان لێ دەدان كە ئەگەر چەكیشی نەبووایە، دەیوت هەمە و مۆڵەتیان دەدا تاك و چەكی پەیدا دەكرد، سوێنددان و تەڵاق پێ فڕەدان و سوكایەتی پێ كردن و دەیان ودەیان شتی تر بۆ ئاشكراكردنی چەك و تەقەمەنی دەتوانین نموونەیەك بێنینە وە: مەلاخدر ئەوكات تەمەنی لە نزیكەی (٦٠) ساڵ دەبوو، پیاوێكی نابینابوو، لەسەر چەك هەبوون لەناو گوندی بەداریان وەكردبوو، پیاو كە ئەو ڕۆژانەی دێتەوە بیر بێز لەخۆدەكاتەوە، سەیرەكە لەوە بوو دووژمن چی دەكرد، ئاسایی بوو چونكە دووژمن بوو، ئەی باشە ئەو میللەتە بەدبەختە بۆ دەمی دە خوێنی یەكتر نابوو؟ وای لێهات بوو پیاوەتی بووبووە جاسووسی و گەوادی! دەردێكیان بە یەك كرد با بە دەواری شڕ نەكات.

من شەرم دەكەم ئەگەرنا باسی شتی وادەكەم كە لە تاریخی میللەتان ڕووی نەداوە، بە نەفرەت بن ئەوەی پشت لە گەڵ دەكات بۆ دوژمن و دەبێتەپیاوی دووژمنان!

ئەکرێت بۆ مێژوو قسەیەك بکەین بەر پرسەکانیشمان لە شۆڕش ئۆباڵی ئەو کارەساتەیان بەبەردەکەوێت کە بەخۆیان ڕایان کرد و ئەومیللەتەیان بەجێ هێشت بۆ دووژمن! من پیاوێکی وشیارنیم، بەڵام پێم وایە ئێمە درۆ لەگەڵ خۆمان دەکەین لە بارەی مێژوو ئەگەر مێژووی کورد بکەیە چوار بەش سێ بەشی خیانەت و جاسووسی بووە، دژی خۆمان بەدەستی خۆمان، حەق نییە ئەو خیانەتە لە نەوەکانمان بشارینەوە. مێژووی کورد ئاڵاو واڵاکەین، کە ئێمە و رابردووی ئێمە هەمووی جوان بووە. ناکرێت نەوەکانمان چەواشەکەین بەڵێ لەڕابردوو نیوەی کورد خاین و خۆفرۆش بووە، بە درێژایی مێژوو لە هەمان کات نیوەی تر سووتاوە بە دەستی نیوەی خاین وخۆفرۆش. باوەڕ بکەن وای لێ هات بوو لە ناو ماڵی خۆت دەترسای جاسووس هەبێت . ئەوەی ئەڵێت وانیە ئەوە ئەردوو ئەوە گەز ! بابێت دەی پێوین لەسەر مریشکێك بزانم نای دۆڕێنێت، گومانم نییە دەی دۆڕێنێ، چونکە بەشیکی زۆر بەڵگەنامە ئێستا لە ئەمەریکان، ڕۆژێك دێت نەوەکانمان دەی بینن کورد چی بەکورد کردوە!

*** *** ***

شەهید سابیر رەسوول قسەیەکی هەبوو دەیوت کورد بە وەرەسە بۆی مایتەوە، کە بیرکردنەوەی هەر لەلای بەرگری و هەڵاتنە بەرنامەی پەلاماردانی نییە! گرینگ نییە دوێنێ چۆن بووین گرینگ ئەمڕۆ یە چۆن بین! کورد دەڵێت: نان ئەو نانەیە ئەورۆ لە خوانە. ئێمەی گەلانی کوردستانمان و نەمانمان پێکەوە گرێ دراوە، پێویستە دڵسۆز بین بۆ یەکتر هەموومان تەواوکەری یەکتربین. پێویستە دڵسۆزین بۆ بەرژەوەندیەکانمان و بۆ گەل وڵات. ڕژێم کەوتە راگواستنی دڵسۆزانی گەلەکەمان و کادیرەکانی پارتی بە هاوکاری جاسووسان بۆ خوارووی عێراق وەك (حاجی قادر عەبدوڵڵا یوسف ) توتمەیی بۆ قەزای مهناویە.( حاجی حەسەن قادر)توتمەیی و ( محەمەد عەزیز ) توتمەیی و (عومەر عەولارەش) توتمەیی و ( وسو ئەحەمەد حەمەد )شێخ وەسانی و (خەتاب عوسمان تاهیر ) خەتەیی و: (ڕەسوول حەسەن ناسراو بە مەلازادە ) بالیسانی و: ( مەلا ئەحمەد شینکۆ ) و ( قادر مستەفا ناسراو بە مەلا قادر ) بالیسانی و (ئەحمەد حەمەد) بالیسانی و ( فارس ئەحمەد ) بالیسانی و (نووری عوسمان عومەر ) بالیسانی و ( حاجی شێخۆ) گوندی دەراش و ( ئیسماعیل حەمەدەمین ) گوندی بێراوە.

*** *** ***

بڕیار بوو دۆڵی بالیسان ڕابگوازن گوندەکان ناو نووس کران بۆڕاگواستن دیارە پەیدابوونەوەی پێشمەرگە بەرنامەکەی تێك شکاند، ئەمەوێ کورتەباسێکی ئەوکات بکەم: باسی چەند کەسێکی مەردوئازا بکەم لەو ڕۆژگارە، کە پێشتر باسم کرد داروبەرد بووبووە جاسووس ئەو جاسووسانە جیاجیا بوون، وەك هەبوو بۆپارە جاسووس بوو، لەناویان هەبوو بۆتۆڵەکردنەوەی کێشەکۆمەڵایەتیەکان جاسووسی دەکرد، دیارە من جاسووسەکان چاك دەناسم، یەکەم: کە خەڵکی ناوچەکەم. دووەم: لەساڵی (١٩٩١ ) لە دائیرەی ئەمنی شەقڵاوە بە هیممەتی شەهید مەلانجم و کاك تەها کانی بەردی و عەبدوڵڵا کانی بەردی و مامۆستا جەلال شەقڵاوەیی و زۆری تر لەوانەیە من نەیان ناسم بەڵگەنامەکان پارێزراوبوون، ئێستاش پارێزراون، لە ئەمریکان بۆ مێژوو، کاك نۆشێروان دەستی هەبوو لە کۆکردنەوی بەڵگەنامەکان و زۆربرادەری تریش ئەوەی دەیان ناسم (مامۆستا سەیفەدین)یش من ماوەیەك واجبم کەوتە لای ئەوان، سەیری بەڵگەنامەکانم کرد، بە تایبەتی ئەوانەی ناوچەکەمان، ئەگەر لەبەرکەس و کاریان نەبێت باسیان دەکەم چیان بەو میللەتە کردوە ئێستاش زمانیان دوو بست درێژە . زۆرجار بەراپۆرتی ئەوان کەسێك لەسێدارە دراوە، پاداشتیان پێنج دیناری ئەوکات بووە و نوێژو ڕۆژوشیان دەکرد و دەگرت. ئێستاش و ئەوکات خۆیان بە دڵسۆزی گەل دەزانن نسیبەتەکە لێرەیە وادەزانن ناسراو نین ڕۆژکیان لە کەونە دایرەی ئەمنی شەقڵاوە دووای ڕاپەرین ببووە کۆمیتە، زۆربەمان خریکی بژارکردنی بەڵگەنامەکان بووین، تاکو هیلاك بووین دوا بەڵگەنامە بەڵگەنامەی کەسێکی لای خۆمان بوو، چوین پشوبدەین و چایەك بخۆینەوە لەپڕ ئەوکەسەی لای خۆمان بە ژوورکەوت و چەك و چەندان مخزەن و بەحەفتا و پێنجیەوە چەندان رومانەوە بە ژوورکەوت، دەستی بەفشەکرد، من وام کردوە بۆ کورد وام کردوە لەو کات ناکرا پێی بڵێین دەوەرە ناپیاو بۆ برەپاریەکی کەم چۆن شەرەفی خۆت فرۆشتووە؟ ئەو ڕووداوەی باسی دەکەم لە خوارەوە، رەنگدانەوەی ئەو ڕۆژگارەن.
حسێن حاجی خدر مەلەکی لەساڵی (١٩٧٦ ) تەسلیم بە ڕژێم نەبووەوە، لە ساڵی(١٩٧٦ ) ڕژێم لە ڕێگای جاسووسان ئەزانێت مام حسێن لە مەلەکانە پەلاماری گوندی مەلەکان دەدات لە دەوروبەری مەلەکان بە چەندان کۆپتەر دەوری مەلەکان تۆق دەکات، هێزێکی زۆریش کە پێکهاتووە لە چەندان فەوج بەرە و ناو مەلەکان دەچێت، مام حسێن خۆی دەگەینێتە لای سەروکانی مەلەکان بەلای کورتەکەوە کە ناوی ناوچەیەکە، هێزێکی ڕژێم لێی نزیك دەبێتەوە، مام حسێن ناوی خوای لێ دێنێت سێ سەرباز دەکوژێت و لەکوژراوەکان یەکیان ئەفسەردەبێت،

سێ سەربازیش بریندار دەکات. هێزەکەی دووژمن لە هەموولایەک پەلاماری دەدەن،مام حسێن وابەباش دەزانێت بچیتەکونێك خۆی حەشاربدات ئەوهێزە هیلاك دەبێت مام حسێن نابینەوە مام حسێنیش لە ناو کونەکە سەیریان دەکات وپێیان پێ دەکەنێت، دواتر هێزی دووژمن پاشەکشە دەکەن و کوژراو و بریندار لەپشتی خەڵك هەردەدەن تاکو ناومەڵەکان لێدانی باشیش لەوکەسانە دەدەن کە مەیت وبریندارەیان پێ هەڵگرتوون. جاسووسەکان واز لە مام حسێن نایەنن دوای دوومانگ جاسووسەکان ئاگاداری رژێم دەکەن کە مام حسێن و پێشمەرگەیەکی تری مەلەکان بەناوی حەمەدەمین حسێن لە ناوچەی ساوسێو ژکان لەلای( دۆرەسولاّتانیّ ) لە بناری چیای ئاراسن رژێم ئەو جارەیان زیاتر لەجاری پێشو هێزی برد بە مەبەستی گرتنی حسێن و حەمەدەمین یان کوشتنیان، سەرەتاهێزی پیادە دەڕوات دواتر بە کۆپتەر هێز لەسەری کەپرەو ئاراسن و سەری بایزی و چیای کەژۆك ئەو ناوانە هەموویان ناوی چیای بەرزوگەورەن دەبێتەحەسار بۆ گرتنی مام حسێن و حەمەدەمینی هاورێی، دواتر هێزێك بەسەرپەرشتی رایدێك بەناوی راید ( قحتان ) بەرەو شوێنی ئەوقارەمانە دەچێت دەگاتە پێش مام حسێن مام حسێن رووی چەکی تێ دەکاو بە قوربانی حازریانی دەکات. سەربازەکانی لەگەڵ جەنابی رایدن کەسەرکردەیان دەکوژرێت هەموویان رادەکەن مام حسێن راوی سەربازەکان دەنێت، دواتر هەویە و چەك و تەقەمەنی راید دێنێت و رادەکەن و لە شوێنێکی تر خۆیان حەشار دەدەن ئیتر رژێم دەکەویتە ئاگربارانکردنی شوێنەکە و هێرەش دەبات تەرمی قاید دەبەنەوە و شەویش بەسەر دادێت هێزەکەپاشە کشەدەکات مام حسێن و حەمەدەمینیش توانییان لەو تۆقە دەرباز بن . حەمەدەمین لەساڵی هەشتاکان بەتۆپ لەلای گوندی بێراوە شەهید بوو، مام حسێن لەدووای (١٩٩١ ) بەمردنی خۆی مرد.

سەیرەکە لەوەدایە، رژێم لەدزڵی بالیسان بزانی مام حسێن و حەمەدەمین لە چیای ئاراسنن! ئەوەی ئاراسنی نەدیتبێت نازانێت چیایەکی چەند گەورە و سەختە ئەوەیان کاری جاسووس بوو، لە دوو مام حسێن و حەمەدەمین، هەر لە مەلەکان دوو شێرەپیاوی تر هەبوون پێشمەرگەبوون یان هاوکاری پێشمەرگە بوون، یەکیان ناوە محەمەد کوری حاجی حەسەنی مەلەکان مەشوورە ئەوەی تریان مام کەماڵی برایم خەلۆ مەشوورە، جاسووس خەبەر دەدات و هەردووکیان بەچەکەوە دەگیرێن قۆناغ بە قۆناغ دەگەنە گرتوخانەی ئەبووغرێب لە بەغدا. کابرای جاسووس دەچێت لە بەغدا رووبەروویان دەبێتەوە، لە بەردەمی حاکم دەوەرە کاکی جاسووس بەدوایان دابچیە بەغدا

**شاهیدی ئەوە بدەی پێشمەرگەبووینە، حاکم بڕیاڕی لە سێدارەدانیان دەدات دوای ماوەیەکی کەم محەمەد حاجی حەسەن لەسێدارە دەدەن، مام کەمالیش چاوەڕێی لە سێدارەدانە، لەبەختی مام کەمال دوای چەند ڕۆژێك ڕژێم عەفویەك دەر دەکات مام کەمال ئازاد دەبێت، لە کاتی (موهاجە) مام کەمال هەڵسوکەوتێکی خۆش دەنوێنێ باسی ناکەم، ئەوەی حەز بکات دەتوانم دوو بەدوو بۆی باس بکەم، تەرمی شەهید محەمەد حاجی حەسەن ئێستاش ونە . گوند نەبووپڕی جاسووس نەبێت گوندەکەی من زیاتر لە بیست جاسووسی هەبوو، بە ئاشکراو بە دزی زۆربەیان ناسراون دەوەرن، خزمینە ئەوکەرە بێ کلك و گوێیە، لە قورێ دەربینین گوندێك بیست جاسووسی هەبیت، دەبۆ ئاگاداریتان شۆڕشگێرترین گوندیش بووە، لە کوردستان دەبێ گوندە ناشۆڕشگێرەکان چەند جاسووسیان هەبووە، ڕژێم بڕیاریدا ئەوانەی لە ئێرانیش دێنەوە دابەشیان کات لە خوارووی عێراق ئەومیللەتە بەدبەختە کارێکیان کرد چەك و تەقەمەنی زۆر بەرەو کەمی چوو ..دەنگێك پەیدابوو، بەناوی (یەکێتیی نیشتمانی کوردستان)، وەك ئاگرێکی ڕك ئەستوور وەك بروسکە هاواری کرد، هۆ پیاو خراپ و جاسووسان، ئەی ئەوانی لە پێناوی پارە ئامادەن هەموو شتێك بفرۆشن؟ ئیتر بەسە و لەگەڵ ئەو بانگەوازە خەڵکی پیاو شۆڕشگێر وەك گوڵێکی تێنو بە چلەی هاوینێ لای ئێوارە ئاوێکی سارد و نەرمۆکەی لە ژێرکەی ئاوها گەشانەوە بەڵێ پێشمەرگە بەخێربێیەوە، پێشمەرگە دووژمن ماوەی دووساڵ بە خەونی زۆرخۆش دەژیا، کە دەتوانێ بۆ هەتاهەتایێ،کورد دەبێتە کۆیلە بێزمان ونیشتیمان و قەومیەتی خۆی لەبیر دەچێت، کوردستانیش بکەنە شوێنێکی گەشتوگوزار بۆ هەموو دەوڵەتە عەرەبیەکان وەك هەندێك گەلی ئەفریقیاکە وایان لێ کردن وەك : سوودان وجەزائیرو سۆماڵ و لیبیاو میصر و تونس ولوبنان و عیاق و سوریاو فەلەستین زۆری تر... پێ پەتیەکان وایانزانی ئێمەش ئەوانین ! نەخێر باب و باپیرانی ئێمە سەرباری ئەوەی بە درێژایی مێژوو ئێمە دەکەوتینە نێوان دوو بەرداشی ئیمپڕتۆران، بەڵام شانازیە بۆ باب و باپیران دووسێ شتی گرنگیان لە دەست نەداوە پانتایی کوردستان و زمانی شیرینی کوردی، جێی شانازین،لەهەر بارو زروفێك دا.ڕێژەیەکی مەردو ئازاهەبووە بەرگریی کردووە گیانی خۆشی بەخشیوە لەپێناوی مانەوەی گەلەکەمان، دەبێت سوپاسی خوداش بکەین، وڵاتی ئێمە ناوچەیەکی شاخاوی بووە ئەوەشیان ڕێگر بووە لە بەردەمیی دووژمنان، دەستی ژنی کورد ماچ دەکەم هەرچەند دووژمن ڕۆڵەکانیان دەکوشت ئەوان ئازایانە بە سەدان نەوەیان دروست دەکرد بمرێت دووژمن بەقوربانی ژنی کورد بێت،لە ڕابردوو بە تیلەی چاو تەماشا**

بکەی کەمترین خیانەت لەخوشکان ڕووی داوە، بەتایبەتی خوشکانی گوندان یان ناوچە ڕزگارکراوەکان، ئەوبەڕی لە خزمەتی پێشمەرگە دابوون، لە هەرکاتێکی شەو وەخت و ناوەخت نانیان داوەتە پێشمەرگە.

*** *** ***

شەڕەفی کەمترین خیانەت لەگەڵ و وڵات بەر ژنی کورد دەکەوێت، یەك ملیۆن کوردی خۆفرۆش بە قوربانی دەلینگی ژنانی کوردستان بێت، منیش بەناوی پیاوانی شۆڕشگێڕو نیشتمان پەروەر سەری ڕێزم بۆ ژنانی کوردستان دادەنوێنم، بەراستی توێژێکی پاك و دڵسۆز بووینە و دەستیان سوور نەبووە بە خوێنی کورد، دەکرێت بڵێین ژنی کورد پاکتر و دڵسۆزتر بوون لە پیاوی کورد، بە پەیدابوونەوەی پێشمەرگە بەتایبەتی دروستبوونی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و شۆشیالیست و زەحمەتکێشانیش ئەو شەڕەفەیان بەردەکەوێت وتیان دووژمن خەیاڵەکانت خاون ئەوە هاتینەوە.

ڕژیم هەڵوێستەیەکی کرد، هاتە ئەو باوەڕەی هەر چەند توندی بکات ڕێژەی پێشمەرگە زیاد دەکات بۆیە ناوەناوە کەوتە لێبووردنی گشتی بڕیاڕی دا ئەوانەی دابەش کرابوون، لە جنوبی عیاق ئەوانی مەنفی کرابوون، بگەڕێنەوە کوردستان ئەوانەی لە بەندیخانەکان بوون کە بەهەزاربوون ئازاد کران، پاشەکشەی کرد کە بەنیاز بوو زۆر شوێن لەکوردستان رابگوازێت، ئەگەر پێشمەرگە پەیدا نەبایەوە ئەوە ئێمەش لە دوای ئەوان بووین، زوتگاوەکان دەبووە نیشتیمانمان دەبووایە خۆمان بگونجێنین لەگەڵ ئاوی تاڵ و تۆز و دارخورما و بەلەم و قامیش وجداشە و عەسیر دروست کردن و گامێش بەخێوکردن ودروست کردنی تۆڕی ماسی گرتن و خەمی بەلەم کڕینیشمان زۆردەبوو. ناوی جۆرەکانی خورماش کێشەیەك بوو تا فێر دەبووین،ماسیەکانیش، هەروا، سوپاس خودایە. بژی پێشمەرگە بە هەموکەم و کورتییەکەوە.

*** *** ***

ئەکرێت شتێك باس بکەم کە کەمتر باسی کراوە لە قۆناغی بەرگری بە تایبەتی بۆ کورد کە لەلێواری مەرگ بوو، پێوستیت بە هەموو کەس دەبوو گرینگ دوو فیشەکت بۆت بتەقێنیت، دوو سەرباز بکوژێت. دیارە هێزی پێشمەرگە پڕ بوو لە خەڵکی ڕۆشنبیر و خاوەن تەجروبە بە تایبەتی کادیرەکانی کۆمەڵە، بەشێکی زۆری کۆنە کادیرەکان بۆ بەربەچدانەوەی دووژمن ئازابوون-زەروریش بوون لە ناو ئەو سەرکێشانە زۆرجار کاری خراپیشیان دەکرد، دەبووایە چاوپۆشییان لە

هەندێك هەڵە كرابا، چونكە ئەوان خۆ بەخشبوون بۆ نموونە لە گوندی قەرەنیاخە چەندكەسێك شەهید كران، ئەمەش لە ئەنجامی سەركێشیەك... كەسێك لە زێوەی خۆمان خانووی ماڵە شەهیدێك، پێش زۆر خانووی تر لە لایەن پێشمەرگەیەكی سەركێش سوتێندران، دیارە خەڵكی سەركێشیشی رێژەیكی باشی تێدابوون. لە گوندی باویان كەسێك شەهید كرا، بە هەڵەی چەند كەسێك،یان لە دەشتی هەولێر برادەرێكی خۆمان لە دڵسۆزی بۆ گەل و وڵات لە كوشتنی عەرەبە هاوردەكان زێدەڕۆییەكی زۆری كردبوو. دیارە بانگ كراو دواتر سزاشدرا ئەو ڕووداوانە هەبوون... هەندێك جار ئەو سەرەڕۆیانە تاڵانیشیان دەكرد. زۆرجار لە لایەن چەند كەسێك ڕاوەڕووتیش دەكرا.. لەبن باری پێشمەرگە نموونەی بێتواتە كە كۆمەڵێك پێشمەرگە ڕاوەڕوتیان كرد، كە دواتر بانگ كران و سزادران، پێشتریش چەند كەسێك گوللەباران كران.. پێویست ناكات ناویان بێنم لەبەر ماڵباتیان.

دیارە هەركارێك بێ كەموكوڕی نابێت.بەڵام ئەوەناگەینی پێشمەرگە بە گشتی وابووە، نەخێر بە هەزاران پێشمەرگە دەستودەم و داوێن پاك بوو، دڵسۆز بوو ئازابوون. بە هەزاران لە تەمەنی جوانیی خۆیان كردە قوربانی گەل و وڵات، كە گەورەترین قوربانیە لە ژیانی مرۆڤ.

پێویستە ڕێز لەكەسوكاریان بگیرێت و یادیان بەخێربێت پێشمەرگەكان بە گشتی و بەتایبەتی پێشمەرگەكانی كۆمەڵە كە قەڵغان بوون بۆ گەل و وڵات. ئەو دەم كۆمەڵە كۆمەڵە بوو، كۆمەڵە بە هەزاران كوڕە جووتیاری لە خەو هەستاند و چاریان كرایەوە و شت فێر بوون. كۆمەڵە وای كرد كوڕەجووتیار خۆی بناسێت دەوروبەربناسێت ئاشنابێت بە دۆست و دووژمن. كۆمەڵە وای كرد كوڕە جووتیار هەربیر لە خۆی وخزمەكانی خۆی و تیرەكەی نەكاتەوە، بەڵكوو بیر لە نەتەوە و بنیاتنانی دەوڵەتێكی سەربەخۆ بكاتەوە، كۆمەڵە وای كرد بە دڵێكی خۆش لەپێناوی مانەوەی گەل و وڵاتی گیانی خۆی ببەخشێت، پێم وایە دوارۆژ مێژووی گەلەكەمان ئەوشایەدیە دەدات، بۆ پێشمەرگەكانی كۆمەڵە، برایانی شۆڕشگێر و خەتی گشتی، پێشمەرگەكانی هێزەكانی تریش هەركەسەو كاریگەری خۆی هەبووە لەو بەرگریە بەپارتی وشۆشیالیست و بە برایانی كۆمەنیست و پاسۆك و... ئێستاش ئەو شوێنانەی كۆمەڵەی تێدا بووە جووتیاران زۆر وشیارترن لە شوێنەكانی تری كوردستان.

ئەكرێت ناوی قارەمانێكی ئەو گەلە بێنین نازناوی موختار كوژی بە دواكەوت بوو، ئەویش شێرەپیاوی گەلەكەمان (مولازم سەید كەریم )هاودیانی بوو..بە ڕاستیش موختاركوژ بوو بەڵام چ

**موختارێك؟ ئەو موختارەی خۆی لە بیرکردبوو بووبووە نەتەوەیەکی تر بۆ لەناوبردنی نەتەوەکەی خۆی، دەستخۆش سەید کریم، ئەو نازناوەشت پیرۆز بێت. سەیدکەریم پیاوێکی بە هەیبەت بوو لە قەندیل پێداهاتە خوارێ تاکو گەیشتە دەشتی هەولێر جاسووس و پیاوخراپان لێی تۆقی بوون. دیارە سەید کەریمیش بە هیمەتی کۆمەڵێك برادەر و پێشمەرگە قارەمانەکان توانییان ئەو ناوچە گەورەیە لە جاسووس و خەرکی بوودەڵە پاك بکەنەوە. سەید کەریم لەوە گەورەترە من وەسفی بکەم، یەکێك لەشتە خۆشەکانی سەید کەریم کەسێکی کە گومانی لێکرابا و خۆی لە سەیدکەریم دیناپێش و ماستاوی خەستی بۆ سەید دەکرد، سەیدی داوەت بکردبایە سەید کەریم وەختی نان خواردن چەندان پێشمەرگەی دەبرد و ئەوان نانی کابرایان دەخوارد سەید نانی کابرای ناخوارد. چەندی کابرا داوای لێ دەکرد ئەو دەی وت تۆ ئەوپیاوەنیت نانت بخۆم نانی پیاوە بوودەڵەکانی ناخوارد!**

*** *** ***

**دەتوانم ناوی چەند شێرەپیاوێك باس بکەم کە دەوری بەرچاویان هەبووە لەسنوورەکەمان و دەورو بەر وەك: شەهید ملازم خولە و شەهیدی سەرکردە دکتۆر کەمال خۆشناو، شەهیدی سەرکردە حەسەن کوێستانی و شەهید رێباز و شەهید سابر رەسوول و سەفین مەلاقەرە و شەهید رەنجبەری رۆشنبیر و شاعیر و کوڕەکانی مام سەعیدسۆفی و شەهید سەردار و نەهرۆ و بورهان و شەهید فاقە و شەهید سەید سەلیم و سەید کاکە و شەهید شینەی بۆری و شەهید مەولوود شێخ وەسانی و شەهید ئەحمەد قەمبەری و شەهید کاوە مەخووری و عوزێر فەقیانەیی و قادر دۆشکە و سەلاح و مۆفەق و سلاح حەوێزی و بارزان کۆی و مامۆستا کارۆخ و سەرکردەی گەلەکەمان سەیدکریم و سەید مەجید مامۆستا بەکر شەهید مەلا غەفوور و حاجی مەمۆ و شەهید مامۆستا زرار و رائید جەلالی برای و مامۆستا سەیفەدین و شۆڕشی برای و حاکم سەردار و حاکم کەمال و حاکم قاسم و وشیار بابان و شەهید قانیع ناسراو بەجووتیار کۆیی و سەفین کۆلکەڕەشی و کەیفی بەگ و محەمەد بالیسانی و عەزیزبەگ و شەهید تەحسین کاوانی و عەولابۆر و شەهید بەهرام خۆشناو دکتۆری مرۆڤ و ئاژەڵ و داروبەرد دکتۆر زریان و شەهید مغدید و یاسیینی برای و ئازاد خۆشناو شەهید مستەفا خۆشناو و فاخیر خەتی و فاخیر بناوی و ئیبراهیم بناوی و شەهید حاجی شێخ وەسانی و شەهید زاهیر بالیسانی و قادر خەبات و عوسمان بچکۆڵ و جەعفەر بێراوەیی و ئەحمەد هەرتەلی و شەهید وەسمان بەگ و شەهید**

ئەحمەد هەرتەلی و سواراغە و شەهید سەعید مەسیفی و زرار شەقلاوەی و فەوزی شەقلاوەی و شەهید کارزان شەقلاوەی و لادێ شەقلاوەی زوبێر شەقلاوەی و کاک ئەسعەد گۆزێ کاک زوبێر و و شاسوار و بەژن وبالای گیان پۆلار، حاجی ئەکرەم و ئەوانەی لەگەڵی شەهید بوون، شەهید سەعید کادر و مەلا هیوا و شەهید عبدولرەزاق تارینەیی و ئاکۆ کەرکووکی و مام قاسم دۆڵی بلەیی و شەهیدی زیندوو خولەی خۆمان، شەهید حەسەنە گەورە و مەلا مەغدید شێخ وەسانی و خەلیل خەتی و شەهید محەمەد بیکەیسی شێخ وەسانی و کاک جەمال هەروتی و کاک ئارێز و سەباح توتمەرەیی و براهیم بناوی و قاسم عەزیز و هاوڕێ تەلعەت و مزەفەر گەورە و وەمزەفەر بچووك و شێخ قادر و کاروان و مامۆستا حسێن نۆشیر شەقلاوەیی و حاجی مەمۆ و مەجید میرخان و کاك رێبین و شەهید محەمەد جمیل هیرانی و شەهید تۆفیق هەریری،لە حیزبی شیوعی مام رەسوول شیوعی و بەکر توتمەیی و حسێن بەشان و مامۆ مەلەکی و شەهید ڕەحمان شیوەیی و شەهید ئەحمەد هەرتەلی و شەهید مامۆستا زرار وشەهید خدر ئەندێکی و جەلال سۆرکانی و هەڤاڵەکانی و مامۆستا هەندرین و عەلی حەوێزو شەهید شێخ سلێمان بالیسانی و محەمەد گۆڕەشێری و عوسمان گۆڕەشێری و شەهید عەزیز مەلەکی و شەهید شوانۆ گەرەوەی و شەهید مام شوان سەرانەی و شەهید محەمەد و زریان شێخ وەسانی و شەهید مەلاسەعید خەتەیی و شەهید رەحمان شیوەیی و شەهید مەلای رەشی شێخ وەسانان سەنگەر هەولێری و رزگار هاودیانی خزمانی گوندی پوکە و شەهید حسێن بەستەستێنی و شەهید عەلی نەبی و هاوڕێ کاوە وهاوڕێ خەبات کانی بەردی و کاك تەها و کاك عەبدوڵلا و کاك تەها و سباح میرگەسەری و برایم مێرگەسەری و سەنگەر مەلۆکی و مەلا سەفین و ئەندام نواوەی و یاسین مێرگەسەری و خزما نی و عەزیز رووبارەیی و عومەر زێوەی ناسراو بەعومەر جیهاز و کاك ئەسعد زێوەیی و کەمال زیوەیی و شەهید یاسین شیخ وەسانی و ئامانج جیهاز برایی شەهید حەسەن دووبارە کەمال زێوەی و شەهید جمالّ شێخ وەسانی و شەهید عومەر شێخ وەسانی و دکتۆر عبدرەحمان هەرتەلی و کاك جەلال دەراشی و حەسەن کونەفلووسەیی و شەهید عومەر زێوەی و مام قادر خەتەیی و شەهید ئەحمەد و سو شێخ وەسانی و مزەفەر جیهاز و شەهید سەمەد هەو لێری و شەهید عبدولرزاق و شەهید سلێمان خەتی و شەهید ئەکرەم کەرکوکی و شەهید یوسف شەریف و شەهید یوسف خزمی حەسەن کویستانی و شەهید رەفعەت هەولێری و شەهید شەهید پێشرە و ... دووبارە شەهید پێشرەو عەبدوڵلا چۆمانی و شەهید عەلی وەیسی و شەهید حەمەرەش

رانیەیی و خەلیل خەتەیی و زرار توتمەیی و حەسەنەرەشی توتمەیی و شەهید غازی بێراوەیی و شەهید ڕەحمان شیەی و شەهید عەزیز مەلەکی و کەریم سویری و مام حەسەن شیەی و کاکۆی کوڕی و مام سلێمان مەلەکی و کورەکەی ........هتد. و ە دیارە ناو هێنانی شەهیدو پێشمەرگە بەڕێزەکان تەواو نابێت چونکە ڕێژەکە لەهەزارانە ئەوەیان لەتوانای من بەدەرە، داوای لێبووردن دەکەم لەناو نەهێنانی هەموو ئەوانەی دەیان ناسم، هەریك لەوانە ڕۆمانێکە بەداخەوە زۆری دەوێت و لە توانای مندا نییە.

***  ***  ***

با کورتە باسێکی شەهید سەمەد باس بکەم، شەهید سەمەد پێش ئەوەی ببێتە پێشمەرگە دیارە قوتابی بووە لەزانکۆ، لەگەڵ کچێك یەکتریان خۆشویستووە پەیمانیان بەیەك دابوو لە هەر فرسەتێك بگونجێت زەماوەند بکەن، دوای دەرچوونی لە زانکۆ سەمەد بووە پێشمەرگە من زانیاریم نییە لەڕابردووی ئەوەندە دەزانم کاك سەمەد وەك کادیرێك لەناوچەکەمان پەیدا بوو.

لەساڵی (١٩٨٣ ) لەجەولەیەك لە سەرەتای مفاوەزاتی هەمان ساڵ کاك سەمەد بەخۆی و بە کەریم سوێری لە جەولەدابوون سەیارەکەیان ئاگر دەگرێت، شەهید سەمەد زۆر خراپ سووتا بە تایبەتی دەموچاوی مفاوەزاتیش بەسەر داهات سەمەد رەوانەی نەخۆشخانەی جەمهوری هەولێر کرا، بۆ چارەسەری بەسودتفە خزمێکی منیش لە ڕووداوی سەیارە بریندار بوو، منیش لەگەڵ خزمەکەم چوینە هەمان نەخۆشخانە... لەوێ سەمەدم دیتەوە. ڕۆژێکیان وتی هاوڕێ فەقێ کارێکم بۆ بکە، وتم ئەوەی بەمن بکرێت بە چاوان. وتی بابراکەم نەزانێت ناو نیشانی ماڵێکت دەدەمێ ئەو ماڵە کچێکیان هەیە بەوناوە ......پێم خۆشە تا نەمردووم ئەوکچە ببینم بۆ ئەوەی پێی بڵێم: ئەگەر من مردم بۆخۆت شوو بکە. چونکە بڕیارمان وابوو نەمن ژن بێنم ونە ئەویش شوو بەکەس نەکات لەدووای من. من لێرە بەو خوشکە دەڵێم شەهید سەمەد لەلای من وتی بەو کچەبڵێت بیتەلام تاکو پێی بڵێم بۆ خۆت شوو بکە. ئەگەر ئەو خوشکەماوە ئەوە وەسیەتەلای من. پێویستە بۆ خۆی شوبکات، ئەگەر شوی کردووە باشتریش... ئێمە لەو قسانەدابووین براکەی هاتەوە منی بردە پەنایەك وتی سەمەد چی وت ؟ منیش ترسام نەوەك کێشەیەکی کۆمەڵایەتی دروست بێت، قسەکانم بۆ باسکرد براکەی وای پێ باش بوو واز بێنم، دوای چەند مانگ شەهید سەمەد پەیدابووەوە بووەوە پێشمەرگە وەك رابەری سیاسی لە تیپی (٨٣ ) هەوریێ شەهید سەمەد دووای ئەوسوتانە زۆر دڵناسك بووبوو لە جەولەی پێش ئەوەی پەلاماری رەبایەی قۆپی سۆر بدەین لە من

توره بوو لەسەر شتێکی زۆر بچووك، لە ڕێگا زۆر هیلاك بوو نەیدەتوانی لە ڕووباری گوندی ملوەران بپەڕێتەوە منیش ولاغێکم پێ بوو، کە شەهید سەمەدم دیت بەو شێوەیە چوومە لای و وتم هاوڕێ سەمەد وەرە سواری ئەو ولاغە بە وتی: نایم. وتم خۆت گران مەکە، ئێمە براین ئەتۆ برای گەورە و من براگچکە براگەورەش دەبێت لە برابچووك ببوورێت، وەرە سواری ئەو ولاغە بە، دیار بوو زۆر پێی خۆش بوو، زەردەیێکی کرد و وتی باشە.

باش لە بیرم نییە، پێم وایە لە ساڵی (١٩٨٧) لە گۆڕبەشیلانی بەنی هەریر پەلاماری ڕەوەجاشێکیان دا و بەخۆی و ڕەفعەت شەهید بوون.پێم وایە دوو پێشمەرگەی تریش شەهید بوون، من نایان ناسم گۆڕی شەهید ڕەفعەت لەدزۆرەتێیە، کاك سەمەد نەیتوانی خۆشەویستەکەی ببینێتەوە. شەهید ڕەفعەت ئیدارەی کەرتی تیپ بوو، کوڕێکی بەرێز و تێکۆشەر بوو.

*** *** *** ***

پێشمەرگە کەوتە گرتن و لێدانی پیاو خراپان هەندێك جار کوشتنیان، جاسووسەکان بوونە دوو بەش: بەشی زۆری وازیان هێنا بەشی تر ڕایان کرد و چونە شارەکان. یەکەم چالاکی کرا لە ناوچەکەمان لە دەوروبەری گوندی توتمە بوو، کۆمەڵێك سەرباز کوژران شەهید حەسەن سۆفی شێخ وەسانی و زریان شێخ وەسانی و و شەهید محەمەد شێخ وەسانی ئەو چالاکەیان ئەنجامدا، چەند پێشمەرگەیەکی تربوون لەو چالاکییە دوژمن شێت بوو، ئەو چالاکییە لەنێوان چەندان فەوج کرا شەهید محەمەد بالیسانی لەگەڵ خزمەکانی و محەمەدشێخ وەسانی ناوچەکەیان بە جێ نەدەهێشت. خزمانی مەلەکان و گەرەوان و سەران و زۆری تر بوونە پێشمەرگە، بەپەیدابوونەوەی پێشمەرگە ڕژێم زانیاری لە سەر کۆمەڵێك کەسایەتی ناو چەکەمان کۆ کردبووەوە، کە یارمەتی پێشمەرگەیان داوە

لەساڵی ( ١٩٧٦) ئەو بەڕێزانەی خوارەوە بوون و دەستگیری کردن:(خالید حەمەدەمین مستەفا )، مێرگەسەر (کەمال عەلی عەبدوڵلا ) مێرگەسەری، ناسراو بە کەمالی علی بەگ.(مستەفا ڕەسوول مستەفا ) مێرگەسەری، ( خالید ئەحمەد حەسەن عەولا ) مێرگەسەری، (مستەفا سلێمان حسێن ) (تاهیر حەمەدەمین) ناسراو بە حاجی تاهیر(حەسەن قادر حەمەد) مێرگەسەری (سماعیل عبدللە قادر) مێرگەسەری (مولود حسین مەحموود ) گوندی مەلۆك، (حەمەدزانەوێر ) مێرگەسەری...لە سەر هاوکاری پێشمەرگە شەش ساڵ حوکم درابوون لەهەینەی کەرکووك، جەبار فەرمان و عومەری سەید عەلی و کاك ئەرسەلان و فەرەیدون

**عەبدول قادر و عەلی بچکۆل و ئاسۆ سلێمان، ئەوانیش ئەوکات حوکم درابوون، لەگەڵ ئەو کۆمەڵەتێکۆشەرە میوانی بەندیخانە بوون.**

*** *** ***

**تاریخەکەم لە بیر نەماوە شەوێکیان ( ١٨) پێشمەرگە لە مزگەوتی شێخ وەسانان دەخەون ئەوکات فەوجی سەربازی لە بالیسان بوو ........جاسووس، فەوج ئاگادار دەکاتەوە، هێزێکی گەورەی دووژمن دەوری مزگەوت دەگرن پێشمەرگەکان حەرەسیان دەبێت، بەڵام هەست پێناکات ئەو پێشمەرگەی حەرەس دەبێت میزی دێت پێش مزگەوت بەرز بوو، پێشمەرگەکە میز دەکات بە سودفە میزەکە بەر سەربازێك دەکەوێ سەربازەکە دەترسێ و ڕادەکات پێشمەرگەکە وەك مەردان بەدەست و برد تەقەدەکات یەك دوو سەرباز دەکوژێت و بریندار دەکات، بەخۆشی ڕادەکاتەوەناو مزگەوت برادەران هەڵ دەستێنێت دەڵێت کوڕینە دەورمان گیرایە.. یەکێك لەوان ناوی دانابوو پێیان دەڵێت برادەرینە شەڕبکەین هەر دەمانکوژن شەڕنەکەین هەر دەمانکوژن، کەوابوو پیرۆزترین شت دەستوەکەرە، لەکاتی ئەوقسانە بە هەموو چەکی سوك تەقە لەمزگەوت دەکرێت. پێشمەرگەکان بڕیاردەدەن دەستوەکەر بکەن، بڕیاردەدەن هەموویان پێکەوە بچنەدەرەوە دەست ڕێژبکەن و ڕادەکەن دێنەدەرێ و تەقە دەکەن و ڕادەکەن ئەوەندە بەگورجی چەند سەربازێك دەکەونە سەر ڕێگەیان سەربازەکان لەترسان خۆیان فرێدەدەن و ڕێگا بۆ پێشمەرگە چۆڵ دەبێت ئائەوان دەردەچن، سەربازەکان هەر تەقە لە مزگەوت دەکەن ئەو سەربازانەی کە لەبەر پێشمەرگە هەرات بوون نەوێرابوون بەبەرپرسەکەیان بڵێن بەلای ئێمە ڕایان کردووە، تاکو گەزەنگی ڕۆژ دەرکەوت ئەوان هەر تەقیان لەمزگەوت دەکرد وایاندەزانی هەر لە مزگەوت دانە دواتر بانگی موختاریان کردبوو، کە بچێتە لایان بە مەبەستی تەسلیم بوون موختار بە ترسەوە دەچێتە بەر دەرکی مزگەوت دەڵێ پێشمەرگەینە من فلانم بەزۆر ناردراوم دێمەلاتان تەقەمەکەن، چەند جارێك ئەو قسەیە دووبارە دەکاتەوە کەس وەڵامی ناداتەوە سەر بە ناومزگەوت دەنێت دەبینێت کەس لەوێ نیە موختار زۆر دڵخۆش دەبێت، چونکە موختار پیاوێکی باش بوو ناوی(عەبدولڕەحمان حەسەن فەقێ بوو ) بوو دەچێتەوە لای ئامیر فەوج دەڵێت مزگەوت کەسی لێ نییە، ئامیر فەوج شێت دەبێ بە پەلەو بەترسەوە دەچێتەناو مزگەوت سەیر دەکات کەس لەوێ نییە، دووربینێك و( چەند رادیۆێکی بچووك نەبێ لەگەڵ بەتانی کە لەماڵاتیان هێناون، بەتانیەکان دەسوتێنن هێزەکە دەگەڕێتەوە بە کوژراو بریندارەوە دوای ڕۆیشتنی هێزەکە پێشمەرگەکان دێنەوە ناو گوندی بۆ**

ئەحوالّ پرسینی هاولآتیان کەلەو شەڕە سەلامەت بووینە یان نا .خۆشبەختانە کەس هیچی نێنەهات تەنها دووژمن و جاسووس ڕووڕەش بوون، ئەوپێشمەرگانەی لەمزگەوت دەوریان گیرا ئەو بەریزانەبوون ئەوانەی زاندراون ئەگەر هەلّەنەبم، چونکە ئەوکات من لەشێخ وەسانان نەبووم: (کاک دانا کادیری کۆمەلّە، حاجی کەمال کەندۆری، خدر ئۆمەر -مەلەکان، برایم تاهیر-مەلەکان، یوسف عەزیز -مەلەکان، جەمال خۆشناو نواوەیی، شەهید مستەفاخۆشناو گوندی خەتێ، حسێن مامەمین زێوەی، حسێن حاجی مینە زێوەیی، حەسەن حمە ئاغە زێوەیی ، مامۆستا عوسمان زێوەیی، سەلام حاجی زێوەیی، حاجی بلەی، حەمەدەمین مەلەکی ناسراو بە بەنگین، حەمەی حاجی مینە زێوەی ناسراو بە حەمەکۆر) بەلّێ ئەو بەرێزانە بەهیمەتی ئەو حەمەکۆرە نەجاتیان بوو .

*** *** ***

لە گوندی گەرەوانی ئاکۆیان شەڕ و سەرکەوتنێکی گەورە بووە، دەنگدانەوەیکی گەورە بە کەمترین زیان لەبەرەبەیانی (١٠ / ١١/ ١٩٧٦) هێزێکی گەورەی ڕژێم بەرەو گوندی گەرەوان دێت دەگاتە گەرەوان و دەیەوێت بگاتە گەرەوانی سەرێ، خەلّکی مەرد و ئازای گەرەوان بە ژن و پیاوەوە بە هیممەتی پێشمەرگە لێیان دێنە دەست، سەربازەکان زەبتی سەربازی لە دەست دەدەن و لێیان دەشێوێت. خەلّکی بەناویان دەکەون بەڕاست وچەپ تەقەو هاوارهاواری سەربازەکان تێکەلّ دەبێت، سەربازەکان ڕوو لە هەر لایەك دەکەن لێیان دەدرێت، دووژمن قەت هێندە ڕەزیل نەبووە، ژنەکان لە پیاوان ئازاتر بوون، لە کوشتن ودیتنەوەی سەربازان دەردێك بە ڕژێم دەکەن مەگەرخۆیان بزانن چییان بەسەرهاتووە. ئەوەی کوژرا کوژرا ئەوەی دی بەبریندارەوە ڕایان کرد لەو شەڕە ئەوەی ئەوکات زاندرا (٥٤) سەرباز کوژران یەکیان مولازم ئەوەل بوو... (٧) سەرباز بەدیل گیران دووهاولآتیش شەهید بوون بەدەستی سەربازێکی بریندار لەکۆتایی شەڕەکە دەسکەوتێکی زۆر لەچەك وتەقەمەنی بەردەست کەوت، دووشەهیدەکان( مستەفا عەزیز، ڕەمەزان عەزیز ) هەردووکیان سەربازێکی بریندار شەهیدی کردن، دەوری سەرەکی ئەوانەی یەکەم جار ڕووبەڕووی دوژمن بوونەوە ئەوەی من زانیومە ئەو بەرێزانەی خوارەوە بوون:

١- شەهید ڕەسوول

٢- شەهید مستەفا

٣- ڕەحمان کەزیان

٤ - حەماغە

٥- دلۆ

ئەوەندە لەلای من ناسراون، لەو کاتی ئەو بەرێزانە لەپێشەوە لێیان دەدەن، هێزێکی (١٢ ) کەسیش بە سەرپەرشتی عەزیزی رابێ لە دواوە لەو هێزە دەدەن، ئەو لێدانە پشتی هێزەکەی دووژمن دەشکێنێت ناوەکانیان:

١ - عەزیز حەمەدەمین ئەحمەد ناسراو بە عەزیزی رابیێ.

٢ - فەتاح قادر مەحموود

٣ - خالید ڕەسوول ئەحمەد

٤- سدیق سلێمان مستەفا بنمێردی

٥ - ئیسماعیل خدر قادر

٦- قادر سلێمان قادر

٨ - جەلال سابیر

ئەکرێت سەرەتای شەڕەکە کەخەڵکی تریش بەشداری کردبێت، من نەم زانیبێت دوای دروستبوونی شەڕ وردە وردە پێشمەرگەی تر بەرەو شەرەکەدێن ژمارەیان زۆردەبێت دواتر ژنیش بەقەدەر توانای خۆیان بەشداردەبن دەسکەوتی شەڕەکە (١ ) بیکەیسی بۆ یەکەم جار لە کوردستان بکەوێتەدەست پێشمەرگە، ئەوکات چەکێکی نموونەیی بوو، زیاتر لە(١٠٠ ) کلاشینکۆف بۆ ئەوکاتی شۆڕش بەراستی دەسکەوتێکی گەورەبوو، ئەو شەڕە نموونەبوو، لە دوای پەیدابوونەوەی هێزی پێشمەرگە، کاریگەرێکی گەورەشی هەبوو لەوورەبەرزکردنەوەی وورەی جەماوەر و ترسێکی گەورەشی لە دڵی جاسووسان و ڕژێم دروست کرد، گەورەترین شەڕبوو دەکرێت بڵێین یەکەم شەڕی گەورە بوو، لە دووای ئەو شەڕەش شەڕێکی گەورەش لەسماقوری روویدا کەزەرەر و زیانێکی گەورە بە دووژمن گەیشت، دوای جیابوونەوەی بزوتنەوە لە یەکێتی هێزێکی زۆری بزوتنەوە لەدۆڵی سماقولی کۆ دەبێتەوە کە ئەو بەرێزانەی خوارەوەدەبن:

١ - سەید کاکە ئەندامی مەکتەبی عەسکەری

٢ - شینەی بۆری ئامرهەرێمی (١٠) جگری شەهید ئەحمەدخان

٣- سەید سەلیم امیرهەریمی (٩) جیگری عەولابۆر

٤ -عەولاسۆر امیرهەرێمی (١٤) جیگری حەسەن بۆری

**٥- مەلابکر ئامیرهەرێمی باواج، جێگری سەلیم کێشکە**

**٦ -شەهید حمە سور کێخوا سدیق ، ئامیر هەرێمی دەشتی کۆیە، شەهید سەرباز جێگری بوو.**

**دیارە ئەوهێزە رێژەیەکی زۆرپێشمەرگەی قارەمانیان لەگەڵ بووینە، بۆ نموونە محەمەد بیکەیسی و مەولوود شێخ وەسانیی لەگەڵ بوون وەك ئاماژەم پێدا، ئەوهێزە لە دۆڵی سماقولی بووینە هەبوونی ئەوهێزە، لەو ناوچەیە رژێم هەستیان پێ دەکات لەرۆژی ٢٤ / ١٢ / ١٩٧٩، شەڕەکە دەست پێ دەکات دیارە رژێم لە بەرەبیان هێزیکی زۆر دێنێتە سەر چیای هیبان سماقولی و بنەباوی دواتر (٢٤ ) کۆپتەر لە دوولاوە وەك (١٨ ) کۆپتەر لە هەولێر و (٦) کۆپتەر لە چوارقورنە دادەبەزن لە دەوروبەری گۆڕستانی( گرکی ) بەشێك لەهێزەکەی شینەی بۆرە ژمارەیان (١٢ ) پێشمەرگەدەبن، بەبێ بەرنامە پەلاماری هێزەکەی دووژمن دەدەن،( زۆرجار پێشمەرگە بەبێ بەرنامە و رژێم بە بەرنامە، رژێم سەری لێشیواوە، چونکە هێزی سەربازی بە بەرنامە و خەریتە و بە ئەمر و کات وساتی تایبەت، لەگەڵ پێشمەرگەیەکی ناگرتەوە و شکەستی دەخوارد، ئەوپۆلەپێشمەرگە شەڕێکی باش دەکەن:**

**١ - سەید رەمەزان بۆری**

**٢- محەمەد برای شەهید عەولاسۆر**

**٣- قادر شاوری ناسراو بە قادر بۆشۆ**

**٤ - ئەحمەد ناسراو ئەحمەدەشل خەلکی تیتۆکەی**

**٥ - رەمەزان ئەحمەد زیزێ باوری**

**٦- جەمیل خەرکی گوندی شێخەشلی خواربەحرکە**

**٧- علی خەرکی گوندی بوونگینە**

**٨ - تەلعت عەلی حەمەد بۆری**

**٩ - عەلی سۆفی حەسەن بۆری کفرەدۆر**

**١١ - مستەفا پیە بۆری**

**وردە وردە هێزی پێشمەرگەشیان بۆی دەچن هاوکاریان بکەن وەك**

**١- عەولاسۆر بەهێزیکەوە**

**٢- شینەی بۆری بە هێزێکەوە**

**٣- ئەحمەد خان بە هێزێکەوە.**

به هاناوەچوونی ئەو هێزە بۆلای ئەو(١١ ) کەسە ئەو یازدە کەسە وورەیان بەرزتر دەبێت.
گێرە بە سەربازانی ڕژێم دەکەن بە هەموولایەك شەڕەکە زۆرگەرم دەبێت، سەرلەسەربازەکان دەشێوێنن،لەهەمان کات سەید سلیم و سەید کاکە و عەولابۆر حەمەدەمین بناوی و تەواوی هێزەکی تریش توشی شەڕدەبن شەڕەکەی قۆڵی ئەوانیش زۆر قورس دەبێت، بەڵام وەك قۆڵی یەکەم سەربازەکان توشی سەر لێ شێوان نابن، سەید سەلیم بە کۆپتەر شەهید دەبێت، لە شوێنێك دەی شارنەوە، شینەی بۆریش شەهید دەبێت. تەرمی شینەی بۆری دەگوازنەوە بۆ گوندی گرد گۆران و لەوێ دەیبەنەوە سەروچاوە گۆڕی شینەی بۆری لە سەروچاوەی بیتوێنە، شەڕەکە شەو یەکلایی دەکاتەوە زیانی ڕژێم : کوژرانی زیاتر لە (٢٢٥ ) کوژراو جگە لە سەدان بریندار.

دەسکەوتەکان:

٢ - دوو بیکەیسی

٢ - هاوان

لە قۆڵێك (١٢ ) کلاشینکۆف لەقۆڵی سەید کاکە (٣٠ ) کلاشینکۆف، دیارە دواتر شەهید سەید دوای سێ ڕۆژ لە سەروچاوەی سماقوڵی بەخاك سپاردرا، لەو شەڕە زیانی پێشمەرگە دووشەهید بوون شینەی بۆری و سەید سەلیم .

هەرئەوەندەم توانی باسی ئەو شەڕە بکەم، مەبەستم باسکردن لەو دووشەڕەی گەرەوان و سماقوڵی ئەو دووشەڕە وای کرد ڕژێم بەخۆی دا بچیتەوە، ئەوەندەتوندو تیژنەبێت بەرانبەرکورد. خەڵکی کوردستان بەو دوو شەڕە ئومێدێکیان هاتەوە و ئەو ڕەشبینییەی لەساڵی (١٩٧٤ ) توشیان بوو ڕەویەوەو نەما، سیمای جاسووسان هەڵوستێکیان کرد زۆربەی وازیان لەجاسووسی هێناو پێم وایە ناکرێت باسی هەموو شەڕەکانی (٢٣ ) ساڵی پێشمەرگایەتی بکرێت، بە تایبەتی بۆ منی بێتوانا، ڕووداوێکی تر، شەهید محەمەد بالیسانی و حەسەن و حسێن محەمەد شێخ وەسانی نانی ئێوارە لە بالیسان دەخۆن بۆ نووستن دەچنە گوندی کانی بەرد بەو مەبەستەی سەر لە جاسووسان بشێوێنن تومەزانە جاسووس بە دوایان دەکەوێ" شوێنیان پێ دەزانێت دەگەڕێتەوە" دەچێتەلای ئامیر فەوج لە خوار بالیسان هەواڵەکەی پێ دەدات ئامیرفەوج بەو شەوە هێزێك دەنێرێتەوە شێخ وەسانان و چەند کەسێکی تر کە پیاوی ڕژێم بوون بەپێش لەشکر دەکەون، سەرەتا دەورەی گوندی کانی بەرد دەگرن دواتر دەورەی ئەو ماڵە دەگرن، کە محەمەد بالیسانی و هاوڕێکانی لێنە بەداخەوە لە کەمترخەمی خۆیان دەستگیر کران، هۆیەکەی حەرەسیاتیان نەبووە،

ئاگادارییان دەکەنەوە کە خۆیان بدەنە دەست، سەرەتا محەمەد هەوڵ دەدات شەڕ بکات دیارە لەبەر چەند هۆیەك نەکرا، خۆیان دەدەنەدەست . محەمەد شێخ وەسانی بە سوتفە ئەو شەوە دەچێتەوە ماڵەوە دوای درەنگانی شەو دەچێتە ماڵێکی تر دەنوێ دوای گرتنی محەمەدبالیسانی دەچن محەمەد شێخ وەسانیش بگرن دەورەی ماڵی ئەوانیش دەگرن زۆر لە باوکی دەدەن محەمەد لەو ماڵەی لێ بووە هەست دەکات و رادەپەڕێ چەند تەقەیەك دەکات بۆ محەمەدبالیسانی بۆ ئەوەی وشیاریێتەوە نازانی ئەوان گیاینە محەمەدبالیسانی لەئیفادەکەی دەڵێت من هەمووشتێکم کردوە دژی ئێوە ئەو دوکەسەش کە لەگەڵ منن بە زۆر کردینمە پێشمەرگە نەهاتبان لەگەڵم دەم کوشتن بۆیە حاکم بڕیار دەدات محەمەد لە سێدارە بدرێت ئەوانی تر حوکم بدرێن دواتر بڕیارەکە لە ١٦ / ٨ / ١٩٧٩ جێبەجێ کراو تەرمی شەهید محەمەد بالیسانی نەدرایەوە کەسوکاری دواتر ئەو دوکەسەی لەگەڵی بوون بە لێبووردنی گشتی ئازاد کران.

*** *** ***

ئەمەویێت لێرە باسی مام جەلال بکەین لەساڵی ( ١٩٧٩ ) شێخ سلێمان بالیسانی کە کادیرێکی رۆشنبیر و پێشکەوتووی کۆمەڵەبوو پیاوێکی ئازاو چاو نەترس و لەخۆ بووردە بوو من خۆم بە تەڵەبەی ئەو دەزانم وە زۆر هەوڵی لەگەڵ من دەدا دەیان کتێب و نامیلکەی بۆ من پەیدا دەکرد، بۆ ئەوەی بیان خوێنمەوە زۆر ئومێدی بە من هەبوو، زۆر هەوڵی وشیارکردنی منی دەدا، بەداخەوە پێم وایە لە ساڵی( ١٩٨٢) شەهید کرا، لە دەوروبەری گوندی کۆڕێ شەهیدبوونی تاکو ئێستاش گومانارییە، شەهید لە بنەماڵەیەکی شێخانی بالیسانە، ئەو بنەماڵە جیاوازییان هەیە لەگەڵ شێخەکانی تری ناوچەکەمان. یەکەم: هەموو دەم لەبەرەی گەل دابوونە. دووەم: زانای ئایینی و پیاوی ناوداریان زۆر هەبوونە. شەهید سلێمان کاسایەتییێکی گەورەی ئەم بنەماڵەیە بووە. کاسیەتی کۆبوونەوەی بەرێز مام جەلالی بۆ هێنابووم کە قسە بۆ کادیرانی ئەوکات دەکات، ئەوەی لەبیرم ماوە بەو شێوەیە قسەدەکات: لە قسەکانی ئاماژە بەمحەمەد بالیسانی دەکات. دەڵێت: براینە ئێوە دەبێت خۆتان رۆشنبیرکەن بخوێننەوە، شۆڕش کردن بە تەنیا بەچەك ناکرێت، شۆڕشی رۆشنبیری شۆڕشی دیبلۆماسی و وشیارکردنەوەی جەماوەر..تاد. دەڵێت: ئێستا بەمحەمەدبالیسانی بڵێم برۆ ئەو رەبایەی بگرە محەمەد بالیسانی کۆمەڵێك پێشمەرگە دەبات تەق وتریق تەق وتریق تەقوتریق، محەمەد دێتەوە کۆمەڵێك سەربازی کوشتووە و کۆمەڵێکی بەدیل گرتووە و دەسکەوتیشی هەبووە، ئایە رژێم رووخا !؟ نەخێر ئەوەی لەوە گرنگترە وشیاریی ئێوەیەو

**وشیارکردنەوەی کۆمەڵانی خەڵکە، ئەگەر خۆتان رۆشنبیر نەکەن، ناتوانن کاریگەریتان لەسەر وشیاریی جەماوەر هەبێت .**

**باسی مام جەلال هاتەگۆڕێ بەهۆ محەمەد بالیسانی، هەرچەندە وەسفی مام جەلال لە توانای من بەدەرە، بەس با دوو قسەی لەسەر بکەین، ئەوەی بێ هەڵەیە یەکەم خوایە، دووەم ئەو کەسەیە کەهیچ نییە و رەجەبانە دەژی! مام جەلال هەموو تەمەنی خۆی بەخشی لەپێناو رزگاری گەلی عێراق و گەلانی کوردستان، ئەوەی جێگای شانازییە قەت وەك سەرکردە هاوتەمەنەکانی ناوەخۆو دەورو بەر رۆژێك لەرۆژان نەیوتووە من سەرکردەم، نەیوتوە من رەمزی گەلم، نۆهەت و نۆ ناوی نییە، دووناوی هەیە، یەکەمیان: خەڵکی پێیان وتوە مام جەلال، کەپێشمەرگەبووە هەر مام بووە سەرۆك کۆماریشە هەرمامە. ناوی دووەمی: مام جەلال جێگای شانازیی هەموو مرۆڤایەتییە ئەویش بەندەیە رۆژنییە نەڵێت من بەندەی ئێوەم کە جەنابت بەندەی ئێمەی کەوابوو تۆ خۆت گەورەی‌پێویستە تا لە ژیاندا ماوە کورد زۆر رێزی بگرێ، ئەوەی بێخەوشە هەرخودایە..دەتوانین سوپاسی خوداش بکەین کەخودا ئەو مرۆڤ پشودرێژەی بە کورد بەخشی، توانی هەموو ژیانی خۆی تەرخان بکات لەپێناو رزگاری گەلەکەمان، کە خۆشی لەخۆی نەدی و رۆژێك لە رۆژان بۆخۆی نەژیا. دەشکرێت ئێمەش زۆر مننەتباری مام جەلال نەبین، چونکە بە هەزاران گەنجی کوردیش ئامادەبوو بە قسەی مام جەلال بە بۆچوونەکانی گیانی خۆی ببەخشێت، کە هیچ شتێك لەو باجە گەورەترنییە، کەوابوو ئێمەش بەشی خۆمان کردووە.**

**( مام جەلال ) بە سەرهاتی خۆشی هەنە، زۆر حەزیشی لە قسەی خۆش دەکات ..زۆرجار رووداوەکانیش باس دەکات یەکیکیان باس دەکەم، مام جەلال مەقەڕی لە ناوزەنگ دەبێت کوڕێکی گەنجی گوندەی گرجانی بیتوێنێ بە ناوی پیرۆت دەچێتە ناوزەنگ دەبێتە پێشمەرگە هێرۆخان لەبەر کەمی تەمەنی گەنجەکە دەیباتەلای خۆی. بەهار دادێت (مام جەلال) بەپێشمەرگەکان دەڵێت: کوڕەکانم خەمی تەماتەکردن ولەبەر بێت پێشمەرگەکان گیا دەدرون و جووت پەیدادەکەن زەوی ئامادەدەکەن، تەماتە دەچێنن مام جەلال دێتە لایان دەڵێت: با تەماتان بەش بکەین، زۆری بۆ ئێوە ئەوکەمەش بۆ من، بەڵام کەس تەماتەی من لێنەکاتەوە، چونکە من وەخت رناوەخت میوانم دێن. تەماتە پێ دەگەن رۆژکیان پیرۆت خەفەر دەبێت دەچێتەناو تەماتان سەیر دەکات تەماتەی پێشمەرگە هیچی پێوەنیین، تەماتەی مام جەلال سۆر دەکرێن، لە تەماتان چاوەگێری کەس دیارنییە تەماتەکانی مام جەلال لێ دەکاتەوە، چێشت لێدەنێت، کاتژمێر دووی**

دوای نیوەڕۆ مام جەلال چەند میوانی ئێرانی دێن، نانیان نەخواردوە مام بەپێشمەرگەکان دەڵێت: نانیان بۆ ئامادە بکەن، دەچنە ناوتەماتەی مامی تەماتەی پێوە نەماینە، ئەو هەواڵە بەمام دەڵێن، مام دەڵێت: من بەویەیانیە تەماشای تەماتەکانی خۆم کردبوو زۆری پێوەبوون، کێ ئەمڕۆ خەفەریووە؟ دەڵێن: پیرۆت. بانگی پیرۆت دەکات و دەڵێت : پیرۆت ئەتو تەماتەی منت لێ کدنەوە؟ دەڵێت: بەڵێ مامە مام جەلال. دەست بۆ دەبانچە دەبات پیرۆت ڕادەکات، مام بەدوای دەکەوێت، پیرۆت دەچێتە لای دکتۆر فواد لە ترسان مام بەرەو مەقەڕی دکتۆر فواد دەچێت دەڵێت: دکتۆر ئەو کوڕە لێرەیە؟ دەڵێت: نەخێر. لەلای من نییە، مام جەلال دەگەڕێتەوە پیرۆتیان نەقل کرد بۆ بالیسان، بۆکەرتەکەی ئێمە کە کەرتی تیپی مەڵبەندی سێ شەهید عەلی نەبی ئیدارەی دەدا. پیرۆت دوای شەهید بوو، پاشان باسی دەکەم، کە چۆن شەهید بوو.

*** *** ***

لە وەختی خۆی وردە وردە ڕژێم خۆی بۆ شەڕی ئێران ئامادە دەکرد بۆ تۆڵەکردنەوەی ئەو سەرشۆڕییەی کە کردبووی بەرامبەر بەشای ئێران بۆ توانەوەی شۆڕشی کورد. ناوەناوە ڕژێم ناوچەکەی چۆڵ دەکرد، دیارە گۆڕانێکی گەورە بوو بۆ گەشەکردنی هێزی پێشمەرگە، بە زۆربوونی هێزی پێشمەرگە و جیابوونەوەی برادەرانی سۆشیالیست و دروستبوونی ململانێی نێوانیان و پاوان و پاوانخوازی دەستی پێ کرد، برادەرانی پارتی و کەوتنە ململانێ لەگەڵ یەکێتی بەداخەوە، ئەو ململانە کارەسات بوو! پارتی هەوڵێکی زۆری دەدا کە وا جەماوەر تێ بگەینی، جەلالیەکان پیاوی حکوومەتن، جاشن نەوەك پێشمەرگە !

جەماوەریش ناوشیار بوو، کاریگەری شۆڕشی ئەیلوولیشیان لەسەر بوو بنەماڵەی بارزانی و بەشێکی زۆری جەماوەر غەدرێکی گەورەیان لە پێشمەرگەکانی یەکێتی دەکرد، بەتایبەتی پێشمەرگەکانی کۆمەڵە، چونکە زۆربەی پێشمەرگەکانی کۆمەڵە بەشێك نەبوون لە ململانێی کۆنی مەلایی و جەلالی، بە بۆچونی من خۆی لە چەند خاڵێك دەبینیەوە: نێوان پارتی و یەکێتی چەند هۆکارێك هەبوون لەوانە ململانێی ناو پارتی لە ساڵەکانی (١٩٦٥) نێوان بالی مەکتەبی سیاسی و باڵی مەکتەبی عەسکەری، باڵی مەکتەبی عەسکەری شێوازی چارەسەری ململانێکەی بە شێوەیەکی نادروست یەکلایی کردەوە کە بە زەبری هێزبوو نەك دانیشتن و گفتوگۆ کە بووە سەرەتایەکی توندی ململانێ... تاکوو ئێستاش بە شێوەیەکی یەکجاری چارەسەرنەکراوە، بەپەیدابوونەوەی یەکێتی داروەدەستەی شای ئێران ڕێگایان بەپارتیدا جارێکی تر بێتەوە مەیدان

بۆ ململانێی یەکێتی، ئەکرێت پرسیارێك بکەین ئایە شای ئێران خێر بوو لە رێکەوتنی جەزائیر بڕیاریدا کۆتایی بە شۆڕشی کورد بێنێت کە خاوەنی سەدان هەزار پێشمەرگە بوو؟ خێر بوو لە ١٩٧٦ رێی بەپارتیدا پێشمەرگە دروست بکاتەوە لەکاتێك دا ماڵی مەلا مستەفا هەموویان لەئێران بوون؟ خێر بوو ئەو هێزەی ئێمە بەرەو هاکاری دەچوو، بەس لە هێزەکەی ئێمە دراو ئێران لە هێزەکەی پارتی نەدا؟ برادەرانی سۆشیالیستیش زۆرو کەم پاشماوەی هەمان ململانێ بوون وەك سەید کاکە بە ڕاشکاوی باسی کرد پارتی کۆمۆنیست پێیان وابوو کۆمەڵە کاریگەری خراپی دەبێت، لە سەر ئەوان وە پێیان وابوو سەرکردەکانی کۆمەڵە فێڵ لە کرێکاران و جووتیاران دەکەن... ئەوان دەرەبەگ و وردە بۆ بۆرجوازی، ناکرێ نوێنەری پرۆلیتاریابن باوەڕیان وابوو بە هەبوونی کۆمەڵە ئەوان ڕوو لە کزی بکەن، واش بوو یەکێك لە خاڵە لاوازەکانی شیوعیەکان نەیانتوانی مارکسیەت و کوردایەتی تێکهەڵکێش کەن کە لەناو زۆر گەلان ئەوەکراوە. لینین رێگرنەبووە و رێی پێدابوون، لە چەندان شوێن باسی کردوە لە قۆناغی رزگاری گەلان. راستە شیوعیەکان بە قسە لایەنگری کورد بوون، بەڵام بەکردەوە وانەبوون، ئێمەی دۆست ولایەنگرانی یەکێتی لەدەست لایەنگرانی پارتی زۆر بێزار دەکراین.وایان تێگەیاندبوون کە یەکێتی جاشی رژێمن هیچ پەیوەندییان بە کوردایەتیەوە نییە... دواتریش هینانە دەرێی گۆڕی بارزانی هاتەسەرێ... دیارە دەرهێنانی گۆری بارزانی بووبووە پاساو بۆ شکاندنی ئێمەش کە گوایە دیمکورات دەستی هەبووە و یەکێتیش دۆستی دیموکراتە و هەردووکتان جاشی عیراقن، ئەو بەندو بەلۆرانە بەردەوام لە گوندەکانی دەوروبەرمان جێی باس وخواس بوون، چەندی هاوارمان دەکرد بابە، کاکە ئەوە پیلانێکی دووژمنانە و بۆ ئەوەی کورد یەکتربکوژن کەس گوێی بە ئێمە نەدەدا!.
لە دوای (١٩٩١) برادەرانی بزوتنەوە و ئەوانی تریش واتە گروپەئیسلامییەکان توشی هەمان هەڵەی مارکسییەکان بوونەوە، نەیانتوانی ئیسلام و کوردایەتی موتربە بکەن... ئیسلامییەکان ئێستا باشترن، هیوادارم باشتریش بن، کوردایەتی و ئیسلام دژ بەیەك نین تەواوکەری یەکترن. ئەگەر بەشێوەیەکی ئاقڵانە تێك هەڵکێش بکرێن وەك وێران و زۆرشوێنی تر.

*** *** ***

من کە لە ئێران هاتمەوە، باوکم لەوپەڕی خراپی دابوو، دەست کورت و هەژار بووین، من بڕیارمدا بچمە شەقڵاوە، بوومە شاگرد لەلای جەمیل کاوێسی کوڕی کاوێس ئاغا، پیاوێکی نەرمونیان بوو، لە بیرکردنەوە کۆمۆنیست بوو. ناوە ناوە گۆرانی دەوت، دەنگی خۆش بوو دیارە

دەنگی بەرز ناکردەوە. چێشتخانەکانی شەقڵاوە کاریان باش بوو، ئەوکات بە هەزاران سەرباز لە کوردستان هە بوون لە مۆڵەت و گواستنەوەی سەربازەکان لە شەقڵاوە لایان دەدا بۆ نانخواردن. خاوەن چێشتخانەکان گۆرانییە شەعبیەکانیان بۆ سەربازەکان لێ دەدا، نموونەی حتابە و گۆرانییەکانی تر، من زۆر ڕکم دەبووەوە بەو گۆرانیانە من هەستم دەکرد میللەتەکەم لەچ کارەسات دایە، خاوەن چێشتخانەش ئەو کێشەی نەبوو،گرنگ سەرباز بێت نان زقنەبووت کات! منیش بێ دەستەڵات بووم دەیان جار دیومە بەو زستانە سەختە سەربازەکان لە پشتەوەی ئیڤا سوار دەکران کە دەدەبەزین هەموویان لەرزیان لێبوو داوای تەشرییان دەکرد کە بۆمان دەبردن دەستیان لە ناو تەشریب دەنا بەمەبەستی گەرم بوونەوەی دەستیان پیسە پیس نیە ئەوەیان لێگەرێ،ئەوکات کوردستان پڕکرابوو لەسەرباز وسەربازگە ڕۆژانەم نۆ پەنجای بوو دواتر چومە لای مام قادر ناسراو بە قادرەشێت هەموومان شێت بووین تەنیا ئەو شێت نەبوو سەیرە خەڵکی پێیان دەوت شێت ئپیاوێکی فەقیر ناس و نان دەر ڕۆژ نەبوو دەیان کەس نان بەبەلاش نەخوات،مام ئیسماعیل کەبرای مام قادر بوو من ئەوکات دەم زانی کۆمۆنیستە یان مەیلی ئەوانی هەبوو کۆمەڵێك دۆستم هەبوون هەموویان تەلەبەی مامۆستای گەورە جمیل ڕەنجبەربوون شەهید جمیل لەگوندی باتاس مامۆستا بووەو ئێستاش دەیان کەسی لێ یە هەر مامۆستا جەمیل بە مامۆستای خۆی دەزانێت بەدرێژای گوندی باتاس بەسەدان مامۆستای بەرێز لەوگوندە مامۆستابووە بەڵام کەمیان وەك جمیل ڕەنجبەر توانی کاری گەریان هەبێت لەڕێکخستن و هاندانیان کەولاتی خۆیان خۆش بووێت، سەیرە من ناراستەوخۆ مامۆستا جمیل ڕەنجبەرم ناسی لەڕێی ئەوان ڕاستەوخۆ کاتی شەهید بوونی لە نزیکی بووم کەشەهید بوو. دواتر لەکاتی خۆی باسی دەکەم لە ساڵی(١٩٧٦) من چومە شاری بەغدا لەوێ بوومەشاگرد یەکەم جار لە لای کەسێك بەناوی قەندیل خەرکی هەولێر بوو پیاوێکی جوان و بەژن بریند وەك سەرکردەکانی ناپلیۆن خۆی دەنواند وەلێشی دات بەرادەری حسێن علی گۆرانی بێژبوو زۆر پێکەوەبوون من زۆر خزمەتی حسێن عەلیم دەکرد ناوبراو لەقاتی دوەم دادەنیشت دەی خواردەوە زۆر جارکەسەری گەرم دەبوو بە هێواشی شیرن بەهارەی دەوت لە مامۆستا تاهیر تۆفیقی خۆشتری دەگوت دەنگی حسێن علی باریك و تیژ بوو پیاوێکی بەرێز بوو ئەو کات بەغدا زۆر خۆش بوو من چاوم بوونەوە وردە وردە زمان فێر بووم، بەغدا ئەوکات بەغدابوو دوبەی ئەوکات شارەوێران بوو لەچاو بەغدا! جوانی شۆرجە و شەقامی ڕەشید و ئێوارانی ئەبو نەواز و ڕادیۆی کوردی لە ئێران و شیعر و ئاوازی شوکرۆڵای بابان و قاقای کچ و

**کوڕان ودەست لەملان و شنەبای ئێوارانی دەم شەت و ماست سەوزە فرۆشانی گوندانی دەوروبەری بەغدا و علاوی حیلە و زیارەتکەرانی مەزارگای شێخ عەبدولّلاقادر و پیاسەی کەرادە و دەیان دەیان شوێنی جوانتر .....هتد. کە تەماشای ژیانی خەڵکی بەغدام دەکرد جیاوازیی زۆر بوو لە هەموو روویەکەوە لەگەڵ ناوچەکەمان و گوندەکەم ئەوکات تێگەیشتم ئێمەی خەڵکی گوندان لە دۆخێکی سەخت دەژین زۆرشت فێر بووم. ناوە ناوە داتمەوە پارەم بۆ باوکم دیناوە، وام کرد باوکم نەجاتی بێت لە هەژاری... دوای ماوەیەك چوومە رەسافە بۆ کارکردن لە کەبابخانەی شیمال روو لە پەیکەری رەسافی، گوایە ناوبراو کوردە! ماوەیەکی باش لەوێ مامەوە مەیلێکی زۆرم بۆ خوێندنەوە هەبوو. باوەڕیکەن تابلۆکانی بازاڕی بەغدام زوربەیان بە هەڵە دەخوێندنەوە، موهی کۆڵم نەدا. رۆژێکیان چوومە مەکتەبەیەك کتێبێکم دەست دایێ کوردی بوو، ئەویش کرێ قامووسی(شێخ محەمەدی خاڵ) بوو، وەستاکەم ناوی محەمەدبوو، پیاوێکی نیشتیمانپەروەر زۆرجار گیابوو لەسەر کوردایەتی، باوکی ناوی سابیر بوو، بەهێزی پارەو واستە بەری دەدا. رێژەیکی پاش کوردانی دانیشتوی بەغدا هامشۆی کاك حەمەد سابیریان دەکرد، لەوانە حەسەن گەرمیانی مامۆستاو گۆرانییبێژ. ئەوکات گەنجێکی یەکجار جوان و پۆشتەبوو، وە ئەوکات رۆژنامەیەکی کوردی دەردەچوو ئەگەر هەڵە نەبم ناوی هاوکاری بوو رەنگی سوری زۆر تێدا بەکار دات. برادەرانی حیزبی شیوعی دەریان دەکرد، ئەو رۆژنامەیە منی فێری خوێندنەوەو نووسین کرد. دیوانی مامۆستا گۆرانم کری، ئەویش کاریگەری هەبوو**

**لە رۆژانی پشوو دەگەڕام شارەزای هەموو بەغدابووم، برادەرێك لێم نزیك بووەوە منی کردە ئەندامی پارتی دیموکراتی کارتۆنی مەقەڕیان لە بەغدا جدیدە بوو دوو سێجار چوومە کۆبوونەوە دواتر بۆم دەرکەوت ئەوان لە خزمەتی رژێم دان، بۆیە پاشەکشەم کرد دواتر ژنم هێناو هاتمەوە هەولێر لە گەڕەکی عارەبان نیشتەجێ بووم، لەناو ئەو حەسارە چەندان ماڵی تێدا دەژیا. هەندێکیان جاش بوون. رۆژێکیان ئەو رەوەجاشە زۆر بەبێسەروبەری هاتنەوە وردە وردە زانیمان لە گوندی قەراسنج دەوری هێزی پێشمەرگەیان گرتوە و شەهیدی سەرکردە سەید کریم و شوانێ گەرەوەیی هیمەتێکی کەموینەدەکەن و پێشمەرگەکانی تریش هاوکاردەبن دەردێك بەو رەوەجاشانە دەکەن با بەدەواری شڕی نەکردبێت، هەندێکیان دەکوژرێن و هەندێکیان بریندار دەبن و ئەوانی تر رادەکەن.**

پێش ساڵی ١٩٨٠ ماڵم هێنایەوە شەقڵاوە، لە مانگی دەی هەشتا بومە، پێشمەرگە ناردمیانە سەرکردایەتی دەورێکی کادیران هەبوو دکتۆر کەمال خۆشناو ئیدارەی دەدا، دەورەکەم تەواو کرد لەلای دکتۆر مامەوە هێزێکی پارتی بە نیازی هاتنەخوارەوە لە لای قەڵاتوکان یەکێتی پێشی لێ گرتن قوتە شەڕێك روویدا لەو شەڕە جەمال مەلەکی برینداربوو، ئەگەر هەڵەنەبم، پارتی پاشەکشەی کردووە ئیسترێکیان لەکاتی شەڕەکە بە کەلوپەلەوە خۆی دایەدەست، پێشمەرگەکانی یەکێتی ئەوهێزە بەشێکی هاتە گوندی شێنێ لەوان ئازاد خۆشناو بوو، ناو براو کادیرێکی باش بوو داوام لە دکتۆر کەمال خۆشناو کرد نەقڵم بکات بۆ لای ئازاد خۆشناو، پەیوەندیم پێوە کردن مەقەڕمان لە شێنێ بوو ماوەیەك لەوێ ماینەوە، وەخت بوو ئەسپێ بمان خۆن نازانم هۆیەکەی چی بوو؟

عەلی شیعە لەوێ بوو، شەهیدی سەرکردە سابر رەسوول و مامۆستا موحسین و مزەفەر چاوشین مزەفەر گەورە تازە هات بوونە دەرەوە مام جەلال یەکە و مزەلی بە هەدیە دابوونێ، لەنێوان مانگی یانزە و دووانزە هێزیکی٣٠٠ کەسی لە سەرکردایەتی بەرێکەوت ئەوانەی لەبیرم ماون شەهید جەمیل ڕەنجبەر و، سابیر رەسوول شەهید ملازم سەید کەریم، مزەفەر چاوشین، مامۆستا موحسین، قادر دۆشکە، ئەبووبکر خۆشناو، ئازادخۆشناو، یوسفە درێژ، زرار هەنارەیی، مەحموود بەنزین، شێرزاد خۆشناو،محەمەد شوشکەی، عومەری سەید عەلی، شەهید شوانۆ گەرەوەی، جەمال مەلەکی، ڕەحمان مەلەکی، شەهید ئەحمەد جەمیل، مامۆستا ئەحمەد هەولێری، شەهید وشیارە سوور، براێکی مامۆستا ڕەفیق کۆیی مەحموود بەنزین و، من ..بەکورتی من هێزم هەر ئەوەندم لەبیرن ...

بە ڕێ کەوتین پێش بگەینە قەڵاتووکان شەهید جەمیل ڕەنجبەر بە ئازاد خۆشناوی گوت خۆشناو هیممەت بکە یەك بارە بڵاو کراوەمان لە بیرچووە لە فلان شوێن ئازاد پێشمەرگەکانی خۆی کۆکردەوە، شیزاد تۆ محەمەدجەمیل تۆش مامۆستا موحسین تۆش فەقێ، تۆش چەند برادەرێکی تریش ناوم لەبیر نەماون گەڕاینەوە سەرکردایەتی، دووبارە کەتینەوە ڕێ بەرەو قەڵاتووکان دوای حەسر گەیشتینە بەرانبەر بەرد قەرشتی ڕێمان هەڵەکرد چوبووینە بن ڕەبایەی سەربازی، نەمانزانی بوو لە پڕ ئاگریان لەسەر پشت کردینەوە، هەرچەند لە ڕەبایە دوورکوتبایینەوە، لەبەر تەقە دەرناچوین، باشتر ئەوەبوو بچینە بن ڕەبایەکە بۆ ئەوەی بکەوینە پەنا وامان کرد تاکوو شەو داهات یەکترمان دیتەوە، تەنها برادەرێکمان دیارنەبوو وامان زانی شەهید

بووە! کاتژمێرێك بە دوایدا گـەڕاین هـۆ فـلان هـۆفلان! دیـار نـەبوو... مـن لـە دوو شـەهیـ محەمەدجمیل هیرانی دەرۆیشتم هەستم بە دەنگێك کرد لە نزیکەی خۆم دەستێکم گەیانـدە محەمـد بە چرپە پێم وت دەنگێك لێرە هات محەمەد وتی باشـە چـەکی ڕاکێشـاو وتـی کێـی زەلام ئـەم برادەرەبوو کە لێمان بزر ببوو، محەمەدجمیل هەندێك خۆی لـێ تـوڕەکرد و هەنـدێك قسەشـی پـێ گوت،کەوتینە ڕێ لەسەر بچووکی قەلاتووکان چاوەڕێی ئێمە بوون باران دەبـاری ئـاگری گـەورە گەورە هەر کرابوون بەیانی بەڕێکەوتین لەو بەری رووباری گارفێن نانمان خوارد ...

شەهیدسەید کەریم بانگی منی کرد وتی گەنجەجوان وەرە لای من نان بخۆ لەگەڵ نان خـوادن کۆمەڵێك پرسیاری لێ کردم سەید کەریم خوا خەڵقی کـرد بـوو بـۆ ژیـانی سـەربازی ئەوەنـدە بەهەیبەت بوو، باس ناکرێ. بە کورتی من لە ژیانی خۆم پیاوی وابە هەیبەت و باوەڕ بخۆ بوو لـە کورد کەم دیوە، شوانۆ گەرەوەی لەکاتی پەڕینەوە لە رووباری گارفێن بەشێکی زۆری پێشـمەرگەی بەپشت پەڕاندەوە شـوانۆ لـە کارەسـاتی ١٩٧٤ چـەکی دانـەنا هـەر پێشـمەرگە بـوو . لـەوێ بەرێکەوتین بەرەو مـاخۆ بزنان چوین لە ڕێگا توشی هەورازێکی سەخت بووین، مزەفـەر چاوشـێ واتەمزەفەری گەورە پەکی کەوت، چەك و تاقمەم لێوەرگرت دەستیشم گرت بوو، تاوە سەر کـەوت ..شەو لەوێ ماینەوە بەیانیش تاکو کاتژمێر نۆ لەوێ بووین دواتـر بـەرێ کـەوتین بـەرەو گونـدی جەلکان، دوای نانی نیوەڕۆ وردە وردە چووینە سـەر گۆڕسـتانەکە کـە چـەند مـەترێك لـە گونـد دووربوو، شەهیدجەمیل ڕەنجبەر بانگی منی کرد وتی: هاوڕێ فەقێ وەرە کارم پێتە منـیش چـووم جەمیل چ جەمیل؟ بەڕاستی ئەوەی ناوی لێنابوو چاك لێی زانیوە، رووم‌ەتی وەك بەفروخوێن بـوون سەری سپیەکی جوان بوو، تۆزێك قەڵەوبوو جوانی ئەو پیاوە وسف ناکرێ، وتی هـاوڕێ ئەمـەوێ هەندێك ئامۆژگاریت بکەم وتم فەرموو وتی کورم ئەنگۆی خـەڵکی نـاو شـاخان هـەر لـە زگـی دایکتان گوێ بیستی تەقە و تۆپ و تەیارە بووینە کە دەبنەپێشمەرگە ئاسـاییە بـۆ ئێـوە، بـەلام ئەمەی ئەفەندی کە لە شار دێین سەرەتا هەندەك زەحمەتە ئەترسێین لە هەموو شتێ دوای وردەوردە لەنگۆش ئازاتر دەبین منداڵێکی وەك تۆ چۆن خۆت لە فلان....... تورە دەکەی‌من وتم خوا شاهیدە من خۆم لێتورە نەکردوە، نەشم دەویست بڵێم من نیم شەهید ئەحمەدجمیلـە، وتـی: باشـە سـوێند مەخۆ جارێکی تر دووبارەی مەکەوە، ئەوە دوا قسـەی شـەهید جـەمیل بـوو، لـەوەدەم دوکۆپتـەر پەیدابوون لە سەرسەرمان ئەو کات باوەڕ وابوو چەکی سـوك کۆپتـەر نـابرێ بۆیـە وتیـان کـەس تەقەنەکات هەرپێشمەرگەیە و خۆی حەشاردا من و جەمال مەلـەکی و محەمەدشوشـکەیی لـە

قورتێك بووینە جیان ئیتر کەس ئاگای لە کەس نەما کۆپتەرەکان کەوتنەسەرمان بە راست و چەپ، ئەو قوڕتەی ئێمەی تیدابووین، دووجار تەقەی لێ کردین بەختمان هەبوو تەنها یەك گولەو بەر قوڕتەکەکەوت، هەرسێکمان بریندار بووین بەسووکی بەتایبەتی من هەندێك پرۆشکە بەردمم کەوت بوو، محەمەد شوشکەیی پارچەیەکی لە چەنەگی چوبووە ژووری جەمال مەلەکی برینەکەی لە بەلۆکی بوو، دوای سێ چارێگ کۆپتەرەکان رۆیشتن ئێمە هاتینە دەرێ دەوروبەرمان هەمووی هاوار هاوار بوو، بێنە بەر چاوی خۆت لە مەسافەی سەد مەترێك دوانزەکەس هاواری دەکرد، سەرەتا بریندارەکانمان گواستنەوە ناو دێیکە واتە گوندی جەلکان من کە گەیشتمە لایی، عومری سەید عەلی، هەموو گیانی برین بوو بە بێدەنگ کەوت بوو، بە خۆی دونیایەك برینی تێدا بوو، خەمی برادەرانی بوو برادەران هاتن یەکێ لە وان سەید کەریم بوو من گەڕام شەهید جمیل رەنج بەرم دێتەوە لەسەر پشت پالکەوت بوو، گوللەیەکی دۆشکەی پێم وایە بە لای کلیەی ڕاستی کەوت بوو بەداخەوە رەنگە سۆرەکەی نەمابوو، وازمان لە شەهیدەکان هێناو بەهیمەتی خەلکی گوندی بریندارەکانمان گواستەوە مزگەوتی گوندی پیرانە رەش، بریندارەکان ئەوانەی لە بیرم ماون عومری سەیدعەلی، سابیر ڕەسوول، بەکر خۆشناو مەحموود بەنزین، رەحمان مەلەکی،جەمال مەلەکی محەمەد شوشکەی، من بەسووکی، لە مزگەوتی پیرانەڕەش بریندارەکان درێژکران خەلکی گوندی خامیان هەبوو بۆ مردووەکانیان قادر دۆشکە هەندێك قۆلەنی پەیدا کرد لەگەڵ خامە کە برینەکانی پێ دەبرژاندنەوەخامیشی لەجیاتی لەفاف بەکار دینا منیش خۆم لەئیشان هەر دەقورتاند بوومە بەردەستی کاك قادر دۆشکە دواتر چوینە سەر قەبران . خەلکی گوندی هاوکاریان کردین شەهیدەکانن بەجلك وبەرگەوە ناشت یەکێك لە بریندارەکان ناوم لەبیر نەمایەپارچەگولەی دۆشکەی کۆپتەر بەر سەری کەوت بوو مێشکی دیار بوو قەبرمان بۆ لێدابوو شەهید نەدەبوو، شەوەکەشی زور سارد بوو ماوەیەکی زۆر چاوەرێ مان کرد شەهید نەدەبوو پێمان خۆش بوو شەهید بێ چونکە هەرشەهید دەبوو تەنها هەناسەو لرخە لرخی دەهات دواتر بردمانەوە مزگەوت تابەیانی ئەوبریندارە لرخەلرخی نەبرا بریندارەکان جۆر بەجۆربوون ،عومەری سەید عەلی، سابر رەسوول،حالّیان باش نەبوو، کاك عومەر چوارسەد برینی تێدابوو، باوەڕ دەکەن یان نا! کەیفی خۆتانە لەهەمان کات ئەی دەوت ئۆف وخەمی برادەرانی بوو، سابیر ڕەسوول چاوێکی ڕژابوو قاچیشی شکابوو چەندان برینی تر، زۆر بە هیمەت بوو لەکاتی هەلگرتن و گواستنەوەی گاڵتەی لەگەڵ دەکردین دەیوت: باچاك ببمەوە، هەمووتان دەکوژم ئەو دەردەم پێ

**دەکەن،چونکە سابیر قەبە و درێژ و قەڵەوبوو لە هەرگرتن و گواستنەوە زەحمەت بوو بەکرخۆشنلو قاچی شکا بوو، تەحەمولی ئازاری ناکرد، ناهەقیش نەبوو نەبەنج هەبوو، نە ئازارشکێنێك هەبوو، ئەوەی هەبوو خام و قۆلەنیە بوو، بۆ مێژوو عەولاسۆر هاوکاریی باشی کردین، عەولاسۆر پیاوێکی ئازاو بەهیممەت بوو، کەسایەتییەکی باشی هەبوو بەداخەوە بووە قوربانی شەڕی ناوەخۆ. شەو لە گوندی بیرانەرەشماینەوە، دیارە من چەکم نەبوو گولەئارپیجێکم بە شانەوە کردبوو کە برادەران بریندار بوون، چەکی ڕەحمان مەلەکی درایە من، زۆرم دڵ بەو چەکە خۆش بوو، بۆ بەیانەکەی چوومە ماڵێك نان بخۆم، تاکونانم بۆ هات چەکەکەم لێك هەڵوەشاندەوە دواتر نەمزانی وەك خۆی لێ بکەمەوە خاوەن ماڵ، ماڵی ئاوابێت بۆی وەك خۆلێکردمەوە، بەیانی شەهید سەید کەریم بانگی منی کرد وتی: برۆ موختارم بۆ بینە سەید کەریم مەشوور بوو بە موختارکوژ. دیارە مەبەستم لە هەموو موختارەکان نییە، کە چومە لای موختار وتم: موختار سەیدکریم کاری پێتە موختار دەستی بە لەرزین کرد وتی ئەگەر بزانی چ کاری پێمە وتم موختار مەترسە پێم وایە بۆ ولاغانە بریندااران پێ بگوازینەوە موختار هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی کە چوینەلای سەید کەریم هەرواش بوو بریندارەکان بە پشتی ولاغ گواسترانەوە بۆ دۆڵی شاورە بەختی سابیر رەسوول ماینێکی پیری لەڕ و لاواز بەر کاك سابیر کەوت لە هەورازەکەی پیان بۆ سەرکەپکان زۆر سەختە، ماینی قورپەسەر تاقەتی ئەو شینەپیاوەی نەبوو من چەکی پێشمەرگەکانم هەڵگرت و پێشمەرگەکان کاك سابیر و ماینەکەشیان گرت بوو، لەسەر لوتە شاخێك ماین کەوت پێشمەرگەکان ئازابوون ئەگەرنا سابیر و ماین لە شاخی دەکەوتن پارچە پارچەدەبوون، بە هەر شێوەیەکی هەبوو گەیشتینە نزیك سەرکەپکان بە هیمەتی بنەماڵەی سەرکەپکان سواراغە و ئەوانی تر، بە سەیارە بریندارەکان گەیەندرانە بنکەیەکی تەندروستی لەدۆڵی شاورە شەهید عەلی نەبی لەگەڵ کۆمەڵێ پێشمەرگە کاك عومەرو سابیر رەسوول بەرەو سەرکردایەتی رەوان کران بەپشتی ولاغ بریندارەکانی تر ئاگام لێیان نەما سواراغە چی لێ کردن؟ ئەوەندە دەزانم تەنها ئەو پێشمەرگەی مێشکی تەقی بوو تەسلیم بە ڕژێم کرایەوە دواتر شەهید بوو و یەك دوو ڕۆژ لە دۆڵی شاورەماینەوە لەگوندی میدیرە لەگەڵ سەید کەریم میوانی ماڵێك بووین خاوەن ماڵ چەند شانە هەنگوینی زۆرجوانی لەسەر سفرەدانابوو، من بۆ یەکەم جار تامی هەنگوینم کرد نەمدەزانی زگم پێ دیشێت باشیشم خوارد، دواتر چوینەوە مزگەوت دەردێکم دی باس ناکرێت!**

**بەوشەوە منیان هەردایە حەوزی مزگەوت و تووریان بۆ پەیداکردم وردە وردە باشتربووم، لـە دووای ئەوجارە تاکوو ئێستاش من ناتوانم سەیری هەنگوین بکەم، بەسەیرکردنیش تێك دەچم.**

**دواتر بەرەو خۆشناوەتی هاتین لە گۆڕێ سایێ یارمەتیمان وەرگرت بە دوو پێشمەرگە پێـنج دینار بوو هاتینە گوندی شێێ سەید کەریم بانگی منی کرد وتی بڕۆ بالیسـانێ مـلازم خولـە و مامۆستا بەکر لە وێن بیان بینەوە پێیان بڕێ بابێنە گوندی بێراوە،من هاتمەبالیسان و ئـەوانم دی پێم گوتن دیاربوو ئەوانیش کارەساتەکەیان زانی بـوو کۆمـەڵێ پرسـیاریان لێکـردم دواتـر مـن چومەوە بێراوە برادەران گەیشت بوون چومەلای سەید کەریم وتم مولازم خولە و بـرادەران بـەڕێوەن دێنە لات سەید کەریم وتی: فەقێ ئەتۆ بڕۆ سەرەکی لە ماڵەوە بدە، من چومەماڵەوە بـاوکم زۆر گریا بـەبێ ئـەوەی مـن بـزانم بـاوکم دەچـێتە لای سـەید کـەریم داوای لـێ دەکـات کـەمن واز لەپێشمەرگایەتی بێنم. دیارە لەلای سەید زۆر گریا بوو، وتبووی مـن پـیر بووم‌ـە و هـەیتم نیـتم ئەوکورە تاقانەم هەیە ئەوەشیان بکوژرێ ئەمن چمارێ خۆ خەراپ کەم؟ بە کـورتی سـەید قـەولی تەواوی پێدابوو دوای سێ ڕۆژ کە چومەوە لای ئازاد خۆشناو سەید کـەریم بـانگی کـردم وتـی: فەقێ هیچ مەجالی تێدانیە دەبێت بۆ ماوەیەك واز لە پێشمەرگایەتی بێنـی، قـەولم بـەباوکت داوە لەژیانمدا زگم بەکەس ئەوەندە نەسوتاوەوە خۆشت منداڵی باگەورەتریش بیـت ویسـتم قسـە بکـەم وتی: موجامەلەی ناوێ بڕیارە و داوامە ئەتوانی بە شێوەیەکی تر خزمەت بکـەی خـۆت تەسـلیم بکەوە، وریابە مەعلوماتی بە کەڵکیان نەدەیێ کاری تۆ داودەرمانمان بۆ بکـڕە بۆمـان بنێـرەوە، هەندێك کەست بۆ دیار دەکەین کە داوودەرمانت بداتێ قەناعەتی پێ هێنام کە تەسـلیم ببمـەوە بەڵێ تەسلیم بوومەوە، لە ڕێی خزمەکانم ئەوانیش لە ڕێـی کەسـێك بـەناوی ئەحمـەد گـزال، جەنابی ئەحمەد گزال ساڵی ١٩٦٠ لە خزمەتی ڕژێم دابوو تاکو ١٩٩١ نامـەوێ زیـاتر باسـی گزال بکەم چونکە کوڕەکـانی پیـاوی بـاش و بـەڕێزن لەگـەڵ ئەحمـەد گـزال چـوینە مەقـەری ئیستخبارات لە سەرمەیدان شەقلاوە کە ئێستا بوویتە گەڕەکی شەهیدان لە ڕێگا ئەحمەد گزال پێی وتم عەرەبی دەزانی؟ وتم شێخ وەسانان و عەربی یەك وشەش نـازانم! دیـاربوو ئـەو وەڵامـەی منی پێ باش بوو، چوینە ژووری نەقیبێك جەنابی نەقیب پێشوازیەکی گەرمی لێ کـردم گـزال زوو وتی: سەیدی ئەو کوڕە عەرەبی نازانێ، جەنابی نەقیب رووی لە من کرد بە کوردی وتی کاکە عەرەبی نەزانی بە ئاماژە وتم نازانم ئیتر کەوتە پرسیار زۆر بە نـەرم و نیـانی گـزال تەرجومـەی دەکرد زۆر هەڵەی دەکرد تـەرجومانێکی بـاش نـەبوو مـن زۆر لـەو باشـتر بـووم خـۆم لـەگێلی**

دابوو،چەند ئەو بەدرێژپرسیارەکانی دەکرد من بەکورتی وەڵامم دەدایەوە وتی: کەی بوویە تێکدەر؟ وتم یەك مانگ! وتی لەگەڵ کێ بووی وتم: لەگەڵ جەمیل ڕەنجبەر، وتی: لە کێیە؟ وتم: کوژرا. وتی: ئەوانی تر ناویان چییە، خەڵکی کوێن ؟ وتم هەموویان ناوی نەهێنیان هەبوو، نەشم دەزانین خەڵکی کوێن! وتی بۆ بوویە تێکدەر؟ وتم لە باوکم توڕەبووم وتی کێ یارمەتی و دەدات؟ وتم: نازانم وتی کێ نانتان دەداتێ؟ وتم هەمووکەس ئەوەی نانمان نەداتێ بە زۆر لێی دەستێنین وەئەگەر نەیدا بەڵێندان لێی دەستێنین دەیان ودەیان پرسیاری تر دواتر وتی سەید کەریم دەناسی وتم: نەخێر گوێم لەو ناوە بووە لە کاتی ئەو پرسیارە نان و کەبابیان هێنا ئەفسەرەکە وازی لە قسە هێنا و وتی: گزال ئەمڕۆ میوانی منن نەفەر کەبابێکیان لەپێش من دانا و ئەفسەرەکە گوتی ئەوەی لەپێشتە دەزانی چییە؟ مەبەستی کەباب بوو وتم نەخێر! وتی ئەوە کەبابە بیخۆ جەنابی ئەفسەر نەیدەزانی من لە بەغدا گەورە بووبەو لە هەمان کات کەبابچیشم و عەرەبیش باش دەزانم، زۆریش لە جەنابی تەرجومانەکەی باشتر بووم، نان وچامان خوارد من دەمزانی لێدان دەخۆم، زوو یان درەنگ خۆم ئامادە کرد بوو ئەفسەرەکە وتی: کوڕم تەماشا بکە چەند ڕێزت لیدەنێین کەوابوو توش وەك مەردان کارمان لە گەل بکە، چەندت پارە دەوێ دەت دەینێ، ببە پێشمەرگە، لە لای سید کەریم لە فرسەتێك بی کوژە و ئەبیە خاوەن پارەو سەیارەت دەدەینێ و خانووت دەدەینێ وەك مەلیك دەژی! وتم بەڕێز من مانگێك بوومە پێشمەرگە. کە گوێبیستی وشەی پێشمەرگەبوو. زۆربەتوندی وتی پێشمەرگەنا تێکدەر. وەخت بوو بپسێم لەترسان کەدەنگی تەقەدات چ بەرد نامان خۆ دەبن نەنێم ئەمن و زەلام کوشتن تۆبە هەتامن ماوم نابی گوێم لە تەقەش بێ، ئەمن ئەوپیاوە نیم زەلام بکوژم لە دوای ئەوقسەیە ڕووی لە گزال کردو وتی کاکە گزاڵ ئەوکوڕە سەی کوری سەیە! نە قسەمان بۆ دەکات و هیچ کاریشمان بۆ ناکات... ئەوکوڕە زۆرزانیشە خۆ لە گێلی دەدات ئەوەی ڕێگرە لەمن بڕیاری سەرۆکە هەر تێکدەرێك خۆی تەسلیم کردەوە، ڕێزی لێ بگرن بۆ ئەوەی ئەوانی تریش بێنەوە ئەگەرنا ئەوە بۆ ڕمکردن باشە ،گزال دەی وت: بەڵێ سەیدی وایە لەپڕ وەزعەکە گۆڕاو ئەفسەرەکە گوتیە گزالی تۆ بڕۆ دەرێ ماوەیەك دوای بە دوات دادەنێرم گزال ڕۆیی وەك مەردان بۆم هەستا کەوتە لێدانم چ لێدان سەرەتای لێدان ئازارم زۆر بوو دواتر ئازارم نەما وەکی خۆشناو دەڕێن کۆرەکی باشی لۆ کردم... یەکێك لە لەقتەکان بەپۆستار لەسەر سەرم ڕاوەستابوو، ئەوەندەی لێدام تاکوو ماندووبوو چووە سەرمێزەکی دانیشت و ئاوی زەقنەبووت کرد من لەسەر زەوی کەوت بووم تەماشایەکی منی کرد و بەدەست ئاماژەی بۆ

کردم کەبچمەوە سەر کورسیەکە پێشتر لێی دانیشت بووم وتی سەی کوڕی سەی برۆ ئەوێ دانیشە دانیشتم، تەلەفۆنی بۆ ئەمنی شەقڵاوە کرد وادیار بوو لەگەڵ مودیر ئەمن قسەی دەکرد وتی: سەیدی ئەگەر زەحمەت نەبێ مەعلوماتان هەیە لەسەر تێکدەرێك بەناوی مستەفا رەسوول محەمەدئەمین خەڵکی شێخ وەسانان، تەلەفۆنەکەی داناوە، دیاربوو چاوەڕێی وەڵامی دەکرد دوای ماوەیەك تەلەفۆنی بۆهات هەردەی وت بەڵێ بەڵێ، دواتر وتی بیبوورە سەیدی ئەو گەوادە فەقێ رەسوول نییە مستەفا رەسوولە، مارێ جاسووسان خەرابی وەکی خەرابووە خەبەریان دابوو، کە من پێشمەرگەبوویمە و دیارە تاکو ئەو ساڵانەش و ئێستاش هەموو کەس نازانێت من ناوم مستەفایە هەر بەمناڵی پێم وتراوە: فەقێ فەقێش نەبوویمە بەڵکوو ناوم مستەفا یە! ئەو ناوەم زۆر جاری تر بەکەڵك هاتووە لەوەختی خۆ باسی دەکەینەوە، ئەحمەد گزالی بانگی ژوورێی کرد وتی کاکەئەحەمەد وەرە دانیشە وتی پرسیارەکان دەکەمەوە ڕاستی نەڵێیت دەیکوژم ئەحمەد گزالیش قسەکانی پێ دەوتم وتم چ دەزانم بەچاوان وەك پێشوتر، وەڵامەکانم لەبیر مابوون دووبارەم کردەوە دوای پرسیارەکان بۆم هەستا ئەوجارەش زۆر باش لێی دام بانگی دوو سەربازی کرد و بردمیانە ژوورێك دایان نام چەندان پرسیاریان لێکردم، با کورتی کەینەوە رەوانەی مەعەسکەری سپیلکیان کردم دوای چەند رۆژێك رەوانەی هەولێریان کردم سەربازگەیەکی گەورەبوو ماوەی یەك مانگ بەندیان کردم دیارە لێدان هەبوو لێکۆڵینەوەی زۆریان لەگەڵ کردم، هەندێك جار پیاو بە لێدان دەبێتە پیاو بەڕاستی ئەوان منیان کردەپیاو، وایان لێ کردم کە هەتاماوم لە ژیان خیانەت لە گەلی خۆم نەکەم، لە هەمان کات قەت لە دەستەڵاتی کوردی گلەیم نییە و ناشبێت ئەگەر تەماشام بکەی پێمەوە دیارە. قەت پرتەو بۆڵە ناکەم بۆ پلەوپایە یان بۆ هەرشتێك زۆر زۆر ڕازیم لە دەستەڵاتی خۆم بە هەموو کەموکورتیەوە ڕۆژێك دێت چاکی دەکەن بەرچاویشم ڕۆنە ئەو کارەساتەی ئێمەدیومانە دووبارە نابێتەوە دەبنە چیرۆکی مێژوویی بۆ نەوەکانمان لە وانەیە هەندێك لەو ڕووداوانە باوەڕ نەکرێن بە نووسینەکانی ئێمە بڵێن کارەساتی وا مەحاڵە کەیفی خۆیتیان بڕیاری دوارۆژ بە مەناکرێ ئەمینێتەوە ویژدانی خۆیان دیارە لە هەموو رۆژگارێك پیاوی سەردەمی خۆی هەیە، پێم وایە ئەوپیاوانە خۆیان دەناسن، کەوابوو ئێمەش دەناسن، ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە چۆن باسمان دەکەن بابیکەن، گومانیشم نییە کەموکورتیمان زۆربووە، کەموکورتیمان لەنەزانینی بووە، بەڵام گیانی بەرگریشمان هەبووە.

ئەوەندەی لێم بدەن هێرو گێژیان کردبووم، زۆر لاواز بووبووم، مەترسی مردنم هەبوو شەوێکیان درەنگی شەو لە بەندخانە هێنامیانە دەرێ دەست و چاویان بەستم، سواری سەیارەکیان کردم، سەیارەکە ڕۆیی لە دڵی خۆم وتم فەقێ مردن مردنە لاق فرتەی بۆچییە؟ شادەم هێنا و زۆر لە خوا پاڕامەوە کەلەم دونیایە خۆشیم نەدی بەڵکوو لە دونیای تر خودا عەفوم بکات، خەمی گەورەم، یەکەم خەمی باوکم بوو، باوکم منی زۆر خۆش دەویا چونکە پیر بوو بوو منیش تاقانەبووم خۆشم هێشتان خوا کوڕی پێ نەدابووم باوکم دوسی چێری بۆ کردوومە خێر، خەمی دووەم خەمی خێزان و کچەکەم بوو کە ب ەنەمانی من کەسیان شك نابرد .

ئەوەی منی تۆقاندبوو سەربازەکان یەك قسەیان نەدەکرد من لەو خەیاڵانە دابووم، لەوانەیە رمم بکەن و تەرمەکەشم نەدەنەوە کەس و کارم مرۆڤ زۆرجار کە زۆر ئەزیەت دەخوات حەز دەکات بیکوژن زوو نەجاتی بێت، لەوانەیە ئێوە ئەو قسەیە باوەڕنەکەن بەڵام ئەوەی لێدانی زۆریی دەکەوێ حەز دەکات بیکوژن نەجاتی بێت لەو هەموو ئازارەی ڕۆژانە دەی بینێت، سەیارەکە زۆر ڕۆی دیارە نەم دەزانی بۆکوێ دەچن، سەیارەکە وەستاو چاو و دەستیان کردمەوە، دەرگای سەیارەیان کردەوە و منیان فڕێ داو من چاوەڕێی تەقە بووم ئەوان ڕۆیشتن من توشی شۆك بووم، گیانەوە بەقسەخۆشە. تا ماوەیەك چاوم ئالۆز بووبوون دەورو بەری خۆم نادی هەندێك چاوم هەر کوشی تەماشای دەورو بەری خۆم کرد لە لایی سایلۆی هەولێر فڕیاندا بووم، بەو شەوە چومە گەڕەکی عەرەبان ماڵی خارم لە حەسار بوو، خاڵم کۆمەڵێك پرسیاری لێ کردم، چەندان درۆم کرد و خۆم لە پرسیارە کان دەشاردەوە بەیانی پێم باش بوو بچمە بەغدا چومە بەغدا و لە شەقامی سەعدون لە کەباب ئەرپیل دەستم بەکار کرد دوای چەند ڕۆژێك بەیانییێکی زوو بوو هەستام لەخەو وەستام وتی ئەمرۆ جومعەیە قیمەبکە و کەباب شیش بکە ئەوکات برۆ نان بخۆ منیش هەر بەجلی نووستن قیمەم کردو ئاگرم کردەوە ڕێژەیکی باشم کەباب شیش کرد، هێلکەفرۆشێکی سەر عەرەبانە لێمان نزیك بوو منیش بە جلکی شەو چووم نان بخۆم لای هێلکە فرۆشەکە زۆردوور نەبوو لێمان لەلای هیلکە فرۆش ڕاوەستام، کەسێك قۆڵی گرتم وتی: هەویەکەتم بدێ، وتم من لەچێشتخانە کاردەکەم هەویەم لەبیر چووە، هەڵی بگرم شەقێکی لێدام گێژی کردم بەربوومەوە، ویستم هەستم لێی بدەمەوە تەماشام کرد چەند کەسێکن هەموویان چەکدارن خۆم مات کردو شانیان گرتم بە سەیارەیەك بردمیانە ناوچەی (عەلاوی) لەمەرکەزێکی پۆلیسیان بەند کردم، سەرەتا زۆر ترسام وام زانی گرتنی من تایبەتە کەچوومە سجنی عەلاوی، دیاربووسجنی عەلاوی

پری گیراو بوو، لەسەر فێراری سەربازی خەڵکی زۆر گیرا بوو دڵخۆش بوو دواتر بردمیانە ئینجباتخانە، چۆن باسی ئینجبات خانەبکەم شەش ڕۆژ لەوێ مامەوە هەمووی لێدان بوو بە کێبل بەنجاکەس لە ژوورێکی چوار بەچوار بەندکرابوون ناوەناوە کەسێك لەخۆ دەچوو شەڕ بوو لەسەر ژێر دەرگا بۆ هەڵمژینی تۆزێك هەوای پاك ئەوەی سجنی نەدیتبێ نازانێ هەوای پاك لەناو ڕێژەیەکی مرۆڤ چەند گرینگە چونەئاودەست شەو ڕۆژ دووجار بوو هەردوجاریش لە چون و هاتنەوە بەلای کەمی بیست کێبلت دەخوارد تەنەکەیەك لە ناو بەندیانە دا بوو بۆنی میز و پیسایش هەرباس ناکرێت. ڕۆژێکیان کەسێکی عەرەب شەڕی پێ فرۆشتم جوینی بە هەموو کورد دا منش بانگی ئینجبیاتیکم کرد تێم گەیاند کە شەڕ بەمن دەفرۆشێت، جوینیش بە هەموو کوورد دەدا، ئینجبیاتەکە وەك مەردان بانگی دەرەوەی کرد کۆمەڵێك کێبلی باشی لێدا و هێنایە ژورەوەو بەبێ دەنگی دانیشت یەك شتی باش بوو، جیاوازی قەومی تێدا ڕەچاو نەدەکرا، هەموو کەس لێدانی دەخوارد لەوەیان زۆر بە عەدالەت دەجولانەوە !! لەو چەند ڕۆژەی لە ئینجباتخانەبووم ناوە ناوە خەڵکی هەویەی بۆ دەهات ئازاد دەکران من پارەم دایە چوار کەس بۆ ئەوەی وەستاکەم هەویەم بۆ بێنن، لەو چوارکەسە یەکیان چوبوو بەوەستای گوت بوو هەویەی بۆببەن لەفلان شوێنە هەویەم بەدەست نەگەیی تارەوانەی پۆلیس کرام، دواتر ڕەوانەی مەرکەزی پۆلیسی ناوچەی( نەهزە ) یان کردم دوای دوو ڕۆژ لەسجنی نەهزە عوسمان ئەحمەمەد شێخ وەسانی لە بەغدا لەگەڵم بوو نفووسی بۆ هێنام بەپۆلیسەکانم وت من لەسەر نفوس گیراوم ئەوە نفوسم بۆ هاتوە، وتیان ناخوا دەبێت بچیەوە قەزای خۆت ئەوان بڕیار دەدەن لەئازاد کردنت یان بەند کردنت دوای چەند ڕۆژ لە نەهزە بەڕێ کراین بۆ بەندیخانەی کەرکووك من پێم وایە کەرکوك واتە کوریك بووك بوویتە کەرکووك چونکە کەرکوك ئاگری هەبووە بەردەوام وەك بابە گوڕگوڕ وەك کوریك بووکی بەهاران سور بووە کوریك بووك و کەرکووك زۆرلەیەك نزیکن... لە وێ ئێمەیان تەسلیم بە مەرکەزی پۆلیس کرد کە دەرگایان کردەوە چوینە ژوورێ دەیان کەسی لێ بوو هەموویان تەماشای ئێمەیان دەکرد دوو کەسی ڕیشدار بۆ لای من هاتن منیان لە ئامیز گرت و ماچیان کردم من ئەوانم نەناسین، دەستی منیان گرت و بۆ شوێنی خۆیان بردم وامزانی بە هەڵەدا چوینە دواتر ناویان هێنام زانیم هەڵەنین چ لەوە خۆشترنیە کەدەچیە سجن کەسێك پێشوازیت لێ بکات دوای چاك وچۆنی وتیان بۆ گیراوی چیرۆکەکەم بۆ گێڕانەوە وتم من ئێوەناناسم وتیان دەزانین لەبەر ڕیشمان لێت تێك چووە، بەداخەوە ناویانم ئێستا لەبیرچووە ئەگەر بەهۆی ئەو نووسینە ئەوان من ببینەوە وتیان ئێمە فلان وفلانین کە

**لەپشتی قەلادزە دەمان ویست بچینە سەرکردایەتی نەشارەزا بووین جەنابت و شوانۆ گەرەوی دەربازو کردین ئێمەو بردە سەرکردایەتی ئەوکات ناسینمەوە دووبارە یەکترمان ماچ کردەوە .**

*** *** ***

**چیرۆکی ئەو دوو بەڕێزە بەو شێوەیەی خوارەوە بووە: ئەوانە کەرکوکی بوون لە ڕێکخستنی کۆمەڵە بوون سەرکردایەتی بیر لەوە دەکەنەوە چۆن دەزگایەکی چاپ پەیدا بکەن بۆ نوسینی گۆڤار و بلاوکراوە و پێویستی تر پەیوەندی بە شارەوە دەکەن برادەرانی ڕێکخستن روو لەو دوو برادەرە دەکەن هەرچۆنێکی هەبێت دەزگایەکی چاپ پەیدابکەن ئەوانیش چاودێری پێش مەحکەمەی کەرکوك دەکەن عەریزەنوسێك ڕۆژانە درواى دەوام دەزگای چاپ دەباتە دوکانی شەربەت فرۆشێك دادەنێت بەیانیان کاتژمێر حەوت و نیو دەیباتەوەپێش مەحکەمە ئەوان بەیانیەك دووسەدریە لەبەر دەکەن و دوو ستڵ شەربەت دەبەن لەگەڵ گوشێك، بۆ ئەوەی پیاوانی ڕژێم وابزانن شەربەت فرۆشن دوکانەکە دەشکێن و دەزگای چاپەکە دەبەن دەست بەدەست دەگاتەسەرکردایەتی دواتر گومانیان پەیدا دەبێت پیاوانی ڕژێم بیاندۆزنەوە ڕادەکەن بە هەرشێوەیەك بوو گەیشتبوونە لای گوندی ماخۆیزنان لە کەندێك گیریان خواردبوو بەبرسیەتی و نەشوێرابوون بجوڵێن، چونکە شارەزانەبوون پێشمەرگەشیان لێ بووبووە جاش من و شوانۆ گەرەوەیی بە ڕێکەوت بەسەریان هەربووین، زۆرترسان هێمنمان کردنەوەو باوەڕمان پێ هێنان کەئێمەپێشمەرگەین لەگەڵ خۆمان بردنە سەرکردایەتی دیارە ئەوان دوای خۆیان تەسلیم دەکەنەوە یا چۆنیکی هەبوو من لێم نەپرسین پێم باش نەبوو ئەوپرسیارە بکەم ئەوانیش نەیان وت بۆ گیاوون،ئەوەی گرینگە ئەو ماوەی لەلای ئەوانبووم زۆر هاوکاریان کردم ئاگاداری ماڵەوەیان کردەوە پێراو و تەواوی جلکیان بۆ هێنام پۆشتەیان کردمەوە دوای چەند ڕۆژێك ڕەوانەی هەولێریان کردم. دوو شەو لە سجنی هەولێر مامەوە، دواتر بردمیانە شەقڵاوە بردمیانە بەردەمی محەمەدەفەندی کاك محەمەد وتی: کوڕم کێشەت چییە؟ وتم: کاك محەمەد نفووسم وێ نەبوو، گرتمیان دواتر بۆیان هێنام بەریان نەدام لەبەغدا قۆناغ بە قۆناغ ئەوەتەم لەبەردەمت ئەمرکە؟ وتی چایەك بخۆ خوات لەگەڵ بێ، چام بۆهات و خواردم و ڕۆیشتم چومەوە بەغدا.**

*** *** ***

**محەمدەفەندی خەڵکی شەقڵاوە بوو، کاتبنفووس بوو، با ئەو فرسەتە لە دەست نەدەین هەندێك باسی محەمەدەفەندی بکەین پیاوێکی نەرمونیان و دڵسۆزبوو بۆ کارەکەی، خۆی محامی خۆبەخش**

بوو، بۆ هەموو خۆشناوەتی کەسایەتییەکی بەرزی هەبوو، ڕێ نیشاندەری فەقیر و هەژاران بوو، هەرچەندی باسی بکەی تەواو نابێ، خودا پاداشی بداتەوە، ئەمریی بۆ ئەوانەی لەپێناوی خەڵکی ئەژن لەساڵی (١٩٩١ ) لەگەڵ راپەرینی گەلی کوردستان تەواوی سجلەکانی بردەوە ماڵی خۆی تا ماوەیەکی باش ماڵەکەی ببووە دائیرەی نفوسی.

***　***　***

باسی پیاوێکی تری شەقلاوە بکەم باشە یەکێك لەو کەسانە محەمەد علی ناسراو بە محەمەدعەلی شەقلاوەیی ئەو بەڕێزە لە نەخۆشخانەی شەقلاوە کاری دەکرد ماڵیان لە گوندی قەدیم بوو، زۆر جار دەرمانی باشی دەدامێ منیش دەم گواستەوە بۆ هێزی پێشمەرگە پیاوێکی نەترس و مەرد بوو.

***　***　***

دیارە دووای ئەو ڕووداوە گەڕامەوە بۆ بەغدا، دواتر من شارەزای بەغدابووم چاودێری ئەمنی لە سەر سەیدەلی زۆر کەم بوو دەرمانەکانیان بۆ دەنوسیم دەم کڕین و دەم گواستنەوە، لە بەغدا شەوێکیان دوای خۆشوشتن و خۆگۆڕین چوم لە ئیدارەی فندەق لەنزیك خاوەن فندەق دانیشتم بەمەبەستی گوێ گرتن لە دەنگوباس بە جلکی نوستن دوای ماوەیەکی کەم دوسێ ئەمن سەرکەوتن هاتنە نزیك من دوای سەلام لە خاوەن فندەق وتیان کەسێك لێرە دەنوێ بەناوی مستەفا رەسوول خاوەن فندەق هەرچەندە عەرەب بوو پیاوی باش بوو، تیلە چاوێکی دایەمن و وتی با سەیری ناوەکان بکەم من تێگەیشتم بەبێ ئەوەی بگەڕێمەوە ژوورەکەی خۆم زۆر بەنەرم و نیانی بەجلکی نووستن چومەخوارەوە دوور کەوتمەوە سواری تەکسی بووم، بەکراس و بێجامە گەیشتمە نەهزە کەسێك هاواری دەکرد بەسرا یەك نەفەر، سواربووم و بەسرا خۆت بگرە هاتم، شەو مابوو گەیشتمە بەسرا وەزعی بەسراش تەواو نەبوو شەڕ لە رۆژهەلاتی بەسرا گەرم بوو، لەناو نەقلیات خۆم سەرقاڵ کردبوو لەوێ بۆ ئەوێ تا ڕۆژ دەرکەوت وردە وردە چومە بازاڕ و خۆم کردەوە ئەفەندی ماوەیەك لەوێ کارم کرد، کۆمەڵێ کەسم ناسی ڕۆژێك لەیەکیانم پرسی رژێم چۆنە لەگەڵ خەڵکی بەسرا؟ وتی جەناب تۆ کوردی منیش شیعەم لێت ناترسێم بە یەك قسە هەموو شتت بۆ باس دەکەم، لە بەسرا ساڵانە رژێم بە وردی لە هەموو گەڕەکەکان بزانێ کەسێك پێنج کەسی بە قسەی دەکەن دەی کوژێت واتە: ساڵانە هەموو ئەوکەسانە دەکوژێت کەبزانی دەبنەپیاو! بەسرا ئێستا بێ پیاوە ئەوەی ببێتەپیاو دەکوژرێت. شاری بەسرا ئەوکات جیاوازی هەبوو لەگەڵ شارەکانی

عیاق، دووکانی گەورەگەورە پڕبوون لە خواردنی قدوبەندی لەهەرشتێك ئەوبازارە لەبەغداش کەم بوو، ئەوکات لەناو خەڵکی بەسرا توندڕەوی عەرەبی کوردی نەبوو، بەڵکوو دڵیان بەکورد خۆش دەبوو، خەڵکێکی کزوداماو بوون بەدەستی ڕژێم، ترست لەچاوی هەمووکەست دەدی، ماوەی سێ مانگ لەوێ مامەوە دواتر هاتمەوە خۆشناوەتی ڕۆژێکیان سەردانی سەید کەریم کرد، شەهید سەید کەریم لە سەربانی مزگەوتی میروسیان لەبالیسان پیاسەی دەکرد، تەواوی چیرۆکی خۆم بۆ گێڕاوە، کە حکوومەت بەرنامەی هەیە شەهیدت بکات، بە دەستی خەڵکی خاین و پێویستە ئاگات لەخۆبێت ماوەی کاتژمێرێك گفتوو گۆمان کرد. بە داخەوە ڕژێم لەساڵی (١٩٨٤) شەهیدی کرد بەدەستی خۆفرۆشان لە تاسلووجە .

وەزعی شۆڕش گۆڕابوو، خۆشناوەتی پڕبووبوو لە فیراری سەربازی، بەشێکی باش ببوونەپێشمەرگە، لە لای مەعمەل قیری خەلیفان بەسەرەوە تاکو گوندی نواوەی بێتواتە ئازاد کراوبوو، ئەگەر ململانێی ناوەخۆ نەبووایە لە سەر پاوانخوازی لە وانەیە زروفەکەجۆرێکی تر دەبوو، زۆربەی فیرارەکان هەنجەتی شەڕی براکوژیان هەبوو، کەمتر دەبوونە پێشمەرگە ناوچە ڕزگارکراوەکانی کوردستان پەناگایەکی باش بوون، بۆ مانەوەی خەڵکی فیراری سەربازی، بووە هۆی نەجاتدانی هەزاران گەنج لە مردن لە شەڕی عێراق ئێران کەوا بوو هێزی پێشمەرگە لە چەند لایەك بووەبووە پارێزەری خەڵکی کوردستان، هەبوونی پێشمەرگە ڕژێم وازی لە ڕاگواستن هێنا. دووەم ئەوەی لە شەڕگەی عێراق وئێران ڕای دەکرد لە بنباڵی پێشمەرگە ژیانی پارێزراو بوو. ڕژێم باوەڕی بەجاش و جاشایەتی نەبوو، بۆ ئەوەی خەڵك ڕوو لە پێشمەرگە نەکات و شەڕی پێشمەرگەش بکات فەوجەکانی دروست کرد . چونکە دەیزانی کورد سەربازی ناکات بۆیە لەسایەی پێشمەرگە خەڵکێکی زۆر نەبووە سوتەمەنی شەڕی عروبە قادسیە و هەزار و یەك ناوی تری بێمانا، پاش ماوەیەك لەوێ مامەوە، ئەوجارەیان چومەوە موسڵ ماوەیەك مامەوە هەستم کرد پیاوانی ڕژێم چاودێریم دەکەن چەند برادەرێکی سلێمانیم دیتنەوە تەڵەبەبوون لە زانکۆ هەموویان کۆمەڵەبوون، ناوەناوە سەرم لێدەدان لەفندەق، ئەوان دەهاتن بۆ لام بۆخۆمان قسەمان دەکرد لەسەر شۆڕش و باسی ڕژێم لەوبابەتانە، ناوەکانم لەبیر نەماون. لە فندەقێك بوون لە شەقامی ( دەواسە) ڕۆژێك چومە لایان ماوەی نیوسەعات دانیشتم، ئەوکات من لە کەباب کۆیی سنجاق کارم دەکرد، کە چومەوە شاگردێك وتی نەچی کۆمەڵێك ئەمن چاوەڕێی تۆنە. وتم: باشە چومەوە لای برادەرەکام واتە تەڵەبەکان مەسەلەکەم بۆ باس کردن وتیان ئەو شەو

ئەلای ئێمە بنو بەبێ ئەوەی ناوت لە ئیدارە بنووسی هەوڵدەین ئەجاتت بدەین بەیانی زوو برۆ پێش مەلا بانگدان ئەچییەوە هەولێر بەرەو تکریت لەوێ بەرەو کەرکووك لەوێ سولەیمانی و ڕانیە و بالیسان خۆت بگرە هاتم، دیار بوو ڕژێم هەستی بەمن کردبوو کە بانگەوازی شۆڕشم دەکرد، چەند شانەی کۆمەڵەم دروست کردبوو، شەوەکەی لەلای قوتابیەکان بووم وەك مەردان نەیان هێشت خاوەن فندەق هەست بەمن بکات شەو تا بەیانی بوونە حەرەس بەو مەبەستەی بەیانی زو هەڵمستێنن بۆ بەیانیەکەی هێشتان مەلا بانگی نەدابوو، منیان لەخەو هەستاند، دەرگایی فندەقیان کردەوە چۆن کردیانەوە من نازانم؟ چوومە نەقلیات و بەرەو تکریت لە نێوان موصل و تکریت پیاوانی ڕژێم بازگەیان دانابوو، من زۆر ترسام گومانم لەخۆ هەبوو، دوواتر بۆم دەرکەوت تایبەت بوو بە ماشێنەکانی تورکیا کەلوپەلی قاچاغ دەگەڕان. گەیشتمە تکریت بۆ کەرکووك وسلێمانی و چوارقورنە و بالیسان. هیوادارم ئەو تەڵەبانە بە هۆی ئەو نووسینەم بدۆزمەوە . ئەو کاتەی هاتمەوە مەڵبەند داندرابوو دکتۆر کەمال خۆشناو لێپرسراوی مەڵبەند بوو، سەید کەریم مەسئولی سەربازی بوو، عەلی حەویز کاروباری کۆمەڵایەتی بوو، بەشی ڕاگەیاندن هەبوو، بەشی یاساو بەندی خانەپێکەوەبوون، بنکەیەکی تەندروستی هەژارانەمان هەبوو، ئەکرێت وابڵێین لە ناوچەرزگار کراوەکان لە سنووری دەستەڵاتی یەکێتی چەند حکوومەتی هەرێمی دیموکراتی دروست کران، واتە مەڵبەندەکان مەسوولی مەڵبەند وەك سەرۆکی وزیران بەرپرسی گشتی بوو، بەشی سەربازی کارەکانی خۆی دەکرد، بەشی یاساو کومەڵایەتی کارەکانیان لێك نزیك بوو. هەرکیشەیەکی بە کۆمەڵایەتی یەکلانەکرابایەوە، دەدرایە بەشی یاسا، لە هەموو گوندەکان بەوپەڕی ئازادەوە، هەڵبژاردن ئەنجام دەدرا، خەڵکی فێرکران نوێنەری خۆیان هەڵبژێرن، نموونەیکی بچووك دێنمەوە، لەسەرئازادی ڕادەربرین لە شێخ وەسانان پرۆسەی هەڵبژاردن ئەنجام درا، کەسێك کەسی هەڵنەبژارد کاغەزی بە بەتاڵی هاوشتەناو سندووقی دەنگدان، ئەوکاتی سندووقی دەنگدان عەلاگە بوو کە بەراوردی دەنگەکان کرا، کەسێك دەنگی نەدابوو وتیان دەبێت کێ بێت دەنگی نەدابێت؟ کەسێك بەناوی ئەحمەد قادر وتی وەڵا من بووم! وتیان خێربوو دەنگت نەدا؟ وتی من بەو نوێنەرانە ڕازی نیم بۆیە دەنگم نەدا! وتیان بەریاز تۆ ئازادی لە دەنگی خۆت بەڵێ ئەوەدیمکوراتییە. ئەکرێت بڵێین: سیستەمێکی دیموکراتی نەبووە، بەڵام یەکەم هەنگاوی دیموکراتی لە پاریزگای هەولێر لە بالیسان هەنگاوی یەکەمی هاویشت ئەو شەرەفە بەر ناوچەی خۆشناوەتی کەوت هیممەتەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ سەرکردایەتی یەکێتی و ئەو شێرەپیاوتانەی

باسم کردن، زۆرکەسی تریش ئەوکەسانەی دەردەچون دەبوونە بەرپرس لەکاروباری گوندی تەی وردە ئیشانەی کە خزمەتی گشتیان دەکرد وەك خۆشکردنی رێگا وبان چاککردنی کتی وکانیاوەکان چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتیەکان دانانی میراو کە بەرپرس لە ئاودانی کشتوکاڵی جووتیاران وەیان کەسێك دەگیرا، لە لایەن هێزی پێشمەرگە ئەگەر زۆرقورس نەبایە ئەنجومەن دەیتوانی بچێت ئازادی بکات، لە دابەشکردنی هێزی پێشمەرگە بەسەر ماڵان و یارمەتی هێزی پێشمەرگە لە کاتی شەڕدا وەك بردنی نان و تەقەمەنی زۆرجار وەك هێزی بەرگریش بەشداری شەڕدەبوون، شەهیدیشیان زۆرە.

*** *** ***

ئەکرێت شتیك باس بکەین خەڵکی گوندان بەشی هەرەزۆری وەك پێشمەرگە ئەرکی سەرشانی خۆی رادەپەراند بەزیاتریش، ئەگەر کەموکورتیەك لێرەو لەوێ رووی دابێت شایەنی باس کردن نیە .. برادەرانیش رێزیان هەبوو بۆ ئەنجومەن، برادەرانی پارتی مەقەڕی لقیان لە گوندی بێرێ و دەورو بەری بوو، مەقەڕێکی حیزبی شیوعی لە شێخ وەسانان بوو. دکتۆری باش و دەرمانی باشیان هەبوو خەڵکی ناوچەکەمان روویان لەو نەخۆشخانە دەکرد و بەبێ جیاوازی چارەسەری نەخۆشەکانیان دەکرد. لەگەڵ جووتیارانیش زۆر بێکێشە بوون... لە رووی تەندروستی لەگەڵ جووتیاران باش بوون، کەمترین ئەرکیان لەسەر جووتیاران نەبوو. ئیدارەشیان باش بوو زۆریش بەئەدەب بوون. شەڕی براکوژی بەردەوام بوو لە دەشتی هەولێر ئەو ئاگرە وردە وردە گەشەی دەکرد بۆ لای ئێمە دەهات ئێمە لەشێخ وەسانان سێ کەس بووین سەرەتا، هاوڕێ مەلا مغدید عوسمان و من، یەکەم شانەی کۆمەڵە لە ناوەچەکەمان سێ شانەهەبوون کاکۆتەها لە گوندی کانی بەرد. دووەم: مەلاسەعید لە گوندی خەتێ سێیەم من لەشێخ وەسانان دواتر مەلامغد یدیش دەوری خۆی دیت دواتر عومەر ئەحمەدی براشی بووە کۆمەڵە، من چومە لای د. کەمال خۆشناو وتم دەبمە پێشمەرگە، وتی: نەخێر دەبێت لەشێخ وەسانان بمێنیەوە تاکو ماوەیەکی تر، کاك عومەر ماڵی ئاوابی ئێوارە بووە کۆمەڵە شەو هەمووی کەشف کردین زەختێکی زۆرمان کەوتەسەر زۆرمان ئیدارە نەکرد من و مەلا مغدید و عومەر بووینەپێشمەرگە لەلای شەهید عەلی نەبی، کە دەبووە کەرتی تیپی مەڵبەند. بالیسان بووبووە شار، دوکان و چێشتخانەو خەیات و مەقەڕی یەکێتی نووسەران و رێکخراوی کۆمەڵە کە کاك رێکەوت بوو بەشێك لە مەقەڕی کەرتی رێکخستنی کۆمەڵەی لێ بوو، کە چەندان کادیری وەك مامۆستا

بەکر، مەلا غەفوور،زاهیر بالیسانی، مزەفەر، قاسم عەزیز، ئاکۆ کەرکووکی،حاجی مەمۆ،حاجی ئەکرەم، مامۆستا حسێن، ئەلعەت،زۆری تریش.. مەقەڕی تیپی مەڵبەندی لێ بوو، کاك نۆشیر شەقڵاوەیی سەرتیپ بوو پێشمەرگەکانی دەستەی کاك نۆشیر زۆربەیان گەنجی تازە پێگەیشتوو بوون دیارە شەهید سەید کەریم و شەهید دکتۆر کەمال خۆشناو عەلی حەوێز مەقەڕی خۆیان هەبوو، عوسمان بچکۆڵ مەقەڕی خۆی هەبوو، ناوەناوە پێشمەرگەکانی دەشتی هەولێر پەیدادەبوون کادیرەکانی دەشتی هەولێری خەنی دەبوون کە(شەهید ڕێباز) داتە ناوچەکەمان شەووڕۆژ ئەو دەشتەکیانە لە کن یەك کۆ دەبوونەوە، شەهید ڕێباز و کۆڕەکەی وا گەرم دەکرد لە پڕکات دەبووە یەك و دووی شەو من زۆر جار بەهۆی دۆستایەتیم لەگەڵ هاوڕێ ئەلعەت خدر خۆش بوو، دەچومە کۆڕەکەیان بەشێکی زۆر لە کادیرەکانی ناوچەکەمان دەشتەکی بوون، وەکی خۆشناو دەڵێن: هەمووشیان دۆست و برادەر و خزمی یەك بوون، بالیسان بووبووە شوێنی پشودان، دیارە خزمانی بالیسان زەختێکی زۆریان کەوتبووە سەر لە ئیدارەدانیان بەگشتی، بەتایبەتی چەند ماڵێك هەبوون وەك مام فارس ئەحمەد، یاسین ابراهیم، مەلا خالید چاوشین، شەهید فەتحوڵلا، شێخ نەجمەدین، مەلائەحمەد شینکۆ، حسێن شینکۆ، مەلازادە ، ئیسماعیل ئەبووبکر، شەهید حەمەزیاد و زۆری تریش، زۆربەی پێشمەرگەی تیپەکان بۆ دیتنی خێزان و کەس و کاریان دەهاتنە بالیسان جگە لەتیپی کۆیە،٪ ٩٩/ئەوان لە دەشتی کۆیە یەکتریان دەدی و جووتیاران ڕەچاوی هاتنی خێزانی پێشمەرگەیان دەکرد کە داتنە سەردان، ژووری تایبەتیان دەدانێ بۆ ئەوەی دەست لەملان بکەن چەندان کوروکچی پێشمەرگە هەبوونیان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کات ڕەخساندنەی جووتیاران بۆ خێزانی پێشکەرگەیان دەرەخساند، شەو گەوز گەوزانەیەك بکەن .. زۆرجار ئەوتیپانە بانگهێشت دەکران بۆ مەڵبەند بە تایبەتی کۆتایی (١٩٨٢ )، چونکە ئەو کات بەرەی( جود ) وەك دووپشك کلکی ڤیت کردبووەوە هەمووددەم مەترسی پێوەدانی هەبوو بە تایبەتی سەید کاکە هێزێکی(١٠٠) کەسی وەدووخۆ دابوو وەك نێرەکەوی بەهاران بەدەورمان دەسوڕا جەولەکەشی بەو شێوەیە بوو، توتمە، شێخ وەسانان، بێراوە، مێرگەسەر، چیوە... دوو بارە بەپێچەوانەوە، دکتۆر کەمال مەترسی شەڕی دەکرد، لە گوندی دەراش کۆبوونەوەی بە هەموو ئەنجومەنی سنوورەکە کرد، داوای لێکردن کارێك بکەن بەرەی جود وازلە شەڕ فرۆشتن بێنێت، دیاربوو ئەو کۆ بوونەوەیە سوودێکی نەبوو دکتۆر کەمال خۆشناو حەزی بە شەڕی براکوژی نە دەکرد، بەرەی جود وردە وردە هێزی لە ناوچەکە زۆر دەکرد، مەفرەزەیەکی ڕێکخستن چووە گوندی

بلارووکاوە، بە مەبەستی سەردانی هاوڕێیانی کۆمەڵە لە گوندی بلاروکاوە بەبێ هۆ شەڕیان پێ فرۆشتن، هاوڕێکیان شەهید کرد بەناوی (عەلی برای شێخ قادری کادیری کۆمەڵە)، گولەی بەرسەری کەوت پێشمەرگەیەکیش بریندابوو، بە ناوی سەفین پێم وایە کۆلکە ڕەشی بوو. مەڵبەند لەو شەڕە خۆی لادەدا نەی ویست ببێتە شەڕی براکوژی غەدرێکی گەورەمان لێکراو یەکێتی پێی لە جەرگی خۆناو بێدەنگ بوو. لە شەهید کردنی عەلی و بریندار کردنی سەفین. بەرەی جود ئەو هەڵوێستەی یەکێتیان بە لاواز زانی، ئەبووایە هەڵوێستی برانەیان هەبووایە ئەوە نەکرا. وەك باسم کرد سەید کاکە دەورێکی خراپی هەبوو. مەڵبەند داوای برادەرانی دەشتی کۆیەی کردبوو تیپی کۆیە بەرێوە بوون بۆ لای ئێمە چونکە ئێمە مەترسیمان لەسەر بوو لەلایەن بەرەی ( جود ) هەر لەپایزێ تاکوو بەهارێ ئێمە دەبووایە لە باکووری گوندی بالیسان حەرەسیات بگرین لەترسی بەرەی جود لە میان و بەردەلانك بەو زستانە سەختە ئەوەی لەبیرمان کردبوو هێزی داگیرکەر بوو!

دکتۆر کەمال خۆشناو بانگی منی کرد وتی فەقێ کەسێك و ولاغێك بەکرێ بگرە لابەلا برۆ گوندی سەردۆر برادەرانی کۆیە بەرێوەن بۆ گوندی سەردۆڕ ئەو نامەیان بدێ بە دەمیش بە کاك شۆڕش بلێ وریابن سەید کاکە بەسەد پێشمەرگە لە چیوەی سەروەمنیش کەسێکم پەیداکرد، بە ناوی مامە خەرکی بالیسانێ بوو، بە دووانزە دینارم بەکرێ گرت لە گەڵم بێت بەرێکەوتین دووای نیوەرۆ چوینە مێرگەسەر بە چیای نوسەك سەرکەوتین لەترسی سەید کاکە گەیشتینە نیوەی چیا بەفر دەستی پێ کرد دواتر زریان لێی داین لێمان شێوا، شەویش داهات وتم خار( مامە) وتی بەڵێ وتم لە کوردەواری قسەیەك هەیە دەڵێت: ئەگەر شەوت لێداهات و لێت تێك چوو بەدوای ئاگردامەچوو، بە دوای دەنگی سەگدا... برۆ باراوەستین بزانین دەنگی سەگ لە چ لایەك دێت؟ دوای ماوەیەك گوێمان لە دەنگی سەگ بوو، بە دووایدا رۆیشتین، ڕێگا نەبوو زۆر سەخت بوو بەردەوام بەفر لێی دەداین، ئەوەندەمان زانی گەیشتینە گوندێك پرسیارمان کرد ئێرە چ گوندێکە؟ وتیان چیوەی سەرێیە ئێمەش لەچیوە پسابووین لە ترسی سەید کاکە وتم مامە چی بکەین؟ وتی چ ناکرێت دەچینەماڵێك بە تەمای خوای چوینەماڵێك، وتمان میوان ڕادەگرن وتیان فەرموون ولاغیان لێوەرگرتین ئێمەیان بردەژووری و جلکیان لێ گۆرین و سۆبەیان بۆ گەرم کردین، نانمان خوارد ئەو ماڵە دوو گەنجیان میوان بوون، بە گەڕان هاتبوون یەکیان پارتی بوو، یەکیان سۆشیالیست بوو، خاوەن ماڵ یەکێتی بوو. دیارە زانینی من بەهۆی

موجامەلەی گەرمیان بوو لەگەڵ یەکتر لەسەر یەکتر ناوەستان هەر دەروێشەو لە مەدح و سەنای شێخی خۆی باس دەکرد، من و مامەش خۆمان بێدەنگ کردبوو پیرە دایکی خاوەن ماڵیش ناوە ناوە چای گەرمی دەداینێ بۆ ئەوەی سەرما بەرمان بدات، کە گەنجەکان ماندوو بوون یەکیان وتی: ئەنگۆ بەو شەوەی لەکێ هاتن و ئەچنەکێ؟ پیرە دایك پێش ئێمە هاتە وەڵام و وتی پرسیاری لۆ لێ دەکەی؟ میوانە میوان پرسیاری لەسەر نیە میوانە و بەخێربێن کورە بێدەنگ بوو، دواتر دویان رۆیشتن مانەوە کورو دایك، بۆشمان دەرکەوت کەئەوماڵە یەکێتین کورەکەی ناوی مامۆستا عەلی بوو گەنجێکی جوان و تازە پێ دەگەیی بە پیرە دایکم وت بەیانی زوو لە خەو هەڵمانستینە ئێمە دەبێت زوو برۆین بەیانی کە ئێمە هەستاند چاونانی بۆ ئامادەکردبووین هەستاین و دەستمان بەنان خواردن کرد، بە رێکەوتین سەید کاکە هەستی بە ئێمەنەکرد بەفر زۆر کەوتبوو لە سەری سەردۆر گەیشتینە کاك شۆرش و برادەران سەرو جەمەدانی برادەران بە بەفر داپۆشرابوون کاك شۆرشم دیتەوەو نامەکەم دایێ باسی سەید کاکەم بۆ کرد کە ماوەی مانگێکە وەکی کەرەبابی لەدەورمان دەسوڕێ برادەران وتیان سەبریگرە ئەگەر لەچیوە بێت سەید کاکەتان بۆ ئاقر دەکەین واشی لێهات. سەید کاکە لە دوورەوە چاوی بە ئێمە کەوتبوو بەرەو چیای هەورێ ڕای کرد، هێزەکەی کۆیە بەرەو چیوەی خوارێ هات، دکتۆرکەمالیش لە چیوەی خوارەوە پێشوازی کردن، وردە وردە هێزمان بۆ هات ناوچەکە ئارام بووەوە دواتر هێزەکان چونەوە سنووری خۆیان ڕۆژکیان هەواڵی شەهید بوونی شەماڵ وسەرباز کۆیی پەیدابوو کە لە ٢٢ / ٢ / ١٩٨٣ بەدەستی بەرەی جود بەتایبەتی حیزبی شیوعی شەهید کرابوو، ئەمرمان پێ کرا ئەو ڕۆژە هەر بەر پرسەکی بەرەی جود ببینین بیکوژین، ئەوانیش هەستیان کردبوو بەر پرسەکانیان جوڵەیان نەدەکرد ئەو ڕۆژەی ئێمە دەمان ویست تۆڵەی شەماڵ و سەرباز بکەینەوە، کەسێکی بالیسان بەناوی حەسەن ناسراو بە حەسەنەسوور بەرپرسێکی سۆشیالیست بوو، بەرەو لای ئێمە دەهات نیازمان هەبوو بیکوژین، کەسێك بەناوی جەوهەر کە سەر بە سۆشیالیست بوو ئاگاداری کردەوە کە کەمینی لەپێشە مەڵبەند بڕیاری گرتنی جەوهەری دەرکرد، جەوهەر گیرا و دواتر گوللەباران کرا. ئەو ڕمکردنەم زۆر پی ناخۆش بوو، هۆیەکەی جەوهەر باوکی شەهیدی ڕێگای کوردایەتی بوو، خۆی پاش باوك بوو بەناوی باوکیان کردبوو، لە کاتی گرتنی خێزانی و دایکی هاتنەسەردانی زۆر هەوڵیان دا بێسوود بوو، من بەنەهێنی بە ژنەکەم وت برۆ لای شیخ نەجمدین بالیسانی و لای شەهید فتحوڵلا بالیسانی بەڵکوو مەڵبەند ڕەجایان قبووڵ بکات ئەوکارە کراو

سوودی نەبوو، جەوهەر بەخێزانی خۆی گوت من بەناوی باوکم کراوم ئەوکوڕەش بەناوی من بکەن واتە جەوهەر جەوهەر جەوهەر. بەداخەوەم ئێستاش نائومێدی ئەو دایك وخێزانی جەوهەرم لەیاد ناچێ، زۆرم بەزەیی بە ژن ودایکی جەوهەر سوتاو، شتێکیشم لەدەست نەهات . هیچیشم پێنەکرا.

*** *** ***

حیزبی شیوعی هێزێکی زۆری لە شێخ وەسانان کۆکردبووەوە، پارتی و سۆشیالیستیش بەهەمان شێوە، بۆ مێژوو هێزی ئێمە خەریکی پەلاماردانی دوژمن بوون ئەوانیش هێزیان لە دەوری ئێمە کۆدەکردەوە، مەلامحەمەد پیاوێکی بە ڕق و کینە بوو بەرانبەر یەکێتی ڕەسوول فەقێ نەرمونیان بوو، حەزی نەدەکرد شەڕ ڕوو بدات. لە سۆشیالیست عەولابۆر و بەکرتوتمەیی توند بوون لەحیزبی شیوعی، ئازادە سەرسۆر زۆر توندڕەو بوو بەتایبەتی لەگەڵ شەهید د. کەماڵ خۆشناو، چونکە برادەرانی شیوعی دەوری بەر چاویان هەبوو لە شەڕانگێزی، نزیکەی دوومانگ و نیو بەو زستانە سەختە لە سەنگەر دابووین لە باکووری ڕۆژاوای بالیسان و سەرووی گوندی کانی بەرد بە تایبەتی تیپی مەڵبەند ئەوەبوو لە شەوی ۲۸/۲۹، نیسانی ۱۹۸۳) بەرەی جوود لەحەوت قۆڵ پەلاماری داین لە، سەرەوار، سماقە، کانی بەرد، بەردەلانك، خوارمیران، گوندی دەراش، گۆڕەشێر، زۆر بێ ڕەحمانە شەڕەکەیان دەکرد پیاو نازانێ چ بنوسێ؟ شەهید ئایا ئێمە شەهید بووین ئەوان شەهید بوون؟ بەهەرحاڵ شەڕەکە بەردەوام بوو، بە کوژرانی ئازاد سەرسۆر و بریندار بوونی بەکر توتمەیی و بە بریندار بوونی عەولابۆر، بەرەی جود لە هێرشکردن وەستان، بۆ ئەوەی حەق و ناحەق لێك جوودا بکەنەوە، بۆ مێژوو یەك نموونە دێنمەوە کە بەکر توتمەیی بریندار بوو، ڕەوانەی بێتواتە کرا بۆ چارەسەری بە دارەمەیتی شێخ وەسانان، بێتواتەش ئەو کات سنووری ڕژێم بوو بەکر توتمەیی لەوێ گیانی دا، ماڵی ئەنوەربەگ زۆر هاوکاریی بەرەی جودیان کرد ئەو هاوکارییە چۆن بووە؟ وەڵامەکەی لەلای من نییە ئێمەش کۆمەڵێك شەهید و بریندارماندا ئەوندەی لەبیرم ماون، ئەحمەد قەمبەری، پێشڕەو، پیرۆت گرجانی، برادەرێکی کۆیی هەردوو چاوی لەدەست دا برینداره‌کان: شاخەوان عەباس، عەلی نەبی، برایم برنۆ ... دواتر دێمەوە سەر شەڕەکە. باسی شەهیدبوونی شەهید پیرۆت گرجانی بکەم،ئێوارەی پێش شەڕی بالیسان بە منی وت نامەیەك بۆ دایك و باوکم بنووسە کە پیرۆت بریندارە وەرنە بالیسان کوڕەکەتان ببینن، وتم بۆ بەوشێوەیە وتی چەند ساڵە نەم دیون بەو فێڵە نەبێ نایەنە سەردانم، زۆر غەریبیە کردینە، منیش دڵم نەشکاند نامەکەم بۆ نووسی دیار بوو ڕەوانی کرد، بۆ بەیانیەکەی

سوودی نەبوو، جەوهەر بەخێزانی خۆی گوت من بەناوی باوکم کراوم ئەوکوڕەش بەناوی من بکەن واتە جەوهەر جەوهەر جەوهەر. بەداخەوەم ئێستاش نائومێدی ئەو دایك وخێزانی جەوهەرم لەیاد ناچێ، زۆرم بەزەیی بە ژن ودایکی جەوهەر سوتاو، شتێکیشم لەدەست نەهات . هیچیشم پێنەکرا.

*** *** ***

حیزبی شیوعی هێزێکی زۆری لە شێخ وەسانان کۆکردبووەوە، پارتی و سۆشیالیستیش بەهەمان شێوە، بۆ مێژوو هێزی ئێمە خەریکی پەلاماردانی دوژمن بوون ئەوانیش هێزیان لە دەوری ئێمە کۆدەکردەوە، مەلاحەمەد پیاوێکی بە ڕق و کینە بوو بەرانبەر یەکێتی ڕەسوول فەقێ نەرمونیان بوو، حەزی نەدەکرد شەڕ ڕوو بدات. لە سۆشیالیست عەولابۆر و بەکرتوتمەیی توند بوون لەحیزبی شیوعی، ئازادە سەرسۆر زۆر توندڕەو بوو بەتایبەتی لەگەڵ شەهید د. کەمال خۆشناو، چونکە برادەرانی شیوعی دەوری بەر چاویان هەبوو لە شەڕانگێزی، نزیکەی دوومانگ و نیو بەو زستانە سەختە لە سەنگەر دابووین لە باکووری ڕۆژاوای بالیسان و سەرووی گوندی کانی بەرد بە تایبەتی تیپی مەڵبەند ئەوەبوو لە شەوی ٢٨/٢٩، نیسانی ١٩٨٣) بەرەی جوود لەحەوت قۆڵ پەلاماری داین لە، سەرەوار، سماقە، کانی بەرد، بەردەلانك، خوارمیران، گوندی دەراش، گۆڕەشێر، زۆر بێ ڕەحمانە شەڕەکەیان دەکرد پیاو نازانێ چ بنوسێ؟ شەهید ئایا ئێمە شەهید بووین ئەوان شەهید بوون؟ بەهەرحاڵ شەڕەکە بەردەوام بوو، بە کوژرانی ئازاد سەرسۆر و بریندار بوونی بەکر توتمەیی و بە بریندار بوونی عەولابۆر، بەرەی جود لە هێرشکردن وەستان، بۆ ئەوەی حەق و ناحەق لێك جوودا بکەنەوە، بۆ مێژوو یەك نموونە دێنمەوە کە بەکر توتمەیی بریندار بوو، ڕەوانەی بێتواتە کرا بۆ چارەسەری بە دارەمەیتی شێخ وەسانان، بێتواتەش ئەو کات سنووری ڕژێم بوو بەکر توتمەیی لەوێ گیانی دا، ماڵی ئەنوەریەگ زۆر هاوکاریی بەرەی جودیان کرد ئەو هاوکارییە چۆن بووە؟ وەڵامەکەی لەلای من نییە ئێمەش کۆمەڵێك شەهید و بریندارماندا ئەوندەی لەبیرم ماون، ئەحمەد قەمبەری، پێشڕەو، پیرۆت گرجانی، برادەرێکی کۆیی هەردوو چاوی لەدەست دا بریندارەکان: شاخەوان عەباس، عەلی نەبی، برایم برنۆ ... دواتر دێمەوە سەر شەڕەکە. باسی شەهیدبوونی شەهید پیرۆت گرجانی بکەم،ئێوارەی پێش شەڕی بالیسان بە منی وت نامەیەك بۆ دایك و باوکم بنووسە کە پیرۆت بریندارە وەرنە بالیسان کوڕەکەتان ببینن، وتم بۆ بەوشێوەیە وتی چەند ساڵە نەم دیون بەو فێرە نەبێ نایەنە سەردانم، زۆر غەریبیم کردینە، منیش دڵم نەشکاند نامەکەم بۆ نووسی دیار بوو ڕەوانی کرد، بۆ بەیانیەکەی

شەڕدەستی پێ کرد لەنێوان کاتژمێری هەشت و نۆ پیرۆت شەهید بوو، بەرەی جود نەیان هێشت دایك و بابی بە زندوویی ببینێ، لەو لاشەوە دایك و باوكی هاتنە سەردانی كە هاتن تەرمی پیرۆت یان بردەوە.

ئەو ڕۆژە لەبەیانی باران بوو تاكوو ئێوارە، پێشمەرگەكانی یەكێتی بەرگرییەكی باشیان لەخۆ كرد، بەرەی جود لە شوێنی خۆیان چەقین شەڕە تەقە دوور بەدووری بەردەوام بوو، دكتۆر كەمال خۆشناو بە دوای منی دا نارد چومە لای وتی: فەقێ وتم: بەڵێ. وتی لە دەوروبەری من بە، نەڕۆی كارم پێتە منیش ناوەناوە خۆم پیشان دەدا شەو نەنووستبووین، زۆر خەوم دات منیش لە ژوورێك نزیك دكتۆر لێی ڕاكشام، هێشتان خەوم لێ نەكەوت بوو پێشمەرگەیەك هاتەژوور وتی تەماشا بكە بەخۆش دەڵێت پیاو كو لێ كەتیتە خەوێ، ترسنۆك مادام هەندە دەترسێی چت داوە لەپێشمەرگایەتی، منیش وەڵامم نەدایەوە ئەو ڕاستی دەكرد وەختی خەو نەبوو نەشی دەزانی من وەك دەست بە سەربووم لە لای دكتۆر كەمال خۆشناو، دواتر دكتۆر بانگی كردم وتی هەوڵ بدە محەمەد بیكەیسیش بابێتە لام محەمەد پیاوێكی ئازاو گورج وگۆڵ بوو لەكۆتایی (١٩٨٢) بووە یەكێتی پێشتر شۆشیالیست بوو، لە هەمان كات دوو شێرەپیاوی تریش ببوونە پێشمەرگە . شەهید یاسین و شەهید حاجی شێخ وەسانی، وا دیار بوو دكتۆر كەمال خۆشناو دوو مەبەستی هەبوو یەكەمیان بۆ شارەزایی بوو لە ناوچەكە دوومیان باوەڕی تەواوی بەمن ومحەمەد بیكەیسی هەبوو، محەمەد بیكەیسی وەسفی ناكرێت لە دڵسۆزی و ئازایەتی پێشتر سۆشیالیست بوو، دواتربووە یەكێتی لە شەڕی گەورەی سماقوری بەشداری كردبوو، لەگەڵ شۆشیالیست لە كاتی شەهید بوونی شەهید سەلیم و شینەی بۆری لە ساڵەكانی ١٩٨٨ پلە بەپلە بووە سەرتیپی /٨٣/ هەورێ .

دوای ئێوارە لە سەر بڕیاری برادەرانی مەڵبەند بڕیار درا كە پاشەكشە بكەین بۆ گوندی بێراوە، دكتۆر كەماڵ لەگەڵ سەید كەرم ئەمریان بە هێزەكان كرد شوێنەكانیان چۆل بكەن، بێنە پێش مەڵبەند، دیارە خزمانی بالیسان هاوكارمان بوون لەحەشاردانی كەلوپەلی مەڵبەند، دكتۆر ئەمری بە سەید كەریم كرد لەپێشەوە بڕوات محەمەد بیكەیسی پێشیان بكەوێ... بۆ مێژوو دكتۆر كەمال دواكەس بە ڕێكەوت، تەنها ئەمری بەمن كرد من لەدوای بڕۆم سەیرەكەی لەوەبوو من لەكەرتی تیپ پێشمەرگەبووم، ئێستاش بەتەواوی لە مەبەستی د. كەمال خۆشناو نەگەیشتم، بۆ بەس من بەتەنیا لەدووای بڕۆم بە ڕێكەوتین بەرەو گوندی بێراوە گوندی بێراوە

ئەوەی بەبیرم بێت، پارێزراو بوو بە هیمەتی قادر دزشکە و تەحسین کاوانی و پێشمەرگەکان، پێم وایە ئەگەر هەڵە نەبم برادەرانی بە ڕانەتیش لەوێ بوون، قادر دزشکە لەو ڕۆژە زاوا بوو مام جەلال ژنی بۆ خواست بوو، تەوازنی شەڕەکە قادر پاراستبووی بەدزشکەی (١٢) ملیم کە عەدەد دزشکە بوو، چونکە هێزی ئێمە دووسەد کەسێك بوو، ژمارەی بەرەی جود ،لە هەزار و پێنج سەد کەس زیاتر بوو، بەڕاستی بەرەی جود غەدرێکی گەورەیان لێ کردین لە بێراوە، بەرێکەوتین بەرە و گوندی شێوەی سەروو،لە ڕێگا جەوهەریان گوللەباران کرد، چوینە مزگەوت مزگەوت زۆر ساردبوو، پێشمەرگەیەك بەتانیەکی بە خۆدادا بوو، منیش لایەکی بەتانیەکەم برند کردوو بەخۆم دادا لێی نووستم بەیانی بەخەبەرهاتم تەماشای پێشمەرگەکەم کرد کە لەگەڵی نووستبووم شەهید پێشڕەو بوو، لە گوندی مەلەکان بەدەستی شیوعیەکان شەهید کرا، نابووا پێشڕەو بەدەستی شوعیان شەهید کرابا.. مەیتیان هێنابووە مزگەوتی شێیێ... پێشڕەو کادیرێکی چالاکی کۆمەڵە بوو، دەرچووی ئیدارەونیقتیساد بوو، پیاوێکی هۆشیار و جێی ئومێد بوو، بۆ دوارۆژی کورد بە داخەوە بەدەستی برادەرانی شیوعی شەهید کرا... سەید کەریم لە گوندی بێراوە مایەوە دکتۆر کەمال هاتە مەلەکان شەهید سابر ڕەسوول واجبی لەنێوان دەرەدار و دەرەشێر بوو هێزێکی پارتی بە سەرپەرشتی ڕەسوول فەقێ ویستی ڕێی دۆڵی شاورەمان لێ بگرێ، بۆ ماوەی پانزە ڕۆژ سواراغە و خەڵکی رانیە و دۆڵی شاورە ئێمەیان دەژیاند، دەبووایە هەرهێزە و نانساجی بۆخۆی بکات واتە کولیچە، ڕەسوول فەقێ گەیشتە گوندی زێوە زیاتر لە سەد پێشمەرگەی لەگەڵ بوو ئێمەیان نارد پێش لەو هێزە بگرین نزیکەی ( ١٢ ) پێشمەرگەبووین، ئەوانەی لەبیرم ماون: عوسمان بچکۆل، لاسە مێدێری، شەهید زەردەی برای حاجی مێدێرمن و نەجات تورکمان و عومەر شێخ وەسانی .. ئەوانی ترم لەبیرنینە! ئێمە چوینە نزیك دەرەزێوە شوێنی ( هاوار) ئەوشوێنە باسی چیرۆکێك دەکات لەگوندی زێوە کوڕو کچێك یەکتریان خۆشویستوە، خۆشەویستیان ئەوەندە بەهێز بووە مام شوان بە شمشال گفتوگۆی لەگەڵ کچەکە کردووە کچەکەش لێی تێگەیشتووە ڕۆژێکیان لە سەر ئەو قۆپە شمشار لێ دەدات لەخوارەوە واتە لە گوندی زێوە کچە گوێ لەشمشاڵ دەگرێت کچەکە تێدەگات شوان لە شمشاڵەکەی دەڵێت: خزمینە وەرنە هاواریم لێم قەومایە،کچە بە چەند پیاوێك دەڵێت: بگەنەشوانی کارەساتێکی بەسەرهاتووە کۆمەڵێك پیاو دەچنە سەر شاخی بۆلای شوان، کە دەچن تەماشادەکەن زیاتر لە دە گورگ خەریکی خواردنی بزن و مەڕن ئێستاش ئەو( نەزمە) واتە:

ئەوئاوازە ماوە لە شمشالْ ژەندن بەناوی( نەزمی هاوار) کە گەیشتینە شوێنی(هاوار)زۆرمان برسی بوو، عوسمان بچکۆلی بناری قەندیلی وتی برادەرینە من بەهۆی چەند ساڵە لە شاخم گیایەك لێرە هەیە تۆزێك تاڵە چەندی بی خۆی هیچ مەترسی نییە، وتمان دەپیشانمان بدە، وتی بە یەك مەرج وتمان مەرجی خۆت بڵێ؟ وتی سوێندم بەخوێنی شەهیدان بۆ بخۆن ئەوەی من دەڵێم بەگوێم بکەن، ئێمەش سوێندمان بۆ خوارد وتی وەرن ئەو گیایە هەوە، بەڵام دەبێت وەك بزن بیخۆن ئێمەش کەوتینە سەر دەستان وەك بزن دەمان خوارد، کێشەی لوتمان هەبوو لەبەر لوتمان دەبوایە سەری خۆمان خواربکەینەوە، بۆ ئەوەی باش بخێوێتیێ... ناوە ناوە لوتمان لە بەردی دەچەقی ئەوەندە بە خۆمان پێکەنین نەبێتەوە، لەپڕ چاومان بە هەندێك ژن و منداڵ کەوت بانگمان کردن کوڕێکی پارچەلە هات بۆ لامان دەرکەوت برای پێشمەرگەیەکی خۆمان بوو، بە ناوی حسێنی کوڕی کێخوا، حەسەنی زێوە برای شەهید عومەر زێوەیی، وتمان: دەبێ بچیەوە زێوەی نانمان بۆ بینی لە لای چەند پیرەژنێك بڵێ هێزێکی گەورەی بەبڕی دوسەد کەسی یەکێتی بەنیازن لە دەرە زێوەی بێنەخواریێ لەپارتی بدەن لە زێوە،حسێن بە غاردان بەرەو زێوە چوو کە دەگاتەوە زێوە دەچێت بە چەندان ژن دەڵێت دووسەد کەسی یەکێتی لە سەر شاخی بەرەو ئێرە دێن بە زوترین کات ئەو قسە دەگاتەوە رەسوول فەقێ، مام رەسوول دەنگ لە هێزی خۆی دەدات و دەگەڕێنەوە بۆ گوندی مێرگەسەر، بەڵێ شەڕ هەر شەڕی چەك نییە! دەتوانی پڕوپاگاندەی وا دروست بکەی کاریگەری لەچەك پتر بێت! من پێم خۆش نییە شەڕی ناوەخۆ بە درێژی باس بکەم، ناشکرێت باسی نەکەین، چونکە بەشێکە لە ڕابردوی ژیانی من، کەوابوو ناوە ناوە باسی دەکەین، بەکورتی زێوە زۆر نزیك بوو لە بێتواتە هاوکارێکی باشی پارتی کرا، لە بێتواتە زۆری پێ نەچوو شەڕی قرناقا و پشت ئاشان ئەنجام درا، وەك تۆڵەکردنەوەیەك لەسەر ئەو غەدرەی لەبالیسان لەئێمەکرا، من لەگەڵ ئەوەنیم ئەوان ئەوغەدرەیان لە ئێمەکرد ئێمەش وەك ئەوان، بەڵام ئەو بیرکردنەوە بیرکردنەوەی ئێستایە ئەوکات نە ئێمە و نە ئەوان وەك ئێستا بیرمان ناکردەوە بەداخەوە .

بەدەرکەوتنی کاك نۆشیروان هێزی بەرەی جوت شلەژاو ناوچەکەی چۆڵ کرد، بەشێك لەو بەرپرسانەی پارتی چونە لای ماڵی ئەنوەر بەگ نموونەی ......... و زۆری تر... دەست بەکاربوونەوە، من تێی ناگەم ئەوکات پێشمەرگەیەکی یەکێتی تەسلیم بە رژێم بووباوە شەهیدیان دەکرد، نموونەی شەهید حەسەنەگەورەی دۆڵی مەلەکان، دەیان پێشمەرگەی تر . ئەوبرادەرانەی

**چونه لای ماڵی ئەنوەربەگ بەهێز و بەهەمان چەك چونه ڕەبایەكان هۆیەكەی چییه؟ وەڵام لای من نییه، یەكێتی باش دەی زانی ماڵی ئەنوربگی بێتواتە ئەوەی بۆیان كرا، هاوكاری بەرەی جود بوون! هێزێكی زۆری یەكێتی لە ناوچەكەپەیدابوون، بە سەرپەرشتی كاك نۆشیروان،بڕیاریاندا ئەو هێزە بڵاو نەكەن پەلاماری بێتواتە بدەن ئەو تۆڵەش لە ماڵی ئەنوەر بگ بكەنەوە .من ئەوكات پێشمەرگە بووم لە كەرتی شەهید عەلی نەبی كەرتەكەی ئێمەو چەند كەرتێكی تر بۆ گوندی هەرتەل داندراین، هەر تیپەو شوێنی بۆ داندرا ئێمە چوینە گوندی زێوە ئاگادار كراینەوە بگەڕێینەوە دیار بوو بەرنامەكەیان گۆڕی بوو وردە وردە ناوچەكە چۆڵ كرا، پێشمەرگەكان چوونەوە سنوورەكانیان، من پێم وایە لە تاریخی هیچ میللەتێك هێزێك نەبوو، وەك هێزی یەكێتی بە تایبەتی پێشمەرگەكانی گەرمیان و دەروبەری كەركوك و دەشتی هەولێر و قەراغ و قەرەچوغ، بە دەیان جار ئەو هێزانە داتنە سنووری ئێمە و دەگەڕانەوە، ئەو بەدبەختانە دەبووایە تەقەمەنی باشیش هەڵگرن، ئەو هەموو ڕێیە بەگەرمای هاوین و بە قوڕ وسەرمای زستان. دیارە ماڵی ئەنوەر بەگ زانیاریان دەست كەوتبوو كە هێزی پشمەرگە نیازی هەبووە، بێتواتە پاك بكاتەوە، ئەوانیش كەوتنە خۆ هەوڵیان دا پشبێندێكی ئەمنی دروست بكەن لەو كاتەی هێزی پێشمەرگە واتە تیپەكان چونەوە سنوورەكانیان ماڵی ئەنوەر بەگ بە هەلیانزانی پەلاماری ناوچەكەیان دا بەپاڵپشتی ڕژێم توانیان دەست بە سەر ئەو گوندانەدا بگرن: گوندی نێوە و سەردۆر و وەرە و نواوە و مەلۆك و مێرگەسەر و سوێرە و چیوە و چیوە و زێوە و هەرتەل و بەرۆژە و هەنجیرە... دیارە ئێمە بەرگریمان كرد چەندان پێشمەرگە شەهید و برینداربوون، شەهیدی سەركردە دكتۆر كەمال خۆشناو بە دوای منی دا نارد منیش چومە بالیسان سەردانم كرد كاك كەمال وتی فەقێ بەپەلە برۆ شێخ وەسانان بە خزمان گوندی بلێ بەپەلە ولاغەكانیان بێنن مەڵبەند بگوازنەوە، شێخ وەسانان بەو شەوە ئاگاداری خەڵكیم كردەوە خەڵكی گوندی مەردانە كەوتنە جوڵە و بە ماوەیەكی كەم مەڵبەندیان گواستەوە شێخ وە سانان، یەكێك لەو كەسانەی شێخ وەسانان ناوی حاجی ڕەسوول حەمەد مەندەبوو، چومە ماڵیان دوو كەری هەبوون دوای سەلام وتم هیمەت بكە برۆ مەڵبەند لە بالیسانی كەلوپەلی مەڵبەند بگوازینەوە شێخ وەسانان؟ وتی دەوەرە سەیرم بكە ناوبراو، تازە لە كاروان گەڕابووەوە پێیەكانی ببوونە پۆرگە خەنەی لێنابوون، وتم حاجی ڕەسوول وەختی پێ لەخەنە نییە دووژمن گەیشتیتە خوار گوندی بیاوە مەترسی لەسەر مەڵبەندە، كە ئەو هەواڵەی گوێ لێ بوو هەستاو پێیەكانی**

خۆی لە خەنە شوت کەرەکانی کورتان کردوو و کەو تەڕێ دیارە نەخۆشخانەشمان گواستەوە شێخ وەسانان، بە کۆمەڵێ بریندار و نەخۆشخانەوە لە بریندارەکان تەنها ئەیوبم لە بیرماوە . پێم وایە لەشاخی مۆتە بریندار بوو، کەونە هاوڕێی شەهید سەردار سەعیدسۆفی. ئەوکاتە ئەیووب سوکەلە بوو، وەزنی ناگەیشتە پەنجا کیلۆ بۆ بەیانیەکەی کاك د.کەمال نامەیەکی بۆ ناردم لە نامەکەدا دەڵێت: هاوڕێ فەقێ مولازم خولە هاتە شێخ وەسانان ئیدارەیەکی باشی بدە، شوێنێکی گونجاوی بۆ ئامادە بکا منیش مولازم خولەم دیتەوە و بردمە ماڵی هاوڕێیەکی خۆمان بەناوی محەمەد رەحمان، زۆر بەجوانی ئیدارەی مولازم خولەیدا.

ملازم وەسفی بە من ناکرێت ئەوەندە دەڵێم: ڕۆژێکیان چومە لای بۆ ئەوەی بزانم چی پێویست نییە دوای چاك وچۆنی لێی پرسیم دەنگ وباس چییە؟ منیش ئەوەی دەمزانی بۆم باس کرد، مولازم کەوتە قسە و بەرنامەیەکی جوانی دانابوو، بۆ ڕاوەدونانی دوژمن لەگرتنی بێتواتە سەدا هەشتای لەگەڵ بەرنامەکەی مام جەلالی تێکی کردەوە ناو براو لە ساڵی( ) لەگەڵ هێزی پێشمەرگە لە سنووری دەستکردی دوژمن بەرەو ڕۆژهەڵات چوون بەمەبەستی هاوکاریکردنی برادەرانی دیموکرات. دیارە ئەوەی لەدەستیان هات کردیان لەو هاوکارییە چەندان پێشمەرگە شەهید بوون، دەیانی تر بریندار بوون، ئەوانەی من دەمناسین بریندار بوونی مولازم خولەو حاکم قاسم بوون، لە هاوکاری کردنی کوردستانی ڕۆژهەڵات لەو شەڕە بە سەتان پاسداریان کوشت . لەدوای پاشەکشەی ساڵی (١٩٨٨ ) ڕژێمی ئێران، دەورەێکی سەربازی بۆ پێشمەرگەکانی یەکێتی دەکاتەوە، لەو دەورەیە بە دوای ئەوپێشمەرگانەدا دەگەرێت کە بەشداریی شەڕی کوشتنی پاسدارانیان کردووە لە هاوکاری پێشمەرگەکانی دیموکرات دیارە سەرکردایەتی یەکێتی ئاگایان لەو بە دوواداچونە هەبووە، پێشمەرگەکانیان واتێگەیاندبوون کە هەموویان بڵێن لە ساڵی (١٩٨٣) ، بووینەپێشمەرگە بۆئەوەی ئێران تیرۆریان نەکات. ملازم خولە قاچەکانی لە دەست دابوو، مام جەلال ئەوکات لە بۆتێ دادەنیشت، سەرکردایەتی داوای لە تیپەکانی پێدەشتەکان کرد بەپەلە بگەنە بالیسان و دەوروبەری، لە مەڵبەندی چوار تەنیا یەك دۆشکەمان هەبوو، لە هەمان کاتدا تەقەمەنیمان نەبوو، ئەوەی ئەو دۆشکەی بەکار دەهێنا، ناوی قادر دۆشکە بوو، ئەو دۆشکەیەم لە شێخ وەسانان شاردەوە لە ماڵی خالید باوکی ناسراوە بەعەولاشین، هۆی شاردنەوەی دۆشکە نەبوونی پارەو تەقەمەنی بوو، دواتر کەسێکی ناوچەکەمان دەستگیر کرا بەبڕی زیاتر لە بیست هەزاردینار، کڕدرایەوە ..پارەی شەڕی بێتواتە پەیدابوو، بۆ

بەیانیەکەی کاك د.کەماڵ نامەیەکی بۆ ناردم دەڵێت بە زووترین کات بریندارەکان بگەینە مەلەکان بە مولازم خولەشەوە منیش ئاگاداری خەلکم کردەوە، هاوکاریمان بکەن چومە لای دکتۆر زریان پێم وت: کە دەبێت برینداران ببەینە گوندی مەلەکان دکتۆر زریان بریندارەکانی ئامادە کرد بارو بارەگامان تێك نا، لە گواستنەوەی بریندارەکان برادەرانی حاکم هاوکاریان کردین وەك حاکم قاسم، حاکم سەردار، حاکم کەمال، ئەو حاکمانە حاکمی شۆرش بوون، کە چارەسەری کێشە و گرفتە کۆمەڵایەتیەکانیان دەکرد، لەهەمان کات دا بە پێی یاسا جوڵاتەوە لەگەڵ دیل و خائینان.

*** *** ***

پێم باشە دکتۆر زریان لەبیر نەکەین پیاوێکی تێکۆشەر و ئازاو لەخۆ بردوو بوو، دکتۆری داروبەرد بوو، بە هەزاران پێشمەرگە و ژن وپیرو پەککەوتە و منداڵی لە مردن نەجات داوە. ئەگەر دەرمانیشی وەك پێویست لە بەردەست نەبووایە بەهەڵسوکەوتی نەرمونیانی و قسەی خۆش، نەخۆشی چاك دەکردەوە باسی د. زریانی بەمن تەواو نابێت...

رۆژێکیان لەنزیك دکتۆر زریان بووم، پێشمەرگەیەکی برنداریان هێنا، پارچەیەکی گوللەئاربیجی بەر بەلۆکی کەوت بوو، بەشێکی بردبوو، دکتۆر زریان داوای لەچەند پێشمەرگەیەك کرد بیگرن بە توندی منیش ئەو شەرەفەم بەرکەوت لە گرتنی پێشمەرگی بریندار بەشەجوێنی خۆشم بەرکەوت. دیارە چارەسەرەکان بەبێ بەنج دەکران پاکدەکرانەوە و دروینەوەیان بۆدەکرا، نەبوونی بوو د.زریان کەوتە خاوێن کردنەوەی برینەکە، پێشمەرگەکە ئازاری زۆر بوو. وردەوردە دەستی بە جوێندان کرد بەتایبەتی لەکاتی دروینەوە برینەکە بۆشایی هەبوو. هەزارجوینی بە د.بەزریان و ئێمەدا. د.زریان لەگەڵ هەرجوێنێك زەردەخەنەیکی دەکرد، تاکو کاری خۆی تەواو کرد، دواتر پێشمەرگەکە هاتەوەدۆخی ئاسایی و داوای لێبووردنی کرد لە هەمومان بەتایبەتی د. زریان.

بەهیمەتی خەلکی گوندی بریندارەکانمان گواستەوە مەلەکان بێنە بەرچاوی خۆت کۆمەڵێك بریندار بە پشتی گوێدرێژ لە شێخ وەسانان ببە مەلەکان بە رێی دەرەدارێدا، ئەوەی دەرەداری نەدیتبێت نازانێ دەرەدار چۆنە؟ شاخێکی زۆر بەرزە ئەگەر ولاغت پێ بێت دەبێت دەستی تێ بگری، تا لە شاخ نەکەوی، ئەدی ئەگەر بریندار لەسەر پشتی ولاغ بێت،ئایا وەزعی بریندار چۆن بووە؟ هاوارهاواریان و جوێن دان بە داروبەرد بریندارەکانمان گەیاندە مەلەکان و

مزگەوتێ مەلەکان، مولازم خولەشمان بردەماڵی برا شەهیدێکی خۆمان، کە ناوی کەریم بوو. مولازم خولە خێزانی لەگەڵ بوو ناکرا لە مزگەوت بێت، دیارە خزمانی مەلەکان لە بەرنگاربوونەوەی ڕژێم پێش دروستبوونەوەی یەکێتی بەشێك لەخزمانی مەلەکان لەمەیدان دابوون و چەکیان دانەنا و تاکو هێزی پێشمەرگەپەیدابووەوە ئەوان لەمەیدان دابوون، دیارە لە خزمەت کردنی پێشمەرگەش کەمتەر خەم نەبووینە، خەڵکی مەلەکان ناندەر و خانەدانن، گوندیش بێ کەموکورتی نابێت، بریندارەکانیش نانیان نەخواردبوو چومە ماڵێك لەنزیك مزگەوتی مەلەکان، پیرەژن خەریکی نان کردن بوو، دوای سەلام وکەلام وتم پلکێ هەندەك نانم بدێ وتی لێرە ڕانەوەستی، زۆرهەوڵمدا لەگەڵی سوودی نەبوو، وردە وردە لێی نزیك بوومەوە، پەلاماری سەلەی نانم داو هەراتم تاکوو مزگەوت، پیرەژن بە دووامدا نەهات، بەڵام هەزار تووك و جوێنی پێ دام، چوومە ماڵێکی تر دووای سەلام وکەلام داوای ماست وچام کرد، پیرەداك بە ڕووێکی خۆش ماست و کەرستەی چای دایە دەستم و نان وچایەکی باشم دایە بریندااران . دیارە ئەنجومەنی مەلەکان بڕیاریان دابوو، هەر خواردنی جەمێکی بریندااران ماڵێك ئامادەی بکات، د یەکەم ماڵ کە نووسیبوویان، ماڵی کەریمەڕەش بوو، لەبیریشیان چوبوو ئاگاداریان بکەنەوە، منیش بۆ نیوەڕۆ چومەماڵی کەریم نان بۆ برینداران بینم، تومەزانە ئەوانیش بیخەبەر هەموویان چوینە(دێیان) ئێمە بەکۆکردنەوەی گەلای دار بەڕو کەکۆی دەکەنەوە و لەسەریەکی دادەنێن پێی دەڵێین (دێ چرو ) منیش هەندێك بۆڵەبۆڵم کرد، لەژوورەوە مولازم خولە هاواری کرد وتی بەرپێشمەرگەیە بڵێن بێتەژوورێ ، منیش چوم وتی فەقێ ئەوەئەتوی وتم بەڵێ، زۆرخۆی لێ تووڕە کردم، وتی: بابریندار بمرن لە برسان ناکرێت خۆ لەجووتیاران تورەکەی، منیش ناکرا وەڵامی بدەمەوە! هەر دەم وت بەڵێ، وتی لێرە ڕانەوەستی، ڕۆیشتم دیسان نان وماستم بۆبرینداران پیداکردەوە. پێم وتن ئەخۆن ئەوەیە نایخۆن ئەوەیە. شەهید سەید کەریم و د .کەماڵ خۆشناو لە دۆڵی بالیسان پەیوەندیان لەگەڵ مام جەلال هەبوو، وردە وردە تیپەکان لە هەموو لایەك پەیدابوون، بەرنامەی شەڕیان دانا ماڵی ئەنوەربەگ کە دەستیان بەسەر ئەو گوندانە داگرت بە زۆر چەکیان پێدابوون، زۆری خەڵکی ئەو گوندانە دۆست و لایەنگری شۆڕش بوون، لە قوڵی بالیسان بێتواتە شەڕیان لەگەڵ هێزی پێشمەرگە نەکرد، لە گوندی نێوە هێزی پێشمەرگە زێدە ڕۆیان کرد ئەوەش لە پێناو تۆقاندنی جاشەکان بوو ئەو برادەرانەی لە گوندی نێوە زێدەڕۆیان کرد ئەوان لەدوور هاتبوون شارەزای تایبەتمەندی ناوچەکەمان نەبوون، نەشیانزانی بوو بە زۆر خەڵك کرایتە جاش،

**کە ئاگر بەربووە دارستان تەڕو وشك دەسوتێنێ،هەرئەوەندە دەکرێت داوای لێبووردن بکەین لە خەڵکی گوندی نێوە، شەڕ کەوتە ناو بێتواتە و دەورو بەری بێتواتە گیرا، لە ڕۆژی شەڕەکە من و حاکم کەمال بەشداریمان کرد، چونە بێتواتە دیارە لە بێتواتەش هەندێك کاری نابە جێ کرا. وەك تالان و سوتاندن کۆمەڵێك پێش مەرگەیان ڕووبەڕووی سزاکرانەوە، لەسەر ئەو کارەیان. من و حاکم کەمال هەوڵمان دا کتێب و دەستنووسەکانی مەلا سەلام لە سوتان رزگار بکەین بەشکی زۆرمان لە شوێنێك داناو چاو دێریمان دەکرد، لە پڕ دوو تەیارە پەیدابوون کەوتنە بۆردمان کردن ئێمەش تۆزێك دوور کەوتینەوە خۆمان دایە پەنایەك ڕژێم بەبەردەوام ناو بێتواتەی بۆردمان دەکرد بەتەیارەو تۆپ دوای ماوەیەکی کەم گەڕاینەوە شوێنەکە سوتابوو، واتە دەستنووسەکان هەموویان سووتان. بە داخەوە نەمانتوانی رزگاریان بکەین. دوای من بە هاو کاری برادەران توانیم دوو تۆپی سەت و بیست بگەینمەوە شێخ وەسانان، دیارە دوای منیش برادەران چەکو تەقەمەنەیەکی باشیان هێنایە شێخ وەسانان، کاك دەشتی کۆیی و برادەران کران بە بەر پرسی ئەو مەرجەبە، کەسیکمان هەیە لەناوچەکەمان بەناوی وەیسە گوایە چەك کراوە بەهۆی ئەوچەکەی چوار چەکی لێستاندینەوە بەبرو بلعات، وردە وردە ناوچەکە ئارم بووەوە مام جەلاڵ بارەگای لە گوندی زێغان دانا خەڵکی لە شارەکان بە لێشاو سەر دانی مام جەلال و ناوچەکیان دەکرد ڕۆژێکیان شەهید شەوکەت و شەهید عەلی نەبی لەسەر سەیارەیەك دەکەونە دەمەقاڵێ شەوکەت دەڵێت: دەبێت ئەو سەیارەیە بدەنە من، عەلی نەبیش نایداتێ دیارە کاك شەوکەت بە مام جەلال دەڵێت: مام جەلال بەدوای عەلی نەبی دەنێرێت عەلی نەبی دێت، مام دەڵێت: عەلی ئەو سەیارە بدە شەوکەت، عەلی دەڵێت نای دەمێ، مام دەست بۆ دەبانچەکەی دەبات سواری دەکات دەڵێت: سەیارەی بدێ عەلی دەڵێت نای دەم،مام جەلال دوبارەو سێبارە دەبانچەکەی سوار دەکات تاکو دەبانچەکە فیشەکی تێدا نامینێت دواتر بە عەلی دەڵێت برۆ سجن عەلی نەبی دەڵێت: ناچمە سجن، دواتر سەید کەریم بەعەلی نەبی دەڵێت: بە خۆت برۆ سجن. عەلی بە خۆی هاتە شێخ وەسانان لای برادەرانی حاکم بە سوتفە من لەلای برادەران دانیشتبووم عەلی نەبی بەژوور کەوت و دوای چاك و چۆنی وتیان فەرموو؟ وتی: دانانیشم هاتووم سجنم کەن، وتیان: مەسەلەچییە؟ بە کورتی باسەکەی گێڕایەوە، برادەرانی حاکم وتیان باشە وەرە ئێرە دانیشە و تۆ سجنی. زۆری نەبرد سەید کەریم بە دوای دانارد و کێشەکە کۆتایی هات ئەو کێشەیە دیارە ئاماژەیە بۆ ئەو وردە ململانێیەی نێوان کۆمەڵە و شۆڕشگێران عەلی نەبی بە قسەی مام جەلال**

و شەهید شەوکەت ناکات بە قسەی سەید کەریم دەچێتە سجن. بە خۆی مام جەلال کۆبوونەوەیەکی بەهەموو ئەنجومەنی گوندان کرد پرسوڕای بە زۆر کەس کرد لەسەر مفاوەزات زۆربەی کەس مفاوەزاتیان پێباش بوو، تەنها کەمال زیوەیی ڕەتی کردەوە، کەمال زیوەیی برای شەهید عومەر زیوەیی بوو، ڕۆژێکیان لە پڕ دوو کۆپتەر لە زێخان نیشتنەوە دەنگو باسی مفاوەزات لە ناوچەکە پەیدابوو ڕۆژێکیان جومعە بوو بە هەزاران خەڵکی شارەکان و دەورو بەر ڕژانە گوندی زێخان و مام جەلال لەسەر گردێك وتاری بۆدان لەو وتارە تەئکیدی لەسەر پاراستنی عێراق و برایەتی کورد و عەرەب و یەکرێزی خەڵکی کوردستان کرد، دیارە وردەکاری مفەوەزات ئێستاش نازانم چۆن بووە؟ ئەوەندە دەزانم ناوچەکەمان بەرەو ئارامی دەچو گرتن و تۆقاندن نەما فرسەتێکی چاك بوو، بۆ چارە سەری بریندار و نە خۆشەکانمان ڕەوانەی شار کران بە مەبەستی چارەسەر هەناسەیەکی باش بوو، بۆ پشوودان پێشمەرگە و برایانی ڕێکخستن و هاوڵاتیان ئازادکران دیلەکان ئێمەش سەر بازە دیلەکانمان ئازاد کردن ئەوکات کەرتی سجن لەگوندی شێخ وەسانان بوو، کاك مەجید میرخان بەرپرس بوو کاك مەجید پیاوێکی تێکۆشەرو نیشتیمان پەروەر و دڵسۆز بوو پیاوێکی کۆمەڵایەتیش بوو، زۆربەجوانی هەڵس و کەوتی دەکرد پیاوێکی بەئەدەب و نەرمونیان و وشیاربوو جوتیاران زۆر خۆشیان دەویا پێشمەرگەکانی لەگەڵیشی بوون زۆربەی ئەو سفەتانەی کاك مجید میرخانیان تێدا بوو وەك کاك سەلاح و مۆفەق و بارزان و ئەوانی تر، کۆمەڵێك حاکمی لەگەڵ بوون وەك کاك وشیار بابان و حاکم سەردار و حاکم کەمال و حاکم قاسم پیاوی باش و دڵسۆز بوون، کارەساتێکی گەورە توشی کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوە بوو، لە ڕێکەوتی ١٨/١٢/١٩٨٣ کۆمەڵێك کادیرمان بەسەیارە دێنەوە نزیك گوندی زنگ زنگە و گوندی پوکەی بیتوێن ئەلغامێکی ساڵی ١٩٧٤ کە هێزی پێشمەرگە ئەوکات بۆ دووژمنی دا نابوو لەژێریان تەقی، ئەوقارەمانانە شەهید بوون: ( مەلاغەفور و حا جی ئەکرەم و، مامۆستا شەوقی، هاوڕێ ئاشتی و هاوڕێ زاهیر و هاوڕێ ئەبووبەکر و هاوار بادینی) ئێوارە تەرمی پیرۆزیان هاتەوە، مزگەوتی بەگزادان هەموویان خوێنیان لە لووت و گوێ هات بوو کە نیشانەی ئەوەبوو توشی خوێنبەربوونی مێشك هات بوون، کارەساتێکی گەورە بوو ئەو بەڕیزانە هەموویان پیاوی مەیدانی و ڕۆشنبیر و تێکۆشەر بوون، شەڕە قسەی مەلاغەفور لەگەڵ حیزبی شیوعی و حاجی ئەکرەم و پارە گەیاندنە شۆڕش و جوانی شەهید ئاشتی و شەهید زاهیر بالیسانی و بەژن وباڵای هاوار بادینی ئەوەندە بەئاسان لەبیر ناکرێن پێم وایە ئەگەر هەڵەنەبم

تەنیاگۆڕی هاوار لە بالیسان ماوە، هەزاران سلاو لەگیانیان بێت، ئەوکۆمەڵەهاوڕێیـە بـەجێیان هێشتین .

*** *** ***

بۆ یەکەم جار بوو کە جەژنی نەورۆز بە ئازادی بکرێت، دوای(١٩٧٤)باوەڕ ناکەم وەسفی نەورۆزی سورداش بەمن بکرێت، خۆشترین ڕۆژبوو بە لای من،خەریك بوو جەماوەر بمان خوێن. کچان بە هاوار دەیان وت: (ئەو سینگە نەرمونۆڵە* بۆ پێشمەرگەی کۆمەڵە) جەماوەری مامەڕیشە کەمتر نەبوو لە مام جەلال، خەڵکی خەریك بوو بمان خوێن پێشمەرگە زۆرخۆشەویست بوو، وەك مناڵان کچان پاڕویان بۆ دەکردین، دەدەمیان دەنایین حەزیان دەکرد شتێك بدەنە پێشمەرگە، پێشمەرگە نانیان لەگەڵ بخوات، بە هەزاران وینەمان دەگیرا لەگەڵ ماڵباتەکان بەڕێز مام جەلال وتارێکی دا و خەڵکێکی زۆر ئامادەبوون.

دوای نەورۆز لە (١) ئەیار مەڵبەند هەستا بەسازدانی ئەهەنگێکی خۆش لە نێوان گوندی توتمەو گوندی بێرۆ، خەڵکی هەولێرو دەوروبەر یەکەم ئاهەنگ بوو لە دۆڵی بالیسان بە ئازادی بگێڕن دووای ساڵی (١٩٧٤ )ئاهەنگێکی زۆر خۆش بوو. خەڵکێکی زۆر بەشداری کرد، لەشارو لادێکان بەهارێکی زۆر خۆش بوو، لەناو ئەوخۆشیە کاك فوادی جوانەمەرگ کە ئەندامی مەڵبەند بوو لەبەشی دارایی سواری ماشینێك بوو، کۆنترۆڵی لەدەست داو لەجیاتی پێ لە ئیستاپ بنێت پێی لە بەنزین ناو ڕاست و چەپ بەناو جەماوەر کەوت ئەگەرخەڵکی لەبەری هەڵنەهاتبان خەڵکێکی زۆری دەکوشت،لەناو جەماوەر بووە ڕەت ڕەتانە هاتوهاوار خوارەحمی کرد وەستا چەندان بریندارمان هەبوو من مناڵێکی بریندارم بردە نەخۆشخانەی بالیسان و عیلاجی کرا . دواتر ڕێکخراوی کۆمەڵە کەناسراوبوو بە ڕێکخراوی (٥)ی کۆمەڵە لە گوندی بالیسان گوازرایەوە بۆ قوتابخانەی گوندی (خەتێ )، مەقەری دانا منیشیان بۆ چاوساغی ناوچەکە نەقڵی ڕێکخراو کرد، ئەوکات کاك نۆشیروان ئازاری پشتی هەبووشەو بۆ نووستن لەسەر لباد دەنووست نازانم هۆیەکەی چی بوو، کاك نوشیروان زۆرکزدیار بوو زۆریش لاواز بوو جگەرەی زۆر دەکێشا حەزی لەتەنیایی بوو، زۆریش بێ ئەرك بوو کەتێنی بوویا بەخۆی، دەچوئاوی دەخواردەوە بەکەسی نەدەوت ئاوم بۆ بێنە لەکاتی نانخواردن قاپەکانی خۆی بەخۆی هەڵدەگرتن دەی بردنە ئەو شوێنەی خەفەرقاپی لی دەشوتن، ڕۆژێکیان وتی فەقێ وەرە ئیشم پێتە، حەزم لە قەلەخەرمانە منیش بۆ یەکەم جاربوو گوێم لەو وشەیەبیبێت دواتر بۆی شی کردمەوە، منیش چومە ماڵی حاجی

نوری خەتێ، پێم وتن شتێکی وا بۆ کاك نۆشیروان ئامادەبکەن ئامادەیان کرد، رۆژکیان یەك تەنەکە( کوبە)ی زۆرخۆشمان بۆ هات ئەوکاتەی کوبەکان هاتن ئێمەنانمان خواردبوو، وامان پێباش بوو، ئێوارەبیخۆین ئێوارە خواردمان، هەموومان توشی تەسەمووم بووین، بەپەلە چوینە نەخۆشخانەی بالیسان لای د. زریان سەیربوو دوو برادەر لەگەڵ دوو کەس دەچونە نەخۆشخانە لە رێگا ئەوانیش بێ هۆش دەبوون، سەرەتا زۆرترساین پێمان وابوو دووژمن ژەهری بۆ تێ کردووین، خۆشبەختانە وادەرنەچوو تەنها کێشەکە کەونبوونی خواردنەکەبووە، ل سەر قوتابخانە دەنووستین، ئێوارە جووتیارێك کەرەکەی دینێتە نزیك مەقەڕمان دەی بەستیتەوە، برادەرێکمان ناوی نەدەین باشە سەعات یەکی شەو پاسەوان دەبێت لەهەمان کات لەسەرشەو نوێنی خۆی رادەکشێ بەخەبەریشە کەرەکە، لەبەرمیشولە پێی لەبەرد دەدات پیشی بەناڵ بووە، دەنگی ناڵەکەدێت، ئەوبرادەرەی خۆمان کە پاسەوان بوو وادەزانێت راکێشانی چەك بووە، دەست دەداتەچەك و هەریەدرێژبوون دەستی بەتەقەکرد روو لە ئاسمان هەر پێشمەرگەیە و لە خەو ڕادەپەری و دەستی بە تەقەکرد بەدەوروبەر منیش یەکێك بووم لەوان دواتر هیچ تەقە رووبووروومان نەدەهات تەقەمان راگرت، بەلایت چواردەوری خۆمان سەیرکرد بۆمان دەرکەوت ئەوکەرە ئەوبەزمەی نایتەوە پێم وابوو لەوکات وسات بوو مامۆستا جەمال بەکارەساتی سەیارە لە خوار گوندی بێراوە لە شەقامی گشتی وەرگەڕان و شەهید بوو خەسارەتێکی گەورەبوو.دواتر کاك نۆشیروان رێکخراوی بەجێپێشت، وەشەهید ئازاد هەورامیش ماوەیەك میوانمان بوو دواتر مەفرەزەیەکی رێکخراو کە لە حەوت پێشمەرگە پێك هاتبووین وەك حیمایە لەگەڵی رۆیشتین، بۆ ماوەی پانزە رۆژ لەگەڵی بووین واتە لە گوندی خەتێ بۆ قەراغ چوینە گوندێك ماڵی هونەرمەندی گەورەی کۆچکردووی کورد( محەمەد جەزا )لەو گوندە بوو داوەتی کردین جیسکێکی بۆ کوشتینەوە، وە محەمەد جەزا باسی داری سوتانی بۆ کردین، وتی: خەڵکی ئەوگوندە چەندان کیلۆمەتردوور دەکەونەو بۆ هێنانی داری سوتاندن منیش دەچمە ئەوگۆڕستانەی نزیك گوندی دار بۆخۆم دێنم، بە خەڵکی دەڵێم من خێری بۆ دەکەم ! کەسێك میوان بوو لەماڵی محەمەد جەزا تازە لەشار هاتبوو کە زانی ئەوەی لەگەڵ ئێمەیە و ئازاد هەورامیەو سەری لە شیعروئاواز و مۆسیقا دەردەچێت یەقەی کاك ئازادی گرتبوو، دەیان پرسیاری لێ دەکرد . کاك ئازادیش ماندوو بوو خەویشی دەهات، کابرا وازی لێنە دەهینا کاك ئازاد وتی برای بەرێز من وازم لە هەمووشت هێناوە لەبەر کاری پێشمەرگایەتی، ئەوەمحەمەد جەزاو پرسیارەکان لەو بکەی باشترە و محەمەد جەزا لەوبارەیەوە لەمن

بەتواناترە، کابرا وازی لەئازاد هەورامی هێناو کاك ئازادیش ئیتارێك لەنزیکی بوو دەستی دایەو وردە وردە بە چاوی نوقاو پەنجەی پێدادێناو دواتر نووست، بەیانی بەڕێکەوتین وردە وردە گوند بەگوند تاکو گوندی (خاوێ) دیارە پێش بگەینەگوندی خاوێ ئێمەی بردە سەرگۆڕی شەهید ئارام، کورتەیەکی لە ژیانی شەهید ئارام بۆ باس کردین باسی شێوەی شەهیدکردنی بۆکردین لەلایەن کوردەخۆفرۆشەکان شەهید کراوە، وتی برادەران ئێمە زوودرەنگ هەموومان دەمرین مردن لەپێناوی خاك ونشتیمان شەرەفێکی گەورەیە ڕۆژانە لە کوردستان بە سەدان کەس دەمرن ئە ماڵی خۆیان بە بێدەنگی دوای چەند ساڵێك ناوی ون دەبێت، لەلایەن کەسوکاریشی وەك ئەوە وایە هەر لە دایك نەبووبێت، بەڵام شەهید ئارام و شەهیدەکانی تریش بە نەمریی دەمینەوە و گەلەکەمان بەڕێزەوە یادیان دەکاتەوەو دەبنە مێژووی گەلەکەمان وەك ئەوجوانەمەرگە. هەرئەوەندە ئەمەوێ باسی ئازاد هەورامی بکەم ئەو جۆرە پیاوانە دەگمەنن شەهیدبوونی خەسارەتێکی گەورەبوو بۆ کورد کوردستان، لە گوندی خاوێ هەمووومانی ماچ کرد و گەڕاینەوە هەر تیپە و لە سنووری خۆی بە ڕێی دەکردین تاکوو هاتینەوە یەك مانگ تەواو بوو. لەو ماوەیەی ئێمە لەو سەفەرەدابووین پارتی بە هێزێکی زۆر لە قەندیل دابەزی هێزی ئێمەش پێشی لێگرت شەڕەکە زۆر سەخت بوو، چەندان پێشمەرگە شەهید بوون لە هەردوو لا. حەسۆمیرخان لەوێ کوژرا دواتر ئاودیوی ئێران بوونەوە، دواتر هێزێکی بەرەی جود خۆیان گەیاندە دۆڵی ئەوسکە شەڕ لە نێوانمان دروست بوو، دواتر ئەو هێزە پاشەکشەیان کرد دیارە لەو شەڕە کوژراو بریندار هەبوون لە نێوان ئێمەو ئەوان، بەڵام بۆ مێژوو هێزەکەی ئێمە دەستیان پاراست لە کوشتنیان، مەبەستی هێزەکەی ئێمە تەنها گەڕانەوەیان بوو بۆ شوێنی خۆیان ڕێش بە سەربازەکانی ڕژێم نەدرا بێنە ناو شەڕەکە وە ئەو شاهیدیە دەدەم چونکە خۆم لە ناو شەڕەکەبووم. هاتنیان بۆ پەکخستنی مفاوەزات بوو، دواتر مام جەلال بارەگای بردە گوندی خەتێ ڕژێم کەوتە پیلاندانان بۆ شەهیدکردنی فەرماندە سەربازیەکان، لەوانە مامەڕیشە و سەید کریم و چەندانی تر... لەهەمان کات بۆ تۆڵەی ئەوان هێزی ئێمەش خەڵکیان لەوان کوشت، وردە وردە متمانە لە نێوانمان بەرەو کەمی دەچوو ئەوەبوو بە شەڕی (دابان) کۆتایی پێ هات. شەڕ دەستی پێ کردەوە ڕژێم کەوتەوە پەلاماردان و بۆردمان و تۆپباران ڕۆژێکیان کۆپتەرێك هاتە ناوچەکەمان بانگەواز بۆ پێشمەرگە و هاوڵاتیان دەکرد کە خۆیان تەسلیم بکەنەوە، دەنگۆیەك لە ناوچەکە بڵاو بووەوە، گوایە دکتۆر کەمال خۆشناو تەسلیم بووتەوە، بە دواداچوونمان کرد ئەو

قسەیە ژنێك بلاوی كردبووەوە دكتۆر بەو هەواڵە زۆر تووڕەبوو. ئێمە لەناو كۆمەڵە تووشی دەردێكی كوشندە بووبووین سەرهەڵدانی ئالای شۆڕش لەلایەكی تر كادیرانی كوردستانی بەشێكیان تەمبەڵ و سارد بووبوونەوە، بەشێكیان تەسلیم بە ڕژێم بوونەوە ئالای شۆڕش كەبەشێكی زۆری كادیری بەرچاوبوون، لەپاڵیشیدا كادیرانی كوردستانی ناوچەكەی ئێمەش وا بوون ناوچەكانی تر نازانم سەیرەكە لەوەبوو بەشێك لەو كادیرانە كادیری دەقی فەلسەفەكان بوون، بۆ نموونە ململا نێی دكتۆر كەمال خۆشناویان دەكرد كە پیاوێكی دەرەبەگە و پیاوێكی برژوازیە و شۆڕش گێڕنییە ! هەزارو یەك ناوو ناتۆرەیان دەدیتەوە، دواتر جەنابیان تەسلیم بوونەوە دكتۆریش مەیدانی چۆڵ نەكرد، نەك هەرچۆڵی نەكرد، زۆربەی مەقەڕەكانی بالیسانیان بەجێ هیشت لەترسی بەردەوامی بۆردومانی تەیارەوتۆپ . دكتۆر كەمال تاكەمەقەڕ بوو بالیسانی چۆڵ نەدەكرد خۆی و پێشمەرگەكانی زۆر جار لەشەهید بوون نزیك دەبوونەوە دیارە حەزی نەدەكرد بڵێن بالیسان چۆڵ كراوە. زۆرجار بۆچون شتێكە و واقیع شتێكی ترە، ئێمە بە هیچ شتێكی برادەرانی پارتی رازی نەبووین، بەڵام لەزۆربەی شتەكان وردە وردە ئەوەی پارتی كردوویەتی ئێمەش كردوومانە، زۆر و كەم من وەك جووتیارێك كە تەماشا دەكەم ململانێی هەموو پارتەسیاسیەكانی ناوەخۆ لەگەڵ یەكتریش لە ململانێدان لەسەر خۆ دەرخستن پلەوپایەبەردەوام جیابوونەوە بەردەوام بەرەو لاوازبوون من وەك كوڕەجووتیارێك كە تەماشای وەزعی كوردستان دەكەم پێم وایە پێویستە ڕێز لە بنەماڵەی بارزانی بگرین لەپیناوی گەیشتنی كورد بەمافی چارەنووس، واتە دۆستایەتیان و ململانەیان من وای دەبینم كورد پێوستی بەو بنەماڵەیە لەو قۆناغە. ڕێز لە هەندێك تایبەتمەندیان بگیرێت مەترسی ئەوەیان لا نەمینێت، كە هیزێك هەیە ئەیەوێت لە ناویان ببات یان پەراگەند بكرێن، ئەوانیش مرووئەت بنوێنن خۆیان لەگەڵ سەردەم بگونجێنن، بەهەمووومان سیستەمی سیاسی لە كوردستان پیادەبكرێت گەلیش واز لە سۆفیاتی بێنێت و بەرژەوندی گەل و وڵات گەورەتربێت، لەلامان لە هەمووشتێك ئەگەر تەماشای جووتیارانی خۆمان بكەین لە گوندەكان كوكن لەسەر بەرژەوەندی گوندی كە خزمەتی هەمووان دەكات ئەوەیان سیستەمی خۆمانە سەرباری دەیان كێشە كۆمەڵایەتیەكانی نێوخۆیان لەبەرژەوەندیی گوند یەك بڕیاربووینە بەهاران بانگ رادیراو بەیانی جۆگەهێنانە هەمووگوند بەشدار دەبوو، لە پاككردنەوەی جۆگە سەرەكیەكان، لە جۆگە لاوەكیەكان، هەركەس بە ئارەزووی خۆ جۆگەی پاك دەكردەوە، لەجۆگە سەرەكییەكان دۆست و دوژمن پێكەوە كاریان لە جۆگە دەكرد،

بەبێ کێشە و چاویان لە یەك سۆر نەدەکردەوە ئەوەنەرێتی خۆمان بوو، ئێمە کێشەیەکی تریشمان هەیە، بە دەگمەن لەناو کورد کەسێك دەست ناکەوێت بڵێت من ئەوکارەم پێناکرێت بیدەنە فلان کەس، لە من بەتواناترە شارەزاترە، نەخێر ئێمەی کورد بە وەرەسە هەموومان فەیلەسووفین بە قسە. دەشکرێت ئەوەشیان گرینگترین هۆکار بێت کەوا کورد دواکەوتوە لە بنیاتنانی دەوڵەتی خۆی لەرۆژهەڵاتی ناوەراست کە بەو رێژەیە گەلێك نابینی خاوەنی دەوڵەتی خۆی نەبێت پەنا بەخودا لێرە بەولاوە گوێ لەیکتر دەگرین و رێز بۆیەکتر دادەنێین بۆئەوەی دووژمنانمان کوێر بن.

*** *** ***

وەزعی ناوچەکەمان زۆر بەرەو خراپوون دەچوو رژێم بێتواتەی گرتەوە ئەو برادەرەی پاراستنی بێتواتەی لەئەستۆ دابوو کەمتەرخەم بوو، وەزعی دۆڵی شاورەش لە ناوچەکەی ئێمە باشتر نەبوو بەڵکوو خراپ تربوو، بەشی زۆری کادیرانی ئاش دەست گیر کران و هەندێکیش رایان کرد بەشێك لە کادیرانی خۆیان بە کوردستانی دەزانی تەسلیم بوونەوە دیارە من زۆربەیان دەناسم. بێسەر و بەریەکی زۆر روویدا لەوکات و ساتە دیارە رێکخراوی پێنج گۆرا، بووە رێکخراوی دوو، شەهید عەبدولرەزاق لێپرسراوی رێکخراو بوو، جیگرەکانی عەلی بەرزنجە و ئەگەر هەڵەنەبم کاك موراد یش جێگربوو، مەقەری لە دۆڵی شاورە بوو، لە کادیرە دیار و بەرچاوەکانی ئەوکات مامۆستاسەیفەدین کاك رێبین و تەلعەت و چەند برادەریکی تر ئەوانی تر تەسلیم بوونەوە، ناویان نادەین، کادیرەکانمان خراپیان بەسەر هات ئاشەکان بوونە سێ بەش. بەشێکی کەم تەسلیم بوونەوە بەشێك گیران دەست بەسەرکران، بەشێك رایان کرد لەترسان ناهەقیش نەبوون،لەو بەشەی گیران هەندێکیان زۆر ئەشکەنجەدران نموونەی رەشید کونەفلوسەیی زۆر ئەشکەنجە درا . کوردستانەکانیش بەشی زۆریان تەسلیم بوونەوە، لە هەموویان فێرزانتر تلعەت بوو، پیاوێکی تێکۆشەرومەیدانی دەست و دەموداوێن پاك بوو. بێسەروبەریەکی زۆر رووی لەناوچەکە کرد، کیشەیەکی تریشمان کاك کۆسرەت بەلای سماقوری و هەولێرە وە خەریك بوو. کوێستانیش بە هەموو لایکەوە خەریك بو، کیشەکان ئەوەندە لە پرتەقینەوە تێکهەڵکێش بوون. کوێستانیش سەیتەرەی پێ ناکرا، شەهید عەبدول رەزاقیش هەرچەندە پیاوێکی تێکۆشەر و وشیار و خۆراگربوو، دیارە تەجروبەی خەباتی شاخی نەبوو یان کێشەکان لەپڕ زۆر بە سەریەك کەڵەکە بوون ئەوی یارمەتی ئەوپیاوەیان دەدا کۆمەڵێك کادیری قاڵبووەوەی ناو شۆرش بوون وەك

مامۆستاسیفەدین وکاك ڕێبین و تەلعت و هەندێکی تر بەتایبەتی لە ڕووی ئیدارییەوە، کەرتی ڕێکخستنی ڕواندز پەیوەنیکی فراوانی لەناوڕژێم دروست کردبوو لەسیساوە هەریر وباویان و خرواتان و خەلیفان باتاسە و زۆرشوێنی تر دۆست و لاینگرو چەکدارەکانی پەیوەندیان بە کەرتی ڕواندز هەبوو کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر ئیدارەی هێزی پێشمەرگە، لەوکات وسات کاك نۆشیروان لە ناوچەکەمان پەیدا بوو، بەهاتنی جەنابی ڕژێم کەوتە بۆردمانێکی سەختی ناوچەکە کە بۆردومانی وامان نەدیتبوو دار و بەردی دەسوتاند، بەڕۆژ تەیارەو بەشەو ڕۆژ تۆپباران بەردەوام بوو تەواوی گوندەکان ڕوویان لە گوندەکانی دولی ئالانە کرد گوندەکان خەریکی چۆل کردن بوون کاك نۆشیروان هێزی پێشمەرگەی لە ناوچەکەدا تۆزێك ڕێك خستەوە ویستی بچێتە مەلەکان بۆ ئەوەی نزیك بێتەوە لە دۆلی شاورە چونکە دۆلی شاورە بێسەروبەریەکی زۆری تێکەوت بوو، لە گوندی توتمە کەسێك وەك دەلیل دەبات لەڕێگا پێی دەلێت باوکم شارەزای، کابراش دەلێت: بەلێ زۆریش، کابرا بەو شەوە سەختە کاك نۆشیروان و ئەو هێزەی لەگەلی بوو لە ناوشاخێکی سەخت عاسیێ دەکات کاك نۆشیروان زۆر لێی پەست دەبێت هەندێك جوێنی پێ دەدات، بەکابرای توتمەیی دەلێت ئەوگوندە شێخ وەسانان نییە دەلێت: بەلێ هەوە بانگی پێشمەرگەیەك دەکات دەلێت برۆ ئەو گوندە کوڕێکی لێیە بەناوی فەقێ بۆم بێنە، من لەپێش مالی خۆم دانیشت بووم کەسێك لەگەل برادەرێکی گوندەکەمان پەیدابوون دوای سلاو وتی تۆ فەقێی وتم بەلێ وتی: وەرە دوو قسەم پێی، تۆزێك دوور کەوتینەوە وتی: کاکە کاك نۆشیروان و هێزەکەی لەو شاخە گیریان خواردوە دەمانەوێ بچینە مەلەکان وتم باشە پەلە مەکەن داوام لە برادەرانی گوندی کرد ئاو لە سەر ڕێگا دابنێن بۆ ئەو هێزە بەرێکەوتین و تا ئێمەنزیك بووینەوە لەکاك نوەشیروان ئەوانیش تۆزێك لەشاخ دابەزین هێزەکەم هێنا قەراخی گوندی و ئاویان خواردەوە و مەتارەیان پڕکردن بە ڕێ کەوتین لەو جەولەیە مام ڕۆستەمیشی لەگەلێ بوو، بە جوانی ئەو هێزەم گەیاندە مەلەکان کاك نۆشیروان لە ڕێگا بە برادەرانی وت ئەی باوکم ئەوە دەلیلە، لە شوێنێك دانیشتین کاك نۆشیروان وتی فەقێ وتم: بەلێ کاك نۆشروان. وتی وەزعی سۆفی مستەفاچۆنە، وتم زۆرباشە وتم سۆفی مستەفا لەکوێ دەناسی وتی وازبێنە و ئاگات لەسۆفی مستەفابێت، پیاوێکی باشە، دیارە دواتر زانیم کاك نۆشیروان سۆفی مستەفای بەکارهێناوە نامەی پێناردوون بۆ دۆست وبرادەران، لەشارەکان دیارە سۆفی مستەفا پیاوێکی نووراني و ردێنێکی جوان ودوو مەندیلی جوانی سپی لەسەری دەناو، دەفێکی هەلدەگرت ڕژێم

گومانی لێ نەدەکرد ،ئەگەرباسی ئەو شەوە بکەین دنیا خراپوون بوو بە هەزاران گولەتۆپ بەر ناوچەکەمان کەوت بەوشەوە دەنگی تۆپ و دەنگی ئاژەڵ و گریان و هاواری منداڵان تێکەڵ بووبوو بەوشەوە خەڵك خەریکی راکردن بوون،گلەیشیان لێ ناکرا رژێم دارو بەردی دە سوتاند بەیانی من هاتمەوە و ناوچەکەمان بەرەو چۆڵ بوون، دەچوو ئێوارە چومەوە رێکخراو، شەهید عەبدولرەزاق سیفەتی سەرکردەی زۆرتێدابوون پیاوێکی بەبەژن و باڵا تازاو چاونەترس و خاوەن بڕیاری هێمن و لەسەرخۆ بوو، حەسەن کوێستانی خۆی لە بەرەی شەڕدابوو لە سەروی گوندی شیە . نامەوێ باسی حەسەن کوێستانی بکەم باسکردنی لە سەرووی توانای منە کەسێکی مەشوورە بۆ ڕۆژی سێیەم من و شەهید مەلاسەعید خەتی کە کادیرێکی هەرە دڵسۆزی ناوچەکەمان بوو تازوقە و مەلەباتمان بۆ کاك نۆشیروان برد لە ڕێگا بە شە هید مەلا سەعیدم وت مەلاسەعید من هەست بە کێشەیەکی گەورەی ناو رێکخراو دەکەم پێم باشە بە کاك نۆشیروان بڵێم دیارە مەسەلەکەم بۆ باس کرد وتی من بەباشی نازانم ئەترسم بە خراپ بە سەرت دا بشکێتەوە،خۆشناوانە وتم قەیو جەفت کەچوینەلای کاك نۆشیروان لە دەرەوە دەنگی کاك نۆشیروان گوێ بیست دەبووین زۆر قسەی ناشیرینی بە فەرماندەیەکی سەربازی دەدا، ناحەقیش نەبوو چونکە ئەو سەرکردە بەبێ شەهید و بریندار ناوچەیەکی زۆری لە دەست دابوو کە بەخوێنێکی زۆر رزگار کرابوو کابرا ڕۆیی منیش چومە لای وتم سەلام دوای چاك و چۆنی وتم کاك نۆشیروان دووبارە تازوقەمان بۆت هێناوە، هەندێك ئیشم پێتە وتی فەقێ گوونت تەقێ وەختم نیە کەهاتمەوە رێکخراو هەرکارێکت هەبوو بەچاوان، منیش وازمهێنا دەمزانی کاك نۆشیروان وەزعی دەروونی باش نەبوو هەزارویەك کێشەی هەبوو وەك کێشەی ئاش و کوردستانیەکان و تەسلیم بوونەوەی هاوڕیان و لەدەست دانی دۆڵی شاورەو بێتواتەو پەلاماردانی رژێم و ڕاکردنی جوتیاران لە ناوچەرزگارکراوەکان و خەمی چەك و تەقەمەنی و زۆر زۆری تر. گەڕاینەوە گوندی توتمە بۆڕۆژی دواترلەسەروی گوندی شیە کوێستانیم دیتەوە نامەیەکی عبدالرزاقم گەیاندێ دواتر ئەو کێشەی من زانی بووم بە کوێستانیم گوت کوێستانی ماوەیەك داماو زۆر پێی تێك چو منیش گەڕامەوە دوای چەند ڕۆژێك دیارە کوێستانی کێشەکە لەگەڵ شەهید عبدولرزاق باس کردبوو شەهید عبدالرزاق منی بانگ کرد و دەیان قسەی ناشیرنی پێ گوتم، تاوانی ئاشی دایە پاڵم و مەترسیم لێ پەیدابوو دەست بە سەر کرام لای ئێوارە برادەرێك مەجالی دام و رام کرد چوومە لای دکتۆر زریان و مەسەلەکەم بە درێژی بۆ باس

**کرد، وتم من دەڕۆم وتی مەڕۆ تاکوو من نەکوژرێم ناهێڵم کەس دەستت بۆ ببات، وتم نا دکتۆر کێشەی خۆم توشی تۆی ناکەم وتی خۆت توشی خیانەت مەکە وتم مەترسێ خیانەت ناکەم، بەڵام گەر منیان کوشت تۆ مەسەلەکە بزانە،من ئاش نیم ئەوکێشەی بۆم باس کردی راستیەو بۆختانی پێناکەم .**

**ڕۆیشتم چومە گوندی بێڕۆ لای برادەرێك نامەیکم بۆ شەهید عەبدوڵڵا رەزاق نارد بەشێك لەنامەکە ئەوەبوو من ئاش نیم ئەو ڕووداوەی ناو رێکخراویش راستیەکە پێت خۆش بێت یان پێت ناخۆشبێت، من دەمزانی بەرنامەیەك هەیە دەیانەوێت بمکوژن هیچ نەبێت ئەو مەسەلەیە پەردەپۆش بکرێت، چونکە کێشەکە بە گران لەسەر زۆرکەس دەوەستا، منیش تێدا ئیهانەکرابووم و دەربەدەرکرابووم و منیش لەسەر ئەوڕووداوە پێم دادەگرت خۆشناوانە، دوای شەش مانگ بە هەژاری و خۆشاردنەوە لە لەولاو لەولا و دابڕانم لە هێزی پێشمەرگە لە ماوەی ئەو شەش مانگە من ناوێرام لەماڵی خۆم بنوم لەترسی گرتن و کوشتن زۆر بێزار بووم شەوێکیان چوومە لای مامۆستا بەکرو سەید مەجید مەقەڕیان لە سەروی گوندی بێڕۆ بوو، وتم: مامۆستا بەکر جەنابت کێشەکەم دەزانی ماوەی شەش مانگە لە خۆشاردنەوەدامە، تاقەتم نەماوە کێشەکەم چارە نەکەن من دەڕۆم، وتی: چیت بۆ بکەم ؟ وتم کاك نۆشیروان ئاگاداربکەوە لەکێشەکەی من، ئەگەر کاك نۆشیروان چارەم دەکات باشە ئەگەرنا عیلاجی خۆم دەکەم، مەبەستم ئەوەبوو من بەزۆر کرایمە ئاش واباشە ئەگەر کیشەکەم چارەنەکەن بچمە لای برادەرانی ئاش ئەوجارەیان بەڕاستی ببمەئاش، دیار بوو مامۆستا بەکر لە ڕێگای سەید مەجید کەجیهازی لابوو بروسکەیەك بۆ کاك نۆشیروان دەکات لەبارەی کێشەی من دوای چەند ڕۆژێك کاك نۆشیروان بروسکەیەك بۆ حاکم شۆڕش دەکات ئاگاداری کردبووەوە بە حاکم شۆڕشی راگەیاند بوو فەقێ شێخ وەسانی راست دەکات پێش ئەوەی (...... ) ببێتەپێشمەرگە من مەعلووماتم هەبووە لەسەر ئەوپیاوە فەقێ راست دەکات ( .........) بگرن بیدەنە دادگای شۆڕش ) من لەبەر مەشغوول بوونم لەبیرم چو بوو بەنەرمونیانی لێکۆڵینەوە لەگەڵ فەقێ شێخ وەسانی بکەن و رێزی بگرن، کێشە کە لە بەرژەوەندی من دا شکایەوە، خوا مەلا بەختیار بگرێ پاك بوومەوە لە ئاش . هەرچەندە بەشێکی زۆر لە ئاشەکان برادەرم بوون، بەڵام من ئاش نەبووم بەزۆر کرابوومە ئاش، دیارە پێش ئەو ڕووداوەش گومانی ئاش لە سەرمن هەبوو، یەکێك لەو گومانانەی لەمن دەکرا کەئاش بم: لە رێکخراو بووم پێشمەرگەیەکی سادەوساویلکەمان هەبوو، بەناوی برایم برنۆ خەرکی دەشتێ**

هەولێرێ  بوو، دوو برادەری خەرکی بێتواتەمان لەلا بوون، بە ئاش تۆمەت بارکرا بوون، دەست بەسەر بوون، یەکێکیان بە ناوی ئازاد بوو، ئەوەی ترناوم لەبیر نەماوە  برایم برنۆ، پێی رائەبواردن و ئیهانەی دەکردن، منیش وتم برایم ئەوانە لەمستەوای تۆ نین پیاوی رۆشنبیر و تێکۆشەرن بووبەشەڕمان  لەسەر ئەوبرادەرانە ئەومەسەلەیەش ڕوویدا شەڕەکەمان گەیشتەوە شەهید عبدالرزاق ، مەلا کەرت گایە لەگوینە! هەر چەندە ئاش بوون تاوان نەبوو، برادەرانی کۆمەڵەبەتاوانیان دەزانی، لەو ماوەیەی من لە خۆشاردنەوەدا بووم،  فشارێکی  زۆر لەسەر برادەرانی ئاش بوو، لێدان سجنی  ئینفرادی  شکاندن و سوکایەتی پێکردن، پێم باش نیە ناویان بێنم هەموویان دەناسم چیان پێ کرا .

دەکرێت دوو پرسیار لەبەرێز کاك نۆشیروان بکرێت، بۆچی جیابوونەوەی ئاش تاوان بوو ؟ بۆچی ئیهانەکران  ؟ بۆچی بەبێ پرسی زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵە ڕەنجدەرانی کوردستان هەڵوەشایەوە؟ کە گەورەترین ڕێکخراو  و پاکترین ڕێکخراو و ئازاترین ڕێکخرا و بووە لەمێژووی گەلەکەمان؟ لەبەرگری لەمانەوەی گەل و وڵات، دیسان لەناو زۆربەی ئەندامانی یەکێتی کاك نۆشیروان  ڕێزی تایبەتی هەبوو  زۆرشتی زۆرگەورە و محالی لێ چاوەڕێ دەکرا. دووبارە بەبێ ئەوەی پرس بەکەس بکات لەیەکێتی جیابووەوە نازانم کاك نۆشیروان بۆ وادەکات؟ ئەکرێت من تێی نەگەم و ئێستاش لەناویەکێتی کاك نۆشیروان خۆشەویستە، پێویستە ئەوەبزانێت ئەگەر دۆستایەتی یەکێتی نەکات بە هیچ شێوەیەك ناکرێت دووژمنایەتی یەکێتی بکات، دووژمنایەتی  یەکێتی وایە بچێتە سەرداریك لەخوارخۆی دار ببڕیەوە  وەك مەلای مەشوور !! کەگ ڕمانی تێدانیە خۆشی دەکەوێت. دیارە ئەو قسانەی من لەخۆشەویستییە  بۆ کاك نۆشیروان.

***  ***  ***

ناوچەکەمان وردە وردە هێمن بووەوە و بەشێکی باش خەڵك هاتەوە گوندەکان. بەڵام دواتر ناوچەکەمان  بەرەو ئاڵۆزی  دەچو  بەتایبەتی بەهاتنی(کاك  سامان گەرمیانی) بەسەدان  کەسی گرت  و خستنیە بەندیخانەی  گوندی خەتێ، لەگیراوەکان  ئامۆزای جاش برای  جاش  باوکی جاش کوڕە خزمی جاش، لە کەسوکاری جاشەکان  چەندان ئەندامودۆست لایەنگری خۆمان بەند کرابوون لەوانە ئەندامی کۆمەڵەی  تێدابوو، نموونەی  کاکۆ تەها کانی بەردی  کە لە(١٩٧٩) کۆمەڵەبوو لەسەر براێکی خۆی گیرابوو  هەر بەندێك  دینارێك و نیوی لێ وەردەگیرا بۆ خواردن ئەوە بڕیارە قرەقوشیەکەی  کاك سامان گەرمیانی بوو، لە خۆشناوەتی خەریك بوو خۆشناوەتی

وێران بێت. کاك سامان ڕەچاوی تایبەتمەندی خۆشناوەتی ناکرد، دواتر مام جەلال بەو مەسەلەی زانی و شەهیدی سەرکردە سابر ڕەسوولی نارده ناوچەکە ئەوکات کاك سابیر سەرتیپی (٢١) کەرکووك بوو وە بەکاك سابیری وتبوو چۆنت پێدەکرێت ناوچەکە هێمن بکەوە، ئەوکاتەی من پێشمەرگەبووم لە تیپی (٨٣)ی هەوریێ شەهید کاك حەسەن سەرتیپ بوو ناسراو بە (حەسەنە خەپە)پێشڕەو ڕابەر سیاسیی بوو بەداخەوە بەدەستێکی خاین لە ئالانە شەهید کران ..شەهید پێشڕەو نموونەی جوانی بوو لە ناو هێزی پێشمەرگە، دیارە دوای شەهید بوونی ئەوان کاك سابیر هاتە ناوچەکەمان ڕۆژێکیان کاك سابیر بە دوایدا ناردم وتی هاوڕێ فەقێ کێت پێ باشە ڕەوانەی بێتواتەی بکەم بۆلای ماڵی ئەنوەر بەگ؟ منیش دوای بیر کردنەوە وتم کاك سابیر مام خالید مێرگەسەری (خالیدە گەورە) باشە، بەدوای دانارد و ڕەوانەی بێتواتەی کرد دیاربوو ڕێك کەوتن لەگەڵ بێتواتە سەری گرت چۆن ڕێك کەوتن ئەوە کاری من نەبوو. ناوچەکەمان هێمن بووەوە.

ڕۆژێکیان کاك سابیر دەچێتە گوندی خەتێ لە نزیك بەندیخانەی خەتێ لەبن دارەکان کەسێکی کەم ئەندام دەبینێت لێی دەپرسی مامە چی دەکەی لێرە کابرادەڵێت سجنکراوم کاك سابیر دەڵێت: بۆچی سجنی؟ کابرا دەڵێت: برازام جاشە. کاك سابیر دەڵێت: جاچ پەیوەندی بەتوە هەیە؟ کابرا دەڵێت منیش نازانم! هەرمنیش نیم زیاتر لە دووسەد کەس زیاترین سجنکراوین کاك سابیر دەڵێت: بەقسەی کێ دەڵێت نازانم؟ کاك سابیر دەچێتەکەرتی سجن بانگی شەهید بەهرام دەکات و دەڵێت: بەهرام ئەو خەڵکەچییە لێرە سجن وکردینە بەقسەی کێ ئەوکارەت کردوە؟ شەهید بەهرام دەڵێت بڕیاری کاك سامان ومەڵبەندە،کاك سابیر دەڵێت دەرگایان لێبەکەوە ئازادیان کە. بەڵێ هەمووی ئازاد کردن کاك سابیر پیاوێکی ئازاوبەئەدەب و خۆڕاگر و دەستپاك بوو، تۆزێك ڕقەستور بوو، زۆر ڕقی لەکەسی ترسنۆکی زمان درێژ بوو. لەگەڵ (شەهید علی وەیسی) ماوەی چەند ساڵ پێکەوەبوون نێوانیان زۆر خۆش بوو کاك سابیر لە خۆشناوەتی خۆشەوستی خەڵکی بوو کاك سابیر پیاوێکی باڵا بەرزو پۆشتەو بە هەیبەت بوو لەگەڵ کادیران نە دەگونجا ناهەقیش نەبوو کادیرەکانمان بەشێکیان زۆر توندڕەوبوون،ئەو توندڕەویە مێژوویەکی دوورو درێژی هەیە وەك لەناو چەپەکان لەساڵی (١٩٥٨)کادیرەتوندڕەوەکانی پارتی ساڵانی (١٩٦١) نموونەی عەبدوڵلا ئیسماعیل، ئەوانەی ئێمەش واتە لەناوکۆمەڵەش توندڕەوی زۆر بوو کەلەگەڵ بارو زروفە کە ناگونجا زۆرجار توند ڕەوی لە دڵسۆزی رووی داوە لە سنوور دەرچووە، کاك

سابیر منی زۆر خۆش دەویست چونکە لە کارەساتی جەلکان لەپایزی (١٩٨٠) کەبریندار بوو زۆر هاوکاریم کردبوو، جێگری کاک سابیر شەهید عەلی وەیسی بوو، عەلی وەیسی لە کردار و ڕەفتار نەرمونیانی و دڵسۆزی زۆر شتی تر، لە ئازاد هەورامی دەچوو وەك دوانەبن وابوون ڕۆژێکیان (کاك حەسەن کوێستانی) نامەیەکی بۆ (سابیر ڕەسوول) نارد، دیار بوو نامەکەی شکاند و خوێندیەوە و دوای کەمێك وتی برادەران وەرن ئەو نامەیەی کوێستانی بۆتان بخوێنمەوە ئێمەش دەورمان لێدا نامەکە بەو شێوەیە بوو : بەرێز کاك سابیر خەڵکی ناوچەکە بەلێشاو ناوچەکە چۆڵ دەکەن بەرەو سنووری ڕژێم دەچن، ئەگەر بکرێت مەفرەزەیەك بنێریە سەر ڕێگای زینەتیر وابکەی خەڵك نەڕوا ( برات کوێستانی) دوای خوێندنەوە کاك سابیر بە دەنگێکی بەرز پێکەنی وتی جەنابی کوێستانی ئەو کاتە من نایەڵم خەڵك بڕوات کە بتوانم بیان پارێزم، من نەدەتوانم بەرگری تەیارەی لێ بکەم و نەدەتوانم لە تۆپ بیپارێزم. نە لە پەلاماردان ئاخر چۆن ڕێی ڕۆیشتن لە خەڵکی بگرم هەر لەوێ بڕیاری دا خەڵکینە بڕۆن خواتان لەگەڵ.

لەو کەینوبەینە کاك کۆسرەت هاتە ناوچەکەمان بەهاتنی کاك کۆسرەت و هیممەتی هەموو لایەك هێزی پێشمەرگە ڕێکخراو لە جارانیش باشتر... چالاکیەکانیش وردە وردە لە گرتنی ڕەبایە بەرەو چالاکی گەورە گەورە دەچوین وەك گرتنی سەری ڕەش و گرتنی دێگەرە . زستان بوو زۆر سەرمابوو ڕژێم بە بەرنامەیەکی داڕێژراو لە هەموو لایەك پەلاماری سماقوڵیدا شەڕەکە زۆر دژواربوو هێزی پێشمەرگە بەرگریەکی باشی کرد شەڕەکە درێژەی کێشا گرتنی مەڵبەندی چوار مەترسی کەوتەسەر،لە هەموو لایەك پەلامار درا بە هیممەتی برادەران و هیممەتی (کاك کۆسرەت)خۆڕاگریەکی باش کرا، خەسارەتێکی گەورە بەر دووژمن کەوت داواکرا کە هێزێکی ئێمە لە لای گوندی مەندێر دووژمن شەق بکات و برادەرانی مەڵبەند، پاشەکشە بکەن و بێنە سنووری ئێمە هێزێکی باشی ئێمە چوینە دەورو بەری مەندێرو کونەفنوسە خەریکی بەرنامە بووین بۆ شەق کردنی ڕژێم هەندێك لەچەك دارانی ڕژێم، ناوچەیەکیان چۆڵ کرد و پێم وایە ماڵی عوسمان بەگی شەقڵاوە بوون ئەو زانیاریە بەرێز (کاك کۆسرەت) باشتر دەزانێت برادەرانمان بەبێ شەڕ نەجاتیان بوو ئێمەش گەڕاینەوە کەسێکی ناوچەکەمان لە مەڵبەندی چوار دەست گیرکرا کەسێکیش قالەفەرەجی کوشت بوو، ئەو کەسەی قالەی کوشت بوو پێش ئەوەی قالە بکوژرێ،لە دیوەخانی قالە ئەو کوڕەی ناوچەکەمان سەردانی قالە دەکات و باسی زۆر شت دەکات

کەکردویەتی  لە خزمەتی ڕژێم بکوژرێ  قالە ناونیشانی وەردەگرێ ئاگاداری مەڵبەندی  چوار دەکاتەوە  کە کوڕێکی فلان شوێن وای کردوەو وای کردووە  مەڵبەند لە وەڵام  دەڵێن  ئەو کوڕەمان لە بەردەستە دواترئەوکەسەیان ڕەوانەی بەندیخانەی خەتێ کرا ئێوارەیەکیان کاك سابیر بانگی من و  شەهید جووتار کۆیی کرد وتی بەیانی بڕۆنە بەندیخانەی خەتێ، کوڕێك لە وێیە بەناوی فلان ئەمری ڕمکردنی دەرچووە لە پەناپەك  بیکوژن بەیانی  چووین کە داوامان  کرد وتیان  ئەم شەو یەکێك لە پێشمەرگەکان  لەکاتی  یەشك گرتن  لەگەڵ  ئەو کەسە ڕایان کردووە  پێشمەرگەکە ناوی  ......بوو  خەرکی گوندی  چیوە بوو ناوبراو  بووەجاش  شەرێکیان برادەرانی پارتی لەشەقڵاوە دەستگیری دەکەن دواتر ڕادەستی یەکێتی  کراو کوژرا.

شەڕی کوڕەك ئێمەی پێشمەرگە هەرئەوەندمان زانی مەلەکان پڕبوو لەپاسدار  ڕێژەیان زۆربوو بەژمارە  نازانم چەند بوون  ڕۆژێکیان کاك  کۆسرەت من و کۆمەڵێك  پێشمەرگەی  بەتەراکتۆر ڕەوانەی شیەی سەروکرد وتی بڕۆن پاسدار بێنن ئێمەش پاسدارمان هێنا وردە وردە لەدوای مەغریب  خۆمان  لە  ئالانەدیتەوە   هێزەکان  دابەش  کران، ئەوەی وەبیرمە  عەولا  بۆرو پێشمەرگەکانی  بۆ  دەوروبەری  گوندی  شەرکان  داندران  پاسدارەکانیش    بۆ  کوڕەك بەدەلیلەوە سەعیدی حەمەزیاد بۆ قۆڵی ڕواندز لەگەڵ ڕێژەیکی تیپەکان  هەر ئەوەندەم وەبیرە هێزەکان جولان  من پێم وایە کاك  کۆسرەت  پیلانێکی هەبوو بۆئەوەی پاسدارەکان شکست بخۆن نەتوانن کوڕەك بگرن پاسدارەکان  نیوەی ڕێگایان مابوو عەولا بۆر و  برادەرانی  کردیانە هەرا ڕژێمیان بە خەبەر هێنا   چەندان دەبابەیان سوتاند، کۆمەڵێك سەربازیان کوشت... برادەرانی سۆرانیش خراپ تر ڕژێم بەخەبەرهات یان بەخەبەریان هێنا دواتر پاسدارانیش  لەدورەوە دەستیان بە تەقەکرد، ڕژێم بەریووەگیانی پاسداران با بەدەواری شڕی نەکردبێ، برادەرانی خۆمان هاتنەوە پاسدارەکانیش   زۆر بەبێسەروبەری بەهەڵاتن گەڕانەوە، ئێمەی پێشمەرگە پێمان خۆش بوو پاسدارەکان توشی شکەست بوون . پێشمەرگەکانی یەکێتی  ئەوکات و ئێستاش  بەیەك چاو سەیری هەموودووژمنانی کورد دەکەین، پێشمان خۆش بوو پاسداران توشی شکەست بوون، چونکە لە داستانی ڕزگاری ئێران فێڵێکی گەورەی لەگەڵ کردین، لەشەڕی داستانی ڕزگاری لەگەڵ ئێران قەول وابوو بە هاوکاری لە ماوەت ڕژێم ڕامارین تاکو سلێمانی ئەوەبوو یەکێتی ناوچەیەکی زۆری لە دووژمن پاك کردەوە ئێران بەئەنقەست نەك هەر هاوکاری  نەکردین شەڕیشی لەگەڵ

ڕژێمی عیاق ڕاگرت. دیارە کاك کۆسرەت و مێژووی کاك کۆسرەت پێوست بەباسکردن ناکات لەلایەن من کاك کۆسرەت لەوەناسراوترە من باسی بکەم بەدرێژی ئەوەندە دەزانم بەهاتنە دەرەوەی کاك کۆسرەت ئیدارەمان باشتر بوو تیپەکان بەرەوگەشەکردن چون چالاکیەکان گەورەتربوون، کۆمەڵێك کەموکورتی پەیدابیوون لەسەردەستی کادیرانی ئاش و کوردستانییەتەمبەلەکان وەدوایش تەسلیم بوونەوەیان. کاك کۆسرەت ئەوبۆشاییەی نەهێشت بەڵکوو گەرموگرتریش بوو. کاك کۆسرەت ئیدارەی ناوچەکەی ئێمەو مەڵبەندی (٣) دەدا، مەقەڕمان گواستەوە بالیسان بڕیار درا، کە دەست بە چالاکی بکەین چەند وردە چالاکیمان لە بیتوێن و دەشتی هەریر ئەنجام دا ئەوەی دەشتی هەریر کەرتی یەك دەستی بالایان هەبوو کاك رزگارهاودیانی و هەڤاڵەکانی وەئەوەی بیتوێن کەرتی تیپ بوو، بڕیاردرا تەواوی تیپ بەشداری چالاکییەکی گەورە بکات ئەوەبوو هێزەکەمان جوو بەرەو دەشتی هەریر بەرەو ماوەران چوین لەوێ بڕیار درا پەلاماری چەند ڕەبایەك بدرێت لە دەوروبەری گوندی کاوانیان کە لە نزیك شەقڵاوەیە، دوای سەرکەوتنمان لە بەرام بەر ماوەران وابەپەسند زاندرا، چالاکیەکە نەکرێت گەڕاینەوە بەرەو گوندی میاوە و چونەوەمان بۆ گوندی بەرەکە، دیارە هەڵەیەکی گەورەمان کرد ئەو هێزە زۆرە گەڕانمان بەوناوچە فراوانە دوژمن هەستی پێ کردبووین ئەوان کەوتبوونە ئامادەباشی دواتر بەرەو گوندی گەرەوان چوین بەرنامە داندرا کە پەلاماری قوپی سۆری میاوە بدەین بەبێ ئەوەی شارەزابین لەورەبایە ئەو ڕەبایە زۆر سەخت و دژواربوو بەشی زۆری دەستەی پەلامار ئامرکەرت و جێگرەکان بوون وەك (شەهید علی وەیسی شەهید عومەر زێوەی و شەهید عەزیز مەلەکی و شەهید ڕەحمان شێرەی وشەهید ئەحمەد هەرتەلی و شەهید یاسین شێخ وەسانی و شەهید خدر ئەندێکی ئەو شەهیدانە جگە لەعلی وەیسی دەستەی هجوم بوون وشەهید بوون دیارە ئەوانی تر کە لەدەستەی هجوم بوون شەهید عەزەی داودی رزگار هاو دیانی حسێن بەشان و شەهیدئەحمەد شێخ وەسانی زۆری تر کەلەبیرم نەماون دووکەمینیشمان هەبوون لەدەوروبەری ڕەبایەکەمینێکیان سەنگەر بوو ئەوەی تر تێکەڵێو بووین من لەوکەمینەبووم شەر دەستی پێکرد دوای ماوەیەك ڕەبایەکەگیرا دیارە ئەوان ئاگادار بوون زوو دەستی خۆیان وەشاند کۆمەڵێك شەهیدو بریندارمان داوەك شەهید یاسین شێخ وەسان، شەهید عەزیز مەلەکی . شەهید ڕەحمان شێرەی ، شەهید ئحمەد هەرتەلی شەهید خدر ئەندێکی شەهید عومەر زێوەیی، دواتر پاشەکشەمان کرد تیپی (٨٣) ی هەورێ بۆ ماوەیەك ئەو ڕووداوە کاریگەری

**هەبوو لەسەرمان لەساڵی (١٩٨٥) ئاگادار کراینەوە کە لەگەڵ پارتی ڕێککەوتوین مەفرەزەکانیان دێنەخوارێ ڕێزیان بگرن، ڕۆژێکیان مەفرەزەیەکی پارتی لە شێخ وەسانان پەیدا بوو ئەوانەی وەبیرم ماون کاك هەڵگورد بوو شەهید کاروان بوو ناوی ئەوانی ترم لەبیر نەماوە. ئەوەندەی توانیم ڕێزم لێنان و هاوکاریم کردن،ئەو کۆمەڵە برادەرانە کوری باش بوون لەوکات وساتە تیپی (٨٣)ی هەورێ دوای چەند مانگ لەو شکستەی توشی ببووین وردە وردە خۆمان رێك خستەوە چەند وردە چالاکیمان ئەنجام دا لە بیتوین. دەبووایە بەشداری بکەین لە پاراستنی سەرکردایەتی لە دۆڵی جافایەتی چەندان جار بەمانگ دەماینەوە لە لەدەوروبەری چیای کۆرنگ و خەجەلەرزۆك ودۆرمازەلەو ملاسەف و شارستێن و زۆرشوێنی تر ،یەکێتی چوە قۆناغیکی تر لەبەرگری بەرەو رامارین و شەری گەورە گەورە وەك ئازاد کردنی هیان و شەری سەری رەش و شەری دەرگەلەو گرتنی فەوج و بەهەزاران چالاکی گەورە لێرەولەوێ، دیارە ناشکرێت دەوری کاك کۆسرەت رەچاونەکرێت بەهیمەتی هەموولایەك لە هەموو شەڕەکان نزیك بووە لەهێزی پێشمەرگە خریك بوو رژێم زۆربەی قەزاونەحیەکان لە دەست بدات، ئەگەر رژێم چەکی کیمیایی بەکار نەهێنابا، هێزی پێشمەرگە روو لە گەشەکردن بوو، کیمیا وەك ئاو وابوو لەسەرقەلایەکی سەربازی بیبڕی و دەوروبەریشی بگری، چونکە رژێم بەبەرنامە ناوچەکانی بۆردوومان دەکرد بەچەکی کیمیا بۆئەوەی جەماوەر لە هێزی پێشمەرگە دابڕیت هەر واشی لێهات چونکە پشتوپەنای پێشمەرگە جوتیاران بوون، دۆل مازەڵە و دەوروبەری مەرگەی،یەکێك لەجارەکان زیاتر لە مانگێك واجبمان لە دەوروبەری گوندی دۆرمازەڵە گرت گوندی دۆرمازەڵە دەدوانزە ماڵێك بوون دەست کورت و هەژار بوون ئاوی ناو گوندیان بەکەڵکی خواردنەوە نەدەهات ئاوێکی تر لە دووری زیاتر لەکیلۆ مەترێك دەچون بۆ سەر ئەو کانییە سەرەژێرێکی ناخۆش بوو هاتنەوەی هەورازێکی قورس بوو، دایك و خوشکان دەبووایە لەو هەورازە سەختە ئاو بە کوندە بێننەوە گوندی، ئاوەکەش پاك نەبوو حەوزێکی گیاوە، پڕبوو لە کرم و مێش و مەگەز تۆزو ڕیخ لە هەمان کات زۆرشین و خۆش بوو، خۆشوتن قەدەغە بوو حەوزەکە میراوی هەبوو هەرکەسە و بەشەئاوی دیاری کراوی هەبوو وەك گوندی شارستێن ئێمەی بەدبەخت دەبووایە بۆ خۆشوشتن بچینە ورچەچ لە دۆرمازەلە بۆ ورچەچ بەس بەقسە خۆشە! سەیرەکە لەوەبوو ئێمە لەتینان بێ ئاوی بەهیلاك چوبووین دەشمان روانیە سەر دەریاچەی دوکان ڕۆژێکیان چەند کەسێکی پاك و خاوێن هاتنە ناوگوندی چونە ماڵی مام کوێخا پرسیمان ئەوانەکێنە؟ وتیان کەس وکاری**

کێخوا سمایلی تەلانن لەدەست ڕژێم ڕایان کردوە مالّی کێخوا سمایلی تەلانان پیاوی ڕژێم بوون بەناو بلّام لەڕاستیدا ئەوان پێشمەرگەبوون ئەو باجەشیان دا ڕژێم کۆمەلێکیان لێ لەسێدارەدان، من پێم وایە ئەگەر یەکێتی پیلاوی زێر بۆ خەلکی دۆلّ مازەلّە و گوندەکانی جافەتی دروست بکات بە ژن و منداڵ و گەورەو بچووکەوە هێشتان یەکێتی قەرزار دەبێتەوە . وامان لێ هاتبوو هەموومان یەکترمان دەناسی بەراستی لەگەلّمان باش بوون ئێمەش لە گەلیان زۆر بە ئەدەب بووین من ئەگەر واجبم نەبایە لەگەلّیان دەچومە ناو ڕەزان کارە لەگەلّ دەکردن نانی دەستی خۆم دخوارد زۆرجار داوەتیشیان دەکردم، دەچومە ناورەزان هەمووکارێکی ئەوانم دەزانی وەپێشم خۆش بوو ناغواردنم تۆزێك بێ منەت بێت خەلکی گوندیش شارەزای من ببوون لەگەلّ خۆیان دەبردمە ناو ڕەزان ...

ڕۆژێکیان هەر لە گوندی دۆر مازەلە من و پێشمەرگەیەك چوینە مالّێك بۆ نانی نیوەڕۆ تەنها پیرەداکێك لەمالّ بوو قاپە ساوارێکی هێنا لەگەلّ دوسێ کولێرە و جامێك دۆ من لەکاتی ساوار خواردن گەیشتمە دنکە کاو جۆ ،لەبەر هاوڕێکم هەندێك ساوارم بەسەردادایەوەو وازم لەنان خواردن هێنا پیرەدایك و هاوڕێیەکەم وتیان بۆ ناخۆی وتم بەسەمن برسی نیە تومەزانە پیرە دایك ئەو قاپەی کاو جۆی بوولاّغان بردوە نەی دی بوو ساواری بۆ ئێمە لەو قاپە کردبوو چوینەوە مزگەوت من زۆر برسی بووم دوکانێکی لێ بوو یەك قدو گۆشتم کڕی چومە مالّێك سلاّوم کرد ژنیکی پاك و خاوێن وتی فەرموو دانیشە منیش چوم دانیشتم وتم خوشك ئەو گۆشتەم بۆسورکەوە وتی بەسەر چاو وتم وادیارە بەتەنێی لەمالّی وتی بەلێ وتم ڕاوەستە من دەڕۆم مادام پیاوتان لێرەنیە وتی دانیشە من خوشك و تۆ برا ئایە ڕازی نیت وتم باشە زۆریش ڕازیم بەخوشك و برایەتی شتەکانی ئامادەکرد و وەك مەردان هاتە لام دانیشت و نانو چام خوارد باسی کاو جۆشم بۆکرد وتی براکەم لەهەرمارێك نانت بەدلّ نەبوو وەرە لای خوشکی خۆت ، چومەوە لای برادەران چیرۆکەکەم گێڕاوە وای لێهات ڕۆژانە پێشمەرگەکان داوایان لێدەکردم کە بیانبەمە مالّی خوشکم منیش دەم بردن بەمەرجێ بەئەدەب بن ڕۆژکیان چومە مالّیان سەلامم کرد پیاوێك لەوێ دانیشت بوو چاکوچۆنیم لەگلّ کرد خوشکەکەم وتی بابە ئەوەبرامە و بەمنیشی گوت ئەوە باوکمە کەتینەگفت و گۆو وتی ڕۆلّە خەرکی چەمملەکەتی وتم ـمام خۆشناوم لەدۆلّی بالیسان نیشتەجێم دیار بوو پیاوێکی بەڕێز و حەزی لەدوواندنی من بوو وتی ڕۆلّە ژنت هێناوە؟ وتم بەلێ مامە... سێ منالّیشم هەن، وتی تۆ پیاوێکی زیرەك و

ناقل نیت. وتم بۆ مامە، وتی ئەگەر زیرەك بای دەت وت ژنم نەهێناوە و خوشکێکی جوانم هەیە و منیش دەم وت وەرە ژن بەژنی بکەین دەبووینە خزم، وتم مامە یەکەم ناکرێت درۆت لەگەڵ بکەم. دووەم من کۆمەڵەم باوەڕم بە ژن بە ژنەنییە.بزۆرقسەی خۆشمان کرد تومەزانە سەبووری بەپێشمەرگە دەهات چونکە کوڕێکی پێشمەرگەبوو. بەڕۆژ حەرەسمان هەبوو بەشەو کەمینمان هەبوو ئێوارەیەکیان دابەش بووبووین بەمەبەستی نان خواردن لەپڕ ڕژێم کەوتە بۆردومانی دەوروبەری گوندی دۆرمازەلە ئێمەش وازمان لە نان خواردن هێناو بەرەو مزگەوت ڕامان کرد ماوەیەکی کەمی پێ چو تا کو هەموو ئامادەبوون تۆزێك ڕۆیشتین پێشمەرگەیەك وتی هاوڕێ فەقێ خوشکت بەدوادا دەگەڕێت منیش گەڕامەوە دیتم حەلاگەیەکی دایە دەستم وتی برۆ خوا بوو پارێزێ، ئێمەش چوینە پێش دوژمن خۆمان ئامادەکرد چاوەڕێ بووین تانزیك بەیانی دوژمن نەهات شەهید کێخوا بێتواتەیی و شەهید عەلی وەیسی لەنزیکی من بوون گوێم لە عەلی وەیسی بوو بە شەهید کێخوای دەوت زۆرم برسییە وتم کاك عەلی بە خۆت و کێخوا وەرنە لای من ئەوان هاتن عەلاگەم کردەوە سێچوار نان و دوسێ تەماتەو یەك دوو ئاروی تێ دابوو، شە هید عەلی وتی ئەوەت لە کێ هێنان ؟ وتم ئێوارە خوشکم بۆی هێنام. ئەو نان و تەماتەیە ئەوەندە بەلەزەت بوو هەزار گۆشت بەرخی ئێستای بە قوربان بێت، دوای ماوەیەك ئێمەیان ڕەوانەی گوندی شێخ سەف کرد، ماوەیەکیش لەوێ بووین، دواتر گەڕاینەوە ناوچەکەمان چەند وردە چالاکیمان کردن.

باپشویەك بدەین و بچینە دنیای فۆلکلۆر

کابرایەك هەبووە ناوی مام قوربانی بووە خەریکی تەشی و تیزك دروست کردن بووە، یەکێك بانگی دەکات و دەڵێت:

مام قوربانی؟

| | |
|---|---|
| قوربانی دەڵێت: | ها بەرخی خاری! |
| کابرادەڵێت: | دایکت مردیە. |
| قوربانی دەڵێت: | بەگوتم! |
| کابرا دەڵێت: | بابت مردیە. |
| قوربانی دەڵێت: | بەگونم. |
| کابرادەڵێت: | خوشکت مردیە. |

قوربانی دەڵێت: بە گونم.

کابرا دەڵێت: برات مردیە.

قوربانی دەڵێت: بەگونم.

کابرادەڵێت خزمت مردینە.

قوربانی دەڵێت: بەگونم.

کابرادەڵێت پوور خەندانی خێزانت مردیە.

مام قوربانی ئاگری لەچاوان دەباری و دەڵێت:

کێ وەگۆ؟

کابرادەڵێت: مارێ میری وەگۆ.

قوربانی دەڵێت

خزمینە مەچونە سەرقەبران
تاکو ئەستینم تۆرێ خەندان
پێمەڕە و خاکەناسان بینن
زوبن قەراتێ بڕوخینن
ئاگری دەمارێ میری بەردەن
هەمان بکوژن کەس نێرن

.........................................

کابرایەك خێزانی لەسەر سەری دانابوو، باوکی لەسەر شانی ڕاستی دانابوو، دایکی لەسەر شانی چەپی دانابوو، لێیان پرسی ئەرێ کاکێ برا ئەوبەزمە چییە؟ لەوەڵامدا وتی:

ئەوەی شانی چەپم بەرایە،
ئەوەی راستم قەزایە.
ئەوەی لەسەر سەرمە
نیعمەتێ خوایە

*** *** ***

**ڕووداو ........**

له شاری شەقڵاوه پلکەمێرەم هەبوو زۆر شت لەپوور مێرەم دەگێرنەوه، مێردی مێرەم ناوی حەسەن بووه مێرەم هەست دەکات (حەسەنی ) مێردی حەز له ژنێك دەکات، ڕۆژێکیان شایی و ڕەش بەرەك دەبێت، مێرەم و حەسەن داوەت دەکرێن حسەن دەچێتەشایی دواتر ژنەی حزلەحەسەن دەکات دەچیتە دەستی حەسەنی، مێرەم تووڕە دەبێت و تەماشا دەکات مێردی ژنەش لەشایی دایه، مێرەم ناوی خوادێنێت دەچیتە دەستی کابرا بەکابرادەڵێت: دەی هەریەشان مێرەم کابرا گەرم دەکات و شایەکەیان زۆر جوان دەبێت خۆی شێت دەکات ده شایی چەندی حەسەن به ئیشارەت نێو چەوان لەمێرەم گرژ دەکات میرەم گوێ پێنا دات،حەسەن لەخەفەتان واز لەشایی دێنێت و دواتر بانگی مێرەمێ دەکات دەڵێت: وەره ئیشم پێته، مێرەم واز لەشایی دێنیت بۆ لای حەسەن دەچیت دەڵێت: مێرەم ئەو قون بادانەت لەچ بوو؟ دەگەر ئەو کابرایەی مێرەم دەڵێت مانەتو ئەو مل بادانەت لەچ بوو،دەگەر ئەو ژنەی؟ ئەمنیش وەکی تو! دواتر هەردووکیان پێدەکەنن و دەچنەوه ماڵەوه هەر بژی پووره مێرەم، له ماڵەوه حەسەن ئەڵێت مێرەم وەره مەسەلەکت لۆ بگێرمەوه مێرەم دەڵێت دەی بگێرەوه حەسەن دەڵێت ، مێرەم، مەلاو مەلاژنیك دەبن، برای مەلاژنێ ژن دینی، مەلا ژن دەڵێت: مەلا دەبێت ئیزنم بدەی شایی بکەم بووکە و لۆ برامە من شایی نەکەم نابی، مەلاش زۆر هەوڵ دەدات مەلاژن نەچی سوودی نابێت دوواتر مەلا ڕازی دەبێت، بووك دەگوازنەوه و شایی دەست پێ دەکات،مەلاژن به حوکمی ئەوەی برای زاوایه زوو دەچێتە شایی دوو فیتەزەلام دەچنە دەستی مەلاژنی و مەلاژن هەڵ دەپەڕێنن مەلا زۆر قەلس دەبێت دوای ماوەیك بانگی ملاژن دەکات دەڵێت وەره کارم پێته مەلاژن دێتەدەرێ دەڵێت ها مەلا خێره ملا دەڵێت چیدی شایی مەکه ملاژن دەڵێت مەلا ئەدی ئەتو ئیزن نەدام شایی بکەم،مەلادەڵێت کچێ کەنگێ ئەوەشاییه ئەوەی ئەوان دەگەرەتویان کرد، (نیوەگانەك )بوو حەسەن و مێرەم نێوانیان زۆر خۆش بووه و زۆرشتی خۆشیان لێ دەگێرنەوه. جارکیان حەسەن له مێرەم دەدات مێرەم تورە دەبێت و دەچێتەوه مارەێ بابی وەرز پایز بووه، ئەوشەوه بایکی زۆر توند شەقڵاوه دەگرێتەوه مێرەم لەخەمان خەوی لێ ناکەوێت دەڵێت: ئەوشەو گوێز زۆر بەردەبنەوه، حەسەن لەخەوێ هەڵ ناستێت منداڵیش گوێزان خڕدەکەنەوه لەگەڵ مەلابانگ دان مێرەم دەچێت گوێزان خڕدەکاتەوه، دواتر حەسەن هەستی پێ دەکات حەسەن دەڵێت: مێرێ وەرەچایەکی لێنێ مێر جوابی نادالتەوەو دواتر چا لێ دەنێت کێشەکە کۆتایی دێت، حەسەن دووای ئەوەی میەمێ

دەگوازیتەوە دوای چەند مانگ مێرەم مەژگیانیان دەکات زۆری حەز لەگۆشتی دەبێت ئەم حەزەی بە حەسەنی مێردی دەڵێت: حەسەن دەڵێت بەخوای میرێ چپارەی شك نابەم، میرەم دەڵێت حەسەن ئەوشەو برۆ ماڵەبابی من مریشکێك بدزەو وەرەوە، حەسەن شەو دەچێت مریشکێك دەدزێ و دیتەوە و لێی دەنێن بۆ ئەوەی بە شەوێ بیخۆن ئەوان مریشك چادەکەن و لەسەر ئاگری دادەنێن، دایك و بابی میرەمێ پەیدا دەبن میرەم بە پەلە مەنجەڕێ دەشاریتەوە و دواتر دەچێت دەرگا دەکاتەوە تا درەنگی شەوێ دایکوبابی میرێ نا ڕۆن ناوە ناوە، دایکی میرەمێ دەڵێت کچێ میرێ لەمارینگۆ بۆ نێگۆشتی لێ دێت میرەم دەڵێت دایێ خۆزگەن بەو جێیەی گۆشتی لێیە بۆنی چ دایلێ !

رووداو ....

بەیارمەتی مامۆستایانی ئایینی مامۆستایەك حەز لە کچێك دەکات، مامۆستا هەندێك دیاری بۆ ڕەوان دەکات، ڕۆژێکیان ئەیەوێ بە کچەکە بڵێت ئایە دیاریەکانت پێگەیشتووە وەدەیەوێ بە شیوەیەك بێت خەڵکی تێنەگات بەم شێوەیە پێی دەڵێت:

ئەلاهۆ مرەبەنە
ئەڵڵاهو مەڕەبەنا
قالبەك سابوون جامەك خەنە
پێتگەی یانە نا؟
کچەکەش وەڵامی دەداتەوە
ئەلا ئەلا ئەرێ وەللە

رووداو ....

کابرایەکی خۆشناو درەنگی شەوێ لە کاروانی دێتەوە، باری دێخی و زۆر ماندووە دەبێت لەتەنشت خێزانی لێ رادەکشێت خەریکە خەوی لێ بکەوێت، ژنەکەی ئارەزووی دەچێتێ دەست دەکات بەلانك ژاندن و دەڵێت:

ئۆی لایە لایە رۆڵەلای لایە
ئەوە خریکە بەیانە
ئاو لەتەندورمیانە
باوێ مەدرێی میوانە

وەختی تی، دەست لەملانە
قەرد دانەوە،لەسەر ملانە
رۆڵە لای لایە دەلەیلایە بەیانە و بنو رۆڵە لای لایە

کابراش زۆر هیلاك بووە لە کاروانی لەماندیەتیان زەوقی نەبوو، خەویشی زۆرهاتووە، وەڵامی خێزانی دەداتەوە دەڵێت:

تۆی لایە ڕۆ لای لایە
گۆلك نیمەو نەزانم
منداڵ نیمەو نەفامم
راستەکەی خۆ میوانم
زۆرماندیمەو نەتوانم
قەرداری دە شەوانم
دەی دەم بە چاوانم
ئەگەرخوا تەمەت درێژکا
ئەوشەونا شەوەکی دیکا
ژنە دەڵێت
لای لایە رۆلە لای لایە
کەنگێن وەختی پارانەوەیە
دەرمانی قەردان دانەوەیە

*** *** ***

**ڕووداو ....**

لەو گوندانەی دەوروبەرمان دووبرا هەبوون پێم وایە ئێستاش لەژیان دا ماون، ئەو دووبرایە بەماینێکی مام حاجی فێر ببوون بۆ ماوەی چەندان ساڵ، دوواتر خۆشیان ئێسترێکی ماچە دەکڕن ئێوارەیەکیان پێکەوە دادەنیشن دووای گفتوگۆێکی زۆر دێنەسەر باسی ماینێ مام حاجی، وابەباش دەزانن بچنە لای مام حاجی یان گەردەنیان ئازاد بکات یان بێت تۆڵەی خۆی لە ئێسترەکەی ئەوان بکاتەوە ئێوارە دەچنەماڵی مام حاجی دووای سەلام و کەلام براگەورەکەیان دەڵێت: مام حاجی ئەمە بەئیش هاتینە کنەتوو، مام حاجی دەڵێت: ئەوەی بە من پێك بێت

لەخزمەت دامە. براگەورەکەیان دەڵێت: مام حاجی عەیب نەبێ ئەمە ماوەی چەند سالێ بەماینێ تو فێر ببووین ئەلعانیش یان گەردەنێن ئازاد کە، یان وەرە تۆرێ خۆ لە هێسترێمەوەکەوە مام حاجی کە گوێی لەو قسانە دەبێت ئاگری لە چاوان دەبارێت دەڵێت هەستن هەی کوێی کەسنا، سەگبابینە لێرە ڕانەوەستن، یەکیان دێتە وەڵام دەڵێت جا مام حاجی تورەبوونی دەوێت تۆ تورابی؟ مام حاجی دەستەداتە دارێك بەلێدان بە دوویان دەکەوێت دوواتر مام حاجی لە بەرخۆی دەڵێت دەوەرە تەماشای ئەو ناپیاوانە بکە ئەمن چوپمە مارێخوای و ئەرێن وەرە تۆرێخۆ لە هێستری مە بکە وە.

*** *** ***

ڕووداو......

خۆشناوەکی لای خۆمان دەچیتە ئاشی،لە ڕێگا دەگاتە کەسەکی خەلکی گوندی دولوجی ماندوبوون لەیەکتر یەکیان دەڵێت دەوەرە برا ئێکێ تیکەین، دادەنیشن چیسەکە دەردینن ئێکی جگەرە دەپێچنەوە و ئەوەی دەچێتە ئاشی لەو کەسە دەپرسی کە لەئاشی دێتەوە دەڵێت ئەرێ بر باراش زۆر لەئاشی بوون، کابرای دووەم دەڵێت: ئەرێوەڵڵا گەلەك زۆری لێبوون ئەگەر گەبرے نەکردبا، شەوێ لەوێ ئەمامەوە، ئەوەی تر دەرێت کو گەبریت کرد، ئەوەی تر دەڵێت ئەرێوەڵا. ئەوەی تر دەرێت دیارە چیپاو لەوێنە بووینە ئەمن لەوێ بام لێناگەرام گەبرێ بکەی. ئەوەی تر دەڵێت: دەباشە وەرە ئەو تەڕاشەی دەکەینەئاش، بزانم پێت دەکرێت؟ لێنەگەرێی باراشی لێ بکەی باران لە کەرێدەکەنەوەو ئەوەی لەئاشی هاتیتەوە فەردەئاردی خۆی دەباتە کن تەڕاشێی، ئەوەی تر فەردەگەنمی دەبات لە دوو ئەوی دادەنێت ناوی خوای لێ دینن ئەوەی گەنمی پێیە دەڵێت نۆبەتی تو نییە ئەوەی تردەڵێت: نۆبەتی منە دەبێت ڕاکێشان ڕاکێشان پار پێوەنان خەنجەران دەردینن لە کالانێ و یەکتر دەدەنە بەر خەنجەران هەریکە و چەندان خەنجەر لەیەك دەدەن تاکو وای لێدێت بە حەستەم جولەیان ماوە یەکیان دەڵێت: دەی ئەتوو گەوزەکی بکە و ئەمیش گەوزەکی دەکەم. بانووکەنوکێ ژنانن گوێ لێ نەبێت هەریکە و گەوزێك دەکات و یەکتر دەکوژن .

*** *** ***

**ڕووداو.....**

**لە خۆشناوەتی هەموو ساڵێك مەولوودیان دەكرد، بەیادی لەدایكبوونی پێغەمبەر سڵاوی خوای لێ بێت، مەولوودەكان بە گەنجەكوتا و یان بەكفتەدەكران ، لەو مەولوودە سەرباری دەیان قەسیدەی شاعێران مەولوودنامەی مەلا سەلام دەخوێندرایەوە،دیارە مەولوودنامەی مەلاسەلام پێتواتەیی زۆر خۆش بوو، لە شوێنێك دەڵێت: دنیا لەسەر هەوایە هەوا لەسەربایە و با لەسەر گایە و گا لەسەر پشتێ ماسیە و لەوێ بەدواوە كەسنازانێت چ باس و چ هەرایە؟ یەكێكی لای خۆمان دەڵێت: دەوڵڵاهی مادام وەبی جێی ترسێیە،خۆ شەیتانیان نەگایە ریسیە گیایكی پیشانی گای نەدا، هەر لەسەر ئەوبۆچونە من گوێم لە بەساڵاچوان بووە، كە بوومەلەرزە دەهات دەیان وت ئەوە گا مێشی هاتیتێ لوێ دنیا دەلەرزی.**

*** *** ***

**ڕووداو.....**

**باس لە دوو تەمەنی جیاواز دەكات كەپیرەمێردێك كچێك دەخوازێت بەناوی هەمین زۆرجوان دەبێت گەنجەكان شیعری بۆ دەهۆنەوە ڕبەلاماری پیرەمێرد دەدەن:**

**هەمینێ خۆش هەمینێ**
**هەمینم چوەدیوینێ**
**خەركی هەمووی تازیەیە**
**لەبەر خاتر ی هەمینێ**
**هەمینێ خۆش هەمینێ**
**خەزێمێ خۆ دەدمیكە**
**تاسێ خۆ لەسەری نێ**
**ئەگەربیو بۆزەی چگۆ**
**هەندەك گوی دەدەوینێ**
**هەمینێ كەتیە هیلاكێ**
**هاواردەكات وەی بابە**
**سەگباب وەكی قیلەی دێ**
**سوندێدەخۆر كەرەبابە**

لەلای خەرکی چنیە
لەسەر مِن وەك بەرازە
پیرەبۆزم دار دارە
وەدووی کەتن مندارە
دووعایەکی لۆ دەکەم
یاخوا بمرێت ئەو غەدارە
پیرەبۆزم بابی عەیشێ
یاخوە توتنی لۆ نەفرۆشێ
هەمینم زۆر بێ مرادە
یاخوا لەخۆ نەبینی خۆشیێ
پیرەبۆزی پیرەکە
ڕۆژێ سێ جار ڕدێنێ لوس ئەکا
وەکی حەلەلیشێ ڕدێنێ شۆردەکا
پیرەمێردی کەلەرە
ددانی وەك پێمەڕە
کلکی وەکی دووپشکێ
هەموو وەختان لەشەڕە
پیرەمێردی کۆلکانی
بووکی داکردەخانی
لەئەستوندێی پێچایە
بازنی زێری لێ شکایە
پیرەمێردی پیرەکە
بەنۆشەوان ئێکی ئەکا
ئەویش بەنیوەچریەکا

من پێشتر ئاماژەم بەحاجی قادری شێخ وەسانان کردبوو کەحاجی قادری کۆیە باسی دەکات بەرهەمەکانی ونن دەکرێت بەشێك لەو هەرایەی من کۆم کردینەوە مولکی ئەو بن.

*** *** ***

**ڕووداو .....**

**لە شێخ وەسانانماڵێك دەبێت سێ کەس دەبن، هەرسێکیان ژن دەبن دایك و دوو کچ بەو ناوانە شەمس و سۆراحی و رابی لە ماڵەوە نابن کەدینەوە، دەنگەدەنگێکی گەورە لەماڵیان دێت، هاوار بۆ گوندی دەبەن دەڵێن: بەراز پری مارێمەنە، خەڵکی گوندی بە ژن وماڵ و پیر و گەنجەوە بە هاواریان دەچن بەدار و خەنجەر چەکی ئەو زەمان هەموو خەڵکی کۆ دەبێتەوە کە سەیری ناو ماڵیان دەکەن، پشیلە لەسەر بیستەگای بەشەر ها تینە، یەکێك ئەو بەندانە بە خەڵکی گوندی و ڕووداوەکە هەڵ دەڵێت ئایە ئەوکەسە حاجی قادری شاعێر بووە یان کەسێکی تر بووە، ئەوەیان نازانم :**

**شەمس و سۆراحی و رابی**
**کتکێ مارت خەرابی**
**قەت لە شەڕان تێر نابی**

..........................

**شەمسێ هەرمەگرە خەمێ**
**بە تەپشوی غارەدەمێ**
**ئەستێنم تۆرێ شەمێ**

..........................

**بەگزادە ژێر هەراتن**
**پیاوی ساحێب حوکماتن**
**ئەو لەبەر کتکان هەراتن**

..........................

**برێنە مستی حەوێزی**
**سەنگەران لێوە گوێزی**
**لەتفەنگێ نەبرێ تێزی**

..........................

**برێنە سۆفی مستەفایە**
**بگریت ڕێێ پایە**

بووزی لێ داکەلایە

.........................

برێنە وسو کەچەری
با بگریت رێی گەری
کتك تێنە پەری

.........................

کتکێ زێوەو هەرتەلان
رەشەکرێن وەکی قەلان
خواردیان وەسمانی مەلان

.........................

برێنە مستی کیژیلێ
بگری رێێ کانیلێ
شەڕە دەگەر پشیلێ

*** *** ***

**چیرۆکێك بۆمندالآن:**

هەبوو نەبوو مالە ڕەوەندێك هەبوو، مالّیان بارکرد و چونەکوێستانان، مریشکێك لەپەنایەك کورك بووبوو لە خێلی بەجیما چەندان جوجەلەی هەرێنان، رۆژێکیان مام رێویەك هەستی پێ کردن چوەلایان وتی مریشکەرەش میوانم جوجەلەکم بدێ زۆرم برسیە با بیخۆم، مریشکەڕەش وتی مام رێوی جوجەلەکان چ تام و بۆیان لێنایێ من هەر لێرەم کە گەورەبوون وئەوکاتی بەچاوان مام رێوی رازی بوو کاتێکیان دانا و رۆژی، کە جوجەلەکان گەورەبوون مریشك چوەگوندی لای مام حەیدەری و وتی مام حەیدەر حارو حیسابم وایە ئەوڕۆ رێوی دێت جوجەلانم بخوات تۆوەرە لەسەر گردی تەرەدانێوە وادەکەم رێوی بە تەرەوەبێت من و منالەکانم بێنەوە مالێ مام حەیدەروتی: بە چاوان بەپەلە لەسەرگردی تەلەی داناوە رێوی پەیدابوو وتی مریشکەڕەش لەسەر پەیمانی خۆت مای مریشك گوتی بەلێ . وەرە پێش ئەوەی من و منالەکانم بخۆی لەسەر ئەوگردە پێچەشاییەك بکەین، پێش سەرەمەرگێ رێوی رازی بوو دەستیان بە شایی کرد.

**مریشك گوتی مام رێوی شایی بەبێ گۆرانی نابێت، رێوی وتی دەباشە ئەتو گۆرانیەك بڕێ مریشك گوتی:**

**مام حەیدەری ماوانم**

**لەكن ڕێوی میوانم**

**لەبن دەستی داماوم**

**مام رێوی وتی مریشكێ ئەوە كەی گۆرانی بوو، قسەی بێسەربەردەكەی، مریشك گوتی دەبزانم گۆرانی تۆ چۆنە، رێوی وتی :**

**مریشكێ قوندە بۆرە**

**ورورەت ئەوەندە زۆرە**

**مام رێوی لۆ بووەكۆرە**

**مریشك گوتی گۆرانیەكەی تۆ زۆر بێمەعنا بوو، رێوی دەرێ بزانم گۆرانیەكەی تۆ چۆنە، مریشك گوتی:**

**هۆ مام حەیدەری شاوری**

**مریشكەڕەشەت دەبەر مری**

**بگرە ڕێوی غازری**

**رێوی تورە بوو وتی توخوا مریشكەڕەش گۆرانی نەمابوون، ئەوگۆرانییە نەبێت، ئەوە كەنگین، گۆرانیان نەچێت بۆ پیاوی تورە دەكەی، مریشك گوتی دە ئەتو گورانیەكەی بڕێ بزانم گۆرانی تو كوە، مام رێوی وتی :**

**مریشكێ پۆڕ بەرەكێ جوانێ**

**سنگت خۆم سیقەدانێ**

**بچینە دیلمەو دیلانێ**

**مریشك تورە بوو وتی توخوا ئەوەگۆرانیە؟گۆتت: رێوی وتی دەبزانم ئەتو گۆرانیەكی بڕێ بزانم چۆنە، مریشك دەستی دەبناگوێناو وتی:**

**هۆ مام حەیدەری پاش بنێ**

**سمێرانت دەنێم لە خەنێ**

**تولە و تاژییانی بەردەنێ**

## خۆشناو و دز و دزشاو

لەوکاتی ڕێوی بەتەڵەوەبوو، مام حەیدەر دەرکەوت و تولەو تاژی بەر بوونەگیانی ڕێوی ـ ڕێویان دەخوری وەردا و کوشتیان، مام حەیدەریش مرشکی بەجوجەلەوە بردەوە .

ئەوچیرۆکە شەری ئەو کەسانە دەکات کەسەرەتای چیرۆکی کوردی بۆ چەند ساڵێك پێش ئێستە دەگێرنەوە نەخێر چیرۆکی کوردی زۆر لەوە کەوەن ترە کە نووسەران باسی.

*** *** ***

**بۆ منداڵان :**

قایاتەکم کرد سەلەم بێ
لەبرای خۆم مارەکردی
ئاو لەگۆلان کەلەم بێ
مارەمارە هەریەزی
بۆقێ لانك دروی بێ
بە سنجاقە بە دەرزی
قرژار هەڵی بڕی بێ
سنجاقێ تومِ زێرینە
قرژاری مام مەژاری
دەخانیانم گێرینە
لۆخۆم هێینا بە داری
دەخانێ قم قمۆکێ
بەدیاری خرخرنوکان
هەموخانیم خەندەکن
ماینێ برام زایە
بەکوزەرە و بەندە کن
زای ماینێ چدینی
سپی بۆز لەمنت کەوی
چەنگەزێرەکی دێنی
راوەستەو تابوك سەرکەوی
بەسەر بووکێ وەردینی
بەوکێ سلێمانی
بووکم دی حەلارم دی
دەستی دا کلدانی
ئەگەر وسوەلارمدی
کلدانی رۆمیە
وسوەلاری دووگردی
چەق چەقەی گۆمیە
چەندم هێنا و بردی

*** *** ***

**هەلبەست بۆ منداڵان:**

خوشکێ خوشکێ من بای
سۆرەکرێن لە کروکان

شەوێ گێژنەم لە کن بای
کوروکێ نیسانی

خوشکێ دی نەهاتم
دەبرِم بەگیزانێ

چورچەم دی و هەراتم
گیزان خشت و مشتە

چورچەم گرت و دەگۆمێم نا
علی بەگ لەپشتە

بۆقم گرتوو دە قونێم نا
علی بەگی دێزە

قەنی کردن رێزە

.............................

لەسەردووبەردووکان
قەنێ بابی منە

جلکێ زاواو بووکان
یەك بە بەژنێ منە

*** *** ***

**هەر بۆمنداڵان :**

شلێرێ مەگری مەگری
دەسرۆکەکم داتێ

پێکەوە بچینەقەبری
دەسرۆکێ هەوریە

قەبری تەنگوتارە
لەبرینێم بەستیە

پرلە مشك و مارە
برینێ گامێشێ

مشك ومار عەزیایە
بەردان ئەقەرێشێ

خۆی لەرمیێ دایە
بەردی ئەولای ماران

رمیێ هوکەهوکە
پێی دادەن رەشماران

بردیان جۆتەبووکە
رەشمارم پیرۆزبن

جۆتەبووکی میری
لەهەسپەکی بۆز بن

بردیان لۆ یخسیری
هەسپەلەمنت کەوێ

یخسیری قەراتێ
تابووك سەرکەوێ

*** *** ***

دایك كە منالّی ساوا هەلّ دەپەرێنێ، دیارە ئەو هەلّ پەرینەش گۆرانی خۆی هەیە، وەك:

هەندووکەو هەندیشی
تۆز لەبالاّی نەنیشی
بە خۆی جوانە و بابیشی

*** *** ***

زۆرجار منالّەكە بە زەحمەت بوو دایك تورە بووە و گۆتیتی:

ژێر هەردێت بەتەن تەنە
لەملی داداوە بەنە
وەكێ چوە ئی جینگەنە

*** *** ***

ژێرهەردێت بەشەنگی
بۆرەی دەبندا دەلەنگی
وەخاری چوە چاوبەنگی

واتە ئەومنالّەم لە جوانی بەبراكانم چوە وەك براكانم جوانە و ئەوندە بەهێزە و ئەسپی دەبندا هیلاك دەبێت،

*** *** ***

ئەوەی برێت كرێتە
خانی بەسەردابێتە
نەكا لەبەر هەرێتە

واتە ئەوەی بلێت منالّەكەم ناشرینە خانووی بەسەردابروخێ وەنەتوانێت رابكات

*** *** ***

ئەوەی برێت جوانە
گای زەردی كێشتانە
ئەیدەمێ بەو چاوانە

*** *** ***

ئەوەی برێت نەشیرنە

لێی بمرێت گای شینە

لۆبرای دابنێ شینە

کوروکاری بەتەنێ

کیژۆ کاری دەگەنێ

سەرو ماچی دەدەنێ

---

کیژ لەبلورێ خزی بوو

کیژۆ کاران دزی بوو

وایان زانی دەرزی بوو

---

ژێرهەردێت بەتوڕتوڕە

لەملانی مەعمەری سورە

وەکێ چوی ڕکەستورە

*** *** ***

**منداڵان کەلەلای یەکتر کۆ دەبوونەوە بۆ یاری کردن ئەگەر بۆنی بایەك هاتبا بەوشێوەی خوارەوە ئەوبەندۆکانە دەوتران**

هەرچی فسی فسکەی گاتێ

لەبنداری مرخەی گاتێ

نە ئەمنم نە سوسنە

جیسکە قوتەی زۆر فسنە

*** *** ***

**ئایە برا لەلای کچ خۆشەویستە یان دۆست ؟ گوێ لەو کچە بگرن دایك وتی کچم برۆ جلك بۆ برات بشۆ، کچەکە بەو شێوەیە وەڵامی دایکی دە داتەوە دەڵێت :**

دایە دارتەرینە

کانی هیشکینە

گەلەك نەخۆشم

**چ حارم نینه!**

**واتە دایە دارەکان تەڕن ئاگر ناگرن، کانیش وشك بووە و ئاوی تێدانەماوە، جلك بۆ برك بشۆم! لە هەمانم کات زۆریش نەخۆشم.**

**دوای کەمێکی تر دایك وتی کچم برۆ جلك بۆ دۆستت بشۆ کچەکە وتی:**

**دایەدارهیشکینە**

**کانی تەرینە**

**نەخۆش نیمە**

**چ بەرام نینە**

**لێرە بەپێچەوانە وە کچ بۆدۆست لە ئامادەباشی دایە بۆ دۆستی .**

*** *** ***

**کچێکی تر تەشی دەرێسێ لەبەرخۆی گۆرانی دەڵێت، تەشی رستنیش بەندو بالۆرەی خۆی هەبووە:**

**ئەوە دەڕێسم تەرپاریکانی**

**شو دەدەم بەگورو رەیحانی**

**لۆ رانکو چۆغەرێ حیانی**

*** *** ***

**کە بۆ براش دەڕێسێت بەوشێوەیە باس دەکات**

**ئەوادەرێسم سیلەی سێتایە**

**شودەدەم بەریخێ گایە**

**لۆرانك و چۆغەرێ برایە.**

**واتا کەبۆدۆستم دەرێسم زۆر باریك و جوان بەئاوێ گول و ڕیحان تەردەکەم کە بۆبرام دەر رێسم بە گەورەیی دەرێسم بە ریخێ گاش تەڕی دەکەم.**

*** *** ***

**لە خۆشناوەتی زۆر جار وشەی (واك) بەکاردێت ئێمەی خۆشناو ئەگەر(واك) بە یەك ڕستەی تەواو قسەمان بۆ بکرێت تێی دەگەین، وەك: واکم دیت لەسەر واکێ، هەر واکە واکی بوو. واتە مریشکم دیت لەسەر هێلکان هەر گارەگاری دەکرد . یەك رستەش بێت تێی دەگەین، لەگوندی**

مەلەکان له بەردەرکی مزگەوت نزیکەی بیست پێشمەرگەی گەرمیان راوەستاون، هەندێك خەڵکی مەلەکانیش لەلای پێشمەرگەکان راوەستاوبوون، مام حاجیەکی مەلەکان بەوێ دادەڕوا و شوێکی لەسەرشانە شو بەو دارە دەوترێت کە گوێزی پێدا دەوەشێن دوای سەلام خزمانی مەلەکان لێی دەپرسن مام حاجی کێواچی؟ مام حاجی دەڵێت:

ئاچمە واکان

واك واك بووینە

واکان واك نەکەم

واك واکان واکە ئەکەن

پێشمەرگەکانی گەرمیان سەریان سوڕ دەمینێت لەو زمانە داوا لە خەڵکی دەکەن بۆیان تەرجومە بکەن، خزمانی مەلەکانیش دەڵێن ئێمە تێ دەگەین مام حاجی دەڵێت: ئەچمەگوێز داوەشاندنێ، گوێز پێ گەیشتوون ئەگەر دایان نەوەشێنم پێشمەرگە هەمووجوێزان دەخۆن .

*** *** ***

فۆلکلۆری گەلەکەمان دەریایە بەداخەوە من مەلەش نازانم هەرلەخۆم شەپەشەپ دەکەم، دیارە ئێمە خاوەنی زۆر بابەتی جیاجیاین وەك (حەیران، لاوك، پەند، چیرۆك و بەلۆرە و حەیرانۆك و بەندی شایێ و بەندی منداڵان و زۆر شتی تر وەك: مەتەڕۆك و مەتەڕۆك، ئێمە وایان دەناسین دیارە لەهەندێك شوێنی تر پێی دەڵێن( مەتەڵ)، با هەندێك مەتەڕۆکان بنووسین من پێم وایە ئەو مەتەڕۆکانە بۆ مەشقی مێشك بووە، کورد بەکاری هێناوە کە خەڵکی بیر لە نەهێنیەکەی بکاتەوە بۆ ئەوەی مێشکی فێری بیرکردنەوەبێت ... لەهەمان کات سەیرکەن تورك و عەرەب نەیانتوانیوە باڵادەستبن بەسەر فۆلکلۆری گەلەکەمان، بەدەگمەن وشەیەکی ئەوان لە ناو فۆلکلۆر کوردی نابینیەوە، کوردێکی نەرم و بێ گرێ هەست پێدەکەی:

ئاخوڕی خوارە

---

گای هارە واتە خەنجەرە

---

ئەچی ئەشوا ئەچی ئەدا ئەچی ئەکا. واتە: ئەچێت دەست نوێژهەڵ ئەگرێت و بانگ دەدات و نوێژدەکات.

(چومەدەشتێ ژێری، مێم دی لەسەر نێری) واتە دەستاڕم دی.

(دارێکم دی پێنج لکە دوو لەبەر تاوێ سێ لەبەر سێبەرێ ) واتە پێنج فەرزی نوێژێ.

(ڕەشی گرێ گرێ، گەر نەتزانی قونت خورێ) واتە کاکێش جوتیاران کایان پێ دەکێشا.

(مامەگر هەیە لە دەشتێ سیووسێ کونی لەپشتێ) واتە: سەرەد بۆ لێکدەرکردنی کلو و دان بەکار دات لەلایەن جوتیاران

(پیرەمامی لەدەشتێ، بارەقەرەمەك لەپشتێ) واتە: زیوشك.

(کێرشکێ لە لانێ گوێی لەبەر بارانێ ) واتە خەنجەر.

(سەریانەو بن بانە چوارمەرە و یەك شوانە) واتە: پەنجەکانی دەست.

(ئادەمیە دەمدەمیە شەقەی ڕۆی لۆ ڕۆمییە ) واتە: بروسك.

(دارەکم هەیە دووانزە لکە، هەرلکەو سی پەلکە هێلانەو دوو لکە) واتە دوانزەمانگ هەرمانگی سی ڕۆژە مانگ و خۆریش

پایزێ شیولێنا بەهارێم هێنا )

لێو تەڕە دوونە بی تەرەشێن

(سرقا وێ بخوات ڕۆژی ناشکێت ) واتە: سرق ئاودان.

(شتێکم هەیە هەمووشتێکی بەبندا دەڕوات) واتە: قەڵەم.

(پیز پیزۆکێ هەرزانە، ئەگەر نەی زانی زمانە )واتە: زمان.

(ڕەشێ لەبنەبانێ، هەردێتە کابانێ ) واتە: کوندەی ئاوێ

(سەری بەقونێ، قونی بەسەری ) واتە: بێری کە بزن دەدۆشێت

(چارنەچەقن، دوونەلەقن، دوونەرەقن دوونەزەقن ) واتە: ئاژەڵ چوار پێ و دووقۆچ و دووچا و دووگوێ.

(ڕەشە قیر نیە، گوتکان ئەکات ژن نیە، ئەفرێت تەیرنییە) واتە: قالۆچە.

(مامەکم هەیەلەبن گرێ، لەبن سمێران ئەکات ورەورێ) واتە: جورجە کۆر.

(نەپێی هەیە نەپانی بە هەمووماران دەزانی ) واتە: پارە یە

(شتێکم هەیە تا ئێوارێ لەبن گریە، کە هاتەوە لەکابانێ جوانترە ) واتە: گاسنە

(کەری شین کەربەندی شین، بەستمەوە لەمێرگەکی شین ) واتە شفتی

( سەری وەعاجباتیان ئەچی، نارقەدی وەگەنجان ئەچی، قونی وەپیرەژنان ئەچی) واتە مێروستان

(قەسری سپی، سواندەی کەسك ) واتە:پیواز

(هێلکەی قازان،لەهەورازان، کەوتنەبازان،)واتە تەزرە

(سەری سانە بنی قورئانە ) واتە: کوارگ،قارچك.

(چاوی لێ بکەی کفرە، بەلای دابرۆی کفرە ) واتە داری کفر

(سوارەك هات ڕەش و ڕوت، هەربرمەبرمی ئەوت، نە گوللەی پێیە نەبارووت ) واتە: ڕەشەبا.

(چارەکم هەرقەناند چل کەزی، فاتمەخان تێ هەر بزی، سەری پڕبوو لودەرزی ) واتە: کەنگر.

(عومری درێژت دەوێت یان جۆرکی دراوان ) واتە: کیو گونی کەرێ هەرچی بتەوێ زەرەرە

(شەکری سەرنارەپنجێ دەخۆی یان گوی نارەقنجێ )شەکر واتەگوی سەگ گوەکەش واتە هەنگوین و

(_پشتی رەقە شاخ نیە، هێلکان دەکات مریشك نیە، گیا دەخوات بزن نیە) واتە: کیسەڵە

(کە دێتەخوارێ میرە، کە دادەنیشێت وزیرە، کە دەڕوات فەقیرە) واتە: بەفرە

(گا ی رەشە، جلی سپیە ) واتەسێرێ نانی

(ئیکت ئەگێ پێنجت شایدن ) واتە: لەکاتی خۆخاوێن کردنەوە بەبەرد.

(پیرەمامی لەدەشتێ، دوولینگەی گەیشتێ، خستیەسەر گازی پشتێ ) گەنم دروێن

(گەرمە نەرمە بێنەبەرمە، گەر دۆخینم نەپساند تۆزە لەسەرمە ) واتە،گیپە

(ئەولام رەقایی ئەولام رەقایی، لێی پەیدادەبێت گەرمایی ) واتە ئەستێو بەرد

(ئەولام تات ،ئەولام تات، وەی بابە گوم لێ دەرهات ) ئەسپێ لەکاتی کوشتن بە دوو نینۆکی پەنجەی گەورە واتەپەنجەی ئەشپێ کوژە

(شەش پێ لە عاردی دووپێ لەهەوای، بنێشت لە مێزەر ) واتە کەرو ماکەر لەکاتی جوت بووندا...

(سەری دەقوڕێ دەنێن، ئێکی دەکونێ نێن ) واتە گاسنی جووت کردن و دەستەندو

(سەرلەسەر سەری، پێ لەسەر پشتێ، ئەگەرنەت زانی ئێکت دەکونەگشتێ ) واتە مریشك و کەرەبان لەکاتی جوت بووندا

(یەك تاقەسوار دام لەدیوار بووبەچل هەزار)، واتەهەنار

(چومە دەشتێ ژێری مێم دی لەسەر نێری) واتە دەستاڕ

( پیرەمامی لەدەشتێ، بارەقەرەمەك لەپشتێ، مگۆ ئەوەکێواچی، وەی گۆ ئەچمەبەهەشتێ. واتەزیوشك

(پیرەمێردی بەپێوە، پەرۆکەکی بەقونێوە) واتە حەمبار ی دانەوێرە

(زندو مردوو ئەشێرێتەوە، مردوو هەڵ دەستێتەوە، زندی دەی گریتەوە) واتا تەرە دانانەوە

(بە کاوێژی گوانان ئەکا ) واتە کچ مەمکی دێن

(مەلای نامەلا ردێن لەپشتی ملی، ئەگەر نەت زانی دەبەر ردێنێی بە رەشکی مری ) واتە کەر

( قەسرەکم هەیە گێچینە، چ دەرگای تێدانینە، روح دەبەری ژینە ) واتەهێلکە

(رەشی رەشەندو نام لە کونەکی بەمو هاتەدەرێ ئاو لەدوو) واتا کل وکادان کل لەچاوکردن

(پیرەمامی سەربانی لۆلکێ دەخوات بەزمانی) واتە باگوردان و گێڕانی خان.

(رەشی لەبنەبانێ، هەردێتەکابانێ) واتەکوندە

(لەسەری یەکەو، لەبنی دوو، ئەگەر نەت زتانی قونێ تو ) واتە سەرو دوو لاق،یان قاچ

(خوارە وەکی داسوکێ زەردەوەکی هێلکێ ) واتەمانگە

(تیری پەرپوتێ داویە لاقان دێتەوە دمی) واتە فس . دمی . واتە لوت

(چاولەتۆقێ سەری، ردێن لەپشتی ملی) واتە ( کیر )

(بزنەقوتێ مەلایە بەرم دایەچیایە نەی هیشت یەك بڕکەگیایە ) واتە ردێن تراشین

(کانی چرقنیٚ میو حاکم دەستی دەبەنیٚ ) واتە: لوت، دم، کەپو

شتیٚکم هەیە بەهەمووشتیٚك دەنوسیٚ ) واتە ناوە

(تەندورەکم هەیە پڕ لەتەپشولە) واتە دەم وددان

(بەگەرماییٚ جلی دەکەن بەسەرماییٚ روتی دەکەن) واتە سیٚریٚ نانی

خڕە وەك گونی بابت کە دەقەرشی وەك ( قوزی ) دایکت واتە قاوغە پەمۆ

چاریان چاون هەشت هەنگاون دار لەناون واتە جوٚت وگا

(تیٚنانی سونەتە سورانی واجبە) واتە گوستیلە

هەردیٚت ودەڕوا و دەبزی

دەوی دینی لۆ قوزی

درانی نینە بگەزی. واتەلەکاتی مەشك ژاندن

لە ساماری بەفر دەباری . واتە ئارد لەهیٚرەنگ کردن.

(قۆریەی فەخفوری دوو رەنگی) واتە هیٚلکە

(هەر لەسەردەمی ئەسحابان، کوڕ گەورە ترە لەبابان) واتە ئیستر لەکەر گەورەترە

(تا کلکیٚی لیٚ نەکەیەوە ناخوریٚت) واتە میٚوژ

(سەری سۆرە عەلامەت بنی قوزە، قیامەت بەتەری دەبەنیٚ بە وشکی لیٚ دەردیٚنن ) واتە تەندوری نانی

*** *** ***

بابەتیٚکی ترمان هەیە من نازانم چی پیٚ دەڵیٚن چەند ڕستیٚیەکە دەبیٚت سیٚجار بە پەلە بیڵیٚی ئەگەر هەڵەت کرد بەزەرەری تۆ تەواو دەبیٚت، من پیٚم وایە ئەوەشیان بۆ کۆنترۆلکردنی میٚشك بووە، وەك مەشقی میٚشك بەکارهاتووە، بۆ گەشەکردنی میٚشك وە بۆ خۆشیش وەك زۆر وریانەبی لەکاتی گوتنی توشی هەڵە دەبی، یەکیٚك لە مەرجەکانی دەبیٚت بەپەلە بووتریٚت شەرتی سیٚجاریش بووتریٚت بەپەلە:

چومەسەر تویَ هەر توم خواردن،
چومەسەرگوی هەر توم خواردن
چومەسەرتوان هەر توم خواردن

--------------

پیرەژنیَ گوزەردە
دەوی بەگوزەردی من
گوزەردی منی بەدەوی
دەوی بەگوزەردی من

-----------

سەت دەرزی
دوروسەت دەرزی
بەکونیَ داکیّت دابەزی

----------------

بەشەویَ سیّشەمیَ
چومەشیریَ
شوم هینان
لۆ سەوەشیریَ

---------------

چومە خانیەکی بەقیّچ
لیّی بوو کەریّکی گون لەپیّچ
قونی لە گونان کردم پیّچ
گونم لە قونان کردن پیّچ
قونی لەگونان کردمە پیّچ

--------------

چومە زەویەکی بەنیسك
لیّی بوو نیریەکی بەتیس

**تیسکم گرت و هەری هاتمی**
**تیسکی گرتم و هەری هاتمێ**
**تیسکم گرت و هەری هاتمێ**

-------------

**قورێ کۆڕێ کەر قڕکردن .... سێجار بووترێ**

-------------

**(پیەە مەڕێ لە لا ڕێیان دەلە وەڕێ)**

---------------------

**قسەهاتە ڕوونامینێ چ گلەی و هەرزوو**

----------------

**قسەدروستێ**
**کردار سستێ**

-------------------

**زاری گۆتە زمانی**
**هەتا ئەتوم جیانی**
**خۆشیم نایەتەگیانی**

-----------------

**هۆ کابانۆکێ**
**جێی گۆلکێ**
**پرکە لەلۆلکێ**

**واتە کە چێڵ زا هەوڵ بدە لۆلکی بدەێ، لۆلك ئاردە بروشە زۆر بەهێزە و نەرمیشە بۆ هەزم بۆژنیش واپێویستە لە دوای منداڵ بوون شتی نەرم و شل بخوات.**

*** *** ***

**پوورەتەستیمان هەبوو خێزانی حاجی کەریمی بوو، خزمی خۆمانە ڕۆژێك زۆر لە حاجی کەریم تورە دەبێت دەڵێت ئەمن ئەڕۆم نایەمەوە ئەو مارەی بەرا ئاگات لەجوسکان بیت برسی نەبن ! ئەو ژن و پیاوە لەلای یەکتر زۆر بەڕێز بوون وە زۆر کاسبیش بوون لە هەموو گۆڤەندەکانی**

گوندی، ئەو ژن و مێردە یەکیان چوە سەرچۆپی و ئەوەی تر لە تەنشتی دەبوو، یەکتریان زۆ خۆش دەویا دونیا بۆکەس نیە تاسەری کەریم مردووە و ئەستیش پیر بووە.

*** *** ***

جاران کۆچەران کە پایزان لە کوێستان داتنەوە، پەنیر و ژاژی و خوێیان دەگوندان دەگێرا. بە سماق و پیواز و هەنجیر و مێوژیان دەگۆڕیەوە، یەکێك لەو ژنانەی دێتەگوندی بۆ شت گۆڕینەوە. لە ڕێگا ژنە ڕەوەندێکی تر دەبینێت پێی دەڵێت :

( کچێ هێ هێ سەرشینێ، ئەخشینێ، نەچیە مارا بەپەرژین، هەندت لێ ئەژەنن هەندت نی ئەژەنن ماستت پێ ئەکەنە دۆ) .تومەزانە ژنەتیم لەو ماڵە لێی قەوماوە !

*** *** ***

خزمینە قسەی من نییە قسەی کوردە
دەڵێت: شێت مەبە بۆقون و کەفەران
هەرامە هەوە لە چەقەران.
بۆتان شی ناکەمەوە هونەرە بەخۆتان بزانن وەڵامی ئەو پێناسەیە.

*** *** ***

باوازلە لەفۆلکلۆر بێنین بچینەوە سەر مەسەلەی (کەر تێدایە)ئەزانن ئەو رستەیەچییە؟

زستان و باب و سێ کوڕ دانیشتینە، داکیان لە پایزێ مردووە تەگبیر دەکەن چی بکەن یەکیان دەڵێت: بەهارێ کەرێ دەفرۆشین لۆ بابی بە ژن دەدەین، هەردوو براکەش رازی دەبن. دواتر باسی ڕەزدانان دەکەن، کە رەز دابنێن و ترێ ببەنەدەشتی هەولێر بەگەنم بیگۆڕنەوە، بەشێك لەو گەنمە بچێنن. باوکیان دەڵێت: کوڕم ئەنگۆ زۆر زۆر دوور ڕۆیشتن، وەرنەوە سەر مەسەلەی کەر تێدایە! منیش زۆردوور ڕۆیشتم لەگەڵ فۆلکلۆر.

بامنیش بگەڕێمەوە سەر مەسەلەی خۆم، پایزی -١٩٨٦- لە سەروی ئێمە بڕیار درا چالاکییەکی گەورە لە قەرەنیاغا بکرێت لە حەوزی بیتوێن زۆر لە تیپەکان بەشدار بوون لەم پەلاماردانە کاری ئێمە لە گەڵ کاك سابیر ڕەسوول تۆپباران کردنی بنکە سەربازیەکانی دەوروبەر بوو، لەو چالاکیە کۆمەڵێك سەربازو جاش کوژران وە قایدی سەربازی حەوزی بیتوێنیش کوژرا، شەوێکی زۆر ساردو تاریك بوو، هاوڕێیەکمان بە ناوی فەوزی شەقڵاوەیی لە سەرمان چاکەتی قایدی دەبەر کردبوو، بەنەجمەی سەربازی.

به هەڵە لە گوندی قەرەنیاغە، لە ماڵێکدا چەند کەسێك شەهید بوون، لەو شەهیدانە منداڵیشی تێدابوون، ئێمەش شەهیدمان هەبوون ناویانم لەبیر نەماوە، لەزستانی -١٩٨٧- بەتەواوی زستان ئێمە لە شەر دابووین لە قوڵی بێتواتەو دەورو بەری دواترئێمە چوینە سەرکردایەتی لەدۆڵی جافایەتی.

ناوچەکەمان لە بێتواتە پەلاماردرا بوو، شاخی مۆتە و دەورو بەری تاکو کێلی شەرەکە دەکەوێت، سەروی گوندی شیرە بە هەموو پێشمەرگە متەفریقەکان بەرگری دەکەن، لە شاخی مۆتە تاهیر و د.عومەر برای سابر رەسوور، شەهید دەبن، شەهید عومەر گەنجێکی جوان و باڵابەرز و تازە ژنی هێنا بوو، جاشەکان دوای شەهیدبوونی پەنجەی بە ئەڵقەی دەبڕن، بۆ هێنانەدەرەوەی ئەڵقەکە. لەو جاشانە جاشێك ..... هاتەلام دەی وت: من زۆر خزمەتی پێشمەرگەم کردوە خانەنشینم کەن وتم برۆ با چیای مۆتە خانەنیشینت کات جاشەکەچاوی شۆڕکردن و رۆیی دواتر لەخوا بە زیاد بێت کۆتایی هات ..... لە بەرنامەیەك حسێن بەشان لەگەڵ کۆمەڵێك برادەر بە شێوەیەکی نەهێنی خۆیان دەگەیەنیتە سەر جاشەکان جاشەکان باوەڕ ناکن بەو بەفرە زۆرە کەس بتوانێت بچیتە ئەوشوێنەی حسێن بەشان بۆی چووبوو، کە ناوی کێلی هەوارانە. لەوێ لێیان دەدەن لە خوارەوەش پەلامار یان دان، هەرتەلیش ئازاد کرایەوە.

ناوی حسێن بەشان هات بامەسەلەیەکی مام حسێن بەشان باس بکەین: مام حسین بەشان پیاوێکی بەرێز و خانەدان و نیشتمان پەروەر بووە، لە تەواوی ژیانی خۆی.... حسێن بەشان ئامێرکەرت بوو، لە سەرەتای شۆڕشی نوێی گەلەکەمان بووبوە پێشمەرگە، لەو دوایە کەرتێك بوولەتیپی (٨٣) هەورێ، کاك سابیر ئەی ویست حسێن بەشان وەك ئامێرکەرتەکانی تر ئیلتیزام بکات بەبەردەوام مام حسێن بەشانیش خاوەنی دوو خێزان بوو، یەك رەوە منداڵی هەبوون، بزن و چێڵ و زۆرشتی تری هەبوو، نەیدەتوانی مەقەڕی هەبێت دەوام بکات، کە دەچوەماڵەوە ئاگادارەدەکرایەوە بۆ جەولە تەلەفۆن ومۆبایلیش نەبوو، ئەوکات تاکو مام حسێنیش گوند بەگوند پێشمەرگەکانی ئاگادار دەکردەوە زۆر دوا دەکەوت لێرەموجامەلە دروست دەبوو، رۆژێکیان کاك سابیر وتی: پێویستەجەنابت وابکەی مام حسێن بەشان وتی کاك سابیر، ئەتوو دەتەوێت وەکی شێخی سیپەکورەم پێ بکەی؟ من سیپەکورەناکەم. کاك سابیر وتی حسێن بەشان سیپەکورە چییە؟ مام حسێن بەشان وتی: لە زەمانی زوو لەناوچەی( .......) فلان شێخ دەروشێکی متوکراوی هەبوو هەر دەروشێك بۆ تەریقەت وەرگرتن هاتبا، ئەو دەرویشە بە دەروێشە نوێیەکەی دەوت ( سیپە

کوره)، واته: خۆت دابینەوە شێخیش هەرامەی بەسەتی دەرویشەکەدادینا. ئەگەر دەرویش سربووبا واتە: مشاوەش بووبا ئەوپێیان دەوت تۆ بەکەلکی دەرویشایەتی نایێ ئەگەر دەرویش دەنگی نەکردبا، ئەوە تەریقەتی وەردەگرت، دەبووە دەروێشێکی گوێڕایەڵ وتی: کاك سابیر من سیپەکورەنابم !! بووە پێکەنین ئێستاش سیپەکورە لە ناو ئەو برادەرانەی ماون زۆرجار بۆ پێکەنین دووبارە دەبێتەوە.

*** *** ***

باسی شەهید سابیر رەسوول کرا، کاك سابیر پیاوێکی بە ئەدەب و دڵسۆز نیشتمانپەروەر دەستپاك بە وەفا بوو، بەڵام جارجار تۆزێك رکەستور بوو. باسم کردوە کەمام جەلال رای دەسپێرێت ئەوکات لەتیپی( ٢١) کەرکوك بوو وەزعی خۆشناوەتی زۆر خراپ بوو مام جەلال هەست بە شێوانی خۆشناوەتی دەکات و سابر رەسوولی ناردە سنوورەکەمان پیش کاك سابیر کەسێکی تربەناوی ...... بوو لەکاتی رۆیشتنی پێشمەرگەکانی مۆلیدەی مەلبەند لەگەڵ خۆیان دەبەن. کاك سابیر بروسکەیەکی بۆ مام جەلال کرد وتی مامە فلان مۆلیدەی بردوە. مام جەلال لە وەڵامدا وتی مۆلیدەیەك بکڕەوە. کاك سابیر وتی نای کڕم. هەمان مۆلیدەم دەوێتەوە ئەوکێشەیە زۆری خەیاند، مۆلیدە چەندان رۆژە رێ لێمان دووربوو، وازی نەهێناو مۆلیدەی هێناوە، مەسرەفی مۆلیدە هێنانەوە چوار مۆلیدەی پێ دەکرا. رۆژێکیان وتم باشە کاك سابیر بۆ وادەکەی؟ مۆلیدەیەك ناکڕیەوە... پارەت لەبەردەستە، وتی: دەزانی بۆ وادەکەم تا کابرا شەرم بکات جارێکی تر کاری وانەکات!

لە دووای ساڵی ( ١٩٩١ ) کاك سابیر رەسوول بووە قایمقام دوو شوێنیان بۆ دیارکرد، یان شاری کۆیە یان شەقلاوە، دواجار بووە قایمقامی شەقلاوە، رۆژێکیان چەندان لەبەرپرسانی حکومی و هەمووحیزبەکانی ئەوانەی مەقەڕیان لە شەقلاوەبوو، لەگەڵ ریشسپی و پیاوماقولانی شەقلاوە پێشنیارێك بۆ کاك سابیر رەسوول دەکەن، کە شەقلاوە بۆتە گوند پێویستە سنوورێك دابندرێت خەڵك چێر بەرەڵای ناو شار نەکات، شەقلاوە شارێکی گەشتوگوزاریە و ئێستا بوویتە گوندێکی گەورە پڕە لە چێل وبزن و مەڕ لەناوشار دەسوڕێنەوە شارناشیرین بووە، کاك سابیریش پیشنیارەکەی ئەقل دەبڕێت و پێی جوانە ولەجێی خۆیەتی، بڕیار دەردەکات وقەدەغەی چێر بکرێت. زۆربەی چێرەکان بەند کران، ئیتر دەبێتە هەرا پارتی وەك حیزب بەرگری لە چێرەکانی خۆی دەکات و یەکێتییش بەهەمان شێوە و شیوعیەکانیش هەروەها و شۆشیالیستیش وەك

ئەوان ... بەهەموویان هەوڵ دەدەن بڕیارەکەی کاك سابیر هەڵوەشێتەوە و جێ نەکرێت. بۆ ئەوەی ئەندامەکانیان تووڕەنەبن لەسەر چێران چونکە بەشێکی زۆری خەڵك بۆ بەرژەوەندی خۆی دەبێتە ئەندامی پارتەسیاسیەکان، بە خەیاڵیشی دانایت پارتێکی سیاسی هەڵبژێرێت کە بەرنامەکەی خزمەتی گشتی بکات وەهەڵوێستیشی هەبێت ئایە ئەوحیزبە راستگۆیە لە خزمەتی بەرژەوەندیی گشتی کار بۆ یەکخستنی ژێرخانی دەوڵەتی کوردی دەکات، بە قسەنا بە کردەوە باوەڕی بەدیموکراتیەت هەیە، یان هەر قسەیە..! کاك سابیر تووڕە دەبێت و دەڵێت: ئەو میللەتە شێت بووە، چێر و بزن و مەڕیش بووینە ئەندامی حیزبەکان . واباشە تاکو منیش شێت نەبوویمە بڕۆم باشە لە رکی چێربوون بە ئەندامی حیزبەکان وازی هێناو دووسێ جوێنی تەڕیشی بە هەموویاندا. لەسەر دەروازەی( تورکیا،کوردستان ) نووسراویکی دەست لە کارکێشانەوەی خۆی نووسی و ناردیەوە کوردستان. بەداخەوە دواتر ئەوشێرەپیاوە لە وڵاتی غەریبی شەهید بوو، کە حکومەت و یاسای پێ لە حیزب و چێر وبزن و مەر گەورەتر بوو، ئەو شوێنەی حسێن بەشان بۆی چوو ئەو شاخە نزیك لەدوومەتر، زیاتر بەفری لێ بووە، ئەوەی لەهەمووی ناخۆشتربوو، شەهید عومەر رەسووڵ برای سابر ڕەسووڵ پێم وایە یەك حەفتەبوو ژنی هێنا بوو، ماڵی لە گوندی کانی بەرد بوو، دوای ئەو شەڕە ماوەیەك دووژمن نەهاتەوە، وازی لەپەلامار هێنا، دیارە شەو ڕۆژ بەدرێژایی ئەو زستانە لە چوار لاوە تۆپباران دەکراین لە سەروچاوەو چوارقورنەو هیزوپ و سەرمەیدان دواتر لە دیانانیش تۆپباران دەکراین ... باسی فڕۆکەش هەر مەکە!... بێنە بەر چاوی خۆت ڕۆژانە تۆپباران و تیارە میوانمان بوو لەناو ئەو هەموو بەزم و هەرایە جووتیارانمان کاروکاسیی خۆیان دەکرد ئیدارەی هیزی پێشمەرگەش یان دەدا دایك و خوشکانیش ئازایانە هاوکاری پیاوەکانیان دەکرد نانیشیان لە کاتی وەخت و ناوەخت دەدایە پێشمەرگە لەخزمەتی پێشمەرگەدابوون ئەوەی منی ناڕەحەت دەکرد، ترسانی مناڵان بوو لە فڕۆکە و تۆپباران زۆر جار ئەو پەپولانە پارچەپارچ دەبوون، خوشکانیش دوو کێشەیان هەبوو، بە ڕۆژ ناوێران لە ماڵەوە نان بکەن، بەشەویش لەبەر ڕەسەدی سەر شاخی شیشار... ڕژێم بەرنامەیەکی دارێشت بوو، بۆ رووخانی وورەی جەماوەر پێشمەرگە لەڕوی دەروونی لەدوای کات نۆی شەو هەموو سەرە سعاتەکان کۆمەڵێك گوللەتۆپی ئاراستەی ناوچەکە دەکرد تابەیانی بەردەوام دەبوو، بەڕۆژیش کاکی تەیارەی هەمەجۆر تەقەمەنی تەیارەکان ناپاڵم سارۆخی -٥٠٠ – کیلۆی -٢٥٠ –کیلوی سارۆخی هێشوەی کە هەر سارۆخێك -٢٥٠ – سارۆخی تێدابوو،

سارۆخی دایك لەبەرزایکی دیاری کراو دەکرایەوە ناوچیکی دیاری کراو وێران دەبوو یکێکیتر سارۆخیك بوو پڕ لە شلەیك کە بەر ئەرز دەکەوت ئەوشلەیە بە مەسافەی زیاتر لە ‎-١٠٠‏ مەتر لە شوێنی خۆی دەکردە یەك پارچە ئاگر ئەو شلەیە ئاگری دەگرت لە سەر دار بەرد مرۆڤ ئاژەڵی دە سوتاند، شلکە ڕنگ و شێوەی وەك کەتیرە وا بوو، جۆریکی تر سارۆخەکە لەناوەوە دوو بەرگە، برگی یەکەم پڕە لە تێنتی برگی دوەم پڕە شیشی سەبە، بە چەند سانتیمێك براون دیارە سارۆخی چەکی کیمیاش جیاوازە، بەداخەوە گەنجانی ئێمە وادەزانن کارەساتی ئێمە ئەنفال و کیمیابارانە پێش ئەنفال و کیمیاش داروبەردی ئەو کوردستانە کرابووە یەك پارچە ئاگر هەموو ئەو ناوچانەی لەژێر دەستی پێشمەرگە بوون دەکرێت هێزی پێشمەرگە لەو ژینگە سەخت و کارەسات وجەرگبڕە بۆ بەرنگار بوونەوەی ناوەناوە لە کوشتن و تۆڵەکردنەوە هەڵە و زێدەڕۆیی کرابێت ئێوەی گەنجیش توشی ئەو ڕۆژە ڕەشە بن، لەوانەیە هەڵە بکەن، یان لە تۆڵە زێدەڕۆیی بکەن... ئێمە وامان لێهات بوو دڵڕەق بووبووین، کەمتر بەبەزەیی بووین چ لەبەرانبەر دۆست یان دووژمن! واتە: ئەگەر برامان شەهید بووبا، گریان نەمابوو دوای چەند کاتژمیرێك لە بیر دەکرا، ئەگەر واشمان نەکردبا ناکرا، من زۆربەی ئەو سارۆخانەم پاراستوە ئەوەی باوەڕ ناکات بابێت سەیریان کات، لە بالیسان ئەوە وەزعی ناوچە رزگار کراوەکان بوو، دیارە وەزعی ناوشارەکانیش لە ئێمە خراپتر بوو، بەڵام بە جۆرێکی تر با کەسێکی ناو شار وەسفی شار بکات لەوانەیە ئەو لەمن شارەزاتر بێت، چونکە من خەڵکی شار نیم . جارێکی تر سەرکردایەتی داوای لە تیپەکانی مەڵبەندی چوار کرد ئێمەش خۆمان کۆکردەوە و بەرەو سکتان بەڕێکەوتین مام جەلال داوای ملا پالۆی کوردستانی باکووری کردبوو ئەویش بووە هاورێی ڕێگامان چەند ڕۆژێك لە سکتان بووین بەو نیازەی ڕێڕۆنیمان دەست کەوێت، بتوانین بەبیتوین بچینەوە بناری کۆسرەت لەوێ بۆ ئەوبەری ناوچەی مەرگە چونکە ڕێگاکە زۆر نزیکتر بوو، بەڵام مەترسی داریش بوو بەرێکەتین من و ئازاد عەسکەری دابڕاین و ڕێگامان هەڵەکرد بەرەو گوندی گرد گۆران چوین، لەپەرگەی گوندی کەسێکمان لێ پیدابوو وتی: برادەران ئێوە چنە وتمان پێشمەرگەی یەکیەتین وتی: لە شوێنی خۆتان دانیشن واهاتم کابرا هات و وتی براینە هێزیکی زۆری مەفرەخاسە لەناو گوندیە بەپەلە بگەڕینەوە منیش وتم باشە دەست خۆش دەگەڕێینەوە ئەگەر دوکان لەناو گوندی هەیە برۆ چەند پاکەتێکی جگەرەم بۆبێنە و دەڕۆین کابرا وتی کاکی من وەختی ئەوەنیە ها ئەوەپاکەت برۆن لەکۆرم ببنەوە ئێمەش گەڕاینەوە

دوواتر براده‌رانن دیتنه‌وه وه‌به شه‌هید عه‌لی وه‌یسمان گوت ئاگاداربه رژێم چاودێریمان ده‌کات ئه‌ڕێگای مه‌فره‌زه خاسه‌کان وتی باشه‌و ئاگاداری براده‌رانی کرده‌وه که‌وا به چاوکراوه‌یی به‌ڕێبکه‌وین و به‌ره‌و دۆڵی نێوه چوین ناوی شوێنه‌که نازانم گۆڕستانیکی گه‌وره‌ی لێ بوو له‌گۆڕستان ده‌رچوین ،که‌وتینه که‌مین به‌ڵام که‌مینه‌که تۆزێك لێمان دووربوون ئێمه‌ش ته‌قه‌مان لێکرن به‌بێ زیان پاشه‌کشه‌مان کرد، گه‌ڕاینه‌وه گوندی کۆلکه‌ڕه‌ش بۆ ئه‌وه‌ی به‌سه‌ری دانه‌ڕژین ئه‌و گوندانه زۆر باش بوون له‌گه‌ڵ پێشمه‌رگه به تایبه‌تی خه‌ڵکی کۆلکه‌ره‌ش، بۆنان خواردن چوینه نازه‌نین له نازه‌نین دابه‌ش بووین دیاره پێشمه‌رگه‌ی تریشی لێبوون من و دوو هاوڕێ چوینه ماڵێك یه‌ك له‌و هاوڕیانه له‌تیپه‌که‌ی ئێمه نه‌بوو، دیاره من ئه‌وکه‌سه‌م ده‌ناسی چونکه پێشتر له‌ناو چه‌ی ئێمه حاکم بوو دانیشتین زۆر به خێرهاتنیان کردین کچێك خزمه‌تی ئێمه‌ی ده‌کرد، له کاتی نان لێوه‌رگرتن ئه‌و حاکمه کارێکی نابه‌جێی له‌گه‌ڵ کچه‌که کرد هه‌رچه‌نده ئێمه هه‌ستمان پێنه‌کر کچه‌که وتی فلان ئه‌و کاره‌ی ده‌بینی کێی ئه‌وکه‌ره‌ت تێ، دیار بوو کچه‌که ناویشی ده‌زانی، من و هاوڕێکه‌م ده‌ستمان ره‌ق بوو و هه‌ستاین و به‌کابرامان وت نامه‌رد ئه‌وه‌چ بوو کچه‌که په‌لاماری ئێمه‌ی دا و وتی ئێوه برای منن ئێوه نانی خۆتان بخۆن وتم خوشکم ئه‌ونانه کو ده‌خورێت ئێمه رۆیشتین و نانمان نه‌خوارد هه‌رچه‌نده کچه‌که زۆر داوای لێکردین نه‌گه‌ڕاینه‌وه دواتر ناوبراو به‌دوامان که‌وت وتی خواو پێغه‌مبه‌رم هێنانه ره‌جا قسه‌م لێ مه‌که‌ن ئێمه‌ش کابرامان زۆر ره‌زیل کرد و زۆرقسه‌مان پێ وت کابرا زۆر ترسا چونکه ئه‌وه‌مه‌سه‌له‌یه تاوان بوو، له بنباری پێشمه‌رگه ئه‌گه‌ر زاندرابا ئه‌و شه‌وه به‌برسیه‌تی من و هاوڕێکه‌م ماینه‌وه شه‌و هه‌ندێك کێکمان خوارد له (اا ) شه‌و مێشوله ده‌وریان لێداین ده‌ردێکیان پێکردین به‌و شه‌وه له نازه‌نین له‌به‌ر پێشوله هه‌راتین، چوینه‌وه سه‌ر جاده‌ی کۆلکه ره‌ش نووستین به‌یانی دابه‌ش بووین له‌لای خزمانی کۆلکه‌ره‌ش بۆ ئێواره به‌ته‌ره‌نکته‌ر به‌ره‌و جه‌لی به‌ڕێکه‌وتین له‌ڕێگا ته‌ره‌نکتر وه‌رگه‌را چونکه رێژه‌یه‌کی زۆر سوار ببووین له‌کاتی وه‌رگه‌ران له‌ناو یه‌کتر گیرمان خواردبوو، چه‌ندان پێشمه‌رگه‌مان برینداربوون ئه‌وه‌ی له‌بیرم مابێت مه‌لا پالۆ، سابیر بێکه‌س عوسمان میرگه‌سه‌ری زۆری تر سابیر بێکه‌س لوله‌ی چه‌ك چوبووه ناولوتی لوتی دراند بوو دووباره گه‌راینه‌وه کۆلکه‌ره‌ش و به‌شێك له‌وبریندارانه‌مان ره‌وانه‌ی بالیسان کرده‌وه ئه‌وجاره‌یان به‌ڕێکه‌وتین به‌ره‌و ده‌شتی کۆیه‌و دۆڵی جافه‌تی و قوله‌جاف خۆبگره و هاتین . خه‌جه له‌رزۆك به‌ر ئێمه که‌وت شاخی کۆڕه‌نگ و ده‌وروبه‌ری وه‌به‌ر دوانزه‌ی سۆران و کارۆخ و تیپه‌کانی تر، تیپی -٨٣-ی هه‌ورێ زیاتر له

**خەجەلەرزۆك، بووین چیایەکە دەڕوانێتە سەرکارێزە و دەوروبەری بەتایبەتی لەکاتی بەرگریەکە زیاتر پشت بە ئێمە دەبەسترا واتە: ئەو تیپانەی کە سنوورەکەیان شاخاوی بوون، کۆرەنگ و عەولا بۆرو دۆشکە وپێشمەرگەکانیان ون نابێت لە مێژوودا دوشتی لە یەك جیانەکراوەن تیپەکانی پێدەشتەکان زۆر ئازاتر بوون،لە ئێمە هەر شوێنێکی زۆر ستەمبایە، دەیان گرت دیارە حەزیان لە شەڕی شاخ و بەرگری ناکرد واتە ئێمە خۆڕاگرتر بووین لەوان ئەوان ئازاتر بوون، کەوابوو هەردولا تەواوکەری یەکتر بووین، جەنابی کاك کۆسرەت لە شەڕگەکان هەموو دەم شان بەشانی ئێمە لە شەڕگەکان لەگەڵمان بوو، رۆژێکیان لەخوار گردی خەجەلەرزۆك من لەکاك کۆسرەت نزیك بووم هێزکی زەبەلاحی رژێم سەرکەوت بۆ شاخی حەسەن بەگ سەعیدی حەمەزیاد لای کاك کۆسرەت بوو وتی سەعید حەسەن بەگ گیرا هیمەت بکە۔ بەینی ئێمەو حەسەن بەگ زیاتر لە دەکیلۆ مەتر دە بوو، سەعید هەستاو ڕای کرد دەپانزە پێشمەرگە، بەدوای ڕایان کرد سەیرەکە لەوەبوو نەجوابی کاك کۆسرەتی دایەوە، نە بەپێشمەرگەکانی وت بابڕۆین لەبەرچاوی ئێمە ئەو غارەی لەلای ئێمە دەستی پێ کرد بەردەوام بوو، تاگەیشتە دوژمن و دوژمنی شکاندوکەوتەدوای بە قسە خۆشە بڕۆن سەیرکەن نێوان قولەجاف و سەری حەسەنبەگ باسی هەورازیش هەرمەکە لێرە خۆشەویستی کاك کۆسرەت و هەیبەتی کاك کۆسرەت دەر دەکەوێت کە هێزی پێشمەرگە چەند گوێڕایەڵی بوون، شەوێکیان پێشمەرگەیەك بەلایەت شەڕی بەدەبابە دەفرۆشت دەبابەکە گولەتۆپێکی لە پێشمەرگەکەدا شەهید بوو . من لەسەر داوای برادەران ماوەیەك لە قولەجاف ئیدارەبووم شەوەکیان لە خەجەلەرزۆك تەقە دەستی پێ کرد بەڵام چ تەقەیەك ! دنیا خەرابوون بوو (ڕاید جەلال) ئەوشەوە لەلای من بوو. سەربازانە و هەستاو وتی هەستە بابڕۆین ئێمە بەرەو خەجەلەرزۆك چوین لە رووبار پەرینەوە وەك بارانی بەهارێ تۆپمان بۆ هات، هجوم لەسەر برادەران بوو، تۆپەکان لەپشت پێشمەرگە دەدران واتە هەمووی بۆ ئێمە بوو من بە چرکەش بەتەمای خۆم نەبووم، نەبەتەمای ڕایدجەلال نەجاتمان بی، بەدەیان تۆپ بە دەوربەرمان دەکەوت کارەساتەکەی من لەوەبوو ئەو بەردەوام بوو لەرۆیشتن بەمنیشی دەگوت: ئاگات لە خۆبێت کەتۆپ بەر ئەرز دەکەوێ درێژبە منیش بەتوندی بەقسەکەی ڕاید جەلال پێکەنیم و ڕاید جەلال وتی وەختی پێکەنینە بەچی پێدەکەنی وتم توخوا ئەوەقسەیە تۆ دەیکەی لەرۆیشتن دەکرێت درێژبی دیار بوو ئەویش پێکەنی بەڕاستی نەترس بوو بەهیمەت بوو تاکوئێمە گیشتینە برادەران دووژمن شکا**

و ئێمەش گەڕاینەوە وردە وردە بە جیهاز پەیوەندی بەجاشەکان دەکرا جاشەکان وایان پێ باش بوو کە هجومی ئێمەیان دەکرد لە دوورەوە تەقەیان لێ بکەین بۆ ئەوەی ئەوانیش تەقەبکەن و رابکەن ئێمەش پێمان باش بوو تەقەنەکەین تاکو لێمان نزیك دەبنەوە بۆئەوەی هەندێکیان لێ بکوژین شەڕی سەخت لەسەر عەولابۆر و برادەران و سۆران بوو ناوەناوە هەندێك جاش مەعلوماتی باشیان دەدا لەسەر کاتی هێرشیان، یان خەسارەتی دوژمن جاشەکانیش فێرزان بوون ناوی خوازراویان بە کاردێنا بۆ ئەوەی لەلای ڕژێم ئاشکرانەبن یەکیانم لەبیرماوە ناوی لەخۆ نابوو(خەپ)

ڕووباری قولەجاغ ماسی باشی تێدابوون، بە برادەرانی دیموکرات ناردمە سولەیمانی چەند قولابێکیان بۆ هینان ناوە ناوە دوسێ پێشمەرگەم داوەت دەکرد، بەگۆشت ماسی ئێمە بەهۆی زۆری ڕێژەی تۆپ باران لێ ڕاهاتبووین ، ڕۆژێکیان خەریکی ماسی گرتن بووم ، تۆپبارانیش ڕووبارەکەی ویران کردبوو دیارە ئەگەر ماوەیەك لە شەرگە بووی لەگەڵ مەترسیەکان لێڕادێی لەلات دەبێتە شتێکی ئاسایی سەیرم کرد گەنجێك ڕووبارو ڕووبار خۆی بەدارو بەرد دەدا لەترسی تۆپ باران زۆرپەشۆکاو دیار بوو گەیشتە لای من پەلامارەم دا و گرتم وتم وەرەدانیشە، هێنام لەلای خۆم دانا و وتی ئەی ئەوتۆپبارانەنابینی وتم چنیە مەترسێ وتم ئاوێك بخۆوە ئاوی خواردەوەو وتم جگەرەدەخۆی وتی بەڵێ جگەریکم داێ و وتم چکارەی لێرە، وتی بەملی شکاوم هاتم سەرێکم لەبراکەم بدەم لەپرتۆپێك لەنزیکمان بەرئەرزکەوت کابرا زۆر ترسا دەستم گرت و بردمەوە قولەجاخ لە ڕێگا دەیوت ئەوجارەی ئەجاتم بێت ئەگەر برام شەهیدیش بێت نایەم تەرمەکەشی ببینم .

ڕۆژێکیان چومە ماڵی مام حاجی قولەجاغی ماڵیان لەسەروی قولەجاغ بوو لە کەندێك بۆ پاراستنی ماڵ و منداڵی لە دووژمن ماڵی لەوێدانابوو چونی من بۆ ماڵی مام حاجی ئاو بۆ هێزی پێشمەرگە بباتە شاخی کۆرەنگ بۆ سۆران و تیپەکانی تر ، منیش نزیك بوومەوە وتم سەلام وتی سەلام بەخێرنێت هەردووچاوت دەرێ ئیتر هەزار جوێن لەمنەوە تاکو بەرێز مام جەلال کەوتە حاڵەتی شلم کوێرم، کەس ناپرسم منیش بەبێدەنگ لە بەرانبەری ڕاوەستام تا هیلاك بوو جوێنی دا... کەماندو بوو تۆزێك داما وتم دوو قسە بکەم بە دەنگێکی بەرزو تورە وتی: ئا بزانم جنابت چ دەڵێیت وتم: مام حاجی بەس بزانم بۆ تورەی دیسان دەستی بەجوێن کردەوە وتی ئێوە سەگباوکن بێ ئەخلاقن چەند مانگە نان و ئاوتان بۆ دەبەمەسەر شاخی ئێوە

دەچن جیسک لەکوڕەکەم دەدزن قوزلقورتی دەکەن، وتم مام حاجی ئەوە زۆر ئاسانە چارەی دەکەم وتی چۆن وتم جیسکی تۆ چەند پارەی دەکرد وتی سیو پێنج دینار وتم باشە من چل دینارت دەدەمێ وتی باشە وەرە دانیشە دانیشتم بە نەرمی وتی کورم من دەیان جیسکم بۆ پێشمەرگە سەر بڕیوە بەڵام دزیم پێناخۆشە وتم راست دەکەی دیارە من زانیم کێ ئەو کارەی کردبوو ناوی نابەین چونکە کورد دەڵێت برسیەتی ڕێیەکی لەهاریە یارەبی کەس برسی نەبێت ، بەخۆم و مام حاجی هاتینە لای کاک سابیر رەسوول چیوکەکەم بۆ گێڕایەوە کاک سابیریش هەندی نیوەی مام حاجی جوێنی بەداروبەردا چل دینارم لێوەرگرت مام حاجی چو و ئاوی گەیاندەچیای کۆرەنگ. ڕۆژێکیان چومەلای مام جەلال بەمەبەستی هینانی ئێستر پێویستیمان بەئێستربوو قەولی بەکاک سابیر دابوو ئێسترەکمان بداتێ لە ڕێگا لەنزیك هەڵەدن دەنگی چەند تەیارەیك بەر گوێم کەوت لەبەرزێکی زۆر منیش سەیری ئاسمانم کرد لەئاسمان شتێکی سپی بەرێژەیکی زۆر داتنەخوارێ چاوەڕێم کرد تاکوکەوتنە خوارەوە سریرم کرد لەفافی برین پێچان بوون دەستم بۆنەبردن وتم دوژمن مان ئەوەندە مرۆڤ دۆست نیە بەزەی بەبرندارەکان بێتەوە دیاربوو چەند پێشمەرگیکی تریش پەیدابوون دواتر دەرکەوت لەفافەکان ژەراوی کرابوون بۆ ئەوەی پێشمەرگە برندارەکان لەبرینەکانیان ببستن و شەهید بن پێم وایە هەول درا لەناویان ببەن سەیربوو هەندێك جار دووژمن زۆر بەنەزان دە هێزی پێشمەرگەدەگەیشت یان ڕژێم بەبەرنامە وای لەپیاوەکان گەیاندبوو کەپێشمەرگە وەك کیوی وان نایان دەزانی ئێمە لەوسەری هاتینەوە و زۆریش لەوان وشیارترین، بەرێ کەوتم بۆ مەقەری بەرێز مام جەلال منیش زۆر هیلاك بووم لەنزیك مام جەلال دانیشتبووم لەبن ساباتێکی جیاواز کەبۆ میوان دروست کرابوو کەسکی لای ئێمە لەشەر کەمتەر خەمییەکی زۆری نواندبوو من دەمزانی،کە کەمتەر خەمیەکەی نواندبوو هات و چوەلای مام جەلال گوێم لێ بوو، وتی سەلام مامە مام وتی یاخوابەخێربێیت پاڵەوان مام وتی فلان دەزانی بۆ لەدوام ناردوی وتی نەخێر مامە .مامە وتی دەت کەمەبەرپرسی هەی سگ باوك ترسنۆك مام دەنگی بەرزکردەوە هەزارو یك جوینی بەکابرادا دواتر دەری کرد لەو کات تاکو ئێستا کابرا ئێمەی بەجێ هێشت باسی ئەویتریش ناکەم دواتر چومە لای مام جەلال توڕەبوونی هەر پێوەدیار بوو دوای چاکوچۆنی نامەی سابیر رەسوولم ویداوەو مام وتی رۆلە خەرکی چناوچەیێکی وتم بالیسان وتی مام خۆشناوی وتم بەڵێ وتی خۆشناوی هەرامە .تەواوی نەکرد ئاگاداری برادەرانی کردەوە و وتی برۆن ئیسترێکی باشی بدەنە ئەو

**خۆشناوەی و سەلام لە برادەرا بکە مالّئاواییم کرد و ئێستەکەم وەرگرت و بەرەو لای قولەجاغ گەرامەوە لەو ماوەیە برادەرانی دیموکرات هاتووچۆی شاری سلێمانیان دەکرد هەرشتێکمان پێویست ببایە لە دارتابەرد لاریان نەبوو زۆر بەسۆز بوون لەگەڵمان، دوای ماوەیەك گەڕاینەوە ناوچەکەمان ماوەیەك پشوماندا.**

**دووبارە ئاگادار کراینەوە بەنیازی جەولەین بەڕێکەوتین چوینە سماقوڵی کاك کۆسرەت داوەتێکی باشی کردین ڕۆژی دواتر تەقەمەنی یەکی باشی داینێ، بەڕێکەوتین بەرەو دەشتی کۆیە کاك کۆسرەت بەخۆشی هات، گوند بە گوند تاکو گەیشتینە کانی بی ڕژێم تۆقی بوو، هەستی بەو هێزە کرد بوو ڕۆژانە کۆپتەر و تەیارەی لە جۆری عەنتەر پەلاماری گوندەکانی دەشتی کۆیەی دەدا کۆپتەرەکان بەناپاڵم گوندەکانیان بۆردوومان دەکرد وە زۆر لەبەرزیەوە زۆر بێ ڕوحمانە چەندان هاوڵاتی و پێشمەرگە شەهید بوون یکێك لە برینندارەکان( عمەر مەلەکی ـ گۆرەشێری) بوو چاویکی لەدەست دا و لەگەڵ چەند پەنجەیك، عمەر مەلەکی بەو حالە لە ئەنفالەکان زیاتر لەچوار مانگ بەتەنیا مەلەکانی بەجێنەهێشت وتی من مەلەکیم و بۆتان چۆل ناکەم .. چەند ڕۆژێك لەوێ ماینەوە خەلکی دەشتی کۆیە جیاواز بوون لەگەڵ زۆریەی ناوچەکان ڕێزی زۆریان دەگرتین خواردنی چاکیان دەداینێ نەیان دەهێشت بچینەوە مزگەوت بنوێن هەر لەماڵی خۆیاندا دەیان نواندین ڕۆژکیان چەند پێشمەرگەیەك بووین لەوانە مام قادر خەتی چەند کەسێکی تر دەمان وست لەزێ بپەرینەوە بە کەلەك، لەناوزێ دوو تەیارەمان گەیشتنەسەر سەرمان ترسان و پێکەنینمان تێکەڵ ببوو کەلەکیش ئەوەنازانێت زۆر بەهێواشی زێی دەبری، گەیشتینە ئەوبەر و خۆمان لەبن دارەبیەك مات کرد لەنزیك ماڵە جووتیارێك کابرای جووتیار زۆر بەپەلە منالّەکانی بردنە ناو کونەتەیارەودەستی دایەپەرەشوتێك و سەری لە کونێ دەرهێناو کەوتە تەقەلە تەیارە پیاوێکی زۆر ئازابوو زۆرکەیفمان پێهات، دواتر هەندێك ماسیمان کڕی و لەگەڵ ئەوماڵباتەمان خواردن هەمان ئێوارە چەند تەیارێکی عەنتەر گوندی کانی بیان زۆربەخەستی بۆردوومان کرد شەهید وبریندار هەبوون گوندی کانی بی میەگوند بوو ڕێژەی دانیشتوانی زۆربوون، هێزەکە بەڕێکەوت بەرەو دۆڵی جافایەتی لەبیرم نەماوە ئێمە(کەرتی تیپ) بۆلەتیپی ٨٣ی هەورێ دابڕاین ئێمەپێنج کەس بووین سەنگەر ئامێرکەرتیشمان لەگەڵ بوو، چوینەوە گوندی عەسکەر ئاگادار کراینەوە کە برادەران دەرچون واتە لەجادەی سلیمانی دوکان پەڕینەوە دوای ئەوان ڕژێم ڕێگاکانی هەمووگرتبوو هێزێك بەرەو لایی ئێمەش لەڕێدا**

بوو واته پێشەوەمان گیرابوو لەدواوەشمان ڕژێم بۆمان دات ئێمە بەو هێزە کەمە و ناشارەزا لە ناوچەکە بە پەلە لەسەر ڕێنوێنی خەڵکی چوینە چەمی ڕێزان خۆمان شاردەوە دوسێ شەو ڕۆژ ماینەوە چەمی ڕێزان چەمێکی عاسێ و باشە بۆ خۆ شاردنەوە ئەشکەوتێکی ئاساری لێیە. بەرامبەری قەڵایەکی سەخت و کۆنی لێیە ئەگەر دەستکاری بکرێت دەبێتە ناوچەیەکی خۆشی گەشت و گوزاری، سەدەیەکی ئاو گلدانەوەی لێ بکرێت زۆر لە دووکان خۆشتر دەبێت و زۆریش فێنکترە دووکان زۆرگەرمە بەهاوینان چەمی ڕێزان فنك ترە، دواتر بە ڕێکەوتین بەرەو قەمچوغە لەوێ بەرە و سەرگەڵو تاکو ئێمە گیشتینە گوندی ( گەرەدێ ) داستانی ڕزگاری کۆتایی هاتبوو ئێمە گەیشتینە پێش مزگەوتی گەرەدێ کۆمەڵێك پێشمەرگە زۆر بە توندی پێدەکەنین کە تەماشام کرد دەورەیان لە جاشێك دابوو جاشەکە دوو گوللەی بە هەردوو قاچی کەوتبوو، پێشمەرگەکان پێیان ڕادەبوارد، شەو لەگەرەدێ ماینەوە ماڵەکان چۆل کرابوون. پیداویستی ماڵەوە دەسکاری نەکرابوون چوینە ماڵێك ماڵێکی پاك وخاوین، کەسی لێنەبوو منیش دەستم کرد بەکێشت لێنان لە ناکاو دوو هاوڵاتی پێدابوون وتیان ماڵێ میوان ڕادەگرن برادەران وتیان فەرموون لەخزمەت داین، ئەوان بە بێدەنگی دانیشتن منیش کێشتم لێناو سفرەی نانم ڕاخست و بۆم تێکردن نان خوراو بە چەند برادەریکم وت قاپەکان بشۆن بەخاوێنی لەشوێنی خۆی دابنێنەوە چام لێناو چاخورایەوە وشتەکانم شوتن و لەشوێنی خۆم دانانەوە ماڵەکەمان پاك کردەوەو بەمیوانەکانم گوت برادەرینە ئێمەدەڕۆین ئێوە نارۆن، وتیان کاکە ئێمە خاوەن ماڵین دەنگمان نەکرد گوتمان بزانین چدەکەن تاکو ئێوە لێرنە هەمووڕۆژێ وەرنەوە ئەوماڵە ماڵی خۆتانە دوواتر برادەرانمان دیتەوە و بەڕێکەوتین بۆ دۆڵێك لە باکووری گەرەدێ لەوێ برادەران باسی خۆشی شەرەکەیان بۆ گێڕاینەوە گە سەرباز و جاشەکانی ڕژێم چەند بێ وورەبووینە و چەند ڕەزیل کراون، یەکێك لە کەرتەکانی ئێمە توشی جاشیك دەبن جاشەکەدەڵێت: مەم کوژن من خزمی سابیر ڕەسوڵم یەکێك لە پێشمەرگەکان دەڵێت: دایکت والێ بکەم، لەگەڵ دایکی سابیر ڕەسوول یەك سریە کلاشینکۆفی لێ دەدات دەی کوژێت برادران دەڵێن بۆ کوشتت ؟

دەڵێت ئەگەر خزمی کاك سابیر بووایە لەگەڵ کاك سابیر دەبوو دیارە وەسفی داستانی ڕزگاری بە من ناکریت دەسکەوتی زۆروبوو پیاوانی ڕژێم زۆر دەستگیرکران ئەوەی من زانیم گوایە ڕێك کەوتنێك هەبوو لەنێوان ئێمە و ئێران گوایە لە ماوەت تاکو ئەزمەر لە ڕژێم پاك بکرێتەوە دیارە ئەوەش لە بەرژەوەندی یەکێتی بوو بۆیە ئێران لە کاتی جێبەجێکردنی پاشگەز

بووەوە بەوەشەوە نەوەستا ئێران شەڕی لەگەڵ سوپای عیراق لە ناوچەی ماوەت ڕاگرت ئێمە واجبمان کەوتە باکووری گوندی(گەرەدێ) دواتر ڕژێم بەپاڵ پشتی سەدان کەتیبەی تۆپی جۆراو جۆر ڕێژانە بە دەیان فرۆکەی جۆراو جۆر کەوتە بۆردومانی ئێمە دەیان فەوجی حەرەس جەمهوری و قوەخاسە دەیان هەزار سەر بازوجاش پەلاماریان داین لە هەمووقوڵەکان بەتایبەتی قوڵی ئێمە شەڕێك ڕووبەڕوومان بووەوە کەبەدەگمەن شەڕی وا باوەڕناکەم لەنێوان روسیاو ئەلمانیاش ڕوی دابێت سەربازەکانی ڕووبەڕووی ئێمە ببوونەوە قوەخاسەوحەرەس جەمبووری بوون، زۆربەیان دوو چەکیان پێ بوو سەربازەکان بەدوو شێوە دەکوژران بەتایبەتی ئەو ڕۆژەی ئێمە پاشەکشێمان کرد یان ئێمە شکاین ناوەناوە هجومیان دەکرد کە زۆریان لێ دەکوژران ڕایان دەکرد هێزێکی خۆیان ئەوەی ڕای دەکرد خۆیان دەیان کوشت وایی لێهات بوو، نێوان ئێمە و ئەوان وەك خۆشناو دەڵێت: چەند گوریسێك بوو سەربازێك زۆر نزیك بوو ویستی بە ئارپیجی لێمان بدات، شەهید کێخوا زووتر لێی داو کوشتی پەلاماری سەربازەکەی داو ئارپیجیەکەی هێنا وەك سەربازەکە هەستا وتی بەچەکی ئەوان ئەوان دەکوژم چەند برادەران وتیان کێخوا دانیشە دانەنیشت سەربازێك تەقەی لە کێخواکرد و شەهیدی کرد، دیارە پێشتریش لە ئێمە هاوڕێ مستەفا خزمی شەهید علی وەیسی بەسەختی بریندار بوو گوللەیەك بە سنگی کەوت بوو جەرگی بڕی بوو مستەفا ڕەوانەی نەخۆشخانەی برادەرانی دیموکراتی ئێران کراو چارەسەریان کرد، لە سەرووی ئێمە برادەرانی بەڕانەتی توشی شەڕێکی زۆر سەخت بووبوون وەسفی شەڕەکە مەگەر ئەوان بیکەن شەڕەکەیان چۆن بووە دەستەویخە شەهید علی وتبووی برادەران هەستن کەڵکی نەما بەدەستان دەمان گرن برادەران دەڕۆن سەربازەکان زۆر نزیك دەبنەوە شەهید علی بۆیان دەگەڕێتەوەو کۆمەڵێك دەکوژێ ئەوانیش علی شەهید دەکەن برادەرەکانی دەگەڕێنەوە بە شەری دەستەو یخە تەرمی شەهید ڕزگار دەکەن پێموایە ئەگەر لەبیرم ما بێت ئەحمەد کوردەش دەوری هەبوو لەوشەرە،

یەکێك لەکێشە هەرەگەورەکان لەنێوان ئێمەو ڕژێم کوشتنی سەربازەکان بوو ڕژێم کێشەی نەبوو چەند سەرباز دەکوژرێت ئامادە بوو یەك فەوج بەکوشت بدات لەپێناوەی یەك ڕەبایە، سەرباز کوشتن وەك کوشتنی مێرولە بوو لەلای ئەوان ئەگەر سەدت دەکوشت ئەودوسەد سەر بازی تری دێنا قایدەکانیان زگیان بە سەربازەکان ناسوتا، ئێمەش دەبووایە سەرباز بکوژین چارە نەبوو هەر سەربازێکی لەڕووبەڕوی بوونەوەی پێشمەرگە گەڕاباوە دواوە قایدەکان دەیان کوشت

بەترسنۆك لە قەلەم دەدران، بەلەدەست دانی شوێنی برادەرانی بەرانەتی دەبووایە ئێمەو تیپەکانی تر پاشەکشە بکەین بەدەیان فڕۆکەلەسەر سەرمان بوون بە دۆشکەو کلاشین کۆفو ڕومانە بۆردمانیان دەکردین پێشمەرگە ناپرژایە سەر فرۆکە تەقەی لێ بکات ئەوانیش زۆر نەوی دەبوون بڕیار درا پاشە کشەبکەین پاشە کشە کێشەیکی گەورە بوو چونکە کەپاشەکشەت دەکرد دۆلێك بوو دەچویەخواریّ دەبووایە لەبەر چاوی ئەوان سەرکەویەوە ئەوەی بەفریامان کەوت کاك کۆسرەت بوو کاك کۆسرەت هەستی بەمەترسیەکەکردبوو لەسەرئێمە وەمامۆ مەلەکی حەمە دۆشکەبوو دەوری بەرچاوی هەبوو لەرزگارکردنی ئێمە (کاك کۆسرەت)یش لەلای دەوەستێ ئەوەندەی تر بە هیمەت دەبێت مامۆ مەلەکی پیاوێکی ئازا بوو بۆ ئەوەی ئێمە نەجاتمان بێت ئەوەی کاك کۆسرەت و مامۆ مەلەکی کردیان باوەڕناکەم بە هەموو کەس بکرێت تاکو نەجاتمان بوو ئەوان نەیانهێشت سەربازەکان بتوانن شەهیدمان کەن لەکاتێکدا لە هەرچرکەیەك دەیان گوللە تۆپ بەدەوروبەری کاك کۆسرەت و مامۆ مەلەکی دەکەوت خۆشبەختانە هەموومان نەجاتمان بوو، ئەوەی جێگای داخە تەرمی پیرۆزی شەهید (کێخوا، بێتواتەیی نەکرا رزگار بکرێت ئێستاشی لەگەلّ دابێت تەرمەکەی ونە و گۆڕەکەی دیار نییە. دەکرێت مەزارێك بۆ ئەو قارەمانە لە شکارتە دروست بکرێت بوونی کێخوا بەپێشمەرگە کارەساتێکە کەناکرێت باس بکرێت لەو کات و ساتەدا.

*** *** ***

بابێینەوە سەر دیموکرات و کۆمەلّەی ئێران کۆمەلّە تاڕادەیەك بێ هەلّوێست بوو بەرانبەر بە ئێمە پێش ئەوشەڕەی باسم کرد ڕۆژێکیان چومە لای مەقەڕی کۆمەلّە دوای خۆ شوشتن زۆرم برسی بوو، چومە دیواخانی کۆمەلّە دوسێ هاوڕێی ئەوانی لێ بوو دوای سلّاو چاکو چۆنی هێشتا نانیان ئامادە نەبووبوو لە دیواخان کۆمەلّەی ئێران چەند نامیلکە و دیوانی مامۆستا قانعی لێ بوو لەگەلّ بەرنامەی کۆمەلّە منیش بۆ خوێندنەوە نەبوو بۆ کات کوشتن بوو بەرنامەی ئەوانو لەگەلّ هەندێك لە شحرەکانی مام هێمنم خوێندەوە وردەوردە ئەوان لێم نزیك بوونەوە حەزیان لە موجامەلە بوو، منیش حەزم نەدەکرد چونکە من هیلاك و برسی و دەستەجلێکی شڕ ئەوان پاك و خاوێن تێر و پۆشتە و تێرخەو مەجبووریان کردم، وەلّامیان بدەمەوە دەورەیان لێدام وایان دەزانی من ئەندامیکی سەرکردایەتیم بێ ئیش وکار، بۆ منی کورەجووتیارێکی ئاستی رۆشن بیریم دیاری کراو بوو نزیکەی بیست کەس دەورەیان لێدابووە

ئەیان وت ئێوەی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان ئەو شەرەی ئێوەئێستا دەیکەن سەر لەخۆ شیواندنە لە ئێستاوە ئێوە کوڕە جووتیار و کرێکار و زەحمەت کێشان بەکوشت دەدەن لەپێناوی برژوازی دا ئەوەی من لەو دانشتنە تێیان گەیشتم باوەڕیان بە کێشە نەتەوایەتیەکان نەبوو، زۆر قسەی بێمانایان دەکرد نامەوێ باسی بکەم لەپڕ دوو پێشمەرگە سلاویان کرد، من زۆ زانیم پێشمەرگەی ئێمەن چونکە وەك من ڕەنگ زەرد و ماندو دیاربوون لەجل و بەرگیش وەك ئەوان پۆشتە نەبوون دوای بەخێرهاتنیان جامەلەکەی ئێمە دەستی پێکردەوە دیسان زۆر قسەی بێمانایان دەکرد یەکێك لەو دوکەسانە وتی هاوڕێان ڕاوەستن منیش دوو قسەم هەیە وتی ئێوە ئەوەبۆچونتانە وتیا بەڵێ وتی ئەزانن ئێوە چنە من دەزانم وتی : یەکەم خواتان بەقوربانی پێشمەرگەکانی دیموکرات کات دوم ئێوە کۆمەڵە کەسێکی، ............وان لەگەڵ ئەوقسەیە بوو بە هەرا جامەلە گەرم بوو ماوەیەك دواتر وتیان بانان بخۆین دواتر بەردەوام دەبین لەکاتی چونمان بۆ نان خواردن من لەو کەسەنزیك بوومەوە سوپاسم کرد کەنەجاتی دام لەو کادیرە فەلسەفیانەی بێ کردار، دوای نان من ڕۆیشتم نازانم فیلمەکە بەکوێ گەیی بەپێچەوانە برادەرانی دیموکرات کەتەیارە هاتبایە ناوچەکە تەقەیان لێدەکرد نان و پێخۆر و چایان بەدرێژی سەت مەتر لەسەر ڕێگا دانا بوو بۆپێشمەرگەکانی ئێمە ئامادەکرا بوو بریندارە سەختەکانیان چارە سەر دەکرد چونکە ئەوان دکتۆری بێسنووریان لا بوون هەرپێشمەرگەیەك کارێکی هەبووایە لەشار بۆیان جێ بەجێ دەکرد نامەهێنان و بردن زۆرشتی تر بەڕاستی برادەرانی دیموکرات کەم تەرخم نەبوون لە ئەرکی نەتەوایەتی - ئێمە گەراینەوە بەر گەڵو ئەورۆژەی ئێمە گیشتینە بەرگەڵو زانیمان ڕژێم بەچەکی کیمیایی لە مەقەری دکتۆر فوادی دا بوو کەوابوو ئێمە دوای - ٢٠-٤ لە سەر گەڵو بووینە من چومە سەر گەل و لە ڕێگا شەهید خولەی برای شەهید عەبدولرەزاقم دی وتی هاورێ ئەزانی کیمیایی لە دۆڵی بالیسانی داوە منیش زۆر بەسادەیم وەرگرت گوێشم پێنەدا لای ئێوارە گەڕامەوە بەرگەڵ و لەسەروی بەندی خانە لە ژێر بنە هەناریك دانیشتم دوو بێشمەرگە لەنزیك من دانیشت بوون گویم لێ بوو باسی کمیایان دەکرد کە لەشێخ وەسانان و بالیسانی داوە منیش لیان نزیك بوومەوە وتم برادەران باسی کیمیا تان کرد لە دۆڵی بالیسان وتیان نەخێر وتم با من گویم لێ بوو وتیان تۆ هەڵەی من زانیم شتێك ڕوویداوە دەی شارنەوە چونکە خولەش ناوی کیمیای هێنا هەستام وتم واباشە بچمەلای حەدەد جیهاز چوم دوای سلاو دانیشتم چایان دامێ بەبێ

دەنگی چام خواردەوە ماوەیك دانیشتم دواتر ڕستەیەکم ئامادەکرد دور لە لەهجەی خۆمان وتم برادەران دەڵێن ناوچەی بالیسان کیمیای بەرکەوتو وە حەدەد جیهاز سجلەێکی دایە دەست تەماشام کرد لە ئێوارەی -١٦ -٤ - ١٩٨٧ ) هەر دوو گوندی بالیسان و شێخ وەسنانی بە خەستی بۆردمان کردوە ناوی زۆرینەی خەڵکی گوندی تێدا بوو بە ژن و منداڵ و پیر و گەنجەوە شەهید و بریندار تەماشای ناوەکانم کرد، ناوی باوکم ناوی کوڕەکەم ناوی کەسوکار و گوندەکەم تێدابوو بە بێدەنگی هەستام چومە لای برادەران وتم سابیر ڕەسوول لە کێیە؟ وتیان لەلای کاك ئەرسەلان بایزە، چومەلای لەدەرگەم دا ئەوان یاری شەترەنجیان دەکرد لە کاك ئەرسلان وتی فەرموو دوای سەلام و چاك وچۆنی وتیان فەرموو دانیشە وتم دانانیشم ئیشم بەکاك سابیرە، کاك سابیر وتی: ئەمرکە زۆر بە نەرمی وتم کاك سابیر زانیتم ڕژێم گوندەکەمی بۆردمان کردوە، بەچەکی کیمیایی ئەگەر ڕازی بی پێم باشە بچمەوە کاك ئەرسەلان، نەیهێشت کاك سابیر وەڵامم بداتەوە وتی درۆیە کاری وانەبووە! وتم کاك ئەرسەلان وایە توڕەمەبە وتی لە کێتزانی منیش لەدەمم دەرچوو وتم لە عەدەد جیهازەکەی جەنابت ئەرسەلان وەك بروسك هەستاو بەجوتێ نعلە ڕایکرد بۆلای جیهاز منیش چومەدیاری دیار بوو دوو کەس بوون هەردوکی گرتن بەمشاوەشی بەجوێندان هاتەوە کاك سابیر وتی چبوو وتی هەردوکیانم سجن کرد کاك سابیر وتی باشە چۆن دەچیەوە بەتەنیا برۆ قادر خەتی و مەلاخدر مەلەکی ببەوە لەگەڵ خۆت دووپێشمەرگەی سنووری ئێمەبوون من و برادەران ڕۆیشتین لەڕێگا چەن باردەرێکی تریش بەرەو مەڵبەندی سێ داتنەوە بووینە مەفرەزێك یەکێك لەوان نووسەر بوو ناوم لەبیر نەمایە پێم وایە لەسەر ئەورووداوە شتێکی نوسی بوو باسی منیش دەکات نازانم کاك ئەرسەلان لەدوای من چی کرد ئەوەشم دەزانی برادەران ویستویانە بۆماوەیەکیش بێت ئەوکارەساتە پەردەپۆش کەن بە باوەڕی ئەوان رژیم بەبەرنامەوای کردوە بۆئەوەی ئێمە لەشەرگەکان بروخێن بگەڕینەوە ناوچەکەمان وردەوردە گەیشتینە قەمچوغە دوای عەسر بوو جاشەکانی دەورو بەری قەمچوغە یان لەترسان بوو یا لەپیاوەتی بوو دەنگیان نەدەکرد ئەگەر بەڕۆژیش جادەت بڕیبا بۆ ئەوبەری واتە لای گوندی تەلانە ئێمەش کەوتینەڕێ ئەنجومەن وتی مەڕۆن تاکو جاشەکان ئاگادار دەکەینەوە بۆمێژوو زۆرجار بەشێك لە مستەشارەکان لەترسان نەیان دەویرا ڕێ لەپێشمەرگە بگرن لەکاتی واجبی سەرجادە هەرئەوان لەکاتی هجوم گوێیان بە کوشتن و جەردەی نادا ئەوگەنجەی چوەلای جاشەکان وتبوویان بابێن ئێمەش چوین نزیك بووینەوە لەجا دە بەسوتفەقافلیکی سەربازی

بەبەردەمان رەت بوو لەوکاتە ئێمە دانیشتین لەتەنشت جادە دواتریەرینەوە و چوینە گوندی تەلانەو بەبێ ڕاوەستان بۆ دەشتی کۆیە پێم وایە چوینە گوندێك ناوی سور قاوشان بوو بەیانی بەرێکەوتین ئێوارەکەی خۆمان تاودیوی لای هیزۆپ کرد و بەشەو جادەمان بڕی ڕانەوەستاین زۆریش هیلاك بووین تاکو گوندی سکتان لەوێ پشومان دا لەسکتان بەرێکەوتینەوە بەرەو گوندی چیوە ئەو رۆیشتنە بە قسە خۆشە لەگەڵ برادەرەکانم لێك دابڕاین ئەوانیش وەك من خەمی ماڵ و منالّی خۆیان بوو زۆر هیلاك ببووین من ئاگام لەخۆنەبوو گەیشتمەبالیستان با لیسانێکی چۆل کەس نەبوو پرسیاریکی لیّ بکەم گوندێکی چۆل و پر لەترس ئەوەی نەچێتە گوندی چۆل نازانێت چەند بەترسە چومەشێخ وەسانان هەر لەپێشەوە گەیشتمە ئاژەڵی برندار بزن و مەر وچێ و گۆلك و بەرخ و کارۆکە زۆربەیان کۆرەبووبوون شوێنە ناسکەکانیان سوتابوون ئەوانەی گیانیان لەبەر مابوو ئاوی چاو لوتیان تێکەڵ بووبوون هەموویان رەق و لاواز بووبوون دیارە ئەو گیان لەبە رانەش ناو دەم و قورگ و سیپەلاکیان سوتابوو نەیان دەتوانی خواردن بخۆن یان لەبەر کوێر بوونیان لەئاو خواردنەوەش دابڕابوون هەرچەند لەناو گوند نزیك دەبوومەوە ژمارەی گیان لەبەران زیاتر دەبوو گەیشتمە ناوگوند گوندێکی چۆل وبۆگەن پربوو لەلاشەی مردووی پشیلەو مریشك و چێل و وبزن و بەشکیان نەمردبوون لەگیاندان بوون کەسێك نەبوو سلاوی لیّ بکەم چومە ماڵەکەی خۆم ماڵێکی چۆڵ زۆربەی کەلوپەلەکانمان نەمابوو دواتر زانیم دوای بۆردومانەکە بە دوارۆژ جاشەکان هاتوون گوندەکەیان تالآن کردوە ئەی لەو غیرەتە دووژمن بتکوژێ و جاشکانی خۆشت تالآنت کەن بەڕاستی ئازابووینە غیرەتی دەوێ بەشێك لەوجاشانە کەسوکاری خۆشمان بوون هەی غیرەت سەگ بت خوا ڕووڕەشی دنیا و قیامەت بن چومەپێش، خانووەکەم تەماشای گوندم دەکرد گوندێکی چۆڵ ئەوەی بەرچاوم کەوت لەناو گوندی مردنی ئاژەڵ بوو یان هەندێکیان خەریکی مردن بوون یەکێك لەو دیمەنانەی کە قەت لەبیرم ناچێت مریشکە کورك بوون بە ڕێژەیەکی زور ناو گوند پڕ بوو لە مریشکەکورك و جوجەڵە، مریشکە کورکەکان بە خۆیان کوێر بووبوون دیارە لە کاتی کیمیاباران جوجلە خرپنەکان مریشك دای بۆشیوون، چونکە ئێوارە بووە جوجەلە جوانەکان تەندروستیان باش بوو لەوەش غەریب تر مریشکە کورك بەکۆرەی ناوە ناوە دنوکی لە ئەرز دەدا و بانگی جوجەلەکانی دەکرد بۆ ئەوەی شتێك بخۆن گوندەکەمان زربەی خاوەن ئاژەڵ بوون وەك مەڕ بزن کەر ماین و ئێسترو مانگاو سەگ وپشیلەو باڵ دارەکانیش وەك مریشك و قەل و لەوبابەتە وە

جۆرێك باڵندە هەیە ئێمە پێی دەڵێین كێشكە لەگەڵ مرۆڤ دەژی بە ڕێژەیەكی زۆر هەبوو ئەوانیش كۆتاییان پێ هات بوو... لە دەوروبەریشمان دەیان باڵندەی خۆماری و میوان كە ساڵانە ڕوو لە هەرێمەكەمان دەكەن زۆریان لە ناو چون بەشێكیان ئێستاش نەهاتنەوە وەك كۆترە باریكە ئێمە پێی دەڵێین: تفتیلك كە بەرێژەیەكی زۆر داتننە ناوچەكەمان(٢٠١٠) چەند دانەیەك لەو كۆترانەم بەرچاو كەوتەوە.دیارە شێخ وەسانان دارستانی زۆرە ئەو شوێنانەی كیمیایان بەركەوت بوو، گەلاكەیان وەری بوو بۆ ماوەیەكی زۆر ئەقڵم راوەستابوو، چۆن ئەقڵ نەوەستیٚ پێش ئەوەی ئێمە بچینە داستانی ڕزگاری ئەو گوندە نزیكەی -٦٠٠ – كەسی تێدا نیشتەجیٚ بوو، لە هەموو تەمەنەكان و لە هەردوو رەگەز ئێستا كەسێك نییە پرسیارێكی لیٚ بكەم، زۆر گریام لەپڕ گوێم لە بانگ بوو، لە پەڕگەی گوندی، زوو دەنگەكەشم ناسی، حاجی حسێن بوو لەگەڵ ماڵباتەكەیان، بە پەلە چومە لایان دوای چاك و چۆنی و هەندێك گریان وتم: حاجی حسێن وەختەمێشكم بتەقی بۆم باس بكە ئەوخلكەچی بەسەر هات وتی راوەستە بانانی بخۆین نوێژان بكەین هەموو شتت بۆ دەگێڕمەوە دواتر گوتی كاكە ئێوارەی ١٦- ٤، ١٩٨٧ - كاتژمێر نزیكەی شەشی ئێوارە، لەو كاتەی خەڵكی لەناو رەزان گەرابووەوە شوان و گاوانیش خەریك بوو بێنەوە ناوگوندی، لەپر دوانزە تەیارە پەیدابوون دوای دووجەولە سەرووی گوند و ناوگوندیان بۆردمان كرد بوو خەڵكی بەهەر شێوەیەك بوو لە كونەتەیارە خۆیان شاردەوە گوندیان دایە بەر قومبەلان بەڵام قومبەلەكان وەكی جاران دەنگیان گەورەنەبوو، كەتەیارەكان رۆیشتن تەمێكی رەنگ قاوەیی بۆنێكی لیٚ دەهات ئەو بۆنەمان قەت بۆن نەكرد بوو، وردە وردە خەڵكی وەدەركەتنەوە ئێمە نەمان دەزانی، ئەو تۆز و بۆنە چەكی كیمیایە ئیتر بووە رەت رەتانە لە ناوگوندی باوك بۆ لای كوڕ و كیژ بۆلای دایكی لەساغ و سەلامەتی یەكتریان دەپرسی، یان پیاوەكان دەچونە سەر شوێنی قومبەلەكان حاجی فەقێی برا بۆ بەرز كردنەوەی وردی خەڵكی پارچە قومبەلەیەكی كیماویی لە دەست گرت بوو دەی وت ڕژێم قومبەلەی نەماوە بەرمیل فڕیٚ دەدا! دواتر دەنگ بڵاو بووەوە كە زاهیری حەمەدەمینی برندار بووە، دیارە بەناو ئەو هەموكیمیایە داچوون و ئەحوالی زاهیر بپرسن، شەویش بەسەرداهات وردە وردە نیشانەكانی وەدەركەوتن، سوتانەوەی هەموو شوێنەناسكەكان وەك مل و بن باڵ و پشتەچاو و شوێنەناسكەكانی تر ئاوكردنێكی زۆر لە چاو لووت سەرئێشە و ڕشانەوە و دەم و قوڕگ وشك بوون ئێمە لەو حاڵە دابووین چەند كۆبتەرێك لە ئاسمانی گوندەكەمان پەیدا بوون ئەوانیش

دەوروبەری گوندیان بە شێوەی باران کیمیا باران کرد دەنگەدەنگ لەناو گوندی بڵاو بووەوە کە ئەوە چەکی کیمایە و دواتر دەنگ بڵاوبووەوە کە ڕژێم هجوم دەکات بەو شەوە سارده و تاریکە بارانیش دەستی پێ کرد ئەگەر ئەوبارانە نەباریبا هەموو دۆڵی خۆشناوەتی دەمرد ئەو هەموو برینداره گوندیان بەجێ هێشت و ڕویان لە چیاکرد بارانیش دەباری بەوشەوە روومان لە (گەری ) شێخ وەسانان کرد بووە هات و هاواره گریان بانگی یکتر کردن دەت وت ڕۆژی حەشرە دیارە بەشی زۆری هەرزو کوێر بوون تابەیانی گریانی لاو پیرو ژن و منداڵ بەردەوام بوو برسیەتیش کەس نانی ئێوارەی پێ نەخورابوو بەو شەوەسارده گریان و هاوار هاوار بەردەوام بوو لەتاوی ئازار و برینەکان زۆربەی خەڵکی کۆره بوون بۆبەیانی خەڵکی دەوروبەرمان بەهانامانەوە هاتن بەولاغ و بەلەپشت کردن ئێمەیان لەکونەشاخ و ئەشکەوت و بن بەردان دەرهێناو ئێمەیان هێنایەوە ناوگوندی بەتەنەکتەر . ئێمەیان گواستەوە سەروچاوه لەوێ بەڕێیان کردین بۆ شاری ڕانیە بۆ ئەوەی چارەسەرمان بکەن، خەڵکی ڕانیە کەزانیان ئێمە برینداری کیمیاین زۆربەی خەڵکی شار روویان تێکردین بەدەموچاوشوتن و جلك گۆڕین و هێنانی قەترە و شرووب و بۆدره و نان و ئاو پارەش دیاره ئێمە پێوستمان بە پاره نەبوو دیاره خەڵکی ڕانییە بەوکاره دڵیان خۆش دەبوو، پاره لە و کاتە بۆچییە؟ لە ڕانیە مردن دەستی پێ کرد بەشێك لەوانە منداڵ بوون ڕژێم، ترسی لە کۆبوونەوەی خەڵکی رانیە پەیداکردو کەوتەگرتنیان و ڕاونانیان بەپەلە جگە لەوانەی مردبوون بە زۆر سواری کۆستەرانیان کردن بۆ شاری هەولێر یەکێك لە کۆستەرەکان دەچێتە سلیمانی ئەوانەی هەولێر سەرەتا دەیان بەنە نەخۆشخانە دواتر دەیان بەنە سجنی ڕەشکێن لەوێ ئەمنەکان فڕێیان دەدەنە ناو چەند قاوشێك ئیتر لەوێ بۆماوەی حوت ڕۆژ دمیننەوە بەبێ بەبێ عیلاج خواردن و شیربۆمناڵان هۆکار مردنی منداڵان هەم چەکی کیمیاوی بووەو هەم برسیەتی بووە چونکەبەشێکی زۆر دایکان لەبەرئازارو گیانی خۆیان نەدەپرژانە سەر منداڵەکانیان ئەونموونەیە بەسە کە چ کارەساتێك بووە دایك ئاگای لەمنداڵەکەی نەمینێت، ئەوەی بۆیان کرابوو مامۆستامحەمەد برای سابر رەسوول دکتۆری برای کە سجن بووینە لەسەر سابیری برایان کەیەکێك بوو لە فەرماندەکانی هێزی پێشمەرگە داوا لە بۆلیسێکی عەرەبی شیعە دەکات پارەی پێ دەدات کە لەدەره و قەترەی چا و سابوون و بۆ درەی بکرێت و دابەشی بکات بەسەر بریندارەکان کارەساتەکە گەیشتە حاڵەتێك زۆر لەژنەکانمان لەبەر زۆری ئازاریان لەبەرچاوی پیاوانی ڕژێم هەموو جلکانیان لەبەر خۆ دادڕی وە ئەوەی

دەمرد بە مامۆستا محەمەدیان بارکردوە بۆ بچووکی بە کۆمەڵ . ئەوشەش حەوت ڕۆژە مانەوەیان بەبێ عیلاج بووە هۆی مردنی بەشی زۆریان ڕۆژی حەوتەم ڕژێم چەند مەنشائێکی چارۆگەدار ئامادە دەکات سەرەتا ژن و منداڵ سوار دەکەن دواتر پشێمان دەبنەوە پیاوە کان سوار دەکەن لە تەمەنی دەساڵان بۆ دواتەمەن بۆ نموونە ئەرسەلان رەسوول تەمەنی دەدوانزەساڵان بوو، کەسێکی تر بەناوی سلێمان مامەشێخ تەمەنی لە سەروی هەشتاکان بوو ڕەگەزی نێرلەو دووتەمەنە سواری مونشەئە یەکی چارۆگەدار دەکەن بۆ شوێنێکی نادیار تاکو ئێستاش گۆڕیان ونە هەر هەمان ڕۆژ ژن ومنداڵە بریندارەکان سواری چەند ئیڤایەکی سەربازی دەکەن بەرەو خەلیفان لەپشت بازگەی سەربازی فڕێیان دەدەن بەشێکی زۆر لەڕێگا مردبوون لەوێش زۆریان دەمرن خەڵکی خەلیفان هیمەت دەکەن مردوو و بریندارەکان دەبەنەوە خەلیفان مردووەکان دەنێژن بریندارەکان خزمەت دەکەن جلیان لێ دەگۆڕن شۆرباویان دەدەنێ، خزمانی خەلیفان ئەوەی بۆیان کراوە ئەنجامیان داوە، وردە وردە کەسوکارمان لەشارەکان دێن، دەیانبەنەوە بەشیك لەگۆڕی شەهیدانمان لە خەلیفان هەریر شەقڵاوە هەولێر سلێمانی ڕانیە سەروچاوە دابەش بووینە لە هەولێر چەند کەسێك توانی بووی فرسەت لە بێسەروبەری ڕژێم ببینی ڕابکات.

با بگەڕێینەوە سەر ئەو کۆستەرەی بەرەو سلیمانی دەچیت دەیانباتە نەخۆشخانە دکتۆرەکان وەریان دەگرن عیلاجی باشیان دەکەن دواتر دەزانن ڕژێم نیازی هەیە ئەنفالیان بکات، پێیان دەڵێن نەخۆشخانە چۆڵ کەن ئەوانیش زۆر بەتوندی دەڵێن ئێمەناڕۆین برینداری بچینەکوێ؟ دکتۆرەکان بڕیار دەدەن بە زۆر دەریان کەن، بریندارەکان تووڕە دەبن جوێن بە دکتۆرەکان دەدەن چەند قسەیەکی ئەوکات کەدەریان دەکەن ( ئەنگۆ پیاونینە بێدینن، نەکوردن، نەموسڵمانن، ئەگەرنا ئەمە ئێ دەرکردنێ نین نابینن کوینە خۆ کۆرە نینە) دکتۆرەکان گوێ بەو قسانەنادەن دەریان دەکەن لە دەرەوە کارمەندەکان دەیان بەنەوە ماڵەوە و ئەوکات پێیان دەڵێن دەرمان نەکردبان ڕژێم ئێوەی بێ سەرو شوێن دەکرد، خزمەکانی ئێوەیان لە هەولێر بێ سەرو شوێن کردوە، دواتر داوا لەچەند مستەشاریکی خۆمان کرا کە بتوانین ئەو بریندارانە بینینەوە دیارە مستەشارەکان هیچ هەڵوێستیان نەبوو، دواتر کاك محەمەد سوورچی لەڕێی چەکدارەکانی هاوکاری کردین و نەجاتیان بوو، سوپاسی خەڵکی ڕانیە و خەلیفان دکتۆر و کارمەندانی سلێمانی دەکەین لەوڕۆژە سەخت و دژوارە کە هاوکاریان کردین سوپاس بۆ هەموو ئەوانەی هاوکارو یارمەتیان داین . سەبارەت بەژمارەی شەهیدەکان و ناو و ناسنامەیان بە پێویست نازانم

لێرەدا بەیاننووسم، یاخود باسیان بکەم،چونکە لە کۆمەڵی سەرچاوەی تایبەت تەواوی ژمارەی شەهیدەکان و ناسنامەیان خراوەتەو ڕووو، یەك لەو پەرتوکانەی کە لەم بارەیەوە دانراوە (کیمیاباران لەخۆشناوەتی)کە بەدەستە ڕەنگینەکانی هەردو بەرێز (محەمەدجمال توتمەیی و صالح حەیدەری بەرێوبەری ناحیەی بالیسان ) بەهاوکاری چەند برادەرێکی دڵسۆزی تر نوسراوەتەوە، وەچەند گۆڤارو ڕۆژنامەیەکیش.کاریان لەسەرکردوە.

لێرە شتێك ماوە بڵێم دوای کیمیابارانیش ئەوەی شەهید بوو شەهید بوو، کێشەی نەماو کۆتایی هات، کێشەی گەورە ڕووبەڕوی بریندارانی کیمیاوی بووەوە بەتایبەتی هێتیمەکان ئەوکچانەی بێ باب و دایك مانەوە یان کوڕەکانیش بریندارانی کیمیاوی تێدەگن من باسی چی دەکەم، قوڕگم پڕلە گریانە و نامەوێت باسی بکەم بە درێژی کۆمەڵەخەڵکێکی لە خوا نەترس چیان پێکردن و دڵی ئێوەش بریندارێکەم سەرباری نەبوونی و دەربەدەری و بۆ ماوەی نزیکەی (٦) ساڵ زیاتر لە دووسەت برینداری سەخت بەسەرەوە لە خۆشناوەتی عیلاجیان نەکراو بەشی زۆریان لەو ساڵانە مردن، بە درێژایی ئەو بیست ساڵە دەبوایە کاروکاسبیش بکەن وەك دارهێنان و گورە گەنم کۆکردنەوە لە پەرێزان و جل شوتنی ماران و چونە چیا بۆ کۆکردنەوەی گیاوگۆڵی خواردن و کرێکاری و قسەو قسەلۆکی خەڵکی بێوژدان و زۆر و زۆری تر. گومانم نییە کە سوکاری ئەنفالەکانی گەرمیان و دەشتی کۆیە و مەرگەو هەڵەبجە و بادینان و خوشکە بارزانییەکانیش لە ئێمە باشتر نەبووینە ئەگەر خراپتر نەبووبن .

لەدوای ساڵی (١٩٩٢ ) بەهیمەتی کۆمەڵێك برادەری ناوچەکەمان هاوکاری یەکتر کردن وەك شەهید ملانەجم و عەبدوڵلاکانی بەردی و کاك یاسین و ملاخالید بالیسانی مەلا مفدید شێخ وەسانی و خزمەت کارتان، تواندرا لە ڕێگای زۆر بەرێز کاك کۆسرەت کە ئەودەم سەرۆکی حکومەتی هەرێم بوو، مووچەیێکی شایستە لەوکات بدرێتە هەموو ماڵەشەهیدێکی ناوچەکەمان بەبێ جیاوازی، دیارە ئەو بڕیارە تایبەتمەندی خۆی هەبوو نامەوێت بەدرێژی باسی بکەم، بەهۆی ئەوبڕە مووچەیە ژیانی کەسوکاری شەهیدان باشتر بوو. داوا لەسەرکردەکانمان دەکەم بە گشتی نەچوە بچێ، دەکرێت ڕێز لەیەکتربنێین هەموو هیواکانی ئێمە لەئێوە دەبینین، ئێوەش ئەوندەی دەکرێت ڕێز لە کەسو کاری شەهیدان بنێن. خۆشبەختانە ئێستا حکومەتی هەرێم بریندارەکان ناوەناوە ڕەوانەی ئێرانیان دەکات بۆ چارەسەری . بەلای من پاداشی تەواوی

**کەسوکاری شەهیدان پیش هەر شتێك یەك هەڵوێستی پارتە سیاسیەکانە بۆ ڕێکخستنی ماڵی کورد دواتر پاداشی کەسوکاری شەهیدان.**

**دوورۆژ دوای کیمیابارانی (١٦ / ٤ / ١٩٨٧) ڕژێم پەلاماری ناوچەکە دەدات واتە دوای کیمیاباران بە دوو ڕۆژ بەهۆی کەمی پێشمەرگە لەناوچەکە بەرگری ناکریت، چونکە زۆربەی هێزی شەڕکەرمان لە دۆڵی جافەتی بوو، لەو پەلامارە جاشەکان زۆربێ ئەدەبانە گوندی شێخ وەسانان و بالیسان و ناوچەکە تاڵان دەکەن سەیرەکەلەوەبوو بەشێکی زۆر لەو تالانچیانە جاشەکانی خۆمان بوون، واتە کەسوکاری شەهیدەکان بوون ... دیارە خزمانی بالیسانیش بەهەمان دەردی گوندی شێخ وەسانان شەوی کیمیابارانەکە دەچنە چیا بۆ خۆ حەشاردان خەڵکی ناوچەکە بەهانایان دەچن دواتر تێکەڵ دەبن لەو سەفەرە شومەیە هەرچی باسی شێخ وەسانانم کردبێت خزمانی بالیسانیش توشی هەمان کارەسات بووینە، دوای بیرکردنەوە یەکی زۆر بەباشم زانی ماڵێك دابنێم چونکە کارەسات هەرچەند گەورەو بێسنوور بێت ناکرێت ژیان ڕاگری ئەوکاروانە بەردەوامە، بەتایبەتی تیمەی پێشمەرگە باش دووژمنی خۆمان دەناسی هەموو شتێکی لێدەوەشایەوەوەلەگەڵ کارەساتیش لێراهات بووین لەماڵە خزمەکانم هەندێك ئازوقەی داپۆشراوم بەدەست کەوت لەدووری گوند ماڵێکم دانا دوای ماڵ دانان بیرم لەوە کردەوە پێویستە وێنەی خەڵکی گوندی کۆبکەمەوە، دەمزانی ڕۆژێك بە کەڵك دێن وەك بەڵگە دوای کۆکردنەوەی وێنەکان، کەوتمە سوتاندنی شوێنی قومبەلەکیمیاویەکان، دوای کەوتمە سوتاندنی لاشەی ئاژەڵی مردوو، بۆ ئەوەی ژینگەی گوند بگەڕێنمەوە دۆخی جاران، وردەوردە ماڵەکەی من بووە ماڵێکی پێشوازی لەوانەی نەجاتیان بووبوو، داتنەوە سنوورەکە دیارە لەو کیمیابارانە برادەرانی پارتیش بەشێکیان بەسەختی برندار بوون، بەهاتنەوەی خەڵکی ئاگادار بوومەوە کە باوکم لە رووباری خوار گوندی بەرەکە شەهید بووە، کوڕێکم هەبوو بەناوی ئارامم کرد بوو، ئەویش لەبەندیخانە پیاوانی ڕژێم دەی رفێنن تاکو ئیستاش ئەو کوڕەم ونە خێزان و کچێکم بە ناوی ئارەزوو لەشەقلاوە لە ماڵی خەزوورم بەدزی چارەسەر دەکران.**

*** *** ***

**چیرۆکی شەهید بوونی باوکم بەم شیوەیە بووە : باوکم لەترسی ئەوەی کوڕەکەی پێشمەرگەبووە بەبریندار سواری گوێدرێژەکەی دەبێت بەرەو چیای هەورێ دەچێت لەسەر چیا تەندروستی تێك دەچێت پێش ئەوەی بەریبتەوە کندری ڕشمەی گوێدرێژەکەی لە قۆڵی خۆی**

گرێدەدات دواتر خۆی پێراناگیرێ و بەردەبێتەوە، دوای دوو ڕۆژ هاولاتییەکی گوندی مێدیر لەبەختی باوکم دێتە سەر چیای هەورێ بۆ وەرگرتنی هەوالێك لە دۆڵی بالیسان لەدوورەوە گوێ درێژێك دێتەبەرچاوی بۆلای دەچی تەماشادەکات کسێك لای گوێدرێکە درێژ بووە بۆلای دەچی تەماشادەکات نەمردووە زیندوە هەندێك ئاوی دەداتێ و بەهۆی گوێدرێژەکەی دەی باتەوە گوندی مەندێر خزمەتی دەکەن باوکم تۆزێك زیندی دەبێتەوە و کارەساتەکە دەگێڕێتەوە بۆیان دواتر داوادەکات بڕوات سواری گوێدرێژەکەی دەکەنەوە دەکەوێتە ڕێ ئەوجارەیان لەخوار گوندی بەرەکە لەنزیك رووبار دەکەویت ودەمرێ، دوای دەڕۆژ زیاتر هەندێك شوان دەی دۆزنەوەو هەر لەوێ دەی نێژن بەهاوکاری خزمو خەلکی ناوچەکە.

من کەباسی ڕووداوی خۆم دەکەم ڕەنگ دانەوەی کارەساتی زۆربەی خەلکی بالیسان و شێخ وەسانانە زۆربەی مالەکان لە من خراپ تربوون کارەساتی هەندێك مالْ زۆر لەکارەساتی من گەورەترە ناشکریت مالْ بەمالْ باس بکەی زۆری دەوێت لە توانای مندا نیە بەلام دەتواندرێت هەموکەس یاداشتەکانی خۆی بنوسێتەوە(شەرت نیە چۆن دەنووسێ، شەرتە ڕاستگۆیانە بنووسێ ئەگەر وامان کرد مێژوویێکی تەواو ورد بۆ گەلەکەمان بەجێ دێلین خەلکی شارەزا دەتوانن بە شێوەیەکی جوان لە ڕۆژگاری خۆیان ترشو خوێی پێوەرکەن لەبەردەم نەوەی نوێ دایبنێن ترسی وشەرمی ناوێ، هەرچی دیوتانەبیستوتانە زانیوتانە بی نوسن، باوکم لەڕێگا داوە بەنێك کەوتبا هەلی دەگرتەوە دەی وت ڕۆژێك دێت بە کەلك دێت؟ بەیەك مەرج ڕووداوەکان چۆن بووە وەك خۆی بنوسرێتەوە لەوباوەڕەشدام بێکەموکورتی نابن باوەڕناکەم کەسمان دوای چەندان سالْ بەبیرەوەریەکانی دابچێتەوە هەموشتی بەبیر بێتەوە. دوای گەڕانەوەی بەشێك لەبریندارەکان، دوای کیمیاباران یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئەوەی گەڕایەوە ناوچە ڕزگار کراوەکان،هاوکاری مادی کردن و ڕەوانەی ئێران کران بۆ چارەسەر لەوانە عەزیز علی عەبدوللا قادر و زۆری تر .

هات و چۆ بۆ شارەکان دەستی پێ کردەوە وردەوردە خەلك هاتەوە منیش ناردم مندالەکانم هاتنەوە، بەلام دەت وت مردوون و زیندی بوونەوە تەندروستیان زۆر خراپ بوو، دوای یەکتر دیتنمان زۆر هەولمدا بەسەرخۆم زالبم، نەگرییم باش بوو توانیم نەگرییم خێزانم چاوەڕێی پرسیارێك بوو لێی بکەم منیش دەمزانی ئەیەوێت پرسیارێکی لێ بکەم خۆم دەدزیەوە دواتر زانی من پرسیارەکە ناکەم خۆی ڕانەگرت دەستی بەگریان کرد و وتی کوڕەکەشمیان دزی وتم گوێش مەدێ خوا حەوێزە دەکاتەوە گرینگ ئەتوسەلامەت بیت،دیارەمن زۆربەسادەی وەلامی خێزانم دایەوە

لەراستی وانەبوو کەوتی کوڕەکەمیان دزی وەك ئەوەوابوو خەنجەرێك لەدڵم بدرێت، وام نەکرد خێزانم هەستی پێ بکات بەڕاستی پیاوی دەوێت خۆ ڕاگرێت بەرانبەر ئەو کارەساتە زۆر جەرگبڕ بە گێڕانەوە باس ناکرێت، نزیکەی زیاتر لە سێ کیلۆ مەتر لەسەرووی گوندی ماڵم بۆدانان لەنزیك کانی (ڕێخێ )ماڵ چماڵ هەر بەناو ماڵ بوو پەیداکردنی ئازوقەو شتی تر زۆرئەستەم بوو، بۆ ڕۆژی سێیەم دوای هاتنەوەی خێزانم چومە گوندی خەتێ لای دکتۆر زریان وتم دکتۆر منداڵەکانم هاتینەوە وەزعیشیان زور خراپە ئەمەوێت بیانبەمە ئێران وتی: هاوڕێ مەیانبە. ئەوانەی چوینە ئێران گەڕاینەوە ئەودەرمانانەی پیان داون لەلای منیش دەست دەکەوێت، وتم باشە ناچین بۆ ئێران وتی زۆرباشە دوو عەلاگە دەرمانی دامێ لەگەڵ کۆمەڵێ شریقە نەمن نە دکتۆر زریان بیرمان لە شتێك نەکردبووەوە وتم دکتۆر وتی بەڵێ وتم باشە من ناتوانم ئەوڕۆنە هەموو ڕۆژێك بێنمەئێرە بۆ شریقە لێدان ئەو زۆر نەخۆشە و نەخۆشە ناگاتێ ئێرە دکتۆر زریان وتی ناشکرێت منیش نەخۆشخانە بەجێ بێڵم بێمە شێخ وەسانان وتم ئەی تەگبیر وتی ئاسانە وتم چۆن وتی ڕاوەستە ئێستا دەت کەمە دکتۆر و شەهادەشت دەدەمێ، ئازاد عەسکەری لەوێ پەیدا بوو دکتۆر زریان وتی ئازاد وەرە ئازاد هات وتی شلوارت داکەنە وتی بۆ دکتۆر وتی دەتۆ دایکەنە وتی دکتۆر ئاخر ئەوە قسە نیە وتی دەورەیەکی سەریع بۆ هاوڕێ فەقێ دەکەینەوە، بۆ شریقەلێدان پێداویستی شریقەی هێناو ئازاد شلوارەکەی داکەند، دکتۆر وتی واو وابکە لێرە بدەو وابکە بەچەند دەقەیەك بوومە دکتۆر لە شوشەی شروب سائلیۆنی بۆ تێکرد بووم بە مەبەستی شریقەلێدان شێوەی بەکارهێنانی عیلاجەکانیشی پێ وتم شەهادەم وەرگرت و بوومە (دکتۆر فەقێ).

لەمەجبووری هەمووشت فێردەبیت، چومەماڵەوە، شریقەم لەخێزان و منداڵەکانمدا ویستم شروبیان بدەمێ هەرکەسە و مراکیکی سائلیۆنم دانێ بەستەزمانانە وەخت بوو بمرن. وتیان ئێمە شروبمان زۆر خواردوە لە شەقڵاوە تام و بۆنی وانەبوو بیەم لێ کردەوە بۆم دەرکەوت سائلیۆن بووە نەوەك شروب خۆم نەشکاندەوە! وتم زۆرم هێناون چیتر ئەو شروبە مەخۆن من نەم توانی چیتر بچمە واجبی پیشمەرگایەتی دەبوایە ئەوان خزمەت بکەم چومە مەقەڕی تیپی (٨٣) هەورێ، کاکەجوان سەرتیپ بوو باسی منداڵەکانی خۆم بۆ باس کرد وتم ئەگەر بکرێت ماوەیەك مۆڵەتم بدەن، کاکەجوان وتی: هاوڕێ فەقێ ئاگام لە وەزعی تۆیە گلەیی لە تۆو ناکرێت ئەو ماوەیە بڕۆماڵەوە، تاکو ماوەیەکی زۆر من خێزانی خۆم خزمەت دەکرد و بووبوومە دکتۆریش

هۆیەکەشی ئەوە بوو من تاقانە بووم، ئەوەی هەم بوو باوکم بوو ئەویش شەهید بوو. کەسم نە بوو ماڵ و منداڵم بەخێو بکات . دیارە لقی پارتیش ماوەیەك بوو دابەزی بوو سەرەتا لەکانی تەلانە دواتر بۆ ناو شێخ وەسانان برادەرانی پارتیش کۆمەڵێك پێشمەرگەیان لێ بریندار بوون پێم وایە دواتر یەکیان شەهید بوو بەکاریگەری ئەوچەکە خەڵکی کانی بەرد بوو ناوی بێکەس بوو لە غەریبی مرد پێم وایە گۆرەکەشی ونە.

دیارە دوژمن لەدوای کیمیا هێرشی دووەمی کردەوە برادەرانی پارتی و برادەرانی ٨٣ ی هەورێ جاشەکانیان شکاند، رژێم لە ناوچەی شەقڵاوە و سیساوە و هەریر شلی پێوەدیار بوو پێشمەرگە بە نیمچە ئاشکرا دەچوە ئەو شوێنانە بۆ پێداویستیەکان من پێم وایە رژێم بەبەرنامە ئەو نەرمیەی دروست کردبوو بەمەبەستی کاری هەواڵگری بەمەبەستی وەرگرتنی زانیاری بۆ ئەنجام دانی برۆسەی ئەنفال، رۆژانە ناوچەکەمان بۆردومان دەکرا لەلایەن رژێم رۆژێکیان بۆردومانی کردین بەوچەکە ئاگرینەی پێشتر باسم کرد کۆمەڵێك خانوو سوتان هێزێکی پازداران لە سەروی مەقەرِی قورشید شێرە بوو ئیدارەیان زۆر باش بوو جموجۆڵی سەربازیان نەبوو کاریان چ بوو ئەوپرسیارە دەبێت لە لقی پارتی بکرێت؟ هێزێکی پارتی ویستیان چالاکیەکی گەورە بکەن بۆخۆ دەرخستن چونکە ماوەیکی زۆر پارتی دابرابوو لەناوچەکە ئەوەبوو لەدۆڵی هیان ئەنجامیان دا پەلامارەکە وا دەرنەچوو چەندان شەهیدیان دان یەکێك لە شەهیدەکان ئامۆزای من بوو بەناوی (محەمەد علی) پارتی وازی لە چالاکی گەورە هێنا تەنها چالاکی بچووك نەبێت گرتنی جاش لەولاو لەولا، رۆژێکیان برادەرانی پارتی زیاتر لە (١٠ ) کرێکاری دەوڵەتی میصریان گرت بوو هێنایانە شێخ وەسانان ماوەیەکی باش لەلایان بوون دواتر ئازاد کران لەو ماوەیە بەرێژەیکی زۆر گەنجی تازە روویان لە پارتی کرد رۆژانە ئەگەر دەکەس هاتبان دەشیان تەسلیم دەبوونەوە، زۆربەی لە تەمەنی گەنجی دابوون لەو رێژەیا بەشێکیان سەر بە موخابەرات بوون کاری نابەجیشیان کرد نموونە یەکیان پێم وایە چوار پێشمەرگەی تەسلیم بە رژێم کردەوە، دواتر هەر پێشمەرگە کۆنەکانی پارتی مانەوە .

لەساڵی ١٩٨٧ رۆژکیان چەندان سەیارە لە جۆری ئیڤای لەزینەتیی خۆشناوان دەرکەوتن سەیرەکەلەوەی بوو سەیارەکان سەربازی بوون، پێشتر نەش دیترا بوون، رژێم بە سەیارە پەلاماری ناوچەکەمان بدات بەبێ پیشەکی تۆپوتەیارەو تەقە.. مەڵبەندوناوچەکە سەریان سورماو تێك هەڵقژانێکی سەیر لەناوچەکە رووی دا دواتر زاندرا کەوا شێخ مستەفای زینوێ بەخۆی و

**براکەی و بەشێکی زۆر لەهێزەکەیان و بەچەك و سەیارە پیوەندیان بە شۆڕشەوە کردووە، هاتنی ئەوهێزە زۆردڵخۆشکەر بوو وامان چاوەڕێ دەکرد بەشێکی زۆر لە مستەشارەکان چاو لەجەنابی شێخ بکەن، بە داخەوە ئەوە ڕووینەدا !**

**دیارە لە(١٦/ ٤/ ١٩٨٧ گوندەکەمان بۆردومان کرا دوای سێ مانگ ڕۆژێکیان چومەشاخی سلێمانان، کەنزیکەی چەند کیلۆمەترێك لەشێخ وەسانان دورە، لەسەروی گوندیە. مەتارە تاوێکم پێ بوو لەبن بەردێکی گەورە کارۆکەیەکم دیتەوە، هەردو چاویشی کۆرەبووبوون بە چەکی کمیاوی کارۆکەم گرت و بەمەتارە برێك ئاوم دایێ و هێنامەماڵەوە خزمەتم کرد بووە جیسك زۆر قەڵەو بوو ڕۆژێکیان میوانم هاتن وتیان ئەو جیسکە دەخۆین زۆر هەوڵمدا کەئەو جیسکە کیمیادارە بە کەڵکی خواردن نایەت وتیان ئەوەکێشەی ئێمە نیە دەی خۆین جیسکەکە بۆ کوشتنەوە، جیسکەکە وەك سواروگورگی لێهات ! دەگێڕنەوە سوارێك لەرێدابوو لەپڕ گورگێك دەبینیت بزنێکی پێیەو ڕادەکات سوار دەکەوێتە دوای گورگی بزنەکە لەگورگی دەستێنێتەوە و چەقو دەردێنێت بزنکە سەر ببڕێت بزنەکە دەڵێت بۆ من چ سوار چ گورگ جیاوازیان نیە، جیسکەکەی منیش بە کیمیا نەمرد میوان خواردیان بۆ جیسك چ جیاوازەی هەیە مردن هەرمردنە چ دۆست چ دووژمن!**

**دوای چوار مانگی تر لەسەرووی (کانی ڕێغێ ) هەستمان بە دەنگی بزنێك کرد برادەران بۆی چوون بزنەکە جیسکێکی لەبەر بوو بزنەکە وەك خۆی مابوو، لە مرۆڤ ناترسا جیسکەکە کێوی بووبوو، بەبرادەران ناگیا دواتر بزنەکەیان گرت و بەستیانەوە بەفێڵ جیسکەکەشیان گرت. گوێدرێژێکیشمان دیتەوە بەهەمان شێوە. ڕۆژێکیان من لەناو گوند بووم برادەرانی پارتیش بەرێژەیەکی زۆر لە ناوگوند بوون، من و زریان شێخ وەسانی و خۆشناو توتمەیی خەریکی نوسراوێك بووین بۆ لقی پارتی لە بارەی شەهید بوونی جەلالی برای زریان شێخ وەسانی، لەپڕ من هەستم بە دڵتوندی کرد ئەو تەجروبەشم هەبوو زۆرجار پێش ڕووداو من هەست بەشت دەکەم، بەڵام نازانم ڕووداوەکەچییە؟ وتم خۆشناو زریان کارەساتێك ڕوودەدات، هەستن بابڕۆین دووسێ جار لێم دوبارە کردنەوە دیار بوو باوەڕیان بە قسەکانی من نەکرد، منیش لێیان توڕەبووم و دەشمزانی ڕووداو ڕوودەدات، نان هات نانیشم نەخوارد، چومەدەرەوە لەپڕ دووتەیارە پەیدابوون. بەبێ جەولە یەك لەدوای یەك (١٨) قومبەلەی دووسەت و پەنجا کیلۆیی بە سەرمان داباری یەکێك لە قومبەلەکان یان سارۆخەکان پێنج مەتر لە من دور بوون، لەبەختی من دیوارێك**

**لەنێوانمان بوو لەکات ژمێری دوانزەی نیوەڕۆ بوو بەشەو خۆرپارین و دارو بەردبارین من لەسەر ئەرز درێژ بووبووم هەردوو دەستم لەسەر سەرم دانابوو لە ترسی داروبەرد بارین کەزانەیم داروبەرد تەواو بوو بە پەلە چومە خانووی ماڵی شەهید یاسین لەناو خانوویان کونەتەیاریکی باشیان هەبوو من لەترسان چومەئەوێ کەچوم ژنە شەهیدێکمان کە لەکارساتی کیمیا تەنها خۆی و دووکچی رزگاریان بووبوو لەناو ئەوکونە تەیارە هەرسێکیان تۆقی بوون یەك بەدەنگی خۆیان دەیان زیراند من ترسم لەبیرکردو هەردوو کچەکەم لەباوەش گرت بەسەبریم وت بەسە هاوارمەکە سەبریش منی نەناسی چونکە دەتۆزو خۆر دا بزر بووبووم وتی ئەتوکێی وتم فەقێ مە کەمنداڵەکان کربوونەوە وتم سەبری ئاویان بدێ دواتر من دەموچاوی خۆم شوت لە تۆزو خۆر وتم ئەمن دەچمە دەرێ بزانم چ ڕوویدایە؟ سەبری وتی ئەدی ئەمە وتم جێگاو زۆر قەیە مەترسێ لێرەبن کە هاتمەدەرەوە هاوار هاوار هەبوو ژمارێکی زۆر پێشمەرگەی پارتی بریندارببوون ئەوانی باش بوون زۆربەیان هەڵاتبوونە دەرەوەی گوندی ناحەقیش نەبوون لەپڕ مام قورشید شێرە پەیدا بوو، دەنگیشی گەورە بوو، بە نەڕەنەڕ وەك شێر پێشمەرگەیێکی زۆر لە دەوری ئامادە بوون، بەراستی قورشیدشێرە لەو هەڵوێستە مەردانە بوو، بۆ مێژوو من مەلاکەمەدم نەدی لەوێ ئامادەبی، یان دەکرێت من نەم دیبێ پارتی دکتۆر و دەرمانی پێویستیا نەبوو، بریندارەکان گەیاندرانە لای دکتۆر زریان هەندێکیان پێویستی بە خوێن هەبوو، خوێن وەرگرتن پێویستی بەناسین هەیە دکتۆر زریان باشترین ڕێگای دیتەوە لەکەرتی سجن ژمارەیەك دیلی سەربازیمان هەبوون، لە هەویەی سەربازەکان جۆری خوێنیان نوسرابوو، دکتۆر زریان بەپێی پێویست سەربازەکانی دژشی بریندارەکانی چارەسەرکرد جەنابی وردەکاری باشتر دەزانی لەمن ئەوی من گوێم لێبووە گوایە بە مشاری دارپرین قاچی پێشمەرگەیەکی بریتەوە، کەبێ ئومێد بووە لە قاچی! خۆشبەختانە زۆربەی پێشمەرگەکانی پارتی چارەسەرکران دکتۆر زریان کاری سەیرو سەمەرەی کردوە، من بە چاوی خۆم لەو کارانەم لێ دیوە.**

**پێشمەرگەیەکی دەشتی هەولێر ناوەکەم لەبیر نەماوە گولەیەك بە قاچی دەکەوێت بۆی دەپێچنەوە وردەوردە گەیشتبووە لای دزریان من لەوێ بووم کەبۆی کردەوە برینەکە پڕ بوو لە کرم بۆ خاوین کردنەوەو کوشتنی کرمەکان دەرمان مێشی بەکار هێنا دکتۆر زریان دکتۆری گشتی بوو، ئاژەڵ منداڵ و ژن گەورە و بچووك و تەنانەت دکتۆری دوژمنیش بوو سەربازانەی دەگیران چارەسەری دەکردن، ئەگەر دەرمانی نەبایە ئاوی مرقەتەری دەکردە دەرزی و نەخۆش چاك**

دەبووەوە.. متمانەیەکی زۆری هەبوو لەلای هاولاتی و پێشمەرگە . گەیشتینەپایز لەسەری زستان هێزی شەرکەرمان لە دۆلی جافایەتی بوو، رژێم پەلاماری داین هێزی پێشمەرگەی ئێمە زۆر کەم بوو من چومەلای مامۆستا سەیفەدین لە گوندی بێراوە مامۆستا سەیفەدین بووبووە تۆپهاوێژ وتم برادەرانم لێرەنین ئەمرکە پێشمەرگەی تۆمە دلخۆش بوو، وتی: برۆ مەلبەند لای کوێستانی ئەونامەیەی بدێ وتم باشە بەسواری ئەسپ چوم ئەگەر بەپێیان چوبام ئەوەندە سەرماء نابوو لەگوندی بێراوە بەفری لێدام تاکو چومە تونمە برادەرانی کوێستانی منیان بەئامێز بردەژورێ لای کویستانی جلەکنیان لێ گۆریم و گەرمیان کردمەوە توانیم قسەبکەم نامەکە دایە کویستانی وتی دەنگوباس وتم باشەهێزکی زۆری بەرگری لەوێیە لەهەموگوندەکان هێزی بەرگریمان هەبوو لەکاتی هێرشی دوژمن هاوکاریان دەکردین وتی دەنگوباسی پارتی وتم دەورو بەری شێخ وەسانانیان گرتوە وتی کەسیان لەپێشەوە نیە وتم نەخێر کوسێتانی وەك پێوست لەمەسول لقی پارتی رازی نی بوو، لەوکات دوو پێشمەرگەی حیزبی شیوعی پەیدابوون دوای سلاو وچاك و چۆنی کوێستانی وتی برادەران دەنگوباس لای ئالانەو کەیکی حەمەد ئاغە چۆنە ؟ وتیان خەمی دۆلی ئالانەت نەبیت بە مەرجێك جەنابت تەقەمەنیمان بۆ دابین کەی کوێستانی وتی بەچاوان، چەندی پێتان دەچێت بیبەن کوێستانی شێخ شەمالی لەگەل ناردن، بۆ مەرجەب نامەیەکی نوسی و دایەدەستم و وتی بیدە بە مەلا محەمەد کە مەسئوولی لقی پارتی بوو، نامەیەکی تری بۆ مامۆستاسەیفەدین نوسی من رۆیشتم شەوم بەسەر داهات چومەلای مەلامحەمەد نامەکەم دایەدەستی مەلا دوای خوێندنەوە، کەوتە جولە بەو شەوە نزیکەی چل پێشمەرگەی رەوانەی گوندی بێراوە کرد، مامۆستاسەیفەدین رەوانەی پشتی گوندی خۆرانی کردن، یەکێك لەوان مولازمێك بوو ناوم لە بیرنەماوە بۆ بەیانی رژێم بە مودەرعە تەقەی لێ کردن برادەرانی پارتی پاشەکشەیان کرد و خۆیان بزرکرد .. هەمووشەری پارتی لەوشەرە ئەوەبوو کەباسم کرد وەدەشکرێت پرسیار لە مەلا محەمەد و پێشمەرگەکانی پارتی ئەوکات لەباتی باسی ئەوشەرە بکەن دەبووایە باسی، مزگەوتی هەنجیرەیان کردبا باشتر بوو ... لەکاتی نووسینی ئەوبابەتە مەلا محەمەد چاوپکەوتنێکی تەلەفزیۆنی لەگەل ئیسماعیل بەرزەنجی ئەنجام دا زۆر بەپالەوانە و خۆ هەلکێشان باسی شەرەکە و قاید کوشتنی دەکرد، بێ ئەوەی باسی یەکێتی و ئەوکەسە بکات کە قایدی کوشت .. لەبەختی هەموو لایەکمان هاورێ تەلعەت کە خەریکی تۆپ هاویشتن بوو لە قۆلی ئالانە تۆپێك داوێت دەلێت: ئەواهات تۆپ گوتی نەرۆی

قایدی حەرەکە واهاتم هاوڕێ تەلعەت قایدی کوشت، بەکوشتنی قاید پیاوانی ڕژێم لە هەموولایەك ڕایان کرد هاوڕێ تەلعەت لێن بووە خولەپیزە تا ماوەیەك هاوڕێ تەلعەت ئەی نەڕاند دەور دەوری تەلعەت بوو، کورد لەمێژە دەڵێت هەر شەڕەو لۆ جوامێرەکیە دوای ئەو شەڕە بووە زستانێکی زۆر سەخت، زیاتر لە چل ڕۆژ ناوچەکەمان خۆری بەخۆوە نەدی ترسی تەیارەمان نەمابوو ئێمە( ٣٠) ماڵێك ماڵمان لەبن شاخی شۆپە و دەورو بەر بوو ئەو چل ڕۆژەی باسم کرد لەچیا هەر بەفربوو لەبنارەکان باران بوو، ماڵ و منداڵمان هێنایەوە ناوگوند لەسەرەتایی مانگی سێ هێرەش و تۆپ باران دەستی پێ کردەوە ناچار بووین ماڵ و منداڵ ببەینەوە شاخ ناو ئەوبەفرە ئەوڕۆژەی تۆپ باران کراین زۆر بەخەستی خەڵکی گوندی بەرەو چیا رایی کرد برادەرێك ولاغی منی بەکارێك بردبوو ئەوەی وەدەستم کەوت کەرێکی لەر و لاواز بوو خێزانم هەم نەخۆش بوو بەکاری گەری کیمیا و هەم زگی هەبوو شەهید محەمەد بیکەیسی شەرگەی لەناوچەی جافەتی بوو وەماڵ ومنداڵێکی وردی هەبوو خێزانی ئەویش زگی هەبوو نەم دەزانی لەنێوان خێزانم خێزانی محەمەد بیکەیسی کامیان سواری ئەوکەرە لەر و لاوازە بکەم دواتر بریارم دا خێزانی محەمەد بیکەیسی سواری کەرەکە بکەم بێنەبەرچاوی خۆت ئەو(٣٠ ) ماڵە زۆربەیان بریندااری چەکی کیمیا وی بوون کێشەمان نەبوونی دەرمان و ئازوقە و کێشەی بەفر کەزیاتر لە دوومەتر بەفر هەبوو، لەچیا من خەمێکی ترم بۆ دروست بووبوو ئەویش بەخێو کردنی عەیشەبەگ بوو عەیشەبەگ کە پیشتر باسم کردبوو لەزستانی(١٩٨٧ بە تەنیا بەجێما بوو من دەبووایە ڕۆژانە ئیدارەی ئەو ژنەبدەم، بەو بەفرو قیامەتە لە کانی ڕێخێ بەقسەخۆشە زیاتر لە سێ کیلۆمەتر دەبوو نان و پێخۆرم بۆ دێنا گوندی و داریشم بۆ قەد دەکردن، دەبووایە ئاویشی بۆ دابین بکەم بۆئەوەی نەمرێت لەبرسان و سەرمان باش بوو عەیشەبەگم گەیاندە بەهاری ئەمرد .

*** *** ***

ئەکرێت باسێکی خارحەمەدی کوڕی فەقێ عەیشێ بکەین لەئێوارەی ١٦- ٤ -١٩٨٧ خار حەمەد لەگەڵ عەیشەبەگی دایکی دەچنە ژووری، تەیارە گوند بۆردوومان دەکەن ئەوان گوێش نادەنێ نایەنە دەرێ بزانن چقەومایە نەهاتنەدەرەوەیان دەبێتە سەلامەتیان لەو چەکە، بەیانی خار حەمەد دێتەدەرێ دەبینێت گەنمی پێش ماڵییان پڕە لە بزن و مەڕو چێل و گۆلك، خارحەمەد زۆر تورە دەبێت دەکەوێتە دوویان ودەڵێت بڕۆنەدەرێ هەی داکێ ساحێب و بگێم

ساحێب و لەکی ‌قونێ دەدات؟ هەی گەوادینە! هەزار جوین بەپولەکی ئەو نازانێت خەڵکی گوندی چییان بەسەر هاتووە، کەس نەماوە بە ساغی، بەس ئەو بە خۆ و دایکی نەبێت .

*** *** ***

بۆ مانگی سێ ڕژێم و پیاوانی ڕژێم پەلاماریان دەداین شەڕو شۆڕ بەرۆقەی گرتین لە هەموولایەك بارە قورسەکە کەوتەسەر ئەو (٣٠) ماڵە دەبووایە بەوڵاغەکانمان یارمەتی پێشمەرگمان دابا ئەوانیش یارمەتی ئێمەیان دەدا بەبڕە پارەیەك، ڕۆژێکیان کوێستانی بانگی کردم وتی فەقێ پیم باشە وابکەی خەڵکی هاوکاریمان بکات بۆ هێنانی( گراد) جۆرە سارۆخێك بوو سێ مەتر درێژ دەبوو ئەو سارۆخانە ساڵی پێشتر هات بوونە گوندی مەلەکان ئێمەش زۆرمان گواستنەوە.

وردەوردە ڕژێم کەوتە پیلانی ئەنجامدانی ئەنفال لەگەرمیان و دەوروبەری شەر لە دەورو بەری ئێمەش دەستی پێ کرد ئەوجارەیان یەکێتی نیشتمانی فیلی لەپارتی و ماڵی ئەنوەربەگی کرد بەبرادەرانی پارتی وت: ئێوە بکەونە شەڕگەی ماڵی ئەنوەربەگ قۆڵی بێتواتە کە یەکێتی بەئەنقەست شەڕگەی بێتواتەی دایەپارتی ماڵی ئەنوەر بەگ کەمتر خۆیان لەپارتی دەد ئەتوانین نموونەیەك بینینەوە، جاشەکانی ماڵی ئەنوەربەگ لە مزگەوتی گوندی هەنجیرە بەدەیان پێشمەرگەی پارتیان دەست بەسەردەکەن و دوواتر ئازادیان دەکەن، وردە وردە شەڕ لە قۆڵی گەرەوان دەستی پێ کرد هەر زوو ئەحمەد شێخ وەسانی شەهید بوو، دواتر شەڕ لە کێل کێل دەستی پێ کرد شاخێکە لە نزیك کورەك ئەوشەڕە ئەوەندە سەخت بوو باس ناکرێت شەڕەکە زۆرجار ئەبووە شەڕی چەکی سپی پێشمەرگەیەکی ئازامان بەناوی ( عەوزێرفەقیانەیی ) دوای شەریکی قورس و بێوینە توشی نیمچەشکانێك دەبن دواتر کاك عەوزێر بەخۆی و برایمی حاجی ڕەشیدی بناوی و شەهید نجات هەروتەکەونی و کەماڵ مەسیفی و کارزان لە(٩١)ی سەفین وشەهید محەمەدجمیل و لابەلا پەلاماری دووژمن دەدەن سەرلەدوژمن دەشێوێت و دەگاتە وەزعێك جوندییەك دەستی پێشمەرگە یەك دەگرێت بۆئەوەی بەسەرشاخی بکەوێت وای زانیوە سەربازی خۆیانە دواتر برادەرانی پێشمەرگەشیان دەگەنەئەوکۆمەڵەپێشمەرگەیە دەردێك پەقوەخاسی عیراق دەکەن بابەدەواری شری نەکردبێت لەناوشەرەکە ئەفسەرێك دەگرن دواتر دەی خنکینن شیوەی خنکاندنەکە باس نەکەین باشە باکەس تورەنەبێت، هەرچەندە کاك کۆسرەت دەڵێت نەی کوژن دیارە پێشمەرگەکان لەتۆڵەی شەهیدەکان لەناوی دەبەن ئەوەی من زانیومە هونەرەکە بەشێکی

شارەزای کاک عوزێر بووە لەوشاخ وداخە، دیارەئەوانەی بەشداری ئەو شەڕە قوڕسەیان کردووە هەموویان لەلای من ناسراونین، کاک عوزێر پێشمەرگێکی ئازابوو، دەسکەوتێکی زۆر کەوتە دەست پێشمەرگە شەڕی کێل کێل بێ وێنەبووە لە هەموو کوردستان، دەیان پێشمەرگە شەهید بوون، بەهەزاران سەرباز کوژران. شەڕەکە زۆردرێژەی کێشا شاخی کێل کێل و دەوروبەری ورد ورد کرا بوو بەتۆپ باران و هجوم پێشمەرگە زۆرخۆ ڕاگر بوون چەندان پێشمەرگە لەبەر دەنگی گولە دەبابە گێژ بووبوون لە قۆلی گەرەوانیش شەڕەکە زۆرقوڕس بوو تیپی(٩١)ی سفین چەندان پێشمەرگەیان شەهیدبوون وای لێهاتبوو ئەو شاخەبۆگەن بووبوو لە بۆنی لاشەی دووژمن، شەڕەی کێل کێل شەڕێکی یەکلاکەرەوە بوو، لەنێوان ئێمەو دووژمن، ئەو شەڕەی کێل کێل وەنەبێ تەنها ئەو برادەرانەی من ناوم هێنان هەر ئەوان بووینە نەخێر، چەندان تێپوکەرت لەو چل ڕۆژە بەشداربوون، زۆروکەم ئەگەر مەترسی چەکی کیمیاوی دەورەگرتنی مەڵبەندی سێ لە ئارادا نەبا ڕژێم لەناوچەی کێل کێل لەپەلاماردان وەستابوو دیارە شەڕەکە لەدۆڵی گەرەوانیش زۆر سەخت بوو، لەنێوان هێزی پێشمەرگەو ڕژێم .

ڕۆژێکیان من و چەند برادەرێك چەند بارە تەقەمەنیمان بردە بناوی، لەلای قەڵاتی (کۆرانە گادەرێ ڕژێم بە ڕاجیمە دەورەبەری ئێمەی تۆپبارانی کیمیاکرد، دیارە کاریگەری لەسەر ئێمەنەبوو. چوینەلای برادەران شێخ جەعفەر و کاکەجوان لەوێ بوون تەقەمەنیمان دانەدەست و شێخ جەعفەر وتی هاورێ فەقێ دەبێت بچنەگەرەوان هەندێك گوللە ڕاجیمە لە فلان ئەشکەوتە لەگەرەوانی خوارو بەسەرەوە بەلای ڕۆژئاوا، ئەوکات ڕژێم لە زێغی گەرەوان بوو من دەمزانی زۆر مەترسیدارە، وتم یاشێخ ئەوانەی لەگەڵ من هاولاتین پێم باشە نەچین... شێخ پێی داگرت دەبێ بچن وتم باشە خۆم بە تەنیا دەچم وتی نەخێر، دەبێت هەمووتان بچن شەڕەقسە لەنێوان من و شێخ جەعفەر ڕوویدا دواتر کاکەجوان ناوبژیوانی کردین زۆرنەمابوو لێدان بخۆم بەدەستی شێخ جەعفەر، دوواتر کاکەجوان بە نەرموونیانی قەناعەتی پێ کردین، بە ڕێکەوتین گەیشتینە ناوگەرەوان، ڕژێم هەستی پێ کردین بەسوتفە نەجاتمان بوو بەدۆشکەوبیکەیسی وبەهاوان و تۆپ ئاگربارانیان کردین ئەشکەوتەکەمان دیتەوەو گولەراجیمەکانمان نەجات دا، لە کۆرانە گادەرو دەوروبەری پڕبوو لە پاشماوەی ئاژەڵی کوژراوە ئەوشاخ وداخانە پڕبوون لە بزن و جیسك،لە خەڵکی ناوچەکە ڕایان کردبوو جیسك و بزنێکی زۆر بەو شاخانە دەسوڕانەوە و پێشمەرگە دەیان خواردن من لەوسەفەرە ڕووداوێکم زانی دوو پێشمەرگەی زۆر قارەمان بە ناوی حەسەنە گەورە و

محەمەدگۆڕەشێری هەردووکیان ئامێرکەرتی زۆرچالاك بوون، پیاوی زۆرئازاو تێکۆشەر بوون گوایە کەمتەرخەم بووینە لەبەرگری لە ( شاخێ زیرینۆکێ ) ڕووداوەکە بەو شێوەی خوارەوە بووە محەمەد گۆڕەشێری واجبی لەشاخی زیرینۆکێ بووە دوای چەندان ڕۆژ مانەوەیان لەچیای زیرینۆکێ و هێزەکەشیان زۆر کەم بووە چونکە پێشتر چەندان بریندارایان هەبووە، زۆرهیلاك دەبن پەیوەندی بەکاك ڕێبین دەکەن دەڵێن: زۆرهیلاکین ئەگەر بە دڵمان بکەن کاك ڕێبین دەڵێت ئێوە وەرنە خوارێ، حەسەنەگەورە دەنێرمە شوێنتان لەو کەینوبەینە ڕژێم چیای زێرینۆك دەگرێت، شێخ جەعفەر ئەودووبەرێزە تۆمەتبار دەکات کاك ڕێبینیش حاشای لەبڕیارەکەی دەکات حەسەنە گەورە محەمەد گۆڕەشێری زۆر بێزار دەکرێن شەڕگە بەجێ دێڵن حەسەنەگەورە دەچێتەوە لای بلە و پەیوەندی بەپیاوانی ڕژێم دەکات محەمەد گۆڕەشێریش نیازێکی وای هەبوو ماڵی بردبووە خوار گوندی هەرتەل و من کە گەڕامەوە و ڕۆژی دووەم چومە هەرتەل و محەمەد گۆرشێریم هێنایەوە شێخ وەسانان بە ماڵ ومنداڵەوە بۆ بەیانیەکەی چومەوە مەلەکان لە کۆڕانەگادەر بە مەبەستی دیتنی بەڕێز عەولابۆر عەولابۆرم دیتەوەو وتم کاك عەبدوڵلابۆر من گۆڕەشێریم هێناوەتەوە شێخ وەسانان، وتی کارێکی باشت کردوە. دوواتر چومە لای کوێستانی باسی گۆڕەشێریم بۆ کرد کویستانیش وتی کارێکی باشت کردووە.

بەداخەوە نەمتوانی ئەوکارە بۆ حەسەنەگەورە بکەم . حەسەنەگەورەی قارەمان خۆی دایەدەست ڕژێم و ڕژێم شەهیدی کردن، خۆشبەختانە محەمەد گۆڕەشێریم لەو مەترسیە دوورخستەوە، ناوی بەڕێز عەولا بۆرم هێنا ئەگەرەوسفی عەولابۆر بکەی نازانی باسی عەولابۆر لەکوێ دەست پێ بکەی! ئەکرێت بەوشێوەیە باسی بکەی پیاوی تەنگانە، پیاوی ڕۆژەسەختەکان، شێرەپیاوی چیای کۆڕەك و سەرەجوانەگا و کێل کێل وهەزار و یەك ناوی دی... ڕۆمانێکی گەورەیە... ڕۆژێکیان لە شەڕێکی سەخت عەولابۆرم دیت زۆرتێنی بووبوو لێوی وشك بووبوون، قسەی پێ ناکرلە لەتێنان، منیش نیوەمەتارەئاوم مابوو، چاوم پێ کەوت زانیم زۆرتێنیە وتم کاك عەبدوڵلا ئاوبخۆوە، ئاوی لێوەرگرتم یەك قوم ئاوی خواردەوە... دووبارە وێمدایەوە، ئەوجارەشیان یەك قومی لێ خواردەوە. دڵی نەهات ئاوی من تێربخواتەوە، بۆمێژوو هەموروناوچەیەك پێشمەرگەی ئازاو قارەمانی هەبوونە، بەڵام ئەگەر بە وردی بەدوواداچون بکەی پشکی شێر بەر دزەیێ ئاکۆیی دەکەوێ، لەپیاوی ئازاو قارەمان و شەڕکەر و لێزان و خۆڕاگر و نیشتمانپەروەر... دەیەی شەهیدی هاوشێوەی سەعید کادیریان هەیە و هەبووە... سەعید کادیر لە کارەساتی

کوێستانەکانی ڕۆژهەڵاتی مەرگە نەیتوانی بەو شاخە سەر بکەوێت و لە سەرمان شەهید بوو، پێم وایە گۆڕیشی ونە. هیوادارم تادەنگ نەبووە کەسێکی بە توانا دەستێك بە ڕابردووی دۆڵی تاکۆیاندا بگێڕێ .

*** *** ***

دووای چەند ڕۆژی تر چەندبارە تەقەمەنیمان بردە دەوروبەری کەندۆر، ڕێژەیەکی باش شیرنەمەنیشم، لەگەڵ خۆ بردە نەخۆشخانەی مەلەکان، کەپڕبوون، لە پێشمەرگەی بریندار بەسەر برینداراندا دابەش کرد ئەو شیرنەمەنیەم لە گوندی سیساوە بۆ هات بوو برادەران لایان سەیر بوو لەو وەختە سەختە من بیرم لەشیرینی و برینداران کردیتەوە نەخۆشخانە لەتەشکەوتێکی گەورەبوو پڕ بوو لە بریندار دکتۆر زریان و برادەرانی وەك قەساب لەناویان داتن و دە چوون چاودێریان دەکردن.

لەکاتی دابەشکردنی شیرنەمەنی کەسێك دەستی گرتم زمانی لەنگ بووبوو، سەرو ریشوسمێلی تراشابوون نەمناسی ماوەیەکی لەلادانیشتم، هەر نەمناسی لێشی تێنەدەگەیشتم چی دەوت، دوای ڕۆیشتم لە هاوڕێ ئیسماعیل گەرەوەیم پرسی وتم ئەو سەرتراشایە کێیە؟ وتی چۆن نای ناسی وتم نەوەڵڵا! وتی شاسواری خۆمانە پارچەیەکی بە سەری کەوتووە و ناتوانێت قسە بکات دووبارە چومەوە لای و دەستم لە ملی کرد و ماچم کرد و ماوەیەکی چاك لەلای دانیشتم، بەڵام ئەو قسەی بۆ دەکردم وحەزیشی لە قسەکردن بوو منیش یەك وشەچیەتێی نەدەگەیشتم، ناهەقیشم نەبوو، شاسوار پیاوێکی ئازاو پۆشتە و سەروڕیشێکی جوانی هەبوو پێشتر کە من دیتبووم سەروڕیش و سمێڵیان تراشی بوو هیچ وە شاسواری جوانی جاران ناچوو، ببووە سەرکودیلە.
ئەوڕۆژە کارەسات بوو ناوەناوە دووشەهید بەبنبار لە گوێدرێژ بارکرابوون و دەیان هێنانەوە نەخۆشخانە هەمووشیان گەنجی تازەپێگەیشتوو بوون جلکوپێڵاو سەرودەم و چاویان هەموخوێن بوو، بە تایبەتی پێشمەرگەکانی (٩١ ) سەفین، شەهیدی زۆریاندا و هەمووشیان گەنجی جوان و تازە پێگەیشتوو بوون لە گەڕانەوەم بۆ شێخ وەسانان دوو پێشمەرگەم دیتن یەکیان بەتۆپی دەبابە مێشکی ئەزیەتی خواردبوو، گێژو بووبوو جلوبەرگیان هەمووی رەش بووبوو دەقرێژێ و خوێنی شەهیدەکانیان سەروگوێلاکیان ئارۆز و تۆز و خۆڵی گوللەتۆپیان لەسەر نیشتبوو لەگەڵ خۆم هێنانەوە ماڵەوە و خۆیان شووت لەگەڵ جلوبەرگیان تۆزێك خاوێن بوونەوە، ڕۆیشتن هەر لەو ساڵەدا گوندی مەلەکانی کیمیاباران کرا چەندان ژن ومناڵ و پیرو پەکەوتە شەهید وبریندار

بوون فرۆکەو تۆپ باران بەردەوام بوون لەبۆردمانی گوندەکان لەگوندی وەره وە تاکو گوندی بناوی و دۆڵی مەلەکان و دۆڵی گەرەوان گوندی فریز و مەندیر و نازەنین ودۆڵە سماقوری و وەرتێ و و شەووڕێژ ئاسن ئاگر دەباری، بەسەر گوندەکان و هێزی پێشمەرگە ئەوەی لەو ناوچانە دەژی بەچرکەش بە تەمای مانەوەی نەبوو، لەخەویش مەترسیت هەبوو تۆپێك شەهیدت بكات، من وەك خۆم نامەوێت باسی خۆم بكەم، بەڵام بۆ مێژوو ئەگەر ئەو سێ ماڵەی شێخ وەسانان نەبووان من پێم وایە هێزی پێشمەرگە نەیدەتوانی ئەو چل ڕۆژە خۆی ڕاگرێ ئەوانەی دەزانن لەژیان دلێ دەتوانن ئەو شاهیدی بدەن ئەوانەی لە ژیان ماون ئاگاداری ئەو چەند ماڵەی شێخ وەسانان بوون. لەپاڵ پشتی پێشمەرگە. یەکیان شێخ شەماڵ بوو کە ڕاستەوخۆ ئاگادار بوو ئەو لە نزیك کوێستانی بوو، ئاگاداری ئیدارە بوو.

***　***　***

لە ڕێکەوتی ( ٣١/ ٨ / ١٩٨٨ ) وام بە باش زانی سەردانی مەلا نەجم و برادەران بكەم لەقاسماوە لەڕۆژئاوای گوندی بالیسان مەقەڕیان لەوێ بوو، سەردانەکەشم تەنها ئەحواڵ پرسین بوو دوای چاك و چۆنی چاخواردنەوە، دووماڵەپێشمەرگە لەنزیك ئەوان بوون ماڵی جەعفەر و سەلام و مام حەمەدیشیان لەلابوو، چومەسەردانی ئەوانیش هەردووکیان ماڵ و منداڵیان لەگەڵ بوون لە بالیسان ئەو دوو ماڵە مابوون، لەلای ئەوانیش چام خواردەوە. سەلام کوڕێکی خرپن و جوانی هەبوو گەمەی زۆر خۆش بوون ماوەیەك بەو منداڵە خەریك بووە. منداڵەکەناوی (گەردۆ) بوو، دواتر وتم دەڕۆم زۆر هەوڵیان دا شەو لە لایان بم، منیش وتم دەڕۆە سواری وڵاغەکەم بووم کەوتمەڕێ سەت مەترێك لەوان دوورکەوتمەوە دوو تەیارە لەسەر سەرە پەیدا بوون، من وام پێ باش بوو ڕا بكەم وڵاغەکەشم زۆر باش بوو، قەمچییێکم لێ داو وڵاغەکە غاریدا گوێم لە دەنگی سارۆخەکان بوو من رۆیشتم دورکەوتمەوە چومەوە ماڵەوە بەیانی بەخێزانم وت من دەچمەوە بالیسان لای ماڵی سەلام و جەعفر بزانم چیان بەسەر هاتووە خەریکی خۆ ئاما دەکردن بووم خێزانم بەشەهید حاجی وتبوو: وابکە فەقێ نەچێتەخوارێ، با نە فەوتێ خەریك بوو سواری ئێستر ببم شەهید حاجی ڕێی لێ گرتم بەزۆر دای بەزاندم، منیش دڵم نەشکاند باوەڕ بکەن خێزانم ڕاستی دەکرد بۆ کاتژمێرێکیش کەس بەتەمای خۆی نەبوو ڕژنە داروبەردی ناوچەکەمانی دەسوتاند بەردەوام تەیارە بە ئاسمانەوەبوو هەروەها تۆپبارانیش ئەگەر کەرستەی خۆ پاراستنت نەبێت شەڕ لەگەڵ چەکی کیمیاوی ناکرێت، ناوەناوە چەکێکی تری بەکار

دێنا هەر سارۆخێك دووسەت وپەنجا سارۆخی بچووكی تێدا بوو، بۆ گوندەكان و ناو دارستان بەكاری دێنا من هەر بیم لەسەلام و جحفر ومناڵەكانیان دەكردەوە دەم زانی فەوتاون من لەكاتی بۆردوومانی تەیارەكان سەت مەتر لەوان دووربووم، دوای دووسعات حاجی ئاگای لەمن نەما. سواری ئیسترەكەم بووم، بۆی دەرچوم نەوێرام بەشێخ وەسانان دا برۆم بەچیا چومە لایان گەیشتمە ماڵی سەلام سەرەتا گوێدرێژێكم دی كوێر بووبوو چەندان باڵندەم دی مردبوون ماڵێكی چۆڵ تۆزێك بەرەو ڕۆژ ئاوا رۆیشتم خێزانی سەلام لەناو تەراشێك لەسەر پشت كەوتبوو دەمولێوی شین هەڵگەرابوون خنكانی بەچەكی كیمیاوی پێوەدیار بوو تۆزێكی تر ڕۆیشتم خێزانی شەهید جەحفرو خۆی و كچەكەی شەهید بووبوون بەمردووش دەستی لە كچەكەی شل نەكرد بوو هەر لە ئامێزی بوو تۆزێكی تر ڕۆیشتم شەهید جەعفەر و مام حەمەد لەنزیك یەك شەهید بووبوون جەعفەر قیناعی دژەچەكی كیمیایی بسەرەوەبوو پر بووبوو لە خوێن منیش قیناعەكەم لە سەری كردەوە پێ دەچێت شەهید جەعفەر چەند هەناسەیەكی هەڵمژی بێت،ئەوكات قیناعی بەستووە. مام حەمەد لایەكیشی سوتا بوو، زۆر گەڕام بە دوای سەلام و كوڕەكەی كە ناوی گەردز بوو، گەردزی جوان و خرپن تەمەن یەك دوو ساڵان بوو، نەم دۆزینەوە، لەو گەڕانەم هەستم كرد كیمیا كاریی تێ كردم شوێنەكەم بەجێ هێشت دواتر زانیم لەگەڵ لێدانی كیمیا سەلام پەلاماری كوڕە خۆشەویستەكەی دەداو ڕادەكات بۆلای مەلا نەجیم لەوێ تەماشا دەكەن كوڕەكەی مردووە ئەوانیش شوێنەكەیان چۆڵ دەكەن بەرەو چیای ڕەش دەچن، من چومەبێراوە لای ئیسماعیلی حاجی ڕەشید، هەندێكی ترلەوێ بوون، پێم وتن لە فلان شوێن كۆمەڵێك شەهیدمان هەیە، هیممەت بكەن ئەم شەو ژێرخاكیان بكەین مەردانە ئامادەیی خۆیان دەر بڕی، لەوێ چومەوە مەقەڕی تیپی (٨٣) هەورێ لە سەروی گوندی كانی بەرد ڕووداوەكەم بۆ باس كردن ئەوانیش ئامادەیی خۆیان دەر بڕی من چومەوە ماڵەوە خزمانی شێخ وەسانانیشم ئاگادارکردەوە، كەوا هیممەت بكەن ئەو شەهیدانە ئەمشە و ژێرخاك بكەن، لەوێ كەوتمە بەر كاریگەری چەكی كیمیا وەزعم باش نە بوو، نەمتوانی بەشداربم لەناشتنیان دیارە ئەو خەمە هەر خەمی من نەبووە بەتنیا شەو خەڵكێكی زۆركۆدەبنەوە و دەیاننێژن وەك شەهیدمەلانەجم و برادەرانی بەشێك لە پێشمەرگەكانی پارتیش بەشدار دەكەن، لەسەرروی گوندی شرێمك كچ ودایك چۆن لەكاتی مردن و دوای مردنیش ئامێزی یەكتریان بەرنەدا برادەران بە هەمان شێوە ناشتنیان، ئێستاش هەر لە باوەشی یەكتردان ناوچەكەمان بووبووە ناوچەی مەرگ،

**لە هەرکاتێك کەس بە تەمای خۆی نەبوو، تەنانەت لە کاتی نووستنیش چاوەڕێ بووی تۆپێك بەماڵەکەت بە مەقەرەکەت، بەو شوێنەی لێی نووستی، بکەوێ. وردە وردە ئاڵۆزتر دە بوو وای لێهات هەموو ناوچەکە پەنجا ماڵی لێ نەما بوو لەزۆربەی شەرەگەکان بردنی تەقەمەنی ئێمەی ئەو ماڵانەی شێخ وەسانان ئیدارەمان دەدا وڵاغی باشمان هەبوون لەپر پاسدارەکان بزر بوون دوای ماوەیەك ڕۆژێکیان شێخ شەماڵ هاتە لام وتی کوێستانی ئەیەوێ بت بینێ لەگەڵ شێخ بەرێکەوتین بۆگوندی توتمە شەهید کوێستانیم دیت وتی هاورێ فەقێ هاتی وتم بەڵێ فەرموو دوای چاك و چۆنی و هەواڵ پرسینی خزمان وتی دوای چەن ڕۆژێکی تر ئێمە ناوچەکە چۆل دەکەین بە پەلە ئاگاداری خزمان بکەوە ئەگەر دەچنەئێران دووسەد دیناریان بۆ سەرف دەکەین ئەگەر دەتوانن بچنەوەشارەکان بتوانن عیلاجی خۆتان بکەن ئێمە مەمنون دەبین ڕێ پێدراون بە هەر شێوەیەك خۆتان بپارێزن من مەمنون دەبم ئەگەر بەجاشایەتیش بێت لە هەموو تەمەنم ناخۆشترین ئەو قسە بووە کەلە کوێستانیم گوێ لێ بوو وتی ئێرە چۆل دەکەین ماڵومنداڵتان لەو ناوچەیە دوور بخەنەوە با ئەنفال نەکرێن پێشم باشە هەندێك لە پیاوەکان بێننەوە بەجێمان مێڵن تا هەمووومان پێکەوە دەڕۆین گریان گرتمی وەڵامی کوێستانیم نەدایەوە. تەنها بەدەست ماڵ ئاوایم لێ کرد. هاتمەوە خزمەکانم کۆکردەوە قسەکانی کوێستانیم بۆ گێڕانەوە، دیارە کوێستانی محەمەد بیکەیسی و خەڵکی ترشی بانگ کردبوو هەمان قسەی لەگەڵ کردبوون ئەوان بوونە دووبەش بەشێکی کەم بەرەو ئێران بەشی زۆر تەسلیم بوونەوە، من منداڵەکانی خۆم و شەهید حاجیم بەرەو گوندی هەرتەل بردن، داوام لەبرادەرێك کرد ئەو ژن و منداڵانە ڕەوان کەن بەرە و سەروچاوە وتیان باشە ئەی تۆ وتم من دەگەڕێمەوە، گەڕامەوە شێخ وەسانان ڕۆژانە دەبووایە تەقەمەنی بگەیەنینە شەرگەکان وردەوردە ناوچەکەمان بەرتەسك تر دەبوو پێشمەرگەو ماڵ و منداڵیان بەرەو ئێران دەچوون نیوەڕۆیەکیان شەهید عەبدولرەزاق بە هێزکی زۆر هاتنەماڵەکەی من منیش نانم کەم مابوو، خەمم بوو چونکە کەس نەبوو نانمان بۆ بکات بوو دواتر بە گونیە کەبابیان هێنا، نانیان لەلای من خوارد دواتر وتیان هەستە بابڕۆین منیش وتم باشە ئامۆزایەکم پارتی بوو بەناوی ساڵح چومە لای وتم ساڵح با بڕۆین وتی من ناڕۆم پارتی ئێرە چۆل ناکات، شەڕدەکەین وتم ئامۆزا شەڕ بەمە ناکرێت چۆن بەپارتی دەکرێت! نەهات لەگەڵم منیش لەگەڵ برادەرانی خۆم نەچووم دوای چەند ڕۆژ ئێوارەکیان کوێستانی هات بەخۆی و هێزێك ئەوانیش وتیان بابڕۆین هەرنەڕۆیشتم بۆ بەیانی ڕژێم لە هەمولایەك**

هات گەیشتەگوندی خەتێ و مێرگەسەر دەت وت ڕۆژی حەشرە! ئاگر و ئاسن لە ئەرز و ئاسمان دەباری چومەلای ئامۆزاکەم وتم بڕۆین یان نا ئامۆزاکەم وتی تەواو من هەڵە بووم بابڕۆین گەیشتینە مەلەکان ڕژێم گەیشتە کۆرانەگادەرێ کەدەکاتە نێوان گەرەوان و مەلەکان بەپەلە ڕۆیشتین هێزی پارتیش کەوتەجولە بۆ ڕۆیشتن گەیشتینە چیای کوڕکوڕ چەکدارەکانی سواراغە دەکرێت بڵێم پێشمەرگەکانی سواراغە لەسەرگا بوون بەجیهاز دەیان وت ناوچەکەمان گرت و هەموومان کوشتن بەئێمەشیان دەوت زوبن پەلەکەن گیشتینەگوڵان دواترپەڕینەوە زۆر ڕۆیشتین بەرەو ڕۆژهەڵاتی بۆتێ ناوچەیەکی کوێستانی بوو ئەوشوێنەم قەت نەدیت بوو لەوێ وتیان ناتوانن بڕێن جادەی قەندیل لەلایەن ڕژێم پەرژین کراوە، ماینەوە بۆبەیانی بەسەدان کەس بووین هێزەکانی پارتی یەکێتی حیزبی شیوعی برادەرانی شیوعی ماڵ ومنداڵیشیان لەگەڵ بوو بۆ شەوی دوەم و سێیەم بەهیمەتی ماڵی سواراغە و پیاوەتی خەڵکی دۆڵی شاورە ئەو هێزە وردە وردە بزرکرا، بە هەموو پێداویستییەکەوە ناکرێت ئەو هەڵوێستەی ماڵی سواراغە قەت لە بیر بکرێت بەعەشیەتیشەوە دیارە برادەرانی دیموکراتیش ئەوەی لەدەستیان هات کردیان زیاد لەتوانای خۆشیان من پێم باش بوو بچمەناو دیموکرات وڵاغەکەم بەرەڵاکرد و چەکەکەی خۆم لە شوێنێك حەشاردا وردە وردە بە ڕێکەوتم بۆ مەقەڕی برایانی دیموکرات بۆ مێژوو شەهید عەلی نەبی لەبەر ماڵی خۆیان پێشماڵی خۆی ڕێك دەخست چەوی بڵاو دەکرد، منی دیت یەکترمان ماچ کرد، وتی بەتەمای چییت؟ وتم خۆم بزردەکەم وتی کوڕی چاك ئەدی ماڵت لێرە نییە بۆ کوێ دەچی؟ وتم ماڵی تۆ زۆر لەسەر جادەیە بە کەڵکی من نایەت زۆر هەوڵی دا بەقسەم نەکرد نزیك بوومەوە، لە بازگەی مەقرەکانی دیموکرات زۆر دوور نەبوو، لەماڵی عەلی نەبی دوای سڵاو وتیان فەرم و وتم دەمەوێ بەرپرسەکەتان ببینم، زۆرکێشەیان کرد دواتر ڕازی بوون، منیان پشکنی و بردمیانە لای مەقەڕەکانیان بردمیانە شوێنێك ڕایان گرتم دواتر کەسێکی باڵابەرز و جوان دەمانچەیەکی بەکەلەکیوە بوو سڵاوی لێ کردم تەمەنی لەسەروی چل دەبوو وتی فەرموو، من بەرپرسم وتم منیش پێشمەرگەی یەکێتیم هاتووم ئیدارەم بدەن بۆ ماوەیەك، کابرا بە هەڵە لە من گەیشت وتی ئێمە هیچ پەیوەندیمان لەگەڵ یەکێتی نیە ناشیان ناسین ئیدارەی پێشمەرگەکانیان نا دەین وتم بەڕێز ئەوخورمایەی جەنابت دەی خۆی دنکەکەی لە باغەڵی منە من یەکێتیم ئەوحیزبەش حیزبی خۆمە لێشم مەترسێ وە ناشڕۆم لێرە وتی باشە کێ دەناسی لەناو یەکێتی ناویان بلێ وتم بەرێز ئەوەناکرێت من لەناو یەکێتی سەدا

پەنجای دەناسم ئەو هەموو ناوە چۆن باس دەکرێت، وتی باشە من ناوی هەندێکیانت پێ دەڵێم وتم باشە، وتی فلان و فلان وتم نا دواتر..وتی مامۆستا بایز وتم بەڵێ وتی ئەویش تۆ دەناسێت وتم بەڵێ کابراوتی تۆ لێرە بوەستە یەکسەر چووە بن ساباتێك دیاربوو کۆمەڵەسەرکێك وەدەرکەوتن تومەزانە ئەوسەرکانە هەموویان برادەرانی ئێمە بووینە و منیشیان ناسی وە بەبرادەرانی دیموکراتیان وتبوو ئەو کورە ڕاست دەکات جێی مەترسی نییە چونکە ئەوانیش لە ڕژێم دەترسان دواتر دوو پێشمەرگیان بۆلای من ها تن، وتیان فەرموو و بردمیان بۆ بن خێمەیەك دواتر نینۆك برِو فلچەو مەعجونی دان و تاقمی تراش و قاتێك جلو بەرگی خۆیان بۆ هێنام ڕۆژێکی ترلەگەڵم ها تن چەکەکەی خۆشم هێنایەوە زۆریان خزمەت کردم هەرمنیش نەبووم برادەران زۆر لەوێ بوون خۆیان حەشار دابوو وردەوردە سەردانیان دەکردم ڕۆژکیان کەوتینە مجامەلە بەخراپ باسی دکتۆر قاسملۆیان دەکرد ئەوانیش توشی ئینشقاق بووبوون ئەوبەشەی من لە لایان بووم پیان دەوترا لادەر پێم وتن برادەران من خۆم بەقوتابیەکی دکتۆر دەزانم ئەوەی فێربووىمە لە کوردستان و کورد، لەلای من باسی دکتۆر مەکەن دکتۆر لەوە گەورەترە ئێمە باسی بکەین ئیتر ماڵیان ئاوابێت تاکوو من لەلایان بووم باسی دکتۆر قاسملۆیان لەلای من نەکرد بەخراپە.

ئەمەوێت ڕووداوێك باس بکەم تاکو زۆر دوورنەچوین ئەویش مام حاجی سمایلی مەلەکانە پێش ئەوەی هێزی پێشمەرگە ناوچەکە چۆڵ بکات، ئاگاداری پێشمەرگە و هاوڵاتیان کرایەوە، لەلایەن سەرکردایەتی یەکێتی کە ڕژێم دەیەوێت ناوچەکە تۆق بکات و بەچەکی کیمیاوی ناوچەکە بە خەستی بۆردوومان بکات دواتر دەست بکات بەهێرەش لەهەموولایك خۆش بەختانەزۆبەی خەڵکی نجاتی بوو کەمترین ئەنفالمان بوو. لە گوندی مەلەکان دوو ئەنفالمان هەبوون بەو شێوەیە مام خاجی سمایل لەگەڵ خێزانی بەناوی حەلیمە هەرچەند برایانی پێشمەرگە و خەڵکی مام حاجی ئاگاداردەکەنەوە کە ئەویش لە ناوچەکە بڕوات مام حاجی دەڵێت تاخوێنی دوژمن لەکاتی خانووسوتاندنی خۆم نەرێژم مەلەکان بەجێ ناهێڵم کۆمەڵێك پیداوستی سەرەتای ڕۆژانە دەباتە پشت ماڵیان ناو ئەشکەوتێك لەگەڵ خێزانی، ڕێژەیەکی باشیش تەقەمەنی دەبات لە جۆری برنۆ دیارە مام حاجی برنۆیێکی باشیشی هەبووە، ڕژێم پەلاماری ناوچەکە دەدات و گوندی مەلەکان دەسوتێن و بەرەو خانووەکەی مام حاجیش دێن، دەست دەکەن بە سوتاندنی خانووی مام حاجی لە نزیك خانووەکەی، سێرە لە ئەفسەرێك دەگرێ و دەی کوژێت وەسێ سەربازیتریش

دەکوژێت و چەندانیش بریندارەدەکات شەردروست دەبێت لەنێوان لەشکرێك و مام حاجی بەتەنیا تاکو شەو بەهەمووجۆرەچەکێکی لێدەدەن لەنەتیجە خێزانی بریندار دەبێت بۆرۆژی دووەم شەربەردەوام دەبێت مام حاجیش بریندارەدەبێت مام حاجی پیاوێکی شاخەوان بووە خێزانی پێی گوتبوو بەشەو برۆ بەشاخی دا مام حاجی خێزانی خۆی بەجێنەهیشت بوو، بۆ ڕۆژی دووەم چەکدارێکی دەوروبەرمان کە لەگەڵ ڕژێم دەبێت بەناوی ( تادەم ) خوا رورەشی کا بانگی مام حاجی دەکات و دەڵێت وەرەلەسەر شەڕەفی من خۆت بدە دەست سەلامەت دەبیت مام حاجی بەهۆی برینەکەی خۆی و خێزانی خۆی تەسلیم دەکات هەردووکیان دەبەنە لای رواندز و لەروزاندز لێکیان جیادەکەنەوە و پوور حلیم لەحەفوەکەی (١٩٨٨ ) ئازاد کرا و مام حاجیش ئەنفال کرا لە پێش راپەرین کابرایەکی عەرەب بەسەیارە لە پوورحلیمی دا وئەویش شەهید بوو،دیارە کوشتنی پوور حلیم مەبەستێکی سیاسی لەپشت نەبووە وە عومەر مەلەکیش زیاتر لەدوومانگ لەمەلەکان مایەوە

*** *** ***

باشترین پەناگە لەکوردستان دۆڵی شاورێ بوو بۆ پێشمەرگە و فیرار و لیقەوماو، دواتریش بۆ پارتی زانەکان. دیارە دەبێت سوپاسی ماڵباتی عەباساغە و جەماوەرەکەی بکەین، داوام لەبرادەرانی دیموکرات کرد، ئەگەر بکرێت ئاودیوی ئێرانم بکەن وتیان سەبر بگرە تاکو وەزعەکە بەرەو ئارامی دەڕوات، رۆژانەدەنگوباس هەبوو کە ڕژێم بەنیازە دۆڵی شاورە و ناو دیموکرات بپشکنی وتم واباشە کێشەیەك بۆ برادەرانی دیموکرات دروست نەکەم بەپارتیزانی ماوەیەك بسوڕێمەوە، بە ڕاشکاوی بە برادەرانم وت ئەوانیش وتیان چۆنت پێ باشە وابکە، سوپاسم کردن بە سەیارێك تاکو خوار حاجیاوانییان بردم، چەك و تەقەمەنیم لە گونییەك نابوو،چومە گوندی گردی خوادای، هەرچی چاوی بە من دەکەوت سەیری دەکردم، سەیربوو دەیانزانی پێشمەرگەم لە سەروی گوندی خوادای نزیکەی سێکەسێك گوللەبەرۆژەیان دادکوتا، چوومەلایان و دانیشتم بووەپستەپست بەیەکتریان دەوت ئەوە پێشمەرگەیە بەپەلە خۆم لێ ون کردن، چەندرۆژێك لەناوگولەبەرۆژان مامەوە کێشەیکی گەورەم توش بووبوو نەدەویرام بۆساتێکیش بنوم ئەوەی پارتی زانی نەکردبێت نازانی بەتەنیا چەند ناخۆشە ماڵەبرادەرێکم لەسەروچاوە بوو خێزانی دەبووە خزمم کەونەپێشمەرگەش بوو پیاوێکی بەرێز و مەرد بوو رۆژکیان بیم کردەوە واباشە من بچمەناوسەروچاوە یەکمانگ بوو من هیچ دەنگوباسی کوردستان وناوچەکەم نازانی رۆژکیان

حەمەدمین سالْح عوسمان شێخ وەسانیم دیتەوە وتم برۆ سەروچاوە و مالْی عەبدوڵڵا ببینەوە وەرە وە دووم حەمەدمین چوو هاتەوە وتم ئەومالّەی بۆی چووبووی دیتەوە وتی بەلْیّ وتم دەوەرە پەنجامەتر لەپێشم برۆ لە ناوسەروچاوەش ئاماژەی مالْەکەم بۆ بکە کێشەی گەورەم کە ڕوو بەڕووم بووەوە خزمانی مەلەکی بوون.

*** *** ***

چیرۆکێك هەیە لەسەر خزمانی مەلەکی، خەریك بوو سوێند بخۆم بلْێم ئەو چیرۆکە وایە چیرۆکەکە بەوشێوەیە: کابرایەك هەبووە چویتەهەرشوێنێك کەسێکی مەلەکی لێبووە کابرا توورەدەبێت دەلْێت واباشە من بچمە ناو( کۆمی ) کەریّ نەجاتم دەبێت لەدەست خزمانی مەلەکی کلکیّ کەریّ برینی دەکات بچێتەژووریّ وەستا(........) ، دەلْێت : ئەوەکیە تاریکێم لیّ ئەکات؟ با چەکوچەکی لەدەستی خۆنەدەم لاکۆ لەویّ مارت خەرانەبی تاریکیّ مەکە جیّ برابوون ئێرە نەبی؟ باوەڕبکەن تاگەیشتمە ئەومالّە (٩) جار لەدەست خزمانی مەلەکان ڕام دەکرد و دواتر داتمەوە سەر ڕێگا،حەزم نەدەکرد کەسی ناسراو ببینم، ئەو خزمانەی مەلەکان هەموویان پیاوی باش بوون، پێم باش نەبوو من بینن حەمەدەمین ئاماژەی بۆ مالْێکی کرد خانوویەکی گەورە و حەوشێکی گەورە دەرگاکراوە بوو چومە ژوورەوە شایی وهەرایەك بوو ئەوسەری دیارنەبێت، وەك کەسێکی ئاسایی چومەژوورەوە و چەکوتەقەمەنیم لە شوێنێکی گونجاو داناو چومەلای پیاو ماقولان دوای سەلام دانیشتم بە خێریان هێنام وایانزانی داوەت کرایە چاکوچۆنیشم لە برادەرەکەی خۆنەکرد ئەویش پیاوێکی ئاقل بوو بەخێرهاتنی نەکردم پێم خۆش بوو وردە وردە مالْەکە چۆل بوو کاتێك خۆی وخێزانی ومندالْی وردیان مابنەوە بۆیەکتر هەستاین و چاکوچۆنیکی گەرمان کرد ئەوجا لەدار بۆم گێراو تاکو بەرد ناوبراو چەکدار بوو شەوچەکمان لەجێیەکی باش شاردەوە ماوەی یەك هفتەلێم پالْ دایەوە شەوێکیان عەبدوڵڵا دەچوە مالْی مستەشارێك وتم منیش دێم وتی بەباشی نازانم وتم خەم مەخۆ نام ناسن بەڕێکەوتین لەدیواخان بەژوورکەوتین دوای سەلام وچاك و چۆنی لیی دانیشتین .. جاشەکان زۆر دل خۆشبوون باسی نەمانی پێشمەرگە بوو یەکێك لەجاشەکان دەی وت پێشمەرگە نا پاشمەرگە ئەوقسانەزۆرکران پیرە جاشێك وتی خزمینە ئەنگۆ فکرو لەشتەکی دی کردیتەوە وتیان لەچ گوتی ئەنگۆ درخۆشن بەنەمانی پێشمەرگە ئەوەش و لەبیربی ئەونانەی ئەمە دەی خۆین لەسایەی پێشمەرگە بوو پاشی چەند مانگی دیکە حکوومەت هەمانن بەرەلا دەکات ئەگەر پێشمەرگە پیدانەبنەوە ، هەموویان گوتیان خۆ ئەوەش ویە

ئەوقسانە زۆر کران زۆرم خەفەتم لێ خواردن دواتر ئێمە هەستاین .. لەژوورەوە دانیشەو بیربکەوەو بنو بخۆ دیارەتەلەفزیۆنیش هەبوو لەپڕ ئاگادارییەك بلاّو کرایەوە کە سەدام عەفو دەدات دواتر عەفوی دا من وام پێ باش بوو فرسەتێك لەو عەفوە ببینم، بەبێ تەسلیم بوونەوە چوومە هەولێر لەوێ بۆ شەقلاّوە منداڵەکانم دیتەوە دواتر چومە باتاس لای ئامۆزایەکم زۆرهەوڵمدا لە ڕێگای چەند چەکدارێك لە سنوور نزیکم بکەنەوە سەری نەگرت، دو ڕۆژ مۆڵەتی عەفو مابوو چومەشەقلاّوە خۆم تەسلیم کردەوە منیان بردە لای مودیر ئەمن کۆمەڵێك پرسیاریان لێکردم لەگەڵ کێ بووی؟ ناوی شەهیدەکانم دەدا کێ نانیان دەدابەئێوە وتم بە زۆر خەڵکی لەترسان نانیان دەدا پێمان، ئەوەی نانی نەدابا لێمان دەدا وتی کێ چەکو تەقەمەنی دەدابەئێوە وتم مستەشارەکان وتی ناویان وتم نازانم ئەوەندە دەزانم چەك و تەقەمەنی لە شوێنێك دادەندرا پێیان دەوتین بڕۆن لەفلان شوێنە بیانهێنەوە دەمان وت: کێ بۆی ناردوین؟ دەیانوت مستەشارەکان، من کە باسی مستەشارەکانم دەکرد دەمویست وایان لێ بکەم لە لای ڕژێم تاوانبار بن، فایلەکەم ماوە دواقسە مودیر ئەمن وتی ڕاست دەکەی مستەشارەکان بوون، بەلاّم قسەکانی ترت درۆنە دواتر وتی باوکت چ کارەیە وتم باوکم نەماوە! وتی بۆنەماوە؟ وتم ئێوان کیمیایی لێداین باوکم شەهید بوو. بەتوندی وتی هەستە سەی کوڕی سەی، وەرن بیبەن لەسەر ئەو قسەیە هەندێك شەقم خوارد جەنابی تێگەیی من لەگەڵ عێراقمە ماوەی نیوسعات بەندیان کردم دواتر مەفرەزەخاسەیەك شۆفرلێتێکیان پێ بوو منیان سوارکرد بۆ ماڵی خەزوورم لەسابیاوە کە گەڕەکێکە لەشەقلاّوە، لەکۆڕانی ماڵی ناسران منیان وەپێش خۆدا و چوینەماڵی خەزوورم یەکسەر خێزانم و سێ کچ و کوڕێکم لەگەڵ دایکم زۆربەبێ ئەدەبانە سواری شۆفللێتیان کردین لانکیشمان پێ بوو، بەناو شەقلاّوەڕۆیشتین بۆ هەولێر.. چەند کەسێك لەمەفرەزەخاسەکان لەلای دەرگای پشتەوە لولەی چەکەکانیان ڕوولە ئێمەبوو لەشەقلاّوە تاکو هەولێر هەرکەسێ ئێمەی دەدی لە شوێنی خۆی رادەوەستا سەیری ئێمەی دەکرد لەچاویانم دەخوێندەوەخەفەتیان بۆ دەخواردین، من وای تێگەیشتم ئەنفال دەکرێم بەماڵ و منداڵەوە گەیشتینە هەولێر لەبەردەرگای محافەزە ڕایان گرتین، مەفرەزەخاسەکان لوولەی چەکیان ڕوولەمن و منداڵەکان بوو، منداڵەکانم تۆقی بوون هەر سەیری منیان دەکرد، لەچاوەکانیان دیار بوو بە تەمایی من بوون شتێك بکەم تاماوم لەژیان ئەو ڕۆژەم لەبیر ناچێت منالەکان لەمنیان شتێك دەخواست منیش هیچ شتێکم لەدەست نەدەهات! حەزم دەکرد بمرم خۆم و منالەکانم وابەڕەزیلی نەبینم من وئەوانیش چاوەڕێی مردن

بووین کارێکیشم لەدەست نا دات بۆماوەی سعات ونیوێك ڕایان گرتین ناوەناوە خەڵکی لەدوورەوە بەرام بەرمان رادەوەستان زۆریان پەرۆشی ئێمە بوو ناشۆێران کارێك بکەن ناوەناوە مەفرەزخاسەکان خەڵکیان دەردەکرد لە دیارمان بانگی کەسێکم کرد وتم بارچە پاکەتیکم بۆ بینە کەهێنای وتم بەچەندی بوو بەرکەوە وتی وازبینە پارەی چ خەڵکی بەوەتێك چوو بوو چوار کەس لولەی چەککانیان رو لەمن و منداڵەکانم بوو دواتر ئێمەیان بردە ژێر زەمینی بینای محافەزەی هەولێر لەژوورێك هەشت کەس دانشت بوون یەکیان تەر جومان بوو پێی وتم عەرەبی دەزانی وتم نەخێر هەرچەندە عەرەبیەکەم باش بوو، باس ناکریت ئەوەندەپرسیاریان لێکردم لەکاتێك چەندین پرسیاریان لێدەکردم پێکەوە منیش بێدەنگ بووم وتیان بۆ بێدەنگی وتم ناتوانم هەمووپرسیارەکان پێکەوەوەڵام بدەمەوە دەبووایە زۆر وردیش بم لەوەڵام دانەوە شتێك نەڵێم لە زەرەری گەلەکەم بێت ئەوەی وەبیرم بێت دیارە لیژنەی ئەمنی بوون (ئەمن و ئیستیخبارات و منەزەمەو مەنزومەو مکافحەو پۆلیس ) بوون ئەوەی سەیر بوو لەوکاتە دایکم بوو، چیرۆکێکی فۆلکلۆری کوردی هەیە، دەڵێت هەبوو نەبوو دایك و کچێك هەبوون کچەکە زۆر نەخۆش بوو هاتە حالەتی مردن دایکەکە دەستی بە دووعایان کرد، دەی وت خوایە ئەگەر ئیزرائیل هات با روحی من بکێشێت واز لە کچەکەم بێنێت لەپڕ مانگایەك هاتە ژووری تەنەکەیەکی لەسەری عاسێ بووبوو دایك وای زانی ئیزرائیلە وتی: بە قوربانت بم من هەونیمە ئەوکچە نەخۆشە، دیارە دایکم پێش ئەنفال لەناوچەکەمان نەمابوو باوکم ماڵی بۆ لەگوندی میاوە دانابوو بەسوتفە لەگەڵ ئێمە دەست گیرکرا کەئەمنەکان پرسیاریان لێ دەکرد خۆی لە ئێمە جودادەکردەوە ئەی وت من لە گەڵ ئەوان نەبووم ! لەوکات ئەوچیرۆکەم هاتەوەبیر، باوەڕبکەن هەرچی وتراوە بێ شك قەوماوە، ئاگاو لەچیرۆك و پەندی کوردی بێت هیچ شتێك لەخۆوە نەوتراوە دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر لەرابردوی من دواقسەیان لەگەڵ من وتیان دەزانین ئەوەی گوتت هەمووی درۆ بوو خوات بەقوربانی سەید رەئیس کات ئێوەی حەفوکردوە دوو بارە سواری هەمان سەیارەیان کردین من ترسی ئەوەم هەبوو ئەنفالمان کەن دواتر سەیارەکە بەرەو مەسیف چو لە دائیرەی ئەمن دایان بەزاندین کۆمەڵێك ئەمن هاتن داوایان لەئێمە کرد دابەزین مەفرەزە خاسەکان نوسراوێکیان دایەدەست ئەمن ئەوان ڕۆیشتن ئەمنەکانی مەسیف بێ ڕێز نەبوون دواترئێمەیان بردە شەقڵاوە لەشەقڵاوە ئێمەیان بردە باسرمە لەوی من و خێزانم ودایکم بەڵێن نامەیەکیان بۆ پڕکردینەوە بەسێ خال ئیعدام بووین وەپێشیان ئیمزاکردین

ئەوكات بۆیان خوێندینەوە دایانە دەستمان، یەکەم ئەوشوینەی بۆتان دیاری دەکرێت کەنیشتەجێبن تێیدا دوەم بەبێ پرسی ئێمەلەماڵ دەرناچن سێیەم هەرکاتێك داوامان لێ کردن بۆ هەرزانیارییەك دەبێت ڕاست و دروست پێمان بڵێن بەپێچەوانەوە ئیعدامن، مامەخەمەیەك هەبووە خەمی لەسەر هەمووشتێك هەڵ گرتوە ڕۆژێك کەسێك دێت دەڵێت مامە خەمە ماڵی ئاغە کەرەکیان بووە نەکلکی پێوەیە نەگوێ مامە خەمە دەڵێت پەککو دەوەرە خەمان هەرمەگرە کەسێك لە تەنیشتی بوو وتی جاباشە مامە خەمە کەرکلکی پێوەنیە گوێی پێوەنیە بۆ خەمی پێ هەردەگری مامەخەمە وتی باوکم ئەتو نازانن بیر لەبەیانی ناکەنەوە؟ زستان دادێ ئاغە پێم دەڵێت برۆ ئاشی لە ڕێگادا کەر دەکەوێتە قوڕێ چۆن دەری بێنم نە کلکی پێوەبێ و نەگوێ ئەدی ئەوە خەم نیە، منیش وام لێهات دەوەرە خەمەخۆ پارچە زەویەکیان بۆ دیاری کردم دەیروانییە سەر جادەی گشتی زەویە کە کێڵ درابوو، وتیان ئەوە شوێنتە دیارەهیچمان پێنەبوو جگە لەو جلی لەبەرمان بوو، چومەماڵێك ئاو بۆ منداڵەکان بێنم ئەوانیش خەڵکی جۆلەمێرگی خەلیفان بوون گوندەکانی ئەوانیشیان ڕوخاندبوو، ئەوانیش ناچارکرابوون بێنەباسرمە ژنێکم دی وتم خوشکە ئاوم بدێ بۆ منداڵەکانم وتی ئاوت نادەمێ ئەنگۆ مارێمەش و خەراکرد، پیەژن دەستی پێ کرد من وازم لەئاو هێناو ڕۆیشتم لە شوێنێکی تر پەیدام کرد دوای ماوەیەك خێزانم دەستی بەگریان کرد منالەکانیش گریان خەریك بوو منیش بگریم زۆری پێنەچو ئامۆزایەکم پەیدا بوو سڵاوی کرد و دوای چاك و چۆنی وتی حاڵتان چۆنە وتم دەمانبینی شتێك نەبوو لەسەری دانیشێ ئاوێك نەبوو بیدەینێ دیاربوو ئەو دەستی بەگریان کردو ڕۆی دواتر هاتەوە ماڵێکی تەواوی بۆ هێنابووین دواترخزمەکانم خانووێکیان بۆ دروست کردم شوێنکەی من گەڕەکێك بوو پێیان دەوت گەڕەکی( عائیدون) لە ئۆردوگای باسرمە دەزگای ئەمن بە مودیر ناحیەی وتبوو عائیدونەکان بۆیان نیە سوودمەند بن لە عەقاری و ئاوی خواردنەوە، بەسایەق تانکەرەکانیشیان وتبوو ئاویان مەدەنێ، مودیر ناحیە کورد بوو پیاوێکی باشیش بوو بڕیاری دا بوو ئاومان بدەنێ بەدزی ئەوان، نازانم ژمارەی ماڵەکان چەند بوو زۆر گەورە بوو لە دەیان عشیرەتی تێدا بوو وەك خۆشناو هەروتی و سوورچی و بارەکی و باڵەکایەتی و خەڵکی روستێ و دواتر کاکەی و واتە برایانی شەبەك هەرکی و خەیلانی و گەڕەك گەڕەك دابەش بووبوون خانووەکانی عائیدونان دیار بوون هەژارانەبوون زۆربەی خەڵکی بووە سەرباز دواتر بەدوو ژمارە وەبیرم نەماوە تەسریع بوون ئەوهەموو خەڵکە بێ کارو کاسبی دەسوڕایەوە ڕژیم کەوتە

بەبەعسی کردنی هەموو خەلکی، کۆمەڵێك خەلکی نەفس نزم بەریوونە گیانی خەلکی دیارە هەمووشیان ناسراون شایانی ئەوەنین ناویشیان بێنین ڕۆژکیان چومەوە ماڵەوە تەماشام کرد ڕسمێکی سەدام لەسەردەرگای ماڵەوەمان دراوە چومەژورەوە پکێکی تریش لەژورەوە هەلواسرابوو وتم خانم ئەورسمانە چنە وتی کچی فلان هات وتی دەبێت هەمووتان ڕسم بێنن ببنە بەعسی و ئەو دورسمەی سەرۆك سەدام لەماڵەوە بدەن منیش ڕسمەکانم لیٚ کردەوەو یەك دوو جوێنی تەڕیشم بەباوکی ئەو کچەدا من و چەند برادەرێك زۆرلەخۆمان دەترساین من و خزمێکم پشتی خانووەکانمان پێکەوەبوو واتە هەریەکەو ڕومان لەلایەك بوو ناوی سالح بوو پێم وت من نیازم هەیە لەناو ژورەکەی خۆم کونێك دروست بکەم بۆ ژوورەکەی تۆ ڕازیت بۆ هەردووکمان باشە وتی: بەڵێ ڕازیم دەستم پیٚ کرد و لەژێرەوە کونەکەم دروست کرد لە حەوشەش یەکێکی ترم دروست کرد بۆ ماوەی شەش مانگ بەیانیان زو دەچومە دەم ڕووبار خۆم لەشوێنێك حەشار دەدا، بەماسی گرتن خەریك دەبووم ئێوارەش ماسیەکانم بۆ منداڵان سۆر دەکردەوە باوەڕیکەن لە پایزو سیٚ مانگی زستان مانگێکی بەهار من ساقۆم نەبوو بەوسەرمایە لەو دوو رووبارانە منالەکانیشم کە نەمردن لە برسان ماڵی خەزوورم یارمەتیان دەداین، یان دۆست و خزم ناوەناوەژیانێکی نەمرەو نەژین بوو، کونێکی ترمان هەبوو چەند برادەرێك دروستیان کردبوو، من پێم وایە شەیتانیش بەو فێڵەی نەزانیوە، ژووری مانگا بوو دوومەتر بەرینی و و مەترونیوێك قوڵی دووبارەداریان هاوشتبووێ و خۆرەبانێکی ئەستور کرابوو کونێکیان تێدا هێشتبووەوە بە قەد تریانێك کەتریانەکایان پڕ کا دەکرد هەزار سوێند دەخوارد کە ئەوشوێنە حەشارگانیە ئەوەی دڵی منی خۆش کردبوو جیانی شەهید جەلال هیانی و فایزە شەقلاوەی بووین، ترسمان لەیەك نەبوو دەردی دڵی خۆمان لەلای یەکتر هەڵ دەڕشت، فایزە ژنیکی ئازاو دڵسۆز وچاونەترس بوو.

*** *** ***

ورده ورده کات دەڕۆی دواتر هەموومان کراینە سەرباز بەهەزاران ڕەوانەی دیوانیە کراین ماوەیەك لەویٚ خەریکی مەشق بووین دواتر دابەشیان کردین بۆناو هۆڕەکان من وەزعم زۆر خراپ بوو کەمۆڵە دەدراین من کەمتر داتمەوە لەبەر نەبوونی پارەی هاتنەوەم نەبوو لەبەختی من دوو برادەرم لیٚ پەیدا بوون ئەوانیش هەمزەبەرەکەی وخەلیل ماڵیان ئاوابێت زۆر هاو کاریان کردم لەخواردن وپارەوە خەلکی تریش هاوکاریان دەکردم کەناویانم لەبیر نەماوە خزمانی

سلێمانی لە هەرشوێنێك بن ڕاناوەستن بەزمێك دروست دەكەن كۆمەڵێك خزمانی سلێمانیمان لەگەڵ بوون كوڕی باش بوون ناویانم لەبیر نەماوە بەرنامەیەكیان دانا كە بەئامیرفەوج بڵێن سەربازەكوردەكان زۆربەیان عەرەبی نازانن دەرسی فێربوونی سایەقەتیمان هەبوو پێویستەخۆمان دەرسیان بە كوردی بۆ شەرح بكەین ئامیر فەوج ڕازی بوو كوڕێكی سلێمانی بووە مامۆستامان هەموو ڕۆژێ دوای كەمێك دەرس یەك یەكەی هەڵ دەستاندین ئەوەی هەڵدەستا دەبووایە پارچەیەكی سەیارە لەدەست بگری ئەوكات مەسەلەیەك نوكتەیەك بگێڕینەوە، دەبووە پێكەنین مولازمی ئێمە بیست مەتریك دوور پیاسەی دەكرد ناوە ناوە داتە لامان دەی وت پێم ناڵێن ئێوە بەچ پێدەكەنن؟ شەرح كردنی سەیارە پێكەنینی تێدانیە من پێنازانم كەرستەیەكی سەیارە هەبێت، پێكەنیناوی بێت! وەزۆرجارلەگەڵ ئێمەپێكەنینی دەگرت بەبێ ئەوەی بزانی بەچی پێدەكەنی، ئەو سەربازە عەرەبانەی لەگەڵمان بوون هەموویان لەسەربازی دا ڕزا بوون، توڕەبوونیان پێوەدیار بوو وەسەربازگەكانی عیراق شلۆق بووبوون، گەندەڵی و گوێ پێنەدان وردە وردە لەزۆربوون دابوون نزیكەی سەت سەیارەمان هەبوو، دە سەیارە سولفی پێوە نەمابوو، سەربازەكان كەرستەی سەیارەكانیان بە ئەنقەست تێك دەدا، ڕقی خۆیان لە سەیارەكان دەر دەكرد .

لەو بێسەروبەریە ئەفسەرە گەورەكان بووبوونە مشەخۆر لە سەربازگەكان ئەو سەربازگەی ئێمەی لێی بووین زیاتر لە سەد سەیارەی لەجۆری ئیڤای لێ بوو دە سەیارە بەتەواوی كاری ناكرد، دواتر منیان لەگەڵ چەند كەسێك ڕەوانەی مەفرەزەیەكی بەرەنگاربوونەوەی چەكی كیمیایی كرد، ئەوەیە مار كەیفی بەسیر نەدات سیریش دەچوو نزیك كونی مار شین دەبوو، چەكی كیمیا ماڵی منی وێران كردووە منیش بووبمە مەفرەزەی كیمیا، كورد دەڵێت: هەموو هەورازێك سەرەژێرێكی لەپێشە، شەوێكیان لەپڕ وەك گوڵێكی تینو كەخەریكە وشك دەبێت ئێوارە بێ و ئاوێكی سازگاری لە تێری دەبنكەی چۆن گەش دەبێتەوە، یان وەك ڕەمەزانان كەسی ڕۆژووگر جگەرە خۆر بە هاوینان ئێوارە مەلا بانگ بدات چۆن دڵخۆش دەبێت كە ئاو دەخواتەوە، جگەرەیەك پێ دەكات منیش گەش بوومەوە، كە هەواڵی گرتنی كوێتم گوێ لێ بوو پێشبینیم كرد ئەو هەویرە ئاوی زۆر دەوێ، سەری ڕژێم دەخوات ماوەیەك دوای ئەو هەواڵە ئێمەیان بردە سەر سنووری كوێت، من لەگەڵ سێ سەربازی شیعە لە خێمەیەك دا بووین كوڕی زۆر باش بوون، ئەوان شەڕەكەیان پێ ناخۆش بوو، منیش شەڕەكەم زۆرپێ خۆش بوو، لە من نەدەترسان ئەوان دەردی دڵی خۆیان بە جوێندان خۆش دەكرد منیش دەموت شەرمە ئێمە پێویستەبەر گری لەخاك

ونیشتیمان بکەین لەسەرۆك بکەین شەڕ دەکەین تا دوا دڵۆپی خوێنمان ناوەناوە دەیان وت وەڵا درۆ دەکەی سەدامت بکەوێتەدەست خوێنی دەخۆی شەوان زۆربەی سەرە سعاتەکان دەچومەپشت خێمەی ئامیر پیاسەم دەکرد ئامیرمان پیاوێکی هێمن و لەسەر خۆ بوو بەرانبەر بەو شەڕە کزی پێوەدیار بوولە سەحرایەکی بێدەنگ بووین مێزو کورسیەکی داناب و ڕادیۆی دەکردەوە ڕادیوی لەندەن هەستی بەمن دەکرد کە گوێ لە دەنگ و باس دەگرم ڕۆژێك بانگی کردم وتی وەرە منیش چوم وتی وەرە پێشم منیش تەحیەکم بۆ کرد وتی چۆن دەو وەزعە دەگەی منیش وتم گەورەم عەرەبیم باش نییە وتی قەیناکە کورد لەمێژە لە شەڕدایە ئێوە دەزانن چۆن پێشبینی ئەو شەڕە دەکەی مەترسێ قسە بکە من شیعەم، وتم گەورەم ئەو شەڕە بەباش نابینم وتی: بۆ ؟ وتم لەشکری عێراق ماندوو بووە، لەڕابردوو لەگەڵ جەیشی ئەمەریکا بەراورد ناکرێت، وتی نەتیجەی ئەوشەڕە چۆن دەبینی؟ وتم لێی تێناگەم! وتی ڕاستیت نەگوت؟ گوتم لێی نازانم ! وتی با من ماوەیەکە تاقیبی تۆدەکەم شەوان گوێ لە دەنگوباس دەگری لە دەوروبەری من شتێك لە سیاسەت دەزانی، وتم: گەورەم لێی نازانم! وتی من کورد باش دەناسم، زیرەکن، شتێکتان هەیە خۆتان لە گێلی دەدەن دەڵێن نازانم! وتم گەورەم بە یارمەتیت وتی برۆ. ڕۆژکیان چەند ئەفسەرێك لەروتبەی جۆراو جۆر ژمارەیەکی زۆریان لە ئێمە برەو کوێت برد، چوینە ناوچەیك نزیك بوو لەدوورگەیکی لاکێشە ئەمریان پێکردین کە کەلوپەلی باشیان بۆ کۆبکەینەوە لەشێوەی سبریت و زۆرشتی ترنازانم ڕێژەیکی زۆر خانوو هەموویان چۆلبوون بەشوێنی نشتەجێی کۆمپانیا دەچو یان شوێنی گەشت وگوزار بوو ئەو سەربازانە وەك دڕندە بەربوونە شکاندنی جام ودەرگاودزینی کەلوپەل هەرشتێکی بە نرخ باوبچووك با سەربازەکان بۆخۆیان دەدزی شتی تریان بۆ ئەفسەرەکان کۆ دەکردەوە من لەپەنایەك خۆم حەشاردا و مراکێك کەوتە بەرچاوم وتم ئەوەیان دەبەم بۆنان خواردن لەپڕ ئەفسەرێك هەستی بە خۆشاردنەوەی من کرد و بۆ لام هات زلەیەکی زۆر خراپی لێ دام وتی: حەیوان بۆشت کۆناکەیەوە، چەندان ئیڤا پڕکران لە پاتار، گەڕاینەوە، ئێوارەیەکیان کە گوێم لەدەنگوباس گرت بەگوێرەی دەنگوباس هاتمە ئەو باوەڕەی سەدام لە کویت ناکشێتەوە، وەختی ئەوە هاتووە بۆی دەرچم بەیانی کاتژمێر نزیکی دەی پێش نیوەڕۆ چومەوە لای برادەران وتم دەڕۆم وتیان بۆ کوێ؟ وتم ماڵەوە. وتم ئەوکەرستانەش بۆ ئێوە وتیان ئەوچەك و تەقەمەنیە لەسەرت دەبێتەمار، تەسلیمی ناکەیەوە؟ وتم بۆخۆتان بیبەن کەوتمە ڕێ گەیشتمە سەر جادەی کوێت عیراق، کۆمەڵێك ئیڤا پڕ لەسەرباز و کەلوپەلی دزراوی کوێتیەکان لەلای بۆڕیەکی تەقیوی ئاو

وەستابوون، منیش چومە لایان کە ڕۆیشتن لەگەڵیان سوار بووم، تاکو بەسرا لەوێ بەرەو بەغدا و لەوێیێ بەرەو هەولێر و باسرمە خۆت بگرە، هاتم دوای ماوەیەك بە پارتیزانی چومە حاجیاوە لە ماڵی محەمەد گۆڕەشێری بووم، چونکە بیتوێن هێمن تر بوو. ڕۆژێکیان بەخۆم و محەمەد گۆڕشێری دانیشتبووین برادەرێك بەناوی وەلی مەلەکی هات وتی گۆرشێری وەرەلەگەڵم بۆم تەماشای دوو ئیسراحەت بکە بزانەچۆنن گۆڕەشێری گوتی فەقێ بابچین، وتم: من نایم، وازی نەهێنا و لەگەڵی چووم. بە سوتفە لە ڕێگا لەلایەن پۆلیس گیراین، ئێمەیان بردە سجن کە چوینە سجن کەسێکی تر گیرابوو، من لەوگیرانە زۆر دەترسام چونکە ئەمری ئیعدامم هەبوو، بە خۆشم ئەمرەکەم ئیمزاکرد بوو، کابرای سجن هەستی پێ کردم، وتی برادەر بۆ هێندە عادزی وتم برادەر لەسجن ناخۆشتر هەیە. وتی خەم مەخۆ ئێستا بەرت دەدەن. لەبەیانی خەڵکی دەگرن بەپارە بەریان دەدەن وتم: بەچەند؟ وتی بەدە دینار. وتم محەمەد پارەم بدێ، وتم ئەی جەنابت وتی من لەسەر قەزیەی سەیارە گیراوم، دوای ماوەیەك منیان بانگ کرد چومە ژورێك یەکسەر پۆلیسیك وتی برادەر ئەتو هاوکاری ئێمە بکە و ئێمەش یارمەتیت دەدەین، دەدینارم دانێ بردمیانە ژووری سجن ئەوجارەیان محەمەد گۆڕەشێری برد، دواتر منیان بردە لای ئەفسەرێك ئەو پۆلیسەی منی بردەلای ئەفسەرەکە و وتی گەورەم ئەوبرادەرە هەویەی هەڵنەگرتوە ئەفسەرەکە وتی: جارێکی تر هەویە هەڵنەگری لەسجن دەت رزێنم. وتم بە سەرچاو دواترگۆڕەشێریش ئازادکرا، شەو وتم گۆڕەشێری بابڕۆین بەوشەوە ڕۆیشتین نان و پێخۆرمان برد چوینە شێخ وەسانان پڕبوو لەجاش و فیار، خەریکی مێش برینەوەبوون دیاربوو لەلایەن ماڵی ئەنوەربەگی بالیسان ئاگادارکرابوونەوە، کەشێخ وەسانان بەجێ بێڵن، ئەگەرچۆڵ نەکەن هێز دەنێرین تەسلیمی حکومەتیان دەکەین. بەیانی زوو ئەوان ڕۆیشتن دیارە برادەرانی پارتیزان لەوێ بوون وەك شەهید محەمەد بیکەیسی و شەهید حاجی و شەهید غازی بێراوەیی... وتم گۆڕەشێری ئێمە چی بکەین ؟ وتی دەچینە ئەو سەرەوە، ئەگەرجاش هاتن شەڕێکی دوو پاکەتیان لەگەڵ دەکەین، دواتر جاشەکان نەهاتن ئێمە چەکمان پێ بوو، چوینە مەلەکان، مەلەکان سەیر بوو وات دەزانی وڵاتێکی ترە، لە هەموو کوردستان مەلەکان ئارام و ترسی تێدانەبوو، نە شەڕ نەجاسووس، نەپیاوکوژ، لەهەمان کات پێشمەرگەو جاش و فیار مفرەزەخاسە و وهاوڵاتی و ناوەناوەش پڕەبوو لە سەرباز سەیرەکە لەوەبوو کەس ئەو ئارامیەی دروست نەکرد بوو، خۆرسك بوو. بۆماوەی زیاتر لە شەش مانگ مامەوە لەمەلەکان، گۆڕەشێری ئیدارەی دەدام ناوەناو هێزێکی سەربازی دات و فیار و

پێشمەرگە ڕێگایان چۆڵ دەكرد سەربازەكان بەبێ دەنگی دەڕۆیشتن ڕۆژێكیان فیارێك خەریكی گوێز لێ كردنەوە بوو تاقمی كلاشین كۆفی لەخوارەوە بەجێدێڵێت چەكەكەشی دەباتەسەر دار گوێزەكە لەوكاتە كۆمەڵێك سەرباز بەلای دارگوێزەكە دا دەڕۆن تاقمەكە دەبینن دەستی دەدەنێ و دەڕۆن فیارەكەش لە سەر دار گوێز ڕاوەستاوە دوای ڕۆیشتنیان پێدەكەنی ڕۆژێكیان ئێوارە بوو دوای نان خواردن زیاتر لە دەكەس دەبووین چامان دەخواردەوە شەهید ( میرئەحمەد ) پرسیارێكی لێكردم وتی هاوڕێ فەقێ بە بۆچونی تۆ ئەو وەزعە بەكوێ دەگات؟ وتم باشە وەلامت دەدەمەوە بەمەرجێك برادەرینە گوێ بگرن( میر ئەحمەد پرسیارێكی زۆر گەورەی لێكردم ئێوەهەمووتان گۆڕەشێرینە قسەیەكی زۆر مژدەبەخشتان دەدەمێ بە مەرجێك هەموویان وتیان باش مەرجەكەت جێ بەجێ دەكەین، وتم سەروچاوەی كانی( نێرتم) بدەنێ بەیەك دەنگ وتیان ئەوەبووە موڵكی تۆ، وتم برادەرینە ڕژێم دەڕوخێ زۆری نەماوە ئەو مەلەكانە دەبینم ئازاد بووە و جادەی بۆ هاتوە و كارەبای بۆ هاتوە، ئاوەدان بووتەوە. خەڵكی لە شارەكان دێنەسەیران بۆ مەلەكان منیش بەخۆم و مناڵەكان دێم بۆ سەروچاوی نێرێ، كە لەسەر بڕیاری ئێوە بووە موڵكی من سوێندیش دەخۆم ئەوەی باسم كرد ئێوە دەی بینن دیارە لەو ساڵانە لەگەڵ برادەران چەندان جار بۆ سەیران چووینە لەخوا بەزیاد بێت مەلەكانیش بووتە خۆشترین ناوچەی گەشتوگوزار لە هەرێمی كوردستان، دیارە برادەرەكانم تائێستا بێدەنگن لە موڵكی من. لەوانەیە لە دادگا شكایەت بكەم لەوانەیە وانەكەم! چونكە زۆر خزمەتیان كردوم گەردەنیان ئازابێ...

*** *** ***

ورده ورده گەیشتینە مانگی دەی (١٩٩٠ ) گەڕاینەوە حاجیاوە و لە وێش بەرە و باسرمە بە پارتیزانی كە گەیشتمەوە باسرمە جوڵەجوڵی پیاوانی ڕژێم وەك جاران نەمابوون، هەیبەتیان لەدەست دابوو، وەك سەگ بۆ نانێك هەموو شتێكیان دەكرد برسی ببوون خەڵكی چاوەڕێ بوون ئەمڕۆ نا بەیانی ئەمەریكا دەست بكات بە پەلامار ورده ورده خەڵكی لەسەربازی فیاری دەكرد، منیش خۆم دەپاراست دیارە وەك جاران ناترسام ناوەناوە دەچومە قەڵاتی خانزادی سۆران شوێنی تریش بۆ كات بەسەربردن بە شەویش لەگەڵ برادەرانی عائیدون بە زمانی بەعسیەكان لەم ماڵێك كۆ دەبووینەوە دیارە هەموومان كەونەپێشمەرگەبووین وەك دوپشك كلكمان قیت

کردبووەوە  چاوەڕێ بووین پێوەبدەین وردەوردە  بووە مانگی دوو دواترپێشمەرگە پەیدابوون بەردەوام ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستانمان دەکردەوە لەبیرم نییە ڕۆژی بانگەوازەکە بانگەوازی کرد، کە خۆمان ڕێك بخەین  دیارە خۆشترین ڕۆژ بوو  من تێی گەیشتم  بەیانییەکەی خۆم گەیاندە ئامۆزایەکم بە ناوی سەلاح  چەکداری ڕژێم بوو وتم بە زوترین کات چەك و تەقەمەنیم بۆ پەیدا بکە بۆ ئێوارە چەك و تەقەمەنییەکی باشی بۆ هێنام  من بەشە و  چەکم هەڵدەگرت  بە ڕۆژ خەریکی سەردانی برادەران بووم، ڕۆژێکیان کاك یاسین بالیسانی دەرکەوت کەپێشتر کەسایەتییەکی ناو شۆڕش بوو لە بالیسان ئەندامی کۆمەڵەش بوو خانەدانێکی  گەورەش بوو  بۆ هێزی پێشمەرگە، هاتە ماڵمان  دیار بوو باران هیلاکی کردبوو  وتی  هاوڕێ فەقێ  کارم پێتە چوینەپەنایەك وتی (تەحسین کاوانی ) سلاو ڕێزی هەبوو ئەونامەیەی بۆ ناردوی وتم کاك تحەسەن لەکێیە وتی لەدەوروبەری کاوانیانە  نامەکەم شکاند لەنامەکە داوای لێ کردبووم کەڕۆژ ئەوڕۆیە هیممەت بکەم برادەرانی پێشمەرگە کۆبکەمەوە  خۆمان ڕێك  بخەین  بۆ کاتی دیاری کراو وتم سوپاسی دەکەم ئێمە خۆمان ڕێك خستوە و ئامادەین چاوەڕێی فەرمانین دیارە ئەونامەیە زۆر کاری گەر بوو بۆ من و برادەران  نامەکەم پیشانی برادەران دا و  ئەوانیش گەرم تر بوون  دیارە ئێمە  چەند گروپ  بووین لەباسرمە بۆنموونە ئێمە زیاتر لە بیست کەس دەبووین بەچەك و بێ چەك،کاك جماڵ  هەروتی و سەباح  توتمەرەیی ئەوانیش ژمارەیان  زۆر بوو  چەکی باشیان هەبوو دەبێت بۆ مێژوو  دووقسەی خێر بکەین  باسی کاك جماڵ  هات  کاك جەماڵ پیاوێکی تێکۆشەر وبەئەدەب وبەڕێز و مەرد وئازایە کەسێکی دیارە لەناوچەکەمان  سباح توتمەرەی  یەکێك بوو لەپێشمەرگە هەرە ئازاکانی  ناوچەکە لەگەڵ برادەران چوە ئێران  دواتر  هاتەوە باسرمە سەباح پێش ئەوەی بچێت بۆ ئێران  بی کەیسی و  تارییجی و کۆمەڵێك پارچە چەکی ترو تەقەمەنیکی زۆر دەشارێتەوە  کەهاتەوە ئەو پارەی هەی بوو ژنی پێهێنا دواتر زۆر فەقیر بوو توانای  پاکەت کڕینی نەبوو،  لەفەی دەکێشا لە کاتێکدا بیکەیسی  چلوپێنج  هەزار دیناری سویسری ئەوکاتی دەکرد مەردانە پاراستی، دواتر ئەوچەکانە وای کرد بتوانین بەسەر پیاوانی ڕژێم سەرکەوین  لە پێشمەرگەدێرینەکان کۆمەڵەی جیاجیا هەبوون وەك خزمانی باڵەکایەتی و دزەی هیران و وەهەندێك لە چەکدارەکان دەوری بەرچاو  خزمانی هەروتی بوون،ٔوەك گوندەکانی باویان و خرواتان خزمانی وەرتێش دەوریان هەبوو، لە ڕزگارکردنی باسرمە وەجەماوەریش هاندەرێکی باشمان بوون تەنها شەو بەجێیان هێشتین دیارە جەلال سۆرکانیش لە جوڵەدابوو بۆ ڕێکخستنی

کەونەپێشمەرگەو دۆستو خەڵکی تێکۆشەر دیارە من لەسەرخەتی ئەوان نەبووم وردەوردە باسرمە وای لێهات بەشەوان ئێمە بەچەکەوە سەردانی خزم و دۆست بکەین ناوەناوە تەقەشمان دەکرد بۆترساندنیان سی خورەکان ونەفس نزمەکان ترسیان لێنیشت خۆیان لەئێمەنزیك دەکردەوە دیارە هەمووسان دەناسین ئەوانیش ئێمەیان دەناسی وای لێهات بەچەکەوە بەرۆژ لەماڵەوە دەبووین ڕادیۆمان کردبووەوە دیار بوو حەوزی بیتوێن پاك کرایەوەو ئێمە چاوەڕێی برادەران بووین ئەمرمان پێبکەن لەپڕ هەواڵی ئازاد کردنی شەقڵاوە بلاو کرایەوە سەیر بوو باوەڕمان نەکرد بەو هەواڵە ئێمەلەماڵەکان هاتینەدەرێ بەچەکەوە لەپر چەند ئیڤایەك پڕ لەسەرباز لەلای شەقلاوە گەڕانەوە برادەران ڕێیان لێ گرت بوون لەسابیراوە ژمارەیەك لەئێمە پێشمان لێگرتن چەند ئەفسەریك هاتنە خوارێ لەئیڤاکان وتیان کێ عەرەبی دەزانێ وتم من یەکێك لەئەفسەرەکان وتی بەرێزینە ئێمەش ئاگادارین لە ڕووداوەکان مەمان کوژن ئێمە دەگەڕێینەوە سپیلك ئەگەر ئێوە سەرکەوتەو بوون پێم وایە ئێمە چیمان پێ دەکرێت خۆ تەسلیم کردن نەبێت وتم باشە ناتان کوژین ئێوەش تەقە نەکەن لەکەس هەندێك تەقەمەنیمان بدەنێ ڕازی بوون و ڕۆیشتن منیش بەگروپەکەی خۆم گوت برادەرینە ڕاوەستن لەمەرکەز مەدەن من دەچمەشەقڵاوە بزانم برادەران چی دەڵێن لەگەڵ سالح تەهارەش شێخ وەسانی چوین بۆ شەقڵاوە لە سابیراوە چەند ئیڤایەك تێك شکا بوون لەپڕ کاك ڕێبینم دیت لەگەڵ کۆمەڵێك پێشمەرگە پارچە لایلۆنیکی کردبووە سەرپۆش لەبەر باران دووای چاکوچۆنی چەندساڵ لێك دابران وتم ئێمەچی بکەین لە باسرمە؟ وتی برۆ بەبرادەران بڵێ بەیانی لێیان بدەن ئەگەر پێو نەگیرائێمە دێین هاوکاریتان دەکەین منیش چومەوە باسرمە کەگەیشتمەوە باسرمە شەڕ گەرم بوو چوینەلایان کەئێمەگەیشتینێ شەهیدیشیان دا بوو شەڕەکە گەرم بوو گولە ئارپیجیمان تەواو بوون ئارپیجی هاوڕێ کاك جەماڵ هەروتی بووە بەرچاویش بوو لەئیدارەدانی شەڕەکە، منیان نارد بۆ لای کەسێك کەلەخزمانی هەروتی بوو مستەشار بوو داوام لێکرد چەند گولەیەکی ئارپیجیمان بداتێ وتی من هاوکاری و ناکەم لێش و نادەم وتم کەهاوکاریمان ناکەی لە لێدانی تۆش ناترسێین، گەڕامەوە گردێکی لێ بوو لە مەرکەز پەنابوو، بە هەزاران خەڵك وەك فیلم لەدیارمان بوون، کە شەو داهات خەڵکی خۆی بزکرد، ئەوانەی مانەوە نزیکەی شەست کەسێك دەبووین، شوێنیان قایم بوو، بەرگری باشیان دەکرد، پیاوی ئازابوون، ئێمەش چەکی وامان لەبەردەست نەبوو کە کاریگەری لەسەر بینایەکە هەبێت شەو بەرنامەیەکمان دانا لەچوار لاوە تەقە بکەین تابەیانی

بۆ ئەوەی ڕانەکەن چونکە شەهیدمان هەبوو ئەمان ویست هەندێکی موستەحەق بکوژین تۆڵەی سوکایەتی ئەوچەند ساڵەش بکەینەوە کەپێیان کردووین ئەوشەوەتابەیانی دەورەمان بەرنەدان شەوەکەشی زۆرسارد بوو بەفرو باران بوو بەیانی وردەوردە تەقەدەستی پێکردەوە دوبارە خەڵکی هاتەوە دەورمان لەناوخەڵکی چەکداریش هەبوون هاوکاریان دەکردین لەپڕ ئاڵایەکی سپیان بەرز کردەوە وەك دەریا خەڵکی کەوتەدوامان پێم وایەخەڵکی وەپێش ئێمەش کەوتن ئیتر لەژووری بووە ڕۆژی حەشر کوشتنیان زۆر زەحمەت بوو لەبەر خەڵکی نزیکەی هەشت کەسی موستەحەق من و ئێوەخۆش ئەوانی تر بوونەدیل گیران من زۆر هەوڵم دا کەبەڵگەنامەکان بپارێزم خزمەکانی خۆم هاوکاریان کردم نەجات و فاخیر دواتر مامۆستایەك بەناوی ( فەتحولا) بەئەصل خەڵکی گەرەوانی رواندز بوو هاوکارییەکی زۆری کردم دیار بوو پیاوێکی زۆر دڵ سۆز بوو من خەریکی مستەمسەك وبەڵگە بووم وتیان قوتابخانە تاڵان کرا کە چومەدەرەوە بەدەیان کەس خەریکی دزینی رەحلە و سەبوڕە و مێز و کورسی و دۆلابی قوتابخانەبوون، دەیاندزی منیش چاوم کوێر بوون یەك سریە کلاشینکۆفم بەناو وەنان خەڵکی دز رای کرد یەکێکیان گوللەیەکی بەرکەوت بوو، کە چوومەسەری لەناو ئەوهەموو دزە گوللە بەر خوارزایەکی خۆم کەوت بوو دیارە خوارزایەکەشم دز بوو، لەو وەختەلەترسی خوشکم بردمە نەخۆشخانە و تیمار یان کرد، چەند ڕۆژێك خزمێکم بیست و پێنج دیناری وەك هاوکاری دابوو پێم منیش لەترسی خوشکم دامەخوارزای بریندارم کردبوو لەسەر دزی ...لە هەمان ڕۆژ لە ئازادی شارۆچکەی باسرمە بیم لەوەکردەوە بچم خێزانی خۆم بینم تەرمی پیاوانی ڕژێم ببینێت کە کوتونەتە ژێر پێی گەل بۆئەوەی دڵخۆش بێت و کەمێك برینەکانی سارێژبن، بەپەلە چومەوە ماڵەوەو داوام لێ کرد لەگەڵم بێت تەرمی ئەو مرۆڤ کوژانە بەچاوی خۆی ببینێت هەرچەندە نەخۆش بوو، بەڵام لەگەڵم هات و پیاوانی رژێمی دیتن کە بەدەستی گەلەوە سەزای تاوانەکەیان وەرگرتبوو خێزانم تەرمی ئەو تاوانبارانەی دیتن و زۆر دڵخۆش بوو. دواتر لەگەڵ کۆمەڵێك برادەرو خزم چوین بۆ هەولێر دیارە هەولێر رزگار کرابوولەلایەن هێزی پێشمەرگەوبەهیمەتی کاك کۆسرەت وهێزی پێشمەرگەو بەهاوکاری جەماوەر ئێمە چوینە ڕەشکێن خەڵکێکی زۆر ڕویان لەوێ کرد بوو بۆ بردنی چەك و کەل و پەل من هەوڵم دا مەقەری ئیستیخبارات ببینمەوە، خۆشبەختانە دیتمەوە بۆ ماوەی دووسعات بەڵگەنامەی چاکم جیاکردەوە، بە بڕی یەك تۆیتە دواتر خزمەکانم دیتەوە و چوین هەندێك چەکیشمان پەیداکرد داوام لەخزمەکانم کرد لەگەڵم بێن ئەوانیش هاتن وتم وەرن

هاوكاريم بكەن لەگەڵم هاتن وتم دەی ئەو فایلانەم بۆ باركەن یەكێك لە ئامۆزاكانم ناوی عەبدوڵلایە وتی: پێم ناڵێی تۆ شێتی كەری؟ بەس پێم بڵێ ئەو قاقەزانە چی لێ دەكەی؟ خەریكە منداڵت لەبرسان دەمرن وازبینە! بابچین ئازوقە بار بكەین. وتم ئێوە منتان خۆش دەوی لەبەر خاتری من ئەو فایلانەم بۆ باركەن ماڵیان ئاوابێت بۆیان بار كردم ئەو ئامۆزایەم نەیپرپیەوە دەیان جار لەرێگا دەی وت بەس بزانم ئەو وەرەقانەت بۆ چنە منیش دەموت ئیشم پێنە كە من دەموت ئیشم پێنە دەی گوت دەوره كابرا ئەتو كوهەندە كەر دەبی فەردە ئاردێك وفەردە برنجێكت هێنابا لۆ مندارۆكان باشتر نەبوو! من پێم وایە رەشكێن خەزینە بوو نەمان توانی بیپارێزین لەدەستمان چوو! كورد دەڵێت: لەدوای چوان مەرێ ئاخ،كۆراوان مەكەبەباغ. كچەتیوان مەكەبە شەو چراغ، من لەو پەندانە مەبەستم ئەوەی چو چو نایەتەوە ئەوانی تر كەنوسراون دیارە بۆ مەبەستی تر بەكاردێن ئەو توێتە بەڵگەنامە زۆرشتی تیدابوو ناكریت هەموویان باس بكرێن دووئموونەی بچووك دێنمەوە كەسێكی لای خۆمان ئەگەر ناوی بێنم خەڵكیكی زۆر دەی ناسن راپوورتێكی داوەتە رژێم لەسەر كەسێك كەسەكەش دەناسم ئەوكەسە لەسێدارە دراوە راپۆرتەكەی كارتێكی زەرد بەدەم بووز خراپووە سەر راپۆرتە كە لە كارتەكە نووسراوە ناوی هەواڵدەر فلانی كوری فلانی كوری فلانی دانیشت وی فلان شوێن پاداشی پێنج دینار بووە، دەوەرە بیر لەو نەفس نزمانە بكەوە بۆ پێنج دینار كەسێك بكوژێ ژنێك بیوەژن، كات چەندان منداڵ هەتیو كات چەندان خوشك و كچی ناسك و نازدار رەش پۆش كات لەپێناوی پێنج دینار كێشەكەش لەوەیە نوێژی دەكرد رۆژی دەگرت قورئانی پیرۆزی ختم كردبوو، دەیان كتابی ئایینی خوێند بوو، ئموونەی دووەم: كەسێك لە هەولێر لەراپۆرتەكەی ناونیشانی خۆی داوە بەژمارەی دەرگاو تەلەفۆنیش بەهەمان شێوە ناونیشانی سێ كەسی دابوو، من وتۆ ئەو ناونیشانەمان لەدەس بایە، پێویستی ناكرد لەخۆتەوە دەچویە هەر چوار ماڵ، بەبێ ئەوەی لەكەس بپرسی كابرای هەواڵدەر، دەڵێت : لە رۆژی ئەوەندە مانگی ئەوەند ساڵی ئەوەندە كاتی ئەوەندە لە یادی لەدایك بوونی سەرۆكی فەرماندە سەدام حسێن خوابی پاریزی مەسیەمان دەكرد سێ كەس بەو ناو نیشانەی خوارەوە بێشەرمانە لە جیاتی بڵێن نعم نعم یاسەدام دەیان وت ئعل ئعل یاسەدام ؟ بەڵێ ئەوە راپۆرتەكەی پیاوە نەفس نزمەكەبوو بەرانبەر گەلی خۆی ئەوسێكەسە حكوم درابوون بە بیست ساڵ دیارە كەوتم ناكرێت باسی یەك توێتە فایل بكرێت فایلەكانم پاراستن وەك ئیلتیزامی پێشمەرگایەتی چومە كۆمیتەی شەقلاوە مەلانجیم و كاك تەها كانی بەردی و

عەبدوڵڵا کانی بەردی ئەوسێ کەسە بۆ مێژوو تەواوی بەڵگەنامەکانی شەقڵاوەیان پاراست ئەکرێت خەڵکی تریش بەشداری کردبێ من نەی زانم،لەوکاتە مامۆستا جەلال شەقڵاوەیش دیارو بەرچاو بوو، بەڵگەنامەکانی شەقڵاوە ئەمنەکان ویستیان بەشێکی دەرباز بکەن خۆشبەختانە لە گوندی کاوانیان سەری خۆشیان لەسەر دانا برادەرانی پێشمەرگە هەموویان کوشتن بەڵگەنامەکان بەهیمەتی دڵسۆزان گەیشتنەوە شوێنی خۆیان دیارە نازانم کێ ئەوکارەی کرد دەستی خۆش بێت بەڵگەنامەکانی شەقڵاوە زۆرگرینگ بوون تەواوی بەڵگەنامەکانی ساڵەکانی زوو واتە پێش بەعسیەکان و بەعسیەکانی تیدا پاریزراو بوون دواتر ژمارەیەك پێشمەرگە و هێرۆخان و شەهید تەحسین کاوانی و شەهید مەلانجم چوین بۆ پێشوازی مام جەلال وردە وردە گەیشتینە زاخۆ چەندان ڕۆژ ئێمە لە زاخۆ دەچوینە سەر رووباری فیش خاپوور و دەگەڕاینەوە خەڵکی زاخۆ مەردن زۆر خزمەتیان کردین زۆربەخشندەبوون دیارە توشی شتێك بووبوون ئەوەشیان لە دل سۆزی بوو برادەرێکمان لەگەڵ دا بوو ناوی شێخ عوسمان بوو لەبنەماڵەی شێخانی بالیسانە دیارە ئەوبنەماڵەیە شوێن و پێگەی خۆیان هەیە لە مێژووی گەلەکەمان دا پیاوی ناودایان زۆربووە لەڕا بردو پێم وایە لەداهاتوش هەر وادەبن کاکەشیخ ڕدێنێکی گەورەی ڕەشی هەبوو کراو وجەمەدانییەکی بەستبوو خۆشناوانەو نیمچە کۆپیانەی بەست بوو کەدەگەڕاینەوە لەسەر رووباری فیشخاپوور بە هەزاران خەڵکی زاخۆ پەلاماریان دەداین ڕێگایان لێ دەگرتین وایان دەزانی شێخ عوسمان بەڕێز مام جەلال چەندی هاوارمان دەکرد کاکە وەڵا بیلا مام نییە کەس باوەڕی پێ ناکردین دەبوایە ئێمە لەدەستیان ڕابکەین چوباینە شوێنێکی نیمچەچۆل ئەوبەزمە چەند ڕۆژێك بەردەوام بوو بەهیلاك چو بووین لەدەست مام جەلال و شێخ عوسمان بێزار بووبووین ڕۆژکیان ئێمە لەسەر رووباری فیشخاپوور دانیشت بووین پێنج شەش چەك دارو کۆمەڵێك خەڵکی بێچەك و مام جەلال پەیدابوون بەبەلەمێکی بچووك پەڕینەوە رووبارەکەش وەك کورد دەڵێت: خوینی دەکردئاوەکە زۆری زیاد کردبوو جێگای مەترسی بوو لەکاتی دابەزین مام جەلال کەوتە ئاوەکە دوای چاکوچۆنی وتی خۆشناوینە لێرەش بەهانام هاتن ئەوچەکدارانەی لەگەڵ مام جەلال بوون پێشمەرگەی پەکەکەبوون بۆ پاراستنی مام جەلال هاتبوون یان ئەوان مامیان هێنایەوە ئەوانەی لەبیرم ماوە کەلەگەڵ مام بوون شەهید شاخەوان عەباس بوو چەند ڕۆژنامەنوسیشی لەگەڵ بوون پێم وایە کەسێکی ئەمریکیشی لەگەڵ بوو لەگەڵ چەند کەسێکی تر من نەم دەناسین یان ناوم لەبیرچوینە سواری سەیارە بووینەوە و بەڕێکەوتین

بەرەو زاخۆ باوەڕ ناکەم لەناو زاخۆ کەس لەماڵی خۆی مابێت هەموویان لەپێش وازی مام جەلال بوون دەردێکیان تاکو گەیشتینە بینایەك بە هەزار دەرد توانیمان مام بگەیەنینە ناو بینایەکە مام جەلال لەسەربیناکە دەرکەوت نەیان هێشت قسەبکات لەبەر چەپڕەو هەراوهۆریالەخۆشیان مام چوە ژورەوە دواتر هاتەوە قسەی بۆ کردن بۆمێژوو مام یەك وشەی بەناوی یەکێتی نەکرد وەك کورد قسەی بۆ کردن خەڵکی وازی لێ نەهێنایین مام نەی دەوێرابێتەخوارێ ئەوجارەیان وتی خوشك وبرایان بڕۆنەوە ماڵەوە خەڵکی وتیان ئێمەیان وەختی خۆی بەزۆر دێنایە ئێرە ئەمڕۆ بەئارەزوی خۆمان هاتوین ناڕۆین دواتر چوینە ماڵی سەرۆك هۆزێك چەندان کەسایەتی ناوچەکەسەردانی مامیان کرد دواتر چوینە دەهۆك مام کۆبوونەویەکی گەورەی جەماوەری ئەنجام دا مام لەسەر بینایەك لەگەڵ کۆمەڵێك سەرۆك هۆزوپیاوە ناودارەکانی دەڤەرەکە دەستیان لەناو دەستی یەکترنابوو بەرزیان کردبووەوە جەماوەریش لە خوارەوە خۆشحاڵ بوو دوای یەك دووڕۆژ وتیان ڕژێم بەرەو دەهۆك بەڕێوەیە ڕژێم دەستی بە تۆپباران کرد لەلای فایدە جەماوەر کەوتە ڕاکردن کوبوونەوەیەك کرا کەپێش لەڕژێم بگرن شەهید تحسین کاوانی کۆمەڵێك پێشمەرگەی کە جێگای باوەڕی خۆی بوون منیش یەکێك بووم لەوان جیا ی کردەوە وتی برادەرینە من لەگەڵ برادەران دەچم پێش لەڕژێم دەگرین وەزع باشنیە ئاگاو لەمام جەلال بێ ئەوان ڕۆیشتن دیارە خەڵکی تریش بەرەو بەرگری چوو تۆپباران دەستی پێکردتۆپ بارانەکەزۆرسەخت بوو ئێمە ئەوەندە لەڕژێم نائترساین ئەوەندەی لەخەڵکی ناو دەهۆك دەترساین دیارە شارێکی وەك دەهۆك بێ پیاوخراپ نابێت وەك هەرشارێکی کوردستان جێمان پێ جێ نەبوو مەترسیەکەی ئێمەمام جەلال بوو ناوەناوە داوامان لەمام دەکرد کەناوچەکە بەجێ بێڵین مام دەی وت باشە دەتوانم بڵێم بەدوسعات نیوەی دەهۆك چۆڵ بوو برادەرانی خۆمان بەخەبەردێن هێزەکانی دەوروبەریان ڕایان کردوە ڕژێم شوێنی ئەوانی گرت وە ئەوانیش پاشەکشە دەکەن گەڕانەوەڵلای خۆمان داوالەمام کرا کەڵکی ئەوەی نەماوە ئێمەچیتر لێرە بین مام جەلال ڕازی کرا بڕۆین زۆربەزەحمەت دەرچوین لەبەر لێشاوی خەڵکی چوینە ئامێدی ماڵی علی شەعبان دیاربوو کەونە دۆستی مام جەلال بوو ماوەیەك لەوێ ماینەوە ئەگەر هەڵەنەبم ئەوسەردانەی مام جەلال سەری علی شەعبانی خوارد دواتر شەهید کرا چەند ڕۆژێك لە ئامێدی ماینەوە لەوماوەیە مام جەلال زۆرماندی بوو بۆ یەکەم جار من ئەوئامێرەم دی کەراستەو خۆ دەنگ ورەنگ بگوازێتەوە ڕۆژانە چەندان ڕۆژنامەنوسی بیانی و تورکی سەردانی مامیان دەکرد دواتر بەرەو بارزان چوین دیارە لەو

بەزموڕەزمە برادەرانی پەکەکەمان هەرلەگەڵ بوون زۆرگورج و گۆڵ بوون زۆر چاودێری مام جەلال یان دەکرد لەبارزان لامان داو گوندێکی وێران بوو مام جەلال باسی یادگاریەکانی کرد لە بارزان لەسالآتی زوو هەندێك وێنەمان گرت لە بارزان بە ڕێکەوتین بۆ بێخمە و لەوێ بۆ شەقلاوە ئەرکی ئێمەتەواو بوو برادەرانی پەکەکەش بۆ خۆدزینەوە لەچاوی ڕۆژنامەنوسانی دەرەوە دەچنە کەندەکانی لای گوندی ماوەران بۆ خۆ حەشاردان لەو کاتیش دەنگوباسی موجاهیدین هەبوو کەبەشداری شەڕیان کردوە لەگەڵ ڕژیم بۆ داگیرکردنەوەی کوردستان هاولآتیەك ئاگاداری برادەران دەکەنەوە کە مجاهیدین لەفلان شوێن خۆیان حەشارداوە هێزێکی ئێمە دەچێتە سەریان تەقەیان لێ دەکەن زۆر بەرکەوە کەوا دەزانن موجاهیدی ئێرانین پێم وایە دوویان شەهید بوون و بریندارێش هەبوون دواتر زاندرا ئەوانە برادەرانی پەکەکەن ئەوانەی مام جەلالیان لە سوریا هێناوەتەوە، کارەسات بوو ڕوویدا هەموومان بەو کارەساتە دڵ تەزێنە غەمبار بووین بە تایبەتی ئەوانەی ئەو ماوەیە پێکەوە بووین ئێستا گۆڕەکانیان لە گۆڕستانی زەیتونە لە شەقلاوە مام جەلال زۆر توڕە بوو پێم وایە ماوەیەك لە کاك تەحسین کاوانی توڕە بوو هەرچەندە تەحسین کاوانی تاوانی نەبوو لەو ڕووداوە کە ڕوی دا من چومەوە بۆ کۆمیتەی شەقلاوە بەلێنشاو خەلکی ڕای دەکرد سەردانێکی مالەوەم کرد ڕۆژی دوای لۆریەکی گەورە ی سەر داپۆشراو لەپێش مالی ئێمەوەستا دووسێ پێشمەرگە دابەزین وتیان ئێرە مالی فەقێ یە وتم بەلێ وتیان کاکە مامۆستا سەیفەدین سلاوی هەبوو وتی ئەو فایل و بەلگەنامانەی لەلاتن تەسلیمان بکە ی بۆ ئەوەی نەفەوتێن ڕەوانەی شوێنێکی پارێزراو دەکرێن منیش هەموو یانم دانە دەست و باریان کرد وەبەلگەنامەو فایلەکانی شەقلاوەشیان هێنابوو بەلگەنامەکان لەزۆر شوێنی تریش کۆکرابوونەوە دواتر زانیم ڕەوانەی تاران کران لەوێش ڕەوانەی ئەمەریکا کران و پێم وایە لیژنەیەکی گەورە ڕێك خراوە چەند سالێکە بۆ تاو توێ کردنی فایلە کان ئەو مەحکەمەی کە دامەزرا بۆ بەدواداچون تاوانی سەرانی ڕژێمی عێراق پێم وایە سوودێکی زۆریان لەو فایل و بەلگەنامانە کرد کەبەهیمەتی دل سۆزانی گەلەکەمان پاراسترا بوو پێم وایە کاك نۆشیروان مستەفا دەوری بەر چاوی هەبوو لە کۆکردنەوەی بەلگەنامەکان بەهیمەتی برادەران .

هەر هەمان ڕۆژ چومەوە شەقلاوە لەپڕ زیاتر لەسێ سەد کەس لە پیاوانی ڕژێم بەپلەی جیا جیا کەزۆربەیان ئەمن بوون لەگەڵ کۆمەلێك خەلکی خراپ و نەفس نزم کەتاوانی بەرچاویان کر دبوو هێنانی ئەوان بۆ شەقلاوە مەترسی لە هەولێر هە بوو کە داگیر بکرێتەوە هەر واش

دەرچو ئێمە بەخۆمـان نانمان نەبوو وەك پێویست وەك دەڵێن ماڵ لەخۆوە نە بوو میوانیشی هاتن ناندانی زیاتر لەسێ سەد کەس بە قسە خۆشە شەقلاوە نیمچە چۆڵ بووبوو فرنیەکان لە کار کەوت بوون، کەس نانی بۆ نەدەکردین من بە هەر شێوەیەك بوو قەناعەتم بەماڵە خزمێکی خۆ هێنا نان مان بۆ بکەن ئەوانیش نانی ئێمە بخۆن پارەش یان بدەینێ من حەزم دەکرد کەسێك بکوژم کەلەناو بەندیەکان دا بوو لەناو چەکەمان کەسێکمان هە بوو ناوی (بەرخۆکە ) بەرخۆکە پیاوێکی قسەخۆش و پیاوێکی خۆشەویست بوو لە ناو جەماوەر خەڵکی گوندی شیە بوو لە دۆڵی بالیسان بگرە تاکو شاری هەولێر زۆربەی خەڵکی دەی ناسی و خۆشیان دەویا یەك لەشتە سەیرەکانی ئەو پیاوە هەموو بەیانیان خۆی دەشوت لەرووبارو کانیەکان کێشەی نەبوو زستانە بەفرە سەهۆل بەندانە ئەوەکێشەی بەرخۆکە نەبوو خۆی دەشوت ئەوکات نوێژی بەیانی دەکرد نوێژەکانی تریش هەروا پیاوێك بوو پارەی لەکەس وەرنەدەگرت ئەگەر کاری بۆنەکردبا کاریشی بۆ هەر کەسێك کردبا زۆربەتوانا بوو کاری پێنج کرێکاری زیاتر دەکرد شێوەی زۆر لە مرۆڤی کۆن دەچو زۆربەی شێتەکانی دەناسی تەزبێحێکی سۆری گەورەی پێ بوو کە داوایان لێ کردبا ناوی شێتەکانی پێ دەژمارد وەك ( عەیشێ، فاتم، چورچە حەسەنە شێتی بێراوی، قالەشێت، ئایشەشێتێ خەتێ، جیهانە شێت، واتەزیاتر لە پەنجاشێتی دەناسی دەی وتن زۆرو زۆری تری دەوتن واتە شێتی زۆر دەناسین روح وگیانی منداڵی بچووك بوو گەیشتبا هەرماڵێك منداڵیان هەبان لە ئامێزی دەگرتن شەوێکیان لە گوندی (سیساوە) لە مزگەوت دەنوێ پێشمەرگەیەکی پارتی کەناوی سەلاح ناسراوەبە سەلاحە شەلاتی خەڵکی شەقلاوە لە مزگەوت دەی بینێ و شەهیدی دەکات و دواتر سەری دەبرێ سەری بەرخۆکە دەباتە دائیرەی ئەمن دەڵێت: من ئەوپێشمەرگەیەم سەربریە دیارە ئەو تاوانبارە لەژێر دەستمان بوو، بەرنامەم دانا بوو، شەو بی کوژم ئێوارە شەهید مەلا نەجیم بەکارێکی زۆرەوە رەوانەی شوێنێکی کردم بۆ بەیانیەکەی کەهاتمەوە بڕیارێك دەرچو و بوو ئەوەی کوردە ئازاد بکرێت سەلاح کەمەشوورە بەسەلاحە شەلاتی ئازاد کرا بوو، بەرەو موسل ڕای کرد لەدەستم دەر چوو، ئەوانی تر کەدڵسۆز و باوەڕ پێ کراوی ڕژێم بوون مقاوەمەیان کردبوو، خەڵکی زۆریان شەهید کردبوو، ئەوکات تەسلیم بووبوون ژمارەیان زۆر بوو ئەوانیش شەوێکیان لەلای گوندی( سپی گرە) ئێوە خۆش کۆتاییان هات دواتر هەولێر گیرایەوە ڕژێم پێشڕەوی کرد مەسیف گیرا، من داوام لە مەلا نەجم کرد پێویستە مناڵەکانم نەجات بدەم دواتربگەڕێمەوە لەگەڵ خزمانم کەوتینەرێ لە چۆمان دەستی

منالەکانم گرت وردەوردە بەرەو خانیَ پیَم وایە زۆر کەس بیرەوەریەکانی ئەو کۆچەی نووسی تەوە ئەوەی منی شیَت کردبوو لەو کۆچە منالاَنی ساوا بەپیَخواسی لەناو ئەوبەفرو قورِ و سەرمایە لەرزینی منالاَن لەسەرمان منی کوشتبوو یان رِۆیشتنی پەك کەوتەکان بە لەپان واتە وەك تاژەلَ دەرِۆیشتن لەبیَ هیَزی و لەبرسان ناوەناوە لە دەوروبەری رِیَگا خەریکی ناشتنی منالَ و پیر و پەك کەوتەبوون ئەوەی لە هەمووی ناخۆشتر منالَ بوونی خوشکان بوو لەو کاتە سەختە لەبەر رِەحمەتی بەفرو باران و سەرما، دەلَیَن: لە رِۆژی حەشر مرۆڤ نیَرو میَیەتی خۆی لەبیردانیە لەبەر سەختی ئەو رِۆژە لەو کۆچە شەرم نەمابوو لەنیَوان ژن وپیاو، لە دەست بە ئاوگەیاندن لە بەتیەختی ئەوەبوو زۆری خەلَکی توشی رەوانی بووبوون، توش بوون بەرەوانی دوو کیَشەی هەیە یەکیان: کات و وەخت نازانیَت کە هات دیَت. دووەم:رِۆیشتن بیَ هیَزت دەکات. سیَیەم: برسیەتی بیَ هیَزت دەکات چوارم: رەوانی بیَ هیزت دەکات. پیَنجەم: بەفرووباران بیَ هیَزت دەکات. شەشەم: بینینی مەرگی کورِو باوکو کەس و کار کەئەوشتانە توشت دیَت قەدەمت دەشکیَ لە رِوی دەروونیەوە بەهەمان شیَوە بەهەزاران کەسم دیی منالیَکی لەسەر قلیم قازی دانابوو بەقولَیَك منالیَکی لەدوای خۆی رِادەکیَشا خیَزانیشی هەروا .یەکیَك لەکیَشەکانی تر کەزۆرمەترسی داربوو هەبوونی مین بوو ئەوسەرسنووران کەونە شەرگەی هەشت سالەی عیَراق ئیَران بوو پرِ بوو لەمینی جۆراو جۆر وەخەلَکیش شارەزای ناوچەکەنەبوو خەلَکیَکی زۆر شەهید و برندار بوو خەلَکی زۆر بیَ ئومیَد بووبوون مرۆڤ کە بیَ ئومیَد بوو نقوومی تاریکایەتی بوو بەرِوناکایتی مومیَك دلَی خۆش دەبیَت و ئومیَدی پەیدا دەبیتەوە بەپەیدابوونی چەند تەیارەیەکی هیَزەکانی هاوپەیمان دەرکەوتن و خواردنیان بەسەر خەلَکی دا بەردایەوە دیارە بەدەیان تەیارەش نەیان دەتوانی خەلَکی برسی تیَر بکات بەلاَم بەراستی ئەوچەند تەیارە دەیان موژدە بوو لەوکاتە بۆ جەماوەر دلَ خۆشیەیکی گەورەبوو زۆرپیَویستە ئیَمەو نەوەکانمان لەهەر سوچیَکی ئەودنیایە هەر گەلیَك توشی کارەسات بوو بەهەرشیوەیك بیت واتە سیاسی بیَت یان سروشتی ئیَمە دەست پیَشخەربیت لەهاوکاریان بۆ میَژوو دەولَەتی ئیَران هاوکاری کردین دیارە رووداوەکە ئەوەندە کتو پرِ بوو ئەگەر خۆشمان دەولَەت و ئیمکانیاتمان هەبوایە ئیدارە دان و کۆن ترۆلَ کردنی کاریَکی ئەوەندە ئاسان نە بوو براکوردەکانمان لە دەورو بەرمان ئەوەی پیَیان کرا کردیان لە هەموو رِویَکەوەمن منالەکانم بردە ئۆردوگای ( دیَلَژیَ ) هەندیَك لایلۆنم بۆ هەلَدان و بەپەلە گەرِامەوە بۆ شەقلاَوە تاکو من گەرِامەوە شەرِی کورِیَ کرابوو دیارە زۆربەی لایەنەکان

بەشداریان تێدا کرد بوو لەوسالآنەی دوایی لەشەڕی براکوژی لەسالّ یادی شەڕی کۆڕێ هەر حیزبەوخۆی قارەمانی شەڕەکەبووە. واتە هەموویان بەشدار بوون زۆروکەم ئەوەیان مەسەلەیەکی ترە شەقلاّوە بووە دەولّەتێکی گچکە، لە بەڕێوبردنی ئیدارە ئەویش بەرەی کوردستان بوو، بەدەیان هەلّەی گەورەگەورە دەکرا دیارە لەو کات و ساتە زۆر باش بوو، وردە وردە خەلّك گەڕایەوە تەشکیلەی پێشمەرگە دەستی پێ کرد منیش بوومە ڕابەری سیاسی تیپ لە بەتالیۆنی (٦١) هەورێ لە دۆلّی بالیسان مەقەڕمان دانا لە مێرگەسەر وردەوردە ناوچەکان ئاوەدان بوونەوە ئەوەی جێگای دلّ خۆشی بوو، جووتیاران پێداویستیەکانیان وردەوردە پەیداکردەوە، کەوتنە پیداکردنەوەی ئاژالّ بەگشتی دەستیان کردەوە بە کشتو کال و ناوچەکەبووژایەوە ژیان گەڕایەوە یەکێك لە شتە سەیرەکان من لەکاتی ڕژێم بەنەهێنی سەردانی ناوچەکەم کردبوو لە گوندە چۆلەکەیەك ئێمەپێیان دەلّێن: چوێشکە، بەرچاو ناکەوت بە ئاوەدان بوونەوەی گوندەکان پڕ بوونەوە لە کێشکە .

ڕژێم لەدۆلّی خەلەکان مابوو ئەوکاتەی شەهیدجەبار فەرمان فەرمانی ڕاماریني ڕژێمی دا لە پارێزگای سلێمانی ئێمەش جولاین بەرەو خەلەکان بۆلێمان نەدان لەبیم نەماوە ئەوەندە دەزانم پێشمەرگە چوبوونە ناو ڕەبایەکان سەربازەکان دەستەوەستان لەلامان وەستابوون دواتر ڕژێم ملی خۆی شکاندوو ڕۆیشتن بەرەو لای کەرکوك دیارە ڕاپەڕین دوو ڕاپەڕین بوو ڕاپەڕینی دووەم خەلّکی قارەمانی سلێمانی دەوریان هەبوو، هەروەها بە هیمەتی کاك جەبار فەرمان و هێزی پێشمەرگە. ڕاپەڕینی دووەم زۆر کاریگەر بوو ڕژێم بە تەواوەتی لەزۆرشوێنی کوردستان پاشەکشەی کرد کە کاریگەری هەبوو لەسەر بەڕێوبردنی کوردستان لەلایەن خۆمان نەتیجەشی هەبوو.

*** *** ***

لەپایزی (١٩٩١) هاوکاری نێودەولّەتی ڕووی لە خەلّکی گوندان کرد، بە پێدانی خۆراك و جلوبەرگ و پیلاّو دارو جەمەلۆن ئەو هاوکاریە وای کرد دانیشتوانی شارەکانیش بێنەوە گوندەکان هاوکاری وای کرد خەلّکی بووژایەوە کاری گەری لەسەر شارەکانیش هەبوو وردەوردە دەست کرا بە دروست کردنی قوتابخانەو نەخۆش خانەو دروست کردنی مزگەوت و ئەوسالّە بەفرێکی زۆر باری لەهەندێك شوێن دوو مەتر وەزیا تریش، بۆ بەهارەکەی مالّم بردەوە شێخ وەسانان یەکەم کار دەبووایە بیکەم کۆکردنەوەی پاشماوەی هەمووچەکەکان و پاراستنیان، چەن ڕۆژێك خەریکی کۆکردنەوە بووم لەشوێنێك کۆم کردنەوە گەنجانی گوندیش هاوکاریان کردم،

ئەوەی لەلای من ناخۆش بوو خەڵکی گوندی پارچەسارۆخیان لێ دەدزیم دەیان کردە پێمەرە پارچە سارۆخەکانیان دەبردە لای وەستای ئاسنگەر بۆیان بکاتە پێمەرە بۆ کێلانی رەزوباغەکانیان، دیارە کردنی پارچە سارۆخ بەکەرستەی جووتیار بۆ ئاوەدان کردنەوە رەزوباغ جێگای دڵ خۆشیە لەلایکی تر پێم ناخۆش بوو پێم وابوو دەبێت بپارێزرێن بۆ ئەوەی نەوەی نوێ ئەوچەکانەببینێ کە بەوچەکانە رۆژانە گەلەکەی پێ بۆردوومان کراوە، دیارە لەسالآنی زوو کادیران بە ئێمەیان دەوت سەرکەوتن هەر دەبێت ئەوەی لەسەرکەوتن زحمەت تر ئیدارەدانی گەلە لەدوای سەرکەووتن بەتایبەتی شۆڕشی گەل وە بەتایبەتی گەلی ئێمە کەبەدەیان سەدە لەژێر باج و سەرانەو کوشتن و برین ناڵاندویەتی و لەپر بەئازادی دەگات وادەزانێت هەرچی بیکات نابێت کەس دەستی بگرێت ئەبیتە میر محێ و دەبێت پیاوانی سیاسەت مەدار وردەوردە لەگەڵیان برۆن لەو فەترە زەمەنیە زۆر شتی نارەواو بێجێ دەکرێت سەرباری ململانێی حزبایەتی. رۆژێکیان کۆمەڵێك بیانی پەیدا بوون تەرجومانیشیان لەگەڵ بوو، وتیان ئێمە لەلایەن کاك ئەسعەد گۆزەیی شەقلاوەیی نێردراوین بۆ لای تۆ دیار بوو ناویان هێنام ئێمە رێخراوی (کیتس) ین دەمانەوێ خزمەت بە گوندی شێخ وەسانان بکەین بەرنامەشمان ئەو پرۆژانەی خوارەوەیە: دروست ردنی قوتابخانەی شەش پۆلی بنکەی تەندروستی مزگەوت بینای رەوزە بینای بەیتەریە بینای بنکەی زراعە، درووستکردنی خانوو بۆ هەموو گوندی بەشێوەیەکی شارستانی دروستکردنی خانوو کە پەسند بێ بۆ ئاژەڵداری، دابین کردنی پێداویستی جووتیاران من ئەقڵم نەیبڕی وتم لەوانەیە هەر قسە بێت وتیان سەرەتا (٨٠٠٠) هەزار دۆلارمان هێناوە و پەکمان لە پارە ناکەوێت زۆرم رێز گرتن، وردە وردە قسە بووە کردار وەکیلیان هات بەداخەوە من تۆزێك هێرم ناویانم لە بیر چوینە، سەرەتا وتیان دووشت زەروورن ئەوان دەکەین وەك قوتابخانە و مزگەوت، دەست بەکار بوون قسەیەکی جوان هەیە نازانم مولکی کێیە؟ دەڵێت: ( نەزانێك بەردێك بارێتە گۆمێك بەهەزار زانا دەرنایەت) بەڵێ کەرستە هات (بلۆك،چەگر، قوم، رێژەیەکی زۆر چیمەنتۆ )پاسەوان گیرا دەست بەکار بوون، منیش رۆژانە سەردانم دەکردن دڵخۆش دەکردن بەدەست خۆشی لێیان کرێکارەکان خەڵکی گوندی بوون کاریان بۆخۆ دەکرد رۆژانەی باشیان هە بوو،وردە وردە دیوارەکان بەرز بوونەوە خەریتەی مەکتەب لەسەر شێوەی سارۆخ دروست کرابوو کەئاماژەبوو ئەوگوندە بەسارۆخ وێران کراوە دیارە لەهەموو گوندێك لەهەمووشارێك خەڵکی تێك دەر هەیە کە کاری ناپەسند دەکەن، بەداخەوە ئەوکات هەموو خەڵکی خۆی بەمیرمحێ دەزانی خەڵکی وشیار

دەبووایە مل کەچی ناوشیار بوو با دەچوە گوکردنیش چەك و تاقمی پێ بوو دەبووایە چەند رومانەشی پێ بێت ئەگەر بەڕابردوویان دا چوبایەوە ئەوە جاشی روت بوون لەڕابردوو خاین و خۆفرۆش بوون، بەداخەوە چەند کەسێکی نەزان ئەو بەرنامە گەورەی گوندیان وێران کرد، بەڵێ دووکەسی خراپ دەتوانن شارێك ئالۆز کەن بە مەرجێك شار بێ حاکم بێ، دەوەرە ئەو کەرە بێ کلکو گوێیە لە قوڕ دەرپێنە، هەر بەم هۆیەوە منەزمەکە وازی لەکارەکە هێناو رۆیشتن، بە رۆیشتنی ئەوان منەزمە خێرخوازەکان کەمتر ڕوویان لە ئێمە دەکرد.

من کە باسم کرد توشی هەژاری بوو بووم بۆ بەهاری داری بەڕو لە شارۆچکەی حاجیاوە دەفرۆشا خەڵکی لەجیاتی سوتەمەنی بەکاریان دێنا منیش هەوڵمدا کەرێك بکڕم بە سودتفە ڕەوەکەرێك هاتنە گوندی بۆ فرۆشتن لە ماکەر و نێرەکەر پرسیارم کرد وتیان کەری نێر بە پێنج سەت دینارە و ماکەرەکان بەسێسەت دینارن، پارەشم نەبوو، کەسێك بەناوی جەلال رەحمان جیرانم بوو، چومەلای و وتم مام جەلال ئەگەر پارەتان هەیە سێسەت دینارم بەقەرز بدێ کەرێك دەکڕم ماڵی ئاوا پارەی دامێ و ماکەرێکم کڕی، دواتر دبووایە پێداوستی تر بکڕم وەك کورتان و قایش و سەرپاروو گوریس و کندر و قەڕاسە و داس و بیور، دەست بەکاربووم رۆژانە چەندان بارەدارم دینان، بە قسە ئاسانە وردە وردە قەرزم دانەوە و هەندێك پێداوستی سەرەتاییم بۆ منداڵەکان پەیداکرد زۆر هیلاك بووبووم، بەڵام بێ ئومێد نەبووم رۆژانە دەموت: رۆژێك دێت حیزبەکەم بە دووام دادەنێرێت، رۆژێك ئاگاداریان کردمەوە کە من بووبمە ئەفسەری هەواڵگری لە فەوجی یەك، لیوای سی و دوو چووم مویاشەرەم کرد، بە پلەی (نقیب )..وام بە باشزانی من کە ببمە ئەفسەری هەواڵگری کەرم بۆ چییە؟ کەرم فرۆشت، بەشێك لەو پارەیەشم دایە هاوڕێیێکی لە خۆم بەدبەختر، دەست بەکاربووم دروست بوونی فەوجەکەمان تەشکیلەکەی فیتی بەفیتی بوو، لە ئامیر فەوجەوە تاکو سەرباز سەرەتا زۆر دڵمان خۆش بووبە بەهیوای دروستبوونی هێزێکی سەربازی دوور لە میلیشیای حیزبی، سەرەتا بڕیاردرا کە حیزبایەتی لەناو فەوج قەدەغەیە دواتر وردەوردە دەستی بێ کرد ،ململانێ و کێشەدروست بوو، لەلایەکی تر ئامیر فەوج و جێگرەکەی زۆر تەبا بوون بۆ خواردنی نەسریە، گەندەڵی دەستی پێ کرد و سلەکانیان بەشتی وەهمی پڕ دەکردەوە، زۆر هەوڵماندا ڕێ لەو گەندەڵییە بگرین سوودی نەبوو( دزوماخۆ)یك بوون! لەناو هەموو ئامیر

فەوجەکان تەنها (تانجۆ بارزانی) پیاوێکی دڵسۆز وپاك و ئیداری بوو تەنانەت ئەفسەرەکانی تانجۆش دز بوون نموونەی دزینی سەرکە غەسالەی بێ خێمەیان فرۆشت.

بزوتنەوەی ئیسلامی ڕۆژ بەڕۆژ لەگەشەدا بوو میلیشیای تایبەتی هە بوو ئێران هاوکاری زۆری دەکرد، پارتیش ئەو کارەی پێ خراپ نەبوو چونکە لەسنووری دەستەلاتی یەکێتی بوو بۆیەی شارو شارۆچکەی سنووری یەکێتی پر بووبوو لە بزوتنەوەسەرکردایەتیان لەبێتواتەبوو، هێزکی گەورەشیان لە دیانان و هەڵەبجە هەبوو زۆرنەما بوو، حەوزی بێتوێن دەستی بەسەر دابگرن، ناوەناوە کێشە دروست دەبوو، لەنێوان ئێمەو ئەوان لە بازگەکان ناوەستان زۆرلووت بەرز و لەخۆبایی بوون، ئەتوانم نموونەیەکی بچووك بێنمەوە هەرلەهاتنەدەرەوەیان، واتە لەوکاتەی دروستبوون لەسەر بیرکردنەوەیان، حاجی رەحمان شیخ وەسانی بەرپرسێکی سەربازیان بوو لەمانگی ٧/ ١٩٨٧ شاری بەجێ هێشت و بووەپێشمەرگەی بزوتنەوە ماڵی هێنایە شێخ وەسانان، هاتە لای من وتی فەقێ وتم بەڵێ وتی دەست بەکارین چل کەپرو سابات دروست بکەن، چل مەلا بەرێوەیە نموونەی مەلاجەلال لە لای ئێمە بەمەلا جەلالی قادیانەمەشوورە، منیش بەهێمنی وتم مام حاجی بابۆ تۆ دروست کەین، خوا کەریمە بۆ سی ونۆی دی! کەپروساباتمان بۆ دروست کرد و دواتر چوینەسەرکانی ریغێ و مام حاجی رەحمان وتی: جاخزمینە ئێمە هەر لێرە دەست بەغەزادەکەین لەو کۆمەڵەو مۆمەڵاتە لەناو دەبەین، واتە لەگەڵ کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان، یەکێتی نیشتمانی کوردستان، بەڵێ ئەوە بیرکردنەوەی کادیرەکانیان بوو مێژووش شاهیدە کۆمەڵە چ دەورێکی هەبووە لە بەگژداچونەوەی ڕژێمی خوێنرێژی سەدام، بەرچاوترین کێشە لەگەرمیان ڕوویدا، چەند کەسێکیان کوژرا، بۆ درۆستکردنی شەڕو ئاژاوە تەرمەکانیان هێنایەوە شاری ڕانیە ئەوەبوو ئاژاوەکە گەورەکرا مەسوولی کۆمیتەی ڕانیە بە بێتاوانی لە لایەن بزوتنەوە شەهیدکرا، بە شەهیدکردنی مەسوول کۆمیتە کێشەکە ئاڵۆز بوو، دەوڵەتی ئێران لەپشت ئەو ڕووداوانە بوو، بۆ ئەوەی هەرێمی کوردستان هەنگاو نەنێت سەرکردایەتی پارتیش وەك بێلایەن خۆیان پیشان دەدا، پێیان خۆش بوو یەکێتی لاوازبێت، دیارە حکوومەتی ئێران و تورك و عێراقیش لەو ڕووداوانە دوور نەبوون، گەلەکۆمەکییەك هەبوو لەسەر لاواز کردنی یەکێتی ئەوە بوو هێزکی ئێمە پەلاماری دان لە دیانان وبێتواتە زۆری هێزی بزوتنەوە تەجروبەی شەڕیان نەبوو بێتەجروبەیی وای لێ کردن بە زووترین کات پەرشو بڵاو ببنەوە، لەدووای شەڕی بزوتنەوە ... هۆیەکەی نازانم لە هەموو فەوجەکان ڕێژەیەکی زۆر ئەفسەر لادران و روتبەیان کەم

کرایەوە، منیش بوومەوە ئامرفەصیل دواتر کەوتمەوە ماڵەوە، زۆری پێ نەچوو شەهید مەلانەجیم بە دووای داناردم من و هاوڕێ کاوە و شەهید حاجی بووین، مەلانەجم سێی کاری بۆ دیاری کردین من بوومە ئامرسریە لە یەکەم فەوجی سەربازی گوایە بەشێوەیکی سەربازیانە بنیات دەندرێت بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك تا من بەخۆ کەوتم شەڕی پارتی دەستی پێ کرد، ئەو ڕۆژەی شەڕدەستی پێ کرد من لە شارۆچکەی خەلیفان بووم، گەنم کڕی بوو، خەریك بوو لەئاشی بکەم، لەمشاوەشیان ئێستاش دەگەردابێت پارەی ئاشەوانم لەبیر چوو، باش بوو کاك مستەفا تەهارەشی شێخ وەسانان گەیشتە فریام و دەربازی کردم، شەڕدەستی پێ کرد، پارتی پەلاماری شارۆچکەی هەریریدا، پێم خۆش نیە برینەکان بکولینمەوە، ئەوەی لە نزیکەوە ئاگای لێیە دەزانێت پارتی چ کارێکی بە کۆمیتەی هەریر کرد. ئێمەش چەند برادەرێك بۆ لای مەلانەجم چوینە شەقلاوە نامەوێ باسی شەڕی پارتی و یەکێتی بە درێژی بکەم لە ترسی ئەوەی نەتوانم بێلایەنانە باسی بکەم، چونکە منیش بەشداری تەواوی شەڕەکانم کردوە، دیارە دوای ڕووداوەکەی قەڵادزە و کۆمیتەی مەسیف شەڕەکە تەشەنەی کرد، نەمەوێ دوو شت باس بکەم کە یەکێتی نیازی شەڕی نەبووە ئەوەی بەچاوی خۆم دیوە یەکەم من و کۆمەڵێك برادەر لەسەر سەفین بووین وەزعکە لەسالّحی ئێمە بوو لە پڕ شەهید تەحسین کاوانی هات وتی دابەزن و سەنگەرەکان چۆل بکەن وتم کاك تەحسین ناکرێت چۆڵی بکەین پارتی هێزی خۆی دێنێتە ئێرە وتی کێشەنیە بابێن ئەوەقسەی من نیە قسەی مام جەلالە بۆئەوەی شەر بووەستێ ئێمەدابەزین وپارتی شوینەکەی ئێمەی گرت و شەر دەستی پێکرد پارتی لە هەموولایەك پەلاماری داین پارتی پێشڕەوی کرد بەرەو گەروێ میاوە و بەرەو شاخی سۆر ئێمە سەرەتا لە گوندی گەرەوان پێشمان لێ گرتن دواتر بەرە و کرلاوقاسم چووین، پێشمان لێ گرت خەریك بوو شاخی سۆریان پێ چۆڵ کەین بە تەواوی بکەوێتە دەستی ئێمە دووبارە مام جەلال برووسکەیەکی کرد شاخی کلاوقاسم چۆڵ کەن، مەلانەجم وتی: دەی برادەرینە چۆڵی کەن، من وتم مەلا پارتی ماری بۆرەیە بێ مۆڵەتە با بە قسەی مام جەلال نەکەین، بە دزی هێزێك لێرە بەجێ بێڵین وتی ناکرێت بڕیاری مام جەلال بشکێنین، وتم بۆ ناکرێت قسەی مام جەلال بشکێنین؟ وتی کاکەناکرێت! تەواوی کراوقاسمان چۆڵ کرد،پارتی دووڕۆژ دووای چۆلکردنی ئێمە هاتە شوێنی ئێمە لە کراو قاسم، ئەوە بوو دووبارە شەڕەکە دەستی پێ کردەوە، زۆرخەڵکی دڵسۆز بە گەل و وڵات هەولاّیاندا شەڕەکە بووەستێ . بەداخەوە، نەوەستا، ڕۆژێك مەلانەجم لە دوای ناردین کۆمەڵێك برادەربووین لەنێوان

ئێمە وخزمانی هەروتی، بڕیاردرا به تەوافوق هەیکەلی فەوجی تایبەت دروست بکەین، من بورمە ئامیرفەوج دەستمان کرد بە مەشقی سەربازی کاك ڕێبین وەك چاودێرێك هاوکاری دەکردین، شەڕی بزوتنەوە لە سنوورەکان دەستی پێ کرد، دەکرێت بڵێم شەڕی ئێمە و ئێران دەستی پێ کرد، شەڕەکە زۆر مەترسیدار بوو، به هەزاران تۆپی قورس و سووك ڕۆژانە هێزی پێشمەرگەیان شەهید دەکرد، شەڕی پارتیش دووبارەدەستی پێکردەوە وەزعەکەزۆرئاڵۆز بووبوو شەرکردن لەگەڵ هەردو لا باجی زۆرمان دا، ڕۆژێکیان کاك کۆسرەت لەدوای هەموو ئامیر فەوجەکانی نارد ئێمەش چوین وتی برادەرینە ئاگادارین خۆتان کۆبکەنەوە لەوانەیە ڕژێمی عێرق پەلامارمان بدات هەرکاتێك ئاگادارمان کردنەوە ئامادەبن دەورە بیو لەیەکێتی بکەوە بزوتنەوە لە لایەك ئێران لەلایك پارتی لەلایك ڕژێم لەلایك تورکیا لەلایك بەراستی گەلەکۆمەکێکی خەتەرناك بوو ئەگەریەکێتی نەباو پێشمەرگە تازاکانی نەبا پێم وایە هەرهێزیك بایە ناوی لە کولەکەی تەرێش ناما، زۆربەی کێشەکانی ڕوبەڕووی یەکێتی بوونەوە پاشماوەی ئەو گەلە کۆمەکیەبوون، من پرسیارێکم لە کاك کۆسرەت کرد وتم کاك کۆسرەت ئەگەر ڕژێم پەلاماری کوردستانیداپارتی هەڵوێستی چییە ؟ بەیەك وشە وەڵامی دامەوە وتی هاوکاری ڕژێم دەکات .ئێمە گەڕاینەوە زۆری پێنەچوو کاك کۆسرەت لەدوای ناردینەوە وتی برادەرینە لەبەر بەرژەوەندی کورد و نەمانی شەڕی براکوژی پارتی داوای کردووە کۆتایی بە شەڕدێنم ئەگەر ئێوە فەوجە تایبەتەکان هەڵ وەشێننەوە، هێزەکانتان دوور بخەنەوە جەلال سۆرکانی تۆ هێزەکەی خۆت ببە( کۆیە ) فەقێ تۆش دۆڵی بالیسان چۆڵ دەکەی دەچیە رواندز فلان بۆ ئەوێ فلا ن بۆ ئەوێ کاك کۆسرەت وتی کێ قسەی هەیە؟ وتم من وتی: فەرموو وتم کاك کۆسرەت لە سەفین پارتی لەپێناو ئاشتی فێری لێ کردین لەشاخی سۆر و کراوقاسم هەروا فێری لێ کردین بە ناوی ئاشتی من پێم وایە ئەو جارەیان فێرێکی گەورەترە لەبن پەردەی ئاشتی، وتی فەقێ موجامەلە مەکەو بڕیارەکە جێ بەجێ بکە سەرم بردەبن گوێی جەلال سۆرکانی وتم من ناچمە رواندز جێ بەجێشی ناکەم کاك جەلال سۆرکانیش وتی منیش ناچم دواتر وتم کاك کۆسرەت هەردوفەوجەکەی هیران و بالیسان لێك بدە من جیگری جەلال دەبم بەس دوورمان مەخەوە ئەو دوو دۆڵە لەڕوی سەربازی گرینگن با چۆڵی نەکەین دوبارە بەتەورەییەوە وتی تەواو جێ بەجێی کەن من بڕیارەکەم جێبەجێنەکرد زۆر تورە بووم چومەوە ماڵێ و لێی دانیشتم ڕێزم هەیە کاك کۆسرەت براگەورەی هەموومانە بەڵام بڕیارەکەی هەڵە بوو ئەو باجەشمان دا چونکە هێزی ئێمە ملیشیات بوو ئەوخەرکە بەمن نەدەچوو

ڕواندز زۆربەیان چونەوە ماڵەوە وازیان هێنا دواتر پارتی پەلاماری داین زۆربەی ناوچەکانی گرت من هەرچەندە تورە بووم وەك پێشمەرگەیەك دەچومە شەرگەکە ڕۆژێکیان عومەر فتاع پەیدا بوو بەدوای منی دا نارد لە قوتابخانەی توتمە بوو دوای سلاو وتم قوربان من فەقێ مە دیارە نابووتیش بووم وەك بڵێی وای باوەڕ کردبوو فەقێ پیاوێکی قەبەوسمێل گەورەو پۆشتەبێ ودەوروبەری هەمووی حیمایە بێت ئاگری لێ دەباری، دیارە من وانەبووم من پیاوێکی سادە بوویمە لە تەواوی ژیانم، کەوتینە گفتوگۆ وتی: بە زووترین کات فەوج تەشکیل کەوە، وتم من ناتوانم لەو دەم و دەستە کاری وابکەم خۆ من لەسەر روو بار نیم پێم بڵێی ئاوم دەوێ بلێم فەرموو ئەوە ئاو، ئەوە کاتی دەوێ پارەی دەوێ وتی شتی وانیە ئێستا دەمەوێ فەوج تەشکیل کەی، وتم برای ئەزیز عینادی مەکە بەو دەمو دەستە ناکرێت سەبرم لێ بگرە وتی شتی وانیە وتم باشە من ڕەجام لە کاك کۆسرەت کرد فەوجەکان تێك مەدە بەگوێی نەکردم وتی پارتی فێری لێ کردین وتم من دەمزانی بەکاك کۆسرەتیشم گوت ئەویش بەقسەی نەکردم، من ڕۆیشتم هەرچەندی بیم لێ کردەوە لەوکات و ساتەفەوج تەشکیل نابێتەوە، لەکاتی شەڕ من وام بەباش زانی بڕۆم بەبێ بەرنامە، لە خەفەتی برادەرانی خۆم تورەبووم و چومە ئێران لە نەغەدە خۆم دیتەوە سەر دانی تارانم کرد، چەند ڕۆژێك لەوێ مامەوە، گەڕامەوە شاری شنۆ ویستم بەناوچەی شەمزینان بەرەو تورکیا بچم لە شاری شنۆ لەگەڵ چەندکەسێکی خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری زێوە سواری سەیارەیك بووین بەبرادەرانم وت من هیچ شتێکم پێ نیە هاوکاریم بکەن، دەریازم کەن لەبازگەی ڕژێمی ئێران کەسێك وتی خەمت نەبێت گەیشتینە بازگە داوای پێناسەیان لەمن کرد ئەوکەسەی قەولی پێدابووم هاوکاریم بکات بەسەربازەکەی گوت دایکی ئەوکورە ماتۆڕ لێی دابوو بەپەلە گەیاندیانە شنۆ بۆیە پێناسەی لەبیر چوە، سەربازەکە وتی بڕۆن، منیش بە هەڵەداچووم وامزانی هەموویان کوردی ڕۆژهەلاتن، یەکیان لێی پرسیم وەزعی کوردستان چۆنە؟ منیش بەبێ بیرکردنەوە-ئەڵێن زمان بەرای سەرە-یەکسەر وتم بۆچی پرسیار لەمن دەکەن،هێزی پارتی ئێوە لەمن باشتر دەیان ناسن، هەردوێنێ بوو شەڕی شنۆتان لەبیرچوو، ئەوان وەڵامیان نەبوو، تومەزانە پێشمەرگەیەکی پارتی لەگەڵیان بوو پێشمەرگەی پارتیم لێ دەربووەوە دەردێکی باشی پێ کردم ناچار خۆم مات کرد، وتی بشمزانیبایە ئەو پیاوەی تەسلیمی ئەرتەشم دەکردی، کاتێك ئەو پارتیە دابەزی خاوەن سەیارەکە منی بردە ناوگوندێك و وتی زوو خۆت بزرکە مەترسیم هەیە بە دوات دابێن منیش بەپەلە ڕۆیشتم، زۆر سەیر بوو سەروەختێك گەیشتمە نزیك گۆڕستانێك خەڵکێکی

زۆر لەسەر گۆڕستان بوون لە کەسێکی لا بەڵام پرسی وتی ئەوەگۆڕستانی ئۆردووگای زیوەیە هەموویان خەڵکی کوردستانی عێراقن پارتیشن، زۆرترسام بەپەلەدوورکەوتمەوە لەبناری چومەگوندێك چومە ماڵێك پێیان دەوت (محەمەد علی) ماڵێکی خانەدان بوو پیاوێکی دنیا دیدە بوو، خەرکی گوندێکە لەباشووری گوندی زێوە لەبناری چیا، ناوی گوندەکەم لەبیر نەماوە، لەخزمانی هەرکین. ئەگەر هەڵەنەبم ناوی (محەمەد عەلی بوو ) لەهەمان کات کەسێکی نیشتمانپەروەر بوو وتی نارۆی تاکو ئەو باو بارانە کۆتایی نێت، شەوێکیان کەتینە گفتوگۆ وتی کە مەلامستەفا مرد چومە سەرەخۆشیان تەماشام کرد مام جەلال لەسەر تازیەکەنییە! پرسیم وتیان نەهاتووە، بیرم کردەوە فرسەتێکی باشە بچمەلای مام جەلال لەگەڵ خۆمی بێنمە سەر تازیەیٔ مەلامستەفای هاتنی مام جەلال بۆتازییە دەبێتە کۆتایی شەڕی براکوژی برنۆیەکی چاکم پێ بوو لەگەڵ کۆمەڵێك دۆست و خزم چومە لای مام جەلال، دوای چاك و چۆنی وتم جەلال جوان ناوەستیٔ تۆ سەرکردەی میللەتێکی سەرکردەیەکی کورد مردووە، ناکرێت جەنابت نەچیە سەرەخۆشی، جێووشوێنت لە تازیەکە دیارە بەخۆ بکەوە بابرۆین، مام جەلال پێی وتم محەمەد علی تۆ برۆ پیاوێك بنێرە ناوچەی شەمزینان ئەگەر عولی عەسکەری و دکتۆر خالید ماون لەژیان ئاگادارم کەوە بەزووترین کات دێمە سەرەخۆشیان، ئەگەر شەهیدیش کرابن ئەوە لەتو بێدەنگی و ئەمنیش نایمە سەرەخۆشی بنەماڵە لەسەر ئەوە رێك کەوتین، منیش قسەکەی مام جەلالم بە دڵ بوو خەریکی هەستان بووین وتی محەمەد عەلی ئەو برنۆیەی بەشانتەوەیە بۆ من باشە دەیدەمە پێشمەرگەیەك منیش وتم باشە ئەو دەبانچەیەی لە قەدوبالاّی تۆیە بۆمن باشە، ئەو منی چەك کرد منیش مام جەلالم چەك کرد، کە هاتمەوە کەسێکم ناردە شەمزینان لای دۆست و خزمان کەهاتەوە وتی هەمووشت کۆتایی هاتووە، شەهید کراون، منیش وازم لەمام جەلال هێنا.

دواترمن چومەشەمزینان دووبارە گەڕامەوە ناوچەی تەرگەوەر، وئەوجارەیان چومە ناوچەی گەوەریٔ لە رێگ توشی ناوچەیکی شاخاوی بووم بەفر ناوچەکەی داپۆشی بوو، کرێوە لیٔی دام کەوتم چاوەڕێی مردن بووم ماوەیەکی زۆر کەوتم دواتر هەندێك نانم خوارد هێزم هاتەوە، وردە وردە رۆیشتم لەپڕ شوێنێکم لێ وەدەرکەوت ڕەشایی بوو، واتە بەفری لێنەبوو گەیشتمە ڕیواسان زۆرم خواردن، گەیشتمە ئاوەدانی و چوومەماڵێك زۆر خزمەتیان کردم، دواتر چوومە شاری گەوەڕیٔ، لە گەوەڕ بە ڕێکەوتم بەرەو شاری وان چووم، شاری وان شارێکی خۆشە دواتر بەرەو

چالدێران لەوێ شەوێك چومە گوندێك لەماڵی موختار میوان بووم کاتژمێر نۆی شەو بوو. تەقە بە چەکی سوك و نیمچەقورس موختار پێی وتم کوڕۆ نەترسی وتم موختار ناترسم ئەو تەقەیەچییە؟ وتی گوندەکەمان زۆری جاشن، ئێوارە پێشمەرگەکانی پەکەکە هاتوون نانی خۆیان دەخۆن تەقەمەنی خۆیان دەبەن لەدووری گوند شەڕەتەقەیەکی هەوای دەکەن ئەوان دەڕۆن جاشەکانیش بەیانی دەچنەلای حکومەت دەڵێن: شەوی ڕابردوو توشی شەڕبووینە، تەقەمەنی وەر دەگرنەوە بەیانی بە ڕێکەوت بۆ شاری وان بەرەو شارۆچکەی مرادیە بۆ چالدێران (دۆغ بازیدێ ) لە وێ چومە ئیدرێ بۆ خۆشم نازانی بۆ کوێ دەچم؟ لەوێ گەڕامەوە، لە چالدێران گیرام بردمیانە معەسکەرێك زۆریان لێدام لیکۆڵینەوەی زۆریان لەگەڵ کردم، سێ پەراسووم شکان سەرو گوێلاکم کرابوونە برین زۆر هەوڵیان دەدا، من بڵێم پەکەکەم دواتر بێ ئەمەل بوون، دامیانە دەست پۆلیس ڕەوانەی مرادییەکرام منیان بردە سجن کەچوومە سجن پڕ بوو لەخەڵك و زۆر بەیان دۆست و لایەنگری پەکەکە بوون، کەسێك پێشوازی کردم وتی من محەمەد دالیمە کەزانی من خەڵکی کوردستانی باشوورم زیاتر ڕێزی گرتم، منیش سێ پەراسووم شکابوون سەرماشم بووبوو کە کۆخم هات هەستی کرد شوێنێکم دێشێ، وتی نەخۆشی؟ وتم بەڵێ زۆریان لێ داوم وتی کێ. وتم عەسکەر. ئیتر منیان بردەحەمام و ناردیان هێلکە و خامەیان هێنا جوان شوتمیان شوێنی شکانیان بۆ بە هێلکەوخامە بەست بۆ ڕۆژی دواتر وتیان دەچیە مەحکەمە؟ چومە مەحکەمە بەندیەکان وتیان قسە مەکە تاوەکو دەچیەسەر تەختەبچووکی پێش حاکم، تەختێك لەپێش حاکم هەیە کە چویە سەر ئەو تەختەیە ئازادی لە بەرگری کردن دیارە ئەوشتانە برادەرانی سجن فێریان کردبووم، کە چومەسەر تەختەکە حاکم کۆمەڵێك ڕستەی گوت نەمزانی چی وت! وشەکان تورکی بوون تەرجومانێکی عەرەب هات کەوتە گفتوگۆ بەعەرەبی‌منیش بە ئەنقەست بۆ ئەوەی حاکم توڕە بکەم بەئیشارەت وتم عەرەبی نازانم بەکوردی وتم بەس کوردی هەرچەندی هەوڵایاندا من دەموت کوردی ناچار بوون حاکم ناردی کوردك یان بۆ هێنام کوردەکە پیاوێکی باش بوو، بە کوردی پێم وت ئاگات لێ بم قسەی باشم بۆ بکە، وتی خەمت نەبێت. داکیان واو والێ دەکەم مەحکمە کرام، بەبیست و پێنج ڕۆژ زیندانی چەند ملیۆن لیرەیەك غەرامە کرام بەحاکمم وت من جەزا نادەم پارەم نییە، چەند ڕۆژکەی تری خستەسەر بەندبوونم ئەو مانگە زۆر خۆش بوو، لە گەڵ برادەران ئەوان زۆر شتیان نازانی بەردەوام پرسیاریان لێ دەکردم، منیش بە پێی وشیاری خۆم لە وەزعی کوردستانی خۆمان وەڵامم دەدانەوە، وە ناوەناوە میتی تورکی کەسێك

دەنارد بۆئەوەی قسەم لێوەرگرێت لەگەڵ (محەمەد دالی) وارێك كەوت بووین ئەگەر ئەوكەسە جێی مەترسی بێت من سەیری كەم و ئەو چاوم لێ بنوقێنێت محەمەد دالی زۆری هاوكاری كردم ناوەناوە كەسێك دەنێردرایە ناو بەندیەكان گوایە بۆ چاك سازی بەلاّم سەر بە ئاسایشی نەتەوەی بوو مەبەستی ئەو بۆ شوتنەوەی ئەقلی بەندیەكان بوو پێ یان وتم ئەگەر هات پرسیارت لە زۆرشت لێدەكات یەكێك لەو پرسیارانەی لەتۆ دەكات كەپێشتریش لە خەڵكی وەك تۆی دەكرد مەسەلەی پارتی و یەكەتیە ئەگەر ئەو پرسیارەی لێ كردی بلێ سەر بە بارزانیم باسی یەكەتی نەكەی، وتم باشە مەسەلەچیە وتیان ئێمەش نازانین ئەوەی بلێ یەكەتیم لێرە دەی بەن، بۆ كوێ دەی بەن نازانم ! ڕۆژكیان ئەوكەسە هات بەندیەكانی كۆكردەوە لە مەیەدانی سجن كورسیەكیان بۆ دانا پیاوێكی سورو سپی و بالابەرز بوو چاوشین دەستی بە قسە كرد لەپڕ ڕوی لە من كرد و برادەران بوونە تەرجومان وتی خەڵكی كوێی وتم عێراق هەولێر، وتی بارزانی یان تالەبانی منیش وتم بارزانی ئیتر كەوتە زەمی مام جەلال و بەرەو زە می یەكەكە چو دواتر ملی خۆی شكاند ڕۆی دەبێت شتێك بلێم بەندیخانەكانی توركیا زۆر جیاواز بوون لەگەڵ بەندی خانەكانی ڕژێمی عێراق بەندیخانەكانی توركیا كارە با تەختی نووستن ئاوی گەرم تەلەفزیۆن دەزگای گەرمكردنەوە بۆ زستان لەكات ژمێر هەشتی بەیانی درگاكان دەكرانەوە بۆ ساحەی سجن تاكو ئێوارە گۆرانی كوردی نەشید قسەكردن لەباری ڕژێم ئازادی هەیە دیارە ئەوئازادیە لە ناو ئەرتەش دانیە ئەوەیان مەسەلەیكی ترە وەختی ئەوەهات ئازاد بكرێم ڕۆژی پێش ئازاد بكریم لە دەزگای میتی شارۆچكەی موورادیە بانگ كرام كۆمەڵێك قسەی بێمانای بۆكردم وەك و ئەوە یا سای دەوڵەتەو نابێت دڵت برەنجێ لەوبابەتە بەیانی برادەرانی سجن زۆر بەڕیزەوە بەڕێیان كردم بەپۆلیسێك ڕەوانەی وان كرام لەوان ڕەوانەی هاكاری كرام دوسێ ڕۆژ لەهاكاری نیمچە ئازاد بووم لەهاكاری كەزانیان من خەڵكی باشوورم و سۆرانیم زۆر ڕێزیان لێ دەنام لە هەرشوێنیك وەك چێشتخانە و چایەخانە و پارەیان لێ وەرنەدەگرتم دواتر ڕەوانەی شارۆچكەی چەلێ كرام بۆ بنكەیەكی میت كەسێكی كورد چایەچی بوو دوكانێكی بچووكیشی دانا بوو لەو دەزگایە، بە دزی پیاوانی میت پارەی دایە من زۆر هەوڵدا وەرمنەگرم وازی نەهێنا مەبەستی ئەوە بوو بەپارەی ئەو شتی لێ بكڕمەوە دوای دوو ڕۆژ درامە دەست یەكێكی سەربازی لەیكەسەربازیەكە دەسەر با زیان ئامادەكرد ئەمریان پێكردن چەك سواربكەن بەتوركی ئەفسەرەكە كۆمەڵێك قسەی كرد ومنیان بەپێشخۆدا و كەوتینە ڕێ وای تێگەیشتم مەبەستیان

کوشتنمە دەبێ بم کوژن لە وانەیە نەم کوژن من پشتم لەوان بوو ئەوان قسەی زۆریان دەکرد من تێی نەدەگەیشتم دووای ماوەیەك لە باسکێك سەرکەوتین منیان راگرت بەئاماژە وتیان برۆ لوولەی چەکەکانیان ڕوولە من بوو ڕۆح لەجێیەکی قەیم بوو دەرناچوو بەراستی ترسام بمکوژن شەرمیشم دەکرد ئاوڕبدەمەوە وردە وردە دوورکەوتمەوە ئاوڕێکم دایەوە ئەوانیش دەڕۆیشتن لەوەزانیم من ئاودیوی لای خۆمان کرایمەوە، دیسان غەمیکی تر سەری هەلدا ئەویش شارەزاش نەبووم زۆریش لە پارتی دەترسام وەدەمزانی ئەوسنوورانە سنووری پارتین لەو خەیالێنەدابووم( زێیەکی) گەورە بەدەرکەوت گەیشتمە سەر زێیەکە ناوچەیکی چۆل بوو وردە وردە بەدەم زێیکە داچومەخوارێ گیشتمە گوندێك پیش گوندەکە جسر بوو زۆر هیلاك بووبووم لەلای جسرەکە دانیشتم ئێوارە بوو کورە گەنجێك هات وتی بابێمن دبێژی کەرەم کە، لەگەلّی چوم پیاوێکی تەمەن هەشتاسالێ دەبوو دوای سلاو بەخێر هات گوتی کورۆ خەلکی کیرێی وتم شەقلاوە وتی ناوشەقلاوە وتم دەوروبەر باوەڕبکەن لەمن شارەزاتر بوو لەناوچەی ئێمە کەتینە گفتوگۆ ناوی زۆرکەسی هێناو لەمان ونەمانی دەپرسین باسی زۆرشەڕی دەکرد لەدەوروبەرمان دوواتر وتی ئەتو جەلالی وتم مامە جەلالی چنە؟ وتی کوڕم فێلّم لێ مەکە، من زۆر سەرناسم دەزانم تۆ جەلالی کەوتە زەمی یەکێتی، بەیانی کە ڕۆیشتم وتی لێم ببوورە، نابووا دلّت عادز کەم ئەتو میوان بووی، وتم مام چت تێدا نەهێشت وتی کوڕە جوان ئەمنیش لەمێژ بوو کەس نەبووە، قسانی لە گەلّ بکەم!

ڕۆیشتم لەکانی ماسی بازگەیەکی پارتی لەسەرڕێگا بوو دوای چاك وچۆنی هەندێك درۆم ڕێك خستبوو لەترسان ڕێگایان دام برۆم کوڕێك بەدوام داهات سەیرەکەلەوەبوو ئەوەی دەی دیتم دەیوت تۆیەکێتی وتی برادەر من پیچەك شۆل بەتو هەنە وتم فەرموو وتی تۆ یەکێتی وتم بابە یەکێتی چییە؟ وتی وەر بەقسەم بکە بۆ ئەوەی لە ڕێگانەگیرێیت برۆ ناو( کانی ماسە) مەکتەبی سەرۆك بارزانی لەوێ بلێ من چەند سالّەلەتورکیام سنووරداش کراوم نووسراوێکم بۆ بکەن، ئەوەنەکەی لەو سنوورە دەرناچی پارتی دەت گرێت، لە منیش مەترسە قسەی کابرا ئەقلّم گرتی، چومە مەکتەب سەرۆك کۆمەلێك درۆم کرد، باوەڕیان کرد نووسراوێکیان بۆ کردم بەو شێوەیە :( مەکتەباسەرۆك ، بۆ هەموو بەرپرسامە، سلاڤکا گەرم هەلگرا نووسیناما مستەفا رەسوول دێچیتەوە، ناو عایلاخۆ لەباژێرێ شەقلاوە هیڤیامەیە هارکاریاوی بکەن، ڕێکاوی نەگرن مەکتەباسەرۆك کانی ماسی ئیمزا) نوسراوەکەم هێناو بەرەو زاخۆ چوم بۆ دهۆك دواتر هەرێر و

**لەوێش شەو بەپارتیزانی چومەوە دۆڵی بالیسان، دیسان توشی شەڕەشەقی برا کوژی بوومەوە ئەمەوێت بەکورتی باسی (٣١) ئابوو شەری تورکیا بکەم.**

*** *** ***

**لەپێش (٣١) ی ئاب تەشکیلەی هێزەکانمان کرد لە مێرگەسەر من داوام لەمەلانەجم کرد لەو تەشکیلەیە دوور دەبم ماوەیەك بەرپرس نابم وەزعی جەستەیی و دەروونیم تەواو نەبوو، لەسەرئەو بۆچونەم مەلانەجم لەگەڵم بە شەرهات من شەرم نەکرد، هێزەکانی ئێمە لە کراوقاسم بوون ولە زینەتێ و شاخی سۆرەپەل و کەپکی حەمەد ئاغا بنکەی ئیدارەمان لە خوار گوندی ئەشکەوتە بوو، دواتر پارتی لە شاخی سۆر تۆپبارانی کردین ئیدارەمان گواستەوە لای گوندی سارتکە. لەبەرەکانی شەڕ بەردەوام بوو ئەوان هێرشیان دەکردو ئێمە هێرشمان دەکرد شەوێکیان پارتی لەکەبکی حەمەد ئاغە پەلاماری هێزەکانی ئێمەی دا وەهێزێکی خۆمان واتە ناوچەکەمان لەگەڵ هێزێکی ئاسۆس کەوتنە بەرانبەر هێزی پارتی توانی شوێنی هێزی ئاسۆس بگری ئێمە لەگەڵ مەلانەجم لەخوارەوەبووین بەپیشەرەکەوە چوین، هێزی پارتی و هێزەکەی خۆمان واتە ئاسۆس بەو شەوە تیکەڵاو بوون، بێسەروبەرییەکی زۆر دروست بووبوو لە هەردوو لاوە... واتە لە ئێمە و پارتی، مەلانەجم وتی لەگەڵ ئەوبرادەرانە برۆ بزانە ئەو ڕەبایە پارتین یان یەکێتین، منیش بەرەو ڕەبایە چووم بیست مەترێك لێیان نزیك بوومەوە و دانیشتم بزانم ئەو هێزە کێیە؟ ڕەبایەکە کەوتبووەبەر ئاسۆ سێ کەسم لە ناوڕەبایەدیتن، برادەرێکمان بەناوی عەولاسۆفی بەپەلەهات و چوەلای، ئەوسێ کەسە، نەدەکرا پێی بڵێم مەچوەلایان عەبدوڵڵا بەسێ کەسەکەی وت ئێوە کێن دووبارەی کردەوە بە هەرسێ کەس عەبدوڵڵایان بردوو ڕۆیشتن، شەڕەکەدرێژەی کێشا هێزەکەی خۆمان جگە لە ئاسۆس شوێنەکەی خۆیان بەرنەدا و پارتی بەیانیەکەی پاشەکشەی کرد منیش بەدوای عەبدوڵڵا سۆفی داچوم باوەڕم وابوو عەولا سۆفیان کوشتووە دیار بوو عەولانەکوژرابوو، عەولایان لەگەڵ خۆبردبوو... عەبدوڵڵاسۆفی پیاوێکی بێکەس بووماڵباتەکەیان لە کیمیاباران زۆربەیان شەهید بوو بوون، خۆشی برینداری چەکی کیمیا بوو، بەگرتنی عەولا زۆر دڵ تەنگ بووم خەمی من لەبێکەسی عەولاسۆفی بوو، دوای پێنج ڕۆژ هێزێکی گەرمیان پێنج پێشمەرگەی پارتی بەدیل گرت، چومە لای مەلانەجم وتم مەلا عەولاسۆفی پیاوێکی زۆر بێکەسە، لە هەمووماڵباتیان دوو کەس ماون، ئەوانی تر بەچەکی کیمیا شەهید بووینە، زۆر قسەی ترم بۆ مەلانەجم کرد، کە لێرە جێگای باسکرنی نییە. زۆر**

نەمابوومەلانەجم بۆی بگری وتی چارەی چییە؟ وتم بەڕێز ئێمە ئەم شەو پێنج پارتین گرتوون، ئەگەر ڕێم پێ بدەی دەی گۆڕمەوە مەلانەجم نووسراوێکی دامێ و چوم هەرپێنج پارتیم هێنانە مەقەڕی خۆمان لەگوندی سارکە، دواتر چوومە لای بەڕێز یادی بەخێر مام رەسوول شیوعی بناوی دوای گفتوگۆیێکی زۆر بەرنامەمان دانا، وتم ئەوەناوی دیلەکانی پارتین ئەودیلانە لەخزمانی عەشیەتی هەرکین برۆ لای خزمەکانیان پیان بلێ هیمەت بکەن لەگەڵ بەرپرسانی پارتی ئەگەر (عەولاسۆفی مان ) بدەنەوە من دیلەکانیان دەنێرمەوە، ئەومامەڵەیە چەند ڕۆژێکی پێ چوو، ڕۆژ بەڕۆژ لێك نزیك دەبووینەوە، ڕۆژکیان مام رەسوول وتی فەقێ ؟ وتم بەڵێ. وتی کاکە ئێوە هەڵەن لەو شەڕە دووکەسی ترتان گیراون، لەگەڵ عەولاسۆفی وتم کێنە؟ وتی پێشمەرگەیەکی پارتی بەنەهێنی پێی وتم. ناوەکانیان ئەوە و ئەوەیە پێشمەرگەی ئاسۆسن، یەکێکیان دادەبرێت و لەناوچەکەش شارەزانابێت دەچێتەماڵە ڕەوندێك لەبن تاتی خوار کەپکی حەمەد ئاغە خاوەن ماڵ دەی داتەدەست پارتی ئەوەی تریشیان لەکەپکی حەمەد ئاغا دەست گیردەکرێت، وتم مام رەسوول فرسەتە لەهەرلایەك ئێمە بتوانین چەند کەسێك نەجات بدەین، هیمەت بکەو کاری لەسەربکە مامەڵەکە پێنج بەسێ واتەمن پێنج پارتی ئازاد بکەم، پارتی سێ کەسمان ئازاد بکات کارەکان لێك نزیك بوونەوە، وتم مام رەسوول من یەکیان بە هەدیە دەنێرمەوە بەبێ بەرانبەر مام رەسوول یەکیانی بۆ بردنەوە دواتر ئەوان یەکیان بۆناردمەوە، ئامیرکەرت بوو، پیاوێکی بێ هیممەت بوو، زوو زانیبام وایە نەم دەگۆڕیەوە پارتی کوشتبای باشتر بوو، منیش یەکێکم ناردەوە پارتی یەکێکی بۆناردمەوە پیگەی سەرتیپ بوو لەو هێزەی ئاسۆس ئەو کەسەبووە کە ماڵەرەشمارەکە دابوویەدەست پارتی ... پیاوێکی نەترس دیاربوو. لە شوێنی گۆڕینەوە کەمەترسی هەبوو منی بەجێ نەهێشت، خولاسە من هەرسێ دیلەکەی خۆم هێنانەوە ئامیر فەوجێکی پارتیم لەلامابوو، بەناوی (حاجی دێوانە) کە لەعەشیەتی خزمانی هەرکی بوو، من چەند تەماشای ئەوپیاوەم دەکرد پیاوەتی لێ دەباری وەختەکەش کاتی جومعەبوو حاجی وتی برادەر پێم خۆشەئە گەر ڕێم پێ بدەی بچمە(جومعە ) دووسێ پێشمەرگەم لەگەڵ بنێرە، وتم حاجی بەتەنیا برۆ وتی بەتەنیا ناڕۆم وتم بەخودای دەڕۆی حاجی ڕۆیشت منیش لەماڵی مام رەسوول نانم دەخوارد، کاتێك حاجی هاتەوە لەگەڵ مام رەسوول نانیان خوارد دوای چاخواردنەوە وتم حاجی دێوانە کەس نەماوە جەنابت لەگەڵی بگۆڕمەوە، گوتی تۆ چی بەباش دەزانی بیکە؟ وتم حاجی قەولم پێ دەدەی ئەگەر بەرێت بکەم نەبیەوەپارتی، حاجی لەوەڵام وتی من درۆت لەگەڵ ناکەم ئێستا ئازادم کەی دوای

سەعاتێکی تر دەبمەوە پارتی ئەوە ڕاستیەکەیە، کە بیم لەوەزعی کوردستان کردەوە، لە قسەکەی حاجی تێی گەیشتم کە حاجی لەسنووری پارتی ناتوانێت پارتی نەبێت وە دڵخۆشیش بووم کە بەڕاشکاوی وبەبێ ترسی وەڵامی دامەوە، وتم حاجی منیش دنیا دیتەم لەشت دەگەم بەچاوان بەڕێت دەکەم، حاجیم بردە سەرجادەو سەیارێکم ڕاگرت و حاجی دێوانەی هەرکیم ئازاد کرد، عەولاسۆفیشم هێناوە، بە هیمەتی هەموولایەك لەو چیرۆکە باسی مام رەسوول شیوعی بناوی بکەم بەراستی هیمەتی کرد ....

لە(٣١) ئاب نزیك بووینەوە ئەوەی ڕوویدا ڕوویدا هەولێر داگیرکرا لەلایەن ڕژێمی عیاق و هێزەکانی پارتی بەرەو کۆیەو دۆڵی سماقوڵی ملیان لێنا دوای بەرگرییەکی زۆر هەرچەندە شیازەی سەربازی و ئیدارەی یەکێتی بە داگیرکردنەوەی هەولێر ئاڵۆزبوو بوو دواتر پارتی هەیبەت سوڵتان و هیزۆپی گرت، ئەوکاتەی ئەو هەواڵەمان زانی شەو بوو من وەك کادیرێکی سەربازی بیم لەو ڕووداوە کردەوە پێش بینیم کرد، پێویستە وابکەم قەناعەت بە مەلانجم بێنم هێزەکانمان لە سۆرەپەل و کەپکی حەمەد ئاغا بینینەوە باکووری ئەو شوێنانەی باسم کردن کە دەکاتەبناری لای هەروتەکەون و سارتکەو گوندی خەتێ، کات ژمێر نۆی شەو بوو کە چومەلای و وتم ملانجیم وتی بەڵێ وتم وەرەکارم پێتە چووینەپەنایەك و پێم گوت مەلا ئەوهێزە پاشەکشەپێ بکە بۆ بەری هیزۆن و شۆپە وتی نەخێر، شەڕ دەکەم وازم لێ هێنا تاکو کاتژمێری یازدەی شەو دووبارە چومەوەلای مەلانەجم ئەوجارەیان زۆریەتوندی بەرەنگارم بووەوە هەندێك قسەی بێتام و توندی کرد وتی هەمووم لێ بووینە قایدی سەربازی، منیش توڕەبووم و ڕۆیشتم لەخەمی هێزەکەی خۆم خەوم لێ نەکەوت کاتژمێر سێی شەو چومەوە لای مەلانجیم وتم مەلا وەرەکارم پێتە بۆ ئەوەی برادەران تێمان نەگەن دوورکەوتینەوە وتم مەلا من قایدی سەربازیم گوێم لێ بگرەن، پاشەکشە نەکەی لەکەپکی حەمەد ئاغا ئەوهێزەمان دەبێتەچەند بەش یەکەم بەشێك شەهید دەبێت، بەشێك بەدیلی دەگیرێت، بەشێك برنداردەبێت، بەشێك دەردەچی! کەس نابیتەبرای کەس ئەو هێزەت لەدەست نامێنێت شەڕیش بە من وتۆ ناکرێت بەتەنێ، مەلانەجم تۆزێك داماو وتی کێ بنێرم؟ ئەو هێزەپاشەکشەی پێ بکەم. وتم من دەچم بەڵام پێم باشە کەسێکم لەگەڵ بنێری وتی کێ دەبەی بیبە، دوام لە زۆر کەس کرد وەڵامیان نەبوو، دواتر چومە لای قادر عەبدوڵڵا کانی بەردی، مەردانە وتی ناو ئاگریش بێت لەگەڵت دێم مەلانجم سەیاریەکی لەگەڵ ناردین تاسەر سۆرەپەل ئێمە دابەزین سەیارەکە گەڕایەوە چومە ڕەبایەکی سۆرەپەل سەباح توتمەرەیی و

شەهید ئەیوب و ئیبراهیمی برای کۆمەڵێك پێشمەرگە لە وێ بوون، وتم برادەرینە پەلەبکەن ڕەبایە ئاگاداری یەکتربکەنەوە  پاشەکشەبکەن بۆگوندی سارکە وتیان ئێمە دۆشکەمان لەلایە وتم وەختی دۆشکەنیە بیشارنەوە یان وازی لێبێنن... ڕەبایە ڕەبایەی ئاگادار کرانەوە بۆ پاشەکشە من گەڕامەوە لای مەلانەجم ، مەلانەجم چاوەڕێی من بوو وتی فەقێ کوا هێز وتم دوای کەمێکی تردێن، بەتوڕەیی وتی ئەبووایە لەگەڵ خۆت ئەو هێزەت هێنابایەوە! منیش لەتوڕەیان وماندوبوونیان وەڵامم نەدایەوە، دوای کەمێك هێزهات و بەڕێکەوتین  بەرەو گوندی خەتێ لەپڕ ملانەجم دەستێکی هاویشتەسەر شانی من  و داوای لێبووردنی لەمن کرد و  وتی  دوو ڕۆژە شەڕ بەتۆ دەفرۆشم لێم ببوورە،  وتم مەلا لەشەڕدا قسە و جوێن باجی لەسەرنییە هەروایە  مەلا وتی سوپاست دەکەم.

ورده ورده گەیشتینە گوندی خەتێ پێشتر مەلاخالید و برادەران  چوبوونە خەتێ نانمان بۆ ئامادەبکەن، ئێمەخەریکی نان خواردن بووین لەدوولا پەلامار دراین  وتیان پارتی گەیشتە خەتێ ئێمەخەریکی جولان بووین بەرەنگاری پارتی ببینەوە بەشێك لەخەرکی گوندی خەتێ پەلاماری مەقەریان داین، بەچەکو تەقەمەنی وئازوقەو کەلوپەلی مەقەڕیان لێك بەشیەوە، سەیر بوو زۆریان دۆست وبرادەری خۆمان بوون، لە دنیای گورگان زستانان کە گورگ زۆر برسی دەبن  مەترسی مردنیان لێ پەیدا دەبێت  بڕیار دەدەن  یەکێك ببێتە قوربانی، هەموویان بەو بڕیارە ڕازی دەبن لەدیار  یەکتر دادەنیشن  چاودەبڕنە ناو چاوی یەکتر تاکو گورگێك خەوی لێنەکەوێ ڕویان نایەت بیخۆن، نازانم ئەوبەشەی گوندی خەتێ چۆن ڕوویان هات وامان لێ بکەن ؟ دیارە من ئەوقسانەم لەگەڵ هەمرو گوندی خەتێ نییە، ئەوانەی بەشداریيان کرد لەو ڕووتکردنە ڕووبەڕوو ئێمە توانیمان پارتی لە پێشڕەوی ڕاگرین، دوواتر بەرەو شێخ وەسانان ڕۆیشتین، سەیرە تاڵانکردنی ماڵ وسامانی خەلکی و دامودەزگا و مەقەڕ بووبووە، نەریت وەدەشکرێت شتیك بڵێن نازانم پێشتر کورد ئەوئارەزوەی هەبووەیان لەعەرەب فێر بووین چونکە عەرەب لەمێژە لەژێر پەردەی  ئاینی ئیسلام خەریکی کوشتن و تاڵان کردنە تاکارگەیشتە ئەنفالەکان کوشتن وتاڵان کردن  ئەوەی باوەڕیشی بەو قسەیەنیە دیارە شارەزانیەلەخوێندنەوەی مێژوو بۆسەلماندنی ئەوقسەیە  پێویستە هەمووکەس مێژووی خوێناوی عێراق بخوێنێتەوە لەنووسینی( مام باقر یاسین) و لە وەرگێڕانی( مام حەمەسالح گەلاڵی) ئەوکات تێدەگات ئەقلی عەرەب چەند بچووکە پەرژین بێت، ناکرێت

**میللەتێکی وەك عەرەب "پیاوی باشی تێدا نەبێت دوبارەپەرژین بەگوڵ، کورد دەڵێت کەرێ لەکن کەرێ ببەستیەوە یان رەنگی دەگرێت یان خوی!**

**ئێمەبەرەو شاورە رۆیشتین دیارە ئێمەشارەزای ناوچەکەبووین وەهێزی گەرمیانیشمان لەدوا بوو، بەزمی خەتێ لە دۆڵی شاورە لەلایەن چەند کەسێك دووبارە و خراپ تروی دا بەرانبەر ئەو هێزە نەشارەزایە ئەویش چەك کردنیان من لەسەرووی گوندی شێخ وەسانان دەرۆیشتم لەدوای مەلانەجم کورێك باناوی نەدەین لە پێش من بێکەیسی فرێدا و رای کرد، منیش بیکەیسی و زنجیرەکانم هەڵگرت لەناودەرەدار گەیشتمە ملانەجم وبرادەرانی، مەلانەجم زوولەشت دەگەی، وتی برادەران هاوکاری فەقێ بکەن، جەلالی مام تەهای بالیسانیێ، زنجیرەکانی لێ وەرگرتم تازاد بالیسانی هات کلاشینکۆفی لێ وەرگرتم، بیکەیسی بێفشەك و سێ مەخزەنی کلاشینکۆفی پڕ فیشەك لەلای من مایەوە، سەیرکەن شتی سەیر روودەدات لە گولانێ بەبێ دەستی من من لەملانجم دابڕام شەوبوو کەزانیم نایان دۆزمەوە چومە (دارەبەن) ماڵی حاجی عەزیز یەکترمان دەناسی شەو لەوێمامەوە بە رۆژچومە ناو بنەهەنجیرێك تاکوئێوارە لەلایەن ماڵی مام حاجی عەزیز زۆر خزمەت کرام سەیرەکە لەوەبوو ئەوانیش کورێکیان بە ناوی فەقێ پێشمەرگەی یەکێتی بوو لەدۆڵی هێیان خۆی حەشاردابوونەوشەوە بەتەمای هاتنەوەبوو جادەم زۆر جوان لێ دیار بوو بەشێك هێزەکەی ئێمە کە ناشارەزابوون لەناوچەکە بەرۆژ لەسەرجادە پەیدابوون بەشێك لەخەڵکی دۆڵی شاورە کەوتنە چەك کردنی ئەوهێزە نامەوێت بەدرێژی باسی بکەم کارەسات بوو بەشێك دۆستەکانمان لەناحەزەکان خراپ تر بوون ئێوارە و وتم دەرۆم زۆرهەوڵیان دا بەقسەم نەکردن بەرێکەوتم بەبیکەیسی بە بێ فیشەك سێ مەغزەنی کلاشینکۆفی بێ کەلاشینکۆف چۆن چەکم پێنەبێت وای لێهات، کە گەیشتمە گوندی دێرە دوو مێرمنداڵ بۆم هاتن چەکیان پێ بوو چەکیان سوار کرد و بۆ لام هاتن وتیان نەجوڵێی کوژرای هەردووکیان منداڵ بوون من هیچ دەستەڵاتم نەبوو دوو گولەم پێ با بەس بوو! دیارە هیچم پێ نەبوو، وتیان ئەو بیکەیسیە فرێدە بۆم فرێدان وتیان ئەو مەخزەنانەش فرێدە ئەویشم فری دان، هەندێك قسەی سوکیان پێ گوتم دواتر ئەوان رۆیشتن باش بوو، نەیان کوشتم، دواتر چومە ماڵێك ماڵی مام عەولای قادریان پێ دەوت، دیارە خێزانی وتی ئەوەماڵی فلانە وتم مام عەولالەویە وتی چویتە گەڕان لە سەروی ماڵی ئێمە کەوەسەرکەوتم چەندپیاو ماقوڵێك دانیشت بوون چایان دەخوارد دوای سەلام وتیان فەرموو دانیشە منیش دانیشتم، بە یەك دەنگ بەخێرهاتنیان کردم وتم:**

خزمینه من پێشمەرگەی یەکێتیم غەریبش نیم لەو ناوچەیە جیانین خەڵکی شێخ وەسانام، دوو منداڵی ئێوە هاتنە سەر رێم چەکیان کردم ئەگەر دوو فیشەکم پێبان باوەڕبکەن دەم کوشتن دیارە بەختیان هەبوو فیشەکم پێ نەبوون ئێستاش بیکەیسی دێنەوە بی هێننەوە نای هێننەوە من دەڕۆم بەڵام رۆژێك بەدوای دادێم ئەوکات لۆمەم مەکەن، یەکیان وتی برائێمە نەبووین بزانەکێ بووە وتم برادەر ئەوقسانە مەکە لەفلان خان وهاتنە دەر بەژنیان بەوشێوەیەو تەمەنیان بەو شێوەیە کەسێکی تر وتی خزمینە ئەوەی پێناوێ من دەزانم باکێشەیەکی گەورەمان بۆ دروست نەبێت فلان و فلان بوون بامن ناویان نەدەین، کە گوێم لەو قسەیە بوو من بێخەم بووم ریشسپیەکان کەوتنە جوڵە و بێکەیسی و تاقمی کلاشینکۆفیان بۆ هێنامەوە، سوپاسی ریش سپیانم کرد و رۆیشتم لە بەرچاوی ئەوان بۆ لایەك چووم دواتر رێ گۆڕیم کرد.

وردە وردە بەرەو میەبەگ چوم چومە ماڵی رەسوول بەگ دەم ناسین ریزیکی زۆرو خزمەتیان کردم بەڕاستی مام رەسوول پیاوی رۆژانی تەنگانەبووخاوەن تەجروبەش بوو ئێوارە کوڕێکی خۆی لەگەڵ ناردم تاکو نزیك سەرو چاوە، بۆ مێژوو لەنێوان ساڵی (١٩٨٨ ) بۆ ساڵی (١٩٩١ ) رۆژێك لەرۆژان میە بەگ بێ پێشمەرگە نەبووە بەهیمەتی دانیشتوانی، لە سەروچاوە بەرەو مێرگەسەر هاتم زۆر هیلاك بووبووم، بە هەڵگرتنی بیکەیسی ... برادەرێکم هەبوولەمێرگەسەر کەسایەتی ناوچەکەش بوو بەناوی( کێخوا عەولای مێرگەسەر) ئەو پیاوە خۆشەوستی هەموو ناوچەکەمان بوو، لەرابردوو زۆر خزمەتی پێشمەرگەی کردبوو، ناوبراو بەرپرسێکی پارتیش بوو، چوو مەماڵیان مام کێخوام دیت وتم مام کێخوا ئەو بیکەیسیەم بۆ هەڵگرە، تاکو یەکێتی دێتەوە، وتی بەچاوان بەرێکەوتم چومەوە شێخ وەسانان شێخ وەسانان بۆ من زۆرباش بوو، خەڵکی شێخ وەسانان هەمومان بە دەیان سەر دبیننەوە خزمی یەکتر زۆر هاوکاریان کردم، ئەوەی پێویستە بیڵێین بۆ مێژوو ئەو جاشانەی دوای (١٩٩١ ) بووبوونە پارتی بە هەمان شێوەی ئەنفالەکان کەوتنە تاڵان کردنی دووکان و سەیارەوچەکی هاوڵاتیان تاکو دوایی من لە نزیکەوە ئاگادار بووم پێشمەرگە کۆنەکانی پارتی زۆریان خۆ پارێز بوون، لەو تاڵانەکاری نابەجێیان کەم دەکرد، بەڵام کۆنەجاشەکان وەك رۆژگاری ئەنفالەکان کەوتنە دووای ڕاو و رووت لە سنووری یەکێتی...بەڵگەشم هەیە ئەوەی باوەڕ ناکات، بەتایبەتی لەشاری رانیە، دیارە لەناو پارتیش خەڵکێکی زۆر هەبوو زۆر بە رووداوی ( ٣١ ) تێك چو بوون، پێیان ناخۆش بوو، کە رژێمی عیراق ئاڵایان لەسەر پەرلەمانی کوردستان هەڵدایەوە ناکرێت باسی هەموویان بکرێت، بۆ

**نموونه:** فەریدون جوانڕۆیی که بەعسیەکان دەبینیت،دەڵێت (( بریا ده ساڵی تریش له دوورەوەم تەماشای هەولێر کردبا، هەولێرم بەوشێوەیه نەدیتبا)) لەو کەسانه زۆربوون ماوەیەکی زۆر من لەشێخ وەسانان مامەوه بەنیمچه پارتیزانی دواتر بەباشم زانی بچمەوه لای برادەران، لەڕێگای بەرپرسێکی مەردی ناو پارتی کارئاسانیم بۆ کرا باناوی نەبەین، لەڕێگای چەند خزمێکی خۆم گەیشتمه لای مەسول سوپا، مەسول سوپا برادەرم بوو، دەمزانی پیاوێکی مەردو کوڕی ڕۆژانی تەنگانەیه. سەلامم لێ کرد و هەندێك گلەی و گازاندەم لێ کرد لەسەر (۳۱) ئاب و هاتنی ئێران و چەند شتێکی تر ئەو بەرێزه وتی باوازبێنین لەو مەسەلەیه وتی فەقێ دەبیەپارتی مەسولیاتێکی باشت بدەمێ، وتم تۆ لەشوێنی منبیت لەوکاتوساته و لەو وەزعه دەبیه یەکێتی؟ مەردانه وتی نەخێرا وتی چیت دەوێت بۆت بکەم؟ وتم: ئێوه لای چۆمانتان چۆل کردوه، هەمووتان له سنووری ئێمەن نامەیەکم بدێ تاکو دەگەمەچۆمان نەگیرێم بەلای گوندە ژۆری دەچمەوه لای برادەران تاقەتی رۆیشتنی ئەو هەموو شاخانەم نییه وتی بەچاوان نامەیەکی دامێ بۆ لق و وتی: برۆ خەمت نەبێت! بەیانی لەگەڵ چوارخزمی خۆم که پێشمەرگەی پارتی بوون چومه لق ئەوان نەیاندەزانی بەرنامەم چیه وایان دەزانی تەسلیم بوویمەوەو دەبمەپارتی وەزۆریش دڵخۆش بوون،مەڵبەند بووبووەلق چوینه لای گەنجێك دانیشتین یەکێك لەخزمەکانی من، وتی بەرێزئەو کوڕه ناوی فەقێ یەو جەلالیەو خۆی تەسلیم کردیتەوه ، زۆربەوەسفەی خزمی خۆم توڕەبووم وتم نەخێر من ناوی فەقێ نیم ناوم مستەفایه پێشمەرگەی یەکێتیم وه نەم توانیوه دەرچم ،کوڕه گەنجەکه زانی خزمەکەی من هەستی منی بریندارکرد وتی وازلەو مەسەلەیه بێنن، وتی برادەر چەند ساڵه پێشمەرگەی یەکێتی، منیش توڕەبوون مێشکی گرتبووم وتم ئەوەتی وەبیرمه. وتی چەند شەڕت لەگەڵ پارتی کردووه ؟ وتم ئەوەی پێ ڕاگەیشتبم، وتی بەرپرسیارەتیت لەناو یەکێتی چی بووه؟ وتم بریند و نەویم زۆردیوه وتی دواپلەت لەناو یەکێتی وتم: ئامیرفەوجی تایبەت، وتی به ئەمری سەرۆك بارزانی ئامیر فەوجەکان دەست به سەردەکرێن، وتم کارێکی باشه . لەگەڵ ئەو قسەیه نامەکەی مەسولی سوپام پێداو، نامەکەی شکاند و خوێندیەوه من نەمزانی چی نوسرابوو، دواتر وتی بەسەرچاوان نووسراوێکی نووسی و مۆرێکی لقی لێداو دایەدەستم وتی تەواو،خزمەکانی من سەریان سوڕما نووسراوەکەم خوێندەوه نووسرابوو بۆ هەموو بەرپرسەکانی پارتی فلان کوری فلان، کەس بۆی نیه دەستگیری بکات دیاره ئەوان نەیاندەزانی من و مەسول سوپا زۆربرادەرین، خزمەکانم منیان لەگەڵ خۆ بردە سەر دەربەند بەبەری مەرگەوه

واجبیان لەوێ بوو، زۆر هەوڵیاندا بزانن نووسراوەکە چی لێ نووسراوە پیشانم نەدان، من بۆ ماوەی سعاتێك لەلایان وەستام، زۆرنەمابوو مێشکم بتەقێت. زۆر نا مەسولانە لەگەڵ ڕێبوارانی خەرکی لای مەرگە دەجولانەوە، دار و بەردیان لێ بووبووە یەکێتی، دۆست و لایەنگری پارتیش تووشی لێدان و ماڵ تالان کردن بوونەوە، ڕەفتاری خزمەکانی من وەك ڕەفتاری دوژمنێکی سەرسەختی گەل دەجولانەوە، ڕەفتاریان ڕەفتاری بەعسیەکان بوو، لەگەڵ جەماوەر بە تایبەتی لەگەڵ خزمانی بەری مەرگەی، من لەنزیکەوە ئاگاداری خەڵکی تێکۆشەری ناوچەی مەرگەبووم و دەمزانی لە ئەنفالەکان چیان بەسەرهاتوە پیشتریش چەند مەردانە بەرگریان لەگەڵ و نیشتمان کردوە. ئەوپارتیانەی ئازاری ئەو خەڵکە تێکۆشەرەیان دەدا هەموویان کەونە جاش بوون من لەنزیکەوە دەمناسین چیتر نەمتوانی لەلایان بووەستم، وتمەخزمەکانم من دەچمە ڕانیە خۆم دەشۆم وتی: باشە زوو وەرەوە سواری سەیارەیەك بووم، بەرەو هیزۆپ لە هیزۆپ بۆ شەقلاوە لەوێ بۆچۆمان چومە گوندەژۆری لەرێگا پرسیارم کرد ئایە گوندەژۆری پارتی لێنە، وتیان بەڵێ پارتی لێنە، وتم بەرپرسی پارتی کێیە؟ وتیان ناوی: (هاشم عەبدوڵلایە) چومە گوندە ژۆری بۆماڵی کاك هاشم، لەوێ نەبوو، نانیان هێنا و نانم خوارد، باڵەکایەتی شتێکی جوانیان هەیە، کە میوانیان دێت یەکسەر نان دێنن میوان بخوا یان نەی خوات، ئێمەی خۆشناو لە ڕیزی میوان کەمتەرخەم نین، بەڵام پرس بە میوان دەکەین، دەڵێین ئەرێ ئەتو نانت خواردیە، ئەوەی باڵەکایەتی جوانترە، دوای نانخواردن وتم کاك هاشیم لە کێیە؟ وتیان لەلای برادەرانە منالێك چووە دووی، کاك هاشیم هات ماشەلای لێ بیت زۆرترسام، وێنەیەکی سەرۆك بارزانی لەسەر مەمکی چەپی بوو، وێنەی کاك ئیدریسی لەسەر مەمکی ڕاستی بوو وێنەی کاك مەسعوودیشی لە مەخزەنی تاقمی دابوو کۆمەڵێك شیعاری پارتی لە جلکوبەرگی دابوو، ڕەنگی زەردی زۆر بە کارهێنابوون، لەدڵی خۆم وتم: ئەورۆژەی چاوەڕێم نە دەکرد ئەورۆیە زۆرترسام بەخۆم وت فەقێ ئەقل بۆئەو ڕۆژەیە بەکاری بینە کاك هاشم گەیشت و سڵاوی کرد لەبەری هەستام و تۆقەمان کرد دانیشت زۆری بەخێر هێنام چاهات وچام خوارد لەدڵی خۆم گوتم فەقێ ئەقل بەکاربینە، وتم بەرێز کاك هاشم ئەوماڵەماڵی بەرێزتە، وتی بەڵێ، وتم بەرێزت مانای ماڵی خۆت دەزانی، وتی زۆریش، وتم کەوابوو قسەی خۆم دەکەم وتی فەرموو؟ وتم بەرێز من هەندێك پارەم لەشاری نەغەدەیە لەبەرئەوشەرەش ڕێگای حاجی ئۆمەران نیە ئەگەر ڕێم پیشاندەی وهاوکاریم بکەی مەمنون دەبم، سەیرەکە لێرەبوو من خۆم کردبووە ئەفەندی، یەکسەر وتی کاکە تۆجەلالی درۆم

لەگەڵ مەکە وتم برا هەونیمە، وتی باش دەزانم هەوی ، وتم بەڵێ هەوم چیت لەدەست دێت لەماڵی خۆت بیکەو منیش کێشەم نیە کاك هاشیم تۆزێك داما وتی کاکە فێرت لێکردم هیچم لەگەڵ تۆیێ ناکرێت خودادەزانی ئەوفێرەت نەکردبام دەست وپەلم دەبەستی دەمدایەوە دەست پارتی وتم چیت پێ باشە بیکە، وتی بەگوێم بکە لەورێگایە پارتی لێیە و یەکەکەی لێیە و ئەرتەشی ئێرانی لێیە توشی بەڵایەك دەبی مەچوو، وتم کێشەم نیە بەرێم کە وتی باشە باوەڕیکەن لەپیاوەتی خۆی فانیلەیەکی زۆرباشی وێدام وەك زەردێنەی هێلکە زەرد بوو نان و پێخۆریشی ویدام بەنەهێنی بەپێشم کەوت تاکولەگوندی بردمەدەرێ ڕێگای پیشان دام وتم کاك هاشیم زۆرسوپاست دەکەم بەیانی لەنەغەدەم ئیشالە، وتی نانا بەیانی لەناو جەلالیانی ئەزانم، ماڵی ئاوا ئێستاش دەڵێم سوپاسی دەکەم، ڕۆیشتم لەسنوور ئاوابووم گەیشتمە سەر کانێ سەربەزێرێ ئەوکانیە شوێنیکی زۆر خۆشە کەکاك هاشم بەرێی کردم وتی دەگەیە کانێك ناوی کانی سەربەزێرە مەشوورە تۆبەرەو دەستەراست برۆخوارێ کانیەکە ناو مێرگێك دایە دەوروبەری پرە لە گولی جۆراو جۆر پشوێکی چاکم دایێ،ئەوکانیە بەهاران کۆچەران روی تێدەکەن وەلەناو چەکە ئەوکانیە زۆر ناوی هاتوە لە ناو حیان شوێنی خۆی گرتوە وە شایانی ناو هینانیشە شوینەکەی زۆر خۆشە، دواتر بەرەوخوارەوە ڕۆیشتم دۆلێکم کەوتەپێش، گوندێکی گەورەبوو ناوم لەبیرچوە کوندێکی پرلەکانی و دارگوێز ئیوارەش بوو زۆرهیلاکیش بووم لامدایە ماڵێك وتم ماڵێ میوان رادەگرن پیاوێکی بەهەیبەت ودرێژ جەمەدانێکی ریشداری بەستبوو وتی فەرموو دوای چاکوچۆنی بردمیە ژوورێ لێی دانیشتم ، نانمان خوارد و وردە وردە کەتینە گفتوگۆ وردە وردە کەوتینەدونیای سیاسەت لەو دانیشتنە ئەوەی بیرم لینەدەکردەوە لێدانی مەقەرەکانی دیموکرات لەشاری کۆیە لەلایەن ئەرتەشی ئێران بەنەرمی نواندن لەلایەن یەکێتی نیشتمانی کوردستان، وردەوردە نزیك بووینەوە لەشەری براکوژی لەنێوان پارتی ویەکێتی بەزمانی سوتاوم بەملی شکاوم منیش خۆم ئاشکراکرد کە پێشمەرگەی یەکێتیم، کەرکەوت و کوندەدرا کابرالێم مۆربووەوە وتی حەیب نەبێت بەو شەوە دەرم دەکردی هەزارجوێن بەداروبەردی دا ئێوە وانەو وانەو ئابوواواتان کردبا منیش خۆم بێدەنگ کرد لەلایەك پێم خۆش بوو، ئەوکابرایە کوردێکی دڵسۆزە و بەرگری لە دیموکرات دەکات وتم با رقەکانی خۆی هەڵڕێژێ،ئەوکات ڕووداوەکەی بۆرون دەکەمەوە مام دەستی پێ کرد وتی ئێوە هەروانە و لەدووای شۆڕشی ئێران پارتیی شتێك نەماوە گەڵ ئێمەی نەکات ئەوەی پارتی لە شاری شنۆ و دەوروبەری کردی بە دەگمەن دووژمن وای نەکردووە،

**چەندان کارەساتی باس کرد کە پارتی ئەنجامی داوە لە کوردستانی رۆژهەلات وە وتی ئێوەش لەپارتیتان خراپ تر، کرد ئەوان واتە دیموکرات برای ئێوەنە و میوانی ئێوەن و زۆری تر، دیاربوو خۆی داوەشاند،وتم مامە گوێش لەمن بگرە با دوو قسە بکەم وتی دەی دەقسە بکە بەلام هەموویان درۆن! باوەڕیکەن کابراچەند تورەدەبوو قسەی دەکردن من لەدلدا ئەوەندە دلخۆش دەبووم، دلسۆزیکی بێسنووری بۆ گەلی کورد پێوەدیار بوو وتم مام وتی فەرموو وتم ئەوەی جەنابت باسی دەکەی هەموویان راستن، منیش وەك جەنابت پێم ناخۆشە منیش حەز ناکەم خوێن لەپەنجەی کوردێك بێت، لەشەڕی ناوەخۆ قسەیەکت بۆدەکەم باوەڕیکە ئەوقسەیەم نەلەترسانە و نەلەشەرمانە و نەپینە وپەرۆیە ئەگەر ئێران هاوکاری ئێمەی نەکردبا وەزعی ئێمە زۆرخراپ دەبوو لەگەل حکومەتی عیاق و و پارتی نالێم ئێمە هەلەمان نەبووە ئێمەش هەلەمان کرد دەبووایە کەپارتیمان لەهەولێردەردەکرد دەستمان کردبایەوە بەدانیشتن و کۆتایمان بەشەڕ هێنا با لەگەل پارتی هەم لەبەرژەوەندی کورد دەبوو هەم شەڕی براکوژی کۆتایی دات و هەنجەتیش بۆپارتی ورژێمی عیاق نەدەرەخساپەلاماری هەولێربدەن وەنەتورکیاو ئێرانیش ڕێ یان بۆ خۆش نابوو بێنەناوشەڕەکە من دەلێم ئەوە هەلەیەکی گەورەی ئێمەبوو وەهەلەی پارتیش زۆر لەهەلەکانی ئێمە گەورەتر بوو، بۆ لێدانی برادەرانی دیموکراتیش، من لەنزیکەوە ئاگادارم ئێران بەسەرکردایەتی یەکێتی ووت ئەوەپارتی جەیشی عێراقی هێنا و هەولێری گرتەوە ئەوەتورکیا بەهێزی ئاسمانی و تۆپ و دەبابە پەلامارتان دەدا، ئێمەش زۆرشتمان بۆ ئێوەکردوە ئێوە چی بۆ ئێمە دەکەن؟ دەبێت ڕێمان پێ بدەن لە دیموکرات بدەین لەشاری کۆیە ؟ وەزعی یەکێتی زۆرخراپ بوو، لە نێوان مان ونەمان! یەکێتی وتی باشە ئێوەش وەرن لە دیموکرات بدەن ئێران بە خۆکەوت لەدیموکرات بدات یەکێتی دیموکراتی ئاگادار کردەوە، شوێنەکانتان چۆل بکەن، بەلێ دیموکرات کەمپەکەیان چۆل کرد، ئێران بە هێزێکەوە هات لەلای چنارۆکێ کەمپەکەی موشەك باران کرد، کە جەماوەر زانی ئەوە هێزی ئێرانە و لە دیموکرات دەدات لەکاتی گەڕانەوە دزست ولایەنگرانی یەکێتی هێزەکەیان بەرد باران کرد چەندان برینداریان هەبوون، دووای گەرانەوەی ئەوهێزەی ئێران برادەرانی دیموکرات هاتنەوەو یەك کەسیش خوێن لەلووتی نەهات بەلکو وهاوکاریش کران زۆر و کەم بەلێ مامی من ڕووداوەکە بەو شێوەی بوو، وەسەرکردایەتی دیموکراتیش بەیان نامەیەکیان دەرکرد کە ئەوان گازاندەیان لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان نییە، باش بوو کابرا وردە وردە خاودەبووەوە دواتر بووینە برادەر زۆرگفتوگۆمان کرد بەیانی ڕۆیشتم، چومە قەمتەران**

**ئۆردیگایەك بوو کرابووەوە خێمەیکی یەکجار زۆری لێ هەڵدرابوو بەچەندان هەزارکەس لەژن ومنداڵ و پیرویەك کەوتەی لێ بوو، وەزعەکەباش نەبوو پیداوستی رۆژانە وەك پێوست نەبوو شوێنەکە زۆر ساردیش بوو، کاك نیاز دەرگەڵەیی ئیدارەی دەدان...کاك نیاز زۆر ماندووبوو لەئیدارەدانی ئەوهەمووجەماوەرە کاك نیازم دیتەوە وتی فەقێ ئەودووخێمە ماڵی منە پڕەلەخەڵك ناکرێت کەسدەربکەم ئەگەرئازای شوێنی خۆت بکەوە وتم کاك نیاز وەختی گلەیی وگازاندە نیە وەزعەکە دەبینم خەمت نەبێت،لەو ماوەیە کاك نیاز وبرادەرەکانی زۆرهیلاك بوون ئیدارەی چەندان هەزارکەس بە قسەخۆشە بەگیرفانی بەتار هەر لەبەیانی تائێوارە نیازدەرگەلەی دەگەڕاو لەهەرچرکەیەك چەندان کەس دەی وت کاك نیاز کاك نیاز، نەی دەزانی چاکوچۆنی لەگەڵ کێ بکات و گوێ لەکێ بگرێ؟ بە هەزاران کەس داخوازی لە کاك نیاز هەبوو ..داخوازی من لەکاك نیاز یەك شت بوو، پارەم نەبوو، لەلای پاکەت فرۆشێك ڕادەوەستام کە کاك نیاز نزیك دەبووەوە چەند پاکەتم هەڵدەگرت، دەم وت کاك نیاز وەرە پارەی پاکەتان بدە، خۆم پیشانی کاك نیاز نەدەداوە تاکو پاکەتم تەواو دەبوون.دووبارە وام دەکردەوە، شەوانیش لەماڵەخزمێکم دەنووستم، ڕۆژێکیان وتیان کاك فواد بەڕێوەیەبەرەو حاجی ئۆمەران ئەوەی من زانیومە گوایە پارتی ویستویەتی قسە بەدکتۆر فواد بکات لە تەلەفزیۆن کاك فواد ویستویەتی خۆی بکوژێت دواتر پارتی لەڕێی حاجی ئۆمەران ئاودیوی کردوو کۆمەڵێك لەبرادەران چون پێشوازیان کرد، کاك نیاز لەسەرداوای ئێمە زۆرهەوڵی دا کە ئەو هێزەی پێشمەرگە ڕەوانەی قاسمەڕەش بکات نازانم گیروگرفت هەبوو نەمزانی گیروگرفتەکەچییە؟ ڕۆژکیان برادەرێکم پەیدابوو کادیری خۆمان بەناوی هاورێ (مجید ) بردمەپەنایك و وتم هاورێ مجید دەنگ وباس چیە وتی لەو ڕۆژانە دەگەڕێینەوە تاکو شاری کۆیەو ڕواندز دەبێتە سنووری پارتی ئەقڵم قسەکەی نەبڕی، دواتریش وادەرچوو نەهێنیەکە لە کێ بوو نازانم؟ ڕۆژکیان کۆمەڵێك سەیارەی جۆراوجۆر هاتن وتیان بۆقاسمەرەش منیس سواری سەیارەبووم و لەگەڵ برادەران قاسمەرەش خۆت بگرەو هاتین، وردە وردە هاتمەوە بالیسان و لەکەپکی حەمەدئاغا بەرانبەرپی یەکتر بووینەوە دووبارە پارتی پەلاماری داینەوە ئێمەش پاشە کشەمان کرد ئەوجارەیان پارتی کەوتەلێدانی خەڵکی خۆشناوەتی و کوشتنی خەڵکی بێگوناح وەك کوشتنی میرئەحمەد مەلەکی لەگوندی توتمە پارتی زیاتر لە خەڵکی پارتی دەدا چونکە خەڵکی یەکێتی ڕایان کردبوو وەك ملای مەشوور و مەسەلەی گۆلکێ یان دەکرد! دەردکیان بەملاو پیاو ماقولانی ناوچەکەکرد مەگەر دووژمن وای کردبێت**

باوەڕبکەن دووژمن قەت ئەوکارەی لەگەڵ خەڵکی ئێمە نەکردوە باباسی نەکەین زۆر ناشیرین بوو چونکە کوشتن بۆ پیاوان باشترە لەسوکایەتی پێکردن . ئەوجارەشیان من هەر لەشێخ وەسانان مامەوە بەپارتی زانی، زۆری پی نەچو پارتی ڕای کرد من پێم وایە یەکێتی لە ڕانیە زێدەڕۆی کرد ئێمە نابووا وەك پارتی بکەین پارتی کەیفی خۆیتی ئەوجارەیان پارتی دەستی بەسەر کراو قاسم و زینەتیرو سۆرەپەل و کەپکی حەمەد ئاغادا گرت ئێمەش سەنگەرمان لەبەرانبەری گرت بۆماوەی زیاتر لە دە مانگ شەرەتەقەی دوور بەدوور بوو یەکێتی لەو ماوە زەمەنیە خۆی ڕێك خستەوە من پێم وابوو ئەو هێرشەی ئێمە بۆ هەستانەوەی شکەستی هەولێر بوو، شەوێکان لە هەموولایەك پەلاماری پارتیماندا لە قۆڵی کراوقاسم هێزەکانمان پێشڕەویان کرد تاکو نزیك گوندی مامەجەلکە جادەی هەریر شەقڵاوە، دەستی بەسەردا گیرا لەزینەتیر پێشڕەوی کرا تاکو سەروی هەریر، دۆڵی تالانە پاك کرایەوە، بەشی زۆری چیای سەفین گیرا، لە زۆر شوێنی تر پارتی شکەستی هێنا ئێمەشەولەپارتیمام دا بۆئێوارەکەی هیزی ئاسمانی تورکیا گەیشت، تەیارەکانی تورکیا پەلاماریان داین دیارە لەڕەباکانی شەکرۆك زیانێکی زۆرمان پیّ گەیشت شەهید کردنی سەید جەوهەریشی لێکەوتەوە ڕێژەی تەیارەکان یەکجار زۆربوو بەهەمووچەکێکی سەردەم لیان دەداین، ئێمە خۆڕاگرییەکی زۆرمان کرد چەندان کەتیبە تۆپی قورس لیمان نزیك بوونەوە بۆنموونە کەتیبەیەکیان لە مەتاری هەریر بوو ڕۆژانە تۆپ بارانیان دەکردین ئێمە لە پەلاماردان چوینە قۆناغی بەرگری من دووجار بە مەلانجیمم وت لەگەڵ برادەرانی سەروی خۆت دانیشە ئێمەپاشەکشە بکەین باشتر پچینەوە شوێنەکۆنەکانی خۆمان،نازانم مەلانجیم پەیامەکەی منی گەیاند،یانا؟ شەوێکیان لە گۆر بەشیلان پارتی پەلاماری داین لە چوار لاوە شەڕەکە زۆر گەرم بوو دواتر پارتی شکا زیانەکانی یەکجار زۆر بوون باوەڕ بکەن من بۆ پێشمەرگە کوژراوەکانی پارتی زۆر گریاوم، چونکە زۆریان لیّ کوژرا بوون، من ئەوکاتیش دەمزانی ئەوشەڕە لە ناوشیاری خۆمانەو دەستی دووژمنانی تێدایە، دەشمزانی نەبوونی و هەژاری ئەوکات وای کردبوو، خەڵکی بۆ نان پەیداکردن بەشێکی زۆر بووبوە پێشمەرگە لە هەردوولامان، زیانی ئێمە شەهید کردنی مەلانەجیم بوو، بۆ مێژوو من زۆر نزیك بووم لە مەلانەجم مەلانەجم کەسێکی ڕۆشنبیری سیاسی قەومی بوو، زۆرجار بەئاگاداری مەلانەجیم خەڵکی پارتیم نەجات داوە لە کوشتن بۆ پارتی نا بەڵکوو بۆ کورد، مەلانەجیم لاری نەبوو ،لەکارەکانی من، باناویان نەبەین من و مەلا بۆ کورد شتمان کردووە، بە نەهێنی با بەنەهێنیش بمینێتەوە، دوای ئەو شەڕە پارتی وازی لەپەلامار

**هێنا تاکو دەبابەکانی تورکیا پەیدا بوون، دیارە دەبابەکان هاتن و ئێمەش پاشەکشەمان کرد، وردە وردە بەهیمەتی دڵسۆزانی گەلەکەمان و دۆستان مام جەلال بە ریشسپی لە تورکیا هاتەوەو چوە لای بەرێز مسعود بارزانی،لەشەڕی براکوژی دوور کەوتینەوە دیارە شەڕی سارد بەردەوام بوو، ئێستاش ئەو شەڕە هەیە، پارتی وای کرد یەکێتی بەرەو لاوازی و لێك هەڵوەشان بچێت، دیارە ئەو سیاسەتە ڕۆژێك دیێت بە رۆکی پارتی خراپتر لەیەکێتی دەگرێتەوە چونکە لاوازی یەکێتی بە زەرەری پارتی تەواو دەبێت ئەوڕۆنا بەیانی لاوازی پارتی و یە کێتی بە زەرەری کورد تەواو دەبێت ئەوە پێشبینی منە هیوادارم واڕوونەدات، چونکە هەموومان پێکەوە جوانین، باوەڕی من وایە پارتی چەند ساڵ هەوڵی داوە یەکێتی لاواز بکات دەبێت ئەوەندە ساڵەش هەوڵ بدات بۆبەهێزکردنەوەی یکێتی ئەگەر وانەکات زۆر زەرەر دەکات، من وەك کورەجووتیارێك زۆرم پێباش بوو پارتی و یەکێتی ئەو ڕێك کەوتنەیان کرد کارێکی باش بوو: (( ئەگەر درێژەی پێ بدەن لە خزمەتی گەل و وڵات سیستەمی سیاسی دیموکراتی پیادە بکەن لە کوردستان )) ئەوەمن دەڵێم: هەر کارێکی خراپ کرابێت لە ڕابردوو لەلایەن گەلەوە لەبیر دەکرێت و دەبنە بەردی بناغە لە مێژووی گەلەکەمان مێژووی گەلەکەمان بەشانازی باسیان دەکات، وەزۆر شتی باش و کەم وینەش کراوە خۆشتان باش دەزانن زیاتر لە (٣٠) ملیۆن کورد چاوی لە ئێوەیە ئومێدی کەسوکاری شەهیدان ئێوەی بەڕێزن، من لەناو شەڕی براکوژی ژیایمە جگە لەسەرکردەکانمان خەڵکێکی زۆری تاجیری شەڕ لەناو گەلی کورد هەیە هیوادارم سەرکردەکانمان ئاگایان لەو تاجیرانە بێت وانەکرێت جارێکی تر بازاڕیان خۆشبێتەوە، چونکە بەشێکی میللەتیش هەر بەناو مرۆڤن وەمن لەمێژە باوەڕم وایە پێوستمان بە دکتاتۆرێکی دڵسۆز هەیە، دیارە ڕێککەوتنی پارتی و یەکێتی ڕۆژ بە ڕۆژ لە خزمەتی گەلەکەمان بوو بە هەموو کەمو کورتیەکانیشەوە، دیارە بەزەرەری یەکێتی تەواو بوو، بەڵام کورد و کوردستان لە یەکێتی گەورەترە ...!**

*** *** *** ***

**دوای گیرانی سەدام حسێن ڕۆژێکیان کوڕێکی بەژن مام ناوەندی سەر ڕووتاوە لە لای من پەیدا بوو، کێ وەسفی منی بۆ کردبوو، ئەوەیان نازانم، هات و وتی تۆ فەقێ شێخ وە سانی وتم بەڵێ وتی مۆڵەتم دەدەی پێکەوە دانیشین وتم بەڵێ پیاوێکی سادە، نەرموو نیان وتی من ناوم( کامەران سابیرە) خەڵکی سلێمانیم ئەگەر هاوکاریم بکەی، منیش وتم چیت دەوێت هاوکاریت دەکەم گوتی من بەدوای چەند کەسێك دەگەڕێم ئامادەیان بکەم بۆ ڕوبەڕووبوونەوەی سەدام لە**

**مەحکەمە وتم بەڕێز من لەئاسمانان چاوەڕێی کەسێك بووم ئەوا لێرە تۆم بەدەست کەوت ئەمرکەو من جێبەجێی دەکەم، ئەوەی لەتوانام بێت خۆبەخشانە یارمەتیت دەدەم، کاك کامەران بۆ زیاتر لە دوو ساڵ بەردەوام هات و چۆی منی دەکرد بە شێوەیەکی نیمچە نەهێنی منیش ئەو نەهێنیەم پاراست تەنیا قسەم بۆ( حاکم سالح بەڕێوبەری ناحیەی بالیسان کرد ) چاوپێکەوتن لەگەڵ زۆریان کرا کە بریندارى کیمیاوى بوون ڕۆژێکیان سەردانی کردم کە چەند کەسێك بە نەهێنی ببەمە مەجەمەع دەوایری چوارقورنە، منیش ئەو کارەم کرد کە چوینە ئەو شوێنە چەند زانایەکی لێکۆلینەوە ی ئەمرکی لەوێ بوون یەکترمان دیو بەسەرهاتەکەیان بەبریندارەکان گێڕایەوە دەبووایە من خێزانی خۆم کردبا سوتەمەنی ئەوکارەم بۆ ئەوەی بتوانم تەکلیف لە خەڵکی بکەم ئەو لێکۆڵینەوە زۆری خەیاند هەرچەندە من ئەوکات دەست کورت بووم دەبووایە زۆر شت بکەم بۆ ئەوەی ئەوانەی دەم بردن دڵیان ڕازی کەم و نازیان هەڵبگرم چونکە ئێمەی کەسوکاری شەهیدان لە(١٩٩١ )وە ئەوەندە ڕۆژنامەو کەناڵی تەلەفزیۆن سەردانیان دەکردین کەسوکاری شەهیدان و برینداران بێزار بووبوون، واشیان دەزانی ئەوانەش بەهەمان شێوەی ئەوان دێن ودەڕۆن هیچ سوودیان نابێت، یان زۆری خەڵکی چاویان لەوە بوو، شتێك وەرگرن یان ئەوان شتێکیان بۆ وەرگرن، منیش دەمزانی ئەوەیان مەسەلەیەکی زۆر گرینگە و سەرەتا نەشم دەتوانی نەهێنیەکە بدرکێنم چونکە کاك کامەران و برادەرانی حاکمی ئەمەریکیەکان دەیان ویست چاو پێکەوتن لەگەڵ زۆر کەس بکەن، بۆ ئەوەی پوختەیەك هەڵبژێرن، وەك کاریگەری کیمیای لەسەر دیاربێت، توانای گفتوگۆی هەبێت، ئەو بەسەرهاتەی کە دەی گێڕێتەوە کاریگەری لە هۆڵی مەحکەمە و دەرەوەی مەحکەمەی هەبێت، کاك کامەران ماندوو نابوو پیاوێکی زۆر دڵسۆزو نیشتمانپەروەر بوو، دواتر کۆمەڵێك حاکمی خۆشمان لەگەڵ کومەڵێك لێکۆڵەر وەك حاکم ئەفراسیا و کاك ڕزگار و زۆری تر کە بەداخەوە ناویانم لەبیر نەماوە، هەموویان لە سلێمانی سەردانیان دەکردم . منیش ئەوەی لە توانام بوو خزمەتم دەکردن و کار ئاسانیم بۆ دەکردن .**

**ڕۆژکیان کاك کامەران سابیر دەرکەوت وتی فەقێ لەو قایمەیە پێنج کەسم دەوێت بچنە بەغدا، بۆ شاهیددانی ڕووداوی ( ١٦ – ٤ – ١٩٨٧ ) لەسەر کیمیاباران کردنی گوندی بالیسان و شێخ وەسانان، ئامادەکراوەکانیش دەبێت لەهەردوو گوند بێت کاك کامەران ڕۆیی ئەوکات، لە بەغدا ئاگر دەباری زۆر مەترسی دار بوو، بەتایبەتی ناوچەی سەوز لەبەغدا بەداخەوە لەو قایمەی کاك کامەران بەمنی دا زۆر کەس ئامادەنەبوو بچێتە بەغدا بۆ شاهیدیدان سەرەتای**

**کارەکەم لەماڵی خۆم دەست پێ کرد، چووم لەگەڵ خێزانم دانیشتم دەبووایە بەشێوەیەکی وا بۆ مەسەلەکە چوبام بەو مەبەستەی بتوانم خێزانی خۆم ڕازی بکەم، بچێتە بەغدا، بە خێزانی خۆم گوت گەورەم ئیشێکم پێت هەیە زۆر گەورەیە دەبێت بەقسەم بکەی؟ تۆ خۆت بریندازی کیمیاوی کوڕێکت شەهیدە، برات شەهیدە، برازات شەهیدە، خەزوورت شەهیدە، زیاتر بیست ساڵە مەترسی کوشتنت لەسەرە، ڕۆژت هاتووە تۆڵە تۆڵەی خۆت و کەسوکارت و میلەتی کورد بکەیەوە وتی بەچ دەتوانم تۆڵە بکەمەوە وتم سەدامیان لەناو قەفەز کردوە لۆی نیە یەك قسەبکات چاوەڕێی تۆنەبچی شاهیدی لێبدەی بۆئەوەی لەسێدارەی بدەن وەلەبەرخاتری من دەبێ بچی مەردانە وەڵامی دامەوە وتی ناو (ئاگریش بێت دەچم ) من زۆردڵ خۆش بووم چونکە بووە پاساوێکی باش داوالەخەڵکیش بکەم، یك سەر چومە ماڵی مام عەلی مامەشێخی ئەو قسانەی بۆ خێزانم کرد بۆ ئەوانیشم دووبارەکردەوە وتم مام عەلی دەبێت خۆت و خێزانت بچن بۆ بەغدا وەك شاهید لەسەرسەدام وتیان بەچاوان دیارە لەو چەندساڵە حاکم صالح حەیدەری لەدوور و نزیك ئاگای لەجوڵەجوڵی من بوو، زۆر هانی دەدام و دەست خۆشی لێ دەکردم مام عەلی بەردەستی حاکم صالح حەیدەری بوو لەکاروباری ناحیە، چومە لای حاکم وتم من بۆلای مام عەلی چویمە بەخۆی و خێزانی ئامادەباشی خۆی پیشانداوە بچێتە بەغدا، دەترسم پشێمانی بکەنەوە پێم باشە لەگەڵم بێی جەنابیشت دووقسەی خێر بکەی وتی بەچاوان چوینە لای ماڵی مام علی شێخە حاکم قسەی زۆر باشی کرد زۆری هاندان گەڕاینەوە ناحیە ئەوجارەیان حاکم الحم بردە ماڵێکی تر بەناوی (بەدری سەعید خدر ) بە هەردووکمان توانیمان قەناعەت بەپ کە بەدری بێنین، دیارە کاریگەری حاکم ساڵحی لەسەر بوو، دواتر ئاگاداری (بەهیە مستەفا مەحموود)یشم کەردەوە مەردانە ئامادەی خۆی دەربڕی، بۆ ماوەی یەك هەفتە ڕۆژانە داوام لە حاکم صالح دەکرد سەردانیان بکەین، کە کەس پەشیمان نەبێتەوە و هەندێك شتیان فێر بکەین وەك شەرم مەکەن لەو دکتاتۆرە مەترسێن ئەو ناتوانێت هیچ شتێك بکات، بەبێ حاکم بۆی نییە قسەش بکات، دیارە ئێوە ڕێزتان دەگیرێت و دەچنە مێژووی گەلەکەمان و زۆر شتی تر، چونکە ئێمە دەمانزانی بەڕاستی کەسێکی مرۆڤکوژی وەك سەدام لەرووی نەفسییەوە کاریگەری هەبوو لەسەر ئەو بەدبەختانەی خۆمان، دەبووایە زۆر شتیان لەگەڵ باس بکەین، بە خۆم و حاکم صالح ئەو کارەمان کرد کاریگەریشی هەبوو، من لێرە سوپاسی کاك کامەران سابیر دەکەم، کە زۆر بەو کەیسە ماندووبوو زۆر دڵسۆز بوو وە سوپاسی حاکم صالح حەیدەریش دەکەم کەهاوکارم بوو، چەند شەوێك**

پێش بچنە بەغدا من دەچومەلایان خۆم دەکردە حاکم پرسیارم لێ دەکردن، وەدەم وت بەو شێوەیە وەڵام بدەنەوە هەموویان لە چاوەڕوانی توشی حالەتیکە نەفسی بووبوون قەلەق بوون زۆر هەوڵم دەدا ئەوقەلەق بوونەیان بڕەوێنمەوە بۆنموونە پرسیارێك دێنمەوە بەخێزانم وت لەوانەیە موحامیەکانی سەدام پرسیارێکت لێ دەکەن ئایە شێخ وەسانان چەند لەئێران نزیکە لەوەڵامدا بڵێ لەئێران دوورە و لە هەولێر زۆر نزیکە، بەخێزانی خۆم وت بە حاکم بڵێ من لەسەدام باشترم، کورد لەسەدام بە وژدانترە، ئەو سەربازانەی ئێمەیان ئەنفال زیندە بەچاڵ کرد هەر هەمان سەرباز بە هەزاران بەڕەزیلی کەوتنە بەردەستی کورد لە ساڵی ١٩٩١ نەمان کەشتن. بەڵکوو ڕێزمان گرتن هاوکاریمان کردن بۆ ئەوەی بچنەوە ناو ماڵ و منداڵی خۆیان کفتەم بۆ مناڵەکانی خۆم لێنابوون، نەمدایە مناڵەکانی خۆم دامە سەربازەکانی تۆ! لەکاتی خێزانم ئەو قسەی بەسەدام گوت، سەدام دەبووایە شەرم بیگرێت داوای لێبووردن بکات، بەخێزانمی گوت عەفیە عەلەیەك.

من مەبەستم لەو چیرۆکە ئەوەبوو بەعەرەب و جیهان بڵێین ئێمەمرۆڤ کوژنین بەڵکوو بەرگری لە خۆمان دەکەین دیارە ئەو چرۆکە ڕاستییکی مێژوویيە، کە کورد سەربازەکانی سەدامیان نە کوشتن بە مناڵان دەمانتوانی بیان کوژین .

ئەوەبوو کاك کامەران سابیر وتی بەیانی بیانهێنە سلێمانی فلان شوێن شونێکیان بۆ ئامادەکردبوون، ئەوانم بردن من گەڕامەوە بۆ بەیانی هێزێکی ئەمەریکی لەمەتاری سلێمانی وەریان گرتن و بەرە و بەغدا بەرێ کەوتن ئێمەش ناوەناوە پیوەندیمان پێوە دەکردن تاکو ئەو ڕۆژەی ڕاستەوخۆ دادگا دەستی پێ کرد، من زۆر دڵخۆش بووم، چونکە کامەران زۆر شتی بۆ باس کردبووم بەنەهێنی دەمزانی کارەکەبەکوێ دەگات، دوای تەواو بوونی کەیسەکە ئاگاداریان کردمەوە، بچم لەسلێمانی بیان هێنمەوە، ئەوەبوو هێنانمەوە پێشوازیێکی باشم کردن، خەڵکێکی زۆر دەست خۆشیان لێ کردین، مامۆستا ئەحمەد و ئەدیبەخانی خێزانی دەسکە گوڵێکیان بۆ هێنناین، بەداخەوە هەموو حیزب و حکومەتی هەرێم خەویان لێکەوتبوو، تەنیا ئەدیبەخان بە خەبەر بوو لە و میللەتە، دیارە خەوێکی قورسیان لێکەوت بوو !!!

باسی هەندێك شت ناکەم کەلەتوانای من نەبوو کردم با ئەوەیان بۆگیانی شەهیدان بێت، دوای ئەوە کاك کامەران داوای لێ کردم هاوکاری بکەم چەند کەسێکی تەوانەی لە گوندی وەرە خاوەن شەهید و برینداربووینە ئەمادەبکەم یان هاوکاری بیم خۆشبەختانە لەوەشیان سەردانی بەرێز مامۆستا مەلاجەمالم کرد، کە خەرکی گوندی وەرەبوو مەردانە ئامادەباشی خۆی دەربڕی

مامۆستاجەمال ئەویش کەسێکی ئامادەکرد، کە خەڵکی گوندی وەرە بوو بەناوی ( سیامەند حەمەدەمین)لە گوندی وەرێ، توانیم کارمەندێکی خۆم کە بریینداری ئەوچەکەبوو لەگوندی وەرە، خەڵکی گوندی توتمە بوو ئامادەی بکەم بەناوی ( فاخیر عەلی ) وە ژنێکی تر کە ئەویش برییندار بوو قەبریشیان بۆ لێد بوو لە کاتی بریینداری دواتر زیندی بووەوە و نەمرد بەناوی ( عایشە حەمەدمین گوندی توتمە)بەڵێ ئەوخزمانەش چونە بەغدا بۆ شاهیدیدان هەر بەهیمەتی کامەران سابیر ...هەرچەندی باسی( حاکم کامەران سابیر ) بکرێت لە دڵسۆزی گەلەکەی تەواو نابێت، دیارە شاهیدحاڵەکان بەرنامەیان بۆداندرا بوو، کە هەرکەسە و چیرۆکی خۆی باس بکات چی بەسەرهاتووە؟ بەڕاست و دروستی سەدام لە هەموو جەلسەکان قورئانی پیرۆزی پێ بوو، مەلاجەمال وەرەیی قسەیەکی جوانی کرد بە حاکمی وت بەرێز حاکم دیارە قورئانەکەی سەدام و قورئانەکانی کوردستان هەبوون جیاوازن؟ سەدام بەهەزاران مزگەوت و قورئانی کوردستانی سوتاند، کەئەو قسەیەن زۆر کاریگەری لەسەر سەدام هەبوو زۆرپێی شەرمەزار بوو.

*** *** ***

دیارە بالیسان و دەوروبەری لە لایەن حکوومەتی هەرێم و بەتایبەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان شوێنێکی بەرچاو بووە وەك زۆر شوێنی تر لە کۆمەك و دڵسۆزی بۆ شۆڕشی گەلەکەمان هەرچەندە ئەرکێکی نیشتمانیش بووە، چاویان لەوە بوو شتێك بۆ دۆڵی بالیسان بکەن، ئەوەبوو کاك کۆسرەت وەك وەفایك بڕیارێکی بوێرانەی دا لە (٢٨- ١٢ - ٨ ١٩٩، مرسومی بۆدەرچوو بالیسان بکرێت بەناحیە، راستەو خۆ خرایە سەر پارێزگای ئەوکاتی کۆیە، لەلایەن بەڕێوبەرانی کۆیە وەك مامۆستا بەکر و کاك مەجید میرخان و کاك رێبین و مامۆستاجمال و مامۆستاموحسین و مامۆستا ڕەفیق و زۆری تر نە ئێمە لەلای ئەوان غەریب بووین وە نە ناحیەی بالیسانیش لەلای ئەوبەرێزانە غەریب بوو، زۆربەیان لەناوچەکەمان تەمەنێك ژیابوون خەڵکی ناوچەکەیان بەتەواوەتی دەناسی زۆر بەدڵسۆزانە کاریان بۆ دەکردین ناحیەی بالیسانیان بە ماڵی خۆیان دەزانی، زۆرشتی مەحاڵیان بۆ کردین، چونکە شار دروست کردن لە سفرەوە زۆری دەوێت، بە قسەخۆشە! قوتابخانە لە سێزدە گوند کرایەوە، حەوت بنکەی تەندروستی دروست کران مەجەمع دەوایر دروست کرا، بینای مەکتەبی متەوەستە دروست کرا، بەشەناوخۆیی قوتابیان دروست کرا، بە هەمووپێداوستیکەوە ، مەکتەبە ساز کرا، پێداوستیەکانی ڕێکخرا، بەسەدان کەس بە هیممەتی کاك کۆسرەت و برادەران وەك شێخ مەزهەریش بەشی

**تیدابوون تەعین بوون. ئەمە بووە بووژانەوەیەکی گەورە لە ناوچەکەماندا کۆمەڵێك دوکان دروست کران، جادە بۆ هەموو گوندەکان چەو ڕێژکرا بۆ ئەوکات زۆر باش بوو، ئەوەی باسم کرد بەشێکی کەمە... زۆر شتی تر کراوە وەك نەخۆشخانەی بالیسان کە دکتۆر محەمەد خۆشناوی دەوری بەرچاوی هەبوو لەو کارەگەورەیە.**

**دیارە لە بەرێز کاك کوسرەت و ئەو بەرێزانەی ناوم هێنان ئەوانە بوونە هۆی دروستکردنی شارێك لە دۆڵی بالیسان وەك وەفایك وەبەوەفاش بوون من تامردن سوپاسی ئەوبەرێزانەو ئەوانەی دەستیان هەبووە لە ئاوەدانکردنەوەی بالیسان و دەوروبەری دەکەم بەراستی جێگای ڕێزن من وەك شاهید حالێك شاهیدی دەدەم درێخیان نەکردوە سوپاس بۆئەو وەفایە بۆ گیانی شەهیدان و کەسوکاریان خەڵکی تێکۆشەری ناوچەکە، ئەوەدەوری برادەرانی سەرەوە وەباسی برادەرانی ناحیەش بکەین .. دیارە لەسەر شوێنی بنیات نانی ناحیە هەندێك وردەکێشە سەری هەڵدا ئەوەی دەوری بەرچاوی دی کە شوێنی ناحیەی ئێستا بکرێتە ناحیە دەوری بەرچاوی هەبێت شەهید مەلا خالید دەوری بەرچاوی هەبوو و یاسین بالیسانی و منیش هەمان بۆ چوونی ئەوانم هەبوو، دیارە کۆمەڵێك خەڵکی دڵسۆز گوێیان لێ گرتین و خەڵکی بالیسانیش کاریگەری مەلاخالیدیان لەسەر بوو، ڕەزامەندیان دەربڕی چونکە جوتیار زەوی خۆی زۆر خۆش دەوێت ماڵیان ئاوابێت ڕازی بوون .هۆی ئەوشوێنەی هەڵمان بژارد من لەگەڵ مەلاخالید دانیشتم چەند نموونەیەکم بۆ هینایەوە وتم مەلا خالید ئەگەر ناحیە ببەینە شوێنی تر دواڕۆژ وەك (مەرگە و بنگردی لێ دێت یان وەك سورداش لابەلا دەبێت و نابێتە شار یان وەك بێتواتەی لێ دێت، مەلاخالید وتی ئەوە بۆچونی منیشە. ڕێك کەوتین لەسەر شوێنی ناحیە، حاکم صالح وەك مودیرناحیە لە ١٥- ٤- ١٩٩٩، دەست بەکار بوو، بنکەی ئاسایشیش ڕێکخرا، هاوڕێ کاوە بووە مودیری ئاسایش، منیش بوومە ئەفسەر لەهەمان بنکە دامەزرام... شوێنمان نەبوو، بەرێز مام جەلال لەچوارقورنە کوبوونەوەیەکی ئەنجام دا و بەرێو بەری ناحیە حاکم صالح داوای بینای کردبوو، مام بەتوندی وەڵامی دابووەوە وتبووی برۆ خێمەیەك هەڵدە و ئەوە ناحییە ! ئەوەبوو ناحیەلە کاولەئاشی ماڵی مەلاخالید داندرا، بنکەی ئاسایش لە کاولەخانوویێکی مام حسێن شینکۆ ڕێك خرا دەست بەکار بووین. یەکێك لەشتەسەیرەکان کە ڕووبەڕوومان دەبووەوە، بە دوای کەسێکی سەرپێچی کارماندا ناردبا دەچووە کەرتی ڕێکخستن، ئەگەر ئەوان ئەمریان کردبا ئەوە ناوبراو سەردانی دەکردین، بە پێچەوانە ئەوە کابرا بۆلامان نەدەهات و منەتیشی نازانین!**

ئێمەش دەستەڵاتی گرتنمان نەبوو، ئەو چیرۆکانە زۆرن ماوەیەکی زۆری ویست، بەشێك لە جووتیاران گاڵتەیان پێ دەکردین باوەڕیان بەو ناحیە نەبوو، هۆیەکەشی ئەوە بوو ئێمە ناحیە بووین و خاوەنی شوێنی خۆشمان نەبووین، چەند نموونەیێك دینینەوە: حاکم سالح حەیدەری، سەیارەی نەبوو قەمەرەیەکی بەکرێ گرت بوو، هاتوچۆی پێ دەکرد لە گوندی بێراوە مەکتەبمان کردبووەوە، مەکتەب لە هۆڕێکی تاژەڵان بوو، مامۆستا عەلی بێراوەیی تەنەکەیەکی وەك مێز بۆخۆ دانابوو، هەر قوتابیەو تەنەکەیەکی هە بوو بۆ دانشتن، دەرسیان لێ دەخوێند. ئەتوانین نموونەیەکی تر بینینەوە، شارەوانیمان هەڵبژارد سەرۆکی شارەوانی لەبەر نەبوونی مووچە و نەسریە و بێسەیارە و ئالیات وازی لەکارەکەی هێنا و برادەرێکی ترمان دانا، بە ناوی حەسەن مەلا زادە . حەسەن مەلازادە بەهیمەت بوو، چەند ساڵە ئەوشارە خزمەت دەکات. نموونەیکی تر: بنکەی ئاسایش لە خانووی مام حسین دابوو، خانووەکە ئەوەندە خراپ بوو، لەپایز تاکو بە هارێ من نەمتوانی لەسەر مێزی خۆم دانیشم، لەبەر دزۆپان(دڵۆپان) بەڵام ئێمە زۆر بەدڵسۆزانە و پشت بەخۆ بەستن هەنگا و بەهەنگاو بەرەو پێش چوین.

دیارە ئێستا بوویتە شارۆچکە و زۆر شتی بۆ کراوە، دەشکرێت کەموکورتیمان هەبوویێت ... دوای بڕیارەکەی کاك کۆسرەت من و هاوڕێ کاوە بووینە ئەفسەری ئاسایش،دوواتر هاوڕێ کاوە وەك لێپسراو، من وەك ئەفسەر دەنگێك پەیدا بوو کەوا دەورە بۆ ئەفسەران دەکرێتەوە، سەیرەکە لەوەبوو ناوی من لەودەورەیەدا نەبوو، بەبێ دەستی خۆم، بەبێ ئەوەی من لەسەرخەتی کەسیان بم منیان خستبووە سەرخەتێك ... ڕۆژکیان چومەسلیمانی و کاك مستەفای سەید قادر وەزیری ناوەخۆ بوو، سەردانم کردوو کێشەکەم کۆتایی هات، چومەوە بەڕێوبەرایتی گشتی ئاسایش، دووبارە دەیان ویست بە ناوی نەبوونی شەهادە بێبەشم کەن لەدەورە، منیش پێم وتن برادەرینە هەرشتیك بکەن من وازنایەنم و چارنیە دەچمەدەورەکە، خۆشم دەناسم لەودەورەیە سەرکەوتوو دەبم، هەرچۆنێکی هەبوو ڕازی بوون. نوسراویان بۆکردم چومە قەڵاچۆلان بۆ ماوەی زیاتر لە (٧) مانگ، بەردەوام بووین،دەرسەکان زۆرقورس بوون، هەمووی یاسایی بوون، ئەوەندەی وەبیرم ماون لیکۆڵینەوەی تاوان،بەڵگەی تاوان، یاسای خانەنیشینی پۆلیس، ئسوولی موحاکەماتی عەسکەری، قانونی عقوباتی عەسکری، مافی مرۆڤ زۆریتریش دەبووایە من کارێك بکەم ئاسایش و ئەفسەرەکان سەرسام کەم منی نەخوێندەوار بتوانم بە زیرەکی خۆم دەرەجەیەکی باش بینم، دیارە ئەوەش بۆم ن باریکی لەسنوور بەدەر قورس بوو، هەرچۆنێکی هەبوو لەکاتی ئیمتیحان وەك ململانە لەگەڵ

**دەوروبەر پیش هەمووکەس وەڵامی پرسیارەکانم دەدایەوە و قاعدم بەجێ دەهێشت مامۆستاکان سەریان سورمابوو، لەکۆتایی ئیمتیحانەکان من بەپلەی باش دەرچوم، نزیکەی چل ئەفسەر لە زۆربەی دەرسەکان کەوتن کە بەشی زۆریان شەهادەیان هەبوو، ئەو چل کەسە بەواستە دەرچون، لەو هیمەتەی من ئەو بەرپرسانەی حەزیان بەمن ناکرد وازیان هێنا، سەیرەکەش لەوەی بوو وایاندەزانی من لەتەکەتولی فلانم ئەوەی سەیرە! من بەژیانم تەکەتولی کەس نەبوویمە، وەتاماوم ناشی کەم! چونکە هەمووخەڵك بەپیاو دەزانم بەڵام کەس لەخۆم بە پیاوترنازانم، ببمەپیاوی، دوای ماوەیەك دەوریکی کادیران کرایەوە کاك نیاز بەرێوبەری پەیمانگاکە بوو پیاوێکی زیرەك و لێزان بوو پیاوێکی ئیداریش بوو دەورەکەن زۆرگرینگ بوو، چەندان بابەتی باشی تیدابوون وەك : ئەمنی قەومی، دیبلۆماسی، هونەری مامەڵە، جوگرافیاسیستەمی سیاسی، پەیوەندی کۆمەڵایەتی ،مێژووی کورد، رای گشتی...تاد.... زۆربابەتی تر دوای ئەو دەورەیە پلەی سەربازین گەڕایەوە، من کرام بە ملازم ئەوەل، کمترین پلەم پیدرابوو ڕێژیکی زۆر خەڵك بۆیەك ڕۆژیش پێشمەرگەنەبووە کرابوونە نەقیب و ڕاید و بەسەرەوە لەلای هەمووبرادەرەکانم ئەوڕووداوەی من سەیر بوو ئەوهەمووتەمەنەو ئەوهەموو ماڵ ویرانیەی من و کۆمەڵێك شەهید، خەڵکیان کردبووە نەقیب گونی خۆی و گیزەری لەیەك دەرناکرد یەك ڕۆژیش پیشمەرگایەتیشی نەبووە، یەك فیشەکی بەداگیرکەروەنەناوە،ڕۆژێکیان چومە لای مامۆستا سەیفەدین وتم مۆستا جەنابت لەنزیکەوە من دەناسی کێشەم چییە؟ حاروحیسابی من وایە مەبەستم پلەنییە لەدەوروبەر هەست بەشکەستی دەروونی دەکەم، کۆمەڵێك قسەی بۆ کردم کەمن ئاگام لێنیە و زۆر لەوقسانە، وتم هیچ چارەی نییە وتی نەخێر، وتم مامۆستا سەیفەدین من لە(١٩٩٢) پلەم نەقیب بووە، لەسەربازی ماقوڵنیە لە(٢٠٠٠ ) من پاشەکشە بکەم بۆملازم ئەوەل دیارە لەو سەردانەی من زۆر نەرمونیان بوو، کە بێ ئومێد بووم لەلای مامۆستا سەیفەدین، چوومە لای کاك کۆسرەت کێشەکەم بەدرێژی بۆم باس کرد دیار بوو کاك کۆسرەت پێی ناخۆش بوو، نامەیەکی دامێ بۆ مامۆستاسەیفەدین بە کراوەی دایەدەستم شتی باشی تێدا نوسی بوو، وتی: ئەگەر مامۆستا سیفەدین چارەسەری نەکرد هەر ئەمڕۆ وەرەوە لام، دووبارە چومەوە لای مامۆستا سەیفەدین، ئەوجارەش بەرێزەوە پیشوازی کردم، منیش نامەکەی کاك کۆسرەتم پیشان دا چاوی پیکەوت دیار بوو دەست خەتی کاك کۆسرەتی ناسی مامۆستاسەیفەدین چەند سۆرە دوو ئەوەندەی تر سووربوو کۆنترۆڵی لەدەست داو دەستی بەقسەکرد قسەی ناشیرین و توند،دواتر قسەیکی بەمن وت پیم**

وایه تامردن ئەوقسەیە هەموو ڕۆژێك لە دەرگای مێشکم دەدات و ئازارم دەدات تاکو مردن،لە خەفەتی ئەو قسەیەی مامۆستا سەیفەدین گریانێك گرتمی بە ژیانم بۆ کوڕوباوکیشم نەگریاوم، کە شەهید بوون منیش قسەی خۆم کردن کورد دەڵێت : پردەبێتەوە جێی خەنجەران پرنابێتەوە جێی کەسەران. هەستام و چومە دەرێ بەبێ خواحافیزی لە شوێنێك ڕاوەستام، ئایە بچمەوە لای کاك کۆسرەت ؟ یانا دوواتر وتم واباشە واز لەهەمووشت بینم کاك کۆسرەت بەخۆی نەخۆشەو ئەوکێشەشی ڕوبەروی بکەمەوە بڵێم مامۆستا گوێی بەنامەکەی تۆنەدا کۆمەڵێك خەفەت دەخوات با کێشە لە نێوانیان دروست نەبێت لەسەر من بە کورتی حەزم نەکرد دڵی کاك کۆسرەت بشکێ وازم هێنا، لەو ڕۆژە بەولاوە سوێندم خوارد من نەچمە لای یەك بەرپرسی یەکێتی مەگەر لەدووام بنێرن، نەگونجێت نەچم، پێم نەکرێت نەچم، خۆشبەختانە زۆر بەدەگمەن دەچمەلای بەرپرسان ئەگەر لەبەر بچمە دەرێ هەمووکێشەکەی من بەهەڵەتێگەیشتن بووە، لە من بەلای هیچ گروپیکدا نەشکایەوە، بڕیاریشم داوە درێژەی پێ بدەم هەموویانم خۆشدەوێن، بەڵام لەزۆریان نارازیم ئەوندە ماوە بڵێم مامۆستا سەیفەدین بەرانبەر بە من بەهەڵەدا چووی دڵت زۆربریندارکردم، من چوبووم سمێل لە خۆ بنێم ڕدێنیشم لەسەردانا! بەداخەوە برادەرەکانم ئەوانەی بەرپرسن بەشێکیان زۆرباشن برادەرایەتی و کۆمەڵێك شتی ڕابردوو ڕەچاو دەکەن کەچاویان بەئێمەدەکەوێت گەشدەبنەوە ئێمەش دڵ خۆش دەبین نموونەی مجید میرخانی بەرێز و زۆری تر وەبەشی زۆریان لە خۆیان بایی و لوت بەرزو بە فیزن ئێمەشیان لەبیر کردووە حەزناکەن بمانبینن یان بیانبینین خۆیان لە ئێمە گەورەتر دەبینن، ئاگایان لێ نیە کە لەلای ئێمە ڕۆژ لەڕۆژ بچووکتر دەبنەوە، بە هەزاران جار لەسەردەستی ئەوان بە ئەمری ئەوان لەمردن نزیك بووینەوە کە گەورەترین قوربانیە، زۆر زۆرشتی تر کە ناکرێت باسی بکەین، مەگەر لەکاتی هەڵبژاردن پرسیار بکەن، ئەرێ فلان وفلان ئەگەریزانن لەفلان ناوچە فلان کەس ماوە، بەڵێ بەڵێ قوربان ماوە، دە ئاگاداری بکەنەوە و سەلامی منیشی لێ بکەن، چاویشی لە فلان کەسبێت، هاوڵاتیان هانبدات دەنگی بدەنێ ! وەی ئەگەرچاوم لێ بێت چاوم کۆرەبن!

دواتر بنکەی پۆلیس دامەزراو هاوڕێکاوە بووە لێپسراوی بنکەی پۆلیس منیش بوومە لێپسراوی بنکەی ئاسایشی بالیسان کە بوومە لێپرسراوی بنکەی ئاسایش خانوومان بۆکرا، ماڵم هێنایە بالیسان، لە ماوەی ئەو (١٢ ) ساڵانە زۆر لە مامۆستا ڕەفیق و کاك ئەنوەر و برادەران

**ڕازیم ڕێزیان گرتووم لە سەرووی پلەکەم ئەوەش بۆ من لە هەموو شتێك گرینگترە، منیش لەو (١٢) ساڵە هەوڵمداوە لێم ڕازین ئەگەر توانیبێتم !**

*** *** ***

**حاکم ساڵح لە سفرەوە دەستی پێ کرد، بەهیمەتی ئەوبرادەرانەی ناوم هێنان وردە وردە شتمان بۆ کراو حاکم زۆر ماندو بوو، کە کەوتەسەر سیکە حاکمیان نەقل کرد، زۆر بەناشرینی. حاکم ئێوارە ماڵی هێنا بەیانی نەقلیان کرد! واتە شەوێك لەو خانووە بوو ڕووداوێکی ناخۆش بوو، دیارە نقلکردنی حاکم ساڵح لەسەر داوای خەڵکی بالیسان بوو، برادەرێکیان بۆ هێنایین بەناوی حاکم جەواد دوای ماوەیەك بە هەموومان داوای حاکم ساڵحمان کردەوە، یەکێك لە قسەکانی مامۆستابەکر وتی:ماوەیەکی تر دەی نێرینەوە بۆ ئەوەی باشتر غەریبی بکەن، دواتر هاتەوە بەهاتنەوەی بەڕاستی زۆر هەوڵی دا بەتایبەتی لەڕووی هاندانی خەڵکی بۆ خوێندنەوەو نووسین دەرکردنی نامیلکەو دەرکردنی جەریدەو هاندانی گەنجان بۆ خۆرۆشنبیرکردن، نەتیجەشی هەبوو من بۆ مێژوو دەڵێم بەڕاستی مودیر ناحیەیەکی خەمخۆر بوو، پیاوێکی کۆمەڵایەتی بوو، رۆشنبیر بوو، ماندو بوو. دیارە کەسیش بێکەموکورتی نییە بە منیشەوە.**

**سەرهەڵدانەوەی خەمێکی گەورە،پێشتر باسم کردووە لەکاتی بریندارەکانی چەکی کیمیاوی بالیسان و شێخ وەسانان ڕەوانەی هەولێردەکرێن لەلایەن ڕژێم لەبەندی خانە پیاوانی ڕژێم کوڕێکی من لەدایکی دەدزن، دیارە لەناوچەکەمان دۆست وبرادەران ئەوبەسەرهاتەدەزانن لەساڵی ٢٠٠٦ لەلایەن کەسێك لە شاری سلێمانی ئاگادار کرامەوە، کوڕێك هاتۆتە سلیمانی دەڵێت من کوڕە کوردم لەتەمەنی سێ ساڵان لە ٢٠/ ٤/ ١٩٨٧، منیان داوەتە هەتیوخانەی بەغدا دواتر ژنە عەرەبێك داوای منالێکی لە هەتیوخانەکردووە بەخێوی بکات، خۆی منداڵی نەبووینە ئەو ژنە منی بردووە گەورەی کردووم، خوێندنی پێ تەواو کردووم ئێستا قانونم تەواو کردووە، دەمەوێت دایکوباوکم ببینمەوە، دیارە کە ئەوهەواڵەمانزانی ئێمە زۆر دڵخۆش بووین بۆ بەیانیەکەی خۆم ومنداڵەکانم چووینە سلێمانی ئەو کوڕەمان لە ماڵێك دیتەوە ڕەنگ و ڕووخساری ئەوکوڕە یەکجار نزیك بوو، لەشێوەی کچێکی من ئەوکوڕە زۆر کەم شتی دەزانی وەك خەونێکی پچڕ پچڕ، لەو ماڵە بووە گریانێك ئەگەر دە مەیتیش کەوتبان گریان هەروادەبوو . ئەگەر بەقسەی خێزان ومنداڵەکانی خۆم کردبا پیان باش بوو دەستی بگرم و بیهێنمەوە ماڵە وە، دوای کاتژمێرێك ماڵێکی سلیمانیش هاتن وتیان ئێمەش لەنزیکی ئەو تاریخە کوڕێکمان بزربووە، ئەوکوڕە لەکاتی**

**لەهەتیوخانەی دادەنێن ناوی خۆی و بابی تۆماركرابوون، ئەو ماڵە پێناسەی منالەكەیان هێنابوو بەهەمان ناو، كەوابوو كوڕی من دەرنەچوو، كێشەكە كێشەیەكی كۆمەڵایتی بوو، دایكی ئەوكوڕە لەسلێمانی توڕە دەبێت وماڵی باوكیشی لە بەغدابووە، چویتەوە بەغداو منداڵەكەی داوەتە هەتیوخانە، كوڕەكە پرسیاریكی كرد وتی باوكم مابوو وتیان بەڵێ وتی بۆ بەدووای كوڕەكەی دانەهات بە ماوەی زیاتر لەبیست ساڵ ؟ ماڵەكە وەڵامیان نەدایەوە، كوڕەكە زۆرتێك چوو وتی من ئێستا دەزانم كوڕی ئێوەم، بەڵام لێرە بەولاوە خۆم بە كوڕی ئێوە نازانم چونكە كەستان بە ماوەی ئەوبیست ساڵە لە منتان نەپرسیووە؟ رووی لەمن كرد وتی: ئەگەر بەكوڕی خۆتم دەزانی من دەبمەكوڕی تۆ ؟ وتم باشە من بەیەك مەرج دەتكەمەكوڕی خۆم وتی مەرجەكەت چییە؟ وتم لەگەڵ من بژی دەتكەمە كوڕی خۆم، پێی وتم باوكە یەكسەر من دەستەڵاتم بەسەرخۆ نەماو گریانێكی زۆر گرتمی كە من گریام ئەو ماڵە هەموویان گریان باوەڕبكەن لەگەڵ ئەو وشەیەی ئێستا كە دەی نووسم گریانم راناوەستێ، ئێستاش نازانم ئەو وشەیەواتە باوكە بۆ ئەوەندە كاریگەر بوو لەسەرمن! دوای تێرگریان، وتی باوكە من منالٚ بوومە دیارە دایكم منی فڕێداوە باوكیشم و خوشكەكانیشم بە دوای دایكم دانەهاتوون بزانن ئەو منداڵە چی بەسەرهاتوە، دواتر ژنە عەرەبێك منی گەورەكردووە وەك كوڕی خۆی بێت، مەسرەفی كردووم خوێندنی پێ تەواو كردووم، چۆن دەكرێت بەجێی بێڵم و بێم لەگەڵ تۆ بژم ؟ وتم ئەوەی تۆش دەڵێی راستە و ئەوەی منیش دەڵێم راستە لەگەڵم نەژی ناتكەمە كوڕی خۆم شەرمی ناوێ، دواتر من پێم باش بوو، ئەوماڵەو كوڕە بەجێ بێڵم دیارە لە هەرستانیش من و منداڵەكان بۆ كۆنەبرینەكانی خۆمان دەگریاین كوریش بۆبێكەسی خۆی دەگریا، ئێمە گەڕاینەوە كوڕەش بۆلای كەربەلا گەڕایەوە نازانم ئەوبەسەرهاتە بەكوێ گەیشت .**

**بە باوەڕی من پێم وایە پێویستە داوای لێبووردن لەیەكتر بكەین لە پێناوی بەرژەوەندی گەلەكەمان، كورد دەڵێت: زەرەر لەنیوەی بگەڕێتەوە. قازانجە زۆربەمان هەڵەمان كردوە ئەوەی هەڵەی زۆر گەورەشی كردبێت بەئەنقەست ئەوە مێژووی گەلەكەمان بەووردی باسی دەكات و ئەوەی دوارۆژ غیابیەن لەسێدارەی دەدەن. كورد دەڵێت: هەركەسەو بەمنیٚ خۆ. واتە هەمووكەس شوێنی خۆی هەیەو كەسایەتی خۆی هەیە. من داوای لێبووردن لە گەلەكەم دەكەم لە هەر هەڵەیەكی كردوومە، من لە یەك شت پەشێمانم ئەوشتەی پێم كراوە و نەمكردووە! لەخزمەتی گەل و نیشتمانم، دەستەڵاتیش وەك كاروان سەرا وایە.**

*** *** ***

دەستەڵات و سەروەت وسامان مولکی کەس با، بۆ ئێمە بەجێ نەدەما! گەورەترین سەروەت خۆت بناسی، شێر شێرە و ڕیویش ڕیوی! ڕێز لە گەلەکەت و مرۆڤایەتی بنێی و لە توانای خۆت خزمەتێك بە مرۆڤایەتی بکەی، هەموو مرۆڤی سەرزەمین برای ئێمەن لە هەر ڕەنگێك دابن لە هەر دینێك دابن، لە هەرقەومێکدا بن،مرۆڤەکان هەموویان گۆشت و ئیسقانی یەکتن، تەواوکەری یەکترن، ئەوان لە خزمەتی ئێمەدان پێویستە ئێمەش خزمەتێك پێشکەش بە مرۆڤایەتی بکەین. خۆ دووربگری لە مشەخۆری بە دەستی خۆت و ئارەقەی نێوچاوانی خۆت نانێك بۆ خۆت و منالەکانت پەیدا بکەی و وایان پەروەردە بکەی نەبنە بار بەسەر دەوروبەر، بەڵکوو ئەوانیش خزمەتکاری گەل و نەتەوەو مرۆڤایەتی بن، دارێکی بەردار بن لەژیانیان و دووای خۆشیان خزمەتێك بەجێ بێڕن، مرۆڤ قەت ئەوەندە لووتبەرز نەبێت، فەقیر و هێتم و بێدەستەلاتمان لەبیر بچێت، ئەگەر وامان کرد، ڕۆژێك دێت لووتمان دەشکێت، گەورەترین تۆڵەکردنەوە لێخۆش بوونە، ئەوەی دەست دەشکێنێت پێی ناڵێن وەستا، ئەوەی چاکی دەکاتەوە وەستایە! بۆ هەر کارێکی خراپ دڵت پێت دەڵێ نەی کەی ئەگەر بەگوێت کرد و کارە خراپەکەت نەکرد، چەندان سوودی هەیە، یەکەم: شەوان خەوت خۆش دەبێت و خەون نابینی. دووەم : زوو پیر نابی. سێیەم: نەخۆش ناکەوی. چوارەم: فەقیر نابی. پێنجەم: کوڕی هەموو ماڵێکی. شەشەم: لە کەس ناترسی. حەفتەم : دڵخۆش و ڕەنگ و ڕووخسارت گەشت دەبێت و لای خەڵکی خۆشەویست دەبێت.

پیرە خیام دەڵێت : ئەو کەسە ژیا پیاوی کەس نەبوو، کەسیش پیاوی ئەو نەبوو! خۆتان بەکەم مەزانن، هەر کەسێك قسەیەکی کرد مەڵێن بەڵێ، وایە. ئەگەر وانەبوو، بڵێن قوربان من وەك جەنابت تێی ناگەم! پێم وایە وانیە، کەسێك ڕای سپاردی بۆ کارێك ئەگەر کارەکە نابەجێ بوو بڵێن قوربان نایکەم! خوا رزقدەرە، کەس لەبرسان نامری. پیاو هەژارێکی بەهەڵوێست بێت باشترە لە دەوڵەمەندێکی سوکو ڕیسوا! هەموو (تەماعێك ) باجی دەوێت،باجیش پیاوی دەوێت،پیاو دەبێت پیش لەچاوچنۆکی بگرێت وەك باپیران دەڵێن : نە ئەو نان و ڕوونە، نە ئەو زەبرەقونە. بەڕاستی ئەو پەندە زۆرگەورەیە، مرۆڤ بە هەردوو ڕەگەزەوە پێویستە ئاگای لە کەسایەتی خۆی هەبێت، لەڕو و لاوازی نەکات، لە پێناو پارە یان هەر ئارەزوییەك وەك ئامۆژگاری باوکم پێویستە خۆت بەراورد بکەی لەنێوان خۆت وخەڵکی، ئەوەی لە هەمووشتێك

ناشیرینتره ببیه پیاوی کەسێك فەقیر و هەژار بکوژێت، بە هەرناوێك بێت لەبن هەرپەردەیەك دابێت، بژی ئەو مرۆڤەی خوێن و ئارەقی مرۆڤ ناخوات! نانی دەستی خۆی دەخوات، ڕووڕەش بن ئەوانەی خیانەت لەنەتەوەکەیان دەکەن، دەبنە پیاوی بێگانە ئەوەی بەرگری لە خۆی و نەتەوەکەی نەکات کەسێکی بێناموسە هەرکەسێك بێت!

ئەگەر خودا مۆڵەتی دام دەست دەکەمەوە بە نووسین لەسەر هەندێك ڕووداو کە ئەوسەردەمە ناکرێت باس بکرێن.

*** *** ***

ماڵتان ئاوا، زۆر ڕەخنەم لێ مەگرن هەرئەوەندەم لێ زانیوە، هیوادارم خزمەتێکم کردبێت، بەشێك لەو بەرێزانەی ناوم هێنان پێیان باش نەبوو، با سێ گێڕانەوەی بابەتەکانیان بکەم، بەشێك لەو دۆست وبرادەرانەی هاوکارییان کردووم پێیان باش نەبووە ناویان بێنم، بەشێك کە سوودم لێ دیون لە کۆکردنەوەی بابەتەکان ناوم لەبیر نەماون، داوای لێ بووردن دەکەم، دووبارە داوای لێ بووردن لەهەر کەموکورتییەك دەکەم کە لە توانای من نەبووە، ئەگەر یەکێك پرسیارێکی لەلا دروست بوو، بۆچی زۆر بەلای شێخ وەسانانی داشکاندووە ؟ هۆیەکەی من شارەزاترم بە هۆی ئەوەی کوڕی شێخ وەسانم، ئەگەر زۆر نەڕازیە باناوی خوای لێ بێنێت ئەویش شتی گوندەکەی خۆی بنوسێت، من زۆرسوپاسی دەکەم. ئەگەر زەمی منیش بکات چونکە بە قازانجی هەموومان تەواو دەبێت لە زۆربەی بابەتەکان هەموو گوندەکانی کوردستان نزیکن لەیەك،خۆشم بە نووسەر نازانم و نووسەریش نیم! ویستومە دارێك لەسەرپەردێك دابنیم بۆ گەلەکەم، گەنجان بزانن ئێمەو باب و باپیران وەك ئەمڕۆ بەخۆشی نە ژیاوین هەر گەل و وڵاتێك داگیر کرا، هەمووشتێك لەدەست دەدات. خۆم لەهەندێك شت لاداوە و باسم نەکردوە! ئێوەش بن لەشوێنی من خۆتان لەهەندێك شت دوورەگرن، چونکە دەوروبەر ڕێت پێنادا پێویستە گەنجەکان ڕێز لەو دەسکەوتە گەورانە بگرن بە هەموو کەموکورتییێکەوە، بەرچاو ڕوونم هەمووشتێك وردە وردە دەکەوێتە سەر سکەی خۆی، هەوڵدانیش پێویستە ئەمڕۆ نا بەیانی بە هەوڵوهیممەتی گەنجان......

# فەرهەنگۆکی ئەم کتێبە

**پیتی -ا -**

ئەنگۆ / ئێوە
ئەدی ئەمن/ ئەی من
ئەستوندە / کۆڵەگە
ئیشی ئەکەی / کار دەکەی
ئەستورکە هەنجیر/ نانە هەنجیر
ئەمەش دەگەرخۆ ببە/ ئێمەش لەگەڵ خۆت ببە
ئەزرەقی جادو /بە کەسێکی تەڵە کە بازیان دەگوت
ئەلعان / هەنوکە /هەنگایێ / ئێستا
ئارو / خەیار
ئۆعە / بەگاجووت دەوترێت بۆ ڕۆیشتن
قەسکوان نە ڕەقن / قەزوان زۆر ڕەقن
ئاخور / بە قوڕو بەرد دروست دەکرێت ئاژەڵ خواردنی لە ناودا دەخوات لە شێوەی چاڵی خڕە
ئەو ئیشە بەهەمانن نەکرا / ئەوکارە بە هەموان نەکرا

**ب /**

بالیف / سەرین
برازام / کوڕی برام
برایمی مەلازینددینان /بەسەرهاتێکی کۆنە
بێن / حەوسەڵە / سەبر / پشودرێژی
بەشکی بێتە ئێرە / بەڵکوو بۆخۆی بێتە ئێرە
بێرایی / پێش خانوو، هەیوان
بەرد کێش / بەچوارداری دوولك دروست دەکرا بۆ بەردهێنان بەپشتی ولاغ
بادان / سوڕاندن بادراو
دوو قسانی برێمێ / دوو قسەی پێ بلێم
بەدرێ خۆم / بەدڵی خۆم
لێکردنەوە / ڕنین

بەلەکار / ڕەنگ و ڕوویی بزنە
بەدکار/ پیاوی ڕەفتار خراپ، زۆرتر بەوکەسانە دەوترێت کە دەبنە ڕێگر لە نێوان دووخۆشەویست کێشەیان بۆدروست دەکەن
باسکم دێشی/ قۆڵم دێشێت
لۆ بەمنت نەگۆ / بۆ بە منت نەوت
بەدرێ خۆم بای / بەدڵی خۆم بای
بەردی بەر ڕەشماری / بەردێکە وەك ڕەشمارە
لەبەر دەرکێمە / لەلای دەرگامان
باو/ ئۆباو / باب / باوك
بناوی / دارێکە حەز لە شوێنی فێنك و بەئاو دەکات
بەپێیان چووم / بەقاچ چووم
بە شەنگی / بەجوانی
بنەبان / ژووری سەرەوە
بۆز / وەك ڕەنگی ڕەساسی بۆ ئەسپ بەکاردێت
باتمان / ناوی وەزنێك بووە لەکۆن وەك کیلۆ
بەرخێ / زۆرجار ئێمە بەمنداڵان دەڵێین بەرخێ لەخۆشەویستی / واتە بەرخ
بەڕ / ڕایەخێکە بۆدانیشتن و نووستن بەکارهێنراوە

.................................................................................

**پیتی -ت -**

تیسك / ئەومووەیە کە لەقاچو قۆڵی نێری دەی هێڵنەوە لەترسی مار پێوەدان و بریندار بوون
تەنگ وتار / تەسك و تاریك
تەپشو / کەرستەیەکی دار تاشینە
تێز / باروت / لەزبری کۆن و داری بی و پاشماوەی دووکەڵی شوێنی چشت لێنان دروست دەکرا
تایەفی / جۆرێکی ترێ یە ڕەنگی سپیەو دواتر بەرەو قاوەی دەچێت
تۆزێی لێ ئەستینم / تۆڵەی لێ دەستێنم
تاریم دیتن / ناخۆشیم دیتن.تاری واتە ناخۆشی تاری وتاریکی، دیارە تاریکیش ناخۆشیە ڕوناکی خۆشیە
تریك/ بەکونێکی شاخ دەوترێت تاریك وتەسك بێت بەهەرامەش دەوترێت
تریان/ کەرستەیەکی ماڵەوەیە لەشوارکە بی دروست دەکرێت دەوری پارزن دەبینێت
تائهو / کەنگێ / کەی زیاتر بۆچاوەروانی زۆر بەکاردێت
تەرحی / وەکی / وەکو / شێوەی

تان / تانم دانێ / هانم دان‌هانم دا
تەختەبەڕ/لە موی بزن دروستدەکرا بۆ ڕاخستن
تاو / ئەو گوڵەت لەمن تاو بوو / ئەوگوڵەت لە من سوبوو/ من شایانی ئەوگوڵە نەبووم /بەمنت ڕەوانەدەبینی
تێی ڕاخوڕی / تێی خوڕی / هاواری لێکرد / دەنگی دا وەك، کورە کێی
تەم وتو / تەم تومان
تیش / باسك / بەشوێنێك دەوترێت بەرزەو شاخ نییەو درێژیش بۆتەوە

.......................................................................

## پیتی -پ -

پشکۆنە / فیشەقان / مەساسە / کەرستەیەکە کەنگری پێ هەڵدەکەنن
پەز / مەڕ
پاشۆڵ / پارچە قوماشێکە ژنان لەپشتی خۆیان قایم دەکرد بۆ گیاو بژارو کەنگرو ڕێواسو هەرشتێکی تر کەپیان هەڵ دەگرت
پشکۆ / پۆلی / پەنگر
پاردان/ پاڵدان
پیمەڕە و خاکەناس/ دۆرەمەڕ یشی پیدەڵێن دوو کەرە ستەی زەوی کێلانن
پیرە بۆز / بەپیاوی پیر دەڵێن کەژنی جوان و منداڵ بێت
پشتی ملی / سەرملی
پانە / قومپانی، پاشپانی /دواوەی پێ
پار ، ساری پار / ساڵی ڕابردوو/ ئەوساڵەی چوو
پێ رێ، واتە سێیەمین ڕۆژ،واتە ئەمڕۆنا دونیش نا، پێرێ
پیز / زمان
پرچ / قژ

.......................................................................

## پیتی -چ -

چەقەر/ شوێنیکی بێ دار و بار و بە بەرد
چومە دەشتێ ژێری/ چومە دەشتێ خوارێ
چار / چارە گەنم قۆرت / چاڵ
چەلانگ / دارێکە چەند مەترێکە لای بنەوەی دەبێت دوو لك بێت بۆ مازی چنین و هەنجیر لێکردنەوە زۆرشتی تر بۆئەوەی بەرو بومەکە لەخۆت نزیك بکەیەوە
چرو/ چرۆ / بەگەلای داربەڕو دەوترێت

چ رۆژان / چ رۆژانم ئەتونەدی/ رۆژێك لەرۆژان تۆم نەدیت
چرپ / چرپوچار / خاشاك/ دارو دریو گیاو گۆڵ کە دەکەوێتە ناو جۆگە و ڕووباران . یان بەشوێنی دارستانێکی چرپش دێت
چەپەر/ وەك دەرگا وایە لە شوارکە داری توو دروست دەکرێت یان شوارکە بەرەو شوارك بەو لقە دارە دەوترێت زۆر ئەستور نیەو درێژو باریکە
چاوبەنگی/ چاو جوان
چۆك/ ئەژنۆ
چێر/ چێل مانگا

................................................................................

پیتی ـج -

جلیت / جەلیت / بەو ئاوە دەوترێت کە زستانان دەی بەستێت وەك بلوریان چلورە.
جاجە / لەخوری دروست دەکرا بۆبەخۆدادان لە زستانان
جێنك / بسك، لە نێوان گوێو چاو خوشکان قژیان بەردەدا یان پرچیان بەردەدا یان پیاوانی ئایینی جولەکە بەریان دەدا. پێی دەوترا جینك و یان جێنك جوو واتە بسکی جوان.
جینگەنە/ بەنوزە نوز/ بەبۆڵەبۆڵ/ بە مندەمند، یا ن منالێکی بە ئەزیەت و نوزە نوزی بەردەوام بێت.
جوانە مەرگ / بە جوانی مردووە/ لە تەمەنی جوانی کۆچی کردووە.
جوان و/ بەماینێك دەوترێت هێشتان بارنەکرابێت یان پشت نەکرابێت، ئامادە نەکرابێت بۆ بار هەڵگرتن.

پیتی ـح -

حاجباتی / دەگمەن/ سەیرو سەمەرە.
حەزم چوێ / دڵم چوێی / حەزم لێ بوو/ حەزم لێ کرد

................................................................................

پیتی ـخ -

خرار / وەك گونیە وابوو گەورەتر لە موی بزن دروست دەکرا بۆ هەرکارێکی جووتیاری
خەل و مێخەلان / دوو گوندن لەکوردستان
خڕی دەکاتەوە / کۆی دەکاتەوە
خۆکرکە / خۆت بێدەنگ کە
خەرکی مە / خەڵکی ئێمە
خرنۆك/ دارێکی بچووکەولەگیاو گۆل دەچێت بەبەژن درکاویەبەرێکی لاکێشەدەدات و کەمێك تامی تفتە

.....................................................................................

**پیتی -د-**

دەرێم/ برێم / دەڵێم

داڕووجان/ شێوەی لە گەڵای برنج دەچێت برنج نیە

دێمەبەرێ / دێمە پێشەوە وەك ئەوەوایە دڵم دێت ئەوکەڵەشێرە سەربڕم

دنیا / دونیا

دەبن / ئەوکەرە دەبن داران کەت - ئەو گوێدرێژە لەژێر داران کەوت

دەلەنگێ/ کەسێك شتێکی گران هەڵبگرێت و بڕوات وەك شەلبێت وایە.

دایی کردەخانی / بردیە ژوورەوە

دەبەری مری / بەقوربانی بی / بەساقەی بی

دیلمەو دیلان/ جاران گەنجان لە هەردوو رەگەز گوریسیان دەبردن گوریس لە موی بزن دروست دەکرێت، وەك کندری ئەمڕۆ دارەلامەیان پێ دەکرد لە دارەکانی بچووك واتە جۆلانە بە رێژەیکی زۆر، زۆرجار تاکو پێنج کەس سواردەبوون گۆرانیەکەیش هەبوو تەواوم لەبیر نەمایە بەو شێوەیەبوو.

سەرتێل و بنتێل، تێلی هەوای
ئەوکچە بانگ دەکات ماچ بەخۆڕایی
هەشت تەیارەی مێك بانەوبان دەکا
بە شریقەی برنۆ رەبا چۆڵ دەکا
ئەوکچە نازدارە هەرخۆی جوان دەکا
مانگەشەو خۆشە دەدات لەبانی
ماچ کردن خۆشە ڕان لەسەر رانی
مانگەشە و هەرات دەی دا لە هۆبە
ماچکردن خۆشە نۆبە بەنۆبە

دەسرۆك / دەسماڵ

دم /دەدمێکە /خەزێمێ دەدمیکە / لوت . کەپوو

دیوین / گوندێکە لە رۆژئاوای کۆیێ، ئەگەر هەڵەنەبم

دۆڵەدارێ/ مەشك بەدارێوە واتە شیرماست پەیدابووە. ئادارێ دۆلەدارێ . لێرەنا لەشەنگارێ، واتە ئەگەر لیە هێشتان نەبۆتە بەهار . لەلای شەنگارێ بەهارەو مەشك ژاندن هەیە.

دەسمەنجەر / وەك ستڵ وایە بچووك ترە

دیداری ئاخیەتێ/ دوادیتن پێش مردن

دۆخین / بەنەخوین

داسوکە/ بۆ گەنم دروین بەکاردێت
داس / بۆبڕینی داری نیمچە ئەستور بەکاردێت
دران / ددان
دابەزی / هاتەخوارێ
دێم / دێمەکار / پشت ئاو
دێمکە/ جۆرە مشەمایك بوو ڕێکیان دەخست بۆ ئاوگواستنەوەو سارد کردن بەکاردات
دەرێ/ چوەدەرێ / چوەدەرەوە /
دەلینگ / بەو دوو پارچە قوماشەی شلواری خوشکان دەگوترێ لە خوارەوە

................................................................................

**پیتی -ڕ -**

ڕاز / بەشاخێکی بەرز دەگوترێت کە دوو بەش بێت
ڕازۆك/ لەراز بچووکترە
ڕەواز/ لا ئەشاخێکەواتە لەرازۆك بچووکترە
ڕێسمان / گوریس یان ئەوبەشە زیادەیە لەدەرگای دار دەرگای لەسەر دەسورێت
ڕمبەی دێت/ ئەوکەسە کەدەروات ئەوەندە بەهێزو قەلەوە دەنگی رۆیشتنی دێ
لەوەڕ / بەخواردنی ئاژەڵ دەوترێت وەك هەبوونی گیاو پۆش وپاوان .. بزنم بردنە لەوەڕێ .. بزنم بردنە ناو پووشێ پاوانی.
ڕکەستور / بە بوغز واتە کە تورەبوو بە ئاسانی رقی دانامرکێ و کۆتایی نایەت

................................................................................

**پیتی -ز -**

زینی خۆشناوان/ چیایەکە بەو ناوەوەك و زینی ولاغ وایە
زیوان/ لەگەڵ گەنم شین دەبێت نان تاڵ دەکات دەرمانیشە بۆ مرۆڤ
زار/مێزەر / دەو/ دەم
زنج/ بەدارو کە دەمێو دروست دەکرێت لە شێوەی خێمە بۆ خۆپاراستن لەباران
زەند / باسك / قۆل / ( زەندێ بە بازنۆکە، چەند نرموشلکۆکە ماچم کرد مەمکۆکە، ئەوشەوم ئێخۆکە ) / قۆڵی بەبازن

................................................................................

**پیتی ژ /**

ژۆرێ / ئەچمەژۆرێ دەچمە ژوورێ
ژێری / گەرەکێ ژێری / دەچمە گەرەکی خواروو یان خوارێ
ژێر هەردێت / لەخوارەوە دێت

ژنەتیم / ژنەکە خانمەکە

.....................

**پیتی س /**

سیکارد / چەقوێکی گەورەیە

سێباریِ شەویِ / سێبەشی شەویِ

سان/ بەردێکە تایبەتە بە تیژکردنی کەرستەی جووتیاری

سامار / سامالّ

سەرباریِ خەتیِ / لەباکووری گوندی خەتیِ چیایەکی بەرز هەیە سەر چیایەکە ناسراوە بە سەربار ( حەیران لەسەرباریِ خەتیِ بڕۆی ئەرەشن ئەکەن خزمەتیِ )))

سەران / ئەوشەو هارەی سەران دێت ئەمشەو دەنگی لوتکەی شاخان دێت بەتایبەتی زستانان کە بای باشوور بەرە و ئێمەدێت سەیرە جاران ئەوبایە زۆر بوو زۆریش بەهێز بوو دەنگی چەندان کیلۆمەتر دەڕۆیی ئەوبایە نەماوە و بەرەوکزی چووە.

سبەینان / زبەینان/ بەیانیان/ سبەحەینە.

سمتەك/ لەدار دروست دەکرێت کە رستەی رستن و چنینە

سنجاق / کەرستەی خۆرازاندنەوەی خوشکان بووە

سەلەم/ ئەوەیە کەسێك پارەت پیِ دەدات لە سەرەتای بەهاریِ لە وەرزی پایزیِ بەروبومەکەت بدەی بەکەسەکە بەقەد پارەکە بەنرخی بازاری ئەوکات.

ساحێب / خاوەن/ خودان، خێو.

سارنو / سەری سار/ سالّی نویِ.

سیلە / زاویە / قوڕنە

سێنی / قاپ نامان بە کۆدێت واتە هەموو قاپەکان هەموو نامانان

سەربەرگ / ساقۆ / چاکەت / پالتۆ

سواندە / جێسوانە

.........................

**پیتی ش /**

شیو / چێشت / ئاش

شەو نوێن / دۆشەك وبەتانی و سەرین / بالیف

شیو/ بە شوێنێك دەوترێت نێوان دوو گرد کە پانتایەکی هەبێت

شەمس و سوراحی و رابی / ناوی سیِ ژنە دایك و دوو کچ

شاوریِ / دۆڵێکە لە باکووری رۆژئاوای شاری رانیە کەپێی دەوترێت شاوریِ، یان دۆڵی شاورە، واتە ئەودۆڵە پاشای لیِ بووینە، وەپاشماوەی دێرینی زۆرە... من باسم کردوە، لە دەمی (خار

فەقێ ئەحمەد ی شێخوەسانان)، کەدەستی زەینەفۆن گەیشتیتە دۆڵی شاورە، وێرانی کردووە یان، شای ئوری پاشای ئوریەکان.

شەواو / زیاتر پایزان دەوری خۆی دەبینێت بەدرێژای شەو ئاو لەزەوی دەنرێت زەوی باش ئاو هەردەگرێت لەپایزان پێی دەڵێن شەواو، زۆرجار منداڵان کە میز لە ژێرخۆیان دەکەن لەخەوێدا دەڵێن شەواویی لێنایە!

شك/ گومان

شێلم / گیایەکە لەگەڵ گەنم شین دەبێت

**پیتی ع /**

عەنتیکە / سەیر / سەیروسەمەرە

عەلەلیش -عەلەشیش / قەل

بێعار / هار و هاج

عارد / ئەرز / زەوی

علی بەردەشان/ گۆرانی بێژێکی بەناو بوو، خەرکی ئەوبەری مەرگە بووە، لەلایەن خەڵکی ئێمەش ناسراو بووە، هاتوە بۆداوەت و داوەت کاری .

..............................

**پیتی غ /**

غەدار / زۆردار

غێم / بەو تەپوتۆزە دێت کە لەخوارووی کوردستان بۆمان دێت

فەرخە /بەچکە

فروج / بارەکە / بارەکە کوردیە، بەو مریشکانە دەگوترێت هێلکەی نەکردێت.

**پیتی ق /**

قونجرکە/ سێدرانکە / گیایەکی بەهاریە لەگەڵ گەنم شین دەبێت بەرەکەی دڕکاویە و بۆ دەرمانی مرۆڤ دەبێت بۆ پاك کردنەوەی میزەڕۆ.

قاتی / ئەبیت/ دەبێت/ ئەشێت

قەننە / کەرستەیەکی جگەرە کێشانە بۆ تووتن کێشان بەکاردێت، لە قوڕ دروست دەکرا، یان لەبەرد جگەرە شوێنی گرتیتەوە

قیت بوونەوە/ هەستانەوە

تاقی تەنێ / بەتەنیا، شەوێ لە چیا بووم بەتاقی تەنێ واتە شەو لە چیابووم بەتەنیا

......................

**پیتی ك /**

کوە / چۆنە

کێرد / چەقو / چەقۆیەکی بچووکە
کورك / مو پرچ / پرچ بۆ موی مرۆڤ بەکاردێت
کارەك ، کارەکە گا / پێڵاوێکە لەپێستی گاجووت دروست دەکرێت بۆزستانان باکی لەبەفر خلیسکێن نیەو قوریش ناگرێ
کەرەباب / کەلەشێر
کۆمەر / کۆمەرە گیا / کۆمەڵ / کۆمەڵە/ باقە
کەنگێ / کەی
کەلەم بێ، بڵاو بێ / پەرت پێ
کوژاندەوە / ئاوم لەباغچەی کوژاندەوە تاسبەینێ
کۆلك / پاشماوەی داری وشك بوو یان داری براو
کێ وەگۆ / کێ وتی
کەس نێرن هەمان بکوژن / کەس مەهێلن هەمان بکوژن، قرانیان لۆبینن
کو زی / کوزیە شفتی کوزیەگندۆرە ، قاشکە هەنار ، قاشکە کاڵەك
کۆتك / لەدار دروست دەکرا بۆ ئاوهێنان و ، بۆ پێوانیش بەکار دات لە شێوەی ستل
کوتك / بۆساوار کوتانەوە بەکاردات
کەد / بەلقی دار دەوترێ ، لق.
کەتیرە / دارێکی بچووکە شلەیەك دەردەکات وەك سیکۆتینی ئێستا
کنێر / کنێر دوو جۆرە کنێر دارێکە لەکوێستانان دەڕوێ بۆنی خۆشە دەیکەنە گۆچان گۆپار وە گیایەکی بەهاری هەیە گولەکانی هێشوین ڕەنگیان زەردە و بۆنخۆشە
کێل/ بەلوتکە شاخێکی بەرز دەگوترێت کەدوبارە لەسەری شاخەکە شاخێکی تر هەبێت شیوەی لەکێل بچێت
کفر / دارێکی بچووکە، هەرچەند بەتەمەندا بچێت ئەستوور نابێت کاریتە لەکفری، هەرناکەویت!
کێرکەر / کارەکەر / خزمەت کار،
کوێشکە، چوێشکە / چۆلەکە بەتایبەتی بەوانە دەوترێت کە لەگەڵ مرۆڤ دەژن لە ٥/ ١٢ / ١٩٩٠ بەنەهێنی سەردانێکی شیخ وەشانان و ناوچەکەم کرد، یەك کوێشکەم بەرچاو نەکەوت لەدوای ( ٩١ ) ناوچەکە پڕبووە لەکوێشکە.
کسۆك / سەگ
کوچك / گوجیلەکسۆك/ بەچکە سەگ
کرۆسك / دارێکە هەرهەرمێك دەبێت لەداری کرۆسك متربە بکرێت واتە داکانەی هەموو جۆرە هەرمێیەکە

**کەور / لە پێستی ئاژەڵ دروست دەکرا وەك پارچە قوماشێك بەکاردات بۆنان کردن**

**کاول / کاول بوو کاولیان کرد / وێران وێرانیان کرد شوێنێکی نیشتەجێبوونی مرۆڤ کەوێران دەکرێت کاول بەخانووش دەوترێ کە وێران کرابێت.**

**کرێت / نەشیرن / ناشیرین**

**کوو درت دێ ؟ / چۆت دڵت دێ؟**

**کەوی /کەوی /کەویە بەفر پەرەپەرە، یان بەوپرە بەفرانە دێت سەرەتای هاوین بەفر ناوەناوە ماوە**

**کاکی بەکاکی / ئەوزەویە یان ئەودەشتە ئەوندە گەورەیە کاکی بەکاکیە**

**کاروان / کەسێك یان چەند کەسێك کە لەماڵەوە دوور دەکەوتنەوە بۆ دابینکردنی پێداوستیەکانیان، یان بۆ ساغکردنەوەی بەروبوومەکانیان دەیان گرت چویتە کاروانی، وەك بابم چویتە کاروانی دایکم لەماڵ نیە وەرە کورەجوان بۆت بکوژمەوە کاوڕی بەربەرانی واتە کاوڕیکی گەورە... کە لەبەران بچێ، پێکەوە دەی خۆین. ئەگەردایك و بابم هاتنەوە و گوتیان کوا کاوڕی گەورە؟ دەڵێم مام گورگ خواردی لەدەشتێ یان لەئاتاری.**

**کاوڕ/ بەرخ**

**کورەتیم / کورەکە**

**کونیش کونیش/ کون کون وەك پارزن یان وەك بێژینگ و سەرەد**

**کوزەرەو بەندۆکە / دوو گیان لەڕووبارو جۆگە دەڕوێن پێکەوە هەردوکیان دەرمانن وەك کورد دەڵێت کوزەرەو بەندۆکا**

**ڕێیێ قونێ توند دەکا/ واتە لەدەمەوە تاکۆتایی ڕێرەوی خواردن بەسوودە و بەمیزەرۆشەوە سوودی بۆمرۆڤ زۆرە زۆر لەدەرمانی کیمیاوی باشترە بۆ مرۆڤ، ئەوەی نەیناسی با بێتەلام دەیبەمە ( گوندی زینێ ) پیشانیان دەدەم، ئەگەر حاجی قادری تومێ تورە نەبێت.**

**کاریتە / نیرگە /دارێکەلە دار ئەسپیندار دارێکی درێژ و ئەستوورە**

**کار / کارۆکە/ بەچکە بزن**

**کادین / بەوشوێنە دەوترێت کای بۆ زستانان تێدا هەڵدەگرن، کەسێك زۆر بخواو توشی سگ ئێشە بێت کورد دەڵێت:**

**باشە کات ئێخۆ نەبوو**

**خۆ کادینت ئێخۆبوو!**

**واتە، ئەگەر خواردنت خواردنی ماڵی خۆت نەبوو، خۆ ورگت ورگی خۆبوو، بۆ ئەوەندە چاوبرسی بووی؟ پڕت کرد بەزەیت بەورگی خۆت دا هاتبایەوە.**

**کالان / بەبەرگی خەنجەر دێت واتە خەنجەر پێوستی بە شتێك هەیە بۆ چەند مەبەست یەکەم تەڕ نەبێت و ژەنگ نەگرێت دووەم خەنجەر تیژە بۆئەوەی نەتبڕی وەبۆ هەڵگرتنیش، کەوابوو**

خۆشناو و دز و دزشاو

پێویستی بە کالانە، (ڕەسوولی هەمزە تۆف ) لە فەرموودەیەکی دا لەداخستانی من دەڵێت:

جوانترین شوێن بۆ پیاوانماڵی خۆیتی
باشترین شوێن بۆ خەنجەر کالانیەتی

بەڵام ئەگەر دووژمنی داگیرکەر پەلامار وڵاتی دای بریسەی ئاگر لەکێوەکان دیترا

ئەوپیاوەی لەماڵ بێت پیاو نیە!

ئەو خەنجەرەی دەکالانێدا بێت خەنجەر نیە، با هەموومان وابکەین پێمان بڵێن: پیاوی ترسنۆك هەموو ڕۆژێ دەمرێت پیاوی ئازا لە هەموتەمەنی ( یەکجار دەمرێت )

**پیتی گ /**

گۆنەر / هەرەت / لەوپەڕی جوانی
گەلەك شینە / زۆر سەوزە ،
حەیران دەشتێ بالیسانێم گەلەك شینە
کێلێ کوێستانێم کەوی کەوینە
حەزلێکردنێ خەرکی بە سارومانگە
ئێمنو کوڕەتیمی لە مردن و ژینە
گای هارە/ گاجووت هارە
گر / خۆر / گڵ
گندۆرە / کاڵەك
گچکە/ مندار گچکەلە، بچووك ، زۆربچووك

چاوان مەگێڕە هێشتان (منداری)
خۆخی نەگەیی هەروچەی تاری
دەستم لێ مەدە دەست لێ دراوم
بە زەبری خەنجەر بە مێرد دراوم
دوعایەك دەکەم لە بەرخودایە
حەقم بستێنی ئومێدم نەمایە
باب و برای من گەلەك غەددار بوون
بەماری دنیایێ چاویان نوسابوون
یاخوا کوژەبی مەلا لە چاوان
ئەمنت مارەکرد لەنا پیاوان
مەلا هەی مەلای مەلای پیسکە

خۆشناو و دز و دزشاو

کەرەبابی قوندە دەرێی جیسکە
مەلا دەرێدا دەڵێی کیسەرە
چاوی کۆرە بوون پارەی مێسەرە
خوایە مەلات دی چ بێ دینەك بوو
خەنجەری دەبانی لەدەستی دابوو
مەلای نامەلا قەڵم پێچەکە گا
لە خوای نەترسا فتوای بەدرۆت دا

گولە / بەکەسێك دەوترێت کەپیربێت و ژنی جوان بێت بە زۆر ئەو ژنەی مارەکردبێت

حەیران دەرێم لەبانیان لەباینێ بەبایە
لەخەرکی بوارەو لەمن پایزەکە بە بایە
حەیف و مخابنێ ئەوێ کاولە دونیایێ
نازدار حەیرانێ من لەخزمەتێ گولەی دایە

گوێزبەلە/ گیایەکە وەك گێزەر و بچووکترە ڕەنگی جیاوازە بەهاران دەردەکەوێت
گوێی دارێ / لقی دار
گیزان/ چەقۆیکی بچووکە جاران سەرو ریشی پێدەتراشا
گا / گاجووت گات بردنەجۆتی گاجووتت بردنەجۆتی
گولەك / ناوی گوندێکە لەنزیك هەریر
گاشەبەرد/ دەستە بەرد
گاز/ کەرستەیەکی وەستایە بۆ دەرهێنانی بزمار
گازم کرد/ بانگم کرد
گاز لێدان/ کە گەنم دەدرون دەبێتە ململانە چەند کەسێك ڕێك دەکەون گاز لێ بدەن لەو سەری بۆ ئەوسەری پشتیان بەرز نەکەنەوە یان پشتیان قیت نەکەنەوە!
گەردەن / هەوك، مل

یاخوا بتگەمێ
بەتاقی تەنێ
بسکانت برنکەم
ماچ کەم گەردەنێ

گۆپار / گۆچان
گەرەکێ ژۆری / گەرەکی سەروو

حەیران دەریچم لە گەرەکێ ژۆری
بەفرێگرتینە کارەك و گۆری

خۆشناو و دز و دزشاو

**خۆ ئەزانم کێ ئەمن کوشتیە**
**نازدار حەیرانێ باسك بە مۆری**
......................................

**پیتی ل /**

**لاق / قاچ، پێ، لاقی گوسەی تێدایە بۆ کەسێکی خراپ بە کاردێت**
**لە کن / لەلای**
**لەکن خەرکی پێم بڵێ کاکە**
**لەچۆلیان سینگ واراکە**
**دونیا مەرگ و مردنە**
**بەتکاران وەك کەرێ داکە**
**لەنگەر / ڕاوەستاو**
**لەگەن / لەسێنی گەورەترە واتە لەقاپ**
**لەبن / لەبنی لەبنان لەخوارێ لەژێر لەبنان واتە لەخوار چیا لەژێرچیا**
**لەبنان ولەبنان لەبنەبانێ**
**کابرای خۆهەردا سەر کابانێ**
**کابانێ هاوارکرد وەی بابە**
**مێردە گولەم چەند سەگبابە**
**هەر دەرتی کە ڕەبابە**
**وەخت وناوەخت نازانی**
**برنج خەسارە لەو سەگبابە**
**لەکن/ پارەی لەکنی بوو / پارەی لە لای بوو لە کن مەڕان بووم،لە لای مەڕان بووم.**
**لەکەرەکە / لەکەرتێك لەگوێدرێژێك لەکەرەکە تۆپی ئەگەر نارانی لێ بکێشیتەوە**
**لۆتو / بۆتۆ**
**لۆنە / ڕەنگە**
**لۆن / رنگ**
**لەگەر /لەگەڵ**

**پیتی م /**

**مەنجەرۆکە / مەنجەڵێکی بچووک**
**میانە/ گەرمە ئاولەتەندور میان بابێمەدێی میوانە، ئاوگەرمە**
**مەحبووبێك / جوانێك**
**مارێمەیە / ماڵی مەیە**

**مۆتك / ئاقل مام مۆتك مام ئاقل وەدەشكرێت مۆتك ناوە كەسێكی ئاقل بووبێت.**
**مانگی رەشان / مانگی رەشەمێ**
**مەگرە / ئەژمار مەكە... هەژدەی ئاداریێ مەگرە لەبواریێ! واتە هەژدەی ئاداریێ ئەژمار مەكە لە بواریێ**
**مارەباوان / ماڵی باوكان**
**ماخۆ / خاوەن ، ساحێب ، خودا ، خودان**
**مەرەز / موی بزنە سۆركە**
**مار / ماڵ**
**مار / مار، خزمانی سلێمانی عەزیاو پێوەنەدا مار و خرا ئەبێ!**
**مەزن / گەورە**
**ماڵۆ / بۆچی**
**مندار/مندارۆكە مندال مندالی بچووك**
**مەیتی من / لاشەی من، تەرمی من**
**مێگەل / ران ، رانەمەر**

**پیتی ن /**

**ناس ناكەی / نایی ناسی، ئەگەر دۆستێ من ناس ناكەن كچە مەلایە**
**نیورانێ / نیوەرۆ**
**نەقۆرا / لێ هات و گەورە، بەهێز**
**نەفامم / نزانم، نازانم**
**نەم چێشتوە / تامم نەكردووە**

**پیتی ه /**

**هێك/ هێكیان / هیچیان، ئەوبزنانە هێكیان ئێمە نەبوون**
**هۆیێ و شۆیێ / بۆ دوو ژن دەگوترێت!**
**هەینۆك / نەینۆك / ئاوێنە**
**هەرهەندە / هەر ئەوەندە**
**هەرناكەوێ / هەڵ ناكەوێ**
**ئەوەی لە گوكەری هەر دەكەوی**
**لەراوكەری هەر ناكەوێ!**
**هەندە / ئەوەندە**
**هەنجەت / بەهانە**
**هەربەزی واتە بەرەو خوارەوە چوو**

هەندوکەو هەندیشی / کەمێك و زۆری تریش،( هەندێ جوانە و هەندیشی، تۆز لە باڵای نەنیشی، بە خۆی جوانە و بابیشی
هەندۆنە/ ئەوەندە
هەربردن / تیك هەڵکێشان، وەك، سنگت تەختەو ڕەو ڕەوە، وەستا کاران تێك بردی
هەردێت / ڕادەکات
هەڕوەلای / هەڕۆکنی / برۆ بۆ لای بچۆ بۆ لای هەڕە لالێوێ.
هەری هاتێ / ئەی پەڕیتێ / سواری بوو، جوتبوون تایبەتە بەئاژەڵ، لەکاتی جوتبوون.
هۆبە / بەچەند ماڵە ڕەشمارێك دەوترێت
چومە زەویەکی بەنیسك
لێی بوو نێریەکی بەتیسك
تیسکم گرت و هەری هاتێ
تیسکی گرتم و هەری هاتێ: مەرجی گوتنی سێجارە بەپەلە
پیتی و /
وەکی/ وەکو
وڕە وڕ / بۆ لەبۆڵ یان وەك سەگ .
وەرداش ، ڕەفیق / هاوڕێ دۆست وەك وەرداش زاوا ئەوەندە یەکتریان خۆش دەوێت، کورد دەڵێت گوی لەسەر گوی یەکتر دەکەن.
وسبە / کڕبە، بێدەنگ بە، هێمن بە، قسان مەکە گارەگاری مەکە.
وەی بڕێ / پێی بلێ
وردە خەزەر/ خەزەر بە دارێك دەگوترێت پێش گەلاوێژ دەرکەوێت دەی بڕن وردە پۆخ دەردەکات پێی دەڵێن خەزەر خەزار لەو خەزەر هاتووە. من کچم دیوە بەناوی خەزار بەتایبەتی لە نێوان هەرسێ عەشیەتی سورچی و خەیلانی و هەرکی ئەوناوە هەیە، بۆ ژنانیش بە کاردێت کە بەرەو پێری دەچن مووی سەریان هەردەوەرێت و وردە مویان لە بسکان دەمێنن.
وەگۆڕە / بیگۆڕەوە

خۆشناو و دۆ و دۆشاو

**ئەو بەڕێزانەی هاوکاریان کردیمە لەو گێڕانەوە و چیرۆك و حەیران وحەیرانۆك بەسەرهات......هتد...**

**ئەوەی لەبیرمە دەی نوسم ئەوەی لەبیرم نەماوە تەنهاناوەکانیان دەنوسم :**

١ / حاجی فەقێ ئەحمەد شێخ وەسانی : هاتنی زەینەفۆن بۆخۆشناوەتی دەوروبەری.
٢ / مەلاخدری حافز شێخ وەسانی : چیرۆکی مریشك و ڕێوی.
٣ /حاجی فەقێ(عەبدوڵلا) عەبدولڕەحمان حەسەن شێخ وەسانی: چیرۆکی شەڕەپشیلە.
٤/خالید عەبدولڕەحمان حەسەن شێخ وەسانی: کۆمەڵێك هەتەرۆك و مەتەرۆك
٥/ مام خالید میرگەسەری کە ناسراوە بە خالیدەگەورە : زانیاری ئەو بەڕێزانەی لە دوای کارەساتی(٧٤)لە دروستبوونەوەی هێزی پێشمەرگە دەستگیرکران لەسەرهاوکاری پێشمەرگە.
٦ / مام عەلی گوندی خۆرانێ : چەند بەسەرهاتێکی مێژووی خۆرانی دۆڵی بالیسان.
٧ / مەلا ئەحمەد بالیسانی کە ناسراون بەماڵی شینکۆیان: چەن ڕووداوێکی مێژووی.
٨/مام سەمەد بالیسانی: چەندگۆرانیەکی دروێنە وەك کەپرەکێت لۆدەکەم .
٩/حاجی حسێن عەبدولڕەحمان شێخ وەسانی: گۆرانی هەنار هۆی هەنار.
١٠ / نەجیبە فەقێ خدر سۆفی ئەحمەد (هەوسەری ژیانم): پاڵەوان لە بەرانبەر سەدام و پاڵەوانی زۆربەی حەیرانۆك و بەسەرهاتەکانەکە لەدایکی بەمیرات بۆی بە جێماوە، دایکی ناوی فاتم بوو کچی وەستاسمایل بووە کەناوم هێناوە حاجی وەستاسمایل پیاوێکی زیرەك و بەتوانا بوو لەپاراستنی هەموبابەتەکانی فۆلکلۆر.
١٢/حاجی قادر توتمەیی: کۆمەڵێك ڕووداوی مێژووی ناوچەکە.
١٣/ فایزە شەقڵاوەیی خێزانی مام حەمەد : کۆمەڵێك قسەی خۆش و ڕووداو.
١٤/ هاوڕێ کاوە کانی بەردی: کۆمەڵێك بەسەرهات و قسەی خۆش.
١٥/ساڵح ڕەسوول قادر بالیسان باشوورە: کۆمەڵێك بەسەرهات.
١٦/ حەمەد حاجی حسێن، گوندی بێراوە : چەند ڕووداوێکی ناوچەکە.
١٧/فەقێ سمایل جەردیس : هاوکارم بۆ باسکردنی چەند ڕووداوێکی کۆن.

١٨ / حاجی ئیسماعیل ناسراو بە وەستا سمایل شێخ وەسانی : کۆمەڵێك زانیاری مێژوویی و بەسەرهات.

١٩ / حسێن شینکۆ .

٢٠ / شەهیدی سەرکردە مەلاپالۆ کوردستانی تورکیا : چەند بەسەرهاتێك چەند چیرۆکێك.

٢١ / کاك محەمەد ناسراو بەمحەمەدی شێخی/ بالیسان : وەڵامی چەند پرسیارێکی دامەوە لەسەر رابردوو.

٢٢/ عەبدولڕەحمان کێخواحەسەن شێخ وەسانی : چەند چیرۆکێك کەلەدەمی بەڕێزی وەرگیراوە وچەند بەسەرهاتێکی کۆن و جەرگ بڕ کەلە باب و با باپیران بۆی بەجێماوە.

٢٣ / حاجی مستەفای شرێمکی : چەند بەسەرهاتێکی ڕابردوو گۆرانی گەنم دروین و قسەی خۆش

٢٤/ هەردو کوڕی خۆشەویستم ( جێگر و هۆگر)کەلەنووسینی کتیبەکە هاوکارم بوون.

٢٥/ مام حەسەن شیەیی .

٢٦، شەهید حاجی شێخ وەسانی.

٢٧، کاکۆ شیەیی .

٢٨/ مەلا هیوا گەرەوەیی .

٢٩ / عەولابۆر.

٣٠ / سەید رەمەزان بۆڵی .

٣١ / سامی رەسوول فەقیانەیی.

٣٢ / عومەر بۆڵی

# پاشکۆ

## بەرەبابەکانی گوندی شێخ وەسانان

## بنەماڵەی عەباسان لە گوندی کەرێتە هاتونەتە شێخ وەسانان



# بنەماڵەی وەسمان مەلان (مالی حاجیان )



# بنەماڵەی( حسەن )ە قیت لە گوندی شێخ وەسانان زۆر کۆنن



# بنەماڵەی سۆفیان لە گوندی کەرێتە
# سنوری وەرتی هاتونەتە گوندی شێخ وەسانان



# بنەماڵەی ئەسمەرێ لە بابە گیسک هاتونەتەشێخ وەسانان



# بنەماڵەی دەرمانیان یەکێکە لەو بنەماڵانەی شێخ وەسانانیان ئاوەدان کردۆتەوە



# بنەماڵەی حەتاران



# بنەماڵەی ( حاجی ) لە گەرموان هاتونەتە شکارتە پاشان هاتونەتە گوندی شێخ وەسانان



# بنه ماڵەی عەولای گابرە ی لە سکتان هاتون



# بنەماڵەی (میر دەر) ئیستا پێیان دەلێن ماڵی (لیلێ)
# لە دەشتی کۆیە هاتونەتە گوندی هەرمك بۆ شێخ وەسانان



# بنەماڵەی عیسایان( ئیسایان )
# لە بابەکیسک هاتونەتە شێخ وەسانان



# بنەماڵەی سۆیی یان سۆفی خدر ی لە گوندی کانی ڕەش باکوری کوردستان هاتوونەتە شێخ وەسانان



# بنە مالەی حاجیە شۆری
# لە ناوچەی سورچیایەتی هاتون /ئامۆزان /خزمی ماماغەن



# بنەماڵەی مستەفا عوێزی
# لە عەشیرەتی مامەسێنی لەڕۆژ هەڵات هاتوون



